# الوجيز

## في فقه السنة والكتاب العزيز

به‌ زمانی كوردی

پوخته‌ی فیقهی شه‌ریعه‌ت


نووسینی
د. عبد العظيم بن بدوي

وه‌رگێڕانی
ملا محموودی گه‌لاڵه‌یی

# الْوَجِيزُ

## فِي فِقْهِ السُّنَّةِ وَالْكِتَابِ الْعَزِيزِ

بـەزمـانـی كــوردی

## پوختەی فیقهی شەریعەت


نووسینی

د. عبدالعظیم بن بدوی

وەرگێڕانی

ملا محموودی گەلاڵەیی



١٤٣٤ك

٢٠١٣ز

بسم الله الرحمن الرحيم

*********************************************


📖 ناوی کتێب: الوَجيزُ فِي فِقْهِ السُّنَّةِ وَالكِتَابِ العَزِيزِ

📖 نووسینی: محمود أحمد محمد

📖 چاپی: یەکەم

📖 تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

📖 ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٢٥٠)ی ساڵی (٢٠١٣ز)ی پێدراوە.

📖 کۆمپیوتەرو دیزاین: (نیان حسین)

📖 لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپکراوە، مافی چاپکردنەوەی بۆ کتێبخانەی ناوبراوە.

# الرموز المستخدمة في التخريج

| | |
|---|---|
| صحيح البخارى (فتح الباري)......خ | مصنف ابن أبي شيبة...... ش |
| صحيح الإمام مسلم...... م | مسند البزار...... بز |
| سنن الترمذي...... ت | الطبراني في الأوسط...... طس |
| سنن النسائي...... ن | الطبراني في الصغير...... طص |
| سنن ابن ماجه...... جه | مختصر صحيح البخاري...... مختصر خ |
| سنن أبي داود (عون المعبود)...... د | مختصر صحيح مسلم...... مختصر م |
| موطأ الإمام مالك...... ط | صحيح سنن الترمذي...... ص.ت |
| الشافعي (الأم)...... فع | صحيح سنن النسائي...... ص.ن |
| أحمد (الفتح الرباني)...... حم | صحيح سنن ابن ماجه...... ص.جه |
| البيهقي...... هق | صحيح سنن أبي داود...... ص.د |
| الدارقطني...... قط | صحيح الجامع الصغير...... ص.ج |
| صحيح ابن حبان...... حب | إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل........................... الإرواء |
| صحيح ابن خزيمة...... خز | أحكام الجنائز...... الجنائز |
| مستدرك الحاكم...... ك | آداب الزفاف...... الزفاف |
| سنن الدارمي...... مي | صفة صلاة النبي ﷺ...... صفة الصلاة |
| الطبراني في الكبير...... طب | تمام المنة في التعليق على فقه السنة.... تمام المنة |

* * *

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

شتێكی ئاشكراو بەڵگە نەویستە: كە شەرحكردنو روونكردنەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كارێكی پیرۆزو سودبەخشە بۆ دونیاو بۆ قیامەت، خودا بمانكاتە هاوكارو رێڕەوی ئەو كاروانە پیرۆزەو توفیقمان بدا بۆ لەگەڵدا ژیانو خەریكبوونو هاوبەشیكردن لەو مەشروعەداو بۆمان بكاتە توێشوی قیامەتو ئەركو ماندوبوونمان بەطاعەتو خوداپەرستی بۆ حسێب بكا.

هەڵبەتە وەرگێڕانو بەكوردی كردنی فەرموودەكانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئێمەی كورد زوبان – ئەگەر بەشێوەیەكی ڕاستو دروست بێ – خزمەتی دینو دونیایە، روونكردنەوەی پایەیەكی گرنگی شەریعەتی ئیسلامە، ئاشنا كردنی نەتەوەی كوردی موسوڵمانە بە فەرمایشتە بەنرخەكانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كە دووەم سەرچاوەی شەریعەتن لەدوا قورئان روونكەرەوەی ئایەتەكانی ئەو كەلامە پیرۆزو سەرئاسایەن: كە ئەركی سەرشانی موسوڵمانە پەیڕەوی ناوەڕۆكیان بكەنو بیانكەنە پەیڕەوو پرۆگرامی ژیانیان لەهەموو بوارەكاندا. هەڵبەتە كەسێكیش پەیڕەوییان بكا قەت سەری لێ ناشێوێو هەمیشە بەرچاو روونو هیدایەتدراوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) داوای لە موسوڵمانان كردووەو فەرمانی پێ كردوون: كە هەموو كات ئەو دوو سەرچاوە پیرۆزە بكەنە چرای رۆشنكەرەوەی رێبازی ژیانیانو موژدەی ئەوەشی پێداون كە هەتا ئەوان شوێن ئەو دوو چرا پرشنگدارە بكەون هەرگیز گومڕا نابنو رێڕەوی ژیانیان لێ تێك ناچێو بەختەوەری دونیاو قیامەت دەبن. هەر لەم ڕوانگەیەوە كە دەفەرموێ: «تركت فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا كِتَابَ اللَّهِ

وَسُنَّتِي وَلَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ»: من لەدوای خۆم دوو سەرچاوەم بۆ ئێوە بەجێ هێشتووە هەتا پابەندیان بن سەرتان لێ ناشێوێو گومڕا نابن. ئەو دوو سەرچاوەیەش قورئانو حەدیثەکانمن ئەم دوو سەرچاوە پشتگیری یەکتر دەکەنو لێك جیا نابنەوە هەتا ڕۆژی پەسڵان.

زانیاری فیقهی خۆی لەخۆیدا لەزانستە پیرۆزو بەنرخەکانە، چونکە لەڕێگەی زانینی ئەوەوە دەتوانین عیبادەتو خودای گەورە داپەرستییەکانمان وا ئەنجام بدەین کە جێگای ڕەزامەندی پەروەردگاربنو هیوامان پێیان بێ کەلێمان قبوڵ دەکرێن. هەڵبەتە گەورەییو ڕێزو نرخی ئەم زانستە زۆرو زەبەندەنو وەصفی تەواو نابێ، چونکە بریتیە لەچەند حوکمێك لەگەڵ ژیانی موسوڵماندایە لەهەموو قۆناغەکانی ژیانداو لەگشت بوارەکانی ژیاندا چ لەنێوان خۆیو خودادا یان لەنێوان خۆی بەندەکانی خودادا، بەهۆی زانینی فیقهەوە دەزانین چۆن خوداپەرستی دەکەینو چۆن پەیوەندی خۆمان بەخوداوە قایمو پتەو دەکەین، چۆن روکنەکانی ئیسلام بەجێ دێنین هەر لە دەستنوێژو نوێژەوە تا دەگاتە ڕۆژوو زەکاتو حەجو عەمرەو باقی عیبادەتەکانی تر.

هەر بەهۆی زانینی فیقهەوە شارەزای ئەحکامی جیهادو غەزاو عەهدو پەیمانو شەڕو ئاشتی دەبین، هەر بەهۆی زانینی فیقهەوە دەتوانین ڕێگای بەدەستهێنانی ڕزقو ڕۆژی حەڵاڵ بدۆزینەوەو خۆمان بپارێزین لە تاوانو ڕێبازە چەوتەکانی پەیداکردنی سامانو دارایی. ئەویش لەڕوانگەی فیقهی مامەڵەکردنەوە چ کڕینو فرۆشتن بێ یان گۆڕینەوەی پارە بێ، یان مامەڵەی ڕیبائامێز بێ..... یان وەقفکردنو وەصیەتکردنو بەخشین بێ.....

هەر بەهۆی ئەم زانستە پیرۆزەوە دەزانین چۆن میرات دابەش بکەین بە ئەوپەڕی عەدالەتو جوانترین یاسا. چۆن ژیانی هاوسەریو خێزانداری

منـداڵ بـەخێوكردنو بەشـێوەیەكی راسـتو دروسـت پـەیڕەو دەكـەینو بەختەوەری بۆ خۆمانو خێزان دابین دەكەین، چۆن تۆڵەی تـاوان لـەتاوانبار وەردەگرین چۆن پارێزگاری لەماڵو عەقڵو ناموسو خوێنو نیشتمان دەكین، چۆن ئاژەڵ سـەردەبڕینو گۆشـتی چ سـەربڕاوێك حەلاڵەو كامـەیان حەرامـە، نەزرو سوێندو پەیمانو بـەڵێنمان چۆن بـێو چۆن كێشەو نیزاعمـان یـەكالا بكەینو هەر كەسە بەمافی خۆی بگاو ستەمی لێ نەكرێ.

لەسەر ئەم بنەمایە، بەنـدە بەخزمـەت كتێبـی (الـوجیز فـی فقـه الـسنة والكتاب العزیز) گەیشتم بڕیارمدا وەریگێڕم بۆسـەر زمـانی كوردی، ماوەیـەك خـەریكی بـووم زیـاد لـەنیوەیم تـەواو كـرد، بیـستم برادەرێـك كردویـەتی بەكوردی، وازم لێ نەهێنا، بەڵام كە وەرگێڕانەكەی چاپ بوو بینیم ئیشی مـن لـەهی ئـەو جـوداوازەو بەرهەمەكـەی كاریگـەری سـەلبی ناخاتـە سـەر وەرگێڕانەكەی من بۆیە هاتمەوە سەر كارەكـەمو تـەواوم كـردو لەچاپمدا، جا ئێستا خوێنـەر خـۆی كارەكـەی مـنو ئـەو بـرادەرەش هەڵدەسـەنگێنێو بڕیـار دەدا!

هیوادارم ئەم بەرهەمە وەكوو ئەصڵەكەی خـودا بەرەكـەتی تـێ بهـاوێو ڕەواجـی پـێ بـداو بیكاتـە مایـەی قورسـی كـردەوەی چـاكەمو سـودی دونیـاو قیامەتمی تێدا بێو بەعەمەلی صاڵح بۆم حساب بكا آمین.

ملا محمودی كەلالەیی

٢٠١٢/٨/٢٠

## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## کتاب الطهارة

## نامەی پاکو خاوێنی

وشەی (الطّهارة) لە زمانەوانیدا پاکو خاوێنیو خۆپاراستنە لەبێ دەستنوێژیو لەشپیسیو پیسایی.

لەزاراوەی شەرعدا بریتیە لەلابردنی بێ دەستنوێژی یان لابردنی پیسایی لەسەر جەستەو پۆشاکو کاڵای تر.[1]

### ١- باسی ئاوو حوکمەکانی

هەرئاوێك لەئاسمانەوە بباریٚ یان لەزەوی بێتەدەر پاکەو پاکەوەکەرە. ئاماژە بە فەرموودەی پەروەردگار کە دەفەرمویٚ: {وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاء مَاء طَهُورًا – الفرقان/٤٨} ئێمە لەئاسمانەوە ئاوێکی پاکو پاکەرەوەمان باراندووە.

هەروا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەربارەی دەریا فەرموویەتی: (هو الطهور ماؤه، الْحِلّ ميتته): دەریا ئاوەکەی پاکو پاکەوەکەرە، مردارەوەبووشی حەڵاڵە. مردارەوەبووی ئاوی تا نەگەنیٚ خواردنی دروستە.

هەروا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی ئاوی بیر کە فەرمووی: (ان الماءَ طهور لايُنَجِسّهُ شيء). بێگومان ئاو پاکەو پاکەوەکەریشە، بەهیچ پیس نابێ.

ئەم پاکیو پاکەوەکەریەی بەردەوامە، تەنانەت ئەگەر شتی پاکی تێکەڵ بێ بەمەرجێ ئاوەکە وای لێ نەیە نەتواندرێ ناوی ئاویەتی (ئاوی رووت)ی

---

[1] المجموع شرح المهذب (ج١/٧٩).

پێ بگوترێ. ئەمەیش بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کەئاراستەی ئەو ئافرەتانەی کرد کەخەریکی شۆردنی کچەکەی بوون. ئەوە بوو پێی فەرموون « اغْسِلْنَهَا ثَلاثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ»:

جەنازەکەی سێ جار بشۆرن، یان پێنج جار، یان ئەگەر ویستتان زیاتر، با شتنەکەتان بەئاوو سیدر بێ، جاری کۆتاییش بەئاوو کافور یان بەکەمێك کافور بێ.

ئەگەر شتێکی پیس تێکەڵ بە ئاو بوو، ئاوەکە بەپیس دانانـدرێ مەگەر بەهۆی تێکەڵ بوونی ئەو پیسییە ئاوەکە بگۆڕێ. بەڵگەی ئەمەیش ئەو فەرموودەیە: کە ئەبو سەعیدی خودری ریوایەتی کردووە دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئێمە دروستە بەئاوی بیری (بوضاعە) دەستنوێژ بگرین؟ کەبیرێکە پەرۆی بێنوێژی ژنانو گۆشتی بەرماوەی سەگو شتی تری پیسو بۆگەنی فرێ دەدرێتە ناوی. لەوڵامدا فەرمووی: «الْمَاءُ طَهُورٌ لاَ يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ». ئەو ئاوە پاکەو پاکەوەکەریشە، چونکە گەیشتۆتە قولەتێنو بەهیچ شتێ پیس نابێ، مەگەر بەشتێك کە تامی یان رەنگی، یان بۆنی بگۆڕێ.

## ٢- باسی پیسییەکان (باب النجاسات)

النجاسات: کۆی وشەی (نجاسە)، ئەمیش بریتییە لەهەر شتێك خاوەنی زەوقی سەلیم بێزی لێ بکاتەوەو خۆی لێ بپارێزێ، هەرکاتێك مرۆڤ جەستەو پۆشاکی شتێکی لەو جۆرەی پێکەوت بیشواو خۆی لێ پاك بکاتەوە، وەکوو پیسایيو میزو ریخو خوێنو شتی وا[1].

---

[1] الروضة الندية (ج١/١٢).

ئەصڵو بنەما لەهەموو شتێکدا پاکیو حەڵاڵییەتی، کەسێك پێی وابوو شتێك پیسە، دەبێ بەڵگەی هەبێ، جائەگەر بەڵگەی پەسەندی هەبوو ئەوە گوێی لێ دەگیرێ، ئەگەر نەیتوانی بەڵگە بخاتە ڕوو، یان بەڵگەیەکی هێنا کەپەسەند نەبوو حوکمی پێ نەدەچەسپا، ئەوە پێویستە ئێمە کار بەو ئەصڵو بنەمایە بکەین: کەهەموو شتێك لەبنەڕەتدا پاکەو تابەڵگە لەسەر پیسییەکەی نەچەسپێ، بەپاکی بزانین[1].

چونکە بڕیاردان بەپیسی شتێك حوکمێکی تەکلیفیو ئەرکێکە دەکەوێتە ئەستۆی ئادەمیزاد بەگشتی، ئەمەیش بەبێ هەبوونی بەڵگەی پەسەندو بەهێز ڕەوا نییە[2].

## هەندێ لەو شتانەی بەڵگە هەیە دەربارەی پیسییان

### ١ - ٢: میزو گووی ئادەمیزاد:

دەلیلی ئەوە: کە گووی ئادەمیزاد پیسە، ئەو فەرموودەیەیە کە ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕاویەتەوە: کە فەرموویەتی: «إِذَا وَطِئَ أَحَدُكُمْ بِنَعْلَيْهِ الأَذَى فَإِنَّ التُّرَابَ لَهُ طَهُورٌ»[3].

وشەی (الأَذى) بریتییە لەهەرشتێك ئەزیەتت پێ بگەیەنێ: لەپیسایيو بەردو چڵکو شتی وا. لە فەرموودەکەدا مەبەست لێی پیسییە.

بەڵگە لەسەرئەوە میز پیسە ئەو فەرموودەیەیە کە ئەنەس دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە ناو مزگەوتی مەدینە بەبەرچاوی پێغەمبەرو هاوەڵانیەوە لەسوچێکی مزگەوتەکەدا میزی کرد،

---

[1] السيل الجرار ج١/٣١.

[2] صحيح {ص. د - ٨٣٤} والروضة الندية ج١/١٥.

[3] صحيح {ص. د - ٨٣٤} د ج٢/٤٧ و ٣٨١.

هەندێ کەس بۆی چوون و دەنگیان دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «دَعُوهُ وَلاَ تُزْرِمُوهُ». لێی گەڕێن میز کردنەکەی لێ تێك مەدەن، دەڵێ: کە لێ بۆوە، داوای دۆلکە ئاوێکی کردو بەشوێنی میزەکەیدا کرد[1].

**٣ – ٤: مەذیو وەدی:**

مەذیی: ئاوێکی سپی روونی لینجە، لەکاتی وروژاندنی شەهوەت دێتە دەر، نە لەززەتی لێ پەیدا دەبێ نە بەفیچقە دەردەچێ، دوای هاتنە دەرەوەیشی کپ بوونەوەو ماندوویی بەدوا نایە، وادەبێ هەست بەهاتنە دەرەوەیشی ناکرێ. ئەم حاڵەتە بۆ پیاوو ئافرەت دێتە دی.[2] ئەم مادەیە پیسە، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە بەشتنی ذەکەر لەئاکامی هاتنە دەرەوەی ئەو مادەیە لێی.

لە ئیمامی عەلییەوە ریوایەت کراوە، دەڵێ: من پیاوێکی وابووم بەزۆری مادەی (مەذی)م دەهاتە دەر، شەرمیشم دەکرد لەم بارەوە پرسیار لە پێغەمبەر بکەم (دروودی خودای لەسەر بێ) چونکە فاطیمەی کچی خێزانم بوو، بۆیە داوام لە (ألمقداد)ی کوڕی (الأسود) کرد ئەو بۆم پرسیار بکا، کەپرسیاری عەرز کردبوو فەرموبوی «يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ».[3] هەرکاتێ ئەو جۆرە حاڵەتەی بینی با ذەکەری خۆی بشواو دەستنوێژ بگرێ.

وەدیی: ئاوێکی سپی خەستەو دوای میزکردن دێتەدەر[4] ئەم مادەیە پیسە.

---

[1] متفق علیه {م – ٢٣٦/١ و ٢٨٤ واللفظ له {خ – ١/٢٣٢/١٣٢}.

[2] شەرحی مسلم ج٣/٢١٣.

[3] متفق علیه. {م ٣٠٣/١/٢٤٧} واللفظ له. خ/٦٠٢٧/٤٤٩/١٠.

[4] فقة السنة/١/٢٤.

لەئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتکراوە: کە دەربارەی (مەنیو وەدیو مەذی) وتوویەتی: هاتنە دەرەوەی مەنی دەبێتە هۆی پێویستبوونی غوسڵ. وەدیو مەذی هەرکاتێك لێت هاتنەدەر زەکەرت بشۆرەو دەستنوێژ بگرە وەکوو دەستنوێژگرتنت بۆ نوێژ.[1]

٥- زبڵو پیسایی هەر ئاژەڵێک: کە گۆشتی نەخورێ:

لە عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی سەرئاو بکا، فەرمووی: (سێ بەردم بۆ پەیدا بکە) منیش دوو بەردو تەرسەقولێکم دەست کەوت، کە دامنە دەستی دوو بەردەکەی هەڵگرتو تەرسەقولەکەی فڕێداو فەرمووی: {هی رجس}. ئەوە واتە: تەرسەقول پیسە.

٦- خوێنی بێنوێژی ئافرەت (دم الحیض):

لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: یەکێك لەئێمە خوێنی بێنوێژی بە پۆشاکی خۆیەوە دەبینێ چی بکات باشە؟؟

لە وەڵامدا فەرمووی: «تَحُتُّهُ، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ، وَتَنْضَحُهُ وَتُصَلِّي فِيهِ». ئەو بەشە پۆشاکەی خوێنەکەی تێوە چووە بیوڵەو ئەمجار بیکرێنەو پاشان ئاوی پێدا بکەو بیگوشە پاشان نوێژ بەو پۆشاکەوە بکە.[2]

٧- لیکی سەگ:

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ أُولاَهُنَّ بِالتُّرَابِ». شێوەی پاککردنەوەی قاپو قاچاغی یەکێك لەئێوە

---

[1] صحیح: {ص. د - ١٩٠} هق/١/١١٥.

[2] متفق علیه: {م/٢٩١/١/٢٤٠ واللفظ له. خ/٣٠٧/١/٤١٠}.

ئەگەر سەگ دەمی تێخست، ئەوە بە حەوت جار ئاوی تێڕا دری، جارێکیان بەقوڕاو گڵاوی لێ دەربکرێ.

٨- مردارەوە بوو:

ئاژەڵو پەلەوەرێکە بەبێ سەربڕینی شەرعی گیانی دەرچووبێ، ئاماژە بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «إِذَا دُبِغَ الإِهَابُ فَقَدْ طَهُرَ».[1] پێستی مردارەوە بوو، کە دەباغ کرا پاک دەبێتەوە. واتە: مردارەوە بوو هەمووی پیسە بەڵام پێستەکەی بەهۆی دەباغەوە پاک دەبێتەوە. چەند جۆرێك لەو شتە پیسانە جەرت دەکرێ.

١- ماسیو کوللەی گیاندەرچوو خواردنیان حەڵاڵەو پیس نین. ئەمەش بەپێی ئەو فەرموودەیەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ریوایەتی کردووە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ وَأَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ».[2] واتە: بۆ ئێمە دووجۆر مردارەوە بوو دوو خوێن حەڵاڵ کراوە، دوو مردارەوەبووەکان ماسیو کوللەیە، دوو خوێنەکانیش جەرگو سپڵە.

٢- گیاندارێك خوێنی رەوانی نەبێ بەمردوویی پاکە، وەکوو مێشو مێرولەو هەنگو ئەو جۆرە شتانە.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ ، فَإِنَّ فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً وَفِي الأُخْرَى شِفَاءً»[3] هەرکاتێك مێش کەوتە ناو قاپو

---

[1] صحيح {ص. ج ٥١١} م (٢٧٩ – ٩١ – ١/٢٣١).

[2] صحيح {ص. ج٢١٠} صم (١/٢٥٥/٩٦) هق (١/٢٥٤).

[3] صحيح {ص. ج ٨٣٧}، خ (٥٧٨٢)، جه (٢/١١٥٩/٣٥٠٥).

قاچاغی ئێوەوەو شلەمەنییان تێدابوو، با بەتەواوی مێشەکە لەشلەمەنی ناو قاپەکەدا نقوم بکاو پاشان دەری بێنێ و فڕێی بدا، چونکە لەباڵێکیدا دەرد هەیەو لەباڵەکەی تریدا شیفا هەیە.

٣- ئێسقانی مردارەوە بوو، شاخەکانی، نینۆکی مووکوڵکی و پەڕوپۆلی، هەموو ئەمانە پاکن، ئەمەیش بەپێ داگرتن لەسەر ئەوە بنەمایە کە ئەصڵ تێیاندا پاکییەئاماژە بەو فەرموودەیەی بوخاری بەشێوەی تەعلیق ریوایەتی کردووە، دەڵێ: ئیمامی زوهری دەربارەی حوکمی ئێسقانی مردارەوەبوو نمونەی ئێسقانی فیل و شتی وا، فەرموویەتی: کەسانێکم لەعولەمای سەلەف دیوە، ئەو جۆرە ئێسقانانەیان بەکار هێناوە بۆ بەشانەکردنی قژی سەرو ڕیش و رۆن تێدا هەڵگرتنی و هیچ خراپەیەکیان تێدا نەبینیوە. حەمماد فەرموویەتی: پەڕوپولی باڵندە هیچ پیسییەکی تێدا نابینم.

## چۆنیەتی پاککردنەوەی شتی پیس بوو

پێویستە بزانین: کەدانەری شەرع (شارع) بەئێمەی زاناندووە ئەم شتە خودی خۆی پیسە، یان بۆخۆی پاکەو پیس بووە، ئەمجار فێری کردووین چۆن شتی پاکی پیس بوو پاك بکەینەوە، ئەرکی سەرشانی ئێمەیە بەپێی ئەو دەستوورو فەرمانانە، خۆمان لەشتە پیسەکان دووربخەینەوەو شتە پیس بووەکان بەو شێوەی بۆمان دیاری کراوە پاکیان بکەینەوە. ئەوەی فەرمانی پێ کردووین بەشتن بیشۆین تا ڕەنگی یان بۆنی یان تامی پیسییەکەی دەڕوا ئەوە پاکبوونەوەیەتی. ئەوەی پێمان دەڵێ: ئاوی پێدا بکەن یان ئاوی لێ بڕشێنن یان بیوڵن و بیکرێنن یان مەسحکردنی بەزەوی یان رۆیشتنی بەناو زەوی پاکدا ئەوە پاکبوونەوەیەتی پابەندی بین و بڕوامان پێی هەبێ.

بزانە ئاو هۆکارێك و بنەمایەکی سەرەکییە بۆ پاککردنەوەی شتە پیسبووەکان، چونکە شاریع وەصفی ئاوی بەوە کردووە کە پاکژکەرەوەیە،

دەفەرموێ: « خَلَقَ اللهُ الْمَاءَ طَهُوراً »[1] لەم ئەصڵ و بنەمایە لانادەین بۆ شتێکی تر مەگەر لەلایەن شارعەوە شتێکی تر دیاری بکرێ، ئەگینا نا. چونکە ئەگەر وا رەفتار نەکەین ئێمە لاماندا وە لەشتێکەوە کە پاکژکردنەوە پێی ئاشکراو روونە – بۆ شتێك کەنازانرێ ئاخۆ پاکژکردنەوەیە یان نا، ئەمەش لادانە لەو رەفتارو ئاکارانەی رێبازە شەرعییەکان داخوازنی.[2]

جا کەتۆ ئەمەت زانی، ئەمجار با ئەو رێبازو رەفتارانەت پێ بڵێم: کەشەرع داینـاوە بۆ چۆنیەتی پاککردنەوەی شتی پیس بوو یاخود پیس. (نجس العين).

**١- پاککردنەوەی پێستی مردارەوە بوو بە دەباغ کردن بێ:**

لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم (درووودی خودای لەسەر بێ) ژنەوت دەیفەرموو: « أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ ».[3] هەر پێستی مردارەوەبوێك دەباغ کرا پاك دەبێتەوە.

**٢- پاککردنەوەی قاپو قاپاغ کە سەگ دەمی تێخست:**

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە: کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ أُولاَهُنَّ بِالتُّرَابِ».[4] شێوەی پاککردنەوەی قاپو قاچاغی یەکێك لەئێوە

---

[1] _ [2] السبل الجرار/٤٢، ١/٤٨ بەدەست لێدانەوە، پێویستە ئەوەش بزانرێ کە رستەی (خَلَقَ اللهُ المَاءَ طَهُوراً)، الحافظ لە کتێبی (التلخيص ١/١٤)دا دەفەرموێ: بەو شێوازە دەستم نەکەوتووە، لەو فەرمودەیەی ئەبو سەعید ریوایەتی کردووەو لەپێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد دەقەکە ئاوایە: (ان الماءَ طهور لايُنَجِسُهُ شيءٌ).

[3] صحيح {ص. جه ٢٩٠٧} حم ١/٢٣٠/٤٩، ت ٣/١٣٥/١٧٨٣، جه ٢٢/١١٩٣/٣٦٠٩ ن ٧/١٧٣.

[4] صحيح: لەوە پێش تەخریج کرا.

كە سەگ دەمی تێخست ئەوەیە: کە حەوت جار بیشوا، یەکەمجاریان بەقوڕاو بێ.

**٣- پاککردنەوەی پۆشاک ئەگەر خوێنی بێنوێژی ویکەوت:**

لەئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە ریوایەتکراوە دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد قوربان! یەکێك لەئێمە پۆشاکەکەی خوێنی بێنوێژی رێدەکەوێ، چۆنی پاك بکاتەوە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوەڵامدا فەرمووی: «تَحُتُّهُ ، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ ، وَتَنْضَحُهُ وَتُصَلِّي فِيهِ».[١] بیپروێنە پاشان تەڕی بکەو بیکرێنە ئەمجار بەئاو بیشۆ، پاشان نوێژی پێوە بکە، ئەگەر دوای ئەم پرواندنو کڕاندنو لەئاو هەڵکێشانە تارماییو ئەثەرێکی پێوە ما قەیناکا.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: خەولەی کچی یەسار عەرزی پێغەمبەری کرد، وتی: قوربان من تەنها یەك کراسم هەیە، بەو کراسەوە دەکەومە بێنوێژییەوە، هەڵبەتە هەندێ لەکراسەکەم خوێناوی دەبێ. چی بکەم باشە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «فَإِذَا طَهُرْتِ فَاغْسِلِي مَوْضِعَ الدَّمِ ثُمَّ صَلِّي فِيهِ »: ئەگەر لەبێنوێژی پاکبویتەوە، ئەو شوێنەی لە پۆشاکەکە خوێنی بێنوێژییەکەیەتی پێوەیە بیشۆرە، پاشان دەتوانی نوێژ لەو پۆشاکەدا بکەی. خەولە وتی ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر بەو شێوە پاککردنەوە ئەثەری خوێنەکە لانەچوو؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « يَكْفِيكِ الْمَاءُ وَلاَ يَضُرُّكِ أَثَرُهُ ».[٢] ئەو شێوە شتنە ئەنجام بدەو لەئاوی هەڵکێشە، مانەوەی ئەسەرەکەی زیانت پێ ناگەیەنێ.

---

[١] صحيح {ص. جه ٢٩٠٧} حم/٤٩/١/٢٣٠، ت/١٧٨٢/٣/١٣٥ جه (٣٦٠٩/٢/١١٩٣، ن٧/١٧٣).

[٢] {ص. د ٣٥١} و {٢/٢٦/٣٦١} هق (٢/٤٠٨).

٤- پاككردنەوەی داوێنی پۆشاكی ئافرەت:

لە ئوممو وەلەدی ئیبراهیمی كوڕی عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف ریوایەتكراوە: كەپرسیاری لەئوممو سەلەمە (خێزانی پێغەمبەر) كردووە وتوویەتی: من ئافرەتێكم داوێنی كراسەكەم درێژ دەكەم، بەشوێنی پیس‌و پۆخەڵدا تێدەپەڕم، داوێنی كراسەكەم لەشتی پیس دەكەوێ‌و پیس دەبێ چی بكەم؟ ئوممو سەلەمە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « يُطَهِّرُهُ مَا بَعْدَهُ ».[1] كەدوایی بەشوێنی پاكدا دەڕۆی‌و داوێنت لەزەوی پاك دەخشێ ئەوە پاكی دەكاتەوە.

٥- پاككردنەوەی پۆشاك لەمیزی منداڵی شیرەخۆرە:

لە ئەبو سەمحەوە (خزمەتچی؛ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ریوایەتكراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْجَارِيَةِ وَيُرَشُّ مِنْ بَوْلِ الْغُلَامِ ».[2] پۆشاكێك بەمیزی كچۆڵەی ساوا پیس ببێ دەبێ بشۆرێ، ئەگەر بەمیزی منداڵی ساوای نێرینە پیس بوو بەئاو لێ پرژاندن پاك دەبێتەوە.

٦- پاككردنەوەی پۆشاك لە (مەذی):

لەسەهلی كوڕی حونەیفەوە ریوایەتكراوە دەڵێ: من زۆر بەدەست (مەذی)یەوە ناڕەحەت بووم (مەذی هاتنەوەم زۆر بوو) لە ئاكامی ئەو مەذی هاتنەوەم زوو زوو غوسڵم لەخۆم دەردەكرد، ئەم حاڵەی خۆم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باس كرد، فەرمووی: « إِنَّمَا يُجْزِيكَ مِنْ ذَلِكَ الْوُضُوءُ ». بە مەذی هاتنەوە غوسڵ واجب نابێ، بەڵكوو دەستنوێژ بەتاڵ دەبێتەوە، هەر دەستنوێژ بگرەوە بەستە. سەهل دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری

---

[1] صحيح {ص. جه/٤٣٠} ط (٣٧/٤٤)، ت (١٤٣/ ١/٩٥) جه ١/١٧٧/٥٣١.

[2] صحيح {ص. ن ٢٩٣}، د (٢/٣٦/٣٧٢) ن (١/١٥٨).

خـودا! ئـەی چـۆن‌و بەچـی ئـەو بەشـەی (مـەذی)یەکـەی وێکـەوتووە پـاکی بکەمەوە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: «يَكْفِيكَ أَنْ تَأْخُذَ كَفًّا مِنْ مَاءٍ فَتَنْضَحَ بِهِ ثَوْبَكَ حَيْثُ تَرَى أَنَّهُ أَصَابَ مِنْهُ».[1] هەر ئەوەنـدەت بەسـە لوێـچێك ئـاو هـەڵبگرێ‌و نـافۆکی خـۆتی پـێ بڕشـێنی، ئـەو شـوێنەی گومانـت لێیەتی (مەذی)یەکەتی وێکەوتووە ئاوی لێ بڕشێنی.

**٧- پاککردنەوەی بنکی نەعل‌و پێڵاو:**

لە ئەبو سـەعیدەوە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) ڕیوایـەتکراوە: کە پێغەمبـەر فەرمووی: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلْيَنْظُرْ فَإِنْ رَأَى فِي نَعْلَيْـهِ قَـذَرًا أَوْ أَذًى فَلْيَمْسَحْهُ وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا».[2] هەرکاتێك یەکێك لەئێوە هات بـۆ مزگـەوت ڕوانـی بە نەعل‌و پێڵاوەکانی‌یەوە پیسایی‌یەك هەیـە بـا لەشـتێکی بخشێنێ (لـەزەوی بخشێنێ) ئەمجار نوێژەکەی پێیانەوە بکا.

**٨- پاککردنەوەی زەوی پیس بوو:**

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: عـەرەبێکی دەشـتەکی هاتـە نـاو مزگەوتـەوەو چـوو لـە سوچـێکەوە میـزی کـرد، هـاوەڵان بـۆی ڕاپـسکوتن‌و دەنگیاندا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (دعـوه) وازی لێ بێنن میزکردنەکەی لێ تێك مەدەن «دَعُوهُ وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِـنْ مَـاءٍ ، أَوْ ذَنُوبًا مِنْ مَاءٍ ، فَإِنَّمَـا بُعِثْـتُمْ مُيَـسِّرِينَ ، وَلَـمْ تُبْعَثُـوا مُعَـسِّرِينَ».[3] کە کـابرای عەرەب لەمیزکردنەکەی بووەوە پێغەمبەر بەهاوەڵانی فەرموو: دۆڵکـەیێ ئـاو

---

[1] حسن {ص. جه ٤٠٩}، دەفەرموێ: (١/٣٨٥/٢٠٧)، ت (١/٧٦/١١٥)، جة(١/١٦٩/٥٠٦).

[2] صحيح: {ص. د ٦٠٥}، د (٢/٣٥٣/٦٣٦).

[3] متفق عليـه (الإرواء/١٧١) خ (١/٣٢٣/٢٢٠)، ن(٤٨ — ١/٤٩) ورواه مطولاً: د(٢/٣٩/٣٧٦)، ت (١/٩٩/١٤٧/٠).

مەسینەیەك ئاو بەسەر میزەكەیدا بكەن، ئێوە پێویستە ئاسانكاری رەچاو بكەن، داوای ئەوەتان لێ نەكراوە شت قورس بكەن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیە فەرمانی بەهاوەڵانی كرد ئاو بەسەر میزەكەدا بكەن تا بەزوترین كات شوێنەكە پاك ببێتەوە. ئەگینا ئەگەر وازیان لێ بهێنایە تا شوێنەكە وشك دەبووەوە ئەثەری پیسیەكەی نەدەما شوێنەكە پاك دەبووەوە، ئەمەش بەپێی حەدیثەكەی ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) كە دەفەرموێ: (كَانَتِ الْكِلَابُ تَبُولُ فِي الْمَسْجِدِ وَتُقْبِلُ وَتُدْبِرُ زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَلَمْ يَكُونُوا يَرُشُّونَ شَيْئًا)[1] لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) سەگەل لەناو مزگەوتا میزیان دەكردو هاوەڵان ئاویان بەشوێنی میزكردنەكەدا نەدەكردو ئاوڕشێنی شوێنەكەیان نەدەكرد. ئاشكراشە ئەگەر پیسیەكە لەو جێگە بمایەتەوە ئاوپێداكردنی واجب دەبوو.

هەركاتێ زبڵو زیخو مردارەوەبوو سوتێندراو بوو بەخۆڵەمێش و گڵ ئەوە پاكەو پیسی پێوە نامێنێ، بەڵگەی ئەوە دەڵێن: حوكمەكان بەگوێرەی ئەو بڕیارەیە كە خودا دەربارەیان چەسپاندویەتیو ناوی بۆ داناونو بەشێوەی خیطاب بەئێمەی گەیاندوە. هەركاتێ ئەو ناوەی لێ داڕندراو ناوێكی تری بۆ پەیدا بوو، حوكمەكەی پێشووی نامێنێ، جودایە لەو شتەی خودا حوكمی تێدا بڕیارداوە، زبڵو زاڵ جوداوازە لەگڵ، مردارەوەبوو جوداوازە لەگڵ.[2] كەوابوو لەگەڵ گۆڕانی ناوەكەیان حوكمەكەشیان دەگۆڕێ، ئەمە ڕای پەسەندكراوە بەلای ئیبنو تەیمیەو وتوویەتی: ئەمە ڕێبازو مەزهەبی ئەبو حەنیفەیەو رایەكی ئیمامی مالیكو ریوایەتێكە لەئیمام ئەحمەد.[3]

---

[1] صحيح {ص. د ٣٦٨} خ تعليقا (١٧٤/٢٧٨/١)، د (٣٧٨/٤٢/٢).

[2] المحلى لابن حزم ١٢/١٢٨/١.

[3] مجموع الفتاوى ج ٧٠/٢١ و ٤٧٨ و ٤٨٢.

## سونەنی فیترەت

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: الاِسْتِحْدَادُ وَالْخِتَانُ وَقَصُّ الشَّارِبِ وَنَتْفُ الإِبْطِ وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ».[1] پێنج ئاکارو رەفتار لەسروشتو فیترەتن‌و کاری باشن، لابردنی مووی خوار ناوك، خەتەنە، سمێڵ کورتکردنەوە، هەڵکەندنی مووی بن هەنگڵ، نینۆك کردن.

لەزەکەریای کوڕی ئەبو زائیدە ئەویش لەموصعەبی کوڕی شەیبەوە ئەویش لەطەلقی کوڕی حەبیبەوە، ئەویش لەئیبنو زوبەیدەوە لەخاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ وَالسِّوَاكُ وَالاِسْتِنْشَاقُ بِالْمَاءِ وَقَصُّ الأَظْفَارِ وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ وَنَتْفُ الإِبِطِ وَحَلْقُ الْعَانَةِ وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ». يَعْنِي الاِسْتِنْجَاءَ بِالْمَاءِ.[2] زەکەریا دەڵێ: موصعەب وتی دەیەمم لەبیر نەماوە، مەگەر ئاو لەدەم وەردان بێ.

## خەتەنەکردن

خەتەنە واجبە بۆ کوڕو بۆ کچ، چونکە شەعیرەو دابو نەریتێکی ئیسلامە، ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە بە کابرایەکی تازە موسوڵمانبووی فەرموو: «أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الْكُفْرِ وَاخْتَتِنْ».[3] کوڵك‌و توکی کوفر لەخۆت بکەرەوەو خۆت خەتەنە بکە.

---

[1] متفق عليه خ(١٠/٣٣٤/٥٨٨٩) م(١/٢٢١/٢٥٧) د(١١/٢٥٢/٤١٨٠) ت(٢٩٠٥/٤/١٨٤) ن(١/١٤)، جة(١/١٠٧/٢٩٢).

[2] حسن{مختصر م ١٨٢}، م(١/٢٢٣/٢٦١)و(١/٧٩/٥٢)ت(٤/١٨٤/٢٩٠٦) ن(١٣٦/٨).

[3] حسن: {ص. ج ١٢٥١}، د (٢/٢٠/٣٥٢)، هق (١/١٧٢).

خەتەنە دەستورو داب‌و نەریتی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمە، لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «اخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ خَلِيلُ الرَّحْمَنِ بَعْدَ مَا أَتَتْ عَلَيْهِ ثَمَانُونَ سَنَةً وَاخْتَتَنَ بِالْقَدُومِ».[1] حەزرەتی ئیبراهیم کە نازناوی (خليل الرحمن)ە دوای تەمەنی هەشتا ساڵ خۆی خەتەنە کرد. بێگومان پەروەردگار بە پێغەمبەری خۆی دەفەرموێ: {ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا – النحل/١٢٣}. ئەمجار نیگامان بۆ تۆ کرد ئەی پێغەمبەر کەشوێن ئایینی ئیبراهیم بکەوە ئاینێکی پاك‌و بێ خەوشە.

واباشە خەتەنە لەڕۆژی حەوتەمی لەدایکبووندا ئەنجام بدرێ، ئاماژە بەحەدیثی جابیر کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ حەسەن‌و حوسەین رۆژی حەوتەمی لەدایکبوونیان حەوتووی بۆ کردن‌و خەتەنەشی کردن[2].

لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە: کە فەرموویەتی: حەوت شت لەسوننەتی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی منداڵ لەڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونیدا، ناوی لێ بنرێ، خەتەنە بکرێ.[3]... هتد.

ئەو دوو حەدیثە، هەرچەندە هەردووکیان لاوازییان تێدایە، بەلام هەریەکەیان ئەویتر بەهێز دەکا، چونکە مەخرەج‌و زنجیرەی سەنەدەکەیان جوداوازە، لەهیچ کام لەزنجیرەی سەنەدەکانیاندا راوی تۆمەتباریان تێدا نیە.[4]

---

[1] متفق عليه: خ (١١/٨٨/٦٢٩٨)، م (٢٣٧٠).

[2] طص (٢/١٢٢/٨٩١) {تمام المنة ٦٨}.

[3] طس: (١/٣٣٤/٥٦٢) (تمام المنة/٦٨).

[4] تمام المنة/٦٨.

## ريش هێشتنەوە

ریش هێشتنەوە واجبە، تاشینی حەرامە، چونکە گۆڕینی دروستکراوی پەروەردگارە. ئەوە کارێکی شەیتانەو جێبەجێ کردنی ویستی ئەوە، کە دەڵێ: {وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ – النساء/١١٩}. لەلایەکی ترەوە تاشینی ریش خۆ شوبهاندنە بەئافرەت. لەکاتێکدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفرینی لەو پیاوانە کردووە کەخۆیان وا لێ دەکەن لەئافرەت بچن.[1]

لەهەمان کاتدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە بەریش هێشتنەوە، ئاشکراشە فەرمان بۆ وجوبەو پێویستی دەگەیەنێ.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «جُزُّوا الشَّوَارِبَ، وَأَرْخُوا اللِّحَى، خَالِفُوا الْمَجُوسَ».[2] سمێڵ کورت بکەنەوە، ریش بهێڵنەوە، پێچەوانەی ئاگرپەرستەکان هەڵسوکەوت بکەن.

لەئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ ، وَفِّرُوا اللِّحَى ، وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ».[3] پێچەوانەی بتپەرستەکان هەڵسوکەوت بکەن، ریش بهێڵنەوە سمێڵ کورت بکەنەوە.

## سیواك

سیواك هەموو کاتێك سوننەتە، لەهەندێ کاتدا پتر سوننەتە.

١- لەکاتی دەستنوێژ شتندا:

---

[1] صحيح: {ص. ج ٥١٠٠}، خ ١٠/٣٣٢/٥٨٨٥)، ت ٤/١٩٤/٢٩٣٥).

[2] صحيح: {مختصر م ١٨١}، م (١/٢٢٢/٢٦٠).

[3] متفق عليه (١٠/٣٤٩/٥٨٩٢)، م (٢٥٩ – ٥٤ – ١/٢٢٢).

لـه ئـەبو هـورەيرەوە ريوايـەتكراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ الْوُضُوءِ».[1]
ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوايە ئـەرك‌و زەحمـەتی زۆر دەکەوتـە سـەر ئومەتەکـەم فەرمانم پێ دەکردن بەوە کە لەگەڵ هەموو دەستنوێژێکدا سیواك بکەن.

٢- لەکاتی هەڵسان بۆ نوێژکردن:

له ئەبو هورەيرەوە ريوايەتكراوە کە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ».[2]
ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبوايـە دەبـووە بـارگرانی‌و ئـەرکی زۆر بەسـەر ئومەتەکەمـەوە، فـەرمانم پـێ دەکـردن کـە لەگـەڵ هـەموو نوێژێکدا سـيواك بکەن.

٣- لەکاتی دەستکردن بەخوێندنی قورئان:

لەئيمامی عەلی‌یەوە ريوايەتكراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردين بەسيواك کردن‌و فەرمووی: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا قَامَ يُصَلِّي أَتَاهُ الْمَلَكُ فَقَامَ خَلْفَهُ يَسْتَمِعُ الْقُرْآنَ وَيَدْنُو، فَلاَ يَزَالُ يَسْتَمِعُ وَيَدْنُو حَتَّى يَضَعَ فَاهُ عَلَى فِيهِ، فَلاَ يَقْرَأُ آيَةً إِلاَّ كَانَتْ فِي جَوْفِ الْمَلَكِ».[3] هەرکاتێ بەنـدەی موسـوڵمان هەڵـسا بـۆ نوێـژکردن‌و نوێـژی دابەسـت، فریـشتەيەك دێتـەلای‌و لەدواوەی ڕادەوەستێ، گوێ لەقورئان خوێندنی دەگرێ‌و لێی نزيـك دەبێتـەوە، بەردەوام گوێی لێ دەگرێ‌و لێی نزيك دەبێتەوە، هەتا وای لێ دێ دەم دەخاتـە

---

[1] صحيح: {ص ج ٥٣١٦}، حم (١/٢٩٤/١٧١).

[2] متفـق عليـه: م (١/٢٢٠/٢٥٢)، خ (٢/٣٧٤/٨٨٧) ، ت (١/١٨/٢٢). وەڵ دەقـی بوخـاری لەجياتی {عند كل صلاة}، {مع كل صلاة}.

[3] صحيح لغيره: {الصحيحة ١٢١٣} هق (١/٣٨).

سەر دەمی قورئانخوێنەکە، ئیتر وای لێ دێ هەر ئایەتێك بخوێنێ لەناو دەمی فریشتەکەدا دەیخوێنێ.

٤- لەکاتی چوونەوە بۆ ماڵو چوونە ژوورەوە:

لەمیقدامی کوڕی شورەیح ئەویش لەباوکیەوە ریوایەت دەکا کە دەڵێ: پرسیارم لەخاتوو عائیشە کرد وتم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵو دەهاتە ژوورەوە بەچی دەستی پێ دەکرد؟ لە وەڵامدا فەرمووی: بەسیواك کردن.[1]

٥- لەکاتی هەڵسان لەخەو:

لەحوذەیفەوە ریوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە هەڵدەستا بۆ شەونوێژ سیواکی دەکرد (دەمی خۆی بەسیواك پاك دەکردەوە).[2]

## هەڵکێشانی مووی سپی مەکرووهە

لەعەمری کوڕی شوعەیبەوە لەباوکیەوە، لەباپیریەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَنْتِفُوا الشَّيْبَ مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَشِيبُ شَيْبَةً فِي الإِسْلاَمِ، إِلاَّ كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ».[3] مووی سپی لەسەرو ریشی خۆتان هەڵمەکێشن، چونکە هەر موسوڵمانێك بەئیمانداری مووی سپی ببن ئەو سەرو ریش سپی بوونەی بۆ دەبێتە نوورو ڕوناکی ڕۆژی قیامەت.

---

[1] صحيح (ص. جه ٢٣٥)، م (١/٢٢٠/٢٥٣)، د (١/٨٦)، جه (١/١٠٦/٢٩٠).

[2] متفق عليه م (١/٢٢٠/٢٥٥) وهذا لفظه، خ (١/٣٥٦/٢٤٥)، جه (١/١٠٦/٢٩٠)، ن (١/٨) ولفظ الثلاثة {إذا قام من الليل}.

[3] صحيح: (ص. ج ٧٤٦٣)، (١١/٢٥٦/٤١٨٤)، ن (٨/١٣٦).

## گۆڕینی نیشانەی پیریو سپی بوونی مووی سەرو ڕیش بەخەنەو وسمەو شتی وا، نادروستی گۆڕینیشی بەرەنگی ڕەش

لە ئەبو زەڕەوە ریوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ أَحْسَنَ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّيْبَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ».[1] بێگومان باشترین شتێك كەئێوە مووی سپی سەرو ڕیشتانی پێ بگۆڕن خەنەو فلفلی قەرودە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لاَ يَصْبُغُونَ ، فَخَالِفُوهُمْ».[2] جولەكەو گاور سەروریشیان بەخەنەو وسمە ڕەنگ ناكەن ئێوە پێچەوانەی ئەوان هەڵسوكەوت بكەن.

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: ڕۆژی ڕزگاركردنی مەككە ئەبو قوحافە هێنرایە خزمەت پێغەمبەر سەروڕیشی وەكوو گوڵە ثوغامە سپی بوو، پێغەمبەر فەرمووی: «غَيِّرُوا هَذَا بِشَيْءٍ وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ». بەشتێك ڕەنگی سەرو قژی بگۆڕن، بەڵام با ڕەنگی ڕەش نەبێ.

لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «يَكُونُ قَوْمٌ يَخْضِبُونَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ بِالسَّوَادِ كَحَوَاصِلِ الْحَمَامِ لاَ يَرِيحُونَ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ»[3]: كەسانێك پەیدادەبن لە ئاخر زەمانا مووی سپی سەرو ریشیان بۆیە دەكەن بە دەرمانی ڕەش وەكوو پەڕی سەر سنگی

---

[1] صحیح (ص. ج١٥٤٦)، (د. ٤١٨٧/٢٥٩/١١)، (ت. ١٨٠٦/١٤٥/٣) جە (٣٦٢٢/١١٩٦/٢)... الكتم: ڕوەكێكە لە كێوەكانی ئەفەریقاو وڵاتە موعتەدیلەكان دەڕوێ، بەرێكی هەیە پێی دەگوترێ: (فلفل القرود) لەگەڵ خەنەو وسمەدا بۆ خەنەبەندان بەكاردەهێندرێن.

[2] صحیح: (ص. ج٤١٧٠)، م (٢١٠٢ – ٩٦ – ٣/١٦٦٣)، و (٤١٨٦/٢٥٨/١١).

[3] صحیح: (ص. ج٨١٥٣)، (٤١٩٤/٢٦٦/١١)، ن (٨/١٣٨).

کۆتر کە بەزۆری پەڕی سەرسنگیان ڕەش دەنوێنێ ئەوانە بۆنی بەهەشت ناکەن.

## دابو نەریتی چوونە سەرئاو

١- سوننەتە بۆ کەسێك دەیەوێ دەست بەئاو بگەیەنێ، بڵێ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ». بەناوی خودا، خودایە من پەنادەگرم بەتۆ لەپیسی‌و دژوێنی. ئەمەیش بەگوێرەی حەدیثەکەی ئیمامی عەلی خودای لێ ڕازی بێ. کە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «سَتْرُ مَا بَيْنَ أَعْيُنِ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ إِذَا دَخَلَ أَحَدُهُمُ الْخَلاَءَ أَنْ يَقُولَ بِسْمِ اللَّهِ».[1] پەردەو ساتری نێوان چاوی جندۆکەو شەرمگای ئادەمیزاد کە یەکێکیان چوو دەست بەئاو بگەیەنێ، ئەوەیە {بسم الله} بکاو ویردی چوونە سەرئاو بخوێنێ.

هەروا بەپێی ئەو فەرموودەی کە ئەنەس ڕیوایەتی دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەچوو دەست بەئاو بگەیەنێ دەیگوت «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ».[2]

٢- سوننەتە کە لەتەوالێت هاتە دەرەوە بڵێ: {غفرانك} خودایە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم، ئەمەیش بەگوێرەی حەدیثەکەی خاتو عائیشە کە دەڵێ: پێغەمبەری خودا کە لەئاودەستخانە دەهاتە دەرەوە دەیفەرموو: {غفرانك}[3] خودایە لێخۆشبوونی تۆم دەوێ.

---

[1] صحيح: (ص. ج٣٦١١)، ت (٢/٥٩/٦٠٣) وهذا لفظه، جه (١/١٠٩/٢٩٧) وعنده (إذا دخل الكنيف) بدلاً من (إذا دخل الخلاء).

[2] متفق عليه: خ (١/٢٤٢/١٤٢)، م (١/٢٨٣/٣٧٥) جه (١/١٠٩/٢٩٨) ت(١/٧/٦)، ن (١/٢٠).

[3] صحيح: (ص. ج/٤٧١٤)، د (١/٥٢/٣٠)، ت (١/٧/٧)، جه (١/١١٠/٣٠٠).

٣- سوننەتە کە دەچێتە سەر تەوالێت قاچی چەپی پێش بخا، کەدێتە دەر قاچی ڕاستی پێش بخا، چونکە هەمیشە لای ڕاست بۆ شتی بەڕێز بەکاردەهێندرێ، لای چەپ بۆ شتی بێ ڕێز. لەم بارەیەوە بەشێوەیەکی گشتی ئاسارو فەرموودە ڕیوایەتکراون.[1]

٤- ئەگەر دەست بەئاو گەیاندنەکەی لەساراو بەتاڵاییدا بوو، ئەوە واباشە ئەوەندە دووربکەوێتەوە نەبیندرێ.

لەجابیرەوە ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەرێکدا چووینە دەر، دەمبینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەئیشی سەرئاوی ببوایەو شوێنەکە دەشتو چۆڵەوانی بوایە، ئەوەندە دوور دەکەوتەوە نەبیندرێ.[2]

٥- سوننەتە بەپێوە عەورەتی خۆی هەڵنەماڵێ، تا لەزەوی نزیك نەبێتەوە خۆی هەڵنەماڵێ.

لەئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە بیویستایە دەست بەئاو بگەیەنێ، تا لەزەوی نزیك نەبوایەوە کراسەکەی هەڵنەدەماڵی.[3]

٦- دروست نییە لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا ڕوبکرێتە ڕۆگە یان پشتی تی بکرێ. لەساراو بیابان بێ یان لەناو بینادا بێ.

لە ئەبو ئەییوبی ئەنصارییەوە ڕیوایەتکراوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا أَتَيْتُمُ الْغَائِطَ فَلاَ تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ وَلاَ

---

[1] السبل الجرار ١/٦٤.

[2] صحيح: (ص. ج ٤٦٥٢)، (١/٣١/١٤)، من حديث أنس.

[3] صحيح (ص. ج ٤٦٥٢)، د (١/٣١/١٤)، ت (١/١١/١٤) من حديث أنس.

تَسْتَدْبِرُوهَا، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا ».[1] کەچوونە شوێنی دەست بەئاو گەیاندن نە رووبکەنە قیبلە نە پشتی تێ بکەن، بەڵکوو رووبکەنە خۆرهەڵات یان خۆرئاوا. ئەبو ئەییوبی ئەنصاری دەڵێ: ئێمە چووینە وڵاتی شام بینیمان ئاودەستیان بنیات نابوون روویان لەکەعبە بوو، ئێمە کە چووینە سەریان بۆ دەست بەئاو گەیاندن، خۆمان وەردەچەرخاند بەلای خۆرهەڵات یان خۆرئاوا بۆ ئەوەی لەوکاتەدا رووما لە کەعبە نەبێ‌و ئەستەغفیروڵڵامان دەکرد.

٧- هەروەها خۆ خاڵی کردن‌و پیسایی کردن لەسەر ڕێگای خەڵك‌و ژێر سێبەریاندا حەرامە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (اتَّقُوا اللاعِنين) خۆتان بپارێزن لەدوو شت کە دەبنە هۆی نەفرین لێ کردنتان، هاوەڵان عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو دوو شتە چین کە دەبنە هۆی نەفرین کردنی خەڵك لێمان؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ألذي يتخلّى في طريق النّاس أو في ظِلِّهِم)[2] ئەوکەسەی لەسەرە ڕێگا دەست بەئاو دەگەیەنێ یان لەژێر سێبەرو شوێنی حەسانەوەیان.

٨- مەکروهەو ناپەسەندە میزکردن لە حەمام‌و شوێنی خۆشتن.

لە حومەیدی ئەلحیمیەرییەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: توشی پیاوێك بووم هاوەڵی پێغەمبەری کردبوو، وەکوو چۆن ئەبو هورەیرە هاوەڵی پێغەمبەری

---

(1) صحيح: (مختصر م (١٠٩)، (ص. د/٧٠).

(2) صحيح: (ص. ج ١١٠)، د (١/٤٧/٢٥)، م (١/٢٢٦/٢٦٩) ولفظه: (اللعانين) قالوا وماللعانان)؟

کردووه. دەڵێ پێغەمبەری خودا نەی لەوە کردووە کەیەکێك لەئێمە هەمووی ڕۆژێ موی سەرو ریشی بەشانە بکا، یان لەشوێنی خۆشتنیدا میز بکا.[1]

٩- میزکردنە ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە حەرامە.

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لەوەی میز بکرێتە ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە.[2]

١٠- میزکردن بەپێوە دروستەو بەدانیشتنەوە باشترە.

لە حوذەیفەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشتە سەرانگوێلکی هۆبەو خێڵێكو بەڕاوەستانەوە میزی کرد، منیش دوورکەوتمەوە، فەرمووی: نزیك بەرەوە، نزیك بوومەوە هەتا وام لێ هات کەوتمە دوا پاژنە پێیەوە راوەستام، پاشان دەستنوێژی گرتو لەسەر خوفەکانی مەسحی کرد.[3]

بۆیە گوتمان دەست بەئاو گەیاندن بەدانیشتنەوە باشترە، چونکە ئەوە دابو نەریتی زۆربەو نیمچە هەمیشەیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووە، تەنانەت خاتو عائیشە فەرموویەتی (هەرکەس بۆی گێڕانەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەپێوە میزی کردووە، بڕوای پێ مەکەن. پێغەمبەر هەر بەشێوەی دانیشتنەوە میزی کردووە.[4]

قسەکەی خاتو عائیشە نەفی ئەو مانایە ناکا، کەحەدیثەکەی حوذەیفە دەیگەیەنێ، چونکە خاتو عائیشە هەواڵی لەشتێك داوە کە بینیویەتی.

---

[1] صحيح: (ص. ن ٢٣٢)، ن (١/١٣٠)، د (١/٥٠/٢٨).

[2] صحيح: (ص. ج ٦٨١٤)، م (١/٢٣٥/٢٨١)، ن (١/٣٤).

[3] متفق عليه: م (١/٢٢٨/٢٧٣)، ت (١/١١/١٣)، خ (١/٣٢٩/٢٢٥)، ن (١/١٩)، د (١/٤٤/٢٣)، جه (١/١١١/٣٠٥).

[4] متفق عليه: خ (١/٣١٧/٢١٦)، م (١/٢٤٠/٢٩٢)، ت (١/٤٧/٧٠).

حوزەیفەیش هەواڵی لەوە داوە کە دیویەتی. ئاشکراشە قسەی چەسپێنەر پێش دەخرێ بەسەر قسەی نەفی کاردا، چونکە چەسپێنەر زێدە زانیاری هەیە. (ان المثبت مقدم علی النا في لان معه زيادة علم).

١١- خۆ پاککردنەوە لەمیز پێویستە.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی، فەرمووی: « إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَنْزِهُ مِنْ بَوْلِهِ وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِين النـاس بِالنَّمِيمَةِ».[1] ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن، سزادانەکەشیان بەهۆی تاوانی گەورەوە نییە، یەکێکیان لەسەر ئەوە سزا دەدرێ: کەخۆی لەمیز پاك نەکردۆتەوە، ئەویتریان لەسەر ئەوە سزا دەدرێ: کەفیتنەیی لەنێوانی خەڵکدا کردووە.

١٢- نابێ لەکاتی میزکردندا بەدەستی ڕاستی ذەکەری خۆی بگرێ، هەروا نابێ بەدەستی ڕاستی خۆی پاك بکاتەوە.

لە ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ وَلاَ يَسْتَنْجِ بِيَمِينِهِ».[2] ئەگەر یەکێك لەئێوە میزی کرد، با بەدەستی ڕاستی ذەکەری خۆی نەگرێ هەروا بەدەستی راستی خۆی پاك نەکاتەوە.

١٣- دروستە خۆپاککردنەوە بەئاو یان بە بەردو هەرشتێکی لەو جۆرە. بەڵام بەئاو چاکترە.

---

[1] متفق عليه: خ (١/٣١٧/٢١٦)، م (١/٢٤٠/٢٩٢)، ت (١/٤٧/٧٠)، د (١/٤٠/٢٠).

[2] صحيح: (ص. جـه. ٢٥٠)، جـه (١/١١٣/٣١٠) هـذا لفظـه ورواه: خ (١/٢٥٤/١٥٤)، م (٢٦٧/١/٢٢٥)، د (١/٥٣/٣١)، ت (١/١٢/١٥) مطولاً مختصراً.

له ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچووە سەرئاو، ئەمن و کوڕێکی تر لەتەمەنی مندا دۆڵچە ئاوو گۆچانەکەمان بۆ هەڵدەگرت، دەمدی بەئاو خۆی پاك دەکردەوە.[1]

هەروا لە خاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا ذَهَبَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْغَائِطِ فَلْيَذْهَبْ مَعَهُ بِثَلاَثَةِ أَحْجَارٍ يَسْتَطِيبُ بِهِنَّ فَإِنَّهَا تُجْزِئُ عَنْهُ».[2] ئەگەر یەکێك لەئێوە چوو دەست بەئاو بگەیەنێ، با لەگەڵ خۆی سێ بەرد بەرێ خۆیان پێ پاك بکاتەوە، ئەوە کیفایەتیەتی.

١٤- نابێ بە کەمتر لەسێ بەرد خۆ پاك بکاتەوە.

له سەلمانی فارسییەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) هاتووە: کە لێی پرسیار کراو پێی گوترا: ئێوە پێغەمبەرەکەتان هەموو شتێکی فێر کردوون تەنانەت چۆنیەتی میزو پیسایی کردن و دەست بەئاو گەیاندن! وتی بەڵێ: بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لێ کردووین کە لەکاتی میز کردن و پیسایی کردندا ڕوو بکەینە قیبلە یان پشتی تێ بکەین. هەروا نەهی لێ کردووین کە بەدەستی ڕاست خۆمان پاك بکەینەوە، یان بەکەمتر لەسێ بەرد خۆمان پاك بکەینەوە، یان بەتەپاڵەو تەرسەقول و شتی وا خۆمان پاك بکەینەوە. یان بەئێسقان.[3]

١٥- دروست نییە بەئێسقان و تەپاڵەو قشپل و شتی وا خۆپاك بکەینەوە.

---

[1] متفق عليه: خ (١/٢٥٢/١٥٢)، م (١/٢٧١،٢٢٧)، ن (١/٤٢) وليس عند ذكر العنزة.

[2] صحيح: (ص.ن ٤٣) ن(١/٤٢)، د (١/٦١/٤٠).

[3] صحيح: (ص. جه ٢٥٥)، م (١/٢٢٣/٢٦٢)، ت (١/١٣/١٦)، د (١/٢٤/٧)، جه (١/١١٥/٣١٦)، ن (١/٣٨).

لەجابیرەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەوەی بۆ خۆپاك کردنەوە لەمیزو پیسایی ئێسقانو قشپڵو تەپاڵەو شتی وا بەکاربهێندرێو مەسحی شوێنی لێ هاتنە دەرەوەی پیساییەکەی پێ بکرێ.[1]

١٦- سوننەتە دوای دەست بەئاو گەیاندنو خۆپاککردنەوە ئاو لە نافۆکی برشێنێ. بەم جۆرە کەمێك ئاو بە لوێچی لەنافۆکی بڕشێنێ بۆ ئەوەی وەسوەسەو خوتەخوت لەخۆی دوور بخاتەوە.[2]

لە سوفیانی کوڕی ئەلحەکەم ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کە دەچوو سەرئاو میزی دەکرد، دوایی دەستنوێژی دەگرتو ئاوی لەنافۆکی خۆی دەڕشاند[3]. لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ڕیوایەتکراوە کەپیاوێك هاتە لای ئیبنو عەبباس وتی: من کە هەڵدەستم بۆ نوێژ هەست بەتەڕایەك دەکەم، ئیبنو عەبباس پێی گوت: بە پیاڵە ئاوێك نافۆکی خۆت بڕشێنە، دوایی کە هەستت بەتەڕایی کرد دڵی خۆت ببەرە سەر ئەوە کە تەڕاییەکە لەوەوەیە. پیاوەکە ڕۆیی‌و ماوەیەکی پێ چوو دوایی هاتەوە بۆلای ئیبنو عەبباس پێی وابوو ئەو وەسوەسەو ختوکەیەی نەماوە.[4]

---

[1] صحيح: (ص. ج ٦٨٢٧)، م (١/٢٢٤/٢٦٣)، د (١/١٠/٣٨).

[2] فتح الباری (١١/٣٣٨).

[3] صحيح: (ص. د ١٥٢)، د (١/٢٨٥/١٦٥)، ن (١/٨٦) جه (١/١٥٧/٤٦١)، هق (١/١٦١).

[4] هق (١/١٦٢).

## باسی قاپو قاچاغی ناو ماڵ
## (باب الآنية)

بەکارهێنانی قاپو قاچاغی ناوماڵ لەهەر مادەیەك بێ دروستە جگە لە قاپو قاچاغی لەزێڕو زیو دروستکراو، ئەوەی لەو دوو مادەیە دروست کرا بێ خواردنو خواردنەوەیان تێدا حەرامە، بەڵام بەکارهێنانیان بۆ مەبەستی تر حەرام نییە.

لە حوذەیفەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لاَ تَشْرَبُوا فِى آنِيَةِ الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ ، وَلاَ تَلْبَسُوا الدِّيبَاجَ وَالْحَرِيرَ ، فَإِنَّهُ لَهُمْ فِى الدُّنْيَا وَلَكُمْ فِى الآخِرَةِ».[1] لەقاپو پیاڵەی زێڕو زیودا شت مەخۆنەوە، ئاوریشمو دێباج مەپۆشن، ئەوە لەدونیادا بۆ ئەوانی ناموسوڵمانەو لەقیامەت بۆ ئێوەیە.

لە ئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « الَّذِى يَشْرَبُ فِى إِنَاءِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِى بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ». رواه البخاری ومسلم، ولمسلم: « أَنَّ الَّذِى يَأْكُلُ أَوْ يَشْرَبُ فِى آنِيَةِ الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ ». ئەو کەسەی لەقاپو پیاڵەی زیودا شت بخواتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخ هەڵدەقوڕێنێتە ورگی خۆیەوە، دەقی ئیمامی موسلیم بەم شێوەیە (ئەوکەسەی شت دەخوا یان دەخواتەوە لەقاپو پیاڵەی زیوو زێڕدا........).

ئیمامی موسلیم دەفەرموێ: لەدەقی حەدیثی هیچ کامێ لەوانەی ئەو فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە باسی {ألأكل}و {الذهب}ی تێدا نیە جگە لەحەدیثی (ئیبنو مسهر).

---

[1] متفق علیه: خ (١٠/٩٦/٥٦٣٣)، م (٣/١٦٣٧/٢٠٦٧)، ت (٣/١٩٩/١٩٣٩)، د (١٠/١٨٩/٣٧٠٥)، جه (٢/١١٣٠/٣٤١٤) بدون النهی عن الحرية والديباج، ن (٨/١٩٨).

شێخی ئەلبانی دەڵێ: ئەم زێدەیە شازو دەگمەنە لەڕوی ڕیوایەتەوە هەرچەندە لەڕوی دیرایەتەوە ماناکەی صەحیحە. چونکە ئاشکرایە {ألأكل}و {الذهب} کاریگەریان زیاترە لە (خواردنەوە) و لە (زیو).[١]

## خۆپاککردنەوەو دەستنوێژگرتن بۆ نوێژ
## (الطهارة للصلاة)

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ).[٢] بەبێ دەستنوێژگرتنو خۆپاککردنەوە نوێژ دروست نیەو لای خودا قبوڵ نابێ.

خۆ پاککردنەوەو دەستنوێژگرتن دوو جۆرە: (خۆپاککردنەوە بەئاو، خۆپاککردنەوە بەخاک).

یەکەم: خۆ پاککردنەوە بەئاو: دەستنوێژگرتن، غوسڵ کردن.

## دەستنوێژو چۆنیەتی بەئەنجامدانی

لە حومرانەوە - کە مەولای عوسمان بووە - ڕیوایەتکراوە دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خودای لێ بێ) داوای ئاوی کرد بۆ دەستنوێژ گرتن، ئاویان بۆ هێنا هەردوو دەستی تا مەچەکی سێ جار شت. پاشان ئاوی لەدەمی وەرداو ئاوی لە لوتی رادا، ئەمجار سێ جار دەموچاوی خۆی شتن، پاشان سێ جار دەستی ڕاستی خۆی لەگەڵ ئەنیشکیدا شتن، ئەمجار دەستی چەپیشی بەوجۆرە شت، پاشان دەستی تەڕی بەسەر سەری خۆیدا هێنا، ئەمجار قاچی ڕاستی تا قولەپێی سێ جار شتن، پاشان قاچی چەپیشی

---

[١] الإرواء: ١/٩٦.

[٢] متفق عليه: م (١/٢٠٤/٢٣٦) وهذا لفظه، خ (١/٢٦٦/١٦٤)، د (١/١٨٠/١٠٦)، ن (١/٦٤).

بەوجۆرە شت، ئەمجار فەرمووی: پێغەمبەرم دیوە بەم دەستنوێژ گرتنەی من دەستنوێژی دەگرت. پاشان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».[1] کەسێك دەستنوێژ بگرێ بەم شێوە دەستنوێژ گرتنەی من، پاشان دوو ڕکات نوێژ بکا تێیاندا خەیاڵی نەڕوا بەملاو ئەولادا ئیللا لەتاوانی لەوەپێشی لێخۆشبوونی بۆ دەستەبەر دەبێ.

ئیبنو شیهاب دەڵێ: زانایانی ئیسلام فەرموویانە: ئەم دەستنوێژ گرتنە تەواوترین دەستنوێژ گرتنە کە یەکێك پەیڕەوی بکاو ئاوا دەستنوێژ بگرێ.

## مەرجەکانی صیحەتی دەستنوێژ

١- نیەتهێنان، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ».[2] کردەوە بەگوێرەی نیەتە، هەموو کردارێك بەگوێرەی نیاز پاداش و سزای لەسەر وەردەگیرێتەوە. نیەت بەدڵەو پێویست ناکا بەزوبان بیڵێ، چونکە لە پێغەمبەرەوە نەچەسپاوە.

٢- بیسمیلا کردن لەسەرەتای دەستنوێژ گرتندا. ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لاَ وُضُوءَ لَهُ وَلاَ وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى عَلَيْهِ».[3] نوێژ بەبێ دەستنوێژ دروست نیە، دەستنوێژگرتنیش بەبێ بیسمیلا کردن لەسەرەتای دەستپێکردنیدا، نایەتەدی.

---

[1] متفق علیه: م (١/٢٠٤/٢٢٦) وهذا لفظه. خ (١/٢٦٦/١٦٤)، د (١/١٨٠/١٠٦).

[2] متفق علیه: خ (١/٩/١)، م (٣/١٥١٥/١٩٠٧)، د (٦/٢٨٤/٢١٨٦)، ت (١٦٩٨/٣/١٠٠).

[3] حسن: (ص. جه ٣٢٠)، د (١/١٧٤/١٠١)، جه (١/١٤٠/٣٩٩).

عەللامـەی دەهلـەوی لـەکتێبی (حجـة الله البالغـة ١/١٧٥)دا دەفـەرموێ: ئەمە دەقێکی صەریحە لەسەر ئەوە کە: (بیسمیلا کـردن) روکنـی دەسـتنوێژە، یـان مـەرجی سـەرەکیەتی، دەشـگونجێ مانـای فەرموودەکـە ئـەوەبێ: دەسـتنوێژگرتن بـەبێ (بیـسمیلا کـردن) تـەواو نابـێ، بـەڵام مـن ئـەم مانـاو تەئویلە ناچێ بەدڵداو پێم وایـە مانایـەکی دوورەو ئـەو وشـەو ڕستەیە ئـەو مانایە لەخۆ ناگرێ.

٣- مـوالات لـەنێوان شـتن‌و مەسـحکردنی ئەنـدامی دەسـتنوێژدا. واتـە: بەشوێن یەکتردا ئەندامەکانی جەستەی بەبێ وەغراندن بـشۆرێ یـان مەسـحی بکـا. ئەمـەیش بـەپێی ئـەو حـەدیثـەی خالیـدی کـوڕی مەعـدان ریوایـەتی کـردووەو دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پیـاوێکی بینـی دەستنوێژی شتبوو نوێژی دەکرد، بە ئەندازەی درەمێك لەپشتە پێی ئاوی ڕێ نەکەوتبوو، ئەوەبوو پێغەمبەر فەرمانی پـێ کـرد سـەرلەنوێ دەسـتنوێژەکەی بشواتەوەو نوێژەکەشی دووبارە بکاتەوە.[1]

ئەگـەر مـوالات‌و بەشـوێن یەکـدا شـتن واجـب نەبوایـە، تـەنها شـتنی ئـەو پارچـەیەی ئـاوی نـەرێ کـەوتبوو کیفایـەت بـوو، لەلایـەکی تـرەوە دەسـتنوێژ عیبـادەت‌و خوداپەرسـتیە، نەشـتنی بەشـێك لـەو شـوێنانەی شـتنیان واجبـە دەستنوێژەکە پوچەڵ دەکاتەوە. لەبەرئەوە مـوالات لەشـتنی ئەندامەکانـدا بـە مەرج دانراوە، لەلایـەکی تـرەوە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هـەر بەشـێوەی مـوالات دەسـتنوێژی گرتـووەو فەرمانیـشی بـەو کەسـە کـردوە کـە پەیڕەوی موالاتی نەکردبوو کە دەستنوێژەکەی دووبارە بکاتەوە.[2]

---

[1] صحيح: (ص. د ١٦١)، د (١/١٩٦/١٧٣).

[2] المغني لابن قدامة (١٣٨ ء ١/١٣٩).

## فەرزەكانی دەستنوێژ

١ ، ٢- شتنی دەمو چاو وێڕای ئاو لەدەم رادانو ئاو لەلوت رادان.

٣- شتنی هەردوو دەست تا ئەنیشك دەبێ ئەنیشكیش بشۆرێ.

٤ ، ٥- مەسحكردنی سەر هەمووی؛ هەردوو گوێچكەش دەچنە چوارچێوەی مەسحەكەوە.

٦- شتنی هەردوو قاچ هەتا قولەپێ.

پەروەردگار دەفەرموێ: (إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ).[1] ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە بە تاكو تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد هەركاتێك ویستتان نوێژبكەن دەستنوێژ بگرن بەم جۆرە: روخسارتان بشۆرن، ئەمجار هەردوو دەستتان لەگەڵ هەردوو ئانیشكتاندا بشۆرن، بە ئاوێكی تازە دەستی تەڕ بهێنن بەسەر سەرتانداو سەرتان تەڕبكەن، ئەوجا قاچەكانتان لەگەڵ قولەپێتان بشۆرن.

ئەوە كەگوترا: ئاو لەدەم رادانو ئاو لە لوت وەردان دەچنە چوارچێوەی شتنی دەمو چاو لەم رووەوەیە: كە پەروەردگار لە قورئاندا فەرمانی كردووە بەشتنی دەمو چاو، ئەوەش چەسپاوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەردەوام لەگەڵ شتنی دەمو چاوی ئاو لەدەم رادانو ئاو لەلوت وەردانی ئەنجام داوە، هەموو ئەوانەی شێوەی دەستنوێژ هەڵگرتنی پێغەمبەریان ریوایەتكردووە چۆنیەتی شتنی ئەندامەكانی دەستنوێژی ئەویان رونكردۆتەوە، ئاو لەدەم رادانو ئاو لەلوت وەردانیان باس كردوە. ئەمە ئەوە

---

[1] المائدة/٦.

دەگەیەنێ: کە فەرمان کردن بەشتنی دەمو چاو لە قورئاندا ئاو لەدەم وەردانو ئاو لەلوت وەردانیش دەگرێتەوە.[١]

لەلایەکی ترەوە لە فەرمودەیەکدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەئاو لەدەم رادانو ئاو لەلوت وەردان کردوە لەگەڵ شتنی دەمو چاودا. دەفەرموێ: «وَإِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ مَاءً ثُمَّ لِيَنْتَثِرْ». [٢] ئەگەر یەکێك لەئێوە دەستنوێژی گرت با ئاو لەلوتی راداو پاشان فم بکا. هەروا لەفەرمودەیەکی تریدا دەفەرموێ: « بَالِغْ فِي الِاسْتِنْشَاقِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِمًا». [٣] زێدەڕەوی بکە لەئاو لەلوت وەرداندا مەگەر بەڕۆژوبێ. هەروا ئاماژە بە فەرموودەیەکی تر: کە دەفەرموێ: « إِذَا تَوَضَّأْتَ فَمَضْمِضْ»[٤]: کە دەستنوێژت گرت ئاو لەدەم رادە (واتە: لەگەڵ شتنی روخسار ئاو لەدەمت رادە).

پێویستی مەسحکردنی هەموو سەر لەبەر ئەوەیە فەرمان بە مەسحکردنی سەر لە قورئاندا موجمەلە پێویستە رون بکرێتەوە بە حەدیث، لە صەحیحەینو شوێنی تریش ئەوە چەسپاوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مەسحی هەموو سەری کردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە لە دەستنوێژ گرتندا پێویستە هەموو سەر مەسح بکرێ.

لە عەمری کوڕی یەحیای مازنییەوە ئەویش لە باوکییەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پیاوێك بە عەبدوڵلای کوڕی زەیدی گوت – کە باپیری عەمری

---

[١] السبل الجرار/١/٨١

[٢] صحيح: (ص.ج٤٤٣)، د(١٤٠/٢٣٤/١)، ن(١/٦٦).

[٣] صحيح (ص. د ١٢٩، ١٣١)، د(١٤٢/١٤٤/١).

[٤] صحيح (ص. د ١٢٩، ١٣١)، د(١٤٢/١٤٤/١).

کوڕی یەحیایە – ئەریَ دەتوانی پێم بڵێی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن دەستنوێژی هەڵدەگرت؟

عەبدوڵڵای کوڕی زەید وتی: بەڵێ. ئەوەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای گرد ئاویان بۆهێنا، هەردوو دەستی تا مەچەکی دووجارشتن، پاشان ئاوی لەدەم راداو ئاوی لە لوت وەردا سێ جار. ئەمجار سێ جار روخساری خۆی شت. پاشان دووجار دەستی بە ئانیشکیەوە شتن. ئەمجار دەستی تەڕی بەسەر سەری خۆیدا هێنا بۆ دواوەو بۆ پێشەوە، لەپێشە سەرییەوە دەستی تەڕی دەبرد بۆ پاشە سەری‌و پشتە ملی، ئەمجار دەیهێنایەوە پێشە سەری. پاشان هەردوو قاچی بە قولە پێکانیشیەوە شت.[1]

ئەگەر بگوترێ: لەو حەدیثەدا کە موغەیرە ڕیوایەتی کردوە، ئەوە دەگەیەنێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوچەوان‌و پێشە سەری مەسح کردوە، لەسەر میزەرەکەیەوە مەسحی کردوە؛

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە دەڵێین: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە بیندراوە تەنها پێشە سەری مەسح کردوە، ئەوە باقی سەری لەسەر میزەرەوە مەسح کردوە، ئێمەیش ئەوە دەڵێین: حەدیثەکەی موغەیرە ئەوە ناگەیەنێ: کە تەنها پێشە سەری مەسح کردبێ یان بەشێکی مەسح کردبێ، بەبێ ئەوەی باقی سەری لەسەر مێزەرەوە مەسح نەکردبێ.[2]

---

[1] متفق علیه: خ(١/٢٨٩/١٨٥)، م(٢٣٥/٢١٠، ١/٢١١)، د(١/٢٠٨/٢٠٥/١١٨)، ت(١/٢٥/٣٢)، ن(١/٧٢/٧١) جة(١٤٩/٤٣٤ و ١/١٥٠).

[2] تەفسیری ئیبنو کەثیر (٢/٢٤).

بـەكورتی مەسـح كردنـی سـەر هـەمووی واجبـە[1] ئـەمجار مەسـحكەر بەویستی خۆی دەتوانێ سەری مەسح بكا، دەتوانێ لەسـەر مێـزەرەوە مەسـحی بكا، دەتوانـێ هەنـدێكی سـەری مەسـح بكـاو بـاقی مانـدەی لەسـەر مێـزەرەوە مەسح بكا، هەموو شێوەكان صەحیح‌و راست‌و دروستن.

باسـی ئـەوە كـە دوو گوێـچكە داخلـی سـەرن‌و دەبـێ مەسـح بكـرێن، فەرموودەی پێغەمبـەرە كـە دەفـەرموێ: «الأُذُنَـانِ مِـنَ الـرَّأْسِ». دوو گوێـچكە بەشێكن لەسەرو مەسح كردنیان واجبە.

لەم حەدیثـەی دوایـی دێ چۆنیەتی مەسـح كردنـی گوێـچكەمان بـۆ رون دەكاتەوە.

لە عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی (العاص) ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پیاوێـك هاتــە لای پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســـەر بــێ) عــەرزی كــرد: ئــەی پێغەمبــەری خــودا! دەســتنوێژ گــرتن‌و خـۆ پاككردنــەوە لــەبێ دەســتنوێژی چۆنە؟ تەشریفی داوای ئاوی كرد لەمەسینەیەكدا بۆیان هێنا، سەرەتا سێجار دەسـت‌و مەچـەكی شـتن، پاشـان سـێجار دەم‌و چـاوی شـتن، ئـەمجار سـێجار مەچەك‌و باسكی خـۆی شـتن، پاشـان مەسـحی سـەری كـرد، هـەردوو پەنجـەی شایەتومانی خستە ناو گوێچكەیەوەو بەهەردوو قامكە گەورەی مەسحی دیوی دەرەوەی گوێـچكەكانی كـرد، پاشـان هـەردوو قاچـی بەقولـە پێیـەوە سـێجار سێجار شتن. ئەمجار فەرمووی: « هَكَذَا الْوُضُوءُ فَمَنْ زَادَ عَلَى هَذَا أَوْ نَقَصَ فَقَدْ

---

[1] بـەلای مەزهـەبی شـافیعیـیـەوە بەشـێكی سـەر – بـا كـەمیش بـێ – مەسـح بكـرێ كیفایەتە.

أَسَاءَ وَظَلَمَ  أَوْ ظَلَمَ وَأَسَاءَ». دەستنوێژگرتن ئاوایە کەسێك لێی زیاد بکا، یان لێی کەم بکاتەوە ستەمی کردوە.[1]

٧- بەدەستی تەڕ هاژنینەوەی ریش (واتە پەنجە خستنە ناو ریش). ئەمەش بەپێی حەدیثی ئەنەسی کوڕی مالیك: کە دەڵێ: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەستنوێژی دەگرت لوێچێکی ئاو هەڵدەگواستو دەستی تەڕی دەخستە ژێر مووی ریشیەوەو هەوڵی دەدا بنکی مووەکان باش تەڕببنو دەیفەرموو: «هَكَذَا أَمَرَنِي رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ ».[2] پەروەردگارم ئاوا فەرمانی پێ کردم.

٨- ئاژنینەوەی نێوان پەنجەکانی دەستو قاچ. ئەمەش بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ): کە فەرموویەتی: «أَسْبِغِ الْوُضُوءَ وَخَلِّلْ بَيْنَ الأَصَابِعِ وَبَالِغْ فِي الاِسْتِنْشَاقِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِمًا ».[3] بەباشیو بەتەواوی دەستنوێژ بشۆرەوە، نێوانی پەنجەکانی دەستو قاچت بئاژنەوە، زێدەڕەوی بکە لەئاو لەدەم وەرداندا مەگەر بەڕۆژوبێ.

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: {لتنهكُنّ الأصابع بالطهور، أو لتَنْهكَنّها النار}[4] بەئاو باشباش نێوان پەنجەکان دەهاژننەوە، یان رۆژی قیامەت ئاگر دەچێتە ناویانەوەو بەئاگر دەئاژێندرێنەوە.

---

[1] حسن صحيح دون قوله (أو نقص) فأنه شاذ (ص.د/١٢٣، د ١/٢٤٥/١٣٥). (جة ١/١٤٦/٤٢٢).

[2] صحيح: (الإرواء/٩٢)، د(١/٢٤٣/١٤٥)، هق(١/٥٤).

[3] صحيح: لەباسی فەرزی دەستنوێژدا ئاماژەی پێ کرا.

[4] حسن صحيح (ص. تغ: ٢١٨)، طس (٣/١٩١/٢٦٩٥).

## چۆن پەنجەی قاچەكانی دەهاژێنێتەوە؟

لـە (ألـمستورد)ی كـوڕی شـەددادەوە ڕیوایـەتكراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەرم (دروودی خودای لەسەر بێ) بینی ناو پەنجەكانی قاچی بـە پەنجە بچكۆلەی دەئاژنیەوە.[1]

## سوننەتەكانی دەستنوێژ

١- سـیواك كـردن: لـە ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: « لَـوْلاَ أَنْ أَشُـقَّ عَلَـى أُمَّتِـي لأَمَـرْتُهُمْ بِالـسِّوَاكِ مَـعَ كُـلِّ وضـوء».[2] ئەگـەر لەبەرئـەوە نەبوایـە دەبـوە ئـەركی زۆر بەسەر ئوممەتمەوە فەرمانم پێ دەكـردن لەگـەڵ هـەموو دەسـتنوێژ گرتنێكـدا سیواك بكەن.

٢- شتنی هەردوو دەستو مەچەك سێجار لەسەرەتای دەسـتنوێژگرتندا چونكە چەسپاوە لە عوسمـانی كوڕی عەففانـەوە: كـە باسـی دەسـتنوێژگرتنی پێغەمبەری گێڕایەوە، دەڵێ: پێغەمبەر سێجار دەستو مەچەكی شتن.[3]

٣- كۆكردنەوە لەنێوان ئاو لەدەم رادانو ئاو لەلوت وەردان بەیـەك لوێـچ ئاو سێجار. ئاماژە بە حەدیثی عەبـدوڵلای كوڕی زەیـد دەربـارەی فێركردنـی چۆنیەتی دەستنوێژ گرتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): كە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە لوێـچێك ئـاو ئـاو لـەدەم رادانو ئـاو لە لوت وەردانی ئەنجامدا سێجار.[4]

---

[1] صحيح (ص.جة: ٣٦٠)، جة(١/١٥٢/٤٤٦)، د(١/٢٥٢/١٤٨).

[2] صحيح: لەباسی سیواكدا تێپەڕی.

[3] صحيح: لەوەپێش لەباسی چۆنیەتی دەستنوێژدا باس كرا.

[4] صحيح: (مختصر.م/ ١٢٥)، (١/٢١٠/٢٣٥).

٤- زێدەڕەوی كردن لەئاو لەدەم رادانو ئاو لەلوت وەردان بۆ كەسێك بەڕۆژو نەبێ. بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە دەفەرموێ: (وَبَالِغْ فِي الِاسْتِنْشَاقِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِمًا).[١]

٥- پێش خستنی لای راست بەسەر لای چەپدا. ئاماژە بە حەدیثی خاتو عائیشە: كە دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا، راست پێشخستنی پێ خۆش بوو لەهەموو شتێكدا؛ لە پێلاو لەپێ كردندا لە بەشانەكردندا، لەشتنی ئەندامەكانی جەستەی دا، لەهەموو كاروبارێكی دا.[٢]

هەروەها بەگوێرەی حەدیثی عوسمان كە لەمیانەی گێڕانەوەی چۆنیەتی دەستنوێژ هەلگرتنی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەڵێ: تەشریفی لای راستی شت، ئەمجار لای چەپی شت.

٦- دەست پێداهێنانی ئەو ئەندامانەی جەستە: كە لە دەستنوێژدا دەشۆردرێن. ئەمەش بەپێی حەدیثی عەبدوڵلای كوڕی زەید: كە بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ سێیەكەمودێك ئاو هێنرایە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستنوێژی پێ شت، لەكاتی دەستنوێژ گرتنەكەیدا دەستی بە ئەندامەكانی جەستەیدا دەهێنا دەستەكانی رێی باسكی دەخستن.[٣]

٧- شتنەكانی ئەندامی دەستنوێژ سێ جار، لەبەر حەدیثی عوسمان كە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستنوێژی هەلگرت سێ جار سێ جار ئەندامەكانی جەستەی شتن، ئەوەش چەسپاوە: كە تەشریفی

---

[١] صحیح: (لەباسی فەرزەكانی دەستنوێژدا تێپەڕی).

[٢] متفق علیه: (١٦٨/١/٢٦٩)، م(٢٦٨/١/٢٢٦)، (٤١٢٢/١٩٩/١١)، ن(١/٧٨).

[٣] اسناده صحیح: (ص.خز: ١١٨/١/٦٢).

دەستنوێژی گرتووە یەکجار یەکجار ئەندامەکانی شتووە، وایش بووە دووجار دووجار شتونی.[١]

سوننەت وایە مەسحکردنی سەر دووبارەو سێ بارە بکرێتەوە، چونکە لە عوسمانەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستنوێژی گرت سێ جار مەسحی سەری کرد. وتی پێغەمبەرم بینی ئاوا دەستنوێژی هەڵگرت.[٢]

٨- تەرتیبو یەك بەدوای یەکدی شتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ. چونکە زۆربەی دەستنوێژگرتنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەرتیبی تێدا بووە، هەموو ئەوانەی شێوەی دەستنوێژهەڵگرتنی پێغەمبەریان گێڕاوەتەوە ئەومیان چەسپاندووە. بەڵام لەهەمان کاتدا ئەوەش چەسپاوەو لە (ألمقدام)ی کوڕی مەعدیکەریبەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بڕێ ئاوم هێنایە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی دەستنوێژی هەڵگرت. سەرەتا دەستو مەچەکی سێ جار شتن. ڕوخساری سێ جار شت، پاشان هەردوو باسكو قۆڵی سێ جار شتن، پاشان ئاوی لەدەمی ڕاداو ئاوی لە لوتی وەردا سێ جار، پاشان مەسحی سەریو دوو گوێچکەی کرد.... تا کۆتایی حەدیثەکە.[٣]

٩- نزاو پاڕانەوەی پاش دەستنوێژگرتن. بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُسْبِغُ الْوُضُوءَ ثُمَّ يَقُولُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ

---

[١] حسن صحيح: (ص. د ١٢٤)، خ (١/٢٥٨/١٥٨) من حديث عبدالله بن زيد، د (١٣٨/١/٢٣٠) ت (١/٣١/٤٣) من حديث ابى هريرة.

[٢] حسن صحيح: (ص. د ١٠١)، د (١/١٨٨/١١٠).

[٣] صحيح: (ص. د ١١٢)، د (١/٢١١/١٢١).

مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ». [١] تیرمزی ئەمەشی لێ زیاد کردووە «اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ» واتە: هەر یەکێك لەئێوە دەستنوێژ بگرێ بەتەواوی دەستنوێژەکەی تەواو بکا، پاشان بڵێ: شایەتی دەدەم هیچ خودا نین جگە لە (الله) تاكو تەنیاو بێ هاوەڵو بێ شەریکە. هەروا شایەتی دەدەم حەزرەتی موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایەئەوە بێگومان هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ والآ دەکرێن لەکامەیانەوە بچێتە ژوورەوە بچێتە ژوور.

لە ئەبو سەعیدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « مَنْ تَوَضَّأَ فقال: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ ». هەرکەسێ دەستنوێژ بگرێ پاشان بڵێ: خودایە پاكو بێ عەیبی هەر بۆ تۆیەو من سوپاسو ستایشی تۆ دەکەم، شایەتی دەدەم هیچ خودا نین جگە لەزاتی پاکت، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم، تۆبە دەکەمو بەزاتی پاکت پەنا دەگرم، ئیتر ئەم دۆعاو پاڕانەوەی دەخرێتە صەحیفەیەکی سپییەوە تا ڕۆژی قیامەت ناشکێندرێو هەڵناپچڕێ. [٢]

١٠- کردنی دوو ڕکات دوای دەستنوێژ: ئەمەیش بەپێی قسەکەی عوسمان: کە دوای ئەوەی چۆنیەتی دەستنوێژگرتنی پێغەمبەری فێرکردن، وتی: من بینیم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم شێوە دەستنوێژگرتنەی من دەستنوێژی گرت، ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا

---

[١] صحيح: (مختصر م/١٤٣)، م (١/٢٠٩/٢٣٤).

[٢] (صحيح الترغيب ٢٢٠)، ك (١/٥٦٤)، طس (٢/١٣٢/١٤٧٨) هيچ جۆرە دوعایەك لەمیانەی دەستنوێژگرتندا نەچەسپاوە.

تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ». [١] کەسێك بەم شێوە دەستنوێژەی من دەستنوێژ بگرێ، پاشان دوو ڕکات سوننەتی دەستنوێژ بکا، لەمیانەی ئەنجامدانی دوو ڕکاتە نوێژەکەدا دڵی پەیوەست بی بەخوداوە، لێخۆشبوون لەتاوانی رابوردووی بۆ دەستەبەر دەبێ.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی نوێژی بەیانیدا بە بیلالی فەرموو: «يَا بِلاَلُ أخبرني بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإِسْلاَمِ ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ»: ئەی بیلال پێم بڵێ: باشترین کردەوەو جێگای هیوا چیە، کە لەپێناو ئایینی ئیسلامدا ئەنجامت داوە، چونکە من گوێم لەخشەی نەعلەکانت بوو لەبەردەمم لەبەهەشتدا، بیلال لەوەڵامدا وتی: من کردەوەیەکی وام نەکردووە جێگای ئومێدم بێو زۆر دڵم پێی خۆش بێ، ئەوەنەبێ من هەر دەستنوێژێکم گرتبێ لە شەودا بووبێ یان لەڕۆژدا بووبێ، ئیللا بەو دەستنوێژە چەندێکم پێ کرابێ نوێژم کردووە. [٢]

## پێویستە ئیقتصاد بکرێ لە بەکارهێنانی ئاو بۆ دەستنوێژ زێدەڕەوی کردن تێیدا حەرامە

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابو نەریتی وابوو بە ڕبەئاوێك تا پێنج مود خۆی دەشتو بەیەك مودیش دەستنوێژی دەگرت [٣] پەروەردگاریش دەفەرموێ: {وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ

---

[١] صحيح: لەباسی دەستنوێژدا تێپەڕی.

[٢] متفق عليه: خ (١١٤٩/٣٤/٣)، م (٢٤٥٨/١٩١٠/٤).

[٣] متفق عليه: خ (٢٠١/٣٠٤/١)، م (٣٢٥/٥١ — ٢٥٨/١).

الْمُسْرِفِينَ – الأنعام/١٤١}. زێدەڕەوی مەکەن، بێگومان خودا موسریف‌و دەست بڵاوی خۆش ناوێن.

لە ئەبو نەعامەوە ڕیوایەتکراوە: کە عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل گوێی لێ بوو کوڕەکەی دەیگوت (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْقَصْرَ الأَبْيَضَ عَنْ يَمِينِ الْجَنَّةِ إِذَا دَخَلْتُهَا). خودایە داوات لێ دەکەم کە چوومە ناو بەهەشتەوە باڵەخانەیەکی سپیم پێ ببەخشی لەلای ڕاستی بەهەشت. وتی: کوڕەکەم! داوا لەخودا بکە بەهەشتت بداتێ، پەنا بگرە بەخودا لەدۆزەخ، من بۆخۆم لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: « إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الطَّهُورِ وَالدُّعَاءِ».[1] لەوەدوا لەم ئوممەتەدا کەسانێك پەیدا دەبن زێدەڕۆی دەکەن لە دەستنوێژگرتن‌و دوعاکردن‌و پاڕانەوەدا. دانەری کتێبی (عون المعبود) ١/١٧٠ دەڵێ: زانایانی شەرعزان کۆڕایان هەیە لەسەر نەیکردن لەدەستبڵاوی‌و ئیسراف کردن لە بەکارهێنانی ئاو بۆ دەستنوێژ‌و غوسڵ کردن‌و شتنەوەو لابردنی پیسی، تەنانەت ئەگەر لەسەر کەناری دەریاش بێ.

## ئەو شتانەی دەستنوێژ بەتاڵ دەکەنەوە

١- هەر شتێك لەپاش‌و پێش بێتەدەر لەمیزو پیسایی، یان تڕو تس‌و هەرشتێکی تر، دەستنوێژ بەتاڵ دەبێتەوە سەربەڵگەیش بۆ ئەم مەسەلەیە فەرمایشتی قورئانە کە دەفەرموێ: {أَوْ جَاء أَحَدٌ مِّنكُم مِّن الْغَآئِطِ – النساء/٤٣}. یاخود یەکێك لەئێوە لەسەر ئاو هاتەوەو بێ دەستنوێژ بوو وشەی {الْغَآئِطِ} لەبنەڕەتدا ئەو جێگەیە: کە دەستی تێدا بەئاو دەگەیەنرێ، دەردراوەکە بەهۆی هاوسێیەتیەوە بەو ناوە ناونراوە، بەپێی ئایەتەکە میزو

---

[1] صحيح (ص. د ٨٧)، د (١٦٩/٩٦و ١/١٧٠).

پیسایی بەردەکەون، کەوابوو غائیط کینایەیە لەسەرئاو کردنو دەست بەئاو گەیاندن.

هەروەها ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: « لاَ يَقْبَلُ اللَّـهُ صَلاَةَ أَحَدِكُمْ إِذَا أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ ». پەروەردگار نوێژی یەکێك لەئێوە قبوڵ ناکا ئەگەر بێ دەستنوێژ بوو هەتا دەستنوێژ هەڵنەگرێ. پیاوێکی ئامادە بوو، کە خەڵکی حەضرەموت بوو بە ئەبو هورەیرەی گوت: کەراوی حەدیثەیە ئایا، مەبەست بێ دەستنوێژی بوون چیە ئەی ئەبو هورمیرە؟ لەلامدا وتی: «فُسَاءٌ أَوْ ضُرَاطٌ».[1] تس یان تڕ.

هەروەها هاتنە دەرەوەی (مەنیو مەذی وەدی)ش دەستنوێژ بەتاڵ دەکەنەوە، ئاماژە بەو فەرموودەیەی لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، کە ئەم سێ شتە دەستنوێژ شکێنەی باس کردو فەرمووی: (ألمني والودي والمذي) پاشان فەرمووی: (مەنی) دەبێتە هۆی واجب بوونی غوسڵ، (وەدیو مەذی) کە هاتنە دەرەوە شەرمگای خۆتیان لێ بشۆرەوەو دەستنوێژ بگرە وەکوو دەستنوێژ گرتنت بۆ نوێژ.[2]

٢- خەوی تەواو کە بەجۆرێك بێ بەتەواوی بێ ئاگایی بەدی بێنێ جا فەرقی نیە کابرا کۆمی لەزەوی قایم کردبێو دانیشتبێ یان ڕاکشابێ. سەر بەڵگە ئەمە حەدیپی صەفوانی کوڕی عەساله، کە دەڵێ: ئەگەر ئێمە لەسەفەردا بوینایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ دەکردین: کەسێ شەو سێ ڕۆژ خوفەکانمان دانەکەنین – مەگەر تووشی لەشگرانی بوینایە – واتە: بۆ غوسڵ کردن دامان دەکەندن، بەلام شکانی

---

[1] متفق علیه: خ (١/٢٣٤/١٣٥)، هق (١/١١٧)، حم (٢/٧٥/٣٥٢) واصل الحدیث عند غیرهم بدون الزیادة. م (١/٢٠٤/٢٢٥)، د (١/٨٧/٦٠)، ت (١/١٥٠/٧٦).

[2] صحیح: لەباسی شتە پیسەکاندا تێپەڕی.

دەستنوێژ بەهۆی (گوو میزو نوستنەوە) خوفەکانمان دانەدەکەندن هەر مەسحمان لەسەر دەکردن.[1] پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی ئەو شتانەی دەستنوێژ دەشکێنن (نوستنو گوو کردنو میزکردن) وەکوو دانان.

هەروەها لە ئیمام عەلییەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « الْعَيْنُ وِكَاءُ السَّهِ فَمَنْ نَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ ».[2] چاو دەمبێنی کۆمە، هەرکاتێ چاو چووە خەو دەمبێنەکە خاو دەبێتەوە. ئەگەر کەسێك خەوی لێ کەوت، کاتێ هەڵدەستێ با دەستنوێژ بگرێتەوە، (واتە بەئاگاییو بەخەبەری پارێزگاری کۆمە، هەرچی لێ دەرچێ هەستی پێ دەکا).

٣- نەمانی عەقڵ بەهۆی سەرخۆشیو یان نەخۆشی. چونکە نەمانی عەقڵ بەم هۆیانەوە زۆر لەنوستن کاریگەرترە.

٤- دەستدان لەشەرمگا بەبێ پەردە ئەگەر بەشەهوەتەوە بوو، ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ».[3] کەسێك دەستی لەهینی خۆی دا دەستنوێژی دەشکێ دەبێ دەستنوێژ بگرێتەوە، ئەو فەرموودەی کە ڕستەی «وَهَلْ هُوَ إِلاَّ بَضْعَةٌ أَوْ مُضْغَةٌ مِنْكَ».[4]ی تێدا هاتووە تەئویل دەکرێ بەوە کە دەست لێدانەکە بەشەهوەتەوە نەبێ، چونکە ئەگەر بەشەهوەتەوە نەبێ دەست لێدانی حوکمی

---

[1] حسن: (ص. ن ١٢٧)، ت (١/٦٥/٩٦)، ن (١/٨٤).

[2] نيل الأطار ج١/٢٤٢.

[3] صحيح: (ص. جه ٣٨٨)، د (١/٣٠٧/١٧٩)، جه (١/١٦١/٤٧٩)، ن (١/١٠٠)، ت (١٨٢/٥٥) بزيادة فلا يصل.

[4] صحيح: (ص. جه ٣٩٢)، د (١/٣١٢/١٨٠)، جه (١/١٦٣/٤٨٣)، ن (١/١٠١)، ن (١/٥٦/٨٥).

دەست لێدانی ئەندامەکانی تری جەستەی هەیە. ئەمما ئەگەر بەشەهوەتەوە بوو ئەوکاتە دەست لێدانەکەی ناشوبهێتە دەست لێدانی ئەندامی تر، ئەمەش شتێکە ئاشکراو روونە.[١]

٥- خواردنی گۆشتی حوشتر. خواردنی گۆشتی حوشتر دەستنوێژ دەشکێنێ. ئاماژە بەو حەدیثەی (البراء)ی کوڕی عازیب ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێمانی فەرمو: «تَوَضَّئُوا مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ وَلاَ تَوَضَّئُوا مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ».[٢] لەدوای خواردنی گۆشتی حوشتر دەستنوێژ بشۆنەوە بەڵام لەدوای خواردنی گۆشتی مەڕو بزن دەستنوێژ هەڵگرتنەوە پێویست نیە.

لەجابیری کوڕی سەمورەوە ڕیوایەتکراوە: کە پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کرد، وتی: ئایا بەهۆی خواردنی گۆشتی مەڕو بزنەوە دەستنوێژ بگرمەوە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ وَإِنْ شِئْتَ فَلاَ تَوَضَّأْ ». بەئارەزووی خۆت بکە، ویستت دەستنوێژ بگرەوە ویستت دەستنوێژ مەگرەوە. دوای کابرا وتی: (ئایا لەخواردنی گۆشتی حوشتر دەستنوێژ بگرمەوە؟) فەرمووی: « نَعَمْ فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ ».[٣]

## ئەوشتانەی بێ دەستنوێژ نابێ ئەنجام بدرێن
## (ئەو شتانەی حەرامن لەسەر بێدەستنوێژ)

[١] تمام المنة/١٠٣.

[٢] صحيح: (ص. جه ٤٠١)، د (١/٣١٥/١٨٢)، ت (١/٥٤/٨١)، جه (١/١٦٦/٤٩٤).

[٣] صحيح (مختصر م ١٤٦)، م (١/٢٧٥/٣٦٠).

١- نوێژ: ئاماژه به فەرمووده‌ی پەروەردگار کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُـواْ إِذَا قُمْـتُمْ إِلَـى الـصَّلاةِ فاغْـسِلُواْ وُجُـوهَكُمْ........ - المائـدة/٦}. (ئـەی بڕواداران و ئەوانەی ئیمانتان هێناوە هەرکاتێ هەڵسان بـۆ نوێـژ دەموچاوتان بـشۆرن......) هـەروەها ئامـاژە بـە فـەرموودەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) « لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلاَةً بِغَيْرِ طُهُورٍ».[1] پەروەردگار هیچ نوێژێك قبـوڵ ناکا بەبێ دەستنوێژ گرتن.

٢- تـەوافی کـەعبـە: ئەمـەش بـەبێ دەسـتنوێژ ئـەنجام نـادرێ، چـونکە پێغەمبەر فەرموويـەتی: « الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ صَلاَةٌ إِلاَّ أَنَّ اللَّهَ أَحَلَّ فِيهِ الكلام».[2] تەوافکردنی کەعبە وەکوو نوێـژ وايـە، وەڵێ ئەوەنـدە هەيـە خـودا قـسەکردنی تێدا حەڵاڵ کردووە.

## ئەو شتانەی دەستنوێژ گرتنیان بۆ سوننەتە

١- ذیکر کردنی پەروەردگار بەگوێرەی ئـەو حـەدیـثـەی (ألمهاجر)ی کـوڕی (قنفذ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: سلاوم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) کرد، لەوکاتەدا تەشریفی خـەریکی دەسـتنوێژ بـوو، تـا لەدەسـتنوێژ گرتنەکـە نەبووەوە وەلامی سلاوەکەی نەدايەوە، جا: کە وەلامی دايەوەو فەرمووی: «إِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرُدَّ عَلَيْكَ إِلاَّ أَنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُرَ اللَّـهَ إِلاَّ عَلَـى طَهَـارَةٍ ».[3] هـیچ شتێك نەبوو کە نـەهێڵێ وەلامـی سـلاوەکەت بدەمـەوە جگـە لـەوەی مـن پـێم ناخۆش بوو يادی خودا بکەم بەبێ دەستنوێژ.

---

[1] صحيح: لەباسی دەستنوێژ گرتندا تێپەڕی.

[2] صحيح: (ص. ج ٣٩٥٤)، ت (٢/٢١٧/٩٦٧).

[3] صحيح: (ص. جه ٢٨٠)، د (١/٣٤/١٧)، جه (١/١٢٦/٣٥٠)، ن (١/٣٧).

٢- پێش نوستن: ئاماژە بەو حەدیثەی (البراء)ی کوڕی عازیب ڕیوایەتی کردووەو دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکاتێ چویتە شوێنی نوستن، دەستنوێژ بگرە وەکوو دەستنوێژ گرتنت بۆ نوێژ، پاشان لەسەر لای ڕاست ڕابکشێ، پاشان بڵێ: «اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ ، اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ».

خودایە من خۆم بەتۆ ئەسپارد، ڕوم کردە قاپی تۆ، کاروباری خۆم دایە دەست تۆ، بەویستی خۆمو بەناچاری پشت بەتۆ دەبەستم، هیچ پەناو مەکۆیەك نیە جگە لەپەناو مەلجەئی تۆ، هەر دەبێ ڕوو لەقاپی تۆ بکەم، خودایە ئیمانم بەقورئانی تۆ هێناوە، ئیمانم بەو پێغەمبەرە هێناوە کە ڕەوانەت کردووە «فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ فَأَنْتَ عَلَى الْفِطْرَةِ ، وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ».[1] ئەگەر تۆ ئەو شەوە بمری ئەوە لەسەر ئایینی پەسەندی ئیسلام دەمری، هەموو شەوێ ئەم وشانەی ناو ئەم پاڕانەوەیە بخەرە کۆتایی قسەکانت.

٣- لەشپیس: ئەگەر ویستی شت بخوا یان بخواتەوە، یان بنوێ یان بیەوێ جوتبوون دووبارە بکاتەوە سوننەتە دەستنوێژ بگرێ.

خاتو عائیشە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: (پێغەمبەر کە لەشی گران بوایەو بیویستایە شتێك بخوا، یان بنوێ دەستنوێژی دەگرت وەکوو دەستنوێژ گرتنی بۆ نوێژ).[2]

لە عەمماری کوڕی یاسرەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی داوە بە لەشپیس کە ویستبێتی شتێك بخوا، یان بخواتەوە،

---

[1] متفق علیە: خ (٦٣١١/١٠٩/١١)، م (٢٧١٠/٢٠٨١/٤).

[2] صحیح: (مختصر م ١٦٢)، م (٣٠٥ – ٢٢ – ١/٢٤٨)، ن (١/١٣٨).

یان بنوێ ڕێگەی پێداوە، کە دەستنوێژ بگرێ وەکوو دەستنوێژ گرتنی بۆ نوێژ.[٣]

لە ئەبو سەعیدەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتدەکا، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ ».[١] ئەگەر یەکێ لەئێوە لەگەڵ خێزانی جوتبوو، دوایی ویستی دووبارەی بکاتەوە با دەستنوێژ بگرێ.

٤- پێش غوسڵ کردن سوننەتە دەستنوێژ بگری، جا غوسڵ کردنەکە سوننەت بێ یان واجب بێ. لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە غوسڵی لەشپیسی لەخۆی دەردەکرد، سەرەتا دەستی دەشتن دوایی بەدەستی ڕاستی ئاوی دەکردە دەستی چەپی‌و شەرمگای خۆی پێ دەشۆرد، پاشان دەستنوێژی دەگرت وەکوو دەستنوێژگرتن بۆ نوێژ.[٢]

٥- خواردنی هەرشتێك بەئاگر بکوڵێ‌و ببرژێ. ئەمەش بەپێی ئەو حەدیثەی ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی کردوە، دەڵێ: لە پێغەمبەرم زنەوت دەیفەرموو: « تَوَضَّئُوا مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ ».[٣] هەرشتێکتان خوارد یان خواردەوە: کە بەئاگر کوڵابوو یان برژابوو دەستنوێژی لێ بگرنەوە.

ئەمە حەمل دەکرێ بۆ حاڵەتی باشە واتە (استحباب). ئەمەش بەپێی حەدیثی عەمری کوڕی ئومەییەی (الضمَري): کە دەڵێ: پێغەمبەرم بینی

---

[٣] صحیح: د (١/٣٧٥/٢٢٢).

[١] صحیح: (ص. ج ٢٦٣)، م (١/٢٤٩/٣٠٨)، د (١/٣٧١/٢١٧)، ت (١/٩٤/١٤١)، ن (١/١٤٢)، جه (١/١٩٣/٥٨٧).

[٢] صحیح: (مختصر م/١٥٥)، م(١/٢٥٣/٣١٦).

[٣] صحیح: (مختصر م/١٤٧)، م(١/٢٧٢/٣٥٢)، ن(١/١٠٥).

(دروودی خودای لەسەر بێ) کوتە گۆشتی لەلاشانی لاکە مەڕێك دەبڕیو دەیبرژاندو دەیخوارد، پاشان بانگی نوێژدرا، ئیتر هەڵساو کێردەکەی داناو نوێژی کرد، دەستنوێژی هەڵنەگرتەوە.[1]

٦- دەستنوێژ تازەکردنەوە بۆ هەموو نوێژێك. ئاماژە بە حەدیثی (بورەیدە): کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی تازە دەکردەوە. کە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە هات دەستنوێژی گرتو مەسحی خوففەکانی کرد، چەند نوێژی بەیەك دەستنوێژ کرد، عومەری کوڕی خەتتاب عەرزی کرد وتی ئەی پێغەمبەری خودا! ئەتۆ ئەمڕۆ شتێکت کرد لەوەپێش نەتکردوە، فەرمووی: « عَمْدًا فَعَلْتُهُ يَا عُمَـرُ ».[2] بەئەنقەست وام کرد.

٧- لەکاتی هەموو دەستنوێژ شکانێکدا دەستنوێژ بگرێتەوە ئەمەش ئاماژە بەو حەدیثی بورەیدە: کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەوێك ڕۆژی لێ بۆوەو بانگی بیلالی کرد، پێی فەرموو: ئەی بیلال! ئەتۆ بەچی پێشم کەوتی بۆ بەهەشت؟ ئەمن دوێنێ چوومە ناو بەهەشتەوە خشپە خشپی تۆم گوێ لێ بوو لەپێشمەوە، بیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەرکاتێك بانگم دابێ دوورکات نوێژم کردوە، هەرکاتێ دەستنوێژم شکابێ خێرا دەستنوێژم گرتۆتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «بهذا».[3] لەبەر ئەو هۆکارەبوو!

٨- دوای ڕشانەوە. هەرکەسێك توشی ڕشانەوە بوو واباشە دەستنوێژ تازەبکاتەوە، ئەمەش بەگوێرەی حەدیثەکەی مەعدانی کوڕی ئەبو طەلحە کە

---

[1] صحيح: (مختصر م/١٤٨)، م(٣٥٥ — ٩٣ — ١/٢٧٤) وهذا لفظه خ(٢٠٨/٣١١/١).

[2] صحيح: (مختصر م/١٤٢)، م(٢٧٧/٢٣٢/١)، د(١٧١/٢٩٢/١)، ت(٦١/٤٢/١)، ن(١/٨٦).

[3] صحيح: (ص.ج/٧٨٩٤)، ت(٣٧٧٣/٢٨٢/٥).

لەئەبو (الدرداء) ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رشایەوە رۆژوەکەی شکاندو دەستنوێژی گرتەوە... لەمزگەوتی دیمەشق توشی (ثەوبان) بووم‌و ئەوەم بۆ باسکرد، وتی راستە من خۆم ئاوی دەستنوێژم بەدەستی دا کرد.[1]

٩- دوای هەڵگرتنی جەنازە، هەرکەسێ جەنازەی هەڵگرت واباشە دەستنوێژ تازەبکاتەوە. بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: (مَنْ غَسَّلَ مَيِّتًا فَلْيَغْتَسِلْ). کەسێك مردوی شت بادوایی غوسڵ بکا « وَمَنْ حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ ». کەسێك جەنازەی هەڵگرت با دەستنوێژ بشواتەوە.[2]

## مەسحکردن لەسەر خوفف

ئیمامی نەوەوی لەشەرحی موسلیم (ج٣/١٦٤)دا، دەفەرموێ: ئەو زانا موسوڵمانانەی راوبۆچونیان بەهەند وەردەگیرێ کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە مەسح لەسەر خوفف دروستە، لەسەفەردا بێ یان لەماڵەوە بێ، ئایا بۆ پێویستی بێ یان بەبێ پێویستی. تەنانەت دروستە بۆ ئافرەتێك هەر لەماڵەوە بێ، یان کەسێك شەلەل لێی دابێ‌و نەتوانێ لەماڵ دەرچێ بۆی رەوایە مەسح لەسەر خوففەکانی بکا. تەنها شیعەو خەواریج ئینکاری مەسح لەسەر خوف دەکەن راجیایی‌و ئینکاریکردنیان ج گرنگیەکی نیە.

---

[1] صحیح الاسناد، (تمام المنة ص/١١١)، ت(١/٥٨/٨٧)، د(٧/٨/٢٣٦٤) ولیس فیه (توضأ).

[2] صحیح: (الجنائز/٥٣)، حم(٢/١٤٥/٤٨٦)، حب(١٩١/٧٥١)، هق(١/٣٠٠)، ت(٢/٩٩٨/٢٣١) بەرواڵەت خیطابەکە ئەمرە، ئەمریش وجوب دەگەیەنێ بەڵام ناتوانین بڵێین: ئەمرەکە بۆ وجوبە لەبەرئەو حەدیثەی ئیبنو عباس کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَيْسَ عَلَيْكُمْ فِي غَسْلِ مَيِّتِكُمْ غُسْلٌ إِذَا غَسَّلْتُمُوهُ ، إِنَّهُ مُسْلِمٌ مُؤْمِنٌ طَاهِرٌ ، وَإِنَّ الْمُسْلِمَ لَيْسَ بِنَجِسٍ ، فَحَسْبُكُمْ أَنْ تَغْسِلُوا أَيْدِيَكُمْ ». رواه ك(١/٣٨٦).

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: حەفتا کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیان باسکردوم: کە پێغەمبەر مەسحی لەسەر خوفەکانی دەکرد.

باشترین شتێك کە بەڵگەبێ لەسەر ئەوەی: کە مەسحکردن لەسەر خوفف دروستە ئەو حەدیثەیە: کەئیمامی موسلیم لە ئەعمەشەوە لە ئیبراهیمەوە، لە هەممامەوە ڕیوایەتی کردوە، دەڵێ: جەریر میزی کرد، پاشان دەستنوێژی گرتو مەسحی لەسەر خوففەکانی کرد، پێی گوترا: ئەوە وادەکەی؟ وتی: بەڵێ، من بۆ خۆم پێغەمبەرم بینیوە میزی کرد پاشان دەستنوێژی گرتو مەسحی لەسەر خوففەکانی کرد. ئەلئەعمەش دەڵێ: ئیبراهیم وتی: هاوەڵان ئەم حەدیثەیان بەلاوە سەرنج ڕاکێش بوو، چونکە موسوڵمانبونی جەریر دوای نازڵبوونی سورەتی (المائدة) بووە.[1]

ئیمامی نەوەوی دەڵێ مەعنای ئەم قسەیە ئەوەیە: پەروەردگار لەسورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: {فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ – المائدة/٦}. ئەگەر موسوڵمانبوونی جەریر پێش نازڵبوونی سورەتی (المائدة) بوایە دەگونجا بگوترێ: مەسحکردن لەسەر خوفف بە ئایەتەکە سڕاوەتەوە، بەڵام چونکە ئیسلامبوونی جەریر لەدوا نازڵبوونی سورەتی (المائدة)یە، دڵنیاین لەوەی کە حەدیثەکەی جەریر دەربارەی مەسح کاری پێ دەکرێو ئەوە دەگەیەنێ کە مەبەست بە ئایەتی (المائدة) کەسێکە: کە خوففی لەپێدا نەبێ، کەوابوو حەدیثەکە دەبێتە (مخصص) بۆ ئایەتەکە. (والله اعلم).[2]

---

[1] صحيح: (مختصر م/١٣٦)، م(١/٢٢٧/٢٧٢)، ت(١/٦٣/٩٣).

[2] شرح مسلم ج/٣/١٦٤.

## مەرجەكانی مەسحكردن لەسەر خوفف

بۆئـەوەی مەسـحكردن لەسـەر خوفـف دروسـت بـێ، دەبـێ پـێش ئـەوەی خوفـەكان لـەپێ دەكا دەسـتنوێژی هـەبێ، واتـە: دەبـێ پـێش لـەپێ كردنیـان دەستی بە دەستنوێژ بێ.

لـە (المغـيره)ی كـوڕی شـوعبەوە ڕیوایـەتكراوە، دەڵـێ: لـە سـەفەرێكدا لەخزمـەت پێغەمبـەردا بـووم، لـە مەسـینەیەكدا ئـاوم بەدەسـتیدا كـرد بـۆ دەستنوێژ شتن، ڕوخساری شت، قۆڵو باسكی خۆی شتن، مەسحی سـەری كـرد، پاشان مـن داهاتمـەوە خوفـەكانی لـەپێ دابكـەنم، فـەرمووی: « دَعْهُمَـا ، فَـإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَـاهِرَتَيْنِ ».[1] وازیـان لێ بێنـە، مـن كاتـێ لـەپێم كـردون دەسـتنوێژم هەبوو، بەدەستی بە دەستنوێژەوە لەپێم كردون.

## ماوەی مەسح لەسەر خوف

لەعەلی كوڕی ئـەبو تالیبـەوە ڕیوایـەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مـاوەی مەسـحكردنی بـۆ مەسـافیر سـێ شـەو سـێ ڕۆژو بـۆ نیشتەنی شەو ڕۆژێكی داناوە.[2]

## شوێنی مەسحو چۆنیەتیەكەی

ئەوەی مەشروعو ڕەوایە مەسح بكرێ ئەو بەشەی خوففە كە دەكەوێتـە پشتەپێو بەشی سەرەوەیەتی. ئاماژە بەوتەی ئیمام عـەلی: كە فەرموویـەتی: ئەگەر ئایین بەرەئیی بوایە لای ژێرەوەی خـوف شـیاوتر بـوو بەمەسـح لـەلای

---

[1] متفق عليه: م(٢٧٤-٧٩-١/٢٣٠). خ(٢٠٦/٣٠٩/١) مختصراً.

[2] صحيح (مختصر م ١٣٩)، م (٢٧٦/٢٣٢/١)، ن (١/٨٤).

سەرەوەی. بێگومان من پێغەمبەرم بینیوە مەسحی لای سەروی خوفەکانی دەکرد[١] ئەوەی پێویستو واجبە لە مەسحدا ئەوەیە پێی بگوترێ مەسح.

## مەسحکردن لەسەر گۆرەویو نەعل

وەکوو چۆن دروستە مەسحکردن لەسەر خوف، هەرئاوایش دروستە مەسح لەسەر گۆرەویو نەعل بەپێی حەدیثەکەی (ألمغیرة)ی کوڕی شوعبە: کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستنوێژی گرت لەسەر گۆرەویو نەعل مەسحی کرد.[٢]

لە عوبەیدی کوڕی جورەیجەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بە ئیبنو عومەر گوترا: بینیمانی شتێکت دەکرد جگە لەتۆ کەسی ترمان نەبینیوە ئەوکارە بکا!؟ وتی: کام کارە؟ وتیان بینیمانی ئەم نەعلی (سەبتییانە) لەپێ دەکەی، وتی: من بۆ خۆم پێغەمبەرم بینی لەم جۆرە نەعلەی لەپێ دەکردو دەستنوێژی پێوە دەگرتنو مەسحی لەسەر دەکردن.[٣]

## ئەوەی مەسح بەتاڵ دەکاتەوە

**مەسحکردن لەسەر خوف بەسێ شت بەتاڵ دەبێتەوە:**

١- تەواوبوونی ماوەکە. چونکە مەسح بۆ کاتێکی دیاریکراوە کە کاتەکەی تەواو بوو، ئیتر دروست نیە ماوەکە درێژ بکەینەوە بۆ زیاتر.

٢- لەشگرانبوون، ئاماژە بە حەدیثی صەفوان: کە بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ دەکردین – ئەگەر

---

[١] صحيح: (الإرواء/١٠٣)، د(١/١٦٢/٢٧٨).

[٢] صحيح: (الإرواء/١٠١)، د(١٥٩/٢٦٩/١)، ت(٩٩/٦٧/١)، جة(٥٥٩/١٨٥/١).

[٣] اسناده صحيح (ص.خز/١٩٩)، هق(١/٢٨٧).

لەسەفەردا بوینایە – کە سێ شەوو سێ رۆژ خوفەکانمان دانەکەنین مەگەر توشی حاڵەتی لەشگرانی بوینایە، ئەگینا بۆ مێزو گوو نوستن دامان نەدەکەندن تەنها مەسحمان لەسەر دەکردن.[1]

٣- داکەندنی خوفەکان لەقاچەکانی. چونکە ئەگەر دایکەندن‌و دوایی لەپێی کردنەوە، لەپێ کردنەوەی خوفەکان لەسەر دەست بە دەستنوێژی نابێ ئەوکاتەی لەپێیان دەکاتەوە دەستنوێژی نیە.

**فائیدەیەک**: بەسەرچوونی ماوەی مەسحکردن یان داکەندنی خوفەکان لەقاچ، حوکمی مەسحەکە بەتاڵ دەکاتەوە، دروست نیە مەسح بکا هەتا سەرلەنوێ دەستنوێژ دەگرێتەوەو قاچەکانی دەشوا، پاشان خوفەکانی لەپێ بکاتەوە. بەڵام ئەگەر لەکاتی داکەندنی خوفەکانی‌دا دەستنوێژی مابوو، یان ماوەکە بەسەرچوو دەستنوێژی نەشکابوو، ئەوە دەستنوێژەکەی باقیەو دەتوانێ چەندێکی بوێ نوێژبکا تا دەستنوێژی دەشکێ..

**فائیدەیەک**: کەسێك جوتێکی گۆرەوی لەسەر پاکی‌و دەست بە دەستنوێژەوە لەپێ کرد، دوایی مەسحی لەسەر کردن، دوای مەسح لای ژوروی خوفەکانی لادا بۆی رەوایە بە مەسح کردن لەسەر لای خواروی خوفەکان ماوەی مەسح کردن درێژە پێ بدا تاماوەی شەرعی تەواو دەبێ مەسحی لای خواروی خوففەکانی بکا، چونکە ئەوە دەتواندرێ پێی بگوترێ: قاچی بە پاکی‌و بە دەستنوێژەوە خستوونە ناو خوففەوە. بەڵام ئەگەرگۆرەوییەکی لەپێ کردو مەسحی لەسەر کرد، پاشان گۆرەوییەکی تری لەقاچەکەی تری کردو مەسحی لەسەر نەکرد، ئەو حاڵەتە ناگونجێ پێی بگوترێ: کە بە دەستنوێژەوە گۆرەوی لەپێ کردوە.[2]

---

[1] حسن (الإرواء/١٠٤)، ت(١/٦٥/٩٦)، ن(١/٨٤).

[2] ئەمە پوختەی رای ئەلبانییە.

## غوسڵ كردن

## ئەوشتانەی غوسڵ پێویست دەكەن

١- هاتنەدەرەوەی (مەنی) چ بەئاگابێ یان نوستوو بێ. چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (إِنَّمَا الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ).[1] واتە خۆشۆردنو غوسڵ كردن بەهۆی هاتنەوەی (تۆماوە)وە دەبێ.

لە ئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: ئوممو سولەیم گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! شەرع شەرمی پێ ناوێ (خودا شەرم لەحەق ناكا). ئایا ئافرەت ئەگەر ئیحتیلامی بوو ئاوی هاتەوە، خۆشۆردنی لەسەر پێویست دەبێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵێ: ئەگەر ئاوی بینی (واتە: ئەگەر ئاوی هاتەوە).[2]

ئەگەر ئاو هاتنەوەكە لەحاڵەتی بەخەبەریدا بوو مەرجە دەبێ بەشەهوەتو لەزەتەوەبێ، بەڵام ئەگەر نوستوبوو ئەوە مەرج نیە. ئەمەش بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە دەفەرموێ: «إِذَا حَذَفْتَ فَاغْتَسِلْ مِنَ الْجَنَابَةِ وَإِذَا لَمْ تَكُنْ حَاذِفاً فَلاَ تَغْتَسِلْ ».[3] ئەگەر ئاو هاتنەوەكەت بە فیچقە بوو ئەوە غوسڵی لەشپیسی لەخۆت دەربكە بەڵام ئەگەر ئاو هاتنەوەكەت بە فیچقە نەبوو غوسڵ مەكە. (واتە: غوسلت لەسەر واجب نابێ).

ئیمامی شەوكانی دەفەرموێ: وشەی (ألحذف) لێرەدا بەمانا ئاو فڕێدانە، ئەمەش بە شەهوەتەوە نەبێ نایەتەدی. بۆیە (ألمصنف) دەفەرموێ: ئەمە

---

[1] صحيح: (مختصر م/١٥٢)، م(١/٢٧١/٣٤٨).

[2] متفق عليه: خ(١/٢٢٨/١٣٠)، م(١/٢٥١/٣١٣)، ت(١/١٨٠/١٢٢).

[3] اسناده حسن صحيح (الإرواء/١/١٦٢)، حم(١/٢٤٧/٨٢).

ئاگاداركردنەوەی ئەوەی تێدایە كە ئاو هاتنەوەی بێ شەهوەتو بێ فیچقە بەهۆی نەخۆشی یان سەرما نابێتە هۆی غوسڵ واجب بوون.

كەسێك ئیحتیلامی بوو واتە: لەخەودا وایزانی ئاوی هاتۆتەوە، بەڵام كە بەخەبەر هات هیچ تەڕاییەكی بەخۆیەوە هەست پێ نەكرد ئەوە غوسڵی لەسەر پێویست نابێ. كەسێك تەڕایی بەخۆیەوە بینی بەڵام لەیادی نەمابوو كە ئیحتیلامی بووە ئەوە لەسەری واجبە غوسڵ بكا.

لەخاتو عائیشە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیاركرا دەربارەی پیاو كە لەخەو هەڵسێو تەڕایی بەخۆیەوە ببینێو هیچ ئیحتیلام بوونی لەیاد نەمابێ. فەرمووی: دەبێ غوسڵ بكا. هەروا پرسیاری لێ كرا لەپیاوێك ئیحتیلامی ببێ بەڵام هیچ تەڕایی بەخۆیەوە نەبینێ، فەرمووی: غوسڵی لەسەر نیە.[1]

٢- جیماع با ئاویشی نەیەتەوە. لە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتكراوە، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا ، فَقَدْ وَجَبَ الْغَسْلُ وإن لم ينـزل».[2] هەركاتێ پیاو لەناو لنگی ئافرەت دانیشتو پاڵی بە سونەتگای خۆیەوە نا بۆناو هینی ئافرەتەكە ئەوە غوسڵ واجب دەبێ لەسەر هەردوكیان جا ئاویان بێتەوە یان نا.

٣- كافر موسوڵمان بێ دەبێ غوسڵ بكا. لە (قەیسی كوڕی عاصیم)ەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: موسوڵمان بووم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێكردم كە غوسڵ بكەم خۆم بە ئاوو سیدر بشۆم.[3]

---

[1] صحيح: (ص.د/٢١٦)، ت(١/٧٤/١١٣)، د(١/٣٩٩/٢٣٣).

[2] صحيح (مختصر م/١٥٢)، م(١/٢٧١/٣٤٨).

[3] صحيح: (الإرواء/١٢٨)، ن(١/١٠٩)، ت(٢/٥٨/٦٠٢)، د(٢/١٩/٣٥١).

٤- وەستانی خوێنی حەیزو خوێنی پاش منداڵ دەبنە هۆکاری واجببونی غوسڵ. ئەمەش بەگوێرەی حەدیثی عائیشە کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە (فاطیمەی کچی ئەبو حوبەیش)ی فەرموو: «فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلاَةَ ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْتَسِلِي وَصَلِّي ».[1] ئەگەر عادەی مانگانکەت بۆ هاتەوەو بێ نوێژ بووی واز لەنوێژکردن بێنە، کە لەبێ نوێژی وەستایەوەو عادەی مانگانەت تەواوبوو غوسڵ لەخۆت دەربکەو نوێژ بکە. خوێنی پاش منداڵبوون وەکوو خوێنی عادەی مانگانە وەهایە، بەکۆڕای زانایانی شەرع.

٥- خۆشۆردنی رۆژی هەینی. لەئەبو سەعیدی (ألخدری)یەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ».[2] غوسڵ کردن لەرۆژی جومعەدا لەسەر هەموو مرۆڤێکی رەسیدە پێویستە.

## ئەرکانو پلەکانی غوسڵ دوو شتن

١- نیەتهێنان، ئاماژە بە حەدیثی (إِنَّمَا الأعمال بالنيات)[3] کردەوە بەگوێرە نیازە.

٢- دەبێ ئاو بەسەر هەموو جەستەیدا بڕوا.

---

[1] متفق عليه: خ(٣٢٠/٤٢٠/١)، م(٣٣٣/٢٦٢/١)، د(٢٧٩/٤٦٦/١)، ت(١٢٥/٨٢/١)، ن(١٨٦/١) والفاظهم غير البخاري (فاغتسلي عنك الدم).

[2] متفق عليه: خ(٨٧٩/٢/٣٥٧، م(٨٤٦/٥٨٠/٢، د(٣٣٧/٤، ٥/٢)، ن(٩٣/٣)، جة(١٠٨٩/٣٤٦/١).

[3] متفق عليه: لەباسی مەرجەکانی صیحەتی نوێژدا رابورد.

## شێوەی پەسەند بۆ چۆنیەتی غوسڵ کردن

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا کە غوسڵی لەشگرانی لەخۆی دەردەکرد، سەرەتا هەردوو دەستی دەشۆردن، پاشان بەدەستی ڕاستی ئاوی دەکردە دەستی چەپی‌و شەرمگای خۆی دەشۆرد، پاشان دەستنوێژی دەگرت وەکوو دەستنوێژ گرتنی بۆ نوێژ، پاشان ئاوی هەڵدەگرت‌و بەهۆی پەنجەکانیەوە هەوڵی دەدا بنکی مووی جەستەی تەڕ ببێ، هەتا دەگەیشتە ئەو قەناعەتە: کە بنکی مووەکان تەڕبووە، ئەمجار سێ مست ئاوی بەسەری خۆیدا دەکرد، پاشان ئاوی بەسەر هەموو جەستەی خۆیدا دەکرد، پاشان هەردوو قاچی دەشۆردن.[1]

دەستنوێژ گرتن پێش غوسڵ سوننەتێکی گەورەیە. جا کەسێك پێش غوسڵ دەستنوێژ بگرێ ئەوە دەق سوننەتی پێغەمبەری پەیڕەوکردوە. کەسێکیش دەستنوێژی نەگرت ئەوە گوناحی ناگاتێ، بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابووە دەستنوێژ گرتنی پێش غوسڵی تەرك کردوە.

لە موحەممەدی (ألباقر)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: جابیر پێی گوتم: کوڕی مامت هاتە لام – مەبەستی حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی (الحنفیە) بوو – پێی گوتم: ئەرێ غوسڵ کردنی لەشگرانی چۆنە؟! وتم: پێغەمبەری خودا کە غوسڵی دەکرد سێ مست ئاوی هەڵدەگرت بەسەر سەری خۆیدا دەکرد، پاشان ئاوی بەسەر هەموو جەستەی خۆیدا دەکرد.[2]

---

(١) متفق علیه: خ(٢٤٨)، م(٣١٦).

(٢) متفق علیه: خ(١/٣٦٨/٢٥٦)، م(١/٢٥٩/٣٢٩).

کەسێك غوسڵی کرد، دەستنوێژی پێش غوسڵ بگری یان نەیگرێ، بۆی هەیە دوای غوسڵ کردنەکە چەندێك بیەوێ نوێژ بکا، هەر بە غوسڵکردنەکە دەبێتە خاوەن دەستنوێژو پێویست ناکا دەستنوێژ بگرێ.

لە خاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوای غوسڵ کردنی لە لەشگرانی دەستنوێژی نەدەگرتەوە.[١]

لەفظی ئەبو داوود بەم شێوەیە (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– يَغْتَسِلُ وَيُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ وَصَلاَةَ الْغَدَاةِ وَلاَ أُرَاهُ يُحْدِثُ وُضُوءًا بَعْدَ الْغُسْلِ).[٢]

فائیدەیەك: پێویست نیە لەسەر ئافرەتی لەشگران لەکاتی غوسڵ کردندا کەپرچی هۆنراوەی خۆی شل بکاتەوە، بەڵام ئەگەر غوسڵ کردنەکەی بۆ پاکبوونەوە لەبێ نوێژیو خوێنی پاش منداڵ بوون بوو ئەوە دەبی پرچە هۆنراوەکانی بکاتەوە.

لە ئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: عەرزی پێغەمبەری خودام کرد، وتم: من ئافرەتێکم پرچی خۆم دەهۆنمەوە، ئایا بۆ غوسڵی لەشگرانی پرچەکانم لێك بکەمەوە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِي عَلَى رَأْسِكِ ثَلاَثَ حَثَيَاتٍ ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ الْمَاءَ

---

[١] رواه أصحاب السنن، واللفظ لإبن ماجه.

[٢] صحيح: (ص. جه: ٤٧٠)، جه (١/١٩١/٥٧٩)، د (١/٤٢٥/٢٤٧)، ن (١/١٣٧)، ت (١/٧٣/١٠٧)، دەڵێ: (وهذا قول غير واحد من أهل العلم أصحاب النبى (ص) والتابعين ان لايتوضأ بعد الغسل).

فَتَطْهُـرِينَ ».[1] نـا، ئەوەنـدەت بەسـە: كەسـێ مـست ئـاو بەسـەر سـەری خۆتـدا بكەی، پاشان ئاو بە باقی جەستەی خۆتدا بكەی‌و پاك دەبێتەوە.

لە خاتو عائیشەوە ریوایەت كراوە دەفەرموێ: خاتو ئەسماء پرسـیاری لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) كـرد، دەربـارەی غوسـڵ كـردن لـەبێ نوێژی، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: « تَأْخُـذُ إِحْـدَاكُنَّ مَاءَهَا وَسِدْرَتَهَا فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُـهُ دَلْكًـا شَـدِيدًا حَتَّى تَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِهَا ثُمَّ تَصُبُّ عَلَيْهَـا الْمَـاءَ. ثُـمَّ تَأْخُـذُ فِرْصَـةً مُمَـسَّكَةً فَتَطَهَّـرُ بِهَا ».[2] یەكێك لەئێوە ئاوو سیدری خۆی ئامادە دەكا، خۆی دەشواو خۆی پاك دەكاتەوە، پاشان ئاو بەسەر سـەری خۆیـدا دەكـا، بەتونـدی دەسـت بـەناو قـژی خۆیدا دێنـێ‌و بە پەنجـەكانی هەوڵبـدا بنكـی مووەكـانی تـەڕ بـێ، ئـەمجار ئـاو بەسەری خۆیدا بكا، پاشان پارچە قوماشێك لۆلۆ بكـاو بیكاتـە تۆپەوانـەو نـاو لەشـی خـۆی پـێ پـاك بكاتـەوە) ئـەسماء وتـی: چۆن پاكردنـەوە بـەو پارچـە قومـاش‌و لۆكەیـە بكـا؟ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: «سُبْحَانَ اللَّهِ تَطَهَّرِينَ بِهَا ». سوبحانەڵلا، خۆی پی پاك بكاتـەوە، خـاتو عائیـشە دەفەرموێ: ئـەسماء دەیویـست ئـەو باسـە تـۆزی بـەنهێنی لـەژێر پـەردەدا رون بكاتەوە، واتە بەدواداچوون بكا بۆ شوێنەواری خوێنەكە.

هـەروا پرسـیارم لێ كـرد دەربـارەی غوسـڵی لەشـگرانی پێـی فـەرمووم: «تَأْخُذُ مَاءً فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ أَوْ تُبْلِغُ الطُّهُورَ ثُمَّ تَـصُبُّ عَلَـى رَأْسِـهَا فَتَدْلُكُـهُ

---

[1] صـحيح: (ص.جـة: ٤٧٠)، جـة(١/١٩١/٥٧٩)، د(١/٤٢٥/٢٤٧)، ن(١/١٣٧)، ت(١/٧٢/١٠٧)، دةلَيَ: (وهذا قول غير واحد من أهل العلم اصحاب النبي (ص) والتابعين ان لاَ إلـهَ إلاَّ اللّـهُ يتوضأ بعد الغسل).

[2] صــحيح: (الإرواء ١٣٦)، م (١/٢٥٩/٣٣٠)، د (١/٤٣٦/٢٤٨)، ن (١/١٣١)، ت (١/٧١/١٠٥)، جــه (١/١٩٨/٦٠٣).

حَتَّى تَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِهَا ثُمَّ تُفِيضُ عَلَيْهَا الْمَاءَ».[1] ئـاو هەڵـدەگرێ: خـۆ دەشـۆرێ، يان جوان خۆی دەشۆرێ، پاشان ئاو بەسەری خۆیدا دەکاو دەست دەخاتـە نـاو قژەکانیەوەو دەیانهێنێ‌و دەیانبا بەناویاندا بۆ ئەوەی بنکی قژەکانی تەڕ بن، ئەمجار پاش ئاو دەکا بەسەر قژەکانیدا.

ئەم فەرموودەیە بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە جوداوازی هەیـە لـەنێوان غوسـڵی ئـافرەت بـۆ لەشـگرانی‌و غوسـڵی بـۆ پاکبوونـەوە لـەخوێنی عـادەی مانگانەو خوێنی پاش منداڵ بوون، ئەوەتا حەدیثەکە ئەوە دووپات دەکاتـەوە کەپێویـستە ئـافرەتی پـاکبۆوە لـەخوێنی عـادەی مانگانــە کەزێـدەڕەوی بکـا لەدەست پێداهێنان‌و پەنجە خستنە ناو قژەکانیەوەو خۆ شۆردنی تەواوو خـۆ پاککردنەوە لەچڵك‌و پیسی مـادی‌و مەعنـەوی بـەجۆرێك کـە بـۆ خۆشـۆردنی لەشگرانی ئەو جەختەی نەکردۆتەوە. هـەروەکوو چـۆن حـەدیثـەکـەی ئوممـو سەلەمە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوە کەپێویـست نیـە لەغوسـڵی لەشـگرانیدا پرچـی هۆنراوەی خۆی بکاتەوە.[2]

ئەصڵ‌و بنەما وایە ئـافرەت بـۆ غوسـڵ پرچـەکانی بکاتـەوە، بـۆ ئـەوەی دڵنیا بـێ، کە بنکـی موومـکـان تـەڕ بـووەو ئاویـان پێکـەوتووە، وەڵێ لەغوسـڵی لەشـگرانیدا عـەفوی لێـدراوە، لەبـەر زۆر دووبـارە بوونـەوەی‌و ئـەرکێکی زۆرە هـــەموو جـــارێ بـــۆ خۆشـــۆردنی لەشپیـــسی پرچـــی هـــۆنراوەی بکاتـــەوە، بەپێچەوانەی غوسڵ کردنی بەهۆی عادەی مانگانەوە، ئەمەیان مانگی جارێـك ڕوو دەدا.[3]

---

[1] صحيح: (مختصر م ١٧٢)، م (٣٣٢ – ٦١/٢٦١/١).

[2] تهذيب سنن ابی داود لإبن القيم (١/١٦٧/١٦٦) بەدەست لێدانەوە.

[3] تهذيب سنن ابی داود والإبن القيم (١/١٦٧/١٦٦) بەدەست لێدانەوە.

**فائیدەیەك**: دروستە بۆ ژن‌و مێرد كە لەیەك شوێندا غوسڵ بكەن‌و شەرمگای یەكتریش ببینن، ئاماژە بەقسەی خاتو عائیشە كە دەڵێ: من‌و پێغەمبەری خودا لەیەك تەشت ئاوی خۆشۆردنمان هەڵدەهێنجاو هەردوكیشمان لەشگران بووین.[1]

## غوسڵە سوننەتەكان

١- غوسڵ كردن لەدوا هەموو جوتبوونێك؛ ئەمەیش بەگوێرەی حەدیثی ئەبو رافیع: كە دەڵێ: شەوێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسەر خێزانەكانیدا گەڕاو لەگەڵیان جوتبوو دوای هەموو جوتبوونێك غوسڵی كرد! دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ یەك غوسڵ بۆ هەموویان ناكەی؟ فەرمووی: «هَذَا أَزْكَى وَأَطْيَبُ وَأَطْهَرُ».[2] ئەم شێوازە پاكترو پەسەندترە.

٢- خۆشۆردنی ئافرەتی هەمیشە خوێن (موستەحاضە) بۆ هەموو نوێژێك یان بۆ نوێژی نیوەڕۆو عەصر غوسڵێك‌و بۆ نوێژی شێوان‌و خەوتنان خۆشۆردنێك‌و بۆ نوێژی بەیانیش خۆشۆردنێك، ئەمەیش بەگوێرەی حەدیثی خاتو عائیشە: كە دەفەرموێ: ئوممو حەبیبە لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) توشی حاڵەتی هەمیشە خوێنی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ كرد كە بۆ هەموو نوێژێك غوسڵ بكا..............[3]

لەڕیوایەتێكی تردا هەر لەخاتو عائیشەوە دەفەرموێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا ئافرەتێك كەوتە حاڵەتی هەمیشە خوێنیەوە، ئیتر فەرمانی پێ

---

[1] متفق علیه م (١/٢٥٦/٣٢١)، خ (١/٣٧٤/٢٦٣)، ن (١/١٢٩).

[2] حسن (ص. جه ٤٨٠)، د (١/٣٧٠/٢١٦)، جه (١/١٩٤/٥٩٠).

[3] صحيح: (ص. د ٢٦٩)، د (١/٤٨٣/٢٨٩).

کرا کە بۆ نوێژی عەصر عەجەلە بکاو بۆ نوێژی نیوەڕۆ خۆی دوابخا، واتە: نوێژی نیوەڕۆ لەدوا کاتیداو نوێژی عەصر لەسەرەتای کاتیدا بکاو بۆ هەردوو نوێژەکە یەکجار غوسڵ بکا، نوێژی شێوان دوابخاو نوێژی خەوتنان لەسەرەتای کاتەکەیدا بکاو بۆ هەردووکیان یەکجار خۆی بشوا، بۆ نوێژی بەیانیش یەك غوسڵ بکا.[1]

٣- غوسڵ کردن دوای بێهۆشبوون، کەبە ئاگا هاتەوە سوننەتە غوسڵ بکا، بەپێی حەدیثەکەی خاتو عائیشە کە دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا لە نەخۆشییەکەیدا قورساییەکی بەسەردا هات، کە بەئاگا هاتەوە فەرمووی: {أصلى الناس؟} ئەرێ موسوڵمانان نوێژیان کرد؟ وتمان نەخەیر ئەوان چاوەڕوانی جەنابتن ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئاوم بۆ بکەنە تەشتەوە، عائیشە دەفەرموێ: ئێمەیش داواکەیمان بەجێ هێنا، تەشریفی خۆی شت، پاشان بەناڕەحەتیو داهێزان هەڵسا بچێ نوێژ بکا، بێهۆشی بەسەردا هات، پاشان بەهۆش خۆی هاتەوە، فەرمووی: ئەرێ خەڵکەکە نوێژیان کرد؟ عەرزمان کرد نەخەیر، ئەوان چاوەڕوانی جەنابتن ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئاوم بۆ بکەنە تەشتەوە خۆم دەشۆرم، ئێمەیش بۆمان جێبەجێ کرد، خۆی شۆرد، پاشان هەڵسا بەناڕەحەتی بچێ نوێژەکەی بکا، دووبارە بێ هۆش بۆوە، پاشان بەئاگا هاتەوە، فەرمووی: {أصلى الناس؟} ئەرێ خەڵکەکە نوێژیان کرد؟ وتمان نەخەیر، ئەوان چاوەڕوانی جەنابتن ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمجار خاتو عائیشە باسی ئەوە دەکا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆلای حەزرەتی ئەبو بەکر کە پێشنوێژی بۆ موسوڵمانان بکا، هەروا خاتو عائیشە تەواوی فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە[2]

---

[1] صحيح: (ص. د ٢٧٣)، د (١/٤٨٧/٢٩١)، ن (١/١٨٤).

[2] متفق عليه: م (١/٣١١/٤١٨)، خ (١/١٧٢/٦٨٧).

٤- خۆشۆردن بەهۆی ناشتنی ناموسوڵمانەوە، بەپێی ئەو فەرموودەی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ریوایەتی کردووە، کە گوایە هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتویەتی: ئەبو طالیب مرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووە: بڕۆ بیشارەوە (بینێژە) جا عەلی دەڵێ کە ژێر خاکم کرد، هاتمەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم غوسڵ بکە.[1]

٥- غوسڵی دوو جەژن (جەژنی ڕەمەزان‌و جەژنی قوربان) غوسڵی ڕۆژی عەرەفە. لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە ئیمامی بەیهەقی ریوایەتی کردووە لەرێگەی شافیعی‌یەوە لە زازانەوە، دەڵێ پیاوێك پرسیاری لە ئیمامی عەلی کرد دەربارەی غوسڵ، ئەویش لەوەڵامدا وتی: ئەگەر حەزت لێیە هەموو ڕۆژێك غوسڵ بکە، وتی: نا من مەبەستم ئەو غوسڵەیە کەپێی دەگوترێ. غوسڵ. فەرمووی: غوسڵی ڕۆژی جومعە، ڕۆژی عەرەفە، ڕۆژی جەژنی قوربان‌و ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان.

٦- غوسڵ کردن لەدوای شتنی مردو لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی: « مَنْ غَسَّلَ مَيِّتًا فَلْيَغْتَسِلْ ». کەسێك مردووی شۆرد با دوایی بۆ خۆی غوسڵ بکا.[2]

٧- غوسڵ کردن بۆ ئیحرام بەستن بەعومرە یان بەحەج، ئەمەیش بەپێی حەدیثی زەیدی کوڕی ثابیت، کە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەرم بینی پۆشاکی خۆی داماڵی بۆ پۆشینی لیباسی ئیحرام‌و غوسڵی کرد.[3]

---

[1] صحيح الإسناد: (الجنائز/١٣٤)، ن (١/١١٠)، د (٩/٣١/٣١٩٨).

[2] صحيح: (ص. جه ١١٩٥)، جه (١/٤٧٠/١٤٦٣).

[3] حسن: (الإرواء: ١٤٩)، ن (١/١٦٣/٨٣١).

٨- غوسڵ کردن بۆ چوونە ناو مەککە، لەئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە کە هەرکاتێ ویستبیەتی بچێتە ناو مەککەوە شەو لە (ذى طوى) ماوەتەوە تا بەیانی، غوسڵی کردووە ئەمجار بەرِۆژ چۆتە ناو مەککەوە. واشی لەیادە: کە پێغەمبەریش وای کردووە.(١)

## لابردنی بێ دەستنوێژیو لەشگرانی بە گڵو خۆڵی پاك مەشروعیەتی تەیەموم

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مَّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم – المائدة/٦}: ئەگەر وارێکەوت ئێوە نەخۆش بوون یان لەسەفەردا بوون، یان یەکێ لەئێوە لە ئاودەستخانەوە دەگەرِایەوە خۆی خاڵی کردبووەوە، یان دەستان لەئافرەت دابوو ئاوتان دەست نەکەوت دەستنوێژ بگرن یان غوسڵ بکەن، ئەوە پەنا بەرنە بەر گڵو خۆڵێکی پاك رِوخسارو دەستو بازوی خۆتانی پێ مەسح بکەن پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ طَهُورُ الْمُسْلِمِ وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ».(٢) بێگومان گڵو خۆڵی پاك لابەری بێ دەستنوێژیو لەشگرانی موسوڵمانە، تەنانەت ئەگەر دەساڵیش ئاوی دەست نەکەوێ.

---

(١) متفق عليه: م (١٢٥٩ – ٢٢٧ – ٢/٩١٩) وهذا لفظه. خ (٣/٤٣٥/١٥٧٣)، د (١٨٤٨/٥/٣١٨)، ت (٢/١٧٢/٨٥٤).

(٢) صحيح: (ص. د ٣٢٢)، ت (١/٨١/١٢٤)، د (١/٥٢٨/٣٢٩)، ن (١/١٧١) بالفاظه متقارين.

## ئەو هۆكارانەی دەبنە مایەی رەوابوونی تەیەموم

تەیەموم كردن و بەكارهێنانی گڵ و خۆڵی پاك دروستە كاتێك نەتواندرێ ئاو بەكاربهێندرێ، جا یان لەبەر نەبوونی ئاو، یان ترسی هەبوونی زیان لە بەكارهێنانی لەبەر هەبوونی نەخۆشی بەجەستەوە یان سەرمای زۆر.

لەعیمرانی كوڕی حوصەینەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەرێكدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی بەخەڵكەكە كرد، ڕوانی پیاوێك كەنارگیر بووە، پێی فەرموو: ئەوە بۆ نوێژت لەگەڵ ئێمە نەكرد؟ وتی قوربان لەشم گرانەو ئاویش نیە غوسڵ بكەم، پێی فەرموو: «عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ ، فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ».[1] بچۆ بەگڵی پاك تەیەموم بكە، ئەوە كیفایەتە بۆ تۆ.

لەجابیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەڵێ لەسەفەرێكدا بووین، یەكێك لەئێمە بەردێك بەر سەری كەوت و برینداربوو، پاشان ئیحتیلامی بوو، پرسیاری لەهاوەڵان كرد ئاخۆ ڕوخصەتی تەیەموم كردنی هەیە؟ هاوەڵان وتیان ناوەڵڵا هیچ ڕوخصەتێك نابینین بۆت لەحاڵێكدا تۆ دەتوانی ئاو بەكار بهێنی ئەوە بوو غوسڵی كردو مرد، جا گەڕاینەوە چووینە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕوداوەكەی بۆ گێڕدرایەوە، فەرمووی: «قَتَلُوهُ قَتَلَهُمُ اللَّهُ أَلاَّ سَأَلُوا إِذْ لَمْ يَعْلَمُوا فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ».[2] كوشتویانە، خودا بیانكوژێ، ئەگەر بۆخۆیان شارەزا نەبوون بۆ پرسیاریان لە زانایان نەكرد، خۆ دەرمانی نەزانی پرسیار كردنە، ئەو كابرایە غوسڵ كردنی بەئاو لەسەر نەبوو هەر ئەوەندەی بەس بوو تەیەموم بكا.

---

[1] متفق علیه: خ (١/٤٧٧/٣٤٤)، م (١/٤٧٤/٦٨٢)، ن (١/١٧١).

[2] متفق علیه: خ (١/٤٧٧/٣٤٤)، م (١/٤٧٤/٦٨٢)، ن (١/١٧١).

له عه‌مری كوڕی (ألعاص)ه‌وه ریوایه‌ت كراوه: كه كاتێك نێردراوه بۆ غه‌زای (ذات السلاسل) ده‌ڵێ: له‌شه‌وێكی زۆر ساردو سه‌رمادا ئیحتیلامم بوو، ترسام ئه‌گه‌ر به‌ئاو غوسڵ بكه‌م به‌هیلاك بچم، ته‌یه‌مومم كردو پاشان پێشنوێژی نوێژی به‌یانیم بۆ هاوه‌ڵان كرد، كه گه‌ڕاینه‌وه مه‌دینه ئه‌و حاڵه‌ی منیان بۆ پێغه‌مبه‌ر باس كرد. پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رمووی: « يَا عَمْرُو صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ». ئه‌ی عه‌مر ئه‌وه به له‌شگرانی نوێژت به‌هاوه‌ڵانت كردووه؟ عه‌مر ده‌ڵێ: عه‌رزم كرد: من یادی فه‌رمایشتی په‌روه‌ردگارم كرده‌وه كه ده‌فه‌رموێ: ( وَلاَ تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ). بۆیه ته‌یه‌مومم كردو پاشان نوێژم كرد، ئیتر پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) پێكه‌نیو هیچی نه‌فه‌رموو.[1]

* مانای {الصعید} كه له ئایه‌ته‌كه‌دا هاتووه چییه؟

له‌كتێبی (لسان العرب)دا[2] ده‌ڵێ: (الصعید) به مانا زه‌ویه. گوتراویشه به مانا زه‌وی پاكه. هه‌روا گوتراوه به‌مانا هه‌موو گڵو خۆڵێكی خاوێنه. له قورئاندا هاتووه «فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا». ئه‌بو ئیسحاق وتویه‌تی: (الصعید) به‌مانا روی زه‌ویه، هه‌ر ئه‌وه‌نده پێویسته مرۆڤ ده‌ستی به‌زه‌ویدا ماڵێ، گوێ نه‌داته ئه‌وه‌ی ئاخۆ شوێنه‌كه گڵو خۆڵی لێیه یان نا، چونكه (صعید) به‌مانا گڵو خۆڵ نیه، به‌ڵكوو مه‌به‌ست روی زه‌ویه، جا گڵو خۆڵ بێ یان شتی تر بێ ته‌نانه‌ت وتویه‌تی: ئه‌گه‌ر زه‌ویه‌ك هه‌مووی به‌ردو شاخ بێو گڵی له‌سه‌ر نه‌بێ، ته‌یه‌مومكه‌ر دوو ده‌ستی به‌و به‌ردو شاخه‌دا بماڵێو ڕوخسارو ده‌ستو بازوی خۆی پێ مه‌سح بكا ئه‌وه بۆی ده‌بێته پاكه‌وه‌كه‌ر (طه‌هور).

---

[1] صحيح: (ص. د ٣٢٣)، د (١/٥٣٠/٣٣٠)، حم (٢/١٩١/١٦)، ك (١/١٧٧).

[2] ج ٢٥٤/٣.

## چۆنیەتی تەیەموم

لەعەمماری کوڕی یاسرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئیحتیلامم بوو، ئاوم دەست نەکەوت، خۆم لەگڵو خۆڵدا گەوزاندو پاشان نوێژم کرد دوایی ئەو ڕەفتارەی خۆم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باس کرد، فەرمووی: ئەوەندەت بەس بوو ئاوات بکردایە، لەپێش چاوی خۆم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی بەزەویدا ماڵین‌و فوی لێ کردن‌و ڕوخسارو دوو دەستی خۆی پێ مەسح کردن.[1]

**فائیدەیەک:** قاعیدەو بنەما لە تەیەمومدا ئەوەیە تەیەمموم لە شوێنی دەستنوێژە، ئەوەی بە دەستنوێژ حەڵاڵ دەبێ، بەتەیەمومیش حەڵاڵ دەبێ، پێش هاتنی کات تەیەموم کردن دروستە وەکوو چۆن دەستنوێژگرتن دروستە، دەتوانێ بەیەك تەیەموم چەندێکی بوێ نوێژ بکا، وەکوو چۆن بەیەك دەستنوێژ دەتوانێ چەندێك بتوانێ نوێژ بکا.

## ئەو شتانەی تەیەموم پوچ دەکەنەوە

هەر شتێك دەستنوێژ بەتاڵ بکاتەوە تەیەمومیش پوچ دەکاتەوە، هەروا دەستەبەربوونی ئاو بۆ کەسێك لەبەر بێ ئاوی تەیەمومی کردبێ، یان توانای بەکارهێنانی ئاو بۆ کەسێك لەبەر نەتوانین‌و زیان پێ گەیشتن، ئاوی بەکارنەهێنابێ‌و تەیەمومی کردبێ، ئەمانەیش تەیەموم بەتاڵ دەکەنەوە، ئەگەر کەسێك لەناو نوێژدا بووئەم عوزرانەی نەمان، ئەوە با درێژە بەنوێژەکەی بداو نوێژەکەی صەحیحەو پێویست بەگێڕانەوە ناکا.

لە ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: دوو پیاو بەسەفەرێك لەماڵ دەرچوون، کاتی نوێژیان لێ هات‌و ئاویان دەست نەکەوت،

---

[1] متفق علیه: خ (١/٤٥٥/٣٤٧)، م (١/٢٨٠/٣٦٨)، د (١/٥١٤/٣١٧)، ن (١/١٦٦).

بەزەوییەکی پاك تەیەمومیان کردو نوێژیان کرد. پاشان هێشتا کاتی نوێژەکە تێنەپەڕی بوو ئاویان دەست کەوت، یەکێکیان دەستنوێژی گرتو نوێژەکەی ئیعادە کردەوە ئەوەی تریان نە دەستنوێژی گرتەوەو نە نوێژەکەی گێڕایەوە، پاشان کە گەڕانەوە هاتنە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەومیان بۆ باس کرد، بە ئەوەیانی فەرموو کە نوێژەکەی ئیعادە نەکردبووەوە « أَصَبْتَ السُّنَّةَ وَأَجْزَأَتْكَ صَلاَتُكَ ». ئەتۆ کارەکەت موافیقی سوننەتی منەو نوێژەکەت دروست بووە، کارەکەت موافیقی شەریعەتە. بەوەشیانی فەرموو: کە دەستنوێژی گرتبووەوە نوێژەکەی گێڕابووەوە « لَكَ الأَجْرُ مَرَّتَيْنِ ». ئەتۆ دوو پاداشتت هەیە.

**فائیدەیەک**: کەسێك برینێکی پێوە بوو پێچابووی، یان شوێنێکی شکا بوو هەڵی بەستبووەوە، ئەوە شتنی ئەو شوێنەی لەسەر نیە، پێویست ناکا نە مەسحی لەسەر بکا، نە تەیەمومی بۆ بکا.

سەربەڵگەی ئەم حوکمە فەرمایشتی پەروەردگارە: کە دەفەرموێ: {لاَ يُكَلِّفُ اللّـهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا – البقـرة/٢٨٦}. هەروا فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). «وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ ».[1] هەرکاتێ فەرمانم پێ کردن بەکارێك بەپێی توانای خۆتان بیکەن، چەندێك دەتوانن ئەوەندەی لێ جێبەجێ بکەن، ئەوەتا بەگوێرەی قورئانو سوننەت هەرشتێك لەتوانادا نەبێ لابراوەو حوکمەکەی لاچووە. بەگوێرەی شەرع دەبێ تەعویضی بکاتەوە، شەرعیش بەقورئانو سوننەت نەبێ شت پێویست ناکا، ئاشکراشە نە لەقورئانداو نە لەسوننەتدا ئاماژەیەك نیە بۆ تەعویضو

---

[1] صحيح: (مختصر م ٦٣٩)، م (٢/٩٧٥/١٣٣٧)، ن (٥/١١٠).

بارتەقای مەسح لەسەر شکاویو برینێك کە نەتوانداریێ بشۆریێ، کەوابوو قسەی ئەوە کە مەسح لەسەر برینو شکاوی دەبێ بکریێ رەتدەکرێتەوە.[1]

## دروستە تەیەمموم بەدیوار بکریێ[2]

لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە دەفەرمویێ: منو عەبدوڵڵای کوڕی یەسار؛ (مەولای مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر، دروودی خودای لەسەر بێ) چوینە لای ئەبو جوهەیمی کوڕی (الحارث)ی کوڕی (الصمة)ی ئەنصاری، ئەبو جوهەیم وتی: پێغەمبەر لەلای (بیئری جەمەلەوە)[3] دەهاتەوە. پیاوێك توشی بوو سڵاوی لێ کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە، هەتا روی کردە دیوارێك مەسحی دەمو چاوو دەستو باسکی خۆی پێ کرد، پاشان وەڵامی سڵاوی کابرای دایەوە.[4]

## حوکمەکانی خوێنی عادەی مانگانەو خوێنی پاش منداڵبوون

خوێنی عادەی مانگانە (حیض): خوێنێکە لای ئافرەتان ناسراوو ئاشکرایە، لە شەرعدا ئەندازەیەك نیە بۆ زۆریو کەمی بەڵکوو ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ عادەت.

خوێنی پاش منداڵبوون (النفاس) ئەو خوێنەیە بەهۆی منداڵبوونەوە دێتە دەرەوە. زۆریەکەی چل ڕۆژە.

لە ئەممو سەلەمەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئافرەتە زەیستانەکان لەڕۆژگاری پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چل ڕۆژ

---

[1] المحلى لإبن حزم ج٢/٧٤.

[2] دیوارەکە گڵ بێ یان بەرد بێ، بۆیە کرابێ یان نا.

[3] شوێنێکە نزیك مەدینە.

[4] متفق علیه: خ (١/٤٤١/٣٣٧)، م (١/٢٨١/٣٦٩) معلقاً، د (١/٥٢١/٣٢٥)، ن (١/١٦٥).

دادەنیشتن واتە: نە نوێژو نە ڕۆژو نە سەرجێی ژنو مێردییان ئەنجام نەدەدا.[1]

هەرکاتێك ئافرەتە زەیستانەکە بینی پاکبۆتەوە پێش تەواوبوونی چل ڕۆژەکە، ئەوە غوسڵ دەکاو پاك دەبێتەوە، ئەگەر دوای غوسڵ کردنەکەو دوای تێپەڕبوونی چل ڕۆژەکە خوێنی بینی ئەوە بەتەواوبوونی چل ڕۆژەکە غوسڵ دەکاو پاك دەبێتەوە. ئەو خوێنەی دەیبینی بەخوێنی زەیستان (نفاس) ناژمێردرێ.

## ئەوەی لەسەر ئافرەتی حائیضو زەیستان حەرامە

هەرکارێك بۆ بێ دەستنوێژ دروست نەبێ بۆ حائیضو زەیستانیش حەرامە، زیاد لەو شتانەیش ئەمانەشی لەسەر حەرامن.

١- ڕۆژوو گرتنی لێ حەرامە، کاتێك پاکبۆوە ڕۆژوەکانی دەگرێتەوە.

موعاذە: دەگێڕێتەوە دەڵێ: پرسیارم لەخاتو عائیشە کرد وتم: ئەوە بۆ ئافرەت کە دەکەوێتە عادەی مانگانەوە نوێژ ناکاو ڕۆژوو ناگرێ: کە پاکبۆوە دەبێ ڕۆژوەکانی بگرێتەوە، کەچی نوێژەکانی ناگێڕێتەوە؟ لەوەڵامدا فەرمووی: یەکێك لەئێمەی ئافرەت لەگەڵ پێغەمبەردا دەبووینو دەکەوتینە عادەی مانگانەوە، فەرمانمان پێ دەکرا ڕۆژو بگرینەوە، بەڵام فەرمانمان پێ نەدەکرا بەگێڕانەوەی نوێژەکانمان.[2]

٢- جوتبوون سەرجێی کردن، ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێ: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ

---

[1] حسن صحيح: (ص. جه ٥٣٠)، د (١/٥٠١/٣٠٧)، ت (١/٩٢/١٣٩)، جه (١/٢١٣/٦٤٨).

[2] متفق عليه: م (١/٢٦٥/٣٣٥) وهذا لفظه، خ (١/٤٢١/٣٢١)، ت (١/٨٧/١٣٠)، د (٢٥٩/١/٤٤٤)، جه (١/٢٠٧/٦٣١).

وَلاَ تَقْرَبُـوهُنَّ حَتَّـىَ يَطْهُـرْنَ فَـإِذَا تَطَهَّـرْنَ فَـأْتُوهُنَّ مِـنْ حَيْـثُ أَمَـرَكُمُ اللّـهُ ـ البقرة/٢٢٢}. پرسيارت لیَ دەكەن ئـەی پێغەمبـەرا دەربـارەی خـوێنی عـادەی مانگانەی ئافرەت، بلێ: ئەوە خوێنێكی سورشـتیـیەو ئەزیـەتو نەخۆشییەكە توشـی ئـافرەت دەبـێ، لـەماوەی هـەبوونی ئـەو حاڵەتـەدا خۆتـان لـەئافرەت كەنارگیر بكەن‌و لێیان نزیك مەبنەوە، كە لەو خوێنە پـاك بوونـەوە، دەتـوانن بچنە لایان‌و سەرجێیان لەگەڵدا بكەن بەو شێوەی خودا فەرمانی پێ كردوون. هەروەها ئامـاژە بـە فـەرموودەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) كـە دەفەرموێ: « اصْنَعُوا كُـلَّ شَـىْءٍ إِلاَّ النِّكَـاحَ ».[1] ئەوكاتـەی ئـافرەت لـەعادەی مانگانــەی دایــە بــۆ مێردەكــەی ڕەوایــە هــەموو شــتێكی لەگەڵــدا بكــا جگــە لەجوتبوون. واتە: لـەكاتی بێنوێـژی ئافرەتـدا هـەموو شـتێكیان لەگـەڵ بكـەن جگە لەجوتبوون.

### حوكمی كەسێك چووەلای ئافرەتی بێنوێژو تێكەوتوو لەعادەی مانگانە

ئیمـامی نـەوەوی دەفـەرموێ: ئەگـەر موسـوڵمانێك پێـی وابـوو جوتبـوون لەگەڵ ژنـی لـەعادەی مانگانەكـەوتوو (حـائض) لەپێـشەوەرا حەڵاڵـە بـەكافرو لـەئاین هەڵگـەڕاوە حـسێب دەكـرێ. ئەگـەر پیـاوێـك لـەكاتی عـادەی مانگانـەدا چووە لای خێزانەكەی پێـی وانـەبوو حەڵاڵـە، جـا یـان لـەبیری چـوبوەوە، یـان نەیدەزانی خێزانەكەی لەوحاڵەدایە، یـان نـەیـدەزانی حەرامـە، یـان زۆریـان لێ كـرد ئـەو كـارە بكـاو ناچـاریان كـرد، ئـەوە گونـاهی ناگـاتـێ‌و كـەفارەت‌و فەرمبووشی لەسەر نیە، ئەگەر بە ئەنقەست لەگەڵ ژنەكەی جوتبوو، دەیزانی ژنەكـە لـەعادەی مانگانەدایـەو حەرامیـشە، كەسـیش زۆری لێ نـەكردبوو

[1] صـــحیح: (ص. جـــه ٥٣٧)، م (١/٢٤٦/٣٠٢)، د (١/٤٣٩/٢٥٥)، ت (٤/٢٨٢/٤٠٦٠)، جـــه (٦٤٤/١/٢١١)، ن (١/١٥٢).

بەویستو ئیختیاری خۆی ئەوکارەی کرد، ئەوە بێگومان تاوانی گەورەی ئەنجام داوە.

ئیمامی شافیعی فەرموویەتی ئەو کارە گوناهی کەبیرەیەو واجبە لەسەری تۆبە بکا، ئەمجار ئاخۆ کەفارەتی لەسەر یان نا؟

ئەوەوی دەڵێ: من دەڵێم رای پەسەند ئەوەیە کەفارەتی لەسەرە کە کەفارەت بدا[1] ئەمەیش بەپێی ئەو حەدیثەی ئیبنو عەبباس لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ریوایەتی کردووە کە دەربارەی کەسێك بچێتە لای خێزانی لەعادەی مانگانەدا فەرموویەتی: « يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ».[2] لەپای ئەو تاوانە دینارێك یان نیو دینار دەکا بەخێر.

ئەو تەخیرییەی لەحەدیثەکەدا چەسپاوە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی نێوان چوونە لای لەسەرەتای هاتنی خوێنەکەو کۆتای عادەکە لەبەر ئەو فەرموودەیەی ئیبنو عەبباس بە مەوقوفی ریوایەتی کردووە: کە دەڵێ: (ان أصابها في فور الدم تصدق بدينار وإن كان في آخره فنصف دينار)[3].

## حاڵەتی هەمیشە خوێنی (الإستحاضة)

ئیستیحاضە: جۆرە خوێنێکە کە غەیری کاتی هاتنە دەرەوەی خوێنی عادەی مانگانەو خوێنی دوا منداڵبوون دێتە دەر، یان یەکسەر دوای ئەوان دێتە دەر، جا ئەگەر حاڵەتی یەکەم بوو ئەوە ئاشکراو دیارەو لێك جیادەکرێنەوە. ئەگەر حاڵەتی دووەم بوو، ئەوە تێدەکرین. ئەگەر

[1] شرح النووي على مسلم ج٣/٢٠٤.

[2] صحيح (ص. جـه ٥٢٧)، م (١/٢٤٦/٣٠٢)، د (١/٤٣٩/٢٥٥)، ت (٤/٢٨٢/٤٠٦٠)، جـه (٦٤٤/١/٢١١)، ن (١/١٥٢).

[3] صحيح موقوف (ص. د ٢٣٨)، د (١/٢٤٩/٢٦٢).

ئافرەتەکە (معتادة) بوو واتە: عادەی مانگانەی ڕێكو پێكو زاندراو بوو، ئەوە چی لە عادەی مانگانەی زیادبێ، بەخوێنی ئیستیحاضە (هەمیشە خوێن) دادەندرێ. ئاماژە بە فەرمایشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): کە بە ئوممو حەبیبەی فەرموو: « امْكُثِي قَدْرَ مَا كَانَتْ تَحْبِسُكِ حَيْضَتُكِ ثُمَّ اغْتَسِلِي وَصَلِّي». [1] بەئەندازەی ماوەی عادەی مانگانەی خۆت خۆت بگرەو، پاشان غوسڵ بکەو نوێژ بەجێ بێنە.

ئەگەر ئافرەتە خوێن بەربووەکە جوداوازی نێوان دوو خوێنەکەی بۆدەکرا، ئەوە خوێنی حەیزەکە، خوێنێکی گەشو ڕەشو ناسراوە، ئافرەت بۆخۆیان باش دەیناسن. ئەگەر وانەبوو ئەو خوێنی ئیستیحاضەو هەمیشە خوێنە. ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): کە ئاراستەی فاطیمەی کچی ئەبو حوبەیشی کرد فەرمووی: (اذا كان دم الحيض فأنه أسود معروف فأمسكي عن الصلاة، فإذا كان الآخر فتوضئ فإنما هو عرق). [2] ئەگەر خوێنەکە خوێنی حەیز بوو ئەوە خوێنێکی گەشو ڕەشو ناسراوە، لەو ماوەدا واز لەنوێژ کردن بێنە، ئەگەر خوێنەکە ڕەنگی بەو جۆرە نەبوو، ئەوە دەستنوێژ بگرەو نوێژ بکە چونکە ئەو خوێنی حەیز نیە.

ئەگەر ئافرەتەکە بە حاڵەتی هەمیشە خوێنیو خوێن بەربوویی ڕەسیدە بوو، نەیدەتوانی جوداوازی بخاتە نێوان خوێنەکانو بۆی لێك نەدەکرانەوە ئەوە بەگوێرەی ئافرەتی خزمو هاو نیشتمانی خۆی حیسابی بۆ دەکرێ.

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٠٢)، م(٣٣٤-٦٥-١/٢٦٤).

[2] صحيح: (الإرواء/٢٠٤)، ن(١/١٨٥)، د(٢٨٣/١/٤٧٠).

ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ): کە بە حەمنەی کچی جەحشی فەرموو: « إِنَّمَا هَذِهِ رَكْضَةٌ مِن رَكَضَاتِ الشَّيْطَانِ فَتَحَيَّضِي سِتَّةَ أَيَّامٍ أَوْ سَبْعَةَ أَيَّامٍ فِي عِلْمِ اللَّهِ ثُمَّ اغْتَسِلِي حَتَّى إِذَا رَأَيْتِ أَنَّكِ قَدْ طَهُرْتِ وَاسْتَنْقَأْتِ فَصَلِّي ثَلَاثًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً أَوْ أَرْبَعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَأَيَّامَهَا وَصُومِي فَإِنَّ ذَلِكَ يُجْزِئُكِ وَكَذَلِكَ فَافْعَلِي فِي كُلِّ شَهْرٍ كَمَا تَحِيضُ النِّسَاءُ وَكَمَا يَطْهُرْنَ مِيقَاتَ حَيْضِهِنَّ وَطُهْرِهِنَّ».[1] ئەوە سەر لێ شێواندنێکی شەیتانە، وای لێ دەکا نەزانێ کامە خوێنی حەیزەو کامە خوێنی (ئیستیحاضە)یە، بە حەمنەی فەرموو: شەش رۆژ یان حەوت رۆژ خۆت بەبێ نوێژ دابنێ، باش ورد بەرەوە لەحاڵی ئافرەتی بێ نوێژ لەخزمو کەس‌و کارو هاوتەمەنی خۆت، بۆئەوەی پەی بەری بە ماوەی بێنوێژی راستەقینەی خۆت بەقیاس بۆسەر عادەی مانگانەی ئەوان، دەق وەکوو ئەو ماوەیەی لەزانستی خودادا هەیە. پاشان خۆت پاك بشۆرەو بیست‌و سێ شەو بەرۆژەکانیەوە یان بیست‌و چوار شەو بەرۆژەکانیەوە نوێژی خۆت بکەو رۆژوی خۆت بگرە.

ئیتر ئەمەت بەسە، هەموو مانگێك بەم شێوە عادەی مانگانەت بڕیاربدە، ماوەی بێنوێژی خۆت بەرامبەر بکە بەماوەی بێ نوێژی ژنانی تر لە خزم‌و هاوتەمەنانت، ماوەی پاکی‌و بێ نوێژی خۆت بە (قیاس) بۆسەر حاڵی ئەوان دیاری بکە.

## ئەو حوکمانەی تایبەتن بە ئافرەتی هەمیشە بێنوێژ (مستحاضة)

هیچ شتێ لەوانەی لەسەر ئافرەتی حەیزدار حەرام دەبێ، لەسەر ئافرەتی هەمیشە بێ نوێژ حەرام نابێ، وەلێ ئەوەندە هەیە پێویستە ئافرەتی موستەحاضە بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرێ. بە پێی فەرموودەی

[1] حسن: (الإرواء/٢٠٥)، د(٢٨٤/٤٧٥/١)، ت(١٢٨).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)؛ کە ئاراستەی فاطیمەی کچی ئەبو حوبەیشی کرد؛ پێی فەرموو: « ثُمَّ تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلاَةٍ».[1] واتە: ئەمجار دەستنوێژ بگرە بۆ هەموو نوێژێك. سوننەتە بۆ ئافرەتی هەمیشە بێنوێژ بۆ هەموو نوێژێك غوسڵ بکا، وەکوو لەوەپێش لەباسی غوسڵە سوننەتەکاندا تێپەڕی.

## كتاب الصلاة
## باسی نوێژ

وشەی (صلاة) لە زماندا بەمانا نزاو پاڕانەوەیە بەخێر قورئان دەفەرموێ: (وَصَلِّ عَلَيْهِمْ). واتە: دوعای خێریان بۆبکە. لە زاراوەی شەرعدا (صلاة) بریتییە لە کۆمەڵێك گوفتارو رەفتار: کە بەگوتنی (الله أكبر) دەست پێدەکرێن و بەسەلامدانەوە کۆتاییان دێ، وێڕای لەبەرچاو گرتنی چەند مەرجێکی تایبەتی.[2]

نوێژی فەرز پێنج نوێژن. نوێژی نیوەڕۆ، نوێژی عەصر، نوێژی شێوان، نوێژی خەوتنان، نوێژی بەیانی.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لەو شەوەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەوڕەوی پێ کرا پەنجا نوێژ لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرزکرا، پاشان لێیان کەم کرایەوە تابوونە پێنج نوێژ. ئەمجار بانگ لە پێغەمبەر کرا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەی موحەممەد! ئەوە بزانە بڕیاری من گۆڕانکاری بەسەردا نایە، ئەتۆ بەکردنی ئەم پێنج نوێژە پاداشی پەنجا نوێژت هەیە.[3]

---

[1] صحيح: (ص.جة/٥٠٧)، د(١٩٥/١/٤٩٠)، جة(٦٢٤/١/٢٠٤).

[2] مغنى المحتاج (ج ١/١٢٠).

[3] متفق عليه: ت(٢١٣/١/١٣٧) هكذا مختصراً واخرجه مطولاً خ(٣٨٨٧/٧/٢٠١).

له طه‌لحه‌ی كوڕی عوبه‌یدیلاوه ڕیوایه‌تكراوه، ده‌ڵێ: كابرایه‌كی عه‌ره‌بی ده‌شته‌كی هاته خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ)، قژ ژاكاو، وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا! پێم بڵێ: خودا ڕۆژی چه‌ند نوێژی له‌سه‌ر فه‌رزكردوم، پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رمووی: « الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ ، إِلاَّ أَنْ تَطَّوَّعَ شَيْئًا ». له شه‌وو ڕۆژێكدا پێنج نوێژت له‌سه‌ر فه‌رزكراوه، جگه له‌نوێژی سوننه‌ت كه بۆ خۆت به ویستی خۆت بته‌وێ نوێژی سوننه‌ت بكه‌ی.

## پله‌و پایه‌ی نوێژ له ئاییندا

له عه‌بدوڵلای كوڕی عومه‌ره‌وه ڕیوایه‌تكراوه، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رمووی: « بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَإِقَامِ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَحَجِّ الْبَيْتِ وَصَوْمِ رَمَضَانَ ».[1]

ئاییینی ئیسلام له‌سه‌ر پێنج پایه بنیات نراوه:

یه‌كه‌م: شایه‌تیدان به‌وه‌ی هیچ خودایه‌ك نیه شیاوی په‌رستش‌و به‌ندایه‌تی بۆ كردن بێ جگه له (الله)، هه‌روه‌ها شایه‌تی ده‌ده‌م: كه حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د ره‌وانه‌كراوی په‌روه‌ردگاره.

دووه‌م: به‌جێهێنانی نوێژ.

سێیه‌م: ده‌ركردنی زه‌كات له ماڵ‌و سامان.

چواره‌م: حه‌جكردنی ماڵی خودا.

پێنجه‌م: ڕۆژوو گرتنی مانگی ره‌مه‌زان.

---

[1] متفق عليه: م(١٦-٢٠-١/٤٥) وهذا لفظه، خ(١/٤٩/٨)، ت(٤/١١٩/٢٧٣٦)، ن(٨/١٠٧).

## حوكمی نوێژ نەکەر

موسوڵمانان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە کەسێك ئینکاری فەرزبوونی نوێژ بکا کافر دەبێ‌و لە چوارچێوەی ئایینی ئیسلام دەردەچێ، بەڵام راجیاییان تێکەوتووە دەربارەی کەسێك نوێژ نەکاو بڕواشی وابێ واجبە، هەندێك دەڵێن: کافر دەبێ، هەندێك دەڵێن: تاوانبار دەبێ‌و لە ئایین دەرناچێ. هۆکاری ئەم راجیاییە، چەند حەدیسێکن لە پێغەمبەرەوە ریوایەتکراون: بەزەقی‌و ئاشکرا ئەوە جوداوازییە دەخەنە نێوان نوێژ نەکەری تەمبەڵ‌و لاسار لەگەڵ نوێژ نەکەری بێ بڕواو مونکیر.

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلَاةِ»[1]: بێگومان نێوانی مرۆڤو کوفرو هاوبەشپەیداکردن وازهێنانە لەنوێژ.

## نوێژ نەکردن

لە بورەیدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: «الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلَاةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ».[2] ئەو عەهدو پەیمانەی لەنێوان ئێمەی موسوڵمان‌و ئەوانی کافردا هەیە بریتییە لەنوێژ، نوێژ نیشانەی جیاکردنەوەی ئێمەیە لە ئەوان. جا کەسێك بە ئەنقەست نوێژ نەکا ئەوە بێگومان کافرە. وەڵ رای پەسەند لای زانایانی ئیسلام ئەوەیە: کە مەبەست بە کوفر لێرەدا کوفری بچوکە: کە نابێتە هۆکاری دەرچوونی مرۆڤ

---

[1] صحيح: (ص.ج/٢٨٤٨)، م(١/٨٢/٨٨) وهذا لفظه. د(١٢/٤٣٦/٤٦٥٣). ت(٢٧٥/٤/١٢٧)، جة(١/٣٤٢/١٠٧٨).

[2] صحيح: (ص.ج/٨٨٤)، جة(١/٣٤٢/١٠٧٩)، ن(١/٢٣١)، ت(١/١٢٥/٢٧٥٦).

لەئايين، بە لەبەرچاو گرتنی ئەم رايە دەتوانين جەمع بکەين لەنێوان ئەم فەرمودانەو فەرمودەی تر کە هەندێکيان ئەمانەن:

لە عوبادەی کوڕی صاميتەوە ڕيوايەتکراوە، دەڵێ: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەيفەرموو: «خَمْسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَى الْعِبَادِ مَنْ أَتَى بِهِنَّ لَمْ يُضَيِّعْ مِنْهُنَّ شَيْئاً اسْتِخْفَافاً بِحَقِّهِنَّ كَانَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَهْدٌ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ وَمَنْ لَمْ يَأْتِ بِهِنَّ فَلَيْسَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ».[1]؛ پێنج فەرزی نوێژ لە شەوو رۆژێکدا خودا پێويستی کردوون لەسەر بەندەکان، کەسێك بەرێكو پێکی بەجێيان بێنێ هيچ نوێژێك نەفەوتێنێ بەهۆی کەمتەرخەمييەوە يان بەهەند نەگرتنيان، ئەوە خودا وادەی داوە بيخاتە بەهەشتەوە، کەسێك بەجێيان نەهێنێ، ئەوە هيچ عەهدو پەيمانێکی لای خودا نيە، مەيلی لێ بێ سزای دەدا مەيلی لێ بێ لێی خۆش دەبێ.

کە دەبينين پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاری ئەو کەسەی بەرێكو پێکی نوێژەکانی بەجێ ناهێنێ، دەخاتە مەشيئەتی پەروەردگارەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە نوێژ نەکردن ناچێتە پلەی کوفرو شيرکەوە، ئاماژە بەدەقی ئايەتی {إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا – النساء/٤٨}. پەروەردگار هەرگيز لەوە خۆشنابێ هاوەڵی بۆ دابندرێ، ئەوە تاوانێکە خودا بڕياری داوە لێی خۆش نەبێ، بەڵام تاوانی تر بە مەشيئەتی خۆی يان سزای دەدا، يان لێی دەبورێ.

لە ئەبو هورەيرەوە ڕيوايەتکراوە، دەڵێ: لە پێغەمبەرم بيست دەيفەرموو: « إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الصَّلاَةُ الْمَكْتُوبَةُ فَإِنْ أَتَمَّهَا وَإِلاَّ قِيلَ انْظُرُوا هَلْ لَهُ مِنْ تَطَوُّعٍ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ أُكْمِلَتِ الْفَرِيضَةُ مِنْ

---

[1] صحيح: (ص.جة/١١٥٠)، ط(٩٠/٣٦٦)، حم(٢/٢٣٤/٨٢)، د(٢/٩٣/٤٢١)، جة(١٤٠١/١/٤٤٩)، ن(١/٢٣٠).

تَطَوُّعِهِ ثُمَّ يُفْعَلُ بِسَائِرِ الأَعْمَالِ الْمَفْرُوضَةِ مِثْلُ ذَلِكَ».[١] یەکەم شتێك کە ڕۆژی قیامەت لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ لەگەڵ مرۆڤی موسوڵمان نوێژە فەرزەکانن، جا ئەگەر لەو لێکۆڵینەوە بەسەرفرازی رزگاری بوو ئەوە باشە، خۆ ئەگەر لەنوێژە فەرزەکاندا کەم‌و کورتی هەبوو، دەگوترێ بڕوانن: ئاخۆ نوێژی سوننەتی هەن؟ ئەگەر هەیبوو، کەم‌و کورتی فەرزەکانی پێ تەواو دەکرێ، پاشان بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ کارە فەرزەکانی تری دەکرێ.

لە حوزەیفەی کوڕی (الیمان)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایینی ئیسلام کاڵ دەبێتەوە تین‌و کاریگەری نامێنێ وەکوو چۆن قوماش ڕەنگ‌و گوڵی کاڵ دەبنەوە، هەتا وای لێ دێ نازاندرێ ڕۆژوو چیەو نوێژ چیە، تاعەت‌و حەج‌و خێرو صەدەقە چیە، وای لێ دێ قورئان دەسڕدرێتەوە لە شەوێکدا ئایەتێکی لێ نامێنێتەوە، چەند کۆمەڵێك لە خەڵکان دەمێننەوە پیرەمێردو پیرەژن دەڵێن: ئێمە باوك‌و باپیری خۆمانمان دیوەو لێمان بیستوون دەیانگوت: (لا الە الا الله) ئێمەیش لاسایی ئەوان دەکەینەوە قسەکەی ئەوان دەڵێینەوە) صیلە بە حوزەیفەی گوت: جا کە ئەوان نوێژو ڕۆژو حەج‌و خێرو خێرات نەزانن، گوتنی (لا اله الا الله) چ سودێکیان پێ دەگەیەنێ؟! حوزەیفە ڕوی لێ وەرگێڕا، صیلە دوبارە هەمان پرسیارو دەستەواژەی ئاراستە کردەوە تاسێ‌جارو هەموو جارێ حوزەیفە ڕوی لێ وەردەگێڕا، دوایی حوزەیفە ڕوی کردە صیلەو وتی: گوتنی (لا اله الا الله) ڕزگاریان دەکا لەئاگر سێ‌جار ئەو قسەی دووبارە کردەوە.[٢]

---

[١] صحيح: (ص.جة/١١٧٢)، جة(١٤٢٥/١/٤٥٨) وهذا لفظه، ت(٤١١/١/٢٥٨)، ن(١/٢٣٢).

[٢] صحيح: (ص.ج/٣٢٧٣)، جة(٤٠٤٩/٢/١٣٤٤).

## نوێژ لەسەر کێ واجبە؟

نوێژ واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی ڕەسیدەو عاقڵ. ئیمامی عەلی دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ».[1] ئەرك‌و بەرپرسیاریەتی لەسەر سێ جۆر مرۆڤ هەڵگیراوە نوستوو تا بەخەبەر دێ، منداڵ تا ڕەسیدە دەبێ، شێت هەتا عاقڵ دەبێ.

پێویستە سەرپەرشتیاری منداڵ فەرمان بە منداڵەکە بکا: بەنوێـژ کـردن – هەرچەندە نوێژی لەسەر واجب نیە – بۆئەوەی لەسەر نوێژکردن ڕابێ‌و باری پێوە بگرێ.

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکییەوە لە باپیریەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مُرُوا أَوْلاَدَكُمْ بِالصَّلاَةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرِ سِنِينَ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ».[2] ئامۆژگاری منداڵەکانتان بکەن بە نوێژکردن کاتێ دەگەنە تەمەنی حەوتساڵی. هەڵیان بنێن بۆ ئەنجامدانی نوێژ لە تەمەنی دە ساڵیدا، جێگای نوستنیشیان لێك جیابکەنەوە.

## کاتەکانی نوێژ

لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: حەزرەتی جوبرائیل هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو هەڵسە نوێژ بکە، لەکاتێکدا خۆر لە ناوقەدی ئاسمان لایدابوو نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان لەکاتی عەصردا هاتەوە لای پێی فەرموو: هەڵسە نوێژی عەصر بکە، نوێژی

---

[1] صحيح: (ص.ج/٣٥١٣)، د(٤٣٨٠/٧٨/١).

[2] حسن (ص. ج/٥٨٦٨)، د(٤٩١/١٦٢/٢) وهذا لفظه حم(٨٤/٢٣٨/٢)، ك(١/١٩٧).

عەصری بەجێ هێنا کاتێك سێبەری هەموو شتێك بە ئەندازەی شتەکە خۆی بوو، پاشان لەکاتی خۆرئاوابوون هاتەوە لای و فەرمووی: هەڵسە نوێژی مەغریب بکە، نوێژی مەغریبی ئەنجامدا کاتێك خۆر ئاوابوبوو، پاشان کاتی خەوتنان هاتەوە لای فەرمووی: هەڵسە نوێژی خەوتنان بکە، ئەویش هەڵسا نوێژی خەوتنانی ئەنجامدا، کاتێك سورایی کەناری ئاسمان نەمابوو، پاشان بەیانی هاتەوە لای پێی فەرموو: هەڵسە نوێژی بەیانی ئەنجام بدە، نوێژی بەیانی کرد کاتێك روناکایی بەیانی دیاری دا، یان کاتێك کە روناکایی فەجر لە کەناری ئاسمان پرتەو بەخش بوو. بۆ رۆژی دوایی حەزرەتی جوبرائیل هاتەوە لای بۆ دیاریکردنی کاتی نوێژی نیوەرۆ پێی فەرموو: هەڵسە نوێژی نیوەرۆ بکە، نوێژی نیوەرۆی ئەنجامدا کاتێك سێبەری هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆی لێ هاتبوو. پاشان بۆ نوێژی عەصر هاتەوە لای فەرمووی: نوێژی عەصر بەجێ بێنە، ئەویش نوێژی کرد لەکاتێکدا سێبەری هەموو شتێك دوو چەندانەی خۆی لێ هاتبوو، پاشان کاتی نوێژی شێوان هاتەوە لەهەمان کاتی دیاریکراوی رۆژی یەکەمدا نوێژی شێوانی کرد، پاشان کاتی نوێژی خەوتنان هاتەوە نیوەی شەو رۆیشتبوو، یان سێیەکی شەو رۆیشتبوو نوێژی عیشای کرد، پاشان بۆ نوێژی بەیانی، کاتێك کە بەتەواوی دونیا روناك بوبوەوە، فەرمووی: هەڵسە نوێژی بەیانی بکە، ئەمجار فەرمووی: نێوان ئەم دوو کاتانە بۆ هەموو نوێژەکان کاتی نوێژە[1].

ئیمامی تیرمیذی: فەرموویەتی: موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری فەرموویەتی: راسترین حەدیث دەربارەی کاتەکانی نوێژ حەدیثی جابیرە.

١- نوێژی نیوەرۆ کاتەکەی لەلادانی خۆر لە ناوەراستی ئاسمان دەست پێ دەکا تاوای لێ دێ سێبەری هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆوی لێ دێ.

---

[1] صحيح: (الإرواو/٢٥٠)، حم(٢/٢٤١/٩٠)، ن(١/٢٦٣).

٢- نوێژی عەصر: کاتەکەی لەوساتەوەختەوە دەست پێ دەکا کەسێبەری هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆی لێ بێ، تا خۆرئاوابوون.

٣- نوێژی شێوان: کاتەکەی لەخۆرئاوابوونەوەیە تا ئاوابوونی سورایی کەناری ئاسمان (الشفق الأحمر)، ئەمەیش بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «وَقْتُ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ».[1] کاتی نوێژی شێوان لە خۆرئاوابوونەوەیە هەتا سورایی فەراخی ئاسمان دیاربێ.

٤- نوێژی خەوتنان: کاتەکەی لە ئاوابوونی سورایی ئاسمانەوەیە تا نیوەی شەو، ئامـاژە بە فەرمووده‌ی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «وَقْتُ صَلاَةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الأَوْسَطِ».

٥- نوێژی بەیانی: کاتەکەی لە روناکبوونەوەی ئاسۆی ئاسمانە تا خۆر دەردەکەوێ. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): کە دەفەرموێ: (وَوَقْتُ صَلاَةِ الصُّبْحِ مِنْ طُلُوعِ الْفَجْرِ مَا لَمْ تَطْلُعِ الشَّمْسُ)[2] کاتی نوێژی بەیانی لە دەرکەوتنی فەجری صادقەوە دەست پێ دەکا تا خۆر دەردەکەوێ.

## مەبەست بە (صلاة الوسطى) چیە؟

قورئان دەفەرموێ: {حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ – البقرة/٢٣٨} ئاگاداری نوێژەکان بکەن‌و بە رێك‌و پێکی‌و لەکاتی خۆیانـدا، بەتایبەتی نوێژی ناوەڕاست واتە نوێژی عەصر. بەملکەچی‌و لێبڕانەوە بەندایەتی خودا بکەن.

---

[1] حسن: (الإرواء٢٦٨/١)، م(٦١٢-١٧٣-١/٤٣٧) وهذا لفظه، د(٢/٦٧/٣٩٢)، ن(١/٢٦٠)، ت(١/١٠١/١٥٠).

[2] حسن (الإرواء ١/٢٦٨) المصادر السابقة.

له ئیمامی عەلییەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: ڕۆژی ئەحزاب پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «شَغَلُونَا عَنِ الصَّلاَةِ الْوُسْطَى صَلاَةِ الْعَصْرِ مَلأَ اللَّهُ بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا».[1] گەلەکۆمەکیکارە کافرەکان وایان لێ کردین نوێژی عەصرمان لەیادبچێو لەکاتی خۆیدا بۆمان نەکرێ، خودا ماڵەکانیان پڕبکا لەئاگر.

## واباشە نوێژی نیوەڕۆ جگە لەکاتی گەرمای زۆر لەسەرەتای کاتدا بکرێ

جابیری کوڕی سەمورە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عادەتی وابوو هەر لەگەڵ خۆر لەنیوەی ئاسمان کلا دەبوو نوێژی نیوەڕۆی بەجێ دێنا.[2]

## واباشە لەکاتی گەرمادا نوێژی نیوەڕۆ دوابخرێ

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا فەرمووی: « إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلاَةِ». ئەگەر گەرما بەهێزبوو نوێژی نیوەڕۆ دوابخەن تا کەمێك تینی گەرما دەڕواو سێبەر دادەکەون. چونکە گرەی گەرمای نیوەڕۆ لە هالاوی دۆزەخە.[3]

له ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) عادەتی وابوو نوێژی عەصری دەکرد هێشتا خۆر بەرزبوو شۆڕ

---

[1] صحيح: مختصر م(٢١٧)، م(٦٢٧ – ٢٠٥ – ١/٤٣٧).

[2] صحيح: (الإرواء/٢٥٤)، م(٦١٨/١/٤٣٢).

[3] متفق عليه: م(٦١٥/١/٤٣٠) وهذا لفظه خ(٢/١٥/٥٣٣)، د(٢/٧٥/٣٩٨)، ت(١/١٠٥/١٥٧)، ن(١/٢٤٨)، جة(١/٢٢٢/٦٧٧).

نەبووبووەوە، کابرا نوێژی عەصری لەگەڵ پێغەمبەردا دەکرد دوایی دەڕۆیی بۆ (الموالی)[١] و دەهاتەوە ناو مەدینە هێشتا خۆر بەرزبوو.[٢]

## تاوانی فەوتاندنی نوێژی عەصر

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: «الَّذِي تَفُوتُهُ صَلاَةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ».[٣] کەسێك نوێژی عەصری فەوتا، دەبێ وابزانێ: کە ماڵو خێزانی کەم بۆتەوە، واتە: چەندی پێ ناخۆشە ماڵو خێزانی بفەوتێو کەم بکا، دەبێ ئەوەندەشی پێ ناخۆش بێ نوێژی عەصری بفەوتێ.

لە بورەیدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ تَرَكَ صَلاَةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ».[٤] کەسێك نوێژی عەصر نەکا، کردەوە چاکەکانی پوچ دەبنەوە.

## تاوانی کەسێك نوێژی عەصر دوابخا تاکاتی زەردەپەڕ

لەئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: « تِلْكَ صَلاَةُ الْمُنَافِقِ يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَّمْسَ حَتَّى إِذَا كَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ قَامَ فَنَقَرَهَا أَرْبَعًا لاَ يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهَا إِلاَّ قَلِيلاً».[٥] دواخستنی نوێژی عەصر بۆ کاتی زەردەپەڕ ئەوە شێوە نوێژکردنی دووڕووە، رادەوەستێ چاودێری خۆر دەکا تا دەگاتە (نێوان دوو شاخی شەیتان)ئەوکاتە

---

[١] الموالی: شوێنێکە لە دەوروبەری مەدینە.

[٢] متفق علیه: خ(٥٥٠/٢٨/٢)، م(٦٢١/٤٣٣/١).

[٣] متفق علیه: م(٦٢٦/٤٣٥/١)، خ(٥٥٢/٣٠/٢)، د(٤١٠/٨٤/٢)، ت(١٧٥/١١٣/١)، ن(٢٣٨/١).

[٤] صحیح: (ص.ن/٤٩٧)، خ(٥٥٣/٣١/٢)، ن(٢٣٦/١).

[٥] صحیح(ص.د/٣٩٩)، م(٦٢٢/٤٣٤/٢١) وهذا لفظه (٤٠٩/٨٣/٢)، ت(١٦٠/١٠٧/١)، ن(٢٥٤/١).

هەڵدەستێ وەکوو مریشك چەند جارێك دەندوك بەزەویدا دەدا گوایە نوێژ دەکاو سوژدە دەبا، کەم کەم نەبێ یادی خودا ناکا.

## واباشە نوێژی شێوان زوو ئەنجام بدرێو دوانەخرێ

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لاَ تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ أَوْ عَلَى الْفِطْرَةِ مَا لَمْ يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ حَتَّى تَشْتَبِكَ النُّجُومُ». ئوممەتی من لەناو خێرو چاکەدا دەبن یان لەسەر فیترەتو ئایین بەردەوامن، بەمەرجێ نوێژی شێوان دوانەخەن بۆ کاتێك شەو تاریك دەبێو ئەستێرەکان تێك دەچەرژێن.[1]

لە سەلەمەی کوڕی (الأکوع)ەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەری خودا عادەتی وابوو: کەخۆر ئاوادەبوو خۆی لەپەردەدا دەشاردەوە نوێژی شێوانی ئەنجام دەدا.

## واباشە نوێژی عیشا دوابخرێ تا نەگاتە ئاستی مەشەقەت

لەخاتو عائیشەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: شەوێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی خەوتنانی دواخست تاشەو زۆری لێ رۆیی، وە هەتا ئەهلی مزگەوت خەویان لێ کەوت، پاشان تەشریفی هاتە دەرو نوێژی کردو فەرمووی: «إِنه لوقتها لَوْلاَ أَنْ يَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي».[2] ئەم کاتە کاتی هەڵبژێراوەو کاتی باشترە بۆ ئەنجامدانی نوێژی

---

[1] حسن صحيح: (ص.د/٤٠٣)، د(٤١٤/٨٧/٢).

[2] صحيح: (مختصر. م/٢٢٣)، م(٦٣٨-٢١٩-٤٤٢/١).

خەوتنان، ئەگەر نەبوایە بە ئەرکی قورس لەسەر ئوممەتەکەم بەجێهێنانی نوێژی عیشامان دەخستە ئەمکاتە.

## نووستن پێش نوێژی خەوتنانو قسەکردنی بێ سوود دوا ئەنجامدانی مەکروهن

لەئەبو بەرزەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) نووستنی پێش نوێژی عیشای بەلاوە باش نەبوو، هەروا قسەکردنی بێ سودیشی دوا ئەنجامدانی نوێژی خەوتنانی بەلاوە پەسەند نەبوو.[1]

لە ئەنەسەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: شەوێك چاوەڕوانی پێغەمبەرمان کرد (دروودی خودای لەسەر بێ) تا خەریکبوو بگەینە نیوە شەو، ئەوجار تەشریفی هات پێش نوێژی بۆ کردین، پاشان وتاری بۆ خوێندینەوە فەرمووی: «أَلاَ إِنَّ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا ثُمَّ رَقَدُوا ، وَإِنَّكُمْ لَمْ تَزَالُوا فِي صَلاَةٍ مَا انْتَظَرْتُمُ الصَّلاَةَ».[2] بزانن خەڵك نوێژیان کردو پاشان نووستن، ئێوە ئەو چاوەڕوانییەتان وابۆ حیساب دەکرێ وەکوو لەنوێژدابن وایە.

## واباشە نوێژی بەیانی زووبکرێ (لە تاریكو رونی بەیانیدا)

لەخاتو عائیشەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: ئافرەتانی موسوڵمان لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی نوێژی بەیانی دەبوون بە لەچکەو چارۆکەکەیان خۆیان دادەپۆشیو هیچ

---

[1] متفق علیه: خ(٥٦٨/٤٩/٢)، م(٦٤٧-٢٣٧-١/٤٤٧)، د(٣٩٤/٦٩/٢)، ن(١/٢٤٦).

[2] متفق علیه: خ(٦٠٠/٧٣/٢) هذا لفظه، م(٦٤٠/٤٤٣/١)، ن(١/٢٦٨).

شوێنێکی جەستەیان نەدەبیندرا، پاشان دەگەڕانەوە بۆماڵەکانیان لەدوای بەجێهێنانی نوێژ، لەبەر تاریکی کەس نەیدەناسین.[١]

## کەی نوێژکەر واحیساب دەکرێ نوێژی لەکاتدا کردوە؟

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: « مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ ، وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الْعَصْرَ »[٢]: کەسێك پێ ڕاگەیی پێش خۆرهەڵات ڕکاتێك لەنوێژی بەیانی بکا ئەوە وادادەندرێ نوێژی بەیانی لەکاتی خۆیدا کردوە، کەسێك پێڕاگەیی ڕکاتێك لەنوێژی عەصر پێش خۆرئاوابوون ئەنجام بدا، ئەوە مانای وایە نوێژی عەصری لەکاتی خۆیدا ئەنجام داوە.

ئەم حوکمە تایبەت نیە بەنوێژی بەیانیو عەصر، بەڵکوو ئەوە گشتییە بۆ هەموو نوێژێك.

لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ ».[٣] کەسێك فریابکەوێ ڕکاتێك لەنوێژ لەکاتی خۆی دا بکا ئەوە فریاکەوتووە هەموو نوێژەکە لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدا.

---

[١] متفـــق عليـــه: خ(١/٥٤/٥٧٨)، م(١/٤٤٥/٦٤٥)، د(٥/٩١/٤١٩)، ن(١/٢٧١)، ت(١/١٠٣/١٥٣)، جة(١/٢٢٠/٦٦٩)؟

[٢] خ(١/٥٦/٥٧٩)، م(١/٤٢٤/٦٠٨)، ن(١/٢٧٣) نحوه.

[٣] متفق عليه: خ(١/٥٧/٥٨٠)، م(١/٤٢٣/٦٠٧)، د(٣/٤٧١/١١٠٨)، ت(٢/١٩/٥٢٣)، ن(١/٢٧٤).

## گێڕانەوەی نوێژی فەوتاو

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مَنْ نَسِيَ صَلاَةً أَوْ نَامَ عَنْهَا فَكَفَّارَتُهَا أَنْ يُصَلِّيَهَا إِذَا ذَكَرَهَا».[1] کەسێك نوێژێکی لەیادچوو لەکاتی خۆیدا بیکا، یان خەوی لێ کەوت تا کاتەکەی تێپەڕی ئەو کەفارەتەکەی ئەوەیە کە هەرکاتێ بیری کەوتەوە نوێژەکە بکا.

## ئایا کەسێك بەئەنقەست نوێژی نەکرد تا کاتەکەی تێپەڕی بۆی هەیە بیگێڕێتەوە؟

ئیبنو حەزم[2] دەڵێ: پەروەردگار بۆ هەموو نوێژێکی فەرز کاتی سەرەتاو کۆتایی داناوە، کاتێکی مەحدود کاتی نوێژەکە دێو کاتێکی مەحدودیش کاتەکە کۆتایی دێ. کەوابێ هیچ جوداوازیی نیە لەنێوان کەسێك نوێژەکە پێش هاتنی کات بکا، یان دوای کات بیکا، هەردوکیان نوێژەکەیان لە غەیری کاتی خۆیدا ئەنجام داوە.

وێڕای ئەوەش نوێژ گێڕانەوە دەبێ شەرع بیچەسپێنێ، شەرع دانانیش بۆ غەیری خودا دروست نیە، دەبێ پەروەردگار لەسەر زوبانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوە دیاریی بکا، جا ئەگەر گێڕانەوەی نوێژ واجب بوایە لەسەر کەسێك کە بەئەنقەست نەیکا تا کاتەکەی تێدەپەڕێ، ئەوە هەرگیز نە پەروەردگارو نە پێغەمبەرەکەی ئەو باسەیان پاشگوێ نەدەخستو لەیادیان نەدەچوو، ئێمەیان بە ئەنقەست توشی ئەو ناخۆشیو ناڕەحەتیە نەدەکرد کە لەئاکامی ڕون نەکردنەوەی ئەو باسە پەیدا دەبێ

---

[1] صحيح: (مختصر. م/٢٢٩)، م(٦٨٤ – ١/٤٧٧/٣١٥).

[2] المحلى لابن حزم ج ٢/٢٣٥.

{وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا – مريم/٦٤}. هەر شەریعەتو یاسایەك قورئانو سوننەت رونی نەكاتەوەو ئاماژەی پێ نەكا ئەوە بەتاڵەو پوچە.

## ئەوكاتانەی نەی كراوە نوێژیان تێدا بكرێ

لە عوقبەی كوڕی عامیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: سێ كات هەن پێغەمبەری خودا نەی لێ دەكردین نوێژیان تێدا بكەین، یان مردوی تێدا بخەینە گۆڕەوە، كاتێك خۆرهەڵدێ تا بەرز دەبێتەوە، كاتێك خۆر دەچێتە ناوەڕاستی ئاسمانەوە تا لادەدا، كاتێك خۆر بەرەو ئاوابوون دەڕوا تا چاك گوم دەبێ.[1]

پێغەمبەری مەزن (دروودی خودای لەسەر بێ) عیللەتو بایسی بۆ نەیكردن لەنوێژ لەو كاتانەدا هێناوەتەوە لەو فەرمایشتەدا: كە ئاڕاستەی عەمری كوڕی عەبسەی كرد فەرمووی: «صَلِّ صَلاَةَ الصُّبْحِ ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلاَةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ حَتَّى تَرْتَفِعَ فَإِنَّهَا تَطْلُعُ حِينَ تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَىْ شَيْطَانٍ وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ ثُمَّ صَلِّ فَإِنَّ الصَّلاَةَ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ حَتَّى يَسْتَقِلَّ الظِّلُّ بِالرُّمْحِ ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلاَةِ فَإِنَّه حِينَئِذٍ تُسْجَرُ جَهَنَّمُ فَإِذَا أَقْبَلَ الْفَىْءُ فَصَلِّ فَإِنَّ الصَّلاَةَ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ حَتَّى تُصَلِّىَ الْعَصْرَ ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلاَةِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَىْ شَيْطَانٍ وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ».[2] عەمری كوڕی عەبسە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چ كاتێكی شەو دوعاو پەرستشی باشتر تێدا گیرادەبێ؟ فەرمووی: نیوەی دووەمی شەو بكە بەسێ بەشەوە بەشی ناوەڕاستی...... ئەمجار فەرمووی: (نوێژی بەیانی بكە،

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٢٣٣)، م(١/٥٦٨/٨٣١)، د(٨/٤٨١/٣١٧٦)، ت(٢/٢٤٧/١٠٣٥)، ن(١/٢٧٥)، جة(١/٤٨٦/١٥١٩).

[2] صحيح المشكاة (١٠٢٤)، م(١/٥٧٠/٨٣٢).

پاشـان واز لەنوێـژكردن بێنـە تـا خۆردەكـەوێو بـە ئەنـدازەی رمبێـك بەرزدەبێتـەوە. چـونكە خـۆر كـە هەڵـدێ لـەنێوان دوو شـاخەی شـەیتانەوە هەڵـدێو لەوكاتـەدا بـێ بڕواكـان كورنوشـی بـۆ دەبـەن، پاشـان چـەندێك حەزدەكەی نوێژبكە، چونكە نوێژ لەوكاتەدا فریشتە دێنە دیاریو پاداشەكەی دەنووسن، ئیتر هـەر نوێژبكـە تـا سێبەری رمـب بەقـەد خـۆی لێ دێو لـەهیچ لایەكەوە سێبەری نامێنێ، لەوكاتەدا واز لەنوێژكردن بێنە، چونكە لەودەمەدا دۆزەخ وەك تەنـدور دادەخـرێو جـۆش دەسـتێنێ، بـەڵام لەگـەڵ خـۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لایدا ئیتر چەندێ دەتوانی نوێژ بكە، چونكە نوێـژكردنی ئەوكاتـە فریـشتە دێنـە دیـاریو سـەیری دەكـەن، لەوكاتـە بـەدواوە چـەنێ حەزدەكەی نوێژ بكە تا نوێژی عەصر دەكـەی، ئـەوجا واز لەنوێـژكردن بێنـە تاخۆر ئاوادەبێ، چونكە خۆر كـەئاوا دەبـێ لـەنێوانی دوو شـاخەی شـەیتانەوە ئاوادەبێو كافرەكان لەوكاتەدا كڕنووشی بۆ دەبەن).

### چەند كاتو شوێنێك لەم نەیكردنە چەرت دەكرێ

١- نوێژكردن لەرۆژی جومعەدا لەكاتێكدا خۆر لەناوەڕاستی ئاسمانـە لـەو نەیكردنـەی لـە حـەدیثی عـەمری كوڕی عەبەسـەدا هـاتووە چـەرت دەكـرێ. چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « لاَ يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ، وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ ، وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ ، أَوْ يَمَسُّ مِـنْ طِيـبِ بَيْتِهِ ثُمَّ يَخْرُجُ ، فَلاَ يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ ، ثُـمَّ يُنْـصِتُ إِذَا تَكَلَّـمَ الإِمَامُ ، إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَـيْنَ الْجُمُعَـةِ الأُخْـرَى».[1] هەركەسـێ رۆژی جومعـە غوسڵ بكاو خۆ پاك بكاتەوە، چەندێك بتوانـێ خـۆی خـاوێن رابگـرێو سـەرو قژی خۆی چەوربكا، یان بۆنی خـۆش لـەخۆی بـداو ئـەمجار لـەماڵ دەربـچێو

---

[1] صحيح: (الترغيب: ٦٨٩)، خ(٨٨٣/٣٧٠/١).

هەنگاو بەسەر کەسدا هەڵنەهێنێتەوە، ئەمجار چەندی حەز لێ بێ نوێژبکا، پاشان کە پێشنوێژ کەوتە وتارخوێندنەوە واز لەنوێژکردن بێنێ، کەسێك ئاوا رەفتار بکا لێخۆشبون لەتاوانی نێوان ئەم رۆژی هەینیو رۆژی هەینی تری بۆ دەستەبەر دەبێ.

وەکوو دەبینین پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بابای موسوڵمانی هەڵناوە بۆئەوەی چەندێکی پێ بکرێ نوێژبکا، نەی نوێژکردنی لێ نەکردوە تا ئەوکاتەی ئیمام دێتە سەر دوانگە، جا لەم روانگەوە زیاد لەیەکێك لە سەلەفی صالح لەوانە حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خودای لێ بێ) هەروا ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، فەرموویانە چونی ئیمام بۆسەر رۆگە دەبێتە مانیعی نوێژکردن. دەستکردنیشی بە وتار خوێندنەوە دەبێتە مانیعی قسەکردن، بەم پێیە سەلەفی صالح دەرچوونی ئیمام بۆسەر رۆگەیان کردوە بە مانیعی نوێژکردن، نەك بوونی خۆر لەناوەڕاستی ئاسماندا. ئەمە لەڕوی کاتەوە.

٢- لەڕوی شوێنیشەوە (مەککەی پیرۆز) خودا رێزو قەدری پترى بداتێ، ئەوە هیچ کاتێ نوێژکردنی تێدا یاساغ نیە. لەهەر کاتێکی شەوو رۆژدا بۆت رێکەوت مەکروه نیە نوێژی تێدابکەی. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووییەتی: (يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لَا تَمْنَعُوا أَحَدًا طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ وَصَلَّى أَيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ)[1]: ئەی بەرەی عەبدی مەناف کەس مەنع مەکەن لە تەوافکردنی کەعبەو نوێژکردن لە مەککەدا، هەرکەسێك ویستی لە مەککەدا لەهەرکاتێکی شەوو رۆژدا نوێژبکا با بیکا.

ئەو نوێژانەی لەم کاتانەدا نەهییان لێ کراوە نوێژی سوننەتی رەهایە، ئەو نوێژە سوننەتانەن کە سەبەبێك بۆ کردنیان نیە. ئەگینا دروستە

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٠٣٦)، جة(١/٣٩٨/١٢٥٤)، ت(٢/١٧٨/٨٦٩)، ن(٢/٢٢٣).

لەوکاتانەدا نوێژی فەوتاو بگێڕیەوە، جا نوێژەکە نوێژی فەرزبێ یان نوێژی (نەفل) بێ چونکە پێغەمبەر فەرمووی: « مَنْ نَسِيَ صَلاَةً فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا ، لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذَلِكَ»: کەسێك نوێژێکی لەبیرچوو لەکاتی خۆیدا ئەنجامی نەدا، با هەرکاتێ بیری کەوتەوە بەجێی بێنێ جگە لەگێڕانەوەکەی هیچ قەرەبووی تری لەسەر نیە.[1]

هەروا لەدوا دەستنوێژ شتن لەهەر ساتە وەختێکدابێ دروستە نوێژبکا، ئەمەش بەپێی حەدیثی ئەبو هورەیرە، کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی نوێژی بەیانیدا بە بیلالی فەرموو: «يَا بِلاَلُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإِسْلاَمِ ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ».[2] لە وەڵامدا بیلال وتی: من کردەوەیەکی وام نەکردوە بەلامەوە پتر جێگای هومێدبێ ئەوەنەبێ: کەمن هەرکاتێ دەستنوێژم گرتبێ شەو بووبێ یان ڕۆژبووبێ ئیللا بەو دەستنوێژە چەندێکم بۆ کرابێ نوێژم کردوە.

هەروا دروستە هەرکاتێ چویە ناو مزگەوتەوە دوورکات نوێژی سوننەت بکەی. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلاَ يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ»[3]: هەرکامێکتان چووە ناو مزگەوتەوە با دانەنیشێ تا دوو ڕکات سوننەتی (تحية المسجد) دەکا.

---

[1] متفق عليه: خ(٢/٧٠/٥٩٧)، م(١/٤٧٧/٦٨٤)، د(٢/١١٣/٤٣٨) ورواه بدون جملة: (لا كفارة لها الا ذلك).

[2] صەحیحەو لەوەپێش لەباسی سوننەتی دەستنوێژدا ڕابورد.

[3] متفق عليه: خ(٣/٤٨/١١٦٣)، م(١/٤٩٥/٧١٤)، د(٢/١٣٣/٤٦٣)، ت(١/١٩٨/٣١٥)، جة(١/٣٢٤/١٠١٣)، ن(٢/٥٣).

## نەهی لەکردنی نوێژی سوننەت دوای هەڵاتنی فەجرو پێش ئەنجامدانی نوێژی بەیانی

لە یەسار (کە مەولای ئیبنو عومەرە) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) منی بینی دوای دەرکەوتنی فەجر نوێژی سوننەتم دەکرد، فەرمووی: ئەی یەسار! دڵنیابە پێغەمبەری خودا لەماڵ هاتەدەر بۆ ناومان ئێمە ئەم جۆرە نوێژەمان دەکرد، فەرمووی: «لِيُبَلِّغْ شَاهِدُكُمْ غَائِبَكُمْ لاَ تُصَلُّوا بَعْدَ الْفَجْرِ إِلاَّ سَجْدَتَيْنِ».[1] با ئەوانەی ئامادەو لێرەن بە ئەوانە ڕابگەیەنن کە لێرەنین، پێیان بڵێن: دوای هەڵهاتنی فەجر جگە لەدوو ڕکات سوننەتی فەجر نوێژی سوننەت نەکەن.

## نەهی کردن لەئەنجامدانی نوێژی سوننەت: کە نوێژی فەرز دابەسترا

لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ).[2] کە قامەت کرا بۆ نوێژی فەرز جگە لەنوێژە فەرزەکە هیچ نوێژێکی تر نابێ.

## ئەو شوێنانەی نەهی لێ کراوە نوێژیان تێدا بکرێ

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « فُضِّلْتُ عَلَى الأَنْبِيَاءِ بِسِتٍّ أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ وَنُصِرْتُ

---

[1] صحيح: (ص.ج/٥٣٥٣)، د(٤/١٥٨/١٢٦٤) ورواه الترمذي مختصراً بلفظ (لا صلاة بعد الفجر الا سجدتين).

[2] صحيح: (ص.ج/٩٤٥)، م(١/٤٩٣/٧١٠)، ت(١/٢٦٤/٤١٩)، د(٤/١٤٢/١٢٥٢)، ن(١١٦/٢)، جة(١/٣٦٤/١١٥١) ئەگەر کابرا نوێژی سوننەتی دابەستبوو پاشان قامەت بۆ نوێژی فەرزکرا دەبێ نوێژە سوننەتەکەی ببڕێو بچێتە ناو نوێژە فەرزەکە.

بِالرُّعْبِ وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ طَهُورًا وَمَسْجِدًا وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ». [1] من زياد له پێغەمبەران بەشەش شت زێدەرێزم دراوەتێ: بەهرەی ئەوەم پێ بەخشراوە قسەی کورتو پڕمانا بکەم، مانگە رێیەك دوژمن لێم دەترسێ، دەستکەوتی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوە، هەموو روی زەویم بۆ کراوە بە پاکەوەکەرو مزگەوت، بۆسەر هەموو خەڵك رەوانەکراومو پەیامەکەم گشتییە، زنجیرەی پێغەمبەران بەمن تەواو کراوەو لەدوا من پێغەمبەر رەوانە ناکرێن.

## زەوی هەمووی مزگەوتەو دروستە نوێژی تێدابکرێ جگە لەو چەند شوێنانەی لەم چەند حەدیثەی دوایی‌دا چەرت کراون

له جوندوبی کوڕی عەبدوڵلای (ألبجلی)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێش ئەوەی وەفات بکا بەپێنج (ساڵ) لێم ژنەوت دەیفەرموو: «أَلاَ وَإِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ وَصَالِحِيهِمْ مَسَاجِدَ أَلاَ فَلاَ تَتَّخِذُوا الْقُبُورَ مَسَاجِدَ إِنِّى أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ». [2] ئاگاداربن ئەو گەلو نەتەوانەی پێش ئێوە دابو نەرێتیان وابوو ئارامگای پێغەمبەرانو پیاو چاکانی خۆیان دەکردە مزگەوتو شوێنی نوێژکردن، ئاگاداربن ئێوە ئەوکارە مەکەن، گۆڕەکان مەکەنە مزگەوت. ئەمن نەهیتان لێ دەکەم لەوکارە.

له ئەبو سەعیدی (ألخدرييەوە) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إِلاَّ الْمَقْبُرَةَ

---

[1] صحيح: (مختصر م/٢٥٧)، م(١/٣٧١/٥٢٣).

[2] صحيح: (الإرواء/٢٨٦)، م(١/٣٧٧/٥٣٢).

وَالْحَمَّـامَ».[1] زەوی هـەمووی شـوێنی نوێـژ لەسـەرکردنە جگـە لەگۆڕسـتانو گەرماو.

لە (البراء)ی کوڕی عازیبەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پرسـیار لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـرا دەربـارەی نوێـژکردن لەشـوێنی پیخـدانی حوشتردا لە وەڵامدا فەرمووی: «لاَ تُصَلُّوا فِي مَبَارِكِ الإِبِلِ فَإِنَّهَا مِنَ الـشَّيَاطِينِ ». لەشـوێنی پیخـدانی حوشـتردا نوێـژ مەکـەن، ئـەوە لـەکردەوەی شـەیتانەکانە، هـەروەها پرسـیاری لێ کـرا دەربـارەی نوێـژکردن لـەناو پەچـەو گـەوەی بـزنو مەڕدا، لە وەڵامدا فەرمووی: «صَلُّوا فِيهَا فَإِنَّهَا بَرَكَةٌ».[2]

## بانگ

بانـگ: راگەیاندنـە بـە خـەڵكو ئاگادارکردنیانـە بـەوەی کاتی نوێـژ هـات، ئـەم راگەیاندنـە بەچـەند وشـەو رسـتەی تایبـەتی ئـەنجام دەدرێ، بانگـدان پێویستو واجبە.

لە مالیکی کـوڕی (ألحـویرث)ەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـودا فـەرمووی: «إِذَا حَضَرَتِ الـصَّلاَةُ فَلْيُـؤَذِّنْ لَكُـمْ أَحَـدُكُمْ وَلْيَـؤُمَّكُمْ أَكْبَـرُكُمْ».[3] ئەگەر کاتی نوێژهات با یەکێکتان بانگتان بۆبدا، باکێتان بە تەمەن گەورەترە پێش نوێژیتان بکا. لە فەرموودەکەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فەرمانی کردوە بەبانگدان، فەرمانیش وەکوو ئاشکرایە وجوب دەگەیەنێ.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەیبردین بۆ غەزای قەومێك، شەو دەورمـان دەگـرتن، تـا بـەیانی فـەرمانی

---

[1] صحيح: (ص.جة/٦٠٦)، د(٢/١٥٨/٤٨٨)، جة(١/٢٤٦/٧٤٥)، ت(١/١٩٩/٣١٦).

[2] صحيح: (ص.ج/٧٣٥١)، د(٢/١٥٩/٤٨٩).

[3] متفق عليه: خ(٢/١١١/٦٣١)، م(١/٤٦٥/٦٧٤).

پێ نەدەكردین بە غەزاكردنیان، بەڵكوو چاوەڕوانی دەكرد تا بەیانی جا ئەگەر گوێی لێ بوایە لەناویان بانگ بدرێ وازی لێ دێنان، ئەگەر گوێی لەبانگ نەبوایە تاریكو رونی بەیانی هێرشی دەبردنە سەر.[1]

## گەورەیی بانگ

لە موعاوییەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ الْمُؤَذِّنونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ».[2] بێگومان بانگبێژان لەهەموو كەس زیاتر گەردن بڵندترن لەڕۆژی قیامەتدا له عەبدوڕەحمانی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی (عبدالرحمن)ی كوڕی ئەبو صەعصەعەی ئەنصارییەوە ڕیوایەتكراوە، پاشان (المازنی) له باوكییەوە، ریوایەتی كردوە: كە باوكی هەواڵی ئەوەی داوەتێ: كە ئەبو سەعیدی خودری پێی گوتووە: (من تۆ دەبینم مەڕو بزنو لادێت پێ خۆشە، جا كەتۆ لەناو مەڕو ماڵاتی خۆتدا بووی یان لەناو زەویو زارو دەشت مەزرای لادێی خۆتدا بووی، بانگت دا دەنگت بەرزبكەرەوە. «فَإِنَّهُ لاَ يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُـؤَذِّنِ جِنٌّ وَلاَ إِنْسٌ وَلاَ شَيْءٌ إِلاَّ شَهِدَ لَهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ».[3]: چونكه هەرشتێك لەجنۆكەو مرۆڤو هەرشتێكی تر دەنگی بانگدەرەكەی گوێ لێ بێ ئیللا رۆژی قیامەت شایەتی بۆ دەدا.

## شێوەی بانگو چۆنیەتی

له عەبدوڵلای كوڕی زەیدی كوڕی (عبد ربه) ریوایەتكراوە، دەڵێ: كاتێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری دا زەنگ بەكاربێنێ بۆ

---

[1] متفق علیه: خ(٦١٠/٨٩/٢) وهذا لفظه، م(٣٨٢/٢٨٨/١) بمعناه.

[2] صحیح: (ص. ج/٦٦٤٥)، م(٣٨٧/٢٩٠/١).

[3] صحیح: (ص.ن/٦٢٥) ، ح(٦٠٩/٨٧/٢)، ن(٢/١٢).

دیاریکردنی کاتی نوێـژو پێـشی نـاخۆش بـوو، چـونکه لاسـایی کردنـهوەی گاورەکـان بـوو، لەخـەوما پیـاوێکم بینـی دوو کراسـی سـەوزی لەبـەردابوو، زەنگۆڵەیـەکی بەدەسـتەوە بـوو، پـێم گـوت: ئـەی بەنـدەی خـودا!! ئایـا ئـەم زەنگۆڵـە دەفرۆشـی؟ وتـی: بۆچـیتە؟ چـی پـێ دەکـەی؟ وتم: بانگـەوازی پـێ دەکەین بۆ کۆبوونەوە بۆ نوێژ، گوتی: ئەدی بـۆ شـتێکت پـێ نـەڵێم زۆر لـەوە باشتربێ. گوتم: ئادەی بفەرموو: وتی: بڵێ:

«اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّـهُ أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُـولُ اللَّـهِ، حَـيَّ عَلَـى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّـهُ أَكْبَـرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ».

دوایی کابرا هەندێ وەستا، کەمێ دوورکەوتەوە، ئەوجا وتی: بـۆ قامـەتی نوێژیش بڵـێ: « اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللَّـهُ أَكْبَـرُ اللَّـهُ أَكْبَـرُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ».

جا عەبدوڵڵا دەڵـێ: کـە رۆژم لێ بـوەوە چـوومە خزمـەت حـەزرەتو ئـەم خەونەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووده خودا حەزبکا ئەم خەونە خەونێکی راسـتو دروسـتە، ئـەمجار فـەرمانی کـرد بـانگ بدرێ، بەمجۆرە عەبدوڵڵا ئەوەی لەخەونەکەیدا پێی گوتـراوە بە بـیلالی رەوان بکاو بەو شێوە بیلال بەدەنگە زوڵاڵەکەی بانگ بدا[1].

---

[1] حسن صحيح: (ص.د/٤٦٩)، حـم(٣/١٤/٢٤٤)، د(٢/١٦٩/٤٩٥)، ت(١/١٣٢/١٨٩) مختصراً. جة (١/٢٣٢/٧٠٦).

**واباشه بانگدەر هەردوو «ألله أكبر» بخاته ناو يەك هەناسەوه**

لـه عومـەری كـوڕی خەتتابـەوه ڕیوایـەتكراوه، دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ) مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ». كاتێ بانگدەر وتی: (اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ) یەكێكیش لەئێوه بڵێ: (اللّٰهُ أَكْبَـرُ اللّٰـهُ أَكْبَرُ) كاتێ گـوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰـهُ) ئـەویش بڵـێ: (أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّٰهُ)، وەكاتێ ئەو گوتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ) ئـەویش بڵـێ: (أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ). كاتێ ئەو گوتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ) ئـەویش بڵـێ: (لاَ حَـوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ). كاتێ ئەو گوتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ) ئەویش بڵـێ: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ). كاتێ ئەو گوتی (اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ) ئەویش بڵێ (اللّٰهُ أَكْبَـرُ اللّٰـهُ أَكْبَرُ). كاتێ گوتی: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّٰـهُ) ئـەویش بڵـێ (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّٰـهُ) ئـەم گـوتنی وەڵامانەی لەبـەر ڕەزامەنـدی خودابێ ئـەو كەسـه دەچێته بەهەشـتەوه. ئـەم فەرموودەیه ئاماژەیەكی ئاشكرای تێدایه بۆئەوەی بانگدەر هەموو وشـەیێ لـه وشەكانی بانگ بەسەر یەكەوه بەیەك هەناسه دەڵێ.[1]

*** تەرجیع واته: به تەسپایی گوتنی شایەتومانەكانو دوایی گەڕانەوه بۆیان بەدەنگی بەرز كارێكی باشه**

لــه (أبــي محــذورة)وه (ڕەزای خــودای لێ بــێ) ڕیوایــەتكراوه، دەڵــێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فێری ئەم بانگدانەی كردووه: «اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُــولُ اللّٰــهِ أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُــولُ اللّٰــهِ». پاشـان بـەدەنگی بـەرز بگەڕێتەوه سەریانو بڵێ: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ أَشْـهَدُ

---

[1] شرح النووي على مسلم (٣/٧٩).

أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ (مَرَّتَيْنِ) حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ (مَرَّتَيْنِ) اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ».[١]

## تەثویب کردن لەبانگی بەیانیدا

هەر لە (أبی محذورة)وە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فێری بانگی کردم ئەم ڕستەو دەستەواژەیەی تێدابوو «حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ». ئەمەش لەبانگدانی یەکەمی بەیانیدا «اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ».[٢]

ئەمیری صەنعانی لە (سبل السلام)دا[٣] دەڵێ: ئیبنو ڕسلان وتویەتی: گوتنی «الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ» لە بانگدانی یەکەمی بەیانیدا مەشروعە چونکە بە مەبەستی ڕاستکردنەوەی نوستوانە بۆئەوەی بەئاگا بێنەوەو خۆیان ئامادەبکەن وەڵێ لەبانگدانی دووەمجاری بەیانیدا نامەشروعە چونکە ئەمیان بۆ پێڕاگەیاندنی موسوڵمانانە بەچوونە ناو کاتی نوێژەوەو بانگ کردنیانە بۆ نوێژ.

## واباشە بانگ لەسەرەتای کاتی نوێژەوە بدرێ، بۆ نوێژی بەیانیش پێش هاتنی کاتەکەی

لە جابیری کوڕی سەموورەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بیلال لەگەڵ خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا بانگی هەڵدەداو هیچی لەوشەکانی بانگ تەرك نەدەکرد، پاشان تا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهاتایەتە دەرەوە

---

[١] صحيح: (مختصر.م/١٩١)، م(١/٢٨٧/٣٧٩).

[٢] صحيح: (ص.ن/٦٢٨) ، ن(٢/٧).

[٣] ج١/١٢٠.

بۆ مزگەوت قامەتی نەدەکرد، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی دەهاتە ناو مزگەوتەوەو بیلال دەیدی، قامەتی دەکرد.[1]

لەئیبنو عومەرەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ».[2] بێگومان بیلال کەبانگ دەدا هێشتا شەوە، ئێوە بخۆن‌و بخۆنەوە تا عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتوم بانگ دەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکی تردا ئەوەی روون کردۆتەوە کە حیکمەت لەپێشخستنی بانگی بەیانی لەسەر کاتەکەی بۆ ئەومیە موسوڵمانان لەخۆ کەون‌و ئامادەسازی بۆ بکەن، ئەوەتا دەفەرموێ: « لاَ يَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ أَذَانُ بِلاَلٍ مِنْ سَحُورِهِ فَإِنَّهُ يُؤَذِّنُ - أَوْ قَالَ يُنَادِي - لِيَرْجِعَ قَائِمُكُمْ وَيَنْتَبِهَ نَائِمُكُمْ».[3] کەستان بە بانگدانی بیلال واز لەخواردنی پارشێو نەهێنێ، چونکە ئەو کە بانگ دەدا هێشتا شەوە، ڕۆژ نەبۆتەوە بانگدانی ئەو بۆ ئەومیە ئەوەی بەخەبەرە بگەڕێتەوە بۆ مزگەوت‌و ئەوەی نوستووە بەخەبەر بێ‌و خۆ ئامادە بکا بۆ نوێژ.

## ئەو ذیکرو دوعایانەی لەکاتی بیستنی بانگ‌و قامەتدا دەگوترێن

سوننەتە بۆ کەسێك گوێی لەبانگ یان قامەتە هەمان ئەو وشەو ڕستانە بڵێتەوە کەبانگدەرو قامەتکەرەکە دەیڵێن.

---

[1] صحيح: (ص. د ٥٠٣)، حـم (٣/٣٥/٢٨٣) وهـذا لفظـه. م (١/٤٢٣/٦٠٦)، د (٢/٢٤١/٥٣٣) بنحوه.

[2] متفق عليه: خ (٢/١٠٤/٦٢٢)، م (١٠٩٢ – ٣٨ – ٢/٧٦٨).

[3] متفق عليه خ (٢/١٠٣/٦٢١)، م (٢/٧٦٨/١٠٩٣)، د (١/٤٧٢/٢٣٣٠).

لە ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی « إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ».[1] هەرکاتێ گوێتان لەبانگ بوو، ئێوەیش وەکوو بانگدەرەکە وشەو ڕستەکانی بڵێنەوە.

لە عومەری کوڕی خەطابەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:

« إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ. فَقَالَ أَحَدُكُمُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ. قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ. قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ. قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ».

{ئەگەر بانگدەر وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) یەکێك لەئێوە گوێی لێ بوو وتی (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) پاشان بانگدەر وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بیسەریش وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) پاشان بانگدەر وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) ئەویش وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) پاشان بانگدەر وتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ ) ئەویش وتی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ) ئەمجار بانگدەر وتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ) ئەویش وتی (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ) پاشان بانگدەر وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) ئەویش وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) پاشان بانگدەر

---

[1] متفق علیه: خ (٦١١/٢/٩٠)، م (١/٢٨٨/٣٨٣)، د (٢/٢٢٤/٥١٨)، ت (١/١٣٤/٢٠٨)، جه (١/٢٣٨/٧٢٠)، ن (٢/٢٣).

وتـی: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ) ئـەویش بـەدڵ وتـی: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ) ئـەوە دەچـێتە بەهەشتەوە.

بەڵێ کەسێك گوێی لەبانگ بوو وەکوو بانگدەر وشەو ڕستەکانی دووبارە کردنەوە، یان لەکاتی دوو (حَيَّ عَلَى)ەکاندا وتـی (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ) یـان (حَـيَّ عَلَـى)ەکانیـشی گوتنـەوەو (لاحـول ولا قـوة إلا بـالله)یـشی گـوت، ئـەوە پەیڕەوی سوننەتی پێغەمبەری کردووە.

کەبانگـدەر لەبانگـدان بـۆوە، یـان قامـەتی تـەواو کـردو بیـسەر وەڵامـی دایـەوە، ئـەمجار واباشـە ئـەو دوعـاو نزایـە بخوێنـێ: کـە لـەم دوو حـەدیثـەی دواییدا هاتووە: کە یەکەمیان لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ریوایەتکراوە کە لەدەمی پێغەمبەری بیستووە. فەرموویەتی: «إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَـا يَقُولُ ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَـا عَـشْرًا ثُـمَّ سَـلُوا اللَّهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِـي إِلاَّ لِعَبْـدٍ مِـنْ عِبَـادِ اللَّـهِ وَأَرْجُـو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ فَمَنْ سَـأَلَ لِـيَ الْوَسِـيلَةَ حَلَّـتْ لَـهُ الـشَّفَاعَةُ». [1] هـەرکاتێ گوێتـان لەبانگـدەر بـوو بـانگی دەدا، وەکـوو ئـەو بانگەکـە بڵێنـەوە، پاشـان صـەلەوات لەسەر من بدەن، چونکە هەرکەسێ صەلەوات لەسەر من لێ بدا پەروەردگار دە جـار ڕەحمـەتو لێخۆشـبوونی خـۆی دەڕژێنـێ بەسـەریدا، پاشـان داوا لـەخودا بکـەن پلـەو پایـەی وەسـیلەم بـێ ببەخـشێ، بێگومـان وەسـیلە پلەوپایەکـە لەبەهەشـتدا تـەنها بەخـەڵات دەدرێ بـە بەندەیـەك لـە بەنـدەکانی خـودا، هیـوادارم ئـەو بەندەیـە مـن بم، کەسـێك داوای پێـدانی وەسـیلە بکـا، بـۆ مـن شەفاعەتی منی بۆ دەستەبەر دەبێ.

---

[1] صحيح: (مختصر م ١٩٨)، م (١/٢٨٨/٣٨٤)، د (٢/٢٢٥/٥١٩)، ت (٥/٢٤٧/٣٦٩٤).

لەجابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ».[1] هەرکەسێك ئەودەمەی گوێی لەبانگ دەبێو دوایی دەڵێ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ» ڕۆژی قیامەت شەفاعەتی منی بۆ دەستەبەر دەبێ.

**فائیدەیەك:** سوننەتە بۆ موسوڵمان لەکاتی نێوان بانگو قامەتدا زۆر نزاو پاڕانەوە بکا، چونکە دوعای ئەوکاتە وەرگیراوو قبوڵە.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ألدُّعاء لايُرَدُّ بين الأذان والاقامة)[2] نزاو پاڕانەوە لەنێوان بانگو قامەتدا ڕەت ناکرێتەوە.

## ئەوەی بۆ بانگبێژ سوننەتە

**سوننەتە بۆ بانگبێژ ئەو ڕەوشتانە لەخۆیدا بەرجەستە بکا:**

١- دەبێ نیازی لەبانگدان ڕەزامەندی خودا بێو کرێ لەسەر ئەو کارە وەرنەگرێ، لە عوثمانی کوڕی ئەبولعاصەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بمکەرە پێشنوێژی قەومەکەم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَنْتَ إِمَامُهُمْ وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لاَ يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا».[3] باشە تۆ پێشنوێژی ئەتەوەکەتیو موراعاتی لاوازو پیرو

---

[1] صحيح: (الإرواء ٢٤٣)، خ (٢/٩٤/٦١٤)، د (٢/٢٣١/٥٢٥)، ت (١/١٣٦/٢١١)، ن (٢/٢٧)، جه (١/٢٣٩/٧٢٢).

[2] صحيح: (ص. د ٤٨٩)، ت (١/١٣٧/٢١٢)، د (٢/٢٢٤/١٥٧).

[3] صحيح: (ص. د ٤٩٧)، د (٢/٢٣٤/٥٢٧)، ن (٢/٢٣)، جه (٢٣٦/٧١٤) الجملة الأخيرة منه.

پەککەوتەکانیان بکەو نوێژو تەسبیحاتەکانت زۆر درێژ مەکەرەوە، بانگبێژێك دیاری بکە با لەپای بانگدانەکەیدا کرێ وەرنەگرێ.

٢- با لەشپیس‌و بێ دەستنوێژ نەبێ، وەکوو لەمەوپێش تێپەڕی لەباسی ئەو شتانەدا، کە سوننەتە بە دەستنوێژەوە ئەنجام بدرێن.

٣- سوننەتە بانگبێژ بەپاوەستانەوەو ڕوو لەقیبلە بانگ بدا.

ئیبنو لمونزیر دەڵێ: کۆڕای زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە چەسپاوە کەڕاوەستان لەکاتی بانگداندا سوننەتە، چونکە باشتر دەتوانێ دەنگەکە بەگوێچکەی خەڵك بگەیەنێ، هەروا سوننەتە ڕو بکاتە قیبلە، چونکە بانگبێژەکانی سەردەمی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی بانگداندا رویان لە قیبلە کردووە.

٤- واباشەو وا سوننەتە لەکاتی بانگداندا بەملاولای خۆیدا روو وەرگێڕێ، بەم جۆرە لەکاتی گوتنی (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)دا ڕو بەلای ڕاستدا وەرگێڕێ‌و لەکاتی گوتنی (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ)دا ڕو بەلای چەپدا وەرگێڕێ.

لە ئەبو جوحەیفەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: من بیلالم بینی بانگی دەدا، ئەمنیش لاسایی ئەوم دەکردەوە، شوێن دەمی ئەو دەکەوتم بۆ ئەوێ‌و بۆ ئەوێ.[1]

٥- واباشە سەری پەنجەی بخاتە هەردوو گوێچکەیەوە، ئاماژە بە قسەکەی ئەبو جوحەیفە کە دەڵێ: بیلالم بینی بانگی دەداو ڕوخساری خۆی بەملاو بەولادا دەسوڕاندو هەردوو سەرەپەنجەی خستبوونە نا گوێچکەکانی.[2]

---

[1] متفق علیە: خ (٢/١١٤/٦٣٤)، م (١/٣٦/٥٠٣)، د (٢/٢١٩/٥١٦)، ت (١٣٦/١٩٧)، ن (١٢/٢) وەڵێ وەرگێڕانی سنگ لە سوننەتدا نەهاتووە.

[2] صحیح: (ص. ت ١٦٤)، ت (١/١٢٦/١٩٧) فەرموویەتی ئەم حەدیثە حەسەن‌و صەحیحە، لای ئەهلی عیلم پەسەندە.

٦- سوننەتە بانگبێژ دەنگی خۆی بەرز بکاتەوە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «فَإِنَّهُ لاَ يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلاَ إِنْسٌ وَلاَ شَيْءٌ إِلاَّ شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».[1] هەر جندۆکەو مرۆڤێك و هەرشتێکی تر گوێی لەدەنگی بانگەکەی بێ ڕۆژی قیامەت شایەتی بۆ دەدا.

## ماوەی نێوان بانگ و قامەت

پێویستە ئەوەندە ماوە بکەوێتە نێوان بانگ و قامەتەوە بەشی ئەوەبکا نوێژکەر تێیدا خۆی ئامادە بکا بۆ نوێژو ئامادەبوونی لەگەڵ موسوڵمانان بۆ جەماعەت، چونکە بانگ بۆیە دانراوە تا موسوڵمان بزانێ کاتی نوێژ هاتووەو خۆی ئامادە بکا، ئەگەر ماوەی نێوانیان بەو جۆرە نەبێ فائیدە لەبانگ دەفەوتێ.

ئیبنو بەطاڵ[2] دەڵێ: سنوری دیاری کراو بۆ ئەوماوەیە بەس دەبێ بەشی ئەوە بکا موسوڵمانان بزانن کاتی بانگ هاتووەو کۆببنەوە بۆ جەماعەتکردن.

## نەهی کردن لەوەی دوای بانگدان لەمزگەوت دەربچی

لەئەبو شەعثائەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ ئەبو هورەیرە لەمزگەوت دانیشتبووین، بانگبێژ بانگیدا، پیاوێك لەناو مزگەوت بوو، هەڵسا بڕوا، ئەبو هورەیرە سەرەنجی دایە تا لەمزگەوت چووە دەر، ئەمجار

---

[1] صحيح: (ص. ن ٦٢٥)، خ (٢/٨٧/٦٠٩)، ن (٢/١٢).

[2] ئیبنو حەجەر لەفەتحولباریدا ج٢/١٠٦ لێوەی نەقڵ کردووە.

فەرمووی: ئەو کابرایە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەری کرد (دروودی خودای لەسەر بێ).[1]

## بانگو قامەت بۆ نوێژی فەوتاو

کەسێك خەوی لێکەوتو کاتی نوێژ بە ئاگا نەهاتەوە، یان لەیادی چوو نوێژ بکا، کەنوێژەکە دەگێڕێتەوە بۆی دروستە بانگی بۆ بداو قامەتی بۆ بکا، ئامـاژە بـەوەی ئـەبو داوود ریوایـەتی کـردووە لەچـیرۆکی خەولێکـەوتنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)و هاوەڵانی کە لەسەفەرێکدا بۆ کاتی نوێژی بەیانی بە ئاگا نـەهاتنو هـەتاو کەوت کە بەخەبـەر هـاتن پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فـەرمانی کـرد بـیلال بـانگی داو قامـەتی کـرد[2]. ئەگەر نوێژە فەوتاوەکان زۆر بوون بۆ هەموو نوێژەکان یەك بانگ بـدا، بـەڵام بۆ هەریەکەیان دەبێ قامەت بکا، ئاماژە بـە حـەدیثی ئیبنـو مەسعود (رەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: (موشـریکەکان لـەرۆژی غـەزای خەندەکدا پێغەمبـەریان سەرقاڵ کرد لەچوار نوێژ، تا بەشێکی زۆر لەشەو رۆیی، کە تەشریفی سەرخۆ کەوتـەوە، فـەرمانی بـە بـیلال کـرد بـانگی دا، پاشـان قامـەتی کـرد نوێـژی نیـوەڕۆی بـەجێ هێنـا، ئـەمجار قامـەتی کـردو نوێـژی عەصـری کـرد، پاشـان قامەتی کرد نوێژی شێوانی ئەنجامدا، پاشان قامەتی کـردو نوێـژی خـەوتنانی کرد.

---

[1] صـــحیح: (مختـــصر م ٢٤٩)، م (١/٤٥٣/٦٥٥)، ن (٢/٢٩)، د (٢/٢٤٠/٥٣٢)، ت (٢٠٤/١/١٣١) لەهەندێ ریوایەتەکاندا هاتووە کە بانگەکە بانگی عەصر بووە.

[2] صحیح: (ص. د ٢٤٠)، (٢/١٠٦/٤٣٢).

## مەرجەکانی صیحەتی نوێژ

**بۆئەوەی نوێژەکە صەحیح بێ دەبێ ئەم مەرجانە بێنە دی:**

١- بزاندرێ کەکاتی نوێژ هاتووە. ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار {إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا النساء/١٠٣}. بێگومان نوێژ لەسەر موسوڵمانان پێویست کراوەو نووسراوە، کاتی هەموو نوێژێك دیاری کراوە. نوێژ لەپێش هاتنی کاتەکەیدا دروست نیە، هەروەها دوای تێپەڕبوونی کاتەکەشی بەبێ عوزر دروست نیە.

٢- پاکی لە لەشگرانیو بێ دەستنوێژی، ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ – المائدة/٦}. هەروەها ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عومەر، کە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: «لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلاَةً بِغَيْرِ طُهُورٍ».[١]

٣- پاكو خاوێنی پۆشاكو ئەو جێگەی نوێژی تێدا دەکرێ. پاکی پۆشاك ئەوە بەپێی فەرمایشتی پەروەردگار: کە دەفەرموێ: {وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ – المدثر/٤}. هەروا بە پێی مانای حەدیثی پێغەمبەر: کە دەفەرموێ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلْيَنْظُرْ فَإِنْ رَأَى فِي نَعْلَيْهِ قَذَرًا أَوْ أَذًى فَلْيَمْسَحْهُ بِالأَرْضِ وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا».[٢] ئەگەر یەکێك لەئێوە هات بۆ مزگەوت با باش سەیری پێڵاوو گۆرەوییەکانی بکا ئەگەر پیسییەکی پێوە دیتن با لەزەوی خشێنێو پاکی بکاتەوەو نوێژیان پێوەبکا.

---

[١] لەباسی دەستنوێژ گرتندا تێپەڕی.

[٢] لەوەپێش لەباسی چۆنیەتی پاککردنەوەی شتی پیس بوودا رابورد.

پاك‌و خاوێنی جه‌سته‌ش به‌پێی ئه‌و فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ره (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) كه‌ ئاراسته‌ی عه‌لی كوڕی ئه‌بو طالیبی كرد له‌ وه‌ڵامی پرسیاره‌كه‌ی عه‌لیدا ده‌رباره‌ی (مه‌ذی). پێی فه‌رموو: « تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ». ده‌ستنوێژ بگره‌و هینه‌كه‌شت بشوو.[1]

هه‌روه‌ها به‌ ئافره‌ته‌ هه‌میشه‌ خوێن به‌ربووه‌كه‌ی فه‌رموو «فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي». خوێنه‌كه‌ت بشوره‌وه‌و نوێژبكه‌. پاك‌و خاوێنی شوێنی نوێژكردن پێویسته‌، ئاماژه‌ به‌ فه‌رمانی پێغه‌مبه‌ر به‌ هاوه‌ڵانی، كه‌ كابرای عه‌ره‌بی ده‌شته‌كی له‌ناو مزگه‌وتدا میزی كرد، پێی فه‌رموون: «أرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ مَاءٍ».[2] سه‌تڵێك ئاو به‌سه‌ر شوێنی میزه‌كه‌دا بكه‌ن.

**فائیده‌یه‌ك:** كه‌سێك نوێژی كرد پیسییه‌ك به‌ جله‌كانیه‌وه‌ بوو پێی نه‌زانی بوو، ئه‌وه‌ نوێژه‌كه‌ی دروسته‌و پێویست ناكا نوێژه‌كه‌ ئیعاده‌ بكاته‌وه‌. ئه‌گه‌ر له‌ناو نوێژه‌كه‌دا به‌ پیسییه‌كه‌ی زانی، ئه‌گه‌ر بۆی كرا لایبه‌رێ به‌مجۆره‌ پیسییه‌كه‌ به‌نه‌عله‌كانیه‌وه‌ بوو، یان به‌ پۆشاكێكی زیاده‌یه‌وه‌ بوو ئه‌گه‌ر لایبه‌رێ شه‌رمگای ده‌رناكه‌وێ ئه‌وه‌ با نه‌عله‌كانی دابكه‌نێ، یان پۆشاكه‌ زیاده‌كه‌ لابه‌رێ‌و نوێژه‌كه‌ی ته‌واوبكا. ئه‌گه‌ر نه‌یتوانی لایبه‌رێ با نوێژه‌كه‌ درێژه‌ پێ بداو ته‌واوی بكاو گه‌ڕانه‌وه‌ی له‌سه‌ر نیه‌، ئه‌مه‌ش به‌پێی ئه‌و فه‌رمووده‌ی ئه‌بو سه‌عید ریوایه‌تی كردوه‌، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خودا (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) نوێژی كرد له‌ناوه‌ڕاستی نوێژكردنه‌كه‌یدا نه‌عله‌كانی داكه‌ندن، خه‌ڵكه‌كه‌ش هه‌موو نه‌عله‌كانیان داكه‌ندن، كه‌ له‌نوێژ بوونه‌وه‌ فه‌رمووی: ئه‌وه‌ بۆ نه‌عله‌كانتان داكه‌ندن؟ وتیان: دیتمان ته‌شریفت داتكه‌ندن

---

[1] له‌باسی پاككردنه‌وه‌ی پیسییه‌كاندا تێپه‌ڕی.

[2] صحیح: له‌وه‌پێش له‌باسی چۆنیه‌تی پاككردنه‌وه‌ی پیسایی‌دا تێپه‌ڕی.

ئێمەیش دامانکەندن. فەرمووی: «إِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ بِهِمَا خَبَثاً فَإِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقْلِبْ نَعْلَيْهِ فَلْيَنْظُرْ فِيهِمَا فَإِنْ رَأَى فِيهَا خَبَثاً فَلْيَمْسَحْهُ بِالأَرْضِ ثُمَّ لِيُصَلِّ فِيهِمَا».[1]

ئەوە جوبرائیل بوو هاتەلام‌و هەواڵی پێدام: کە نەعلەکانم پیسییان پێوەیە، جا کەیەکێك لەئێوە هاتە مزگەوت، با بڕوانێ، ئەگەر بەنەعلەکانیەوە پیسی‌و پۆخەڵی هەبوو با لەزەوی خشێنێ‌و مەسحی بکاو نوێژیان پێوەبکا.

٤- داپۆشینی شەرمگا، ئەمەش بە پێی فەرموودەی پەروەردگار کە دەفەرموێ: {يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ – الأعراف/٣١}. ئەی ئادەمیزادینە شەرمگای خۆتان داپۆشن لەکاتی ئەنجامدانی هەموو خودا پەرەستییەك دا؛ نوێژ بێ یان تەواف بێ لەوکاتانەدا پۆشاکی باش‌و پاکی خۆتان بپۆشن، کەمترین پۆشاك پوشین ئەوەیە شەرمگا داپۆشێ.

هەروا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلاَةَ حَائِضٍ إِلاَّ بِخِمَارٍ».[2] پەروەردگار نوێژی ئافرەت قبوڵ ناکا ئەگەر خۆی دانەپۆشێ...

شەرمگای پیاو نێوان ناوك‌و ئەژنۆیەتی، وەکوو لەو حەدیثەدا هاتووە: کە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیرییەوە بە (مەرفوعی) ریوایەتکراوە دەفەرموێ: «مَا بَيْنَ السُّرَّةِ وَالرُّكْبَةِ عَوْرَةٍ».[3]

هەروەها لە جەرهەدی (الأسلمی)یەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رابورد، من بوردیەکم لە بەردابوو رانم

---

[1] د (٢/٣٥٣/٦٣٦).

[2] صحيح: (ص.جة/٥٣٤) ، د(١/٣٤٥/٦٢٧)، ت(١/٢٣٤/٣٧٥)، جة(١/٢١٥/٦٥٥).

[3] حسن: (الإرواء/٢٧١) رواه الدار قطني واحمد وأبو داود.

بەدەرەوە بوو، فەرمووی: «غَطِّ فَخِذَكَ فَإِنَّ الفَخِذَ عَوْرَتِهِ».[1] رانت داپۆشە بێگومان ران داخڵی شەرمگایە.

ئەگەر پیاوێك بە ئیزارێك (دەرپێیەك) نوێژی كرد نێوانی ناوكو ئەژنۆی داپوشرابوو نوێژەكەی راستە، وەلێ ئەوەندە هەیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی « لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ».[2] بایەكێ لە ئێوە بە پۆشاكێكەوە نوێژ نەكا، كە لكێكی ئەو پۆشاكە بەسەر شانیدا شۆڕ نەبووبێتەوە، مەبەست ئەوەیە نابێ پۆشاكەكە لەقەدی خۆی شەتەك بداو شانەكانی بەروتی بنو نوێژ بكا، بەڵكوو دەبێ لكێكی قوماشەكە بەسەر شانیدا بێنێتەوە خوارێ، وای لێ بێ قوماشەكە هەم ئیزاربێ هەم (ریداء) بێ. ئەمە ئەگەر قوماشەكە زۆربوو، بەلام ئەگەر قوماشەكە كەم بوو ئەوە لەسێبەندەی بهاڵێنێو بیكاتە ئیزار. ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): كە دەربارەی نوێژكردن لە یەكپارچە قوماشدا بەجابیری فەرموو: «فَإِنْ كَانَ وَاسِعًا فَالْتَحِفْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ ضَيِّقًا فَاتَّزِرْ بِهِ».[3] ئەگەر قوماشەكە فراوان بوو وەكوو لیفە لەخۆتیەوە بهاڵێنە. ئەگەر كەم بوو بیكە بە ئیزار.

ئافرەت هەموو جەستەی شەرمگایە دەبێ لەنوێژدا دایپۆشێ جگە لە روخسارو دوو دەستی تامەچەكی. ئەمەش بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەر

---

(١) صحيح لغيره: (الإرواء/٢٦٩)، ت(٢٩٤٨/١٩٧/٤)، د(٣٩٩٥/٥٢/١١).

(٢) متفق عليه: خ(٣٥٩/٤٧١/١)، م(٥١٦/٣٦٨/١)، د(٦١٢/ ٣٣٢ و ٢/٣٣٣)، ن(٢/٧١).

(٣) د(٣٦١/٤٧٢/١). هەروا بڕوانە (شرح السنة ج٢/٤٢٣).

(دروودی خودای لەسەر بێ) « الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ».[١] هەروا فەرموودەی «لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلاَةَ حَائِضٍ إِلاَّ بِخِمَارٍ».[٢]

٥- روکردنە قیبلە، ئەمەش بەپێی فەرموودەی پەروەردگار {فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ – البقرة/١٥٠}. لەکاتی نوێژکردندا روبکەرە لای مەسجیدولحەرام لەهەرشوێنێك نوێژتان کرد روبکەنە لای ئەو ماڵە پیرۆزە.

هەروەها ئاماژە بە فەرموودەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئاراستەی ئەو کابرایەی کرد: کە بە کەمو کورتیو ناڕێكو پێکی نوێژەکەی ئەنجامدا، ئەوەبوو پێی فەرموو: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ ، ثُمَّ اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ ، ثُمَّ اقْرَأْ بِمَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا ، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَسْتَوِيَ قَائِمًا ، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا ، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا ، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا ، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا ، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا». ئەگەر ویستت نوێژبکەی بەباشی دەستنوێژ بگرە، ئەمجار روبکەرە قیبلە........هتد.[٣]

لەکاتی هەبوونی ترسی زۆردا یان لەسەفەردا لەنوێژی سوننەتدا لەسەر راحیلەو شتیوا دروستە رونەکەیە قیبلە. قورئان دەفەرموێ: {فَإنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا – البقرة/٢٣٩} ئیبنو عومەر دەفەرموێ: مانای ئایەتەکە ئەوەیە (روتان لە قیبلەبێ یان روتان لێی نەبێ). ئیمامی نافیع دەڵێ: ئیبنو

---

[١] صحيح: (ص.ج/٦٦٩٠) ، ت(١١٨٣/٣١٩/٢).

[٢] صحيح: (ص.جة/٥٣٤) ، د(٦٣٧/٣٤٥/٢)، ت(٣٧٥/٢٣٤/١)، جة(٦٥٥/٢١٥/١).

[٣] متفق عليه: خ(٦٢٥١/٣٦/١١)، م(٣٩٧/٢٩٨/١).

عومەر کە ئەم مانایەی بۆ ئایەتەکە کردوە، دەبێ حەتمەن لە پێغەمبەری بیستبێ[١]

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسەر راحیلەوە تەسبیحاتی دەکرد، جا راحیلەکەی ڕوی لەهەر شوێنێك بوایە، سوننەتی ویتریشی لەسەر راحیلەدەکرد بەڵام نوێژی فەرزی لەسەر نەدەکرد[٢].

**فائیدەیەك:** کەسێك لەشوێنێك بوو نەیدەزانی کامە قیبلەیە، لەلایەن خۆیەوە هەوڵی دا قیبلە بدۆزێتەوە، بەمەزندەی خۆی قیبلەی دیاریی کردو بەرەو ئەوێ نوێژی کرد، دوایی بۆی دەرکەوت هەڵەی کردوە، ئەوە نوێژەکەی صەحیحەو گێڕانەوەی نوێژەکەی لەسەر نیە.

لەعامیری کوڕی ڕەبیعەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئێمە لەشەوێکی تاریکدا لە سەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، نەمانزانی قیبلە لەچ لایەك دایە، هەریەك لەئێمە بە مەزندەی خۆی قیبلەی دیاریی کرد، کە ڕۆژمان لێ بۆوە، ئەو حاڵەمان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، ئیتر ئایەتی {فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ – البقرة/١١٥}[٣]. خوێندەوە، واتە: ڕوبکەنە هەر لایەك وەجهی خودا لەوێیە.

٦- نیەت: واتە: نیەتی ئەو نوێژە بێنێ کە ئەنجامی دەداو بەدڵ دیاریی بکا واتە لەدڵی خۆیدا نیازی ئەوەی هەبێ کە فەرزی نیوەڕۆ یان عەصر یان سوننەتی فلان دەکا، گوتنی نیەتە بەدەم مەشروع نیە. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەلەفوظی بەنیەت نەکردوە. بەڵکوو کە هەڵساوە

---

[١] صحیح: ط(١١/١٢٦/٤٤٢)، م(١/٢٩٨/٣٩٦).

[٢] متفق علیه: م(٧٠٠-٣٩-٤٨٧)، خ تعلیقا (٢/٥٧٥/١٠٩٨).

[٣] حسن: (ص.جه/٨٣٥)، ت(١/٢١٦/٣٤٣)، جه(١/٣٢٦/١٠٢٠) بنحوه هق (٢/١١).

بۆ نوێـژ فەرموویـەتی (اللە أكـبر) پـێش ئـەوە هیـچی نـەگوتووە، نیەتەكـەی بەزمان نەگوتووە. هـەرگیز نەبیـستراوە فەرموبیـەتی: (أصـلی للە صـلاة كـذا، مستقبل القبلة، أربع ركعات اماماً أو مأموماً أو لا قـال أداءً، ولا قـال قـضاءً، ولا فرض الوقت...) ئەمە دەشتی بیدعەو داهێندراون، هیچ كەسێك ئەمانـەی لـە پێغەمبەرەوە نەقڵ نەكردوە بە رشتەو سەنەدی صـەحیح یـان ضـەعیـف، نـە بەشێوەی (مسند) نـە بەشێوەی (مرسل) تەنانـەت تاقـە وشـەو رسـتەیەكیش لەوانـە نـەقڵ نـەكراوە نـە لـەخودی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) خۆی نـە لەیـەكێ لـە هـاوەڵانی، نـە كەسـیش لەچـینی دوا هـاوەڵان بـەجوانی زانیوە، نە یەكێك لەچوار ئیمامەكان، شتی وایان ریوایەت كردوە[1].

## شێوەی چۆنیەتی كردنی نوێژ

پێغەمبەری خودا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) كـە دەیەویـست نوێـژبكا بەڕاوەستانەوە روی دەكردە كەعبە، لەنزیك دارێكی چەقاو، یان دیوارێـك یـان شـتێكی دانـراو لـەپێش دەمـیـەوە، ئەوەشـی دەفـەرموو جـەختی لەسـەر دەكردەوە كە دەیفـەرموو: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْـرِئٍ مَـا نَـوَى». كردار بەگوێرەی نیازە، مرۆڤ لـەكردەوەیدا چ نیـازێكی هـەبێ بـەگوێرەی ئـەو نیازە سزاو پاداش وەردەگرێتەوە.

پاشان تەشریفی نوێژی دادەبەست بەوتـەی (اللە أكبر)، لەگـەڵ وتنـی (اللە أكـبر) دەسـتی بـەرزدەكردەوە، ئـەمجار دەسـتی راسـتی دەخـستە سەردەسـتی چـەپیو لەسـەر سـنگی دایـدەنان، ئـەمجار چـاوەكانی ئاراسـتەی زەوی دەكـرد، پاشـان دەسـتی دەكـرد بەخوێنـدنی نـزاو پاڕانـەوەی جـۆراو جـۆر، سـوپاسو ستایشی خودای دەكرد، ئەمجار (أعوذ باللە من الشیطان الرجیم)ی دەگوت، پاشان

---

[1] زاد المعاد ج١/٥١.

بــه ئەســپایی (بســم الله الــرحمن الــرحیم)ی دەخوێنــدو دەنگــی تێــدا بەرزنەدەکردەوە ئەمجار سورەتی فاتیحەی ئایەت ئایەت دەخوێند، کە تەواوی دەکرد بەدەنگی بەرزو شێوە درێژکردنەوە دەیگوت: (آمین) ئەمجار دوای ئــەوە ســورەتێکی تــری دەخوێنــد، جــاری واهــەبوو ســورەتی درێــژی دەخوێنــدو خوێندنەکەی زۆر درێــژ دەکــردەوە وایــش دەبــوو ســورەتی کــورتی دەخوێنــد، کەمی دەخوێند.

لەنوێژی بــەیانــیداو لــەدوو رکــاتی نوێــژی شــێوانو خــەوتنانــدا بــەدەنگی بەرز فاتیحەو سورەتەکەی تری دەخوێند، لەنوێژی نیــوەڕۆو نوێــژی عــەصرو رکاتی سێیەمی شێوانو دوو رکاتی دووەمی خەوتنان بــە ئەسپایی دەیخوێنــد. هەروەها لەنوێژی هەینیو نوێژی هەردوو جەژنەکانو نوێژە بارانــەو نوێــژی مانگگیرانی بەدەنگی بەرز دەخوێند. هەمیشە دوو رکــاتی دووەمــی نوێــژەکانی لەدوو رکاتی یەکەمی کورتر دەکردەوە بە ئەندازەی نیوەی رکاتەکانی یەکــەم، ئەوەندەی کورت دەکردەوە بە ئەندازەی پانزە ئایەت، جاری وایش هەبوو هەر سوورەتی فاتیحەی دەخوێندو بەس.

ئەمجار کە لەخوێندنی سورەتی فاتیحەو سورەتی تــری قورئــان دەبــوەوە، ماوەیەك بێ دەنگ دەبوو، پاشان هەردوو دەستی بــەرزدەکردەوەو (الله أكبر)ی دەکــردو دەچــوە روکــوع، لــەپی هــەردوو دەســتی دەخــستە ســەر دوو ئــەژنۆیو پەنجــەکانی بەســەر کــڵاوە ئــەژنۆیدا بــڵاو دەکردنــەوەو تونــد پەنجــەکانی لــە ئــەژنۆی قــایم دەکــردن وەکــوو ئــەوە بەچــنگی کــڵاوە ئــەژنۆی تونــد بگــرێ. هــەردوو ئەنیــشکی لەلاکەلەکــەی دوور دەخــستنەوە، پــشتی راســت دەکــرد بــەجۆرێك ئەگــەر ئــاو بکرێتــە سەرپــشتی رابومــستێ بــەهیچ لایەکدا نــەڕوا. لەچوونە روکوعدا ئارامی دەگرتو سێجار دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ».

لەناو ئەم روكنەی نوێژدا جارجارە دوعاو نزای جۆراو جۆری دەخوێندن، بەڵام نەهی دەکرد لەخوێندنی قورئان لە روکوعو سوژدەدا.

ئەمجار لە روکوع هەڵدەسایەوەو پشتی راست دەکردەوەو دەیفەرموو: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». لەکاتی راستبوونەوە لە روکوع هەردوو دەستی بەرزدەکردنەوەو دەیفەرموو: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، وایش دەبوو لەم نزاو پاڕانەوانەی زیاد دەکرد. ئەمجار (الله اکبر)ی دەکردو دەچووە سۆژدەو هەردوو دەستی دەخستە سەر زەوی لەپێش ئەژنۆوەی دایدەنانو قورسایی جەستەی دەخستە سەر دەستەکانیو پەنجەکانی دەستی بە بلاویو بەتەنیشت یەکەوە بەرەو قیبلە دادەنان، وادەبوو دەستەکانی لەئاستی شانەکانی دادەنانو وایش دەبوو لەئاستی گوێچکەکانی دا بەزەوییەوە مەلاسی دەکردن، سەری لوتیو ناوچەوانی لەزەوی توند دەکرد.

دەیفەرموو: فەرمانم پێکراوە کە لەسەر حەوت ئێسقان سوژدە بەرم. ناوچەوان – بەدەستی ئاماژەی بۆ لوتیشی دەکرد – هەردوو لەپی دەستی، هەردوو ئەژنۆی، هەردوو چاوە قامکی قاچی. دەشی فەرموو: «لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لاَ يُصِيبُ أَنْفَهُ مِنَ الأَرْضِ مَا يُصِيبُ الْجَبِينَ». نوێژ قبولّ نیە بۆ کەسێك لوتی وەکوو ناوچەوانی لەزەوی توند نەکا. لەکاتی سوژدەبردندا ئارامی دەگرتو سێجار دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى»، وایش دەبوو بڕی ئەزکارو نزای دەخوێندن، جاری وایش دەبوو فەرمانی دەکرد بەکۆششو زۆر دوعاکردن لەم روکنەدا. ئەمجار تەشریفی سەری لەسوژدە بەرزدەکردەوەو (الله أکبر)ی دەکردو ئەمجار قاچی چەپی رادەخست لەسەری دادەنیشتو ئارامی دەگرتو لەهەمان کاتدا قاچی راستی لەزەوی توند دەکرد پەنجەی ئەو قاچەی بەرەو قیبلە ئاراستە دەکردو دەیفەرموو: (أللهم اغفرلي وارحمني واجبرني وارفعني واهدني، وعافني، وارزقني)، ئەمجار {الله أکبر}ی دەکردو دەچووە سوژدەی

دووەم دەق وەكوو سوژدەی یەكەم. پاشان سەری بەرز دەكردەوەو {الله أكبر}ی دەكردو لەجێی خۆی لەسەر قاچی چەپی دادەنیشت بەموعتەدیلی بەجۆرێك هەموو ئێسقانەكانی جەستەی دەچوونەوە شوێنی خۆیان، پاشن هەردوو دەستی لەزەوی گیر دەكردن، واتە: بۆ هەڵسانەوەكە هێزو قورسایی خۆی دەخستە سەردەستیو راست دەبۆوە بۆ ڕكاتی دووەم، لەم ڕكاتەشدا وەكوو ڕكاتی یەكەمی دەكرد، تەنها ئەوەندە هەبوو كورتری دەكردەوە لەهی یەكەم. پاشان كەلەڕكاتی دووەم تەواو دەبوو دادەنیشت بۆ خوێندنی تەحیات. جا ئەگەر نوێژەكە دوو ڕكاتی بوایە ئەوە دانیشتنەكەی بەشێوەی ئیفتیراش دەبوو وەكوو دانیشتی نێوان سوژدەكان هەروا بۆ تەحیاتی یەكەمی نوێژی سێ ڕكاتیو چوار ڕكاتیش.

تەشریفی كە بۆ تەحیات خوێندن دادەنیشت، دەستی ڕاستی دەخستە سەر ڕانی ڕاستیو دەستی چەپی لەسەر ڕانی چەپی دادەنا، دەستی چەپی بڵاو دەكردەوەو دەستی ڕاستی دەنوقاند، قامكە شادەی بەتەنها رادەداشتو ئاماژەی پێ دەكردو بەچاو سەیری دەكرد، جاكە قامكی بەرز دەكردەوە دەیجوڵاند. دەشی فەرموو: « لَهِيَ أَشَدُّ عَلَى الشَّيْطَانِ مِنَ الْحَدِيدِ». كاریگەری ئەم قامكە لەسەر شەیتان لەئاسن كوشندەترە. مەبەستی قامكە شادە بوو.

پاشان تەشریفی لەدوا هەردوو ڕكات نوێژێك، تەحیاتی دەخوێند لەتەحیات خوێندنەكەیدا صەلاواتی لەسەر خۆی دەدا، جا تەحیاتی یەكەم بوویێ یان دووەم، فەرمانیشی بەئوممەتەكەی كردووە كە صەلاواتی لەسەر بدەن، عادەتی وابوو لەنوێژدا دوعاو نزای جۆراوجۆری دەخوێند.

ئەمجار بەلای ڕاستدا سڵاوی دەدایەوەو دەیفەرموو: {السلام عليكم ورحمة الله} بەلای چەپیشدا بەهەمان شێوە، وایش دەبوو لە سڵاودانەوەی یەكەمیدا وشەی {وبركاته}ی زیاد دەكرد.

## پایەو کۆڵەکەکانی نوێژ (أركان الصلاة)

نوێژ لەچەند پایەو ڕوکنێك پێك دێو بەهەموویان حەقیقەتی نوێژ پێك دەهێنن‌و پێیان دەگوترێ فەرز یان واجب. ئەگەر فەرزێك لەوانە ئەنجام نەدرا نوێژەکە قبوڵ نیەو لەشەرعا بەنوێژی تەواو دانانـدرێ. ئەم ئەرکان‌و پایانەیش ئەمانەن:-

١- (الله أكبر) کردنی نوێژ دابەستن، لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ».[1] کلیلی نوێژ دەستنوێژە، چونە ناوی‌و ئیحرام بەستنی (الله أكبر)ە چونە دەرەوە لێی سەلامدانەوەیە.

لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەو کابرایەی گوت: کە بەخراپی‌و بەهەڵەشەیی نوێژی کرد، «إِذَا قُمْتَ فِي صَلاَتِكَ فَكَبِّرِ».[2] ئەگەر هەڵسای بۆ نوێژ (الله أكبر) بکە.

٢- ڕاوەستان لەنوێژی فەرزدا بۆ کەسێك بتوانێ ڕابوەستێ. قورئان دەفەرموێ: (وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕاوەستانەوە نوێژی دەکرد، فەرمانیشی بە عیمرانی کوڕی حوصەین کرد کە بەپێوە نوێژبکا، ئەوەبوو پێی فەرموو: « صَلِّ قَائِمًا ، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا ، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى

---

[1] حسن صحيح: (ص.جة/٢٢٢) ، ت(١/٥/٣)، د(١/١٨/٦١)، جة(١/١٠١/٢٧٥).

[2] متفق عليه: لەوەپێش ڕابورد.

جَنْبٍ».[1] بەراوەستانەوە نوێـژ بکـە، ئەگـەر نـەتتوانی بەدانیـشتنەوە بیکـە، ئەگەر ئەوەشت بۆ نەگونجا بەراکشانەوە لەسەر تەنیشت نوێژەکە بکە.

٣- خوێنـدنی سورەتی (ألفاتحـة) لەهـەموو رکاتێکدا. لـە عوبـادەی کـوڕی صـامیتەوە ڕیوایـەتکراوە: کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: (لا صلاة لمن لم يقرأ بسورة الفاتحة)[2] کەسێك نوێـژبکاو سورەتی فاتیحـەی تێـدا نـەخوێنێ نوێژەکـەی بەتاڵـە، بێگومـان پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەو کابرایە کرد: کە بەنارێكو پێکی نوێژی کـرد – فاتیحە بخوێنێ، پاشان پێی فەرموو: « ثُمَّ افْعَـلْ ذَلِـكَ فِـي صَـلاَتِكَ كُلِّهَـا». ئەمجار ئەم فاتیحە خوێندنە لەهەموو رکاتێکی نوێژەکەتدا بخوێنە.

٤ ، ٥- روکوع بـردنو ئارامگرتن تێیدا. قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا – الحج/٧٧}. هەروا چونکە بـەکابرای نوێـژ بەهەڵشە کردوی فەرموو: «ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا».[3] پاشـان بـچۆرە روکـوعو ئـارام بگرە تێیدا.

٦ ، ٧- هەسـتانەوە لـە روکـوعو ئـارامگرتن تێیـدا. لەئـەبو مەسـعوودی ئەلئەنصارییەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: « لاَ تُجْزِئُ صَلاَةٌ لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ فِيهَا صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ».[4] نوێژی وا دروست نیە مرۆڤ لە روکوعو سجوددا پشتی تەواو ڕێك نەکاتەوە.

---

[1] صحيح: (ص.ج/٣٧٧٨) ، خ(٢/٥٨٧/١١١٧)، د(٣/٣٣٣/٩٣٩)، ت(١/٢٣١/٣٦٩).

[2] متفق عليه: خ(٢/٢٣٦/٧٥٦)، م(١/٢٩٥/٣٩٤)، ت(١/١٥٦/٢٤٧)، ن(٢/١٣٧)، جـة(٨٣٧/١/٢٧٣)، د(٣/٨٠٧) بزيادة (فصاعداً).

[3] متفق عليه: لەوەپێش تەخریج کراوە.

[4] صحيح: (ص.)جة/٧١٠ ، ن(٢/١٨٣)، ت(١/١٦٥/٢٦٤)، د(٣/٩٣/٨٤٠)، جة(١/٢٨٢/٨٧٠).

هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەوکابرایەی فەرمووو: کە نوێژی بەهەڵەشەو ناڕێكوپێك ئەنجام دا. «ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا»[1] پاشان لە روکوع راست بەرەوە تا بەباشی بەراوەستانەوە پشتت راست دەبێتەوە.

٨ ، ٩- سوژدەبردنو ئارامگرتن تێیدا. ئاماژە بە ئایەتی {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا – الحج/٧٧}.

هەروا ئاماژە بە فەرمایشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئاڕاستەی ئەو کابرایەی کرد: کە نوێژی بەهەڵەشەو ناڕێك کرد «ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا ، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا ، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا»[2]: پاشان بچۆرە سوژدە تا ئارام دەگریو جەستەت لە جمو جوڵ دەکەوێ، پاشان سەرت بەرزبکەرەوەو دابنیشەو ئارام بگرە، پاشان بچۆرەوە سوژدەو ئارام بگرە تێیدا. مانەوەو ئارام گرتن (طمأنينة) ئەومیە ئەندامەکانی جەستەی نوێژکەر دەچنەوە جێگای خۆیان.

ئەو ئەندامانەی جەستە کە پێویستە لەکاتی سوژدە بردندا لەزەوی بدرێن حەوتن. لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ عَلَى الْجَبْهَةِ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ، وَالْيَدَيْنِ ، وَالرُّكْبَتَيْنِ وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ»[3]: فەرمانم پێ کراوە لەسەر حەوت ئەندام سوژدە بەرم لەکاتی سوژدە بردنمدا حەوت ئەندامی جەستەم لەزەوی بکەون: ناوچاوان – ئاماژەی بۆ لوتی کرد – واتە

---

[1] متفق عليه: لەوەپێش تەخریج کرا.

[2] متفق عليه: لەوەپێش تەخریج کرا.

[3] متفق عليه: خ(٢/٢٩٧/٨١٢)، م(٤٩٠-٢٣٠-١/٣٥٤)، ن(٢/٢٠٩).

لەگەڵ ناوچەوانی لوتیشی لەزەوی بدا، هەردوو لەپی دەست، هەردوو ئەژنۆ، هەردو سنگەپێ.

دووبارە لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لاَ يُصِيبُ أَنْفَهُ مِنَ الأَرْضِ مَا يُصِيبُ الْجَبِينَ»[1]: کەسێك لەکاتی سوژدە بردندا لوتی وەکوو ناوچەوانی لەزەوی نەدا نوێژی دروست نیە.

١٠ ، ١١- دانیشتنی نێوان سوژدەکانو ئارامگرتن تێیدا. ئەمەش بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «لاَ تُجْزِئُ صَلاَةٌ لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ فِيهَا صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ».[2] نوێژێك دروست نییە پیاو تێیدا لە روکوعو سوژدەیدا پشتی ڕێك نەکاتەوە.

هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەو کابرایەی فەرموو کە بە هەڵەشە نوێژی کرد: کە لەسوژدە سەرت بەرزکردەوە دابنیشەو ئارام بگرە.

١٢- تەحیاتی کۆتایی نوێژ. لە ئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئێمە پێش ئەوەی (تەحیات)مان لەسەر فەرزبێ، دەمانگوت: (السلام على الله، السلام على جبريل ومكائيل، سلاو لەخودا، سلاو لە جوبرائیلو لە میکائیل). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَقُولُوا هكذا، وَلَكِنْ قُولُوا التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ. أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ».[3] (تا کۆتایی تەحیات).

---

[1] صحيح: قط (١/٣٤٨/٣) صفة صلاة النبي ص/١٢٣.

[2] صحيح: (٨٥٥)، ت(٢٦٥)، ن(١٨٣/٢).

[3] صحيح: (الإرواء/٣١٩)، ن(٣/٤٠)، قط(١/٣٥٠/٤)، هق(٢/١٣٨).

**فائیدەیەک**: راستترین شێوەی تەحیات ئەوەیە: کە لەئیبنو مەسعوودەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەحیاتی فێرکردم، دەستم لەناو دەستی موبارەکیدا بوو، وەکوو چۆن فێری سورەتێکی قورئانی دەکردم ئاوا تەحیاتی فێرکردم «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ. أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ».[1] هەرچی وشەو ڕستەی ڕێزو شکۆمەندیو تەعظیم دەگەیەنن شایستەی پەروەردگارە، هەروەها کام وشەو ڕستەی جوانو شیرین هەیە بوترێ شایستەی خودایە؛ سڵاو ڕەحمەتو بەرەکاتی خودات لەسەربێ ئەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سڵاو لەسەر خۆمانو لەسەر هەموو بەندە صاڵحەکانی پەروەردگار، شایەتی دەدەم: کە هیچ خودایەك نیە شیاوی پەرستش بۆ کردن بێ جگە لەزاتی (الله) ، هەروا شایەتی دەدەم: کە موحەممەد بەندەو ڕەوانەکراوی خودایە.

**فائیدەیەکی تر**: دەربارەی ڕستەی (السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە فەتحول باریدا[2] دەفەرموێ: لەهەندێ ڕێگای هاتنی ئەم حەدیثەی ئیبنو مەسعوددا جوداوازییەك هەست پێ دەکرێ لەنێوان صەڵاوەتدان لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەناوی تەحیاتدا لەسەردەمی خۆیدا لەگەڵ سەردەمی دوا خۆی.. لەسەردەمی خۆیدا ڕستەکە بەشێوەی (خیطاب) گوتراوە، واتە گوتوویانە (السَّلاَمُ عَلَيْكَ)، بەڵام لەدوا وەفاتی بەشێوەی (غائب) بە (السَّلاَمُ عَلَى النَّبِيِّ) گوتراوە. ئەوەتا

---

[1] متفق عليه: خ(٦٢٦٥/٥٦/١١)، م(٤٠٢/٣٠١/١).

[2] ج ٢/٥٧٠.

له صەحیحی بوخاریدا لەبابی (الإستئذان)دا لەرێگەی ئەبو موعەممەرەوە لەئیبنو مەسعودەوە دوای ئەوەی حەدیثەکەی لەمەڕ (تشهد) ەوە هێناوە دەڵێ: (ئەوکاتە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناوماندا بوو). کە تەشریفی وەفاتی کرد ئەمجار گوتمان: (السَّلاَمُ يعني عَلَى النَّبِيِّ) بەوشێوە لەبوخاریدا هاتووە، ئەو عەوانە له صەحیحەکەیداو (ألسِّراجُ) و (ألجوزقي)و ئەبو نەعیمی ئەصبەهانیو بەیهەقی لەچەند رێگایەکی جیاجیاوە گەیاندویانەتەوە بەئەبو نوعەیم کە شێخی بوخارییە، لەوێدا بە لەفظی (فَلَمَّا قُبِضَ قُلْنَا السَّلاَمُ عَلَى النَّبِيِّ) واتە بەلابردنی لەفظی (يعني). هەروا ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبە له نوعەیمەوە ریوایەتی کردوە.

شێخی سوبوکی لە شەرحی (ألمنهاج)دا – دوای ئەوەی ئەم ریوایەتەی تەنها لەئەبو عەوانەوە هێناوە – دەڵێ: ئەگەر راست بێ ئەوە لە هاوەڵانەوە ریوایەتکراوە، بێگومان دەلالەت دەکا لەسەر ئەوە کە سەلام کردن لە پێغەمبەر بەشێوازی خیطاب واجب نیە، واتە: دەگوترێ (السَّلاَمُ عَلَى النَّبِيِّ). ئەمجار ئیبنو حەجەر دەڵێ: بێگومان ئەوە لە هاوەڵانەوە چەسپاوەو پشتگیرییەکی بەهێزم بۆ ئەوە دەست کەوتووە.

عەبدو رەزاق دەڵێ: ئیبنو جورەیج هەواڵی پێداوم، دەڵێ عەطاء خەبەری دامێ: کە هاوەڵان لەسەردەمی پێغەمبەردا دەیانگوت (ألسلام عليك أيها النبيّ). کە وەفاتی کرد، دەیانگوت (السَّلاَمُ عَلَى النَّبِيِّ) ئەمە ئیسنادو ریوایەتێکی صەحیحە.

شێخی ئەلبانی لەکتێبی (صفة الصلاة)دا لاپەڕە (١٢٦)دا دەڵێ: دەبێ ئەوە بە تەوقیفی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بوبێ، ئەوەی پشتگیریی ئەم رایە دەکا ئەوەیە: کە خاتو عائیشە (خودای لێ رازی بێ)

هاوەڵانی فێری تـەحیات خوێنـدن دەكـردو پێـی دەگوتن بڵێن: (السَّلَامُ عَلَى النَّبِيِّ)[1].

١٣- صـەڵەواتدان لەسـەر پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) دوای تەحیات خوێندنی كۆتایی. ئەمەش بەپێی حەدیثی فەضالەی كوڕی عوبەیدی ئەلئەنـصاری: كـە دەڵـێ: پێغەمبـەری خـودا (درودی خـودای لەسـەر بـێ) پیاوێكی بینی نوێژی دەكرد، بەڵام لەنوێژەكەیدا نە تەحمیدو تەجمیدی كرد نە صەڵەواتی لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دا، نوێژەكەی بـەكاڵو كرچی بـەجێهێناو ڕۆیـی. پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: (عجِلَ هذا) ئەم پیاوە پەلەی كرد، بانگی كردو بەوو بەوانەی لەوێ ئامادەبوون فەرمووی: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَحْمِيدِ اللَّهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ ثُمَّ لِيُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ لِيَدْعُ بَعْدُ بِمَا شَاءَ».[2]

ئەگەر یەكێك لەئێوە نوێژی كرد با سەرەتا تەمجیدی خودا بكاو حەمدو سەنای بكا، پاشان صەڵەوات لەسەرمن لێ بدا، ئەمجار چەندێكی حەز لێ بوو با دوعاو پاڕانەوە بكا.

لەئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایـەتكراوە، دەڵێ: پیاوێـك هـاتو لـەپێش دەمـی پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕۆنیـشتو ئێمەیش لەخزمـەتیدا بووین. وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خودا! سـەلامكردنمان لەسەر جەنابت زانیو فێری بووین، ئـەدی چۆن صـەڵاواتت لەسـەر لێ بـدەین ئەگەر ئێمە لەنوێژەكانماندا صەڵەواتت لەسەر لێ بـدەین صـەڵەواتی خوات لێ بێ. ئیبنو مەسعود دەڵێ: ئیتر پێغەمبەر بێدەنگ بوو تـا كـار بـەوە گەیـشت ئاواتە خوازبووین كابرا ئەو پرسیارەی نەكردایـە. پاشـان پێغەمبـەر (درودی

---

[1] رواه السراج في مسنده ج/٩/١-٢ والملخص في الفوائد ج/١١/٥٤/١ بسندين صحيحين عنها.

[2] صحيح الاسناد (صفة الصلاة) ١٨٢ ط المعارف، ت(٣٥٤٦/١٨٠/٥)، د(١٤٦٨/٣٥٤/٤).

خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا أَنْتُمْ صَلَّيْتُمْ عَلَيَّ فَقُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَآلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».[1] كە ویستتان صەڵەوات لەسەرمن لێ بدەن بەمجۆرە صەڵەواتم لەسەر لێ بدەن بڵێن: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَآلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ». تا کۆتایی حەدیثەکە.

**فائیدەیەک:** گەورەترین و پەسەندترین شێوازی صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەو شێوازەیە: کە کەعبی کوڕی عوجرە ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرمان کرد وتمان ئەی پێغەمبەری خودا! (درودی خودای لەسەر بێ) ئێمە زانیمان یان فێربووین چۆن سڵاوت لێ بکەین، ئەدی چۆن صەڵەواتت لێ بدەین؟! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بڵێن: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».[2].

١٤- سڵاودانەوە لەنوێژ ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر: کە فەرمووی: «مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ».[3]

---

[1] اسناده حسن خز(٣٥١/٧١١ و ١/٣٥٢).

[2] متفق عليه: خ(١١/١٥٢/٦٣٥٧)، م(١/٣٠٥/٤٠٦)، د(٣/٢٦٤/٩٦٣)، ت(١/٣٠١/٤٨٢).

[3] حسن صحيح: لەوەپێش ماناو تەخریجی تێپەڕی.

## واجبەكانی نوێژ

١- (الله أكبر) كردنی گواستنەوە لەنێوان روكنەكانی نوێژدا لە راوەستانەوە بۆ روكوع‌و لە روكوعەوە بۆ هەڵسانەوە... هتد. گوتنی رستەی «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ».

لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خوادای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ): كەدەستی دەكرد بەنوێژ (الله أكبر)ی دەكرد بۆ چونە ناو نوێژو راوەستان، پاشان: كە دەیەویست بچێتە روكوع (الله أكبر)ی دەكرد. ئەمجار كە راست دەبووەوە لە روكوع دەیفەرموو «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» ئەمجار هەر بەراوەستانەوە دەیگوت «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ». ئەمجار (الله أكبر)ی دەكردو دەچوە سوژدە، پاشان كەسەری لەسوژدە هەڵدەبڕی (الله أكبر)ی دەكرد پاشان كە دەچوە سوژدەی دووەم (الله أكبر)ی دەكرد ئەمجار كە هەڵدەستایەوە لەسوژدە هەمدیسان (الله أكبر)دەكرد، بەم جۆرە ركاتەكانی نوێژی بەجێ دەهێناو ئاوای دەكرد تا كۆتایی نوێژ، كە لەتەحیات خوێندنی یەكەمیش هەڵدەستایەوە (الله أكبر)ی دەكرد[1]. دەشی فەرموو: «صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي»[2] من چۆن نوێژ دەكەم چۆن دەمبینن نوێژددەكەم ئێوەش ئاوا نوێژ بكەن.

بەو كەسەشی فەرموو: كە بەهەڵەشەو بە نارێك‌و پێكی نوێژی كرد: «إِنَّهُ لاَ تَتِمُّ صَلاَةٌ لأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ حَتَّى يَتَوَضَّأَ فَيَضَعَ الْوُضُوءَ ». يَعْنِي مَوَاضِعَهُ « ثُمَّ يُكَبِّرُ وَيَحْمَدُ اللَّهَ جَلَّ وَعَزَّ وَيُثْنِي عَلَيْهِ وَيَقْرَأُ بِمَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ أَكْبَرُ ثُمَّ يَرْكَعُ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ ثُمَّ يَقُولُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حَتَّى يَسْتَوِيَ

---

[1] متفق عليه: خ(٨٩/٧/٢٧٢/٢)، م(٣٩٢ – ٢٨/٢٩٣/١)، ن(٢/٢٣٣).

[2] صحيح: (الإرواء/٢٦٢)، خ(٢/١١١/٦٣١).

قَائِمًا ثُمَّ يَقُولُ اللّٰهُ أَكْبَرُ ثُمَّ يَسْجُدُ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ ثُمَّ يَقُولُ اللّٰهُ أَكْبَرُ وَيَرْفَعُ رَأْسَهُ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا ثُمَّ يَقُولُ اللّٰهُ أَكْبَرُ ثُمَّ يَسْجُدُ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيُكَبِّرُ فَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ تَمَّتْ صَلاَتُهُ»[1]، بێگومان نوێژی هیچ کامێك لەئێوە تەواو نابێ هەتا دەستنوێژ نەگرێو بە رێكو پێکی ئەندامەکانی دەستنوێژی نەشوا. پاشان (الله أكبر) بکاو سوپاسی پەروەردگار بکا سەنا خوانی بێ. چەندێکی حەز لێ بێ قورئان بخوێنێ، پاشان (الله أكبر) بکاو بچێتە روکوعو بمێنێتەوە تا جموژگەکانی ئارام دەگرن، پاشان بڵێ: «سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» راست بێتەوەو ئارام بگرێ بەراوەستانەوە، ئەمجار (الله أكبر) بکاو بچێتە سوژدەو ئارام بگرێ هەتا جموژگەکانی لە جمو جوڵ دەکەون، پاشان (الله أكبر) بکا سەر بەرزبکاتەوەو بەدانیشتنەوە قیت بوەستێ، ئەمجار (الله أكبر) بکاو بچێتەوە سوژدەو ئارام بگرێ، پاشان سەر بەرزبکاتەوەو (الله أكبر) بکا، ئەگەر ئاوای کردو هەموو رکاتی نوێژەکەی بەو شێوە ئەنجامدا ئەوە نوێژەکەی بەتەواوی کردوە.

٢- تەحیات خوێندنی یەکەم: لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەتکراوە، (رەزای خودای لێ بێ) گوتی: بێگومان حەزرەتی موحەممەد فەرمووی: « إِذَا قَعَدْتُمْ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ فَقُولُوا». هەرکاتێ دانیشتن بۆ تەحیات خوێندن دوای ئەنجامدانی دوورکات بڵێن: «التَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللّٰهِ الصَّالِحِينَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَلْيَتَخَيَّرْ أَحَدُكُمْ مِنَ الدُّعَاءِ أَعْجَبَهُ إِلَيْهِ

---

[1] صحيح: (ص.د/٧٦٣) ، د(٨٤٢/٩٩، ٣/١٠٠).

فَلْيَدْعُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ».[1] پاشان به ئیختیاری خۆی چەندێ ئارمزۆ بکا دوعاو نزاو پاڕانەوە ئەنجام بدا، یا بەوجۆرە دوعایانە لەخودای خۆی بپاڕێتەوە.

بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەو کابرایە کرد کە بە هەڵەشەیی نوێژی کردو پێی فەرموو: « فَإِذَا جَلَسْتَ فِي وَسَطِ الصَّلاَةِ فَاطْمَئِنَّ وَافْتَرِشْ فَخِذَكَ الْيُسْرَى ثُمَّ تَشَهَّدْ».[2] ئەگەر لەناوەڕاستی نوێژدا دانیشتی بۆ تەحیات خوێندن، ئەوە جوان ئارام بگرەو رانی راستت لەسەر زەوی دابنێو ئەمجار دەست بکە بەتەحیات خوێندن.

٣- پێویستە کەسێك: کە دەیەوێ نوێژ بکا شتێك لەپێش خۆیەوە دابنێ، بچەقێنێ ببێتە نیشانەی ئەوەی: کە رۆیشتن بە بەردەمیدا یاساغە، وابێ ببێتە پەردەو نەهێڵێ ئەو دیوی ببیندرێ.

لە سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى سُتْرَةٍ فَلْيَدْنُ مِنْهَا لاَ يَقْطَعُ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ صَلاَتَهُ»[3]: هەرکاتێك یەکێك لەئێوە ویستی نوێژ بکا، با پەردەیەك، لەمپەڕێك لەپێش دەمی خۆی دابنێو لەنوێژەکەدا روی تێ بکا، با لەوپەردەو لەمپەڕە خۆ نزیك بکاتەوە بۆئەوەی شەیتان نوێژەکەی لێ نەبڕێ.

لەئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تُصَلُّوا إِلاَّ إِلَى سُتْرَةٍ ، وَلاَ تَدَعْ أَحَدًا

---

[1] صحيح: (الإرواء/٣٣٦)، ن(٢/٢٣٨).

[2] صحيح: (ص.د/٧٤٦) ، د(٨٤٥/١٠٢/٣).

[3] صحيح: (ص.ن/٧٢٢) ، ك(١/٢٥١) وهذا الفظه ورواه: د(٦٨١/٢/٣٨٨)، ن(٢/٦٢) بلفظ (اذا صلى احدكم الى سترة...الخ).

يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْكَ ، فَإِنْ أَبَى فَقَاتِلْهُ ، فَإِنَّ مَعَـهُ الْقَـرِينَ»[1]: نویـژ دامەبەسـتن مەگـەر (سُترة) شتێکتان لەبەردەم خۆتان کردبێ بە پەردەو لەمپەڕ، مەهێڵە کەس بە بەردەمتدا تێپەڕێ‌و بکەوێتە نێوان تۆی نوێژکەرو ئەو شتەی کردوتە بە پەردە، ئەگەر هەر دەیویست بەزۆرە ملێ بەبەردەمتدا تێپەڕێ مەیهێڵە پاڵی پێوە بنێ، شەڕی لەگەڵ بکە، چونکە ئەوە شەیتانی لەگەڵ دایەو هانی دەدا بۆئەوەی نوێژەکەت پێ ببڕێ.

دانانی لەمپەڕ بەوە دێتەجێ روبکەیە دیوار یان کۆڵەکە، یان عەصایەك لەبەردەمتـدا بـچەقێنی، یـان راحیلەیـەك لەبـەردەمت دابنێـیو لەنوێژکردنەکەتدا روی تێ بکەی کەمترین شتێك بیکەیە لەمپەڕو (سُترة) ئـەو پارچـە دارەیـە کـە لـەکاتی سـواربوونی راحیلـەدا پـشتی پێـوە دەدرێ. ئەمەش بەپێی ئەو فەرموودەی موسای کوڕی طەلحە لە باوکیـەوە ڕیوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلَ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ فَلْيُصَلِّ وَلاَ يُبَالِ مَنْ مَرَّ وَرَاءَ ذَلِكَ».[2] ئەگەر یەکێك لەئێوە لەپێش دەمی خۆی شتێکی وەکوو (مۆخرە)ی راحیلەی دانا باروی تێ بکاو نوێژەکەی بکا، ئەمجار هەرشتێك بەئەودیو لەمپەڕەکەدا بڕوا قەیناکا.

### نزیکی نوێژکەر لە لەمپەڕو (سُترة)

لە بیلالەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی کرد لەنێوان ئەوو ئەو دیوارەی روی تێ کردبوو سێ زیراعێك بەتاڵایی

---

[1] صحيح: (صفة الصلاة/٦٢)، خز(٨٠٠/٩/٢).

[2] صحيح: (مختصر م/٣٣٩)، م(٤٩٩/٣٥٨/١)، ت(٣٣٤/٢١٠/١)، د(٦٧١/٣٨٠/٢) بنحوه.

هەبوو[١] ئەمە لەحاڵی راوەستانیدا، ئەگینا لە حاڵەتی روکوعو سوژدەدا چی وانەماوەتەوە.

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ڕیوایەتکراوە، گوتویەتی: لەنێوان شوێنی نوێژکردنی پێغەمبەرو ئەو دیوارەی بەردەمی بۆشایی راڕەوە مەڕێك هەبوو[٢] ئەوە لەحاڵەتی سوژدە بردندا بووە.

★ ئەگەر نوێژکەر لەپێش خۆیەوە (سوترە)ی دانا، نابێ رێگە بدا هیچ شتێك لەنێوان ئەوو لەمپەڕەکەدا بڕوا

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی دەکرد (سُتْرَة)ی دانابوو مەڕێك بە بەردەمیدا تێپەڕی، ئەوەندە لە قیبلە نزیك بووە ورگی خۆی بە قیبلەوە نوساند.[٣]

لە ئەبو سەعیدی (ألخدری)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَلاَ يَدَعْ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلْيَدْرَأْهُ مَا اسْتَطَاعَ فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ».[٤] ئەگەر یەکێك لەئێوە لەنوێژدابوو، با نەهێڵێ کەس بەبەردەمیا تێپەڕێ، با تا لەتوانایدایە کابرا مەنع بکا لەوکارە، ئەگەر هەر سوور بوو لەسەرئەوە بە بەردەمیدا بڕوا با شەڕی لەگەڵ بکا، چونکە ئەوکارە لەکاری شەیتان دەچێ یان ئەو کابرایە بەو کردەوە دەچێتە پێڕی شەیتانەکانەوە.

ئەگەر نوێژکەر سوترەو لەمپەڕی دانەنا ئەوە ئەگەر بە بەردەمیا گوێدرێژ یان ئافرەت یان سەگی رەش تێپەڕی نوێژەکەی دەبڕێ.

---

[١] صحيح: (صفة الصلاة/٦٢)، خ(١/٥٧٩/٥٠٦).

[٢] متفق عليه: (١/٥٧٤/٤٩٦)، م(١/٣٦٤/٥٠٨)، د(٢/٣٨٩/٦٨٢) بنحوه.

[٣] صحيح: (صفة الصلاة/٦٤) ، خز(٢/٢٠/٨٢٧).

[٤] صحيح: (مختصر م/٣٣٨)، م(١/٣٦٢/٥٠٥).

لە عەبدوڵڵای کوڕی (الصامت) لە ئەبو زەڕەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَإِنَّهُ يَسْتُرُهُ إِذَا كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ فَإِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ فَإِنَّهُ يَقْطَعُ صَلاَتَهُ الْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ وَالْكَلْبُ الأَسْوَدُ». هەرکاتێ یەکێ لەئێوە هەڵسا بۆ نوێژ، ئەوە سوترەو لەمپەڕێك لەبەردەم خۆی دابنێ ئەگەر تەنانەت پارچە دارێکی وەکوو پاش ڕەحڵەی لەبەردەستدا بوو، ئەگەر سوترەو لەمپەڕێکی وای دانەنا، ئەوە ئەگەر بەبەردەمیا گوێ درێژ یان ئافرەت، یان سەگی ڕەش تێپەڕی نوێژەکەی دەبڕێ.

عەبدوڵڵا دەڵێ: وتم: ئەی ئەبو زەڕ فەرقی سەگی ڕەش لەگەڵ سەگی سورو وەرد چیە؟ لە وەڵامدا وتی: ئەی برازاکەم منیش هەمان پرسیارم ئاڕاستەی پێغەمبەر کردو وەکوو پرسیار لەمن دەکەی منیش ئاوا پرسیارم لە پێغەمبەر کرد لە وەڵامدا فەرمووی: «الْكَلْبُ الأَسْوَدُ شَيْطَانٌ».[1] سەگی ڕەش شەیتانە.

## حەرامە بەبەردەم نوێژکەردا تێپەڕی

لەئەبو جوهەیمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ».[2]: ئەگەر ئەوکەسەی بەبەردەم نوێژکەردا تێدەپەڕێ بیزانیایە چەندی تاوان دەگاتێ بۆی باشتر بوو چل ساڵ ڕاوەستێ نەك بە بەردەمی دا تێپەڕێ.

---

[1] متفق عليه: خ(١/٥٨٤/٥١٠)، م(١/٣٦٣/٥٠٧)، د(١/٣٩٣/٦٨٧)، ت(١/٢١٠/٢٣٥)، ن(١٦/٢)، جة(١/٣٠٤/٩٤٥).

[2] متفق عليه: خ(١/٥٨٤/٥١٠)، م(١/٣٦٣/٥٠٧)، د(٢/٣٩٣/٦٨٧)، ت(١/٢١٠/٢٣٥)، ن(٦١/٢)، جة(١/٣٠٤/٩٤٥).

## سوترەو کۆڵەکەی پێش نوێژ (ئیمام) بۆ مەئمومیش حلێبە

لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بەسواری دێڵە کەرێك هاتم بۆ دەشتی مینا، ئەوکاتە من رسیدە بوو بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمینا نوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، من بەپێش ریزی نوێژکەراندا تێپەڕیم، ئەمجار دابەزیم، دێڵە کەرەکەم بەرەڵا کرد بلەوەڕێ‌و بۆ خۆم چوومە ریزی نوێژکەرەکانەوە، کەس رەخنەی لێ نەگرتم.[1]

## سوننەتەکانی نوێژ

سوننەتەکانی نوێژ دوو جۆرن گوفتاری‌و کرداری.

**سوننەتە گوفتارییەکان (قولی)یەکان. ئەمانەن:**

١- دوعای نوێژ دەست پێکردنی نوێژ، گەورەترین جۆری ئەو دوعایە ئەوەیە کە ئەبو هورەیرە ریوایەتی کردووەو دەڵێ: پێغەمبەری خودا: کە (الله أکبر)ی دەکردو نوێژی دادەبەست، پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە ماوەیەك بێدەنگ دەبوو، عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! (دروودی خودای لەسەر بێ) بە دایك‌و باوکمەوە بەفیدات بم، پێم نالێی لەنێوان (الله أکبر)و فاتیحە خوێندندا ماوەیێك بێدەنگ دەبێ چی دەڵێی؟ فەرمووی: دەڵێم: «اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ وَالْبَرَدِ».[2] خودایە بە ئەندازەی دوریی نێوان خۆرهەڵات‌و خۆرئاوا لە تاوان

---

[1] متفق علیه: م(١/٣٦١/٥٠٤)، د(٢/٤٠٢/٧٠١)، خ(١/٥٧١/٤٩٣) بە زیادەیی رستەی (بمنی الی غیر جدار).

[2] متفق علیه: خ(٢/٢٢٧/٧٤٤)، م(١/٤١٩/٥٩٨)، جة (١/٢٦٤/٨٠٥)، د(٢/٤٨٥/٧٦٦).

دورم بخەرەوە، خودایە لە تاوانم پاکم بکەرەوە وەکوو چۆن قوماشی سپی لە چڵك پاك دەکرێتەوە، خودایە لە تاوانەکانم بم شۆرە بە بەفرو ئاوو تەرزە.

٢- خوێندنی رستەی «أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ». بە بەڵگەی ئایەتی {فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ – النحل/٩٨} کەویستت قورئان بخوێنی لەپێشەوە «أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ» بخوێنە.

لە ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەستی دەکرد بەنوێژو نوێژی دادەبەست پاشان دەیفەرموو: «أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ».[1] پەنا دەگرم بە پەروەردگاری شنەواو زانا، لەشەیتانی نەفرەت لێکراو، لەفیتنە جۆیی‌و فڕوفیشاڵی‌و هەڵنانی بەخراپەکاری.

٣- ئامین گوتن لەدوای خوێندنی (فاتیحە) لەوائیلی کوڕی حوجرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) کە {ولا الضالين}ی دەخوێند، دەیفەرموو: {آمین}و دەنگی بەرزو درێژ دەکردەوە

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».[2] ئەگەر ئیمام فاتیحەی خوێندو وتی: (آمین) ئێوەش لەتەکیا (آمین) بکەن چونکە کەسێك (آمین) کردنی هاوکات بێ لەگەڵ (آمین) کردنی فریشتە لێخۆشبوون لەتاوانی لەوەپێشی بۆ دەستەبەر دەبێ.

---

[1] صحيح: (الإرواء/٣٤٢)، د (٢/٤٧٦/٧٦٠)، ت (١/١٥٣/٢٤٢).

[2] صحيح: (صفة الصلاة/٨٢)، د (٣/٢٠٧/٩٢٠)، ت (١/١٥٧/٢٤٨).

٤- خوێندنی چەند ئایەتێك لە قورئان. لەئەبو قەتادەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا سورەتی فاتیحەی دەخوێند دوو سورەتی تری قورئانی دەخوێند لەڕکاتی یەکەمدا قورئان خوێندنەکەی درێژ دەکردو لەڕکاتی دووەمدا کورتی دەکردەوە، جاری وادەبوو ئایەتێکی بەگوێماندا دەدا، لەنوێژی عەصریشدا لەدوو ڕکاتی یەکەمدا سورەتی فاتیحەو دوو سورەتی دەخوێند، عادەتی وابوو ڕکاتی یەکەمی دەرێژ دەکردەوە لەنوێژی بەیانیدا، ڕکاتی دووەمی کورت دەکردەوە.[1]

هەر لە ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوو ڕکاتی نوێژی نیوەڕۆو عەصردا سورەتی فاتیحەو سورەتێکی تری دەخوێند، جاری وادەبوو دەنگی بەرز دەکردەوە گوێمان لەئایەتێك بێ، لەدوو ڕکاتی کۆتاییدا تەنها سورەتی فاتیحەی دەخوێند.[2]

وادەبێ خوێندنی قورئان لەدوو ڕکاتی کۆتایشدا سوننەتە ئەمەیش بەگوێرەی ئەو حەدیثەی ئەبو سەعید: کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی نیوەڕۆدا، لەدوو ڕکاتی یەکەمدا لە هەر یەکێکیاندا ئەندازەی سی ئایەتی دەخوێند لەدوو ڕکاتی دووەمدا ئەندازەی پانزە ئایەتی دەخوێند، یان وتی نیوەی ئەوەی لەڕکاتی یەکەمدا دەیخوێند. لەنوێژی عەصریشدا لەدوو ڕکاتی یەکەمدا لەهەر کاتێکدا ئەندازەی پانزە ئایەتی دەخوێند، لەدوو ڕکاتی دووەم نیوەی ئەوەی دەخوێند.[3]

---

[1] صحيح: (صحيح: (ص.)، ن ٩٣٢)، خ (٢/٢٤٣/٧٥٩).

[2] متفق عليه: م (١/٣٠٧/٤١٠)، خ (٢/٢٦٢/٧٨٠)، ن (٢/١٤٤)، (٣/٢١١/٩٢٤)، ت (٢٥٠/١/١٥٨)، جه (١/٢٧٧/٨٥١).

[3] صحيح: (مختصر م/٢٨٧)، م (١/٣٣٤/١٥٧/٤٥٢).

وا سوننەتە لەنوێژی بەیانیدا بەدەنگی بەرز قورئان بخوێندرێ هەروا لەدوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی شێوانو خەوتناندا. لەنوێژی نیوەڕۆو عەصرو ڕکاتی کۆتایی شێوانو دوو ڕکاتی کۆتایی خەوتنان وا سوننەتە بەدەنگی نزم بخوێندرێ بەجۆرێك بێ نوێژکەرەکە گوێی لەدەنگی خۆی بێ.

٥- تەسبیحاتی روکوعو سوژدە.

لە حوذەیفەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژم کرد، لە روکوعدا دەیگوت «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ». لەسوژدەدا دەیگوت: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى».[1]

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەنوێژدا دەچووە روکوع سێ جار دەیگوت: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ وبِحَمْدِهِ» کە دەچووە سوژدەوە سێ جار دەیگوت: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى وَبِحَمْدِهِ».

٦- زیادکردنی تەسبیحی هەستانەوە لەروکوع بەم جۆرە زیاد لەڕستەی «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ». یەکێ لەو تەسبیحاتە زێدانە بخوێندرێ.

«مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ».

ئەگەر حەزی لێ بوو هەر ئەوە بخوێنێ، ئەگەر حەزی لێ بوو بەم ڕستانە تەواوی بکا «أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ».[2] یان ئاوا بڵێ: «رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ مُبَارَكًا عَلَيْهِ كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى».[3]

---

[1] صحيح: (ص. ن ١٠٠١)، ن (٢/١٩٠)، د (٣/١٢٣/٨٥٧)، ت (١/١٦٤/٢٦١).

[2] صحيح: (مختصر م/٢٩٦)، م (١/٣٤٧/٤٧٨،٤٧٧)، د (٣/٨٢/٨٣٢)، ن (٢/١٩٩).

[3] صحيح: (صفة الصلاة/١٩٩).

٧- دوعای دانیشتنی نێوان دوو سوژدەکان.

لە حوزەیفەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنێوان دوو سوژدەکاندا (رب اغفرلی، رب اغفرلی) دەخوێند.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنێوان سوژدەکاندا (اللهم اغفرلی وارحمنی، واجبرنی، واهدنی، وارزقنی)ی دەخوێند.

٨- صەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکۆتای تەحیات خوێندنی یەکەمدا، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی ئەوەی ئەنجامداوە.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: (ئێمە سیواكو ئاوو شتی وامان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادە دەکرد، ئیتر پەروەردگار شەو لەخەو راستی دەکردەوە ئەویش سیواکی دەکردو دەستنوێژی دەشۆرد، پاشان نۆ ڕکات نوێژی دەکرد، لەنێوان ڕکاتەکاندا دانەدەنیشت مەگەر لەڕکاتی هەشتەمدا، لەخودا دەپاڕایەوە صەلاواتی لەسەر پێغەمبەری خودا لێ دەدا، پاشان ڕاست دەبوەوەو سلاوی نەدەدایەوە، پاشان ڕکاتی نۆیەمی دەکرد ئەمجار دادەنیشت، پاشان سوپاسی پەروەردگاری دەکردو پاشان سلاوی دەدایەوە).[1]

٩- دوعاو پاڕانەوە لەدوا تەحیاتی یەکەمو دووەم وەك یەکە.

لەدوا تەحیاتی یەکەم، وەکوو ئیبنو مەسعوود ڕیوایەتی کردووە گوتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «« إِذَا قَعَدْتُمْ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ فَقُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ

---

[1] أخرجه ابو عوانه في صحيحه (٢/٣٢٤) وهذا لفظه، م (١/٥١٢/٧٤٦) بدون جملة (ويصلى على نبيه).

وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللّٰهِ الصَّالِحِينَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَلْيَتَخَيَّرْ أَحَدُكُمْ مِنَ الدُّعَاءِ أَعْجَبَهُ إِلَيْهِ فَلْيَدْعُ اللّٰهَ عَزَّ وَجَلَّ».[1]

لەدوای تەحیاتی دووەم، وەکوو لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا فَرَغَ أَحَدُكُمْ مِنَ التَّشَهُّدِ الآخِرِ فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللّٰهِ مِنْ أَرْبَعٍ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ وَمِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ».[2] واتە: یەکێك لەئێوە کە لەتەحیات خوێندنی کۆتایی بووەوە با پەنابگرێ بەخودا لەچوار شت: لەسزای دۆزەخ. لەعەزابی گۆڕ. لەفیتنەو ئاشوبی زیندو مردو. لەشەڕو نەگبەتی دەجال.

١٠- سلاودانەوەی دووەم، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سلاوی بەلای ڕاستو بەلای چەپدا دەدایەوە، وەکوو لەئیبنو مەسعوودەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سلاوی بەلای ڕاستو بەلای چەپدا دەدایەوەو دەیفەرموو: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ»، «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ». هەتا لەڕیزی دواوەی ڕا سپیایی کوڵمی دەبینرا.[3]

---

[1] صحيح: سبق في واجبات الصلاة.

[2] صحيح: (مختصر م/٣٠٦)، (ص. جـه ٧٤١)، م (١/٤١٢/٥٨٨)، د (٣/٢٧٣/٩٦٨)، جـه (٩٠٩/١/٢٩٤).

[3] صحيح: (ص. د/٨٧٨)، د (٣/٢٨٨/٩٨٣)، ن (٣/٦٢)، جـه (١/٢٩٦/٩١٤)، ت (٢٩٤/١/١٨١) بدون الجملة الاخيرة.

وایش بووه هەر سلاوی بەلای ڕاستدا داوەتەوە، وەکوو لەخاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکۆتایی نوێژدا یەك سلاوی دەدایەوە، کەمێك بەلای ڕاستدا ڕوخساری وەردەگێڕا.[1]

**سوننەتە کرداریەکان (السنن الفعلیە)**

**١- دەست بەرز کردنەوە:** لەکاتی (الله أکبر) کردنی نوێژ دابەستن، لەکاتی چوونە ڕوکوعو هەڵسانەوە لێی. لەکاتی هەڵسانەوە لەتەحیاتی یەکەم. لەئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ دەستی بەرز دەکردەوە تابەرامبەر شانەکانی، هەروا کە دەچووە روکوعو کە لە روکوعیش هەڵدەستایەوە بەوجۆرە دەستەکانی بەرز دەکردەوە.[2]

لەنافیعەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) کە دەچووە ناو نوێژەوە (الله أکبر)ی دەکردو دەستی بەرز دەکردنەوە کەدەچووە روکوع هەمدیسان دەستی بەرز دەکردنەوە، کە لەروکوع هەڵدەسایەوە دەستی بەرز دەکردنەوەو دەیگوت: (سمع الله لمن حمده) هەروا کە لەدوا خوێندنی تەحیاتی یەکەم هەڵدەسایەوە دەستی بەرز دەکردنەوە. (نافیع ڕشتەی ئەم فەرموودەیەی بردۆتەوە سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).[3]

لەهەندێ ریوایەتدا هاتووە کە دەست بەرزکردنەوە سوننەتە لەکاتی هەموو نزمبوونەوەو هەڵسانەوەدا. ئەمەیش بەگوێرەی حەدیثی (مالك بن الحویرث): کە دەڵێ: پێغەمبەرم بینی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژدا

---

[1] صحیح: (ص. ت/٢٤٢)، ت (١/١٨٢/٢٩٥).

[2] متفق علیه: خ (٢/٢١٨/٧٣٥)، م (٣٩٠- ٢٢/١/٢٩٢)، ت (١/١٦١/٢٥٥)، ت (٢/١٢٢).

[3] صحیح: (ص/٦٦٣)، خ (٢/٢٢٢/٧٣٩)، د (٢/٤٣٩/٧٢٧).

کە دەچـووە روکـوع دەسـتی بـەرز دەکـردەوە، کـە لـە روکـوع سـەری بـەرز دەکردەوە کە دەچووە سوژدەوەو کە سەری لەسوژدە بەرز دەکردەوە، لەهەموو دانەوینەو سەر بەرزکردنەوەیەکدا دەسـتەکانی تـا ئاسـتی نەرمـەی گوێچکەی بەرز دەکردەوە.[1]

٢- دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لەسەر سنگ:

لەسەهلی کوڕی سـەعدەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵێ: (موسـوڵمانان فـەرمانیان پێ دەکرا: کـەپیاو دەسـتی ڕاسـتی بخاتـە سـەر باسـکی چـەپی لەنوێـژدا) ئـەبو حـازم دەڵێ: ئـەم فەرمانـە هـەردەبێ لەلایـەن پێغەمبـەرەوە بووبـێ (دروودی خودای لەسەر بێ)[2]

لـە وائیلـی کـوڕی حـوجرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵێ: لـەدوای پێغەمبـەرەوە نوێژم کرد (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی ڕاستی خستبووە سـەر دەسـتی چەپی لەسەر سینگی[3]

٣- ڕوانین بۆ شوێنی سوژدە:

لەخاتو عائیشەوە ریوایـەتکراوە دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) چووە ناو کەعبەوە چاوی بڕییـە شـوێنی سـوژدەبردنیو چـاوی لێ کلا نەکرد هەتا لەنوێژەکەی بووەوە.

٤- لـە ڕوکوعـدا هەنـدێ هـەینات هـەن ڕەچـاویان بکـا، وەکـوو لـەم فەرموودەیەدا ئاماژەیان پی دەکرێ: لەخاتو عائیـشەوە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) ریوایەتکراوە دەفەرموێ: پێغەمبەری خـودا (درودی خـودای لەسـەر بـێ) کـە

---

[1] صحيح: (ص. ن/١٠٤)، ن (٢/٢٠٦)، حم (٣/١٦٧/٤٩٣).

[2] صحيح: (مختصر خ/٤٠٢)، خ (١/٢٢٤/٧٤٠)، ط (١١١/٣٧٦).

[3] صحيح: (صفة الصلاة/٦٩)، ك (١/٤٧٩).

دەچووە روکوع سەری بەرز ڕانەدەگرتو زۆریش نەوی نەدەکرد، بەڵکوو لەنێوان ئەو دوو حاڵەدا سەری خۆی ڕادەگرت.[1]

لە ئەبو حومەیدەوە دەربارەی وەصفی نوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەچووە روکوع هەردوو دەستی لەهەردووك لاوە لەئەژنۆی گیردەکردن، پاشان پشتی ڕاست ڕادەگرت[2]

لە وائیلی کوڕی حوجرەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەچووە روکوع پەنجەکانی بەملاو ئەولای ئەژنۆیدا بلاّو دەکردەوە.[3]

لە ئەبو حومەیدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە روکوعو دەستەکانی خستە سەر ئەژنۆکانیو توندگرتنی قۆڵو باسکی کەوانەیی کردنو لەتەنیشتی خۆی دوورخستنەوە.[4]

**٥- پێشخستنی دوو دەست لە ئەژنۆ لەکاتی سوژدە بردندا بۆسەر زەوی:**

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَبْرُكْ كَمَا يَبْرُكُ الْبَعِيرُ وَلْيَضَعْ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ».[5] هەرکاتێ ئێوە دەچنە سوژدە، باخۆی پیخ نەدا وەکوو چۆن حوشتر خۆی پیخ دەدا، واتە: با سەرەتا ئەژنۆکانی نەخاتە سەرزەوی بەڵکوو با لەپێشدا دوو دەستی بخاتە سەر زەوی ئەمجار ئەژنۆکانی.

---

[1] صحيح: (صفة الصلاة/١١١)، م (١/٣٥٧/٤٩٨)، د (٢/٤٨٩/٧٦٨).

[2] صحيح: (صفة الصلاة/١١٠)، خ (٢/٣٠٥/٨٢٨)، د (٢/٤٣٧/٧١٧).

[3] صحيح: (صفة الصلاة/١١٠)، خ (١/٣٠١/٥٩٤).

[4] صحيح: (ص. ت/٢١٤)، د (٢/٤٢٩/٧٢٠)، ت (١/١٦٣/٢٥٩).

[5] صحيح: (ص.د/٧٤٦) ، د(٢/٧٠/٨٢٥)، ن(٢/٢٠٧)، حم(٢/٢٧٦/٦٥٦).

**٦- له سوژدهدا رهچاوی ئهو ناكارانه بكا: كه ئهم فهرموودانهی دوایی لهخۆیان گرتون**

له ئهبو حهمیدهوه دهربارهی وهصفی نوێژی پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) ڕیوایهتكراوه، دهڵێ: (پێغهمبهر كه تهشریفی دهچووه سوژده دهستی رانهدهخستن واته: لهگهڵ دهستهكانیدا باسكی لهزهوی نهدهدا، ههروا دهستیشی نهدهقوچاندن، چاوه قامكهكانی روهو قیبله دهكردن).[1]

له (ألبَراء)هوه ڕیوایهتكراوه، دهڵێ: پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) فهرمووی: «إِذَا سَجَدْتَ فَضَعْ كَفَّيْكَ وَارْفَعْ مِرْفَقَيْكَ».[2] كه چوویه سوژده ههردوو دهستت لهسهر زهوی دابنێو ههردوو ئهنیشكت لهزهوی بهرزبكهرهوه.

له عهبدوڵلای كوڕی مالیكی كوڕی بوحهینهوه ڕیوایهتكراوه، دهڵێ: پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) كه نوێژی دهكردو دهچووه سوژده ههردوو باسكی لهلاتهنیشتی خۆی دوور دهخستهوه بهجۆرێك سپیایی بنههنگڵی دهبیندرا.[3] لهخاتو عائیشهوه ڕیوایهتكراوه، دهفهرموێ: (پێغهمبهر لهلای من بوو بۆ نوستن، كاتێك به خهبهر هاتم لهپهنام نهمابوو، ویستم بزانم چی لێ هاتووه: كه دیم چوبوه سوژده، چاوه قامكی قاچهكانی كردبوونه قیبلهو پاژنهی راست راگرتبون.[4]

له وائیلی كوڕی حوجرهوه ڕیوایهتكراوه، دهڵێ: (هاتمه شاری مهدینه وتم: دهبێ بڕوانم، بزانم پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) چۆن نوێژ دهكا. بڕێكی حهدیثهكهی گێڕایهوهو وتی: (ثُمَّ هوى، فسجد، فصار رأسه بين

---

[1] صحيح: (ص.د/٦٧٢) ، خ(٢/٣٠٥/٨٢٨)، د(٢/٤٣٧/٧١٨).

[2] صحيح: (صفة الصلاة/١٣٦)، م(١/٣٥٦/٤٩٤).

[3] متفق عليه: خ(٢/٢٩٤/٨٠٧)، م(١/٣٥٦/٤٩٥)، ن(٢/٢١٢).

[4] صحيح: (صفة الصلاة/١٣٦) ، خز(١/٣٢٨/٦٥٤)، هق(٢/١١٦).

كفيه)[1] پاشان خۆی نزم كردەوە بۆ سەرزەوی‌و سوژدەی برد، سەری خستبوە نێوان دوو دەستیەوە.

لە وائیلی كوڕی حوجرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە دەچوە سوژدە پەنجەكانی بەیەكەوە دەنوساندن.[2]

لە (ألبراء)ەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): كە دەچوە سوژدە دەستی دەخستە سەرزەوی، پەنجەی دەستی‌و قاچی وادادەنان كە ڕویان لە قیبلە بێ.[3]

**٧- دەبێ شێوەی دانیشتنی نێوان سوژدەكانی لەسەر ئەو شێوەو هەینەتەی ئەم حەدیپانەی دوایی لەخۆیان گرتووە:**

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: «وَكَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى».[4] (پێغەمبەری خودا: كەبۆ تەحیات خوێندن دادەنیشت قاچی چەپی ڕادەخست‌و قاچی ڕاستی هەڵدەنا).

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتكراوە، فەرموویەتی: (لە سوننەتی نوێژە كە لەتەحیات خوێندندا وابكا قاچی ڕاستی هەڵنێ‌و پەنجەكانی ڕوبكاتە قیبلەو لەسەر قاچی چەپی دانیشی.[5]

هەروا لە (طاوس)ەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: دەربارەی (الإقعاء) كە بریتییە لە دانیشتن لەسەر هەردوو پاژنەپێ‌و هەردوو قاچ هەڵنندرێن سەرە پەنجەكان ڕویان لە قیبلە بێ، پرسیاركرا لە ئیبنو عەبباس لە وەڵامدا

---

[1] صحيح الأسناد: خز(٦٤١/٣٢٣/١).

[2] صحيح: (صفة الصلاة/١٢٣)، خز(٦٤٢/٣٢٤/١)، هق(١١٢/٢).

[3] صحيح الأسناد: (صفة الصلاة/١٢٣)، هق(١١٣/٢).

[4] صحيح: (مختصر م/٣٠٢)، م(٤٩٨/٣٥٧/١)، د(٧٦٨/٤٨٩/٢).

[5] صحيح: (ص.ن/١١٠٩٦) ، ن(٢٣٦/٢).

فەرمووی: ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە، پێمان گوت: ئێمە ئەو جۆرە دانیشتنە بەزەحمەت دەزانین بۆ مرۆڤ ئیبنو عەبباس وتی بەڵکوو ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە (درووودی خودای لەسەر بێ)[1]

**٨- یەکسەر لە سوژدەوە راست نەبێتەوە بەڵکوو کەمێک دانیشێ ئەمجار هەڵسێتە حەوا:**

لە ئەبو قیلابەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: مالیکی کوڕی (الحویرث اللیثی) هەواڵی پێداین: کە بینیویەتی پێغەمبەر نوێژی دەکرد، جا: کە لەرکاتە تاکەکاندا لەسوژدە هەڵدەستایەوە، راستەوخۆ راست نەدەبووەوە بەڵکوو جارێ کەمێك دادەنیشت ئەمجار راست دەبووەوە.

**٩- کە لەسوژدەی دووەم هەڵسایەوە بۆ راوەستان و فاتیحە دەبێ هەردوو دەستی دادا، واتە دەبێ بۆ هەڵسانەوە قورسایی بخاتە سەر دوو دەستی:**

لە ئەییوبەوە لە ئەبو قیلابەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: مالیکی کوڕی (الحویرث) هاتە لامان، لەمزگەوتی خۆماندا نوێژی بۆ کردین، وتی: من نوێژتان بۆ دەکەم مەبەستم ئەوەیە ئێوە بزانن نوێژکردن چۆنەو فێری بن مەبەستم ئەوە نیە من نوێژی فەرز ئەدابکەم. بەڵکوو من دەمەوێ نیشانتان بدەم چۆنم پێغەمبەر بینیوە نوێژی کردوە، منیش بە ئەبو قیلابەم گوت: دەی باشە پێمان بڵێ: نوێژکردنی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) چۆن بوو؟ وتی: نوێژکردنی وەکوو شێوە نوێژکردنی ئەم شێخە نورانی‌یە بوو – مەبەستی بەو شێخە عەمری کوڕی سەلەمە بوو – ئەییوب دەفەرموێ: ئەو شێخە (الله أکبر)ی دەکرد، کە لەسوژدەی دووەم سەری بەرزدەکردەوە،

---

[1] صحیح: (مختصر م/٣٠٣)، م(١/٥٣٦)، د(١/٧٩/٨٣٠)، ت(١/١٧٥/٢٨٢).

دانیشتنێکی دەکرد، ئەمجار قورسایی خۆی دەخستە سەر هەردوو دەستی‌و پاشان هەڵدەستایە سەرپێ.[١]

**١٠- واباشە دانیشتن بۆ هەردوو تەحیات خوێندنەکە بەو شێوە بێ کە ئەم فەرموودانەی دوایی ئاماژەیان پێ دەکەن:**

لە ئەبو حومەیدەوە ڕیوایەتکراوە: کە دەربارەی شێوەی نوێژکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتوویەتی: (کە لەدوا دوو ڕکات نوێژ دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، لەسەر قاچی چەپی دادەنیشت‌و قاچی ڕاستی هەڵدەناو سەری پەنجەکانی ڕووەو قیبلە دەکردن. ئەگەر لەدوا ڕکاتی کۆتایی نوێژ بۆ تەحیات خوێندن دابنیشتایە قاچی چەپی لەژێر گوزنگی قاچی ڕاستی‌یەوە دەردێناو سنگە پێی قاچی ڕاستی لەزەوی گیردەکردن چاوە قامکی ئەو قاچەی بەرەو قیبلە دەکردن مەقعەدی دەخستە سەر زەوی.[٢]

لە ئیبنو عومەرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): کەبۆ تەحیات خوێندن دادەنیشت دەستی ڕاستی دەخستە سەر ڕانی ڕاستی‌و پەنجەکانی کۆ دەکردنەوە، جگە لە قامکە شادە، بەو ئاماژەی دەکرد. دەستی چەپیشی دەخستە سەر ڕانی چەپی.[٣]

لە نافیعەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) کە لەنوێژدا دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، هەردوو دەستی دەخستە سەر دوو ئەژنۆی. بە قامکە شادەی دەستی ڕاستی ئاماژەی دەکردو چاوی ئاڕاستەی قامکە شادەی دەکرد. پاشان وتی: پێغەمبەر (دروودی خودای

---

[١] صحيح: (مختصر خ/٤٣٧)، خ(٨٢٤/٣٠٣،٢/٢)، هق(٢/١٢٣)، فع(١/١١٦).

[٢] صحيح: (مختصر خ/٤٤٨) ، خ(٨٢٨/٣٠٥/٢).

[٣] صحيح: (ص.د/٨٥١) ، م(٥٨٠-١١٦/٤٠٨/١)، د(٩٧٢/٢٧٧/٣).

لەسەر بێ) فەرمووی: « لَهِيَ أَشَدُّ عَلَى الشَّيْطَانِ مِنَ الْحَدِيدِ».[1] بێگومان قامکە شادە کاریگەری لەسەر شەیتان لە ئاسن پترە.

## ئەو ذیکرو دوعایانەی لەدوا نوێژ مەشروعن

١- لە ثەوبانەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەنوێژ دەبوەوە سێجار (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ)ی دەکرد، ئەمجار دەیفەرموو: « اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ السَّلاَمُ تَبَارَكْتَ يَاذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ». خودایە تۆ بۆخۆت سەلامی، سەلامی حەقیقی لەتۆوەیە، بەرزو پیرۆزی ئەی ئەو کەسەی خاوەنی جەلالو عەظەمەتو ڕێزی...

(الوليد) دەڵێ: بە ئیمامی ئەوزاعیم گوت: (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ) کردنە چۆن دەگوترێ؛ وتی: دەڵێی: (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ، أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ)[2]

٢- لەئەبو (الزبير)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئیبنو (الزبير) لەدوا هەموو نوێژێکەوە کە سڵاوی دەدایەوە دەیگوت «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَلاَ نَعْبُدُ إِلاَّ إِيَّاهُ لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ». هیچ خودا نین جگە لەزاتی (الله) تاکو تەنیاو بێ هاوەڵە، دەسەڵاتی حەقیقی هی ئەوە، حەمدو سەنا شیاوی ئەوە، بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارە، هیچ هێزو توانایەك وجودی نیە ئەگەر بەهۆی زاتی (الله)وە نەبێ. ئێمە بەندایەتی هەر بۆ ئەو دەکەینو بەس. نیعمەتو شکۆمەندی هی ئەوەو بەدەست ئەوە، سەناو سوپاسی جوانو بێ خەوش

---

[1] حسن (صفة الصلاة/١٤٠)، حم(٤/١٥/٧٢١).

[2] (صفة الصلاة/١٤٠)، حم(٤/١٥/٧٢١).

شیاوی ئەوە، هیچ خودا نین جگە لەئەو، ئێمە بە ئیخلاصەوە پەرستشی ئەو دەکەین‌و هەر ئەو دەپەرستین، جا بابێ بڕوایان شەق بەرن.

ئیبنو الزبیر وتی: پێغەمبەری خودا لەدوا هەموو نوێژێکەوە ئەم دوعایەی دەخوێند.[١]

٣- لە (وراد) کە مەولاو ئازادکراوی (المغیرة)ی کوڕی (شعبة)یە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: (المغیرة)ی کوڕی (شعبة) نامەی نووسی بۆلای (معاویة) وتی: پێغەمبەری خودا کە لەنوێژ دەبووەوەو سڵاوی دەدایەوە، دەیگوت: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ ، وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ».[٢]

٤- لە کەعبی کوڕی (عُجْرَة)وە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەت دەکا. کە فەرموویەتی: «مُعَقِّبَاتٌ لاَ يَخِيبُ قَائِلُهُنَّ – أَوْ فَاعِلُهُنَّ – ثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ تَسْبِيحَةً وَثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ تَحْمِيدَةً وَأَرْبَعٌ وَثَلاَثُونَ تَكْبِيرَةً فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ».[٣] چەند زیکرو دوعایەك هەن لەدوا نوێژ، بێژەرەکەیان نائومێد نابێ، سی‌وسێ جار (سبحان الله)، سی‌وسێ جار (الحمدلله)، سی‌و چوارجار (الله أکبر) کردن لەدوا هەموو نوێژێك.

لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: «مَنْ سَبَّحَ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَحَمِدَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَكَبَّرَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ فَتِلْكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ وَقَالَ تَمَامَ الْمِائَةِ لاَ

---

[١] صحيح: (ص.ن/٢٢٧) ، م(١/٤١٥/٥٩٤)، د(٤/٣٧٢/١٤٩٣)، ن(٣/٧٠).

[٢] متفق عليه: خ(٢/٣٢٥/٨٤٤)، م(١/٤١٤/٥٩٣)، د(٤/٣٧١/١٤٩١).

[٣] صحيح: (ص.ن/١٣٧٨) ، م(١/٤١٨/٥٩٦)، ت(٥/١٤٤/٣٤٧٣)، ن(٣/٧٥).

إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ غُفِرَتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ»[1]: کەسێك دوای هەموو نوێژێك سی‌و سێ‌جار (سبحان الله)بکا سی‌و سێ‌جار (الحمدلله) بکا سی‌و سێ‌جار (الله أکبر) بکا کە دەکاتە نەوەدو نۆو بۆ کردنی ئەو ژمارە بەسەد، بڵێ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ ، وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ». چاوپۆشی لەتاوانەکانی دەکرێ، تەنانەت ئەگەر بە ئەندازەی کەفی دەریا زۆربن.

٥- لە موعازی کوڕی جەبەلەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرتم‌و پێی فەرمووم: ئەی موعاذ! سوێندم بەخودا من تۆم خۆش دەوێ. منیش گوتم بەدایك‌و باوکمەوە بەقوربانت بم سوێندم بەخودا منیش خۆشم دەوێی. فەرمووی: ئەی موعاز! وەصیەتت بۆدەکەم، لەدوای هیچ نوێژێك ئەم دوعایە لەبیر نەکەی‌و کە لەنوێژ بویەوە بڵێ: «اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ». خودایە! یارمەتیم بدە لەسەر بەجێهێنانی یادکردنت‌و سوپاس کردنت‌و پەرستش بۆکردنت بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك‌و پەسەند.[2]

٦- لە ئەبو ئومامەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: {من قرأ آية الكرسيِّ دُبُر كل صلاة مكتوبة لم يمنعه من

---

[1] دەربارەی ژمارەی زیکرەکان ریوایەت هەیە (دەدە) ریوایەت هەیە پانزە، ریوایەت هەیە بیست‌و پێنج بیست‌و پێنج، بۆیە واباشە موسوڵمان هەندێ جار ئەو ژمارەو هەندێ جار ژمارەیەکی تر رەچاو بکا.....هتد. خ(١١/١٣٢/٦٣٢٩)، م(١/٤١٧/١٤٣/٥٩٥)، ن(٣/٧٦)، ص.ن (١٢٧٩)، صحيح (مختصر/٣١٤)، م(١/٤١٨/٥٩٧).

[2] صحيح: (ص.ج/٧٩٦٩) ، د(٤/٣٨٤/١٥٠٨).

دخول الجنة الا أن يموت}[1]؛ کەسێك لەدوا هەموو نوێژێکی فەرز (ایةالكرسي) بخوێنێ، هیچ شتێك نابێتە لەمپەڕ لەچوونی بۆ ناو بەهەشت جگە لەمردن. هەڵبەتە لەو دونیا مردن نیە. موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم لە حەدیثەکە، ئەمەشی زیادکردوە. {وقل هو الله أحد}.

٧- لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردم: کە لەدوا هەموو نوێژێك (قل أعوذ)ەوەکان بخوێنم[2].

٨- لە ئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە نوێژی بەیانی دەکردو سڵاوی دەدایەوە، دەیفەرموو: « اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا وَرِزْقًا طَيِّبًا وَعَمَلاً مُتَقَبَّلاً». [3]: خودایە! من داوات لێ دەکەمو لێت دەپاڕێمەوە زانیاری بەسودم فێربکەی، ڕزقی حەڵاڵو پاکم بدەرێ، وام بۆ بڕەخسێنە کردەوەیەك بکەم لای تو قبوڵ بێ.

### ئەو کردەوانەی لەناو نوێژدا مەکروهو ناباشە

**١- یاریکردن بە پۆشاك یان بە ئەندامێکی جەستەی بەبێ هۆ:**

لە موعەیقیبەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی پیاوێك: کە جێگای سوژدەی خۆی ڕێك بکا، فەرمووی: «إِنْ كُنْتَ فَاعِلاً فَوَاحِدَةً». [4] ئەگەر پێویست بوو شوێنی سوژدەکەت مەسح بکەی‌و ڕێکی بخەی یەکجار دەستی پێدا بێنە.

---

[1] صحيح: (ص.ج/٦٤٦٤) ، طب(٨/١٣٤/٧٥٣٢).

[2] صحيح: (ص.ن/١٣٦٨) ، د(٤/٣٨٥/١٥٠٩)، ن(٣/٦٨).

[3] صحيح: (ص.جة/٧٥٣) ، جة(١/٢٩٨/٩٢٥)، حم(٤/٥٥/٧٧٦).

[4] متفق عليه: خ(٣/٧٩/١٢٠٧)، م(٥٤٦- ٤٩- ١/٣٨٨)، ت(٣٧٧/١/٢٣٥)، جة(١/٣٢/١٠٢٦)، ن(٣/٧).

**٢- دەست خستنە سەر کەلەکە لەنوێژدا:**

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: (نەیکردوە لەوەی مرۆڤ وانوێژ بکا دەستی لەسەر کەلەکەبێ لەکاتی ڕاوەستان بۆ فاتیحە خوێندن.[1]

**٣- چاو هەڵبڕین بەرەو ئاسمان:**

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر فەرموی: «لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ رَفْعِهِمْ أَبْصَارَهُمْ عِنْدَ الدُّعَاءِ فِي الصَّلاَةِ إِلَى السَّمَاءِ أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ».[2] دەبێ وازبێنن ئەو خەڵکانە لەچاو بەرزکردنەوە بەرەو ئاسمان لەکاتی دوعاکردنیان لەناو نوێژدا، ئەگەر وازبێنن لەوکارەیان باشە، ئەگینا دوور نیە ڕۆشنایی چاویان لێ بسەندرێتەوە.

**٤- ئاوڕدانەوە بەبێ ئەوەی پێویست بێ:**

لەخاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد دەربارەی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا لە وەڵامدا فەرمووی: «هُوَ اخْتِلاَسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلاَةِ الْعَبْدِ».[3] ئەوە لێ دزینەوەیە کە شەیتان لەنوێژی بەندە دەیفڕێنێ.

**٥- تەماشاکردنی شتێک ئادەمیزاد مەشغوڵ بکا:**

لەخاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی دەکرد کراسێکی گوڵداری لەبەردابوو، پاشان فەرمووی: «شَغَلَتْنِي أَعْلاَمُ هَذِهِ ، اذْهَبُوا بِهَا إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَأْتُونِي

---

[1] متفق عليه: خ(١٢٢٠/٨٨/٣)، م(٥٤٥/٣٨٧/١)، د(٩٤/٢٢٣/٣)، ت(٣٨١/٢٣٧/١)، ن(١٣٧/٢).

[2] صحيح: (مختصر م/٣٤٣)، م(٤٢٩/٣٢١/١)، ن(٣٩/٣).

[3] صحيح: (ص.ج/٧٠٤٧) ، خ(٧٥١/٢٣٤/٢)، د(٨٩٧/١٧٨/٣)، ن(٨/٣).

بِأَنْبِجَانِيَّةٍ». [1] گوڵو نەخشی ئەم کراسە مەشغوڵیان کردمو نەیانهێشت باش دڵ بدەمە نوێژەکەم، ئەمە بەرنەوە بۆ ئەبو جەهم - (عامیری کوڕی حوزەیفە). کراسە ئەنبیجانیە سادەکەیم بۆ بێنن. (ئەنبیجانیە): کراسێکی ئەستورو کوڵکنە خەتو گوڵی تێدا نین).

**٦- سەدڵو بەردەماخکردن (ألسدل وتغکیە الفم):**

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لەوەی پۆشاك بەشێوەی سەدل بپۆشی بۆ نوێژکردن، هەروا نەهی کرد لەوەی مرۆڤ لەناو نوێژدا بەردەماخ بکا، واتە: دەمی خۆی بەلکی مێزەری یان پارچە قوماشێك هەڵپێچێ هەڵبەستێ. [2]

**ألسّدل: چەند مانایەکی هەیە:**

أ- خاوەنی (عون المعبود ج ٣٤٧/٢) دەڵێ: (ألخطابی) وتویەتی (ألسدل) بریتیە لەوە کابرا پۆشاکەکەی بەخۆیدا بەربداتەوە تا لەزەوی دەخشێ.

ب- لەکتێبی (ألنبیل)دا دەڵێ: ئەبو عوبەیدە لە (غریب)ەکەیدا وتویەتی (ألسدل) ئەوەیە کابرا قوماشێك بەخۆیدا بدا بەبێ ئەوەی ئەملاو ئەولای بێنێتەوە پێشەوەی خۆیو پشتێنی لەسەر ببەستێ. ئەگەر ئەملاو ئەولای قوماشەکەی لەپێشەوەی خۆی خستە سەریەك بەشتێك بەستی ئەوە پێی ناگوترێ (سدل).

ج- خاوەنی (النهایة في غریب الحدیث) دەڵێ (سدل) ئەوەیە کابرا قوماشەکە لەخۆیەوە پێچێو هەردوو دەستی بکەونە ژێر قوماشەکەوەو بەو

---

[1] صحیح: (جـة/٢٠٦٦)، خ(٢/٢٣٤/٧٥٢) ، م(١/٣٩١/٥٥٦)، د(٣/١٨٢/٩٠١)، ن(٢/٧٢)، جة(٢/١١٧٦/٣٥٥٠).

[2] حسن (ص. جـة/٩٦٦)، د(٢/٣٤٧/٦٢٩)، ت(١/٢٣٤/٣٧٦) رستەی یەکەم، جـە(٩٦٦/١/٣١٠) رستەی دووەم.

شێوە بچێتە روکوع‌و سوژدە. دەشڵێ: گوتراوە: (السدل) ئەوەیە ناوەڕاستی قوماشەکە بخاتە سەر سەری‌و بەڕاست‌و چەپی خۆیدا بەری بداتەوە بەبێ ئەوەی لکەکانی بخاتە سەر شانی.

د- جەوهەری دەڵێ: مانای (سَدَل ثوبَهُ يسدُلُهُ) واتە: کراسەکەی دادایەوە.

جا هیچ مانیعێك نیە لەوەی وشەی (السدل) لە فەرموودەکەدا بۆ هەموو ئەو مانایانە بێ. لەفزێکی موشتەرەك بێ‌و حەمل بکرێ بۆسەر هەموو ماناکانی.

٧- باوێشك دان (التپاؤب):

لە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «التَّثَاؤُبُ مِنَ الشَّيْطَانِ فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَكْظِمْ مَا اسْتَطَاعَ».[1] باوێشك هاتن لەنوێژدا لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەکێك لەئێوە باوێشکی دا با تادەتوانێ بیگێڕێتە دواوە، دەم بنوقێنێ‌و بەپشتی دەستی چەپی بەری دەمی خۆی بگرێ.

٨- تف هەڵدان بۆ پێشەوە بەرەو قیبلە یان بۆلای راست:

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي فَإِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قِبَلَ وَجْهِهِ فَلاَ يَبْصُقَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ تَحْتَ رِجْلِهِ الْيُسْرَى فَإِنْ عَجِلَتْ بِهِ بَادِرَةٌ فَلْيَقُلْ بِثَوْبِهِ هَكَذَا». بێگومان یەکێك لەئێوە: کە هەڵدەستێ بۆ ئەنجامدانی نوێژو دەست دەکا بەنوێژ، ئەوە پەروەردگار لەپێش دەمیەتی ئەو روبەڕوی پەروەردگاری خۆی وەستاوەو رازو نهێنی لەگەڵ ئەودا دەکاو خودا روی رەحمەتی لێیەتی. کەوابێ تف‌و بەڵغەم بۆ بەردەمی خۆی‌و لای راستی

[1] صحيح: (ص.ج/٣٠١٣) ، ت(٣٦٨/١/٢٣٠)، خز(٩٢٠/٦١/٢).

فڕێ نەدا، یا بۆلای چەپی یان بۆ ژێر قاچی چەپی فڕێی بدا ئەگەر لەسەر خۆڵ وەستابوو، ئەگەر تینی بۆهات با تفەکەی بکاتە لۆیەکی پۆشاکەکەیەوە بیپێچێتەوە، یان بیکاتە دەستەسڕێکەوە. دوایی لێی بکاتەوە بیسڕێتەوە. پاشان راوی شێوەی لولکردن و پێچانەوەی پۆشاکەکەی نیشاندا بەم جۆرە کە هەندێ لە قوماشەکەی خستە سەر هەندێك.[1]

**٩- پەنجە تێکنان و چەمبەرە بەستن:**

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (إذا توضأ أحدُكم في بيته، ثُمَّ أتى المسجدَ فلا يقل هكذا)[2] ئەگەر یەکێك لەئێوە لەماڵەوە دەستنوێژی گرت، دوایی هاتە مزگەوت، تا دەگەڕێتەوە ماڵەوە هەموو ئەو ماوەیەی بۆ بەنوێژ حلێب دەکرێ، کەوابێ با پەنجەی تێك نەپەڕێنێ، چونکە بە ئیعتیبار ئەو لەناو نوێژدایە.

**١٠- کۆکردنەوەی قژو پۆشاك:**

لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ریوایەت دەکا دەڵێ: فەرمووی: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةٍ، لاَ أَكُفُّ شَعَرًا وَلاَ ثَوْبًا».[3] واتە: فەرمانم پێ کراوە کە لەسەر حەوت ئێسقان سوژدە بەرم هیچ پۆشاك و قژو شتی وا کۆنەکەمەوە. واتە: ئەگەر لە سوژدە بردندا ئەگەر قژو لکی پۆشاکم کەوتنە سەر زەوی قەیناکا.

**١١- پێشخستنی ئەژنۆکان لەخستنە سەرزەوی دەستەکان:**

---

[1] صحيح: م(٢٠٠٨/٢٣٠٣/٤)، د(٢/١٤٤/٤٧٧).

[2] صحيح: (ص.ج/٤٤٥) ، ك(١/٢٠٦).

[3] صحيح: لەباسی ئەرکەکانی نوێژدا تێپەڕی.

لـه ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَبْرُكْ كَمَا يَبْرُكُ الْبَعِيرُ وَلْيَـضَعْ يَدَيْـهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ».[1] ئەگەر یەکێك لەئێوە ویستی بچێتە سوژدە با وەکوو حوشتر خۆ ییخ نەدا، با لەپێشدا دوو دەستی بخاتە سەرزەوی ئەمجار ئەژنۆکانی بخاتـە سەر زەوی.

١٢- ڕاخستنی دوو دەست لەسوژدەدا:

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بـێ) کە فەرموویـەتی: «اعْتَـدِلُوا فِـي الـسُّجُودِ، وَلاَ يَبْـسُطْ أَحَـدُكُمْ ذِرَاعَيْـهِ انْبِـسَاطَ الْكَلْـبِ».[2] لەسـوژدە بردنـدا میانـەڕەوی ڕەچاو بکـەن، بـا هـیچ کـام لـەئێوە کەچووە سوژدە باسکەکانی لەسەر زەوی ڕانەخا، وەکوو باسك ڕاخستنی سەگ.

١٣- نوێـــژکردن لـــەکاتی ئامـــادەبوونی خـــواردن، یـــان لـــەکاتی تەنگەتاویدا:

لـەخاتو عائیـشەوە ڕیوایـەتکراوە دەفـەرموێ: لـە پێغەمبـەرم ژنـەوت فەرمووی: «لاَ صَلاَةَ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ وَلاَ وَهُوَ يُدَافِعُهُ الأَخْبَثَانِ».[3] کەسفرەو نـان دانـرا نوێـژکردن بـاش نیـە، هـەروا کـە تەنگـەتاو بـوون بـۆ سـەراوکردن نوێـژ مەکەن، تا سەراودەکەن و سەرلەنوێ دەستنوێژ دەگرنەوە.

١٤- پێشکەوتن لەئیمام:

لـە ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ إِذَا رَفَعَ رَأْسَـهُ قَبْـلَ الإِمَـامِ أَنْ يَجْعَـلَ

---

[1] صحيح: (لەباسی سوننەتە کردەوەییەکانی نوێژدا تێپەڕی).

[2] متفـــق عليـــه: خ (٢/٣٠١/٨٢٢)، م (١/٣٥٥/٤٩٣)، ت (١/١٧٢/٢٧٥)، د (٣/١٦٦/٨٨٣)، جــه (١/٢٨٨/٨٩٢)، ن (٢/٢١٣) بنحوه.

[3] صحيح: (ص. ج/٧٥٠٩)، م (١/٣٩٣/٥٦٠)، د (١/١٦٠/٨٩).

اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَـارٍ».[١] ئایا یەكێك لەئێوە ناترسێ ئەگەر پێش ئیمام سەری بەرز كردەوە كە خودا سەری بكا بەسەری گوێدرێژ یان خودا شێوەو ڕوخساری بكاتە شێوەی گوێدرێژ.

## ئەوەی كردنی ڕەوایە لەناو نوێژدا

### ١- ڕۆیشتن لەنوێژدا بۆ كاری پێویست ڕەوایە:

لە خاتو عائیشەوە ریوایەتكراوە دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵەوە نوێژی دەكردو دەرگای ژورەكەی لەسەر داخرابوو، منیش هاتمەوە لە دەرگام داو داوای كردنەوەم كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژەكەیدا چەند هەنگاوێك رۆیشت بۆلای دەرگاكەو كردیەوە، ئەمجار پاشەو پاش گەڕایەوە شوێنی خۆی، ئەمجار خاتو عائیشە وەصفی دەرگاكەی كردو فەرمووی: دەرگاكە لەڕوی قیبلەوە بوو[٢] جا ئەگەر دەرگاكە لەلای راست بوو یان لەلای چەپ بوو یان لەدواوەوەی بوو هەر دروستە بڕۆی بۆلای بەمەرجێ لەڕۆیشتنەكەیدا پشت نەكاتە قیبلە.

### ٢- لە كۆڵكردنی منداڵ لەنوێژدا:

لە ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەری (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی دەكرد لەوكاتەدا ئومامەی كچی زەینەبی كچی كەخێزانی (ئەبولعاص)ی كوڕی (الربیع) بوو لەكۆڵ كردبوو، كە هەڵدەستا بۆ فاتیحە خوێندن ئومامەی لەكۆڵ دەكردو كە دەچووە سوژدە دایدەنا.[٣]

---

[١] متفق علیه: خ (٦٩١/١٨٣/٢) وهذا لفظه م (٤٢٧/٣٢٠/١)، د (٦٠٩/٣٣٠/١)، ن (٦٩/٢)، جه (٩٦١/٣٠٨/١).

[٢] حسن (ص. ن/١١٥١)، ت (٥٩٨/٥٦/٢)، د (٩١٠/١٩٠/٣)، ن (١١/٣).

[٣] متفق علیه: خ (٥١٦/٥٩٠/١)، م (٥٤٣/٣٨٥/١)، د (٩٠٤/١٨٥/٣)، ن (٤٥/٢).

**٣- كوشتنى دوپشكو مار:**

له ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی كرد بەكوشتنی دوپشكو مار لەنوێژدا[1] واتە: ئەگەر كابرا لەنوێژدا بوو دوپشك یان ماری بینیو دەیتوانی بیانكوژێ با دەست بەكار بێ. ئەو جەو جوڵەی دەیكا بۆ لەناو بردنیان زیان بەنوێژەكەی ناگەیەنێ.

**٤- ئاوڕدانەوەو ئاماژەكردنى مەبەست گەیەنەر:**

له جابیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەندروستی باش نەبوو، لەدواوەی نوێژمان دابەست ئێمە بەپێوەو ئەو دانیشتبوو ئاوڕی دایەوە بۆ لامان ئاماژەی بۆ كردین كەدانیشین، ئێمەیش دانیشتین.[2]

**٥- تف و بەڵغەمكردنە لكى پۆشاكەوە،** یان دەرهێنانی دەستەسڕ لەباخەڵ ڕەوایە، ئاماژە بەو فەرموودەی جابیر كە لەوەپێش ئاماژەی پێ كرا دەربارەی نەهی كردن لەتفكردن بەرەو ڕوی قیبلە.[3]

**٦- ئیشارەت كردن بە پەتكردنەوەى سڵاو لەكەسێك سڵاوت لێ بكا:**

له عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی چوو بۆ مزگەوتی قەباء نوێژی تێدا بكا، گروپی یاریدەدەران هاتن سڵاویان لێ كرد ئەویش لەنوێژدا بوو، جا عەبدوڵڵا دەڵێ: بە (بیلال)م گوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن وەڵامی سڵاوەكەیانی دایەوەو لەنوێژیشدا بوو؟ وتی: ئاوا بەو جۆرە دەستی خۆی پان

---

[1] صحيح: (ص. ج/١١٤٧)، خ (٢/٤١/٨٦٩).

[2] صحيح: (ص. ن/١١٤٥)، م (١/٣٠٩/٤١٣)، ن (٣/٩)، د (١/٣١٣/٥٨٨).

[3] صحيح: لەوەپێش لە (باسی كردارە ناباشەكانی ناو نوێژدا) تێپەڕی.

کردەوە جەعفەری کوڕی عەونیش دەستی پان کردەوە، بەری دەستی بۆلای زەوی‌و پشتی دەستی بۆلای ئاسمان.[1]

**٧- ئەگەر لەنوێژدا شتێک رووی‌دا پیاو (سبحان الله) دەکا ئافرەت چەپڵە:**

لەسەهلی کوڕی سەعدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَيُّهَا النَّاسُ مَا لَكُمْ إِذَا نَابَكُمْ شَيْءٌ فِي الصَّلاَةِ أَخَذْتُمْ فِي التَّصْفِيقِ؟ إِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ ، مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلاَتِهِ فَلْيَقُلْ سُبْحَانَ اللَّهِ ، فَإِنَّهُ لاَ يَسْمَعُهُ أَحَدٌ حِينَ يَقُولُ سُبْحَانَ اللَّهِ إِلاَّ الْتَفَتَ».[2] ئەی خەڵکینە! ئەوە چیتانە کە لەنوێژدا شتێکتان دێتەرێ دەست دەکەن بەچەپڵە لێدان، چەپڵە لێدان لەنوێژدا هەر بۆ ئافرەت دروستە. جا هەرپیاوێك لەنوێژدا توشی شتێك هات با بڵێ: (سبحان الله) چونکە هەرکەسێك گوێی لێ بێ کە دەڵێ: (سبحان الله) ئیللا ئاوڕ دەداتەوە.

**٨- ڕاستکردنەوەی هەڵە بۆ ئیمام (الفتح على الإمام).**

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژێکی کرد، قورئانی تێدا خوێند، لێ تێکچونێکی توش هات، کەتەواو بوو بە ئوبەی فەرموو: ئەوە تۆ نوێژت لەگەڵ ئێمە کرد؟ ئوبەی وتی: بەڵێ: فەرمووی: ئەی چی مەنعی کردی لەوەی بۆم ڕەد بکەیەوە.[3]

**٩- تێوەژنین لەقاچی نوستوو:**

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: (وابووە من لەپێش دەمی پێغەمبەر ڕادەکشام‌و تەشریفی نوێژی دەکرد، من قاچم درێژ دەکرد بۆ پێش

---

[1] حسن صحيح: (ص. د/٨٢)، د (١/١٧٠/٩٢٧).

[2] متفق عليه: خ (٣/١٠٧/١٢٣٤)، د (٣/٢١٦/٩٢٨).

[3] صحيح: (ص. د/٨٠٣)، د (٣/١٧٥/٨٩٤).

شوێنی سوژدەکەی، کەتەشریفی دەچووە سوژدە لەقاچی‌یەوە دەژمنیم‌و لام دەبرد، کە هەڵدەستایەوە قاچم دەهێنایەوە شوێنی پێشووی)[١]

١٠- شەڕکردن لەگەڵ ئەو کەسەی بیەوێ بە بەردەم نوێژکەردا تێپەڕێ.

لە ئەبو سەعیدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْ فِي نَحْرِهِ فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ».[٢] هەرکاتێ یەکێك لەئێوە نوێژی کردو رووی کردە سوترەو لەمپەرێك لەنێوان خۆی‌و خەڵکدا، یەکێك ویستی بە بەردەمیدا تێپەڕێ، با دەست بخاتە پێش گەردنی‌و بیگێڕێتەوە. ئەگەر هەر پێکیشی کرد با شەڕی لەگەڵ بکا، ئەوە کارەکەی لەکاری شەیتان دەچێ‌و دەبێ بەهەرشێوەیك بێ ڕێی لێ بگیرێ.

١١- گریان لەنوێژدا.

لە ئیمامی عەلی‌یەوە ڕیوایەتکراوە دەفەرموێ: (ڕۆژی غەزای بەدر کەسمان نەبوو ئەسپ سواری بکا جگە لە (المقداد) ئێمەشت دەدی شەو هەمووومان وەنەوزو خەوەنوچکە دایگرتبووین جگە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو تەشریفی لەژێر درەختێکدا سەرگەرمی نوێژکردن‌و گریان بوو لەنوێژەکەیدا تا ڕۆژ بۆوە.[٣]

---

[١] متفق عليه: خ (٣/٨٠/١٢٠٩)، وهذا لفظه، م (٥١٢ – ٢٧٢ – ١/٣٦٧) بنحوه.

[٢] صحيح: (ص. ج/٦٣٨)، م (٥٠٥ – ٢٥٩ – ١/٣٦٢).

[٣] إسناده صحيح: خم (٢١/٣٦/٢٢٥)، خ (٢/٥٢/٨٩٩).

## ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە

**١- دڵنیابوون لە دەستنوێژ شکان.**

لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە لەمامیەوە ریوایەتکراوە: کەچووەتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شکوای ئەوەی کرد: کەمرۆڤ جاری وا هەیە واهەستدەکا لەنوێژدا شتێکی لێ دەرچووبێو دەکەوێتە گومانەوە، پێغەمبەر فەرمووی: با نوێژەکەی نەبڕێو واز لەنوێژەکەی نەهێنێ. مەگەر گوێی لەدەنگێك بێ یان بۆنێك بێ.[1]

**٢- نەکردنی ڕوکنێک لەڕوکنەکانی نوێژ یان پاشگوێ خستنی مەرجێک لەمەرجەکانی بە ئەنقەستو بەبێ بیانو.**

ئەمەش بەپێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاڕاستەی ئەو کابرایەی کرد کە بەهەڵەشەییو نارێکی نوێژی کرد «ارْجِعْ فَصَلِّ ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ».[2] بگەڕێوە نوێژەکەت بکەرەوە چونکە تۆ لەڕاستیدا نوێژت نەکرد. هەروا بەپێی فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەوکەسەی کە بەپشتە پێیەوە پەڵەیەکی بینی ئاوی وێ نەکەوتبوو فەرمووی: بڕۆ دەستنوێژ بگرەوەو نوێژەکەشت دوبارە بکەرەوە.[3]

**٣- خواردنو خواردنەوە بە ئەنقەست**

(إبن المنذر) دەڵێ: زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەرئەوە ئەگەر کەسێك لەنوێژی فەرزدا بە ئەنقەست شتی خوارد یان خواردییەوە پێویستە لەسەری

---

[1] متفق عليه: خ (١/٢٣٧/١٣٧)، م (١/٢٧٦/٣٦١)، د (١/٢٩٩/١٧٤)، جه (١/١٧١/٥١٣)، ن (١/٩٩).

[2] متفق عليه: خ(٢٧٦/٧٩٣ و ٢/٢٧٧)، م(١/٢٩٨/٣٩٧)، د(٩٣/٨٤١ – ٣/٩٦)، ت(١٨٥/٣٠١ – ١/١٨٦).

[3] صحيح: لەباسی مەرجەکانی دروستی دەستنوێژ تێپەڕی.

نوێژەکەی بگێڕێتەوە[١] هەروا ئەم حوکمە بۆ نوێژی سوننەتیش وایە بەلای جەماوەری زانایانەوە، چونکە هەرشتێك نوێژی فەرز بەتاڵ بکاتەوە نوێژی سوننەتیش پوچ دەکاتەوە.

**٤- قسەکردنی بەئەنقەست کە بۆ بەرژەوەندی نوێژەکە نەبێ**

لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئێمە لەنوێژدا قسەمان دەکرد هیچ پەیوەندی بە نوێژەکەوە نەبوو، هەمان بوو کابرا لەگەڵ هاوەڵی تەنیشتی قسەی دەکرد، هەتا ئایەتی {وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ – البقرة/٢٣٨} ئیتر فەرمانمان پێ کرا بە بێدەنگیو نەهیمان لێ کرا لە قسەکردنێك کە پەیوەندی بەنوێژەوە نەبێ.[٢]

**٥- پێکەنین:**

(ابن المنذر) دەڵێ: کۆڕا هەیە لەسەرئەوە کە نوێژ بە پێکەنین پوچ دەبێتەوە.[٣]

**٦- تێپەڕبوونی ئافرەتی ڕەسیدە یان گوێ درێژ، یان سەگی ڕەش بە بەردەم نوێژکەردا ئەگەر نزیکی کەمتر لەشوێنی سوژدەبوو نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.... چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی:**
«إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَإِنَّهُ يَسْتُرُهُ إِذَا كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ فَإِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ فَإِنَّهُ يَقْطَعُ صَلاَتَهُ الْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ وَالْكَلْبُ الأَسْوَدُ ».

ئەگەر یەکێ لەئێوە ویستی نوێژبکا با شتێك بکا بە سوترەو پەردە لەبەردەمیا، جا ئەگەر شتێ بە ئەندازەی قوتکەی دواوەی کوپانە حوشتری

---

[١] الاجماع/٤٠.

[٢] متفق عليه: م(١/٣٨٣/٥٣٩)، ت(١/٢٥٢/٤٠٠٣)، د(٣/٢٢٧/٩٣٦)، خ(٣/٧٢/١٢٠٠)، ن(٣/١٨) وليس عند الأخيرين (ونهينا عن الكلام).

[٣] الأجماع/٤٠.

هەبوو ئـەوە دەبێتـە لەمپـەڕو محەججـەرە بـۆی. وەڵێ ئەگـەر بەربەسـتێکی وا لەبەردەم نوێژەکەتانا نەبوو، ئەوە لەم حاڵەدا ئەگەر گوێدرێژ، ئافرەت، سەگی رەش بەبەردەم نوێژەکەتاندا تێپەڕی نوێژەکەتان دەبرِن‌و پوچی دەکەنەوە.

## نوێژی سوننەت.
## گەورەیی‌و فەڕی ئەم جۆرە نوێژە

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَـلاَتُهُ فَـإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ فَإِنِ انْـتَقَصَ مِـنْ فَرِيـضَتِهِ شَيْءٌ قَالَ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ فَيُكَمَّلَ بِهَـا مَـا انْـتَقَصَ مِـنَ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ يَكُونُ سَائِرُ عَمَلِهِ عَلَى ذَلِكَ».[1]؛

لـەڕۆژی قیامەتـدا یەکـەم کردەوەیـێ: کـە بەنـدەی لەسـەر موحاسـەبە دەکرێ نوێژەکەیەتی، جا ئەگەر نوێژەکەی بەتـەواوی‌و رێـك‌و پێکی کردبـوو ئەوە سـەرفرازو رزگـاربووە. خۆ ئەگـەر نوێـژەکانی بەتـەواوی نـەکردو کـەم‌و کورِیـان تێـدابوو ئـەوە رەنـــج بەخەسـارو ماڵوێرانـە، جـا ئەگــەر لەنوێــژە فـەرزەکانی کـەم‌و کـوڕی هـەبوو پـەروەردگار دەفـەرموێ: بـڕوانن ئـاخۆ ئـەم بەندەیەم نوێژی سوننەتی هەیە؛ ئەگەر هەیبوو ئەوە کەم‌و کوڕی فەرزەکانی لە سوننەتەکان بۆ تەواو دەکرێ، پاشان باقی فەرزەکانی بـەو شـێوە تـەعامولی لەگەڵ دەکرێ. کردەوەکانی بەم پێیە لێ وەردەگیرێ.

---

[1] صحيح: (ص.ن/٤٥١، ٤٥٢) ، ت(١/٢٥٨/٤١١)، ن(١/٢٣٢).

## واباشه نوێژی سوننه‌ت له‌ماڵه‌وه بکرێ

له جابیره‌وه ڕیوایه‌تکراوه، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رموویه‌تی: «إِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ صَلاَتَهُ فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ مِنْهَا نَصِيبًا فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ فِي بَيْتِهِ مِنْ صَلاَتِهِ خَيْرًا»[1] ئه‌گه‌ر یه‌كێ له‌ئێوه نوێژی فه‌رزی له‌مزگه‌وتدا كرد با به‌شێك له‌نوێژه‌كانی بهێڵێته‌وه بۆ ماڵه‌وه‌ی چونكه په‌روه‌ردگار خێرو فه‌ڕو نوری داناوه بۆ ئه‌و نوێژه‌ی له‌ماڵه‌وه ده‌یكا.

هه‌روا له زه‌یدی كوڕی (ثابت)ه‌وه ڕیوایه‌تكراوه: كه پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رموویه‌تی: «عَلَيْكُمْ بِالصَّلاَةِ فِي بُيُوتِكُمْ فَإِنَّ خَيْرَ صَلاَةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ».[2] هه‌ندێ له‌نوێژه‌كانتان له‌ماڵه‌وه بكه‌ن، چونكه باشترین نوێژی مرۆڤ ئه‌و نوێژه‌یه له‌ماڵه‌وه بكرێ جگه له‌نوێژی فه‌رزه‌كان.

## جۆره‌كانی نوێژی سوننه‌ت

نوێژی سوننه‌ت (تطوع) دوو جۆرن: سوننه‌تی ره‌هاو بێ قه‌ید، سوننه‌تی كات‌و شوێن دیاریكراو (ألسنن الرواتب). واته: ئه‌و نوێژانه‌ی له‌به‌رودوای نوێژه فه‌رزه‌كانه‌وه ئه‌نجام ده‌درێن. پێیان ده‌گوترێ: (سنن مقیدة).

نوێژه سوننه‌ته موقه‌یه‌ده‌كان كه به (ألسنن الرواتب) ناسراون له‌پێش نوێژه فه‌رزه‌كان‌و له‌دوا نوێژه فه‌رزه‌كان به‌جێ ده‌هێندرێن. ئه‌مانه‌ش دوو به‌شن. هه‌یانه (مؤكد)و جه‌خت له‌سه‌ر كراوه‌ن، هه‌یانه جه‌ختیان له‌سه‌ر نه‌كراوه‌ته‌وه.

نوێژه جه‌خت له‌سه‌ركراوه‌كان دوانزه ركاتن.

---

[1] صحيح: (مختصر م/٣٧٥)، م(١/٢٣٩/٧٧٨).

[2] متفق عليه: خ(١٠/٥١٧/٦١١٣)، م(١/٥٣٩/٧٨١)، د(٤/٣٢١/١٤٣٤)، ن(٣/١٩٨).

له عەبدوڵڵای کوڕی شەقیقەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیارم لەخاتو عائیشە کرد دەربارەی چۆنیەتی نوێژکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ نوێژە سوننەتەکانی ئاخۆ چۆنی ئەنجام دەدان؟ لە وەڵامدا فەرمووی: لەماڵی من پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتی دەکردن، دوایی لەماڵ دەردەچوو پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، پاشان دەهاتەوە ماڵەوە دووڕکاتی تری بەجێ دێنان. تەشریفی دەچوو پێش نوێژی شێوانی بۆ خەڵکەکە دەکردو پاشان دەهاتەوە ماڵەوە دووڕکاتی نوێژ دەکرد. دەچوو نوێژی خەوتنانی بە خەڵکەکە دەکردو پاشان دەهاتەوە لە ماڵەوە دووڕکاتی دەکردن. ئەمجار بەشەو نۆڕکاتی دەکردن یەکیان تاك ڕکات بوو، وادەبوو شەو بەڕاوەستانەوە زۆری نوێژ دەکرد، وادەبوو شەو بەدانیشتنەوە زۆری نوێژ دەکرد، جا کەلەخوێندنی قورئانی ناو نوێژ دەبوەوە دەچووە روکوعو سوژدە واتە: لە حاڵەتی راوەستانەوە دەچووە حاڵەتی روکوعو سوژدە. خۆ ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی بکردایە دوای خوێندنی فاتیحەو قورئان دەچووە حاڵەتی روکوعو سوژدە.

ئەمجار کە فەجری دەدا دووڕکاتی سوننەتی فەجری دەکرد[1]. لە ئوممو حەبیبەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «مَنْ صَلَّى اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ بُنِيَ لَهُ بِهِنَّ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ»[2]: کەسێك لە شەوو ڕۆژێکدا دوانزە ڕکات نوێژی سوننەت بکا، خانوێکی لەبەهەشت دا بۆ دروست دەکرێ.

---

[1] م(١/٥٠٤/٧٣٠)، د(٤/١٣٢،١٣٣/١٢٣٨ـ، ت(٢٧٢/٤٣٤ و ١/٢٧٣)) مختصراً.

[2] م(٥٠٢/٧٢٨ و ١/٥٠٣)، د(٤/١٣٢/١٢٣٧)، ت(١/٢٥٩/٤١٣)، ن(٣/٢٦٢)، جة(١/٣٦١/١١٤١).

## سوننەتی جەخت لەسەر نەكراو (غير مؤكد)

دووركات پێش نوێژی عەصرو شێوانو خەوتنان.

لە (عەبدوڵڵای كوڕی موغەففەل)ەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ». لەنێوان هەردوو بانگێكدا نوێژێك هەیە. لەنێوان هەردوو بانگێكدا دوو نوێژ هەیە، پاشان لەجاری سێیەمدا فەرمووی: (لِمَنْ شَاءَ)[1] بۆ كەسێك بیەوێ نوێژی سوننەت بكا.

## سوننەتو باشە كە هەمیشە پێش نوێژی عەصر چوار ركات نوێژی سوننەت بكەی

لە ئیمامی عەلیەوە (خودای لێ رازی بێ) ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: هەمیشە پێغەمبەری خودا پێش عەصر چوار ركات نوێژی سوننەتی بەجێ دێنا، لەنێوانیاندا بە سڵاودانەوە لەسەر فریشتە نزیكەكانی بارەگای ئەقدەس ئەوانەی شوێن ئەوان كەوتوون لەخودا پەرستیدا لە موسوڵمانانو باوەڕداران.[2]

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «رَحِمَ اللَّهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا».[3] خودا رەحم بەو كەسە بكا: كە لەپێش نوێژی عەصردا چوار ركات نوێژی سوننەت بەجێ دێنێ.

---

(1) متفق عليه: خ(٦٢٧/١١٠/٢)، م(٨٣٨/٥٧٣/١)، د(١٢٦٩/١٦٢/٤)، ت(١٨٥/١٢٠/١)، ن(٢٨/٢)، جة(١١٦٣/٣٦٨/١).

(2) حسن: (ص.ت/٣٥٣)، ت(٤٣٧/٢٦٩/١).

(3) صحيح: (ص.ت/٣٧٨١) ، ت(٣٨٧٠/٣٢٦/٥).

**واباشه له‌نێوان نوێژی شێوان‌و خه‌وتنان‌دا نوێژی سوننه‌ت بكرێ**

له حوزه‌یفه‌وه ڕیوایه‌تكراوه، ده‌ڵێ: هاتمه خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) نوێژی شێوانم له‌خزمه‌تدا كرد، دوایی ئه‌و ته‌شریفی تا نوێژی خه‌وتنان هه‌ر نوێژی سوننه‌تی كردن.

له ئه‌نه‌سه‌وه ڕیوایه‌تكراوه، ده‌رباره‌ی ئایه‌تی «تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا». ده‌ڵێ: ئاماژه‌یه به‌و حاڵه‌ی موسوڵمانان كه‌وایان بار پێوه گرتبوو نێوان نوێژی شێوان‌و خه‌وتنان به‌ئاگابن‌و سه‌رگه‌رمی نوێژكردنی سوننه‌ت بن.[1]

**ئه‌و سوره‌تانه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا له‌برێ له‌م نوێژانه‌دا ده‌یخوێند**

له‌خاتو عائیشه‌وه ڕیوایه‌تكراوه، ده‌فه‌رموێ: پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) ده‌یفه‌رموو: {نِعْمَ السُّورَتَانِ يُقْرَأُ بِهِمَا فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ - (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)}.[2] چه‌ند پڕفه‌رو به‌نرخن دوو سوره‌ت بخوێندرێن له‌دوو ركاتی پێش نوێژی به‌یانی زوو. ئه‌و دوو سوره‌ته‌ش سوره‌تی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)و سوره‌تی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ )ن.

له ئه‌بو هوره‌یره ڕیوایه‌تكراوه: كه پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) عاده‌تی وابوو له‌دووڕكاتی سوننه‌تی فه‌جردا سوره‌تی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ )و سوره‌تی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی ده‌خوێند.[3]

له ئیبنو عه‌بباسه‌وه ڕیوایه‌تكراوه: كه پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) له‌دوو ركاتی سوننه‌تی فه‌جردا له‌ركاتی یه‌كه‌مدا ئایه‌تی {قُولُواْ آمَنَّا بِاللّـهِ

---

[1] صحيح: (ص.د/١١٧٣) ، د(٤/٢٠٣/١٣٠٧).

[2] صحيح: (ص.جة/ ٩٤٤) ، خز(٢/١٦٣/١١١٤)، حم(٤/٢٢٥/٩٨٧)، جة(١/٣٦٣/١١٥٠).

[3] صحيح: (مختصر م/٣٦٠)، م(١/٥٠٢/٧٢٦)، د(٤/١٣٥/١٢٤٣)، ن(٢/١٥٦) جة(١/٣٦٣/١١٤٨).

وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَـا} ئـەوەی لـە سـورەتی (البقـرة)دايـەو لـەرکاتی دووەمـدا ئايـەتی {آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ}ی دەخوێند.[1]

لـە ئیبنـو مەسـعوودەوە گێڕدراوەتـەوە، گوتویـەتی: (نـازمێردرێن ئـەو هـەموو جـارەی گـوێم لـە پێغەمبـەر بـووە (دروودی خـودای لەسـەر بـێ): کـە لەدوو رکاتی دوا نوێژی شێوانو دوو رکاتی پێش نوێژی بەیانی سورەتی (قُـلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ )و (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی دەخوێند.[2]

## نوێژی ویتر (نوێژی یەك ركات)
## حوکمی نوێژی ویترو فەضڵو گەورەیی

نوێـژی ویـتر سـوننەتێکی موئەکـەدو جـەخت لەسـەرکراوە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هـانی موسـوڵمانانی داوە بـۆ بـەجێهێنانیو پارێزگاری کردن لەسەری.

لـە ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ »: خـودا تاقـەو تـاقی خـۆش لێ دێ.[3]

لە ئیمامی عەلیەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: نوێـژی ویـتر واجب نیـە، وەکوو نوێژە فـەرزەکانتان نیـە، وەلێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نوێژی ویتری بەجێ هێناوە، پاشان فەرمووی: « يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ أَوْتِرُوا فَـإِنَّ اللَّـهَ

[1] صحيح: (ص.ن/٩٠٥) ، م(١/٥٠٢/٧٣٧)، ن(٢/١٥٥)، د(٤/١٣٧/١٢٤٦).

[2] حسن صحيح: (ص.ت/٣٥٥) ، ت(١/٢٧٠/٤٢٩).

[3] متفق عليه: خ(١١/٢١٤/٦٤١٠)، م(٤/٢٠٦٢/٢٦٧٧).

وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ».[١] ئەی ئەهلی قورئان، نوێژی ویتر بەجێ بێنن، بێگومان خودا بۆ خۆی تاكو تەنهایە، تاكی خۆش دەوێ.

## كاتی نوێژی ویتر

نوێژی ویتر لەدوا نوێژی خەوتنانەوە دروستە تا كۆتایی شەوو دەركەوتنی فەجری راست. ئەنجامدانی لەسێیەكی كۆتایی شەودا خێری زۆرە. لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتكراوە، فەرمووی: (پێغەمبەری خودا لەهەموو كاتێكی شەودا نوێژی ویتری كردوە، لەسەرەتای شەودا، لەناوەڕاستیدا، لەكۆتایدا، كاتی ئەنجامدانی نوێژی ویتری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كاتێكی بەرفراوان بوو بە كۆتایی هاتنی شەو كۆتایی هاتووە.[٢]

واباشە پەلەكردن لە بەجێهێنانی نوێژی ویتردا بكرێو لەسەرەتای شەودا ئەنجام بدرێ بۆ كەسێك ترسی ئەوەی هەبوو كۆتایی شەو بەئاگانایە، لەهەمان كاتدا واباشە بۆ كەسێك گومانی هەبوو كە لەكۆتایی شەودا بەئاگادێ. نوێژی ویترەكەی دوابخا بۆ ئەوكاتە.

لە ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەبوبەكری فەرموو: (متى توتر؟): كەی نوێژی ویتر بەجێ دێنی. حەزرەتی ئەبوبەكر فەرمووی: پێش ئەوەی بنوم. بە حەزرەتی عومەریشی فەرموو: (متى توتر؟) كەی نوێژی ویتر دەكەی؟ فەرمووی: دەخەوم دوایی هەڵدەستم نوێژی ویتر دەكەم. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە

---

[١] صحيح: (ص.جة/٩٥٩) ، جة(١١٦٩/٣٧٠/١)، ت(٤٥٢/٢٨٢/١)، ن(٢٢٨ و ٣/٢٢٩) في حديثين، د(١٤٠٣/٢٩١/٤).

[٢] متفق عليه: (٧٤٥/٥١٢/١) وهذا لفظه. خ(٩٩٦/٤٨٦/٢) مختصراً، ن(٣/٢٣٠).

حەزرەتی ئەبوبەكری فەرموو: «أَخَذْتَ بِالْحَزْمِ أَوْ بِالْوَثِيقَةِ». بە حەزرەتی عومەریشی فەرموو: «أَخَذْتَ بِالْقُوَّةِ ».[١]

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتكراوە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەو نوێژی دەكردو منیش لەسەر جێگاخەوی ئەو پاڵ كەوتبووم، جا كەدەیەویست نوێژی ویتر بەجێ بێنێ، بەخەبەری دەكردمەوە منیش نوێژی ویترم دەكرد.[٢]

## ژمارەی ركاتی نوێژی ویترو شێوازو صیفەتی

كەمترین نوێژی ویتر ركاتێكە، لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى ، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً ، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى».[٣] شەو نوێژی سوننەت دوو ركات دوو ركاتە، ئەگەر یەكێ لەئێوە ترسی ئەوەی هەبوو نوێژە ویترەكەی بكەوێتە بەر كاتی بەیانی، با یەك ركات بكا.

دروستە نوێژی ویتر بەسێ ركات بكا، یان پێنج ركات، یان حەوت ركات، یان نۆ ركات: لەخاتو عائیشەوە گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: (هەرگیز پێغەمبەری خودا لە ڕەمەزان‌و غەیری ڕەمەزاندا زیاد لە یانزە ركات نوێژی سوننەتی بەجێ نەهێناوە، چوار ركاتی دەكردن مەپرسە چەند بەجوانی‌و بەدرێژی ئەنجامی دەدان، پاشان چوار ركاتی تری دەكردن. پرسیار لەجوانی‌و ڕێك‌و پێكیان مەكە، ئەمجار سێ ركاتی بەجێ دێنان.[٤]

---

[١] حسن صحيح: (ص.جة/٩٨٨) ، خز(١٠٨٤/١٤٥/٢)، د(١٤٢١/٣١١/٤) ج(١٢٠٢/٣٧٩/١).

[٢] متفق عليه: خ(٩٩٧/٤٨٧/٢)، م(٧٤٤/٥١١/١).

[٣] متفق عليه: خ(٩٩٠/٤٧٧/٢)، م(٧٤٩/٥١٦/١)، ن(٢٢٧/٣)، ت(٤٣٥/٢٧٣/١).

[٤] متفق عليه: خ(١١٤٧/٣٣/٣)، م(٧٣٨/٥٠٩/١)، د(١٣٢٧/٢١٨/٤)، ت(٤٣٧/٢٧٤/١).

هەر لەخاتو عائیشەوە هاتووە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشرەودا سیانزە رکاتی شەو نوێژ دەکرد، نوێژە ویترەکەی دوایی دەکردە پێنج رکات لەهیچ رکاتی ویتردا دانەدەنیشت مەگەر لەرکاتی کۆتاییدا.[1]

هەر لەخاتو عائیشەوە هاتووە فەرموویەتی: ئێمەی خێزانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەوانە سیواكو ئاوی دەستنوێژمان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادە دەکرد، ئیتر پەروەردگار بەخەبەری دەهێناین بەشەو وەندەی حەزی لێ بوو بەخەبەری بێنێ، جا تەشریفی سیواکی دەکردو دەستنوێژی دەگرت، نۆ رکات شەونوێژی دەکرد لەدوا رکاتی هەشتەم نەبوبایە دانەدەنیشت، زیکرو حەمدی خودای دەکردو لێی دەپاڕایەوە، پاشان هەڵدەستایەوەو سەلامی نەدەدایەوە پاشان بە پێوە رکاتی نۆیەمیشی بەجێ دێنا، پاشان بۆ تەحیات خوێندن زیکرو حەمدو سەنای خودای تێدا دەکردو پاڕانەوەو دوعای تێدا دەخوێندن، ئەمجار سەلامی دەدایەوە بەجۆرێك ئێمە گوێمان لە سڵاودانەوەکەی بوایە. پاشان دوا سڵاودانەوە دووركات نوێژی بەدانیشتنەوە بەجێ دێنا. بەوە، شەونوێژەکەی دەبوە یانزە رکات ئەی کوڕەکەم. پاشان کە پێغەمبەر کەوتە ساڵەوەو پیربوو نوێژی ویتری بە حەوت رکات بەجێ دێناو دوو رکاتەکەی دوا ویتریشی وەکوو پێشوو بەجێ دەهێنان ئەوە دەق دەیکردە نۆ رکات، ئەی کوڕەکەم.[2]

ئەگەر هەرسێ رکاتی نوێژی ویترت کرد لەناویاندا ئەو سورەتانە بخوێنی کە لەم حەدیثەی دواییدا ئاماژەیان پێ کراوە.

---

[1] صحيح: (مختصر م/٣٨٢)، م(١/٥٠٨/٧٣٧)، د(٤/٢١٦/١٣٢٤)، ت(١/٢٨٥/٤٥٧).

[2] صحيح: (ص.ن/١٥١٠) ، م(١/٥١٢/٧٤٦)، د(٤/٢١٩/١٣٢٨)، ن(٣/١٩٩).

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی ویتردا {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى} و {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ} و {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}ی دەخوێندن. واتە: لەهەر ڕکاتێکی ویتردا، یەکێ لەم سورەتانەی دەخوێند.[1]

## خوێندنی قنوت لەنوێژی ویتردا

لە حەسەنی کوڕی عەلییەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) چەند وشەیەکی فێرکردم، لەنوێژی ویتردا دەیانخوێنم «اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ إِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ وَلاَ يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ».[2]

سونەت وایە لەم قنوتەدا پێش چوونە ڕوکوع بکەوێ، ئەمەش بەپێی حەدیثی ئوبەی کوڕی کەعب، کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی ویتردا قنوتی پێش چوونە ڕوکوع خوێند.[3]

قنوت خوێندن لەنوێژی فەرزدا ڕێ پێدراو نیەو نامەشروعە. مەگەر لەکاتی بەڵاو کارەساتدا، پەیدابوونی ترس‌و بیم لە ڕوداوی ناخۆش. ئالەم حاڵانەدا قنوت خوێندن تایبەت نیە بەنوێژێك‌و بەنوێژێکی ترەوەنا، ئەم جۆرە قنوتە واباشە بخرێتە دوای چوونە ڕوکوع.

---

[1] صحيح: (ص.ن/١٦٠٧) ، ت(١/٢٢٨/٤٦١)، ن(٣/٢٣٦).

[2] صحيح: (ص.ن/١٦٤٧) ، د(٤/٣٠٠/١٤١٢)، ت(١/٢٨٩/٤٦٣)، جة(١/٣٧٢/١١٧٨).

[3] صحيح: (ص.د/١٢٦٦) ، د(٤/٣٥٨/١٤١٤).

لـه ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) عادەتی وابوو کە دەیەویست دوعا لەیەکێ بکا یان دوعـای بـۆ بکا دوای روکوع قنوتی دەخوێند.

بەڵام قنوت خوێندنی نوێژی فەجر بەهەمیشەیی ئەوە بیدعەیە، وەکوو هاوەڵانی پێغەمبەر دانیان پێداناوە. لەئەبو مـالیکی (الأشجعی – کە سەعدی کـوڕی طـاریقـە) ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: بـە بـاوکمم گـوت: ئـەی بـاوکی خۆشەویـستم؛ ئـەتو لـەدوا پێغەمبـەرەوە، لـەدوا ئەبوبـەکرو عومـەرو عوسمانەوە، لەدوا ئیمامی عەلیـەوە لـەم شوێنە لەکوفە نزیکەی پێـنج ساڵ نوێژت کردوە. ئایا لەنوێـژی بـەیانیدا قنوتیـان دەخوێنـد؟ لە وەڵامـدا وتـی: ئەی کوڕی خۆشەویستم هەموو ئەو قنوت خوێندنانـە بیدعـەو داهێنـراون چ بنەمایەکی شەرعی نیە.[1]

خۆ مەحاڵەو عـەقڵ قبـوڵی ناکا پێغەمبـەری خـودا، لەهـەموو نوێـژێکی بەیانیدا دوای هەڵسانەوەی لە روکوع بڵـێ: «اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَـدَيْتَ وَعَـافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ وَقِنِي شَرَّ مَا قَـضَيْتَ إِنَّـكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ وَلاَ يَعِزُّ مَنْ عَادَيْـتَ تَبَارَكْـتَ رَبَّنَـا وَتَعَالَيْتَ». بەخوێندنی ئـەم دوعایـە دەنـگ بەرزبکاتـەوەو هـاوەڵان لەدوایـەوە (ئـامین) بکـەنو بـەم شێوە بـەردەوام بـێ تـا لـەدونیا دەردەچـێ، پاشان ئـەم واقیعو حاڵە لای ئوممەت دیار نەبێو زوربـەی ئوممـەتو زۆرینـەی هـاوەڵانی باسی نەکەنو پەیڕەوی نەکەن، بەڵکوو هـەموویان لـەیادیان بچێو کـاری پـێ نەکەن، تەنانەت هاوەڵی وا هەبێ بڵێ: ئەوە (موحدەث)و تازە هەڵاّیە، وەکوو بینیمان (طارق الأشجعی) بەڕاشکاوانە وای گوت!![2]

---

[1] صحيح: (الإرواء/٤٣٥)، حم(٣/٤٧٢ و ٦/٣٩٤)، جة(١/٣٩٣/١٢٤١).

[2] زاد المعاد: (١/٢٧١).

## شەونوێژ (قيام الليل)

شــەونوێژ ســوننەتێکی گەورەیــە، یەکێکــە لــە گــرنگترین دیــاردەو تایبەتمەندییەکانی تەقواکاران، وەکوو قورئان ئاماژەی پێکـردوەو دەفـەرموێ: {إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ، آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ، كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ، وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ، وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ – الذاريات/١٥-١٩} بێگومان تـەقواکاران لـەناو بـاخ‌و سەرچاوەی سازگاری بەهەشـتدا رادەبـوێرن، پاداشـی لـەبن نـەهاتووی خـودای خۆیان وەردەگرن، ئەوان لەوەپێش لەژیانی دونیایاندا چاکەکارو لەخودا ترس بـوون، لەشـەودا کـەمێك دەنوسـتن لەبەشی زۆریدا خـەریکی خـودا پـەرستی بـوون. لەبەرەبەیانـداو لـەکاتی روناکبوونـەوەی ئاسـودا لـەخودا دەپاڕانـەوەو داوای لێخۆشبوونیان لێ دەکرد.

له ئەبو مالیکی (الأشعری)یـەوە ڕیوایـەتکراوە، ئـەویش لـە پێغەمبـەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویـەتی: «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَغُرَفاً يُرَى بُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا وَظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا أعد اللّٰهِ تعالى لِمَنْ أَطَابَ الْكَلَامَ وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ وَصَلَّى لِلّٰهِ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ»[1]: بێگومـان لـە بەهەشـتدا ژورو غورفـەی وای تێدایـە لـەناوەرا دەرەوەیـان دیـارەو لـەدەرەوەڕا ناوەوەیـان دەبینـدرێ، پـەروەردگار ئامادەی کردوون بۆ کەسانێك خواردنیان دابێ بە برسـی‌و لێقـەوماوان، قـسەو گفتوگۆیان لەگەڵ خەڵکدا نەرم‌و نیان بووبێ، زۆر بـەڕۆژو بـووبن‌و بـەردەوام بووبن بەشەو نوێژیان کردبێ لەکاتێکدا خەڵك نوستبن.

---

[1] حسن (ص.ج/٢١٢٣).

## شەونوێژ لە ڕەمەزاندا زیاتر جەختی لەسەر کراوەتەوە

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەڵکی هەڵدەنا بۆ شەونوێژو خوداپەرستی لەشەوانی ڕەمەزاندا بەبێ ئەوەی فەرمان بکا بەوەی کەواجبەو عەزیمەتە. دەیفەرموو: «مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».[١] کەسێك بەبڕوای تەواو هیوای پاداشەوە لە ڕەمەزاندا شەونوێژ بکا پەروەردگار لەتاوانی رابوردووی خۆش دەبێ.

## ژمارەی ڕکاتەکانی شەونوێژ

کەمترین نوێژی شەونوێژ ڕکاتێکە، زۆریەکەیشی یانزە ڕکاتە. ئەمەیش بەپێی ئەو فەرموودەیەی خاتو عائیشە ریوایەتی کردووە لەوەپێش ئاماژەمان پی کرد. کە دەفەرموێ: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەرگیز لەیانزە ڕکات نوێژ زیاتری نەکردووە، نە لەڕەمەزانو نە لەغەیری ڕەمەزاندا).[٢]

## ڕەوایی ئەنجامدانی شەونوێژی ڕەمەزان بەجەماعەت

لەخاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەوێك نوێژی تەراوێحی لەمزگەوتدا بە جەماعەت بۆ موسوڵمانان کرد پاشان شەوی دووەم خەڵك زۆر کۆبوونەوە، ئەمجار شەوی سێیەم یان چوارەم سەرلەنوێ لەمزگەوت گردبوونەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهات پێشنوێژییان بۆ بکا، کە ڕۆژبۆوە فەرمووی: «قَدْ رَأَيْتُ الَّذِي صَنَعْتُمْ وَلَمْ يَمْنَعْنِي مِنَ الْخُرُوجِ إِلَيْكُمْ إِلاَّ أَنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ

---

[١] متفق عليه: م (٧٥٩ – ١٧٤ – ١/٥٢٣)، خ (٢٠٠٩/٢٥٠/٤)، د (٤/٢٤٥/١٣٥٨).

[٢] متفق عليه: (لەوەپێش ئاماژەی پێ کرا).

عَلَيْكُمْ». بێگومان من ئاگام له کۆبوونهوهو چاوهڕوانیتان بوو هیچ شتێکیش نهبوو بێته لهمپهڕ لهوهی بێم بۆناوتان، وهڵێ ترسام لهسهرتان فهرزبكرێ.) ئهمه لهمانگی رهمهزان بوو.[1]

له عهبدوڕهحمانی کوڕی عهبدی (القاري) ڕیوایهتكراوه، دهڵێ: لهخزمهت عومهری کوڕی خهتابدا شهوێكی رهمهزان چووم بۆ مزگهوت، بینیم خهڵكهكه كۆمهڵ كۆمهڵ بوون ههركهسه بۆ خۆی نوێژی دهكرد ههبوو بهتهنیاو ههشبوو نوێژی دهكردو كۆمهڵێك لهگهڵیدا نوێژیان دهكرد، عومهر فهرمووی: من پێم وایه ئهم نوێژكهرانه لهدوا قورئان خوێنێكهوه كۆبكهینهوهو بهیهك كۆمهڵ نوێژبكهن باشتره، لهپاشان بڕیاری دا ههموویان لهدوای ئوبهی كوڕی كهعبهوه نوێژ بكهن. پاشان شهوێ لهخزمهتیا چوومهوه مزگهوت دیتمان خهڵكهكه لهدوا یهك پێش نوێژهوه نوێژدهكهن، عومهر فهرمووی: بهڕاستی ئهمه – كۆكردنهوهی ئهو خهڵكهیه لهدوا یهك ئیمامهوه – بیدعهیهكی باشه، ئهو بهشهی تێیدا دهخهون خێری زۆرتره لهو بهشهی نوێژی تێدا دهكهن. مهبهستی كۆتایی شهوبوو، واته: ئهنجامدانی نوێژی شهونوێژ لهكۆتایی شهودا باشتره، ئهوكاته خهڵكهكه لهسهرهتای شهودا نوێژیان دهكرد.[2]

## واباشه لهغهیری رهمهزانیشا پیاو ماڵو منداڵی بهشهو بهخهبهر بێنێ بۆ شهونوێژ

لهئهبو سهعیدهوه ڕیوایهتكراوه، دهڵێ: پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) فهرمووی: «إِذَا أَيْقَظَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّيَا أَوْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ

---

[1] متفق عليه: م(٧٦١/٥٢٤/١)، خ(١١٢٩/١٠/٣)، د(١٣٦٠/٢٤٧/٤).

[2] صحيح: (مختصر خ/٩٨٦)، ط(٢٤٧/٨٥)، خ(٢٠١٠/٢٥٠/٤).

جَمِيعًا كُتِبَا فِي الذَّاكِرِينَ وَالذَّاكِرَاتِ».[1] ئەگەر پیاو بەشەو خێزانی خۆی بەخەبەر هێناو دەستنوێژیان گرتو شەونوێژیان کرد – یان بەیەکەوە دوورکات نوێژیان کرد – ئەوە ناویان لەڕیزی ئەوانە دەنووسرێ کەزۆر زیکرو یادی خودا دەکەن.

## گێڕانەوەی نوێژی شەونوێژ (ئەگەر فەوتابوو)

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: (پێغەمبەری خودا ئەگەر شەونوێژی بفەوتایە بەهۆی ئازارێك یان بیانوێکی تر، بەڕۆژ دوانزە رکاتی دەکردنەوە). [2]

لە عومەری کوڕی خەتابەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ مِنَ اللَّيْلِ أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الظُّهْرِ كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ».[3]: کەسێك لەو ئەندازە قورئانەی باری پێوە گرتبوو بەشەو دەیخوێند، بۆی نەخوێندراو خەوی لێ کەوت یان شتێك لەو بەشەی مایەوەو بۆی نەخوێندرابوو، ویستی لەنێوان نوێژی بەیانیو نوێژی نیوەڕۆ بیخوێنێو خوێندی، ئەوە دەق وەکوو ئەوە وایە بەشەو خوێندبیەتیو ئەو پاداشەی بۆ دەنووسرێ.

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٠٩٨) ، د(١٢٩٥/١٩٤/٤)، جة(١٣٣٥/٤٢٣/١).

[2] صحيح: (ص.ج/٤٧٥٦) ، م(٧٤٦ – ١٤٠/٥١٥/١).

[3] صحيح: (ص.جـه/١١٠٤) ، م(٧٤٧/٥١٥/١)، ت(٥٧٨/٤٧/٢)، د(١٢٩٩/١٩٧/٤)، ن(٢٥٩/٣)، جه(١٣٤٣/٤٢٦/١).

### کەسێك بەوە ڕاهات شەونوێژ بکاو دوایی وازی لێ بهێنێ کارێکی خراپە

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی (العاص)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ئەی عەبدوڵڵا! وەکوو فلانکەس مەبە، لەوەپێش بەوە ڕاهاتبوو شەونوێژ بکا، کەچی دوایی وازی لێ هێنا.[1]

### نوێژی چێشتەنگاو (نوێژی تۆبەکاران)

### ڕەوایی نوێژی چێشتەنگاو

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خۆشەویستم بەسێ شت ئامۆژگاری کردم: بەوەی لەهەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوبم، دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو بەجێ بێنم، هەموو شەوێك پێش خەوتن نوێژی ویتر بەجێ بێنم.[2]

### گەورەیی نوێژی چێشتەنگاو

لە ئەبو زەڕڕەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنَ الضُّحَى».[3] ڕۆژ دەبێتەوەو لەسەر هەموو جموزگەیەکی یەکێك لەئێوە خێرو صەدەقە هەیە هەموو (سبحان الله) گوتنێك صەدەقەیە، هەموو (الحمد لله) گوتنێك صەدەقەیە، وتنی: (لا اله الا الله)، (الله أكبر) کردن صەدەقەیە، فەرمان بەچاکە

---

[1] متفق عليه: خ(١١٥٢/٣٧/٣)، م(١١٥٩ — ١٨٥/٨١٤/٢).

[2] صحيح: (مختصر م/٣٦٧)، م(٧٢١/٤٩٩/١)، د(١٤١٩/٣١٠/٤).

[3] صحيح: (مختصر م/٣٦٤)، م(٧٢٠/٤٩٩/١)، د(١٢٧١/١٦٤/٤).

صەدەقەیە، نەهی کردن لەخراپە صەدەقەیە. لەجیاتی ئەو زیکرو پەرستشانە مرۆڤ دەتوانێ دوورکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو بکا.

## ژمارەی رکاتی سوننەتی چێشتەنگاو

کەمترین رکاتی ئەو نوێژە دوو رکاتە، ئەمەش بەگوێرەی ئەو حەدیثانەی لەوەپێش ئاماژمیان پێ کرا. زۆرترین رکاتیشی هەشتە.

لە (ئوممو هانیء)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆژی رزگارکردنی مەککە لەماڵەوە غوسڵی کردو هەشت رکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کرد.[1]

## باشترین کات بۆ بەجێهێنانی نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو

لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕیوایەتکراوە: گوتویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە لای ئەهلی قوباء، لەوکاتەدا خەڵکەکە نوێژی سوننەتی چێشتەنگاویان دەکرد، فەرمووی: « صَلاَةُ الأَوَّابِينَ إِذَا رَمِضَتِ الْفِصَالُ مِنَ الضُّحَى»: کاتی باشو پەسەند بۆ ئەنجامدانی نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو (نوێژی فەرمانبەرداران و تۆبەکاران) ئەو دەمەیە خۆر گەرمی بەهێز دەبێ و قاچی بێچوە حوشتر بەگەرمبوونی لمب تینی پێ دەگا.[2]

---

[1] متفـــق عليـــه: خ(٣/٥١/١١٧٦)، م(٧١/٣٣٦ – ١/٢٢٦)، د(٤/١٧٠/١٢٧٧)، ت(٤٧٢/١/٢٩٥)، ن(١/١٢٦).

[2] صحيح: (مختصر م/٧٤٨/٣٦٨ – ١/٥١٦/١٤٤).

## سوننەتی دوا دەستنوێژ شتن (سنة الوضوء)

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی نوێژی بەیانیدا بە بیلالی فەرمووە: « يَا بِلاَلُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإِسْلاَمِ ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ».!

ئەی بیلال پێم بڵێ: بەباشترین کردەوەیەك لەچوار چێوەی ئیسلامدا ئەنجامت دابێ، چونکە من تەپە تەپی نەعلەکانتم بیست لەپێش خۆمەوە لە بەهەشت.؟! لە وەڵامدا بیلال وتی: لەڕاستیدا من کردەوەیەکم ئەنجام نەداوە زیاتر جێگای هومێدبێ لەناو کردەوەکانمدا، ئەوەندە هەیە من هیچ کاتێ نەبووە دەستنوێژم گرتبێ بەشەو بووبێ یان بەڕۆژ بووبێ، ئیللا بەو دەستنوێژە ئەوەندێکی توانیبێتم نوێژی سوننەتی دوا دەستنوێژ گرتنم بەجێ هێناوە.[1]

## نوێژی ئیستیخارە

سوننەتە بۆ کەسێك کارێکی گرنگی دێتە پێش کە داوا لە پەروەردگار بکا چی چاكو باشە ئەوەی بێنێتەڕێو دڵی بخاتە سەر ئەو لایەنەی خێری ئەوی تێدایە. وەکوو لە حەدیث دا هاتووەو لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا فێری نوێژی ئیستیخارەی دەکردین وەکوو چۆن سوڕەتێکی لە قورئان فێر دەکردینو فەرمووی: « إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ لِيَقُلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي - أَوْ قَالَ عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ - فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي - أَوْ قَالَ فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ

---

[1] لەوەپێش لەباسی ئەو شتانەدا کە دەستنوێژی بۆ دەشۆردرێ باس کرا.

- فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ ، وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي - قَالَ - وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ».[1]

خودایه من لێت دەپاڕێمەوەو داواکارم بە زانیاریو دەسەڵاتی خۆت ڕێگای خێرم نیشان بدەی، داوای هێزو توانات لێ دەکەم بە دەسەڵاتی خۆت یارمەتیم بدەی، داواکارم لە فەضلو شکۆمەندی هەرە بەرزو گەورەییت، ئەتۆ خاوەن دەسەڵاتیو من بێ توانا، تۆ زاناو عالم بەهەموو شتێك من نەزانو هیچ نەبین، ئەتۆ زاناو ئاگادار بەسەر هەموو غەیبیاتو نهێنییەکاندا. خودایە تۆ دەزانی کام ڕێگایە خێری بۆ من تێدایە بۆ دینو دونیاو قیامەتم - یان بۆ ئیشی ئێستاو داهاتووم - جا کەوابێ ئەو ڕێگایەی خێری بۆمن تێدایە ئەوەم نیشان بدەو بمخەرە سەر ئەو ڕێگایە. دەشزانی کام ڕێگایە شەرو خراپە بۆمن، جا ئەو ڕێگایەی شەڕو خراپە بۆ دینو دونیاو قیامەتم - یان بۆ ئیشی ئێستاو داهاتووم - ئەوە ئەو شەڕو نەگبەتیەم لێ لادەو منیش لەو ڕێگایە دوور خەرەوە. لەهەر شوێنێك خێر هەیە بۆم دەستەبەر بکەو دڵم پێی ڕازی بکە، ئەمجار ناوی کارەکەی دێنێ.

## نوێژی خۆرگیران

ئەگەر مانگ گیرا یان خۆرگیرا سوننەتە جاڕبدرێو بگوترێ (الصلاة جامعة).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆرگیرا، بەناو خەڵکدا جاڕدرا بەم

---

[1] صحيح: (ص.جه/١١٣٦) ، خ(٦٣٨٢/١٨٣/١١)، د(١٥٢٤/٣٩٦/٤)، ت(٤٧٨/٢٩٨/١)، جه(١٣٨٣/٤٤٠/١)، ن(٦/٨٠).

شێوەیە: (إنَّ الـصَّلاة جامعـة)[1]. جا کەخـەڵك بـەدەم بانگەوازەکـەوە هـاتنو لەمزگەوت کۆبوونەوە ئیمـام دوو رکات پێشنوێژییان بۆدەکا. بـەم شـێوەیەی لەم حەدیثەی دواییدا هاتووە.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویـەتی: لەسـەردەمی پێغەمبـەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆرگیرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چـوو بـۆ مزگـەوتو خەڵکەکـەی لـەدوا خۆیـەوە ریزکـرد (الله أکـبر)ی نوێـژ دابەستنی فەرموو. ئەمجار بەدورودرێژی قورئانی خوێنـد، پاشـان (الله أکبر)ی کردو چووە روکوعو زۆر لە روکوعدا مایەوە، پاشان هەڵسایەوەو وتـی: «سَـمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». ئەمجار وەستاو نەچووە سوژدە، دەستی کردەوە بە خوێندنی قورئان بەشێوەیەکی درێژ بەڵام لە قورئانخوێندنی رکاتی یەکەم کورتتر بـوو، ئەمجار (الله أکبر)ی کردو چووە روکوعو زۆرمایەوە، بـەڵام لـە روکـوعی رکـاتی یەکـەم کورتربـوو، ئـەمجار سـەری بـەرزکردەوەو فـەرمووی: «سَـمِعَ اللَّـهُ لِمَـنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ» پاشـان چـووە سـوژدە، پاشـان لـەرکاتی کۆتاییـدا وەکـوو رکاتی یەکەم رەفتاری کرد، چوار رکات نوێژی بەچوار سوژدە ئەنجامداو پێش ئەوەی لەمزگەوت بگەڕێتەوە خۆر دەرکەوتەوە[2]

## وتارخوێندنەوە دوای نوێژی خۆرگیران

سـوننەتە پـێش نوێـژ خـوێن کـە سـلاوی دایـەوە هەڵـسێ وتارێـك بـۆ خەڵکەکە بخوێنێتەوە، تێیدا ئامۆژگاری خەڵکەکە بکاو هەڵیان نێ بـۆ کـرداروگوفتاری باشو بەئاگایان بێنێتەوە.

---

[1] متفق علیە: خ(١٠٤٥/٢/٥٣٣)، م(٩١٠/٦٢٧/٢)، ن(٣/١٣٦).

[2] متفق علیە: خ(١٠٤٦/٢/٥٣٣)، م(٩٠١-٣/٦١٩/٢)، د(١١٦٨/٤٦/٤)، جة(١٣٨٣/٤٤٠/١)، ن(٦/٨٠).

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژی خۆرگیران نوێژی خۆرگیرانی ئەنجامدا، ئەمجار خاتو عائیشە باسی شێوەی نوێژکردنەکەی پێغەمبەری کرد، فەرمووی پاشان سڵاوی دایەوە لەوکاتەدا خۆر دەرکەوتبوەوە. وتاری بۆ خەڵکەکەداو فەرمووی: خۆرگیران و مانگگیران دوو نیشانەن لەنیشانەکانی پەروەردگار، ئەم دوو مەخلوقە نە بەهۆی مردنی کەسێك یان ژیانی ناگیرێن و، هەرکاتێ دیتان مانگگیرا یان خۆرگیرا پەنابەرنە بەر نوێژکردن[1]

لەخاتو ئەسمائەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی خۆرگیراندا فەرمانی کرد بەکۆیلە ئازادکردن.[2]

لە ئەبو موساوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا خۆرگیرا، پێغەمبەری خودا ڕابوو، ترسا کە ئەوە سەرەتای ڕابوونی قیامەت بێ، هات بۆ مزگەوت و بەدرێژترین شێوە وەستان و ڕوکوع و سوژدەبردن نوێژەکەی ئەنجامدا، من لەوەپێش وام نەدیبوو بەو شێوە نوێژی ئاوا بەجێ بێنێ، ئەمجار فەرمووی: «هَذِهِ الآيَاتُ الَّتِي يُرْسِلُ اللَّهُ لاَ تَكُونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ ، وَلَكِنْ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهِ عِبَادَهُ ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ» ئەم ڕوداوانە نیشانەی گەورەیی خودان و دەیان هێنێتە دی، هۆکاری هاتنە دییەکەیان مردنی کەسێك یان ژیانی نیە، بەڵکوو دیاردەو ڕوداوێکن پەروەردگار بەندەکانی خۆی پێ دەترسێنێ، جا کەئێوە ڕوداوی ئاواتان دیتن پەنا بەرنە بەر یادو زیکری پەروەردگارو دەست بکەن بەدوعاو پاڕانەوە لێی.

---

[1] متفق عليه، خ(١٠٤٦/٢/٥٣٣)، م(٩٠١ – ٢/٦١٩/٣)، د(١١٦٨/٤/٤٦)، ن(٣/١٣٠).

[2] صحيح: (مختصر خ/١٨)، خ(١٠٤٥/٥٤٣/٢).

ظـاهیری فەرمودەکـەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـە دەفەرموێ: {فافزعوا.........} وجوب دەگەیـەنێ، کەوابوو نوێـژی خۆرگیران دەچـێتە چوارچـێوەی فـەرزی کیفایـەوە، ئـەبو عوانـە لـە صـەحیحەکەیدا (ج٢/٣٩٨) ئاماژەی بەوە کردووەو نوسـیویەتی: (باب وجوب صـلاة الكـسوف) پاشـان بـڕێ فـەرموودەی صـەحیح‌و راسـتی دەربـارەی فـەرمانکردن بـە ئەنجامدانی نوێژی خۆرگیران رانوانـدون. ئیبنـو خوزەیمـەش هـەمان رەفتاری ئەبو عەوانەی رەچاو کردوەو لە (صەحیحە)کەیدا (ج٢/٣٨) وتوویـەتی (بـاب الأمر بالصلاة عند كسوف الشمس والقمر) پاشان هەنـدێ فـەرموودەی هێنـاون دەربارەی فەرمانکردن بە ئەنجامدانی نوێژی خۆرگیران.

ئیبنـو حەجـەری عەسـقەلانی لـە (فـەتحولباریدا ج٢/٥٢٧) دەفـەرموێ: جـەماوەری فوقـەها پێیـان وایـە نوێـژی خـۆرگیران سـوننەتێکی جـەخت لەسەرکراوەیە ئەبو عەوانە لە صەحیحەکەیدا دانی ناوە بەوەدا کە ئەو نوێژە واجبە، وەڵێ من کەسی ترم نەدیوە ئەو رایەیان هەبێ. جگەلەوەی کە لەئیمام مالیکـەوە واگێڕدراوەتـەوە کـە وتویـەتی حوکمەکـەی وەکـوو حـوکمی جومعـە هەیـە. (ألـزین)ی کـوڕی (المـنیر) لـە ئـەبو حەنیفـەوە نـەقڵ دەکا: کـە نوێـژی خـۆرگیران واجبـە، هـەروا بـڕێ لـەو زانـا حەنەفیانـەی فیقهـی حەنـەفییان نووسیوە پێیان وایە ئەو نوێژە واجبە.

### نوێژ بارانە

ئەگـەر بـاران نـەباری‌و وشـکە سـاڵی بـوو، قـات‌و قـڕی چاوەڕوان دەکـرا، سوننەتە خەڵکەکە لەشارو گوند بڕۆنە دەرەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژ بارانە لـە چۆڵ‌و سارایەکی لەباردا ئیمـام دووركـات نوێـژیان پـێ بكـا، دوعـاو پاڕانـەوەی

زۆر بکەن، ئەمجار پۆشاکی سەرشانیان هەڵگێڕنەوە، لای راستی بخەنە سەر شانی چەپیانو لای چەپیان بخەنە سەرشانی راست...

لە عەبباد‌ی کوڕی تەمیمەوە لەمامیەوە عەبدوڵڵای کوڕی زەید ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا لەگەڵ موسوڵمانان لەشار چووە دەر بۆ شوێنێك نوێژە بارانەی لێ بکا، روی کردە قیبلەو دوورکات نوێژی نوێژەبارانەی کرد، ئەمجار ڕیدای سەرشانی هەڵەوگێڕکرد، سوفیان دەڵێ: (المسعودی) لە ئەبوبەکرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ لای راستی ڕیدایەکەی خستە سەرشانی چەپی.[1]

هەر لە عەببادەوە ڕیوایەتکراوە، وتی: پێغەمبەرم بینی کاتێك کە تەشریفی چووە دەر بۆ نوێژەبارانە، دەڵێ بینیم پشتی لە خەڵکەکە کردو روی کردە قیبلەو دەستی کرد بە دوعاو پاڕانەوە، پاشان ڕیداکەی سەرشانی هەڵەوگێڕ کرد، پاشان دوورکات نوێژی بۆکردین، بەدەنگی بەرز قورئانی خوێند.[2]

## سوجدەی قورئان خوێندن

ئیبنو حەزم لەکتێبی (المحلی ج٥/١٠٥-١٠٦)دا دەفەرموێ: لەقورئانی پیرۆزدا چواردە سوژدە هەن، یەکەمیان لە سورەتی (الأعراف) پاشان لە (الرّعد)، ئەمجار لە (النحل)و پاشان لە (سبحان)داو ئەمجار لە (کهعص)و پاشان (الحج)و ئەمجار لە (الفرقان)و ئەمجار لە (النمل)و پاشان لە (الم التنزیل) پاشان لە (ص)و ئەمجار لە (حم فصلت) پاشان لە (والنجم)

---

[1] متفق علیه: خ(١٠٢٧/٥١٥/٢) وهذا لفظه م (٨٩٤-٢/٦١١/٢)، د(١١٤٩/٢٤/٤)، ت(٥٥٣/٣٤/٢)، ن(١٥٥/٣) بنحوه.

[2] صحیح: (ص.د/١٠٢٩)، خ(١٠٢٥/٥١٤/٢) وهذا الفظه م(٨٩٤/٤ – ٦١١/٢) ولیس عنده الجهد د(١١٥٠/٢٦/٤).

لەكۆتاییداو ئەمجار لە (اذا السماء انشقت) لەدوا (لا يسجدو) پاشان لە (اقرأ باسم ربك) لە كۆتاییەكەیدا.

## حوكمی سوژدە

ئیبنو حەزم دەڵێ سوژدەی تیلاوەت فەرزنیە، بەڵكوو فەضلو خێرێكی گەورەیە، سوژدەی تیلاوەت هەمووكاتێ دەبردرێ. لەنوێژی فەرزو سوننەتو لەغەیری نوێژیشدا ئەنجام دەدرێ. هەموو كاتێك دەبێ، لەكاتی خۆرهەڵاتنو ئاوابوونیدا لەوكاتەدا كەخۆر لەنێوەڕاستی ئاسماندا دەبێ روت لە قیبلە بێ یان روت لە غەیری قیبلە بێ، دەستنوێژت هەبێ یان نا.

بۆیە دەگوترێ: سوژدەی تیلاوەت فەرزنیەو فەضلو خێرە، چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سورەتی (والنجم)ی خوێندو سوژدەی برد[1]

زەیدی كوڕی ثابیت هەمان سورەتی بەسەردا خوێندەوە كەچی سوژدەی نەبرد[2] ئەمەش {وەكوو (ألحافظ) لە فەتحولباریدا ج٥٥٥/٢}دا دەڵێ: نیشانەی ئەوەیە واجب نیە.

ئیبنو حەزم [3] دەڵێ: سوژدەی تیلاوەت بۆیە بەبێ روكردنە قیبلەو دەستنوێژیش دروستە چونكە لە واقیعدا بەنوێژ ناژمێردرێ، ئەمەش بەپێی حەدیثی پێغەمبەر كە فەرموویەتی: «صَلاَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى». نوێژی شەونوێژ دووركاتە. جا هەرنوێژێك لەدووركات كەمتربوو ئەوە بەنوێژ ناژمێردرێ مەگەر دەقێك هەبێ بەنوێژی حسێب بكا، وەكوو ركاتی

---

[1] متفق عليه: خ(١٠٧٠/٥٥٣/٢)، م(٥٧٦/٤٠٥/١)، د(١٣٩٣/٢٨٢/٤)، ن(١٦٠/٢).

[2] متفق عليه: خ(١٠٧٣/٥٥٤/٢)، م(٥٧٧/٤٠٦/١)، ن(١٦٠/٢)، د(١٣٩١/٢٨٠/٤)، ت(٥٧٣/٤٤).

[3] المحلى ج١١١/٥.

نوێـژی تـرس‌و نوێـژی جـەنازە. دەی هـیچ دەقێـك نیـە سـوژدەی تیلاوەتـی بەنوێژ حسێب کردبێ.

## گەورەیی سوژدەی تیلاوەت

لـە ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي يَقُولُ يَا وَيْلَهُ – وَفِي رِوَايَةِ أَبِي كُرَيْبٍ يَا وَيْلِي – أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِيَ النَّارُ» [1]: کـە ئـادەمیزاد ئایـەتێکی سوژدەبردنی خوێندو سوژدەی برد، شەیتان کەنارگیر دەبێ‌و دەست دەکا بـە گریان‌و دەڵێ: ئەی هاوار بۆ خـۆم، ئـەو کابرایـە فـەرمانی پـێ کـرا بـە سـوژدە بردن‌و سوژدەی بردو بەهەشتی بۆ خۆی مسۆگەر کرد. ئەمن فەرمانم پێ کرا بە سوژدەو یاخی بووم، دۆزەخم بۆ خۆم مسۆگەر کرد.

## چی لە سوژدەی تیلاوەتدا دەگوترێ

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە سـوژدەی تـیلاوەتدا بەشـەو چـەند جارێـك ئـەم دوعایـەی دەخوێنـد « سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ». [2] ڕوخسارم سوژدەی بـرد بـۆ خودایـەك دروسـتی کـردوە، بـەهێزو توانـای خـۆی ئامێری بیستن‌و دیتن: کە گوێچکەو چاوە بۆی فەراهەم هێناوە.

لـە ئیمـامی عەلییـەوە ڕیوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەچوە سوژدە دەیفـەرموو: «اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ

---

[1] صحيح (مختصر م/٣٦٩)، م(١/٨٧/٨١).

[2] صحيح: (ص.د/١٢٥٥) ، د(٤/٢٨٩/١٤٠١)، ت(٥/٤٧/٥٧٧)، ن(٢/٢٢٢).

آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ وَأَنْتَ رَبِّى سَجَدَ وَجْهِى لِلَّذِى خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ». [(١)]

خودایە من بۆتۆ سوژدەم برد، ئیمانم بەتۆ هێناوە، بۆ تۆ گەردنكەچ بووم، ئەتۆ پەروەردگاری منی، روخسارم چووە سوژدە بۆ ئەو خودایەی گوێچكەو چاوی بۆ بەدی هێناوم، پاكو مونەزەهی بۆ خودایەك كە بەدیهێنەرێكی بێ وێنەو كار دروستو بێ خەوشە.

لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەردا بووم، پیاوێك هاتە خزمەتی، وتی: من دوێنێ شەو لەخەودا وام خۆم بینی كە نوێژ دەكەم روم كردۆتە قەدە درەختێك، سورەتی (ألسجدة)م خوێندو چوومە سوژدەو درەختەكەش وەكوو من سوژدەی برد، گوێم لێ بوو، دەیگوت: خودایە! لەپاداشی ئەم سوژدەیەمدا گوناهم لێ هەڵوەرێنە، خێرم بۆ بنووسە، لای خۆت بۆم بكە بە بارمتە.

ئیبنو عەباس دەفەرموێ: پێغەمبەرم بینی سورەتی (ألسجده)ی خوێندو چووە سوژدە، گوێم لێ بوو لە سوژدەكەیدا هەمان ئەو دوعایەی دەخوێند: كە پیاوەكە لەبارەی درەختەكەوە بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە. [(٢)]

## سوژدەی شوكر

وا سوننەتە بۆ كەسێك خودا نیعمەتێكی پێدا یان بەڵایەكی لەسەر لابرد، یان مزگێنی پێدرا بەشتێك كەیف خۆش بێ، بكەوێتە سوژدەو ئیقتیدا بە پێغەمبەر بكا.

---

(١) صحيح: (ص.جة/٨٦٦) ، م(١/٥٣٤/٧٧١)، جة(١/٣٣٥/١٠٥٤)، د(٢/٤٦٣/٧٤٦)، ت(٥/١٤٩/٣٤٨١).

(٢) صحيح: (ص.جة/٨٦٥) ، ت(٢/٤٦/٥٧٦)، جة(١/٣٣٤/١٠٥٣).

لە ئەبوبەکرەوە ڕیوایەت کراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ): کە شتێکی دەهاتە پێش کەیفخۆشی بکردایە، یان پێی کەیفخۆش بوایە خێرا سوژدەی شوکری بۆ خودا دەبرد.[1] حوکمی سوژدەی شوکر وەکوو حوکمی سوژدەی تیلاوەت وایە.

## سوژدەی سەهو

ئەوە چەسپاوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژ سەهوی لێ ڕودراوە، ئەوەش ڕاستو سەلمێندراوە کە تەشریفی فەرموویەتی: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي».[2] منیش تەنها ئادەمیزادێکم وەکوو ئێوە، شتم لەبیردەچێ وەکوو چۆن ئێوە شتتان لەبیردەچێ، جا کەزانیتان شتێکم لەبیرچووە بیرم بخەنەوە.

بێگومان پێغەمبەر چەند حوکمو یاسایەکی بۆ ئومەتەکەی ڕونکردۆتەوە، ئێستا بەکورتی ئاماژەی پێ دەکەین:

١- ئەگەر لەرکاتی دووەم هەڵسایەوە تەحیاتی تەرك كرد.

لە عەبدوڵڵای کوڕی بوحەینەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕکات نوێژی بەجەماعەت لەیەکێ لەنوێژەکاندا بۆ کردین، لەدوای دوو ڕکاتەکان دانەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، خەڵکەکەیش لەگەڵی هەڵسانەوە، جا کەنوێژەکەی تەواو کرد چاوەڕێمان دەکرد سڵاو بداتەوە بەڵام سڵاوی نەدایەوە {الله أكبر}ی کردو چووە سوژدەوە، دوو سوژدەی بەدانیشتنەوە بردو پاشان سڵاوی دایەوە.[3]

---

[1] حسن (ص. جة/١١٤٣)، جة(١/٤٤٦/١٣٩٤) وهذا الفظه، د(٧/٤٦٢/٢٧٥٧)، ت(٣/٦٩/١٦٢٦).

[2] صحيح: (ص.ج/٢٣٣٩) ، (الإرواء/٣٣٩).

[3] متفق عليه: خ (٣/٩٢/١٢٢٤)، م (١/٣٩٩/٥٧٠)، ن (٣/١٩)، د (٣/٣٤٧/١٠٢١)، ت (٣٨٩/١/٢٤٢).

موغەیرەی کوڕی شوعبە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ فَلَمْ يَسْتَتِمَّ قَائِمًا فَلْيَجْلِسْ فَإِذَا اسْتَتَمَّ قَائِمًا فَلاَ يَجْلِسْ وَيَسْجُدْ سَجْدَتَي السَّهْوِ».[1] ئەگەر یەکێ لەئێوە لەدوای دوو ڕکات دانەنیشت بۆ تەحیات خوێندن بەڵکوو هەڵسایەوە سەرپێ، ئەگەر بەتەواوی ڕاست نەبووەوە ئەوە با دانیشێو تەحیات بخوێنێ، ئەگەر بەتەواوی ڕاست بووەوە، با دانەنیشێ، بەڵکوو نوێژەکە تەواوبکا دوای سڵاو دانەوەکە دوو سوژدەی سەهو بەرێ.

٢- ئەگەر لەجیاتی چوار ڕکات پێنج ڕکاتی کرد. لە عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی نیوەڕۆی بە پێنج ڕکات کرد، کەسڵاوی دایەوە عەرزیان کرد ئەوە نوێژ لێی زیادکراوە؟ فەرمووی: (ئەوە چیەو چی بووە؟) عەرزیان کرد پێنج ڕکات نوێژت کرد، ئیتر دوو سەجدەی سەهوی بردن، دوای سڵاودانەوە.

٣- ئەگەر لەنوێژی چوار ڕکاتیدا دوای دوو ڕکات یان سی ڕکات سڵاوی دایەوە.

لە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕکات نوێژی تەواو کردو سڵاوی دایەوەو تەشریفی ڕۆیشت (ذوالیدین) عەرزی کرد، ئەرێ نوێژ کورت بۆتەوە یان جەنابت لەبیرت چوو؟ ئەی پێغەمبەری خودا! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئایا (ذوالیدین) ڕاست دەکا؟ خەڵکەکە عەرزیان کرد بەڵێ: ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕکاتی تری کردو پاشان سڵاوی دایەوە،

---

[1] صحیح: (الإرواء: ٢/١٠٩/١١٠).

پاشان (الله أكبر)ى كردو چووه سوژده وەكوو سوژدەبردنى لەوەپێشى يان هەندێ لەو درێژتر، پاشان سەرى بەرز كردەوە.[1]

له عيمرانى كورى حوصەينەوه ريوايەتكراوه: كه پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) نوێژى عەصرى كرد، سێ ركاتى كردو سلاوى دايەوه، دوايى چۆوه بۆ مالى خۆى، پياوێك كەپێيان دەگوت: (الخرباق) درێژييەك بەدەستەكانيەوه دەبيندرا، چووه خزمەتى وتى: ئەى پێغەمبەرى خودا! ئەمجار چۆنيەتى نوێژەكەى بۆ باس كرد، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) بەپەله لەمال دەرچووريدائەكەى بەدو خۆيدا كێش دەكرد هەتا هاته ناو خەلكەكه، فەرمووى: ئەمه راست دەكا، عەرزيان كرد بەلێ راست دەكا سێ ركات نوێژ كرا، ئيتر ركاتێكى ترى ئەنجام دا، پاشان سلاوى دايەوه، ئەمجار دوو سوژدەى بردنو پاشان سلاوى دايەوه.[2]

٤- ئەگەر كەوتە گومانەوه ئاخۆ چەند ركات نوێژى كردوون. له ئيبراهيمەوه له عەلقەمەوه دەلێ: عەبدوللا وتى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) نوێژى كرد – ئيبراهيم دەلێ: زيادى كرد يان كەم – كەسلاوى دايەوه، عەرزى كرا ئەى پێغەمبەرى خودا! ئايا گۆڕانكارى بەسەر نوێژدا هاتووه؟ فەرمووى: چى بووه؟ عەرزيان كرد ئەتۆ ئەمرۆ ئاواو ئاوا نوێژت ئەنجامدا، ئيتر قاچەكانى نوشتاندنەوەو رووى كردە قيبلەو دوو سوژدەى بردن، پاشان سلاوى دايەوه، ئەمجار رووى تێكردينو فەرمووى: « إِنَّهُ لَوْ حَدَثَ فِي الصَّلَاةِ شَيْءٌ أَنْبَأْتُكُمْ بِهِ وَلَكِنْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي وَإِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ فَلْيُتِمَّ عَلَيْهِ ثُمَّ لِيَسْجُدْ

---

[1] متفق عليه: خ (٣/٩٨/١٢٢٨)، م (١/٤٠٣/٢٧٣)، د (٣/٣١/٩٩٥)، ت (١/٢٤٧/٣٩٧)، ن (٣/٣٠)، جه (١/٣٨٣/١٢١٤).

[2] صحيح: (ص. جه/١٠٠١)، م (١/٤٠٤/٥٧٤)، د (٣/٣٢٣/١٠٠٥)، ن (٣/٢٦)، جه (١/٣٨٣/١٢١٤).

سَجْدَتَيْنِ».[1] ئەگەر گۆڕانكارییەك لەنوێژدا روی بدایە من یەكسەر هەواڵم پێ دەدان، وەڵێ منیش ئادەمیزادێكم وەكوو ئێوە شتم لەیاد دەچێ وەكوو ئێوە، جا ئەگەر زانیتان شتێكم لەیاد چووە بیرم بخەنەوە، ئەگەر یەكێك لەئێوە لەنوێژەكەیدا كەوتە گومانەوە ئاخۆ چەند ڕكاتی كردووە، روكنەكانی نوێژی بەتەواوی ئەنجام داوە، با هەوڵبدا لەسەر یەقین نوێژەكەی تەواو بكا، واتە: وای دابنێ كەمی كردووەو تەواوی بكا، دوایی دوو سوژدەی سەهو بەرێ، تەحەریو لێكۆڵینەوە بەوە دەبێ، كەبیر بكاتەوە لەنوێژەكەیدا چی خوێندووە، بیر بكاتەوە كەئاخۆ دوو سورەتی خوێندووە لەدوو ڕكاتدا تا بزانێ دوو ڕكاتی كردووە نەك ڕكاتێك، وایش دەبێ دێتەوە یادی، كە دانیشتووە تەحیاتی خوێندووە، ئەوكاتە دەزانێ، كە دوو ڕكاتی كردووە نەك ڕكاتێك، سێ ڕكاتی كردووە نەك دوو، وادەبێ بیری دەكەوێتەوە فاتیحەی لەڕكاتێكدا خوێندووەو پاشان لەڕكاتێكی تردا خوێندویەتی، ئەوكاتە بۆی مەعلوم دەبێ چوار ڕكاتی كردووە نەك سێ..... هەروا بەو جۆرە، كە لێكۆڵینەوەكەی گەیشتە ئاستێك نزیك بێ لەواقیعو صەواب ئەوە شكەكەی لادەبا، ج جوداوازی نیە لەوەدا نوێژكەرەكە پێشنوێژ بێ یان بەتەنیا نوێژ بكا[2] ئەگەر لێكۆڵینەوەی ئەنجامدا تەرجیحی لەلا دروست نەبوو، ئەوە لەسەر یەقینەوە نوێژەكەی تەواو دەكا، وەكوو لەحەدیثدا لەئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى ثَلَاثًا أَمْ أَرْبَعًا فَلْيَطْرَحِ

---

[1] متفق عليه: خ (١/٥٠٣/٤٠١)، م (١/٤٠٠/٥٧٢)، د (٣/٣٣٦/١٠١٧)، جه (١/٣٨٢/١٢١١).

[2] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ٢٣/١٣.

الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ فَإِنْ كَانَ صَلَّى خَمْسًا شَفَعْنَ لَهُ صَلاَتَهُ وَإِنْ كَانَ صَلَّى إِتْمَامًا لأَرْبَعٍ كَانَتَا تَرْغِيمًا لِلشَّيْطَانِ».[1]

ئەگەر یەکێك کەوتە گومانەوە لەنوێژەکەیدا، نەیدەزانی ئاخۆ چەند ڕکاتی کردوون، سێ ڕکاتی کردوون یان چوار ڕکات، با گومانەکەی وەلانێ‌و لەسەر ئەوەی کەدڵنیایە کردوویەتی نوێژەکەی تەواو بکا، پاشان دوو سوژدەی سەهو بەرێ پێش ئەوەی سلاو بداتەوە، جا ئەگەر پێنج ڕکاتی کردن ئەوە شەفاعەتی نوێژەکەی بۆ دەکەن، خۆ ئەگەر بەئەوەیشەوە: کە کردی دەبوونە چوار ڕکات ئەوە دەبنە هۆی دڵناخۆش کردنی شەیتان‌و سەرپێ شۆڕکردنی.

## حوکمی سوژدەی سەهو

سوژدەی سەهو واجبە، ئەمەیش بەپێی فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەکوو لەدووتوێی ئەو حەدیثانەی لەوەپێش ئاماژەیان پێ کرا، هەروا لەبەر ئەوەی پێغەمبەر لەحاڵی ژیانیدا هەرکاتێ شتێکی لەیاد چووبێ سوژدەی سەهوی بردووە، بۆ تاقەجارێك ئەم کارەی تەرك نەکردووە.

## کەی‌و بۆچی سوژدەی سەهو دەبردرێ؟

بەرچاوترین راو قەولی زانایانی شەرع ئەوەیە دەبێ جوداوازی بکرێ لەنێوان زێدەو کەمی روکن‌و کردارەکانی نوێژ، هەروا لەنێوان گومان لەگەڵ تەحەڕی‌و لێکۆڵینەوەو گومان لەگەڵ تەواوکردنی نوێژ لەسەر یەقین.... چونکە ئەمە وێڕای ڕەچاوکردنی کارکردن بەهەموو دەقەکان جوداوازییەکی مەعقول هەیە لەنێوان حاڵەتەکاندا.

---

[1] صحيح: (ص. ج/٦٣٢)، م (٥٧١/٤٠٠/١)، د (١٠١١/٣٣٠/٣)، ن (٣/٢٧).

لەم روەوە ئەگەر سوژدەكە لەبری كەمی كارێك بوو، وەكوو تەحیات نەخوێندنی یەكەم، لەم حاڵەدا نوێژەكە پێویستی بە جەبركردنەوەو پڕكردنەوە هەیە، دەبێ پێش سڵاودانەوە سوژدەكە ببرێ، بۆ ئەوەی نوێژەكەی پێ تەواو بكرێو كەموكوڕییەكە نەمێنێ، سڵاودانەوەش دەرچوونە لەنوێژو رەهابوونە لێی.

خۆ ئەگەر سوژدە بردنەكە بەهۆی زیادكردنی ركاتێكەوە بوو ئەوە دەبێ دوای سڵاو دانەوە سوژدە ببرێ، چونكە كردنی دوو زیادە لەنوێژدا نابێ، سڵاو دەدەیەوە ئەمجار (الله أكبر) دەكەیەوەو دەچیە سوژدە، ئەمەیش دەبێتە هۆی ملكەچ كردنی شەیتان، ئەو دوو سوژدەیە وەكوو نوێژێكی سەربەخۆ حسێب دەكرێنو كەموكوڕی نوێژەكەیان پێ پڕدەكرێتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنجامدانی دوو سوژدەی بەركاتێك حسێب فەرمووە.

هەروا ئەگەر كەوتە گومانەوەو لێكۆڵینەوەی كرد، ئەوە نوێژەكەی تەواوە، ئەو سوژدە بۆیە دەبا بۆ ملكەچكردنی شەیتانەو دڵ ناخۆش كردنیەتی. كەوابوو ئەم سوژدە بردنەش دوای سڵاودانەوەیە.

هەروا كەسڵاوی دایەوەو برێ ئەركی نوێژەكەی لەسەر مابوو، دوایی تەواوی كرد، ئەمیش نوێژەكەی تەواوە سڵاودانەوەكەی زیادەیە دەبێ سوژدەی سەهوی دوای سڵاودانەوەكە بێ چونكە سەرشۆڕكردنی شەیتانی لەخۆگرتووە.

بەڵام كە كەوتە گومانەوەو گومانەكەی بەلایەكدا نەڕەوییەوە، ئالێرەدا حاڵ خاڵی نیە یان چوار ركاتی كردووە یان پێنج، ئەگەر پێنج ركاتی كردبوو، ئەوە دوو سوژدەكە نوێژەكەی بۆ دەكەنە جوت، وەكوو ئەوە شەش ركاتی كردبن نەك پێنج، ئەم دوو سوژدەیەش دەبێ لەپێش سڵاودانەوە بن.

ئەم رایەی ئێمە بەپەسەندمان زانیو پشتگیریمان كردووە، راوبۆچوونێكە هەموو فەرموودەكانی تێدا بەرجەستە دەبنو كارا دەكرێنو فەرموودەیەكیان

پاشگوێ ناخرێ، وێڕای کاراکردنی قیاسی صەحیح لەشتێك فەرموودەی دەربارە نەهاتبێ، لکاندنی شتێك مەنصوص نەبێ بەشتێك لە مەنصوص بچێ.[1]

## سوژدەی سەهو بەقەرەبوو کردنەوەی نەکردنی سونەتێك

کەسێك سوننەتێکی ناو نوێژی لەبیر چوو دەبێ سوژدەی سەهو بەرێ. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لِكُلِّ سَهْوٍ سَجْدَتَانِ».[2] بۆ هەموو سەهوو لەبیرچوونەومیەك دوو سوژدە هەیە. ئەم جۆرە سوژدەبردنە سوننەتە واجب نیە. بۆ ئەوەی فەرع لەسەر ئەصڵ زیاد نەبێ.[3]

## نوێژی بەکۆمەڵ (الصلاة الجماعة)

## حوکمی نوێژی بەکۆمەڵ

نوێژی بەکۆمەڵ فەرزی عەینە لەسەر پیاوان مەگەر عوزری هەبێ بۆ ئامادە نەبوون.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمَّ النَّاسَ ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ

---

[1] مجموع الفتاوى لإبن تيمية. ٢٣/٢٤.

[2] حسن: (ص. د/٩١٧)، د (٣/٣٥٧/١٠٢٥)، جه (١/٣٨٥/١٢١٩).

[3] السيل الجرار (١/٣٧٥).

فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَرْقًا سَمِينًا أَوْ مِرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ لَشَهِدَ الْعِشَاءَ».[1]

سوێندم بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، وام بەخەیاڵدا هات، فەرمان بكەم دارو چیلكە كۆبكرێتەوە، پاشان فەرمان بكەم پیاوێك پێشنوێژی بۆ خەڵك بكا ئەمجار بۆخۆم هێرشم دەكردە سەر ئەوانەی كە ئامادەی نوێژی جەماعەت نەبوون خانووەكانیان بەسەردا بسوتێنم، سوێندم بەوكەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر یەكێك لەئێوە بیزانیایە كە بێ بۆ جەماعەت پارچە گۆشتێكی كەمی بەسەر ئێسقانێكەوە دەست ددەكەوێ، یان سمە قاچی مەڕێ چنگدەكەوێ ئامادەی نوێژی عیشا دەبوو بەجەماعەت ئەنجامی دەدا.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پیاوێكی كوێر هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من كوێرمو كەس نیە چاوساغم بێو دەستم بگرێ بمهێنێ بۆ مزگەوت، داوای لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد كە روخصەتی بداو نوێژ لەماڵەوە بكا، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەیدا، جا كە كابرا ڕۆیی، بانگی كردەوە پێی فەرموو: «هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ»؟ ئایا تۆ گوێت لەبانگ دەبێ؟ وتی بەڵێ. فەرمووی: كەواتە دەبێ ئامادەی جەماعەت بی.[2]

لە عەبدوڵلاوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: (كەسێك پێی خۆشە بەموسوڵمانیو ئیمانی ساغ بەخزمەت پەروەردگار بگا، با پارێزگاری لە بەجێهێنانی ئەو نوێژانە بكا، كاتێ بانگیان بۆ دەدرێ، بێگومان خودا ڕێگەی هیدایەتی بۆ

---

[1] متفق علیه: خ (٢/١٢٥/٦٤٤) وهذا لفظه، م (١/٤٥١/٦٥١) بنحوه، د (٢/٢٥١/٥٤٤)، جه (١/٢٥٩/٧٩١) ولیس عندهما الجملة الآخیرة، ن (٢/١٠٧)، بلفظ البخاری.

[2] صحیح: (مختصر، م/٣٢٠)، م (١/٤٥٢/٦٥٣)، ن (٢/١٠٩).

پێغەمبەرەكەی دەست نیشان كردووە، ئەو نوێژانە بەشێكن لەو ڕێگا هیدایەت ئامێزە، ئەگەر ئێوە نوێژەكانتان لە ماڵەوە بكەن وەكوو ئەم دواكەوتووە كە لەماڵەوە نوێژ دەكا، ئەوە ئێوە واز لەپەیڕەوی كردنی سوننەتی پێغەمبەرەكەتان دەهێنن، ئەگەر وازبێنن لە پەیڕەوكردنی ڕێبازی پێغەمبەرەكەتان گومڕا دەبن، هەر پیاوێك خۆ پاك بكاتەوەو دەستنوێژی جوان بشوا، پاشان روو لەیەكێك لە مزگەوتەكان بكا، ئەوە بێگومان پەروەردگار بەهەر هەنگاوێك لەو هەنگاوانەی دەیانهاوێ چاكەیەكی بۆ دەنووسیو پلەیەك پێی بەرز دەبێتەوە، گوناهێكی پێ لێ هەڵدەوەرێ، بێگومان خۆمان دیومانەو زانیومانە موناافیقو دوڕوو نەبێ لەنوێژی جەماعەت دواناكەوێ، بێگومان پیاوی پەككەوتەی واهەبوو دوو كەس دەچوونە ژێر باڵی‌یەوەو دەیانهێنا لەصەفی جەماعەت دارایان دەوەستاند.[1]

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَمْ يَأْتِهِ فَلاَ صَلاَةَ لَهُ إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ».[2] كەسێك گوێی لەبانگ بوو، نەهات بۆ جەماعەت، ئەوە نوێژی بۆ حساب ناكرێ مەگەر نەهاتنەكەی بەهۆی عوزرێكەوە بێ.

لە ئەبو دەردائەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «مَا مِنْ ثَلاَثَةٍ فِي قَرْيَةٍ وَلاَ بَدْوٍ لاَ تُقَامُ فِيهِمُ الصَّلاَةُ إِلاَّ قَدِ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَعَلَيْكَ بِالْجَمَاعَةِ فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ الْقَاصِيَةَ». هەرسێ كەسێك لەگوندێكدا یان لەهۆبەو هەوارێكدا بوون نوێژیان بەجەماعەت نەكرد ئیللا شەیتان بەسەریاندا زاڵ بووە، كەوابێ ئاگاداری

---

[1] صحيح: (ص. جه/٦٣١)، م (٦٥٤ – ١/٤٥٣/٢٥٧)، ن (٢/١٠٨)، د (٢/٢٥٤/٥٤٦)، جه (١/٢٥٥/٧٧٧).

[2] صحيح: (ص. جه/٦٥٤)، جه (١/٢٦٠/٧٩٣)، ك (١/٢٤٥)، هق (٣/١٧٤).

نوێـژی جەماعـەت بـەو هـەوڵ بـدە ئامـادەی جەماعـەت بـی. چـونکە گـورگ فرسەت لە ئاژەڵی تەرەبوو دێنیٚ‌و دەیکاتە نێچیری خۆی.

زائیـدە دەڵـیٚ: (الـشائب) گـوتی: مەبەسـتی بـە (الجماعـة) نوێژکردنـە بەجەماعەت.[١]

## فەضڵ‌و گەورەیی نوێژ بەجەماعەت

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بیٚ) فەرموویەتی: « صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلاَةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَـةً».[٢] نوێژی بەکۆمەڵ بە بیست‌و پێنج پلە لەنوێژی تەنیایی گەورەترە.

لـە ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـیٚ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بیٚ) فـەرمووی: « صَلاَةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَـلاَتِهِ فِـي بَيْتِـهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ ضِعْفًا ، وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ الصَّلاَةُ ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلاَّ رُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ ، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ ، فَإِذَا صَلَّى لَمْ تَزَلِ الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ مَا دَامَ فِـي مُـصَلاَّهُ اللَّهُـمَّ صَلِّ عَلَيْهِ ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ . وَلاَ يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا انْتَظَرَ الصَّلاَةَ».[٣] نوێژی پیـاو بەجەماعـەت پاداشـی دووچـەندانەو چـەند چـەندانە دەبێتـەوە بەسـەر نوێژێکیدا لەماڵەوە بیکا یان لەدوکانەکەیدا بیکا بـە بیـست‌و پێـنج ئەوەنـدە، چونکە ئـەو موسـوڵمانەی دەسـتنوێژ بگـریٚ‌و دەسـتنوێژەکەی ڕێك‌وپێـك بـیٚ، پاشان لەماڵ دەرچیٚ بەرەو مزگەوت، تەنها مەبەسـتی لـەو چوونـە دەرەوە بـۆ

---

[١] حسن: (ص. د/٥١١)، د (٥٤٣/٢٥٠/ و ٢/٢٥١).

[٢] متفـــق عليـــه: خ (٢/١٣١/٦٤٥)، م (١/٤٥٠/٦٥٠)، ت (١/١٣٨/٢١٥)، ن (٢/١٠٣)، جـــه (١/٢٥٩/٧٨٩).

[٣] متفق عليه: خ (٢/١٣١/٦٤٧)، م (١/٤٥٩/٦٤٩)، د (٢/٢٦٥/٥٥٥).

مزگـەوت ئەنجامـدانی نوێـژی بەکۆمـەڵ بـێ، ئـەوە بەهـەر هـەنگاوێکی کـە دەیهاوێ پلەیەك بەرز دەبێتەوەو تاوانێکی لێ هەڵدەوەرێ، جا ئەگەر نوێـژی کـرد ئـەوە بـەردەوام فریـشتە داوای لێخۆشـبوونی بـۆ دەکـەن هـەتا لەشـوێن نوێژیـدا بمێنێتـەوە لـە پـەروەردگار دەپاڕێنـەوەو دەڵێن: خودایـە ڕەحمـەتی خـۆت برژێنـە بەسـەریداو ڕەحمـی پـێ بکـە، هەمیـشە یـەکێك لـەئێوە وا دەژمێردرێ کە لەنوێژدایە لەوکاتەدا چاوەڕوانی نوێژ دەکا.

هـەر لـە ئـەبو هورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ وَرَاحَ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُ نُزُلَـهُ مِـنَ الْجَنَّةِ كُلَّمَا غَدَا أَوْ رَاحَ».[1] کەسێك بەیانیو ئێوارە باری پێوە بگرێ هاموشۆی مزگەوت بکا، پەروەردگار لە بەهەشتدا مـەنزڵو جێگای بـۆ سـاز دەکـا، هـەتا ئەو بەیانیو ئێوارە ئەو کارە ئەنجام بدا

## ئایا ئافرەت ئامادەی نوێژی جەماعەت دەبن؟

دروستە ئافرەتان لەماڵ دەرچن بـۆ مزگـەوت، ئامـادەی نوێـژی بەکۆمـەڵ بن، بەمـەرجێك خۆیـان بپـارێزن لەهـەر شـتێك کەشـەهوەت بوروژێنـێ، خـۆ بپـارێزن لـە خۆڕازاندنـەوەو خـۆ بۆنخۆشـکردنو هەرشـتێك سەربکێـشێ بـۆ فیتنە.[2]

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ تَمْنَعُوا نِسَاءَكُمُ الْمَسَاجِدَ وَبُيُـوتُهُنَّ خَيْـرٌ لَهُـنَّ».[3]

---

[1] متفق عليه: خ (٢/١٤٨/٦٦٢)، م (١/٤٦٣/٦٦٩).

[2] فقه السنة: ١/١٩٣.

[3] صحيح: (ص. د/٥٣٠)، د (٢/٢٧٤/٥٦٣)، حم (٥/١٩٥/١٣٣٣).

ئافرەتـەکانتان لـەوە مـەنع مەکـەن بـچنە مزگـەوت، مانـەوەیان لـە ماڵـەوەو نوێژکردنیان لەوێدا باشترە بۆیان.

لـە ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە، گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: «أَيُّمَـا امْـرَأَةٍ أَصَـابَتْ بَخُـورًا فَـلاَ تَـشْهَدَنَّ مَعَنَـا الْعِـشَاءَ الآخِرَةِ».[1] هەر ئافرەتێك خـۆی بۆنخۆش بکـاو عـەترو بخـور لـەخۆی بـدا بـا ئامادەی نوێژی خەوتنان نەبێ.

هـەر لـە ئـەوەوە دوبـارە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: «لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ مَسَاجِدَ اللَّـهِ وَلَكِـنْ لِيَخْـرُجْنَ وَهُـنَّ تَفِـلاَتٌ».[2] ئافرەتـان لەمزگەوتـەکانی خودا مـەنع مەکـەن، بـەڵام بـا لـەماڵ دەربـچن بـۆ مزگەوت بەمەرجێك بۆنی خۆشیان لەخۆ نەدابێ.

## نوێژکردنی ئافرەت لەماڵەوە باشترە تا لەمزگەوت

ئافرەت هەرچەندە بۆی ڕەوایە لەماڵـەوە دەربـچێ بـۆ نوێـژی جەماعـەت لەمزگەوت، بەڵام نوێژکردنی لەماڵی خۆیدا باشترە.

لـە ئوممـو حومەیـدی (الـساعدی)یـەوە ریوایـەتکراوە: کـە هـاتووە بـۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەمن حەز دەکەم لەگـەڵ جـەنابت نوێـژ بکـەم، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی: « قَدْ عَلِمْتُ أَنَّكِ تُحِبِّينَ الصَّلاَةَ مَعِي وَصَلاَتُكِ فِي بَيْتِكِ خَيْـرٌ لَـكِ مِنْ صَلاَتِكِ فِـي حُجْرَتِـكِ وَصَـلاَتُكِ فِـي حُجْرَتِـكِ خَيْـرٌ مِـنْ صَـلاَتِكِ فِـي دَارِكِ

[1] صحيح: (ص. ج/٢٧٠٢)، م (٤٤٤/٣٢٨/١)، د (٤١٥٧)/٢٣١/١١، ن (٨/١٥٤).

[2] حسن صحيح: (ص. د/٥٢٩)، د (٢/٢٧٣/٥٦١)، حم (٥/١٩٣/١٣٢٨).

وَصَلاَتُكِ فِي دَارِكِ خَيْرٌ لَكِ مِنْ صَلاَتِكِ فِي مَسْجِدِ قَوْمِكِ وَصَلاَتُكِ فِي مَسْجِدِ قَوْمِكِ خَيْرٌ لَكِ مِنْ صَلاَتِكِ فِي مَسْجِدِي ».[1]

بێگومان دەزانم کە تۆ حەزدەکەی نوێژ بەجەماعەت لەگەڵ مندا بکەی. وەڵێ نوێژکردنت لەماڵەوە باشترە بۆ تۆ لەوەی نوێژ لەحوجرەی خۆتدا بکەی، نوێژکردنت لەحوجرەی خۆتدا باشترە لەوەی نوێژ لەحەوشەی خۆتدا بکەی، نوێژکردنت لەحەوشەی خۆت باشترە لەوەی نوێژ لەمزگەوتی قەومی خۆتدا بکەی، نوێژکردنت لە مزگەوتی قەومەکەتدا باشترە لەوەی نوێژ بەجەماعەت لەگەڵ مندا بکەی.

## ڕێ‌و شوێنی چوون بۆ مزگەوت

لە ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا خەریکی نوێژی بەجەماعەت بووین، لەپڕێکا غەڵبە غەڵب‌و دەنگە دەنگی کۆمەڵێ پیاومان بەرگوێ کەوت، جا کە پێغەمبەر لەنوێژەکەی بۆوە، فەرمووی: « مَا شَأْنُكُمْ؟» ئەوە بۆ واتان کرد؟ ئەو هەراو هوریایەتان لەچی بوو؟ وتیان: پەلەمان کرد فریای جەماعەت بکەوین، فەرمووی: (فَلاَ تَفْعَلُوا) نا وامەکەن «إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا».[2] هەرکاتێ هاتن بۆ نوێژ لەسەرەخۆ بن‌و بەهێواشی وەرن، ئەوەندەی پێڕاگەیشتن بەجەماعەت نوێژەکەتان بکەن، ئەوەیشی فریانەکەوتن تەواوی بکەن.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا سَمِعْتُمُ الإِقَامَةَ فَامْشُوا إِلَى الصَّلاَةِ ، وَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ

---

[1] حسن: حم (٥/١٩٨/١٣٣٧)، خ (٣/٩٥/١٦٨٩).

[2] متفق عليه: خ (٢/١١٦/٦٣٥)، م (١/٤٢١/٦٠٣).

وَلاَ تُسْرِعُوا ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا».[١] هەركاتێك گوێتان لەقامەتكردن بوو، بڕۆن بۆ نوێژی جەماعەت، لەسەرەخۆو بەویقار بن پەلە مەكەن، ئەوەندەی پێراگەیشتن لەگەڵ پێشنوێژ نوێژ بەجەماعەت بكەن، ئەوەی فەوتابوو لێتان تەواوی بكەن.

لە كەعبی كوڕی عوجرە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إِلَى الْمَسْجِدِ فَلاَ يُشَبِّكَنَّ بَيْنَ أَصَابِعِهِ فَإِنَّهُ فِي صَلاَةٍ».[٢] هەركاتێك یەكێك لەئێوە دەستنوێژی گرت بەڕێكوپێكی، پاشان بەرەو مزگەوت بەڕێ كەوت بۆ نوێژی جەماعەت با پەنجەكانی تێك نەپەڕێنێ، چونكە ئەو وا حیساب دەكرێ ئەوماوەیە لەنوێژدایە.

## ذیكرو دوعای ئەو كاتەی لەماڵ دەردەچی

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ قَالَ – يَعْنِي إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ – بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. يُقَالُ لَهُ: هديت وَكُفِيتَ وَوُقِيتَ. وَتَنَحَّى عَنْهُ الشَّيْطَانُ».[٣] كەسێك كە لەماڵ دەردەچێ بۆ نوێژی جەماعەت، وتی بەناوی خوداو پشت بەخودا دەبەستمو هیچ هێزو توانایەك نیە كاراو كاریگەر بێ مەگەر بەهێزو توانای خودا، ئیتر پێی دەگوترێ هیدایەت دراوی، بەشی خۆت درایە، پارێزراوی، شەیتانیش لێی دەتەكێتەوە.

---

[١] متفق عليه: خ (٢/١١٧/٦٣٦)، وهذا لفظه، م (١/٤٢٠/٦٠٢)، د (٢/٢٧٨/٥٦٨)، ت (١/٢٠٥/٣٢٦)، ن (٢/١١٤)، جه (١/٢٥٥/٧٧٥).

[٢] صحيح: (ص. ت/٣١٦)، ت (١/٢٣٩/٣٨٤)، د (٢/٢٦٨/٥٥٨).

[٣] صحيح: (ص. ت/٣١٦)، ت (١/٢٣٩/٣٨٤)، د (٢/٢٦٨/٥٥٨).

له ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە: کە شەوێك لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوستووە...... وەصفی شەونوێژی پێغەمبەری کرد چۆنی ئەنجام داوە، پاشان وتی: بانگدەر بانگی داو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ بەجێهێنانی نوێژی بەجەماعەت لەماڵ دەرچوو بەدەم ڕێگاوە دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا وَفِي لِسَانِي نُورًا وَاجْعَلْ فِي سَمْعِي نُورًا وَاجْعَلْ فِي بَصَرِي نُورًا وَاجْعَلْ مِنْ خَلْفِي نُورًا وَمِنْ أَمَامِي نُورًا وَاجْعَلْ مِنْ فَوْقِي نُورًا وَمِنْ تَحْتِي نُورًا. اللَّهُمَّ أَعْطِنِي نُورًا»[1] خودایە دڵم نورانی بکە، زوبانم نورانی بێ، نور بخەرە گوێچکەمەوە، چاوم ڕۆشنا بکە، خودایە: دواوەم بکە بەروناکی، پێشەوم روناکی بێ، نورو روناکی بخەرە لای سەروم، لای ژێرەوەم نورانی بێ، خودایە بەنورو روناکی دامپۆشەو هەموو لایەکم نورو ڕەحمەت بێو بەهەموو شێوەیەك نورو ڕەحمەتم پێ ببەخشە.

## ذیکرو نزای کاتی چوونە ناو مزگەوت

له عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی (العاص)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێك دەچووە ناو مزگەوت دەیفەرموو: «أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ». پەنادەگرم بەخودای گەورەو شکۆمەند، بەزاتی بەرزو بێ هاوتای، بە دەسەڵاتی ئەزەلیو بێ کۆتایی ئەوزاتە پەنادەگرم لەشەیتانی نەفرین لێ کراوو دوورخراوە لە ڕەحمەت.

لە فاطیمەی کچی پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەچووە ناو مزگەوتەوە، دەیفەرموو: «بِسْمِ اللَّهِ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي

---

[1] صحيح (مختصر م/٣٧٩)، م (٧٦٣ – ١٩١/٥٣٠/١)، د (١٣٤٠/٢٣٠/٤).

أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ». (بەناوی خوداو سلاو لە پێغەمبەری خودا، خودایە لەتاوانم خۆشبە، دەرگای ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە) کە لەمزگەوتیش دەردەچوو دەیفەرموو: «بِسْمِ اللَّهِ وَالسَّلاَمُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ فَضْلِكَ».[1] بەناوی خوداو سلاو لە پێغەمبەری خودا، خودایە لێم خۆشبە، دەرگای فەضلو بەخششی خۆتم بۆ والا بکە.

## نوێژی (تحية المسجد)

هەرکاتێك موسوڵمان چووە ناو مزگەوتەوە پێویستە لەسەری پێش ئەوەی دابنیشێ دوورکات نوێژبکا.

لە ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتکراوە، گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلاَ يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ».[2] ئەگەر یەکێك لەئێوە چووە ناو مزگەوتەوە با دانەنیشێ تا دوورکات نوێژ دەکا.

کەوتم: پێویستە لەسەر ئەوکەسەی دەچێتە ناو مزگەوتەوە دوورکات نوێژبکاو نەمگوت سوننەتە، ئەوە بەپێی ظاهیری فەرمانەکەی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچ قەرینەیەکیش نیە فەرمانەکە لە ظاهیری خۆی لادا. جگە لەو حەدیثەی طەلحەی کوڕی عوبەیدیلا ڕیوایەتی کردوە، کە عەرەبێکی دەشتەکی سەروقژ ژاکاو هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بڵێ: چیم لەسەر پێویستە لەنوێژ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:

---

[1] صحيح: (ص. جه/٦٢٥)، جه (١/٢٥٣/٧٧١)، ت (١/١٩٧/٣١٣).

[2] متفق عليه: لەوەپێش تەخریج کراوە.

«الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا».[١] پێنج نوێژ مەگەر بە تەطەوع نوێژی تر بکەی.

(لەوەدا ئەگەر ئەم حەدیثە بکرێتە بەڵگەی ئەوە کە نوێژی چوونە ناو مزگەوت واجب نیەو سوننەتە، تێبینی هەیە لەلام؛ چونکە ئەوەی لەسەرەتای فێرکردندا واقیع دەبێو ئاڕاستە دەکرێ، نابێ پشتی پێ ببەسترێو بکرێتە بەڵگە بۆ لادانی دەقێکی تر - کە لەوەدوا دێ - لەمانای ظاهیری خۆی. ئەگینا پێویست دەبێ تێکڕای واجباتی شەرعی کورت هەڵبێنین لەو پێنج شتەی باسیان کرا، ئەمەش پێچەوانەی کۆڕای زانایانی شەرعە، پوچاندنەوەی زۆرینەی شەریعەتە، حەقو راستی ئەوەیە دەلیلو بەڵگەی پاشین (متأخر) وەربگیرێو کاری پێ بکرێ ئەگەر بە مەوریدێکی صەحیح واردبێ، چی لێ وەردەگیرێ لە (وجوبو نەدبو شتی وا) کاری پێ بکرێ، هەڵبەتە مەسەلەکە خیلافیو راجیایی تێدایە ئەمەش رای پەسەندو راجیحە.[٢]

★ ئەوەی جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە کە نوێژی چوونە ناو مزگەوت واجبە، ئەوەیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەکردنی فەرمووە تەنانەت لەوکاتەشدا کە ئیمام وتاری نوێژی هەینی دەدا.

لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە هاتووە دەڵێ: پیاوێك هات بۆ مزگەوتو پێغەمبەر وتاری رۆژی جومعەی دەدا، فەرمووی: «أَصَلَّيْتَ يَا فُلاَنُ». ئەرێ فلان نوێژت کرد؟ وتی: نەخەیر، فەرمووی: «قُمْ فَارْكَعْ» هەڵسە نوێژەکەت بکە.[٣]

---

[١] متفق عليه: (لەوەپێش لەسەرەتای باسی نوێژدا ئاماژەی پێکرا).

[٢] نيل الأوطار/١/٣٦٤.

[٣] متفق عليه: خ(٢/٤٠٧/٣٩٠)، م(٢/٥٩٦/٨٧٥)، د(٤/٤٦٤/١١٠٢)، ت(٢/١٠/٥٠٨)، جة(٣٥٣/١١١٢١)، ن(٣/١٠٧).

ئەگەر نوێژی چوونە مزگەوت (تحية المسجد) لەهەر بارودۆخێكدا ڕێگای ئەوە ببوایە وازی لێ بهێندرێ، دەبوایە لەكاتی خوێندنەوەی خوتبەی ڕۆژی هەینیدا تەرك بكرایە. چونكە كابرا كەهاتبوو بۆ مزگەوت دانیشتبوو كاتی ئەنجامدانیشی پێش دانیشتنە، كابراش حوكمی ئەو نوێژەی نەدەزانی، پێغەمبەریش كەدیتی كابرا نوێژەكەی نەكردو دانیشت، وتارەكەی بڕیو فەرمانی پێ كرد بەوە هەڵسێ نوێژی (تحية المسجد) بەجێ بهێنێ. ئەگەر پابەندبوون بە ئەنجامدانی ئەو نوێژە ئەوەندە گرنگ نەبوایەو هەموو كاتێ واجب نەبوایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە گرنگی پێ نەدەدا.[1]

## ئەگەر قامەت بۆ نوێژی فەڕزكرا نوێژی تر ناكرێ

لە ئەبو هورەیرەوە گێڕدراوەتەوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ). كە قامەت بۆ نوێژی فەڕزكرا، ئیتر جگە لەنوێژی فەرز نوێژی تر ناكرێ.

لە مالیكی كوڕی بوحەینەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێكی بینی لەكاتی قامەتو نوێژ دابەستنی فەڕزدا دووركات نوێژی سوننەتی دەكرد، جا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سڵاوی دایەوەو لەشوێنی خۆی هەڵسا، خەڵكەكە دەوریاندا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەكابرای فەرموو: « الصُّبْحَ أَرْبَعًا؟!».[2] یان «الصُّبْحُ أَرْبَعًا؟!» ئەوە نوێژی بەیانی چوار ركاتە؟! واتە: بەكاری كابرا ناڕازی بوو.

---

[1] مسلم بشرح النووی (٥/٢٢٦).

[2] متفق عليه: خ(٢/١٤٨/٦٦٣) وهذا لفظه، م(١/٤٩٣/٧١١).

## گەورەیی پێڕاگەیشتنی نوێژ دابەستنی ئیمام

لـە ئەنەسـەوە ڕیوایـەتکراوە، گوتویـەتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ صَلَّى لِلَّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا فِي جَمَاعَةٍ يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الأُولَى كُتِبَتْ لَهُ بَرَاءَتَانِ بَرَاءَةٌ مِنَ النَّارِ وَبَرَاءَةٌ مِنَ النِّفَاقِ»[1]: کەسێك لەبەرخاتری ڕەزامەنـدی خـودا چـل ڕۆژ نوێـژە فـەرزەکان بەجەماعـەت بکـاو لەهـەموو نوێژێکی دا فریای (الله أکبر)ی نوێـژ دابەسـتنی ئیمـام بکـەوێ دوو ڕزگـاربون‌و بەرائەتی بۆ دەنووسرێ، ڕزگاربوون لەئاگر، ڕزگاربوون لەدووڕوویی.

## کەسێك هاتە مزگەوت‌و ئیمام لەنوێژ بوبوەوە

له سەعیدی کوڕی (اُلْمسَيَّب)ەوە ڕیوایـەتکراوە، گـوتی: پیـاوێکی ئەنـصاری کەوتـە حاڵـەتی نزیـك گیـان دەرچـوونەوە، لەوکاتـەدا بەوکەسـانەی گـوت کـە لەدەوروبەری بوون، ئەمن حەدیسێکتان بۆ دەگێڕمـەوە، تـەنها بۆیـەش بۆتـان دەگێڕمەوە پاداشی خودام دەستگیر بێ. له پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ لَمْ يَرْفَعْ قَدَمَهُ الْيُمْنَى إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُ حَسَنَةً وَلَمْ يَضَعْ قَدَمَهُ الْيُسْرَى إِلاَّ حَطَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَنْهُ سَيِّئَةً فَلْيُقَرِّبْ أَحَدُكُمْ أَوْ لِيُبَعِّدْ فَإِنْ أَتَى الْمَسْجِدَ فَصَلَّى فِي جَمَاعَةٍ غُفِرَ لَهُ فَإِنْ أَتَى الْمَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّوْا بَعْضًا وَبَقِيَ بَعْضٌ صَلَّى مَا أَدْرَكَ وَأَتَمَّ مَا بَقِيَ كَانَ كَذَلِكَ فَإِنْ أَتَى الْمَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّوْا فَأَتَمَّ الصَّلاَةَ كَانَ كَذَلِكَ»[2]:

ئەگەر یەکێك لەئێوە دەسـتنوێژی گـرت بـەجوانی‌و ڕێـك‌و پێکی، پاشان بەرەو مزگەوت لەماڵ دەرچوو بە مەبەستی نوێـژی بەکۆمـەڵ، قاچی ڕاستی بەرزناکاتـەوە ئـیللا خـودای مـەزن چـاکەیەکی بـۆ دەنووسـێ، قاچی چەپی

---

[1] حسن: (ص.ت/٢٠٠)، ت(١/١٥٢/٢٤١).

[2] صحيح: (ص.د/٥٢٧)، د(٢/٣٧٢/٥٥٩).

هەڵناهێنێتەوە ئیللا خراپەو تاوانێکی لێ هەڵدەوەرێ، جا باشوێنەکەی لەمزگەوت نزیك بکاتەوە یان دووری بخاتەوە، جا ئەگەر هاتە مزگەوتو بەجەماعەت نوێژی کرد ئەوە لێخۆشبوونی خودای بۆ دەستەبەر دەبێ، ئەگەر هاتە مزگەوتو خەڵکەکە هەندێ لەنوێژەکەیان ئەنجام دابوو هەندێکیان مابوو، ئەوەندەی پێڕاگەیشت لەگەڵ ئەواندا نوێژەکە بەجەماعەت دەکاو ئەوی تری بەتەنیا تەواو دەکا، لەم حاڵەشدا لێخۆشبوونی خودای بۆ دەستەبەر دەبێ، خۆ ئەگەر گەیشتە مزگەوتو خەڵکەکە نوێژیان کردبوو، بۆ خۆی نوێژی بەتەنیا کرد، ئەویش هەر هەمان پاداشی دەدرێتێ.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ رَاحَ فَوَجَدَ النَّاسَ قَدْ صَلُّوْا أَعْطَاهُ اللَّهُ جَلَّ وَعَزَّ مِثْلَ أَجْرِ مَنْ صَلاَّهَا وَحَضَرَهَا لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أَجْرِهِمْ شَيْئًا».[1] کەسێك بەجوانیو ڕێكو پێکی دەستنوێژی شت، پاشان چوو بۆ مزگەوت ڕوانی خەڵکەکە لەنوێژ بوونەوەو ئەم فریانەکەوت، خودا خێری ئەوانەی پێ دەبەخشێ: کە ئامادەی جەماعەت بوونو نوێژیان بەکۆمەڵ کردوە، هیچیش لەخێری ئەوان کەم نابێتەوە.

## چوونە ناو نوێژ لەگەڵ ئیمام بەهەرشێوەیەك بێ

لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبو موعازی کوڕی جەبەلەوە ڕیوایەتکراوە، وتوویانە: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا أَتَى أَحَدُكُمُ الصَّلاَةَ وَالإِمَامُ عَلَى حَالٍ فَلْيَصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الإِمَامُ».[2] ئەگەر یەکێك لەنێوە

---

[1] صحيح: (ص.د/٥٢٨) ، د(٥٦٠/٢٧٢/٢)، ن(١١١/٢).

[2] صحيح: (ص.ت/٤٨٤) ، (ص.ج).

هات بۆ ئەنجامدانی نوێژی جەماعەتو ئیمام لەنوێژدابوو با یەکسەر نوێژ دابەستێو وەکوو ئیمام بکا.

## کەی نوێژکەر واحیساب دەکرێ فریا رکاتێك کەوتووە؟

لە ئەبو هورەیرەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: «إِذَا جِئْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا وَلاَ تَعُدُّوهَا شَيْئًا وَمَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ».[1] ئەگەر هاتن بۆ بەجێهێنانی نوێژی جەماعەتو ئێمە چووبووینە سوژدە، ئێوەش نوێژ دابەستنو بچنە سوژدە، بەلاّم بەرکاتی حسێب مەکەن، هەرکەسێ فریابکەوێ لەگەڵ ئیمامدا بچێتە روکوع ئەوە فریای رکات کەوتووە.

## کەسێك نەچێتە ریزەوەو روکوع بەرێ

لەئەبو بەکرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: چووم بۆ جەماعەتکردن لەگەڵ پێغەمبەردا، کە گەیشتمەجێ، پێش ئەوەی بچمە ناو ریزی نوێژکەرانەوە روکوعم برد، دوایی ئەم حاڵەم بۆ پێغەمبەر باسکرد، فەرمووی: « زَادَكَ اللَّهُ حِرْصًا وَلاَ تَعُدْ ».[2] خودا پتر حەریصت بکا لەسەر ئەنجامدانی ئەرکەکانی ئایین. جارێکی تر ئەم کارەت دوبارە مەکەرەوە.

لە عەطائەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: گوێم لێ بوو ئیبنو زوبەیر لەسەر مینبەر وتاری دەداو دەیفەرموو: موسوڵمانینە ئەگەر یەکێك لەئێوە هاتە مزگەوتو خەڵکەکە لەنوێژدابوونو چووبوونە روکوع، با ئەویش خێرا نوێژ دابەستێو بچێتە روکوع، بۆئەوەی داخڵی جەماعەتەکە بێ، پاشان

---

[1] صحيح: (ص.ج/٤٦٨) ، د(٣/١٤٥/٨٧٥).

[2] صحيح: (ص.ج/٣٥٦٥) ، خ(٢/٢٦٧/٧٨٣)، د(٢/٣٧٨/٦٧٠٦٩)، ن(٢/١١٨).

لەنوێژەکەیدا هەنگاو هەڵنێ بۆئەوەی بچێتە ڕیزەوە بێگومان ئەوە سوننەتە‌و پەیڕەوکردنی پێغەمبەرە.[١]

لەزەیدی کوڕی وەهبەوە هاتووە، دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵلا (واتە ئیبنو مەسعود)دا لەماڵەوە دەرچووین بۆ مزگەوت، کە گەیشتنە ناو مزگەوت ئیمام چووە ڕوکوع، ئیتر عەبدوڵلا خێرا (الله أکبر)ی کردو چووە ڕوکوع‌و منیش لەگەڵیدا چوومە ڕوکوع، پاشان کە لەڕوکوع سەریان بەرزکردەوە هەنگاومان هەڵێنایەوە هەتا چووینە ڕیزی نوێژکەرانەوە، جا کە ئیمام سڵاوی دایەوە‌و نوێژ تەواو بوو، ئەمن هەڵسامەوە پێم وابوو نوێژەکەم تەواو نەبوو، عەبدوڵلا دەستی گرتم‌و داینیشاندمەوە، پاشان فەرمووی: ئەتۆ فریا نوێژەکەت کەوتوی‌و نوێژەکەت تەواوە.[٢]

### واباشە ئیمام نوێژ درێژنەکاتەوە

له ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَالْكَبِيرَ وَإِذَا صَلَّى لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا يَشَاءَ». [٣]: ئەگەر یەکێك لەئێوە پێشنوێژی بۆ موسوڵمانان کرد، با نوێژەکە درێژنەکاتەوە‌و گرانی نەکا، چونکە نوێژکەرەکانی لاوازو نەخۆش‌و پیرو کەنەفتیان تێدایە، کەسێکیش بەتەنیا بۆ خۆی نوێژی کرد، با چەندێك دەتوانێ‌و ئارەزوی لێیە نوێژەکەی درێژبکاتەوە.

---

[١] صحيح الأسناد: (الصحيحة/٢٢٩).

[٢] صحيح (الصحيحة/٢/٥٢)، هق: (٢/٩٠).

[٣] متفق عليه: خ(٢/١٩٩/٧٠٣) وهذا لفظه م(١/٣٤١/٤٦٧)، د(٣/١١/٧٨٠)، ت(١/١٥٠/٢٣٦)، ن(٢/٩٤).

## واباشە ئیمام ڕکاتی یەکەم درێژ بکاتەوە

لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە، گوتویەتی: (نوێژی نیوەڕۆ بەجەماعەت دادەبەسترا، کابرا دەڕۆیی بۆ بەقیعو سەرئاوی خۆی دەکردو دەستنوێژی دەگرت، پاشان دەهات بۆ جەماعەت، هێشتا پێغەمبەری خودا لەرکاتی یەکەمی نوێژەکەدا بوو، ئەمە لەو نوێژانەیدا کە درێژی دەکردنەوە.[1]

## پێویستە شوێن ئیمام بکەویو لێی پێش نەکەوی

لە ئەنەسەوە هاتووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا».[2] ئیمام بۆیەیە مەئمومی چاوی لێ بکاو شوێنی بکەوێ، جا کە (الله أكبر)ی نوێژ دابەستنی کرد ئێوەیش (الله أكبر) بکەن کەچووە سوژدەی ئێوەیش بچنە سوژدە، کە هەڵسایەوە، ئێوەیش هەڵسنەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ أَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ».[3]: ئایا یەکێ لەئێوە کە لەپێش ئیمامدا سەر بەرزدەکاتەوە ناترسێ خودا سەری بکاتە سەری گوێدرێژ؟ یان ڕوخساری بکاتە ڕوخساری گوێدرێژ.؟!

---

[1] صحيح: (ص.ن/٩٣٠) ، م(١/٣٣٥/٤٥٤)، ن(٢/١٦٤).

[2] متفـق عليـه: خ(٢/١٨٢/٦٩١)، م(١/٣٢٠/٤٢٧)، د(٢/٢٣٠/٦٠٩)، ت(٢/٤٨/٥٧٩)، ن(٢/٩٦)، جة(١/٣٠٨/٩٦١).

[3] متفق عليه: خ(٢/١٨٢/٦٩١)، م(١/٣٢٠/٤٢٧)، د(٣٣٠/٦٠٩).

## کێ شیاوی ئەوەیە ببێتە پێشنوێژ!

لـە ئیبنـو مەسـعودی ئەلئەنـصارییەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « يَؤُمُّ الْقَـوْمَ أَقْـرَؤُهُمْ لِكِتَـابِ اللَّـهِ فَـإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْـدَمُهُمْ هِجْـرَةً فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِلْمًا وَلاَ يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي سُـلْطَانِهِ وَلاَ يَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ عَلَـى تَكْرِمَتِـهِ إِلاَّ بِإِذْنِـهِ».[1] هـەرکاتێ موسـوڵمانان کۆبوونـەوە بـۆ نوێژی جەماعەت، کێ زیاتر قورئانی لەبەربێو باشتری بخوێنێ ئـەوە دەبێتـە پێشنوێژ، جا ئەگەر لە قورئان لەبـەربوونو بـاش خوێندنیـدا یەکسان بـوون، کێیـان لـە سوننەتدا زانـابوو ئـەو دەبێتـە پـێش نوێـژ، خـۆ ئەگـەر لـەزانیاری بەسوننەت وەکوو یەك بـوون، کـێ زووتـر کۆچی کردبـێ بـۆ مەدینـە دەبێتـە پێشنوێژ، کە لەکۆچکردنیشدا هاوشان بوون ئەوە کێیان بەتەمەنتربوو دەبێتە ئیمامیان. نابێ کەس لە قەڵەمڕەوی کەسدا ئیمامـەت بکـا، (واتـە: نابـێ بـەبێ ئیزن ئیمامێك لەشوێنی ئیمامێکی تر پێشنوێژی بکـا) نابـێ کـەس لەجێگەی خاوەن ماڵ دانیشت، مەگەر خاوەن ماڵ داوای لێ بکاو ڕێی پێ بدا.

ئـەم حـەدیثـە ئـەوە دەگەیـەنێ: کـە خـاوەن مـاڵو پێـشنوێژی فـەرمیو تەعین کراوو هاوشێوەیان لەکەسانی دیکە شـیاوترن بـۆ ئیمامـەتکردن مەگـەر بۆ خۆیان ڕێگە بدەنو لەمافی خۆیان تەنازول بکەن. ئەمـەش فەرمودەکـەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـە فەرموویـەتی: «لاَ يَـؤُمَّنَّ الرَّجُـلُ الرَّجُلَ فِي سُلْطَانِهِ وَلاَ يَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ».

---

[1] صـــحيح: (مختـــصر م/٣١٦) ، م(٦٧٣/٤٦٥/١)، ت(٢٣٥/١٤٩/١)، د(٥٧٨/٢٨٩/٢)، ن(٧٦/٢)، جة(٩٨٠/٣١٣/١) وعندهم (فان كانوا في الحجرة سواء فأكثرهم سنا).

## پێشنوێژی کردنی منداڵ

لە عەمری کوڕی سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە فەتحی مەککە ئەنجام درا هەموو هۆزو خێڵەکان پێشبڕکێیان کرد بۆ موسوڵمانبوون، باوکم هۆزەکەی خۆی هەڵنا بۆ ئیمانهێنانو موسوڵمان بوون، جا کەهاتە ناویان وتی: سوێندم بەخودا ئێستا لەخزمەت پێغەمبەرەوە دێم بۆ لای ئێوە، ئەمجار پێی وتن: فلاّن نوێژ لەفلاّن کاتدا بەجێ بێنن، فلاّن نوێژیش لە فلاّن کاتدا بکەن، هەرکاتێ وەختی نوێژهات با یەکێکتان بانگ بدا، ئەمجار کێتان پتر قورئانی لەبەرە ئەو ببێتە پێشنوێژتان، جا خەڵکەکە ڕوانییان، کەسیان لەمن قورئانی زۆرتر لەبەرنیە، چونکە من لەوەپێش لەڕێگەی کاروانیو ڕێبوارانەوە فێری قورئان ببووم ئیتر لەبەرئەوە منیان خستە پێش خۆیانەوە بۆ ئیمامەت کردن، ئەمن ئەوکاتە تەمەنم شەش حەوت ساڵانە بوو.[1]

## دروستە ئەوکەسەی نوێژی فەرزەکا ئیقتیدا بەکەسێکەوە بکا کەنوێژی سوننەت دەکاو بە پێچەوانەشەوە

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە معازی کوڕی جەبەل لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژی دەکردو دوایی دەگەڕایەوە پێشنوێژی بۆ قەومەکەی دەکرد؟[2]

لە یەزیدی کوڕی (الأسود)ەوە ڕیوایەتکراوە، کە لەخزمەت پێغەمبەردا نوێژی بەجێهێناوە، لەوکاتەدا ئەو گەنجێکی مێرمنداڵ بووە، جا کە لەنوێژەکە بوونەوە ڕوانییان دوو پیاو لە سوچێکی مزگەوتدا هاوبەشی خەڵکەکەیان نەکردبوو، پێغەمبەر بانگی لێ کردن، بە پەشۆکاویو لەرزە لەرز هاتن، فەرمووی: بۆچی لەگەڵ ئێمەدا نوێژتان نەکرد؟ وتیان: ئێمە لەناو

---

[1] صحيح: (ص.ن/٧٦١) ، خ(٨/٢٢/٤٣٠٢)، د(٢/٢٩٣/٥٨١)، ن(٢/٨٠).

[2] صحيح: (مختصر خ/٣٨٧)، خ(٢/١٩٢/٧٠٠)، م(١/٣٣٩/٤٦٥)، د(٣/٤/٧٧٦).

هۆبەو بارگەنەو کاروانەکەی خۆماندا نوێژمان کردوە، فەرمووی: جارێکی تر وامەکەن، ئەگەر وا ڕێکەوت یەکێ لەئێوە لەناو هۆبەی خۆیدا نوێژی کرد، دووایی هات دیتی ئیمام نوێژی نەکردوە با لەدواوەی نوێژەکەی بە جەماعەت بکاتەوە، ئەوە بۆی بەنوێژی زێدەو سوننەت دەژمێردرێ.[1]

### ئیقتیداکردنی موقیم بە سەفەری‌و بە پێچەوانەشەوە

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، وتی: باوکم (عومەری کوڕی خەتاب) پێشنوێژی بۆ دانیشتوانی مەککە کرد نوێژەکە نوێژی نیوەڕۆ بوو، دوو ڕکاتی کردن‌و سلاوی دایەوەو بە نوێژکەرەکانی دوا خۆی گوت: ئێوە ئەی دانیشتوانی مەککە نوێژی خۆتان بەتەواوی بکەن ئێمە سەفەرین.[2]

### ئەگەر سەفەری لەپاش پێشنوێژیکەری موقیمەوە نوێژی کرد دەبێ نوێژەکەی تەواوبکا بە قەصر نەیکا

موسای کوڕی سەلەمەی هوزەلی دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد ئەگەر لەمەککە بووم‌و لەگەڵ ئیمامدا بە جەماعەت نوێژم نەکرد چۆن نوێژ بکەم؟ لەوەڵامدا فەرمووی دوو ڕکات بکە ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ).[3]

لە ئەبو میجلەزەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم گوت (سەفەریی وادەبێ فریای دووڕکات نوێژی جەماعەت دەکەوێ کە دانیشتوان دەیکەن، ئایا دووڕکاتەکە کیفایەتە یان وەکوو ئەوان نوێژەکەی بەتەواوی بکا؟

---

[1] صحيح: (ص.د/٥٣٨) ، د(٥٧١/٢٨٣/٢)، ت(٢١٩/١٤٠/١)، ن(٢/١١٢).

[2] صحيح (الارناؤوط في تحقيق جامع الاصول ٧٠٨/٥) مصنف عبدالرزاق/٤٣٦٩.

[3] صحيح (الإرواء/٥٧١)، (٦٨٨/٤٧٩/١)، ن(٣/١١٩).

لە وەڵامدا ئیبنو عومەر زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی: وەکوو ئەوان دەبێ نوێژ بکا، نابێ بە قەصر بیکا.[(١)]

## ئیمام بەدانیشتنەوە نوێژبکا دەبێ مەئمومی‌یەکانیشی بەدانیشتنەوە نوێژی لەگەڵ بکەن

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵەوە نوێژی کرد نەخۆش بوو، نەیتوانی بەپێوە بوەستێ بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، کۆمەڵێك خەڵك لەدواوەی بەپێوە نوێژیان کرد، ئاماژەی بۆکردن کە ئەوانیش دانیشتن وەکوو ئەو نوێژەکەیان بکەن. جا کە سلاوی دایەوە فەرمووی: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا ، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا ، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا».[(٢)] ئیمام بۆ ئەوەیە چاوی لێ بکرێو پەیڕەوی بکرێ، جا کەئەو چووە ڕوکوع ئێوەش بچنە ڕوکوع کە هەڵسایەوە ئێوەش هەڵسنەوە، ئەگەر ئیمام نەیتوانی بەپێوە ڕابوەستێو بەدانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش وەکوو ئەو بەدانیشتنەوە نوێژبکەن.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەسپێك کەوتە خوارەوە لای ڕاستی ڕوشا بڕێکی پێستی جەستەی داماڵدرا، چووینە خزمەتی بۆ ئەحواڵ پرسی، کاتی نوێژهات، پێشنوێژی بەدانیشتنەوە بۆ کردین ئێمەیش لەدواوەیەوە بەدانیشتنەوە نوێژمان کرد، جا کەنوێژ تەواو بوو فەرمووی: « إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا رَبَّنَا

---

(١) صحيح الإسناد (الإرواء/٢٢) هق (٣/١٥٧).

(٢) متفق عليه: خ(٦٨٨/٢/١٧٣)، م(٤١٢/١/٣٠٩)، د(٥٩١/٢/٣١٥).

وَلَكَ الْحَمْدُ. وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعُونَ».[1] ئیمام بۆ ئەوەیە چاوی لێ بکرێ، کە (الله اکبر)ی کرد (الله اکبر) بکەن، کەچووە سوژدە بچنە سوژدە؛ کەوتی: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»، ئێوە بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەیش هەمووتان بەدانیشتنەوە نوێژبکەن.

## ئەگەر لەگەڵ ئیمامدا یەك مەئموم هەبوو دەبێ لەلای راستی ئیمامو لەرێکی ئەو بوەستێ

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: شەو لەماڵی پورە مەیمونەم مامەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی عیشای کرد، پاشان چوار رکاتی کردن، ئەمجار نووست، پاشان هەڵسا بۆ نوێژ منیش چوومە لای چەپی، خستمیە لای راستی خۆی.[2]

## ئەگەر مەئموم دوو یان زیاتر بوون ئەوە لەدوا ئیمامەوە ریز دەبەستن

لەجابیرەوە هاتووە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا بۆ نوێژ، منیش هاتم لەلای چەپیەوە وەستام، تەشریفی دەستی گرتم خستمیە لای راستی خۆیەوە، پاشان جەباری کوڕی صەخر هات لەلای چەپی پێغەمبەرەوە وەستا، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوکمانی ریزکردو لەدوا خۆیەوە رایوەستاندین.[3]

---

[1] کەمێك لەوەپێش تەخریج کرا.

[2] صحیح: (الإرواء:٥٤٠)، (ص.جة/٧٩٢)، خ(٦٩٧/٢/١٩٠) وهذا لفظه م(٧٦٣/١/٥٢٥)، د(٥٩٦/٢/٣١٨)، ت(٢٣٢/١/١٤٧)، ن(٢/١٠٤)، جة(٩٧٣/١/٣١٢).

[3] صحیح: (الإرواء/٥٤٠)، د(٥٩٥/٢/٣١٨)، جة(٩٧٥/١/٣١٢).

## ئەگەر مەئموم ئافرەت بوو دەبێ لەدوا ئیمامەوە بوەستێ

لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشنوێژی بۆ ئەوو دایکی، یان پوری کرد، دەڵێ: منی خستە لای ڕاستی خۆی‌و ئافرەتەکەشی خستە دواوە.[1]

## پێویستە ڕیزی نوێژکەران ڕێك‌و پێك بکرێن

پێویستە ئیمام نوێژ دانەبەستێ هەتا بەباشی ڕیزی نوێژکەرانی دواوەی ڕێك دەخا، فەرمانیان پێ بکا بەڕێك ڕاوەستن‌و پاڵ لێکدان. ئیمام یان بۆ خۆی ئەم ڕێکخستنە بکا، یان یەکێك ڕابسپێرێ ئەو ئەرکە ئەنجامبدا.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلاَةِ».[2] ڕیزەکانتان ڕێك بخەن‌و ڕاست ڕابوەستن‌و پاڵ لێکدەن، بێگومان ڕێکخستنی ڕیزەکانتان تەواوکەری نوێژە.

لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): کەخۆمان ڕێك دەخست بۆ نوێژ دەستی موبارەکی بە شانەکانماندا دەهێناو دەیفەرموو: «اسْتَوُوا وَلاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ»[3]: ڕێك ڕابوەستن‌و خواروخێچ مەوەستن ئەگەر وانەکەن دڵەکانتان وەگری یەکتر نابن!

لە نوعمانی کوڕی بەشیرە هاتووە، دەڵێ: پێغەمبەر ڕیزەکانی ڕێك دەخستین وەکوو چۆن لاسکە تیری بێپەڕ ڕیزبکرێ ئاوا هەتا دڵنیابوو لەوەی ئێمە ڕاهاتووین، پاشان ڕۆژێك تەشریفی بەرەو قیبلە وەستا، خەریکبوو نوێژ

---

[1] متفق عليه: خ(٧٢٧) م(٦٦٠)، د(٣/٤/٧٧٦)، ن(٢/١٠٢).

[2] متفق عليه: م(١/٣٢٤/٤٣٣) وهذا لفظه خ(٢/٢٠٩/٧٢٣)، د(٢/٣٦٧/٦٥٤)، جة(١/٣١٧/٩٩٣).

[3] صحيح: (ص.ج/٩٦١) ، م(١/٣٢٣/٤٣٢).

دابه‌ستێ، پیاوێكی بینی له‌ریزی نوێژكه‌راندا سینگی پێش كه‌وتووه، فه‌رمووی: «عِبَادَ اللَّهِ لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ».[1] ریزه‌كانتان رێك ده‌خه‌ن‌و پاڵ لێك ده‌ده‌ن، یان خودا روتان له‌یه‌كتر وه‌رده‌گێڕێ‌و لێكتان دڕدۆم ده‌كا.

له ئیبنو عومه‌ره‌وه گێڕدراوه‌ته‌وه كه پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رموویه‌تی: «أَقِيمُوا الصُّفُوفَ وَحَاذُوا بَيْنَ الْمَنَاكِبِ وَسُدُّوا الْخَلَلَ وَلِينُوا بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ وَلاَ تَذَرُوا فُرُجَاتٍ لِلشَّيْطَانِ وَمَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ اللَّهُ وَمَنْ قَطَعَ صَفًّا قَطَعَهُ اللَّهُ».[2]: ریزه‌كانتان رێك بخه‌ن، شانتان لێك بده‌ن، بۆشایی ریزه‌كان پڕبكه‌نه‌وه، نه‌رمی‌و گوێڕادێری بنوێنن به‌ده‌ست براكانتان كه‌داوایان لێ كردن بچنه پێشه‌وه یان بێنه دواوه بۆ رێكخستنی ریزه‌كانی نوێژ، كه‌لێن مه‌هێڵنه‌وه بۆ شه‌یتان خۆتان له‌گه‌ڵ تێهه‌ڵكیش بكا، كه‌سێك ریزێك بێكه‌وه بلكێنێ خودا په‌یوه‌ستی ده‌كا به ره‌حمه‌تی خۆیه‌وه، كه‌سێك كه‌لێن بخاته نێوان ریزی نوێژه‌وه خودا له‌ره‌حمه‌تی خۆی دایده‌بڕێ.

له ئه‌نه‌سه‌وه ریوایه‌تكراوه: كه پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رموویه‌تی: « رُصُّوا صُفُوفَكُمْ وَقَارِبُوا بَيْنَهَا وَحَاذُوا بِالأَعْنَاقِ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لأَرَى الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ مِنْ خَلَلِ الصَّفِّ كَأَنَّهَا الْحَذَفُ».[3] ریزه‌كانتان رێك بخه‌ن‌و نێوان صه‌فه‌كان ته‌سك بكه‌نه‌وه سه‌رو ملتان رێك رابگرن، سوێندم به‌وكه‌سه‌ی گیانی منی به‌ده‌سته، من شه‌یتان ده‌بینم خۆ ده‌خاته بۆشایی نێوان ریزه‌كانتان هه‌ر ده‌ڵێ به‌رخۆله‌ی ره‌شه.

---

[1] صحيح: (ص.ج/٣٩٧٢) ، م(٤٣٦-١٢٨/٣٢٤/١)، د(٦٤٩/٣٦٣/٢).

[2] صحيح: (ص.د/٦٢٠) ، د(٦٥٢/٣٦٥/٢).

[3] متفق عليه: م(٤٣٣/٣٢٤/١) وهذا لفظه، خ(٧٢٣/٢٠٩/٢)، د(٦٥٤/٣٦٧/٢)، جة(٩٩٣/٣١٧/١).

## ڕیزی نوێژكەران چۆن ڕێك دەخرێ؟

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي».[1] ڕیزەكانتان ڕێك بخەنو ڕاست ڕاوەستنو پاڵ لێك بدەن من لەدوا خۆمەوە دەتانبینم. جا ئەنەس دەڵێ: هەریەكێ لەئێمە شانی دەلكان بەشانی هاوەڵەكەیەوەو قاچی بەقاچی هاوەڵەكەیەوە دەنووساند.

## ڕیزی پیاوانو ڕیزی ئافرەتان

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا وَشَرُّهَا آخِرُهَا وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا». باشترین ڕیزی پیاوان لەنوێژدا ڕیزی یەكەمەو خراپترینیشیان ڕیزی دواوەیە، باشترین ڕیزی ئافرەتان لەنوێژدا ڕیزی كۆتاییانە، خراپترینیشیان ڕیزی پێشەوەیانە.

## گەورەیی‌و خێری زۆری ڕیزی یەكەم‌و لای ڕاستی ئیمام

لە (البراء)ی كوڕی عازب ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصُّفُوفَ الأُوَلِ».[2] بێگومان پەروەردگارو فریشتەكانی صەلاوات لەسەر ئەوانە دەدەن كە لەنوێژدا لەڕیزەكانی پێشەوەن.

هەر لەئەوەوە، هاتووە، دەڵێ: ئێمە كە لەدوا پێغەمبەرەوە نوێژمان دەكرد پێمان خۆش بوو لەلای ڕاستییەوە ڕیزببین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەوی خۆی ڕومان بۆلا وەرگێڕێ. دەڵێ: گوێم لێ بوو

---

[1] صحيح: (مختصر خ/٣٩٣)، خ(٢/٢١١/٧٢٥).

[2] صحيح: (ص.د/٦١٨) ، د(٢/٣٦٤/٦٥٠)، ن(٢/٩٠).

دەیفەرموو: «رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ». خودایە لەسزای خۆت بمپارێزە لەرۆژی زیندوبوونەوەدا.

## دەبێ کێ لەپاش ئیمامەوە بێ؟

لە ئیبنو مەسعوودی ئەلئەنصارییەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»[1]: با لەدوا منەوە پیاوە عاقڵو ریش سپییەکانتان ریزببن، پاشان ئەوانەی لەوان کەم تەمەنترن ریز ببەستن، پاشان ئەوانەی لەوان گەنج ترن.

## ریزبوون بۆ نوێژ لەنێوان کۆڵەکەو پایەدا مەکروهە

لە موعاوییەی کوڕی قوررە لە باوکییەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێ: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیمان لێ دەکرا، کە لەناو کۆڵەکەو پایەدا ریزببین بۆ نوێژ.

ئەم حاڵەتە – ریزبوون لەنێوان کۆڵەکەو پایەدا - نەی لێ کراوە بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، بەڵام بەنیسبەت نوێژی بەتەنیاوە چ کەراهەتێك نیە ئەگەر لەنێوان دوو کۆڵەکەدا بکرێ بەمەرجێك کابرای نوێژکەر سوترەیەك بۆ خۆی دابنێ.

لەئیبنو عومەرەوە هاتووە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ناو کابەوە ئوسامەی کوڕی زەیدو عوسمانو طەلحەو بیلال لەخزمەتیا بوون، تاوێ مایەوە، پاشان چووەدەر، من یەکەم کەس بووم

---

[1] صحيح: (ص.د/٦٢٦)، م(٤٣٢/٣٢٣/١)، د(٦٦٠/٣٧١/١)، جة(٩٧٦/٣١٢/١) وعنده الصفوف المتقدمة.

کەچووەمە ژوورەوە دوای هاتنــە دەرەوەی پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بێ). بەبیلال گەیشتمو لێیم پرسـی پێغەمبــەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەکوێ نوێژی کرد؟! وتی لەنێوان ئەو دوو کۆڵەکانەی پێشەوە.[1]

## بیانوی نەچوون بۆ نوێژی جەماعەت

١-٢: سـەرماو بـاران: لـە نافیعـەوە ڕیوایـەتکراوە، کـەوا ڕێکـەوت شـەوێك ئیبنـو عومــەر بـانگی دا بـۆ نوێـژ، شـەوەکە زۆر ساردو ڕەشـەبا بـوو، پاشـان فەرمووی: خەڵکینە! هەرکەسەتان لەناو ماڵو هۆبـەی خـۆی نوێـژبکا مەیـەن بۆ جەماعەت، پاشان وتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە بانگدەر دەکـرد: کـە شـەو بـارانو ساردو سـەرما بووایـە کـە بـە موسـوڵمانان ڕابگەیەنێ: کە لەناو ماڵو هۆبەی خۆتان نوێژ بکەن.[2]

٣- ئامــادەبوونی خــواردن: لــە ئیبنــو عومــەرەوە ڕیوایــەتکراوە، دەڵــێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: «إِذَا وُضِـعَ عَـشَاءُ أَحَـدِكُمْ وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَابْـدَءُوا بِالْعَـشَاءِ ، وَلاَ يَعْجَـلْ حَتَّـى يَفْـرُغَ مِنْـهُ». ئەگـەر شێوو خـواردن بـۆ یـەکێك لـەئێوە دانـراو قامـەت بـۆ نوێـژکرا، ئێـوە دەست بکـەن بـەخواردنی شـیوەکەو پەلـە لـەکردنی نوێژەکـە مەکـەن تـا لەخواردنەکـە دەبنەوە. ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بـێ) خـواردنی بـۆ دادەنـراو قامـەتی نوێژ دەکرا، تا لەخواردنەکە نەبوایەتەوە نەدەهات بـۆ جەماعـەت، لەودەمـەدا کە سەرگەرمی نانخواردن بوو گوێی لەفاتیحەی ئیمام بوو.[3]

---

[1] صحيح: (مختصر.خ.ص/١٣٩)، خ(١/٥٧٨/٥٠٤).

[2] متفق عليه: خ(٦٦٦/٢/١٥٦)، م(٦٩٧/١/٤٨٤)، د(١٠٥٠/٣/٣٩١)، ن(٢/١٥).

[3] متفق عليه: (٦٧٣/٢/١٥٩)، م (٥٥٩/١/٣٩٢) بدون الجملة الآخيرة. د (٣٧٣٩/٢٢٩/١٠).

٤- تەنگەتاوی پیسایی‌و میز، لەخاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: « لاَ يُصَلِّي أَحَدُكُمْ وَهُوَ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ وَلاَ وَهُوَ يُدَافِعُ الأَخْبَثَيْنِ ».[1] ئەگەر خواردن دانرا تا خواردنەکە نۆش نەکەن نوێژ ناکرێ، هەروەها کەسێك تەنگەتاو بوو بەپیسایی‌و میز نابێ نوێژ بکا تا خۆی لەو تەنگەتاوییە ڕزگار دەکاو دەستنوێژ دەشۆرێ.

## نوێژی سەفەری

کورتکردنەوەی نوێژ لەسەر موسافیر پێویستە لەنوێژی نیوەڕۆو عەصرو خەوتناندا. قورئان دەفەرموێ: {وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ – النساء/١٠١}.

لە یەعلای کوڕی ئومەییە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیارم لە عومەری کوڕی خەطاب کرد دەربارەی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ}. خۆ ئێستا موسوڵمانان ترسیان نەماوەو دونیا ئەمینە، عومەر فەرمووی: بەخوا منیش سەرم سوڕماوە لەوەی تۆ سەرت لێ سوڕماوە. بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد فەرمووی: «صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ».[2] ئەوە صەدەقەو بەخششێکە خودا پێی داون ئەو دیاری‌و بەخششەی پەروەردگارتان قبوڵ بکەن.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: فەرموویەتی: (خودا لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکەتان لەکاتی حازربوونتان لەماڵو حاڵی خۆتان چوار

---

[1] صحيح: (ص. ج/٣٧٦٢)، م (١/٣٩٣/٥٦٠)، د (١/١٦٠/٨٩).

[2] صحيح: (ص. جه/٨٧٦)، م (١/٤٧٩/٦٨٧)، د (٤/١٢٤/١٢٣٤)، ن (٣/١١٨)، جه (١/١٠٦٨/٣٣٩) بدون الجملة الآخيرة.

ڕکات نوێـژی لەسـەر فـەرز کـردوون، لەسەفەریـشدا دوو ڕکـاتو لـەکاتی تـرس لەدوژمن یەك ڕکات)[١]

لە ئیمامی عومەرەوە گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: (نوێـژ لەسـەفەردا دوو ڕکاتە، نووێژی هەینی دوو ڕکاتە، نوێـژی جـەژنی ڕەمـەزانو جـەژنی قوربـان دوو ڕکـاتن، تـەواو بـی کـورت کردنـەوەن، ئەمـەش لەسـەر زوبـانی حـەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ)[٢]

لەخاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە فەرموویەتی: (نوێژ کە سەرەتا فەرز کرا دوو ڕکـات بـوو، لەسـەفەردا نوێـژ وەکـوو خـۆی مایـەوەو نوێـژی حـەضـەر تەواوکرا)

لـە ئیبنـو عومـەرەوە ریوایـەتکراوە دەفـەرموێ: لەخزمـەت پێغەمبـەردا بـووم لەسـەفەرێکدا، نەمـدی زیـاد لـەدوو ڕکـات بکـا هـەتا لـەدونیا دەرچـوو، لەخزمــەت ئەبوبــەکردا بــووم لەســەفەردا، لــەدوو ڕکــات زیــاتری نــەکرد، لەخزمــەت عومــەردا بــووم لەســەفەردا لــەدوو ڕکــات زیــاتری نــەکردووە، لەخزمـەت عوسمانـدا بـووم لەسـەفەردا نەمـدی لـەدوو ڕکـات زیـاتر بکـا، تـا لەدونیا دەرچوو. پەروەردگار فەرموویەتی: {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ – الأحزاب/٢١}.[٣]

---

[١] صحيح: (ص. جه/٨٧٦)، م (١/٤٧٩/٦٨٧)، د (٤/١٢٤/١٢٣٤)، ن (٣/١١٨)، جه (٣٣٩/١) بدون الجملة الآخيرة.

[٢] صحيح: (ص. جه/٨٧١) ن (٣/١٨٣)، جه (١/٣٣٨/١٠٦٣).

[٣] متفق عليه: م (١/٤٧٩/٦٨٩)، د (٤/٩٠/١٢١١)، خ (٢/٥٧٧/١١٠٢)، ن (٣/١٢٣).

## مەسافەی قەصر

زانایـانی شـەرع کەوتوونـە راجیاییـەوە دەربـارەی ئـەو مەسـافەیەی کـە دەبێتـە هۆکـاری کـورت کردنـەوەی نوێـژو زۆریـان مـشتومڕ لەسـەر هەیـە، تەنانەت ئیبنولمونذیرو کەسانی تریش لـەم مەسـەلەیەدا بیـست جـۆر رەئیـان گێڕاوەتـەوە، راسـترین راو صـەریحترین حـەدیـث کـە لـەم بارەیـەوە هاتبـێ - وەکــوو ئیبنــو حەجــەر لــە فەتحولباریــدا - ج/٢/٥٦٢ - دەڵــێ: ئــەو فەرموودەیەیـە کـە موسـلیمو ئـەبو داوود لەحـەدیثـی ئەنەسـدا ریوایـەتیان کردووە، کەتیایدا هاتووە دەفەرموێ: (پێغەمبەری خـودا کەسـەفەری بکردایـە سێ میل، یان سـێ فرسـەخ لـەماڵ دوور بکەوتایـەوە نوێـژی کـورت دەکـردەوە، لەجیاتی چوار ڕکات دوو ڕکاتی بەجێ دێنا)[1]

## ئەو جێگەیەی نوێژی لێ کورت دەکرێتەوە

زۆربەی زانایانی ئیسلام پێیان وایە: کـە موسـافیر بەدەرچـوون لەسـنورو ئاوەدانی گوندو شارەکەی، بۆی هەیـە نوێـژ کـورت بکاتـەوە، ئـەم تێپەڕبوونـە لەسـنورو ئـاوەدانی قـەراخ شـارو گونـد مەرجـە، سەفەرەکەشـی کۆتـایی نایـە تانەگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆیو نەگاتەوە بە یەکەم خانووی شوێنەکەی.

ئیبنولـمونزیر دەڵـێ: مـن نـەمزانیوەو نەمـدیوە: کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەســەر بــێ) لــەهیچ ســەفەرێکدا لەســەفەرەکانی‌دا تــا لەمەدینــە دەرنەچووبێ نوێژی کورت کردبێتەوە.

ئەنـەس دەفـەرموێ: نوێـژی نیـوەڕۆم لەمەدینـە لەخزمـەت پێغەمبـەردا بەچوار ڕکاتی کرد، لە ذیلحولەیفە لە خزمەتی‌دا عەصر دوو ڕکاتم کردن.

---

[1] فقــه الــسنة: (١/٢٤١/٢٤٠) وقــول أنــس رواه خ (٢/٥٦٩/١٠٨٩)، م (١/٤٨٠/٦٩٠)، د (٤/٦٩/١١٩٠)، ت (٢/٢٩/٥٤٤)، ن (١/٢٣٥).

★ موسافیر ئەگەر لەشوێنێك مایەوەو بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستی خۆیو نیازی مانەوەی نەبوو، دەتوانێ ماوەی مانەوەکەشی هەر نوێژ کورت بکاتەوە تا لەو شوێنە دەردەچێ، کە دەریش چوو هەروا تا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ.

لەجابیرەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەتەبوك بیست ڕۆژ مایەوەو نوێژیشی کورت کردنەوە[1]

ئیبنولقەیم: دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیفەرمووە ئەگەر زیاد لەبیست ڕۆژ مانەوە نوێژ کورت مەکەنەوە، وەڵێ واڕێکەوتووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو ماوەیە لەو شوێنە ماوەتەوە، ئەم ماوە مانەوەیەی لەحاڵی سەفەردا لەحوکمی سەفەری نایباتەدەر - جا مانەوەکە درێژ بێ یان کورت بێ – بەمەرجێ ئەو شوێنە نیشتیمانی ئەو نەبێو نیەتی مانەوەشی لەوشوێنە نەبێ.[2]

ئەگەر نیازی مانەوەی هەبوو دوای نۆزدە ڕۆژ دەبێ نوێژەکانی بەتەواوی بکا، وەکوو ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نۆزدە ڕۆژ مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە، ئێمەیش کەسەفەرمان دەکرد تا نۆزدە ڕۆژ هەر نوێژمان بەکورتکراوەی دەکرد، کە سەفەرەکەمان لەوە تێپەڕ بوایە بەتەواوی دەمانکردن[3]

---

[1] صحيح: (ص. د/١٠٩٤)، د (٤/١٠٢/١٢٢٣).

[2] زادالمعاد ٣/٥٦١.

[3] (الإرواء/٥٧٥)، خ (٢/٥٦١/١٠٨٠)، ت (٢/٣١/٥٤٧)، جـه (١/٣٤١/١٠٧٥)، د (١٢١٨/٩٧/٤) ألا إنـه قال سبع عشرة.

## کۆکردنەوەی دوو نوێژ

## هۆکاری کۆکردنەوەی دوو نوێژ

١- سەفەرکردن: لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا ئەگەر پێش ئەوەی خۆرلەناوەڕاستی ئاسمان لای بدایە بکەوتایە ڕێ، ئەوە نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست بۆ کاتی نوێژی عەصرو لەگەڵ ئەو نوێژە نوێژی نیوەڕۆی دەکرد. ئەگەر دوای خۆرلادان بیویستایە بکەوێتە ڕێ ئەوە پێش ئەوەی بکەوێتە ڕێ ئەوە نوێژی نیوەڕۆی دەکردو عەصریشی دەهێنایە گەڵ نیوەڕۆو ئەمجار دەکەوتە ڕێ.[1]

لە موعاذەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەغەزای تەبوکدا ئەگەر بکەوتایە ڕێ پێش ئەوەی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لابدا نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست تا لەگەڵ نوێژی عەصر بەیەکەوە کۆیان بکاتەوە بەجێیان بێنێ، ئەگەر دوای لادانی خۆر بکەوتایە ڕێ ئەوە نوێژی عەصری دەهێنایە گەڵ نیوەڕۆو هەردووکی بەجێ دێنان ئەمجار تەشریفی دەکەوتە ڕێ. هەروا ئەگەر پێش نوێژی شێوان بکەوتایە ڕێ نوێژی شێوانی دوادەخست بۆ کاتی نوێژی خەوتنان بەیەکەوە بەجێی دێنان، ئەگەر دوای مەغریب بکەوتایە ڕێ، نوێژی خەوتنانی دێنایە گەڵ شێوانو بەیەکەوە ئەنجامی دەدان.[2]

هەروا لەموعاذەوە هاتووە دەڵێ: ئێمەی هاوەڵان لەساڵی غەزای تەبوکدا لەخزمەت پێغەمبەردا دەرچوین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو سەفەرەدا نوێژی نیوەڕۆو نوێژی عەصری بەیەکەوە دەکرد، نوێژی شێوانو

---

[1] متفق عليه: خ (٢/٥٨٣/١١١٢)، م (١/٤٨٩/٧٠٤)، د (٤/٥٨/١٢٠٦)، ن (١/٢٨٤).

[2] صحيح: (ص. د/١٠٦٧)، حم (٥/١٢٠/١٢٣٦)، د (٤/٧٥/١١٩٦)، ت (٢/٣٣/٥٥١).

خەوتنانی بەیەکەوە بەجی دێنا، جا موعاز دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژێك نوێژی نیوەڕۆی دواخست، پاشان هاتە دەرو نوێژی نیوەڕۆو عەصری بەیەکەوە کرد، پاشان چووە ژوورەوە، ئەمجار هاتە دەرو نوێژی شێوان‌و خەوتنانی بەیەکەوە ئەنجامدا.[1]

٢- باران: لەنافیعەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) هەرکاتێ فەرمانڕەواو ئەمیرەکان بەهۆی بارانەوە نوێژی شێوان‌و خەوتنانیان کۆبکردایەوە ئەویش لەگەڵ ئەواندا کۆی دەکردنەوە.

لەهیشامی کوڕی عوروەوە هاتووە: کە عوروەی باوکی‌و سەعیدی کوڕی (المسیب)و ئەبو بەکری کوڕی (عبدالرحمن)ی کوڕی (الحارث)ی کوڕی هیشامی (المغیره)ی (المغزومی) لەشەوی باراناویدا نوێژی شێوان‌و خەوتنانیان کۆدەکردەوەو بەیەکەوە ئەنجامیان دەداو بەلایانەوە شتێکی ئاسایی بوو.

لە موسای کوڕی عوقبەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە عومەری کوڕی عبدالعزیز لەکاتی باراندا نوێژی شێوان‌و خەوتنانی بەیەکەوە دەکردن، هەروا لەسەعیدی کوڕی (المسیب)و عوروەی کوڕی (الزبیر)و ئەبو بەکری کوڕی (عبدالرحمن)و پیرو زانای ئەو ڕۆژگارە نوێژیان لەگەڵ ئەوانەدا دەکرد کە بەهۆی بارانەوە نوێژی مەغریب‌و عیشایان کۆدەکردەوەو هیچ ڕەدێکیان نەدەدانەوە.[2]

لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی نیوەڕۆو عەصری بەیەکەوە دەکرد، نوێژی شێوان‌و

---

[1] صحیح: (ص. د/١٠٦٥)، د (٤/٧٢/١١٩٤)، ن (١/٢٨٤)، م (١/٤٩٠/٧٠٦)، جه (١/٣٤٠/١٠٧٠).

[2] صحیح: (الإرواء: ٣/٤٠)، هق (٣/١٦٩/١٦٨).

خەوتنانیشی بەیەکەوە بەجێ دەهێنا، نەهۆکاری ترس هەبوو، نەهۆکاری باران.[١]

هەر لەوەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی نیوەڕۆو عەصری بەیەکەوە بەجێ هێناو نوێژی مەغریبو عیشای بەیەکەوە کرد، لەمەدینەشدا بوو، نە ترس هەبوو نەباران.[٢]

ئەم ڕیوایەتە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە کۆکردنەوەی نوێژ بەهۆی بارانەوە لەسەردەمی پێغەمبەردا زانراوو باوبووە، ئەگەر وانەبووبێ چ فائیدەو سودێك نابیندرێ بۆ دەستەواژەی نەبوونی باران وەکوو هۆکارێکی باوو زانراو بۆ کۆکردنەوەی نوێژ.[٣]

٣- پەیدابوونی پێداویستی جیاجیا کەدێنە پێش.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا لەمەدینە نوێژی نیوەڕۆو نوێژی عەصری بەیەکەوە کرد، نوێژی شێوانو خەوتنانیشی بەیەکەوە ئەنجامدا نەبیانوی ترس نەبیانوی سەفەری هەبوو. ئەبو زوبەیر دەڵێ: پرسیارم لەسەعید کرد، پێغەمبەر بۆچی ئاوای کرد، لەوەڵامدا وتی منیش وەکوو چۆن پرسیارت لەمن کرد ئاوا هەمان پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد، لەوەڵامدا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستوویەتی ئوممەتەکەی نەخاتە حاڵەتی حەرەجو بەرتەسککردنەوە.[٤]

هەر لە ئەوەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مەدینەدا بەبێ ئەوەی بیانووی باران بارین یان سەفەری

---

[١] صحيح: (ص. ج/١٠٦٨).

[٢] صحيح: (ص. ج/١٠٧٠)، م (١/٤٨٩/٧٠٥)، ن (١/٢٩٠)، د (٤/٧٧/١١٩٨).

[٣] الإرواء: ٣/٤٠.

[٤] م (٧٠٥).

هەبێ نوێژی نیوەڕۆو نوێژی عەصری بەیەکەوە کۆکردەوە، نوێژی شێوان‌و خەوتنانیشی بەیەکەوە کۆکردەوە، پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد ئاخۆ پێغەمبەر بەم کارەی مەبەستی چی بوو؟ لەوەڵامدا فەرمووی: ویستوویەتی ئیحراجی ئوممەتەکەی نەکا.[1]

ئیمامی نەوەوی[2] دەفەرموێ: کۆمەڵێك لەزانایانی شەرع پێیان وایە دروستە دانیشتووی شارو گوند لەبەر پێویستی جارجار نوێژی نیوەڕۆو عەصر بەیەکەوە بکا، نوێژی شێوان‌و خەوتنان بەیەکەوە بکا بەمەرجێ نەیکاتە عادەت، ئەمە رای ئیبنو سیرین‌و ئەشهەبە کەهاوڕێی ئیمام مالیك بووە، هەروا (الخطابی) لە (القفال)و (الشاشی) گەورە: کەهاوەڵانی شافیعی بوون گێڕاویەتەوە ئەوانیش لە ئەبو ئیسحاقی (المروزی)و ئەویش لەکۆمەڵێك لەهاوەڵانی فەرموودە ناس ریوایەتی کردووە، ئیبنو (المنذر) ئەم رایەی پەسەند کردووە، ظاهیری قسەکەی ئیبنو عەبباسیش پشتگیری دەکا کە دەفەرموێ: (أَرَادَ أَنْ لاَ يُحْرِجَ أَحَدًا مِنْ أُمَّتِهِ). هیچ بیانوو پاساوی تری وەکوو نەخۆشی‌و شتی وای نەهێنایەوە. (والله أعلم)

## نوێژی هەینی (الجمعة)

ئامادەبوون بۆ نوێژی هەینی فەرزی عەینە لەسەر هەموو موسوڵمانێك جگە لەپێنج کەس: کۆیلە، ئافرەت، منداڵ، نەخۆش، موسافیر.

پەروەردگار دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ – الجمعة/٩}. ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان هەیە بەتاك‌و تەنهایی خوداو راستی

---

[1] حم (١٩٥٤).

[2] شرح مسلم ج/٢١٩/٥.

پەیامی پێغەمبەر، کەبانگ درا بۆ نوێژی هەینی پەلە بکەن بۆ ئەنجامدانیو رابن بۆ شوێنی نوێژی هەینیو واز لەمامەڵەو کڕینو فرۆشتنو کاروکاسبی بهێنن، ئەگەر بزانن ئەوە بۆ ئێوە باشو بەسودەو ئەرکی سەرشانتانە بەجێی بهێنن.

لەطاریقی کوڕی شیهابەوە لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتکراوە: کە فەرموویەتی: «الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلاَّ أَرْبَعَةً عَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَوِ امْرَأَةٌ أَوْ صَبِيٌّ أَوْ مَرِيضٌ».[1] نوێژی هەینی واجبو پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێكو دەبێ بەجەماعەت بیکا، جگە لەچوار جۆر ئادەمیزاد: کۆیلە، ئافرەت، منداڵ، نەخۆش.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لَيْسَ عَلَى الْمُسَافِرِ جُمُعَةٌ».[2] مرۆڤی موسافیر نوێژی هەینی لەسەر واجب نیە.

## هەڵنان بۆ بەجێ هێنانی نوێژی هەینی

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « مَنِ اغْتَسَلَ ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَصَلَّى مَا قُدِّرَ لَهُ ثُمَّ أَنْصَتَ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ خُطْبَتِهِ ثُمَّ يُصَلِّيَ مَعَهُ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى وَفَضْلَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ».[3] کەسێك غوسڵ بکا پاشان لەماڵ دەربچێ بۆ ئەنجامدانی نوێژی هەینی، ئەوەندەی بۆ کرا نوێژی سوننەت بکا، پاشان بەبێ دەنگی دانیشت تا وتار خوێن لەوتارەکەی دەبێتەوە، ئەمجار نوێژی لەگەڵ بکا لەتاوانی نێوان

---

[1] صحيح: (ص/٩٤٢)، (ص. ج/٢١١١)، د (١٠٥٤/٣٩٤/٣)، قط (٢/٣/٢)، هق (٣/١٧٢).

[2] قط (٢/٤/٤).

[3] صحيح: (ص. ج/٦٠٦٢)، م (٢/٥٨٧/٨٥٧).

ئەو هەینییەو هەینییەکی تر لێخۆشبوونی بۆ دەستەبەر دەبێ‌و لەتاوانی سێ ڕۆژ زیادەشی.

هەر لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ).[1] پارێزگاری کردنی پێنج نوێژە فەرزەکان‌و ئەنجامدانی جومعە بۆ جومعەو ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، دەبنە کەفارەت بۆ تاوانی نێوانیان بەمەرجێ خۆپارێزی بکرێ لەتاوانی گەورە.

## ترساندن‌و هەڕەشەکردن لەکەمتەرخەمی کردن لەئەنجامدانی نوێژی هەینی

لە ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە کە ئەوان لە پێغەمبەریان ژنەوتووە کە لەسەر مینبەرەوە دەیفەرموو: «لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ».[2] بەتەئکید دەبی کەسانێك واز بێنن لەنەچوون بۆ چەند جومعەیەك‌و ئەو کەمتەرخەمییەی خۆیان بەکۆتا دێنن، یان خودا دڵیان مۆر دەکاو پاشان دەچنە پێڕی ئەوانەی غافڵ‌و بێ ئاگان.

لە عەبدوڵلاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەکەسانێکی فەرموو کە نەدەهاتن بۆ نوێژی هەینی «لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلاً يُصَلِّي بِالنَّاسِ ثُمَّ أُحَرِّقَ عَلَى رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الْجُمُعَةِ بُيُوتَهُمْ».[3]

---

[1] صحيح: (ص. ج/٥٤٨٠)، م (٢/٥٩١/٨٦٥)، ن (٣/٨٨).

[2] صحيح: (ص. ج/٣٨٧٥)، م (٢٣٣ – ١٦ – ١/٢٠٩)، ن (١/١٣٨/٢١٤) وليس فيه رمضان إلى رمضان.

[3] صحيح: (ص. ج/٥١٤٢)، م (١/٤٥٢/٦٥٢).

بێگومان بەتەمابووم فەرمان بکەم بەپیاوێك پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکا، پاشان بۆخۆم بگەڕێم {بەناو مەدینەدا} هەر کەسانێك ببینم نەهاتوون بۆ نوێژی هەینی خانووەکەیان بەسەردا بسوتێنم.

لە (أبو الجعد)ی (الضمری)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ تَرَكَ ثَلاَثَ جُمَعٍ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ». [1] کەسێك سێ نوێژی هەینی بەبێ عوزرو بیانوو نەکا، لەپێڕی دوو ڕواندا دەنوسرێ.

لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە هاتووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مَنْ تَرَكَ ثَلاَثَ الْجُمُعَاتِ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ كتب من المنافقين»: کەسێك بەبێ بیانووی ڕەوا سێ جومعە نەکا، ناوی لەپێڕی دووڕووان دەنووسرێ.

## کاتی بەجێهێنانی نوێژی هەینی

کاتی بەجێهێنانی نوێژی هەینی کاتی نوێژی نیوەڕۆیە، دروستە پێش ئەوکاتەش ئەنجام بدرێ، لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوکاتە نوێژی هەینی بەجێ دێنا: کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لای دەدا. [2]

لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە گێڕدراوەتەوە: کە پرسیاری لێ کرا، (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەی نوێژی هەینی دەکرد؟

---

[1] حسن صحيح: (ص/٩٢٣)، د (١٠٣٩/٣/٣٧٧)، ت (٢/٥/٤٩٨)، جه (١١٢٥/١/٣٥٧).

[2] (ص.د/٩٦٠)، خ(١٠٣٩/٢/٣٧٧)، د(١٠٧١/٣/٤٢٧)، ت(٢/٧/٥٠١).

فەرمووی: تەشریفی کاتێ نوێژی هەینی دەکرد: کە خۆر لای دەداو ئێمە حوشترەکانمان پیخ دەدان‌و دەمان حەساندنەوە).[١]

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژی هەینی بەڕاوەستانەوە وتاری دەخوێندەوە پاشان کەمێك دادەنیشت‌و ئەمجار هەڵدەستایەوە، وتی: وەکوو چۆن ئەمڕۆ پەیڕەو دەکرێ.

نوێژی هەینی واجب‌و پێویستە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەردەوام بووە لەسەر ئەنجامدانی‌و هەرگیز تەرکی نەکردووە، وێڕای ئەوەش: کە فەرموویەتی: «صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي».[٢] بڕوانن من چۆن نوێژ دەکەم ئێوەش ئاوا نوێژەکانتان بکەن.

## ڕێنومایی کردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی وتاری هەینی‌یەوە

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «إِنَّ طُولَ صَلاَةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ فَأَطِيلُوا الصَّلاَةَ وَاقْصُرُوا الْخُطْبَةَ وَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا». نیشانەی عاقڵ مەندی‌و تێگەیشتویی وتار بێژی هەینی ئەوەیە نوێژەکەی درێژبێ‌و وتارەکەی کورت. کەوابێ ئێوە نوێژەکە درێژ بکەنەوەو وتارەکە کورت، بێگومان وتاری وا هەیە سەرنج ڕاکێش‌و کاریگەرە هەست دەهەژێنێ‌و مرۆڤ سەرسام دەکا دەڵێی سیحرە.[٣]

---

[١] الإرواء (٥٩٧)، م(٨٥٨-٢٩/٥٨٨/٢).

[٢] صحيح (الإرواء/٢٦٢)، خ(٦٣١/١١١/٢).

[٣] صحيح: (ص.ج/٢١٠٠) ، (الإرواء/٦١٨)، م(٨٦٩/٥٩٤/٢).

لـەجابیری کـوڕی سـەمورەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: مـن لەخزمـەت پێغەمبـەردا نوێـژم کـردون، نوێـژی ڕێـك و پێـك و نـەکورت نەدرێـژ بـوون، وتارەکانیشی هەروابوو.[1]

له جابیری کوڕی عەبدوڵلاوه هاتووه: دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ): کـه وتـاری دەخوێنـدەوه چـاوی لێ سور دەبوونـەوه، دەنگی بـەرز دەکردەوه ڕقی هەڵدەسـتا، دەتگوت: ترسێنەری سوپایەو دەڵێ: هابەرەبـەیان یان ئێواره درەنگ وەخت پەلامار دەدرێن.[2]

پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) عـادەتی وابـوو لـه وتـاردانـیدا لەکاتی ناوهێنـانی خـودادا، لـەکاتی دوعـا کردنیـدا بـه ڤامکـه شادەی ئامـاژەی دەکرد، لەوتاردا ئەگەر بۆ باران بارین نەبوایه دەستی بەرز نەدەکردەوه.

لـه حوصـەینی کـوڕی (عبـدالرحمن)ەوه ڕیوایـەتکراوه، دەڵـێ: عومـارەی کـوڕی ڕوئەیبـه بیـسری کـوڕی مـەڕوانی بینـی لەسـەر مینبـەر دەسـتی بـەرزکردبوەوه، عومـاره وتـی: خـودا ئـەو دوو دەسـته بـشکێنێ کـەوا بەرزکراونـەوه! بێگومـان مـن پێغەمبـەرم دیـوه (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لەوەنده زیاتر: کە بەڤامکه شادەی ئاماژەی دەکرد هیچی ترم لێ نەدیوه.[3]

له ئەنەسەوه ڕیوایەتکراوه: که پیاوێك ڕۆژی هەینی لـەدەرگای مزگـەوت که بەرامبەر (دارالقضاء) بوو هاته ژورەوه، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەپێوه وتاری دەدا، ڕوی له پێغەمبەر کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خـودا! (درودی خـودای لەسـەر بـێ) مـاڵ و ئاژەڵمـان فـەوتا، ڤـات و ڤـڕی کەوتـه ناومانـەوەو بڕەسـتی لێ بڕیـوین، ڕێگـا چـارەمان نـەماوه، لـەخودا بپـاڕێوه

---

[1] صحيح: (ص.ن/٤١٨)، م(٢/٥٩١/٨٦٦)، ت(٢/٩/٥٠٥).

[2] صحيح: (ص.ج/٤٧١١) ، (الإرواء/٦١١)، م(٢/٥٩١/٨٦٧)

[3] م(١/٥٩٥/٨٧٤)، د(٤٥٢/١٠٩١ – ٣/٤٥٤)، ت(٢/١٤/٥١٤)، ن(٣/١٠٨).

بارانمان بۆ ببارێنێ. ئەنەس وتی: ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی بەرزکردنەوەو پاشان فەرمووی: «اللَّهُمَّ أَغِثْنَا ، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا ، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا». [١] سێجار فەرمووی: خودایە! بارانمان بۆ ببارێنە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی وتارداندا نە شمشێری بەدەستەوە دەگرت و نەهیچ شتێکی تر، بەڵکوو پێش ئەوەی مینبەر دروست بکا، خۆی بەسەر قەوسێك یان عەصایەكدا دەدا، نەبیستراوەو نەزاندراوە دوای ئەوەی مینبەری دروست کرد، بەشمشێرەوە یان بەقەوسەوە یان بەهەر شتێکی ترەوە چووبێتە سەر مینبەر. [٢]

## خوتبەی پێویستی (خطبة الحاجة)

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارو وەعزو وانەکانی بەم جۆرە خوتبەیەی کە بەناوی (خطبة الحاجة) ناوزەد کراوە – دەستی پێ دەکرد. ئەمەش دەقی ئەو خوطبەیەیە [٣]

«الْحَمْدُ لِلَّهِ أَوْ إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا ، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ». {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ – آل عمران/١٠٢}. {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللَّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا – النساء/١}

هەرکەسێك لەم وتارەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وردبێتەوە،

---

[١] متفق عليه: خ(١٠١٣/٥٠١/٢)، م(٨٩٧/٦١٢-٦١٤/٢)، د(١١٦٢/١١٦٣/٣٧-٣٩/٤).

[٢] زاد المعاد/٤٢٩/١.

[٣] صحيح: (ص.ن/١٣٣١) ، م(٨٦٧/٥٩٢/٢)، ن(١٨٨/٣).

هەروا سەرنج بداتە وتاری هاوەڵانی بۆی روون دەبێتەوە: کە وتاری لەم جۆرە رێنمویی موسوڵمانان بۆ رێگای هیدایەتو یەکتاپەرستیو رونکردنەوەی صیفاتەکانی خوداو بنەماکانی باوەڕ بەگشتیو بانگەوازیکردن بۆلای خوداو خوداپەرستیو باسی نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی پەروەردگار بەسەر بەندەکانیدا لەخۆ گرتووە. ئەو نیعمەتانەی خودا لای بەندەکانی خۆشەویست دەکا، هەروا ئاماژە کردنە بەو عەزابو روداوە گرنگانەی خودا بەسەر گەلە پێشینەکانیدا هێناوەو ترساندنە لەدوبارە بوونەومیانو فەرمانکردنە بە یادکردنی خوداو سوپاسو ستایش کردنی کەدەبنە هۆکاری دەستەبەر بوونی خۆشەویستی خودا بۆیان. ئیتر بەیادی گەورەیی پەروەردگارو صیفاتو ناوە جوانەکانی، کەدەبنە هۆی خۆشەویست بونیان لای خەڵكو فەرمانبەرداریان بۆ تاعەتکردنی خوداو سوپاسکردنی، وتارەکە کۆتایی دێو بیسەرانی دەگەڕێنەوە خۆشەویستی خودایان لا دروست بووەو خوداش خۆشی دەوێن.... پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وتارەکانیدا زۆر ئایەتی قورئانی دەهێنایەوە بەتایبەتی لەسورەتی (ق)[1]

دایکی هیشام کچی حاریثەی کوڕی نوعمان وتوویەتی: من سورەتی (ق)م هەر لەدەمی پێغەمبەرەوە لەبەرکردووە: کە عادەتی وابوو لەسەر مینبەر لە وتارداندا بەگوێرەی پێویست چەند ئایەتێکی لێ دەخوێندنەوە.

## لەکاتی وتار خوێندنەوەی خەتیبدا پێویستە بێدەنگ گوێ بگری هیچ قسەیەك نەکرێ

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَنْصِتْ. وَالإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ

---

[1] زاد المعاد: ١/١٥٤.

لَغَوْتَ». [1] ئەگەر رۆژی هەینی بەهاوەڵەکەت گوت بێدەنگ بە لەوکاتەشدا وتار خوێن وتاری دەدا بێگومان ئەوە تۆ لەغوت کردوە، چونە پێری ئەوانەوە کە بە لەغوەچی ناودەبرێن.

**بەچی تۆ بەجومعە رادەگەی؟!**

نوێژی هەینی دوو رکاتە بەجەماعەت دەکرێ، کەسێك فریای جەماعەت نەکەوت لەوانەی لەبنەڕەتدا نوێژی جومعەیان لەسەر نیە، یان بیانووی هەبوو بۆ نەکردنی، ئەوە نوێژی نیوەڕۆ بەتەواوی (چوار رکات) دەکات. کەسێك فریا رکاتێك کەوت لەگەڵ ئیمامدا ئەوە فریای جومعە کەوتووە. [2]

**نوێژی سوننەتی پێش نوێژی هەینی‌و دواوەی**

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، لە پێغەمبەرەوە: کە فەرموویەتی: «مَنِ اغْتَسَلَ يَومَ الْجُمُعَةَ ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَصَلَّى مَا قُدِّرَ لَهُ ثُمَّ أَنْصَتَ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ خُطْبَتِهِ ثُمَّ يُصَلِّيَ مَعَهُ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى وَفَضْلَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ»: کەسێك رۆژی هەینی خۆبشوا، پاشان بێ بۆ ئەنجامدانی نوێژی هەینی، ئەوەندێکی بۆی بلوێ نوێژی سوننەت بکا، پاشان بێدەنگ دابنیشێ تا وتارخوێن لە وتارخوێندنەوە تەواو دەبێ، ئەمجار لەگەڵ ئیمامدا نوێژوی هەینی بەجێ بێنێ، ئەوە لەتاوانی نێوانی ئەو جومعەو جومعەیەکی تر لێخۆشبوونی بۆ دەستەبەر دەبێ‌و سێ رۆژیش زیاد. [3]

کەسێك پێش نوێژی هەینی هاتە مزگەوت با چەندێکی بۆ دەکرێ نوێژی سوننەت بکا، هەتا ئیمام دێ بۆ خوتبە خوێندنەوە. وەڵێ ئەو دوورکات

---

[1] متفق علیه: خ(٢/٤١٤/٩٣٤)، م(٢/٥٨٢/٨٥١)، (ص.جة/٩١١)، ن(٣/١١٢)، ج(١/١١١٠).

[2] صحیح: (الإرواء/٦٢٢)، (ص.ج/٥٩٩٩)، ن(٣/١١٢)، جة(١/٣٥٦/١١٢١).

[3] صحیح: (ص.ج/٦٠٦٢) ، م(٢/٥٨٧/٨٥٧).

نوێژەی ئەمڕۆ بەناوی سوننەتی پێش نوێژی هەینی ناوزەد دەكرێ. ئەوە چ بنەمایەكی نیە، چونكە ئاشكراو چەسپاوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر لەگەڵ بیلال لەبانگ دەبووەوە، دەستی دەكرد بەوتار خوێندنەوە لەوكاتەدا كەس هەڵنەدەستا بۆ ئەنجامدانی دووركات. هەریەك بانگ دەدرا، دەی كەوابێ كەی نوێژی سوننەتیان كردووە؟![1] وەڵێ دوا نوێژی هەینی دەتوانێ چوار ركات یان دووركات نوێژی سوننەت بكا.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا».[2] كە یەكێك لەئێوە نوێژی هەینی ئەنجامدا، با دوای ئەوە چوار ركات نوێژی سوننەت بكا.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عادەتی وابوو كە لەنوێژی هەینی دەبووەوە لەمزگەوت نوێژی نەدەكرد، تا دەگەڕایەوە ماڵەوە، ئیتر لە ماڵەوە دوو ركات نوێژی دەكرد.[3]

## ئادابی ڕۆژی هەینی

سوننەتە بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێ ئامادەی نوێژی هەینی ببن هەموو ئەو ئادابانە پەیڕەو بكەن: كە لەم فەرموودانەدا ئاماژەیان پێ كراوە: لە سەلمانی فارسی‌یەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ، وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ ، وَيَدَّهِنُ

---

[1] زادالمعاد: ١/١١٨.

[2] صحيح: (الإرواء/٦٢٥)، (ص.ج/٦٤٠)، م(٢/٦٠٠/٨٨١) وهذا لفظه د(٣/٤٨١/١١١٨)، ت(٢/١٧/٥٢٢).

[3] متفق عليه: م(٢/٦٠٠/٧١/٨٨٢)، خ(٢/٤٢٥/٩٣٧).

مِنْ دُهْنِهِ ، أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ ثُمَّ يَخْرُجُ ، فَلاَ يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ ، ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الإِمَامُ ، إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى ».[1]: کەسێك رۆژی هەینی غوسڵ بکاو وەندێکی بتوانێ خۆ پاكو خاوێن بکاتەوە. سەروقژی خۆی چەوربکا، ئەمجار بڕوا بۆ نوێژی جومعەو هەنگاو بەسەر کەسانی دیکەدا هەڵنەهێنێتەوە، پاشان چەندێکی بۆ بکرێ نوێژی سوننەت بکا، پاشان کە ئیمام دەستی کرد بە وتارخوێندنەوە ئەو بێدەنگ بێو گوێ لە وتارەکە بگرێ ئەوە لەتاوانی نێوان ئەو هەینییەو هەینییەکی تر لێخۆشبوونی بۆ دەستەبەر دەبێ.

لە ئەبو سەعیدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: (کەسێك رۆژی هەینی خۆبشوا پاکترینو جوانترین پۆشاك بپۆشێ، ئەگەر بۆنی خۆشی هەبوو بۆن لەخۆی بدا، ئەمجار بێ بۆ جومعەو هەنگاو بەسەر شانی خەڵكدا هەڵنەهێنێتەوە ئەمجار وەندێکی خودا بۆی نوسیو بۆی کرا نوێژی سوننەت بکا، ئەمجار کە ئیمام هاتەدەر بۆسەر مینبەر بێدەنگ دانیشتوو گوێی لە وتارگرت تا مەراسیمەکە تەواو دەبێ، ئەم هەڵسو کەوتەی دەبێتە کەفارەتی تاوانی نێوان ئەو جومعەو جومعەی پێشەوەی.[2])

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَلاَئِكَةٌ يَكْتُبُونَ النَّاسَ عَلَى قَدْرِ مَنَازِلِهِمْ الأَوَّلَ فَالأَوَّلَ فَإِذَا جَلَسَ الإِمَامُ طَوَوُا الصُّحُفَ وَجَاءُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ وَمَثَلُ الْمُهَجِّرِ كَمَثَلِ الَّذِي يُهْدِي الْبَدَنَةَ ثُمَّ

---

[1] صحيح: (ص.ج/٧٧٣٦) ، خ(٢/٣٧٠/٨٨٣).

[2] صحيح: (ص.ج/٦٠٦٦) ، د(٣/٧/٣٣٩).

كَالَّذِي يُهْدِي بَقَرَةً ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الْكَبْشَ ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الدَّجَاجَةَ ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الْبَيْضَةَ».[1]

که ڕۆژی هەینی هات، لەبەردەرگاکانی هەموو مزگەوتێ فریشتە ئامادە دەبن‌و دەکەونە ناونووسینی ئەوانەی دێن بۆ نوێژی هەینی، تا ئەوکاتەی ئیمام‌و وتارخوێن دێ‌و دەچێتە سەر مینبەر، ئیتر ئەوانیش قەڵەم‌و کاغەزی خۆیان دەپێچنەوەو دەچن گوێ لە وتارەکە دەگرن، جا وێنەی ئەو کەسەی زوو دەچێ بۆ نوێژی هەینی وەك ئەوە وایە کە حوشترێ بکا بەخێر، پاشان کەسێك دواتر بچێ وەکوو ئەوە وایە ڕەشە وڵاخێ ببەخشێ، کەسێ دواتر بچێ وەك ئەوە وایە بەرانێ ببەخشێتەوە، پاشان وەکوو ئەوە وایە مریشکێ بکا بەخێر، کەسێ دواتر بچێ وەك ئەوە وایە هێلکەیێ بکا بەخێر.

## ئەو زیکرو دوعایانەی لەڕۆژی هەینی‌دا سوننەتە

١- زۆر صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

لە ئەوسی کوڕی ئەوسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ وَفِيهِ قُبِضَ وَفِيهِ النَّفْخَةُ وَفِيهِ الصَّعْقَةُ فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاَةِ فِيهِ فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ ». قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ تُعْرَضُ عَلَيْكَ صَلاَتُنَا وَقَدْ أَرِمْتَ. فَقَالَ « إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَجْسَادَ الأَنْبِيَاءِ».[2] لە گەورەترین ڕۆژانی ئێوە ڕۆژی هەینی‌یە، لەو ڕۆژەدا ئادەم دروستکراوە، لەو ڕۆژەدا لەدونیا دەرچووە، لەو ڕۆژەدا جاری یەکەم فوو بەکەڕەنای صوردا دەکرێ، هەر لەوڕۆژەدا نەعرەتە گەورەکە ڕودەدا: کە هەرچی زیندەوەرە لەوانەی لە

---

[1] صحيح: (ص.ج/٧٧٥) ، م(٢/٥٨٧/٨٥٠)، ن(٣/٩٨)، جة(١٠٩٢/١/٣٤٧).

[2] صحيح: (ص.جة/٨٨٩) ، د(١٠٣٤/٣/٣٧٠)، جة(١٠٨٥/١/٣٤٥)، ن(٣/٩١).

ئاسمان‌و زەویدان لە سام‌و هەیبەتی زەندەقیان دەچێ‌و بێهۆش دەکەون‌و دەمرن، جا کەوابێ ئێوە لەم ڕۆژەدا زۆر صەڵاواتم لەسەربدەن، چونکە صەڵاوەتەکانتان دەگەنەوە پێم‌و بەسەرما رادەنوێرێن، هاوەڵانی عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ کە جەستەت پۆڵکاو لەشت رزی لەگۆڕدا چۆن چۆنی صەڵەوات‌و دروودی ئێمەت پێ دەگاتەوە؟ فەرمووی: خودای باڵادەست جەستەی پێغەمبەرانی یاساغ کردووە لە زەوی‌و لەشیان لەخاك دانارزێ!!

٢- خوێندنی سورەتی (الكهف)

لە ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ»[1]: کەسێك لەرۆژی هەینیدا سورەتی (الكهف)ی خوێند، نێوان هەردوو جومعەکانی بۆ پڕدەکرێ لەنورو روناکی.

٣- زۆر پاڕانەوەو دوعاکردنی زۆر بەهیوای ئەوەی دوعاکانی ڕێکەوتی ساتی دوعا قبوڵبوون بکا.

لە جابیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، لە پێغەمبەرەوە: فەرموویەتی: «يَوْمُ الْجُمُعَةِ اثْنَتَا عَشْرَةَ سَاعَةً لاَ يُوجَدُ فِيهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ آتَاهُ إِيَّاهُ فَالْتَمِسُوهَا آخِرَ سَاعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ».[2] ڕۆژی هەینی دوانزە سەعاتە، بەندەیەکی موسوڵمانت دەست ناکەوێ داوا لەخودا بکا شتێکی پێ ببەخشێ ئیللا دەیداتێ، هەوڵ بدەن داواکارییەکانتان بخەنە دواکاتی ڕۆژەکەوە لەدوا نوێژی عەصر پاڕانەوەکانتان لەخودا چڕبکەنەوە.

---

[1] صحيح: (لإرواء/٦٢٦)، (ص.ج/٦٤٧٠)، ك(٢/٣٦٨)، هق(٣/٢٤٩).

[2] صحيح: رواه أبو داود والنسائي واللفظ له، والحاكم، وقال صحيح على شرط مسلم.

## نوێژی هەینی لەمزگەوتدا بەجێ دەهێندرێ

لەخاتو عائیشەوە (خودای لێ رازی بێ) ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: (لەرۆژگاری پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) خەڵك لەماڵەکانی خۆیانەوەو لە بەرزاییەکانی مەدینەوە – کەچەند گوندێکی نزیکی مەدینەبوون – دەهاتن بۆ نوێژی جومعە).[1]

لە (الزهری)یەوە ڕیوایەتکراوە: کە دانیشتوانی (ذوالحلیفة) بوون لەخزمەت پێغەمبەردا نوێژی جومعەیان دەکرد زولحولەیفە شەش میل لەمەدینەوە دووربوو.[2]

لە عەطای کوڕی رەباحەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: (دانیشتوانی مینا ئامادەی نوێژی هەینی دەبوون کە لەناو مەککەدا بەڕێوە دەچوو).

حافیظ (ابن حجر) لە کتێبی (ألتلخیص) (ج/٢/٥٥)دا دەڵێ: نەبیستراوەو نەگێڕدراوەتەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیزنی دابێ بۆ هیچ کەس کەنوێژی هەینی بەجێ بێنن لەهیچ کامێ لەمزگەوتەکانی مەدینەو گوندو گەڕەکی دەوروبەری نزیکیدا جگە لەمزگەوتی مەدینە.

## کۆبونەوەی نوێژی جەژنو نوێژی هەینی لەیەك ڕۆژدا

ئەگەر وارێکەوت نوێژی جەژنو نوێژی هەینی لەڕۆژێکدا کۆبوونەوە، ئەوە هەرکەسی نوێژی جەژنی کرد نوێژی جومعەی لەسەر لادەچێ.

لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی جەژنی بەجێ هێنا، پاشان ڕێگەیدا بۆ ئەوانەی

---

[1] متفق علیه: د(١٠٤٢/٣٨٠/٣) هکذا مختصراً وهو طرف من حدیث طویل. خ(٩٠٢/٣٨٥/٢)، م(٨٤٧/٥٨١/٢).

[2] هق(٣/١٧٥).

ئامادەی نوێژی جەژن بوون، نوێژی جومعە نەکەن، فەرمووی: « مَـنْ شَـاءَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيُـصَلِّ».[1] کەسێك دەیەوێ ئامادەی نوێـژی هـەینی بـێ بـا ئامادەبـێ نوێژی هەینی بکا.

واباشە بۆ ئیمام لـەو ڕۆژە جەژنانـەدا کەڕێکەوتی هـەینی دەبـن، وێـڕای ئەنجامدانی نوێژی جەژن دوای خۆرهەڵاتن، نوێژی جومعە پاشگوێ نـەخا بـۆ ئـەوەی ئەوانـەی ئامـادەی نوێـژی جـەژن بـوونو ئەوانـەی ئامـادەی نـەبوون نوێژی هەینی بەجێ بێنن.

لـە ئـەبو هـورەیرە ڕیوایـەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «قَدِ اجْتَمَعَ فِي يَوْمِكُمْ هَذَا عِيدَانِ فَمَنْ شَاءَ أَجْـزَأَهُ مِـنَ الْجُمُعَةِ وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ».[2] لەم ڕۆژەتاندا دوو جەژن کۆبوونەوە، کەسێك نوێژی جەژن بکا بۆلای لەبری نوێژی جومعەش دەکەوێ. ئێمە کۆیان دەکەینەوە.

## نوێژی جەژنی ڕەمەزانو جەژنی قوربان
## حوکمی نوێژەکانی جەژن

نوێژی دوو جـەژنی ڕەمـەزانو قوربـان پێویـستن لەسـەر پیـاوو ئـافرەت، چـونکە پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەســەر بــێ) بــەردەوام بــووە لەســەر ئەنجامدانیانو فەرمانکردنی بە موسوڵمانان بۆ چوونەدر لـەماڵ بەمەبەسـتی ئەنجامدانیان.

---

[1] صحيح: (ص. جه/١٠٨٢)، د (٣/٤٠٧/١٠٥٧)، جه (١/٤١٥/١٣١٠).

[2] صحيح: (ص. جه/١٠٨٣)، د (٣/٤١٠/١٠٦)، جه (١/٤١٦/١٣١١) من حديث ابن عباس.

لە ئوممو عەطییەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: فەرمانمان پێ کراوە بەوە ئافرەتی ماڵەوەو کەژاوەنشین بەرینە دەرەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژی جەژن.[1]

لەحەفصەی کچی سیرین ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئێمە عاددەتمان وابوو نەمان دەهێشت ئافرەتمان لەماڵ دەربچێ بۆ نوێژی جەژن، ئافرەتێك هات لە باڵەخانەی بەنی خەلەف نیشتەجێ بوو، چوومە لای، باسی ئەوەی کرد: کەمێردی خوشکەکەی لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دوانزە غەزای کردووە، لە شەش غەزادا خوشکەکەی لەگەڵیدا هاوبەشی غەزای کردووە، بۆیگێڕاوەتەوە کە ئەوو ئافرەتانی تری هاوبەش لەو غەزایانەدا بەسەرنەخۆش ڕاگەیشتوون‌و تەداوی برین‌و خزمەتی برینداریان کردووە، دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد، ئاخۆ ج خراپییەکی تێدایە ئەگەر جیلبابی دەست نەکەوت نەیبوو، نەچی بۆ نوێژی جەژن؟ فەرمووی: «لِتُلْبِسْهَا صَاحِبَتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا فَلْيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُؤْمِنِينَ». با دەستە خوشکەکەی جیلباب‌و پۆشاکی بداتێ‌و بەیەکەوە ئامادەی ئەو خێرو فەرمبن‌و هاوبەشی دوعاو خوداپەرستی موسوڵمانان بکەن.

## کاتی ئەنجامدانی نوێژی جەژن

لە یەزیدی کوڕی خومەیری (الرّحبیّ)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی بوسر (هاوەڵی پێغەمبەر) (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ خەڵکدا لەرۆژی جەژنی ڕەمەزان یان جەژنی قوربانەدا هاتە دەرەوە، ناڕازی بوو بە دواکەوتنی ئیمام‌و وتی: ئەوە کاتی کەراهەت تێپەڕی‌و خۆر بەرزبۆتەوەو کاتی بەجێ هێنانی نوێژە.[2]

---

[1] متفق علیه: خ (٢/٤٦٣/٩٧٤)، م (٢/٦٠٥/٨٩٠)، د (٣/٤٨٧/١١٢٤)، ت (٢/٢٥/٥٣٧)، جه (١/٤١٤/١٣٠٧)، ن (٣/١٨٠).

[2] صحیح: (ص. د/١٠٠٥)، د (٣/٤٨٦/١١٢٣)، جه (١/٤١٨/١٣١٧).

## چونە دەر بۆ ئەنجامدانی نوێژی جەژن

بەگوێرەی ئەو حەدیثانەی لەوەپێش باسکران ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەشوێنی ئەنجامدانی نوێژی جەژن ساراو چۆڵەوانیە نەك مزگەوت، بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانیدا بۆ بەجێ هێنانی نوێژی جەژن هەمیشە چووەتە دەرو لەساراو چۆڵەوانیدا ئەو نوێژەی بەجێ هێناوە، لەدوا لەدونیا دەرچوونیشی کار بەوە کراوەو ئەو سوننەتە پەیڕەوکراوە.

## ئایا بانگ‌و قامەت بۆ نوێژی جەژن پێویستە؟!

لە ئیبنو عەبباس‌و جابیری کوڕی عەبدوللاوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموون: نە بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان‌و نە بۆ نوێژی جەژنی قوربان بانگ نەدراوە.[1]

هەروەها لەجابیرەوە ریوایەتکراوە، فەرمووی: (بانگدان بۆ نوێژی جەژن نابێ، ئەوکاتەی ئیمام دەچێ بۆ ئەنجامدانی‌و نە دوائەوە، هەروەها قامەتیش ناکرێ‌و هیچ شتێکی لەوجۆرە ئەنجام نادرێ.[2]

## چۆنیەتی نوێژی جەژن

نوێژی جەژن دووڕکاتە، لەو دووڕکاتەدا دوازدەجار (ألله أكبر) دەکرێ، حەوتجار لەرکاتی یەکەمدا دوای (ألله أكبر)ی نوێژ دابەستن‌و پێش خوێندنی فاتیحە، پێنج جاریش لەرکاتی دووەمدا پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە.

لە کەثیری کوڕی عەبدوللای کوڕی عەمری کوڕی عەوفەوە لە باوکییەوە لە باپیریەوە، ریوایەتی کردووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەردوو جەژنەکەدا لەرکاتی یەکەمدا حەوتجار (ألله أكبر)ی کردوە، لەرکاتی دووەمدا پێنج جار.[3]

---

[1] متفق علیه: خ (٩٦٠/١/٤٥١)، م (٨٨٦/٦٠٤/٢).

[2] بەشێکە لەو حەدیثەی پێشەوە: کە ئیمام موسلیم ریوایەتی کردوە.

[3] صحیح: (ص.جة/ ١٠٥٧) ، (المشكاة/١٤٤١)، جة(١٢٧٩/٤٠٧/١).

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی جەژنی رەمەزانو جەژنی قوربان حەوتجارو پێنج جار (الله اکبر)ی کردوە جگە لە (الله اکبر)ی نوێژ دابەستنو (الله اکبر)ی چونە روکوع.[1]

## ئەو ئایەتو سورەتانەی لەنوێژی جەژنو جومعەدا دەخوێندرێن

لە (ألنُّعمان)ی کوڕی بەشیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عادەتی وابوو لەنوێژی جەژنەکانو نوێژی هەینی {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى}و {هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ}ی دەخوێند.[2]

لە عوبەیدیلای کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئیمامی عومەر ڕۆژی جەژن چووە دەر بۆ بەجێ هێنانی نوێژی جەژن، ناردی بۆلای ئەبو واقیدی (ألّلیثی) ئاخۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی ئامادا چ سورەتێکی دەخوێند؟ لە وەڵامدا عەرزی کرد سورەتی (قاف)و (اقتربت)ی دەخوێند.[3]

## وتاری جەژن دوای بەجێهێنانی نوێژەکەیەتی

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئامادەی بەجێهێنانی نوێژی جەژن بووم لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەروا لەگەڵ

---

[1] صحیح: (الإرواء/٦٣٩)، (ص.جة/١٠٥٨)، جة(١/٤٠٧/١٢٨٠)، د(٦/١١٣٨/٣٧، ٧/٤).

[2] صحیح: (الإرواء/٦٤٤)، (ص.جة/١٢٨١)، م(٢/٥٩٨/٨٧٨)، (٣/٤٧٢/١١٠٩)، ت(٢/٢٢/٥٣١)، ن(٣/١٨٤)، جة(١/٤٠٨/١٢٨١).

[3] صحیح: (الإرواء/ج/٣/١١٨)، (ص.جة/١٠٦)، م(٢/٦٠٧/٨٩١)، د(٤/١٥/١١٤٢)، ت(٥٣٢/٢/٢٣)، ن(٣/١٨٣)، جة(١/٤٠٨/١٢٨٢).

ئەبوبەکرو عومەرو عوثماندا نوێژی جەژنم کردوە، هەموویان نوێژی جەژنیان پێش خوێندنەوەی وتار بەجێ دێنا.[١]

## بەجێ هێنانی نوێژی سوننەت پێش نوێژی جەژنو دوای نوێژی جەژن

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی جەژنی ڕەمەزانی کرد، (دوورکات) نەلەپێشەوەیو نە لەدواوەی نوێژی سوننەتی نەکرد.[٢]

## ئەوکارانەی لەڕۆژی جەژندا سوننەتن

١- خۆشتن: لە ئیمامی عەلییەوە هاتووە: کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی غوسلی سوننەت، لە وەڵامدا دەفەرموێ: {يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَيَوْمَ عَرَفَةَ وَيَوْمَ الْفِطْرِ وَيَوْمَ النَّحْرِ}[٣]: غوسڵی ڕۆژی هەینیو ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو جەژنی قوربان.

٢- پۆشینی باشترینو خاوێنترین پۆشاك: لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عادەتی وابوو لەڕۆژی جەژندا بوردەیەکی سوری دەپۆشی.[٤]

٣- خواردنی شتێك لەجەژنی ڕەمەزاندا پێش چوونەدەر بۆ نوێژ: لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

---

[١] صحيح: خ(٢/٤٥٣/٩٦٢)، م(٢/٦٠٢/٨٨٤).

[٢] متفق عليه: خ(٢/٤٥٣/٩٦٤)، م(٢/٦٠٦/٨٨٤)، ن(٣/١٩٣).

[٣] لەوەپێش لەباسی غوسڵە سوننەتەکاندا باسکرا.

[٤] اسناده جيد (الصحيحة/١٢٧٩) هەیثەمی لە (مجمع الزوائد)دا دەڵێ: طەبەرانی لە (الأوسط)دا ڕیوایەتی کردوە.

عادەتی وابوو رۆژی جەژنی رەمەزان تا چەندەنکە خورمایەکی نەخواردایە نەدەچوو بۆ نوێژ.[١]

٤- دواخستنی ڤاوەڵتی لە جەژنی ڤورباندا هەتا لەڤوربانییەکەی دەخوا: لە ئەبو بورەیدەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عادەتی وابوو لەماڵ دەرنەدەچوو بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان تا شتێکی نەخواردایە، رۆژی جەژنی ڤوربانیش هیچی نەدەخوارد تا ڤوربانییەکەی سەرنەبڕیایە.[٢]

٥- ڕێگەگۆڕین: لەجابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەرۆژی جەژندا: کەدەچوو بۆ بەجێهێنانی نوێژی جەژن بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیی، کە دەهاتەوە بەڕێگایەکی تردا دەگەڕایەوە.[٣]

٦- (الله أكبر) کردن لەدوو جەژنەکاندا:

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ – البقرة/١٨٥} بۆئەوەی ژمارەکە تەواوبکەن، (الله أكبر) بکەن لەسەرئەوەی خودا هیدایەتی داون و بۆئەوەی سوپاسگوزاربن. ئەمە دەربارەی نوێژی جەژنی رەمەزانە.

دەربارەی نوێژی جەژنی ڤوربانیش پەروەردگار دەفەرموێ: {وَاذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ – البقرة/٢٠٣}. (الله أكبر) بکەن و یادی خودا زۆر بکەن لەچەند رۆژێکی دیاریکراودا: کە رۆژانی (أيام التشريق)ن. یان دەفەرموێ: {كَذَلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ – الحج/٣٧}. ئاواو بەوشێوە

---

[١] صحيح: (ص.ت/٤٤٨) ، خ(٢/٤٤٦/٩٥٣)، ت(٢/٢٧/٥٤١).

[٢] صحيح: (ص.ت/ ٤٤٧، خز(٢/٣٤١/١٤٢٦)) ، ت(٢/٢٧/٥٤٠).

[٣] صحيح: (المشكاة/١٤٣٤)، خ: (٢/٤٧٢/٩٨٦).

ئەو وشترانەی بۆ ئێوە ملکەچ کردووە، بۆئەوەی خودا بەگەورەو مەزن بگرن (الله أكبر) بکەن لەسەرئەوەی: کە ڕێنموویی کردون.

ئیمامی بوخاری دەفەرموێ: ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: مەبەست لە {وَيَذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْلوماتٍ} دە ڕۆژی مانگی زیلحیجەیە. مەبەستیش بە {أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ} سێ ڕۆژەی دوا ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانە. واتە: (ئەییامی تەشریق). ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرە لە دەرۆژی مانگی ذیلحیجەدا دەچوونە ناو بازاڕو (الله أكبر)یان دەکردو خەڵکیش لەگەڵیاندا (الله أكبر)ی دەکرد. موحەممەدی کوڕی عەلی لەدوا نوێژە سوننەتەکانەوە (الله أكبر)ی دەکرد. ئیمامی عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) لەمینا لەژێر خێوەتەکەی خۆیدا (الله أكبر)ی دەکرد، هەموو ئەهلی مزگەوت گوێیان لێ دەبوو، ئەوانیش (الله أكبر)یان دەکردو ئەهلی بازاڕ تێکڕا ئەڵلاهوئەکبەریان دەکرد، بەجۆرێك مینا دەهاتە لەرزەو هەژان،، ئیبنو عومەر لەو ڕۆژانەدا لەمینا لەدوا نوێژەکانو لەسەر جێگەی خەوتنو لەژێر خێمەکەیداو لە مەجلیسو ڕێگەی هاتوچۆیدا (الله أكبر)ی دەکرد سەرگەرمی ئەو زیکرەبوو. مەیمونە (خودای لێ ڕازی بێ)لەرۆژانی قوربانی کردندا (الله أكبر)ی دەکرد. ئافرەتەکان لەدوا ئەبانی کوڕی عوسمانو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەسێ ڕۆژەی قوربانی (ئەییامو تەشریق)دا لەگەڵ پیاوان لەمزگەوتدا (الله أكبر)یان دەکرد.[1]

کاتی (الله أكبر) کردن لەجەژنی ڕەمەزاندا لەوکاتەوە دەست پێ دەکا کە ئیمام دەردەچێ بۆ شوێنی نوێژو تا نوێژەکە تەواو دەبێ. ئیبنو ئەبو شەیبە[2] دەڵێ: یەزیدی کوڕی هارون لەکوڕی ئەبو زیئبەوە لە (ألزهري)یەوە ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەرۆژی

---

[1] فتح الباري/٤٥٧ و ٢/٤٦١.

[2] صحيح: (الصحيحة/١٧١)، (٢/١٦٤).

جەژنی ڕەمەزاندا لەماڵ دەردەچوو دەستی دەکرد بە (الله أکبر) کردن هەتا نوێژەکەی بەجێ دێنا. کە لەنوێژەکە دەبووەوە ئیتر (الله أکبر) کۆتایی دەهات.

شێخی ئەلبانی [1] دەڵێ ئەمە سەنەدێکی صەحیحو مورسەلە، لەڕێگایەکی ترەوە لە ئیبنو عومەرەوە بە مەرفوعی ڕیوایەتکراوە، بەیهەقی لەڕێگای عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە لە نافیعەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەری هێناوە دەڵێ: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەردوو جەژنەکاندا کە دەردەچوو (ألفضل)ی کوڕی عەبباسو عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو عەلیو جەعفەرو (ألحسن) و (ألحسین)و ئوسامەی کوڕی زەیدو زەیدی کوڕی حاریثەو ئەیمەنی کوڕی ئومم ئەیمەنی لەخزمەتدا بوون، بەدەنگی بەرز (الله أکبر)و تەهلیلەی دەکرد، چوونەدەرەوەکەی لە ڕێگەی (ألحذائین) پینەچییەکانەوە دەبوو، کە لەنوێژ دەبووەوە بەسەر پینەچییەکاندا دەگەڕایەوە تا دەهاتەوە ماڵەوە، بەیهەقی دەڵێ: ئەمە وێچوترە لەو شێوەی پێشەوە. شێخی ئەلبانی دەڵێ: پیاوانی ئەم ڕشتەیە بتمانەپێکراون، ڕیجالەکانی ڕیجالی موسلیمن جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر. کە بریتییە لە (العمریّ المکبَّر)ە. ئیمامی زەهەبی دەڵێ: ڕاستگۆیە، شتێك دەربارەی (حفظ)ی ئەو هەیەو ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کە لەڕیجالی موسلیمەو نمونەی ئەو ئیستیشهادی پێ دەکرێ، ئەو شایەتحاڵێکی گونجاوە بۆ مورسەلی (ألزهری)، حەدیثەکە بەلای منەوە صەحیحە، مەوقوف بێ یان مەرفوع بێ. خودا بۆ خۆی باش دەزانێ. کاتی (الله أکبر) کردن لەجەژنی قوربانىدا لەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوە دەست پێ دەکا تا عەصری دوا ڕۆژی

---

[1] (الإرواء: ٣/١٢٣).

ئەییامی تەشریق. ئەمە بەڕاستو دروستی لە ئیمامی عەلیو ئیبنو عەبباسو ئیبنو مەسعوودەوە ڕیوایەتکراوەو چەسپاوە.

دەقی (الله أکبر) کردنو فەرمان بەکردنی زۆری راو بۆچونو ریوایەت تێدا هاتوون. ئەوەی چەسپاوەو جێگای دڵنیاییە (جوت ئەڵلاهوئەکبەر) کردنە، لەئیبنو مەسعوودەوە هاتووە کە ئەو لەرۆژانی جەژنی قوربانـدا بەم شێوە (الله اکبر)ی دەکرد. (ألله أكبر، الله أكبر، لا الـه الا الله، الله أكـبر ألله أكـبر، ولله الحمد).

ئیبنـو ئـەبی شـەیبە (٢/١٦٧) ئەمـەی دەرهێنـاوەو رشـتەکەی راستو صەحیحە. وەڵێ لەشوێنێکی تردا بەهەمان رشتەو سەنەد باسی ئەوەی کردوە کە (الله أکبر)ی جەژن سێ سێ بووە، هەروا ئیمامی بەیهەقیش (ج: ٣/٣١٥) لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ئەویش لە (ألحكَمَ)ەوە لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە سێجار (الله أکبر) کردنی جەژنەکانی ڕیوایەتکردوە، زئەم ریوایەتەش رشتەو سەنەدەکانی راستو صەحیحە.[1]

## نوێژی ترس

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ – النساء/١٠٢}:

واتە: ئەگەر لەکاتی جەنگدا دژی کافران ترس لەئارادا بوو، تۆش ئەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو هاوەڵانتدا بوویو ویستت نوێژیان بۆ بکەی بەکۆمەڵ، ئەوە تۆ موسوڵمانان بکە بەدوو دەستە، با دەستەیەکیان بەچەکەوە لەگەڵتا نوێژ دابەستن، کاتێك ئەوان لەگەڵتا چوونە

[1] الإرواء: ٣/١٢٥.

سوژده، با دهستەی دووەم لەدواتانـەوه پارێزگاریتـان بکـەن، جا کەئـەم تاقمـه لەگەڵ تۆدا رکاتێکیـان تـەواوکرد، بۆخۆیـان نیـیـەتی جیـایی لـه ئیمـام بێـنن‌و بۆخۆیـان رکـاتی دووەم تـەواو بکـەن‌و سـلاو بدەنـەوەو بـڕۆن بـۆ بەرامبـەر دوژمـن‌و دەسـتەی دووەم بـێن: کـەتا ئەوکاتـە بەرامبـەر دوژمـن بـوون بـێن لەپشتی ئیمامەوە نوێژ دابەستن‌و ئیمام رکاتی دووەم لەگەڵ ئەماندا تەواوبکا، کاتـێ ئیمـام دانیـشت بـۆ تـەحیات خوێنـدن ئـەمان هەڵـسنەوە رکـاتی دووەم تەواوبکەن، ئیمام هەر لەنوێژدا بمێنێتەوە چاوەڕوانی ئەمانە بکا لەتـەحیاتا، هەتا ئەوان پێی دەگەنەوە سلاوی نوێژەکەیان لەگەڵدا بداتـەوە. ئەمـە ئەگـەر وارێکەوت دوژمن لەغەیری لای قیبلەوە بوو.

## سیفەت‌و شێوەی نوێژی ترس

(الخطابی) دەڵێ: نوێژی ترس بەچەند جۆرێك ئەنجام دەدرێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حالات‌و زوروفی جیاجیادا بەو شێوانە نوێـژی تری بەجێ هێناوە. بۆ هەر حاڵەتێك بەشێوەیەکی جیاو تایبـەتی ئـەو نوێـژە بـەجێ دێنـدرێ‌و کـام شـێوە باشـتر پارێزگـاری موسـوڵمانی تێـدا بەرجەسـتە دەبێ‌و پتر ئیحتیـاتی تێدایـە بـەو شـێوە رەچـاو دەکـرێ، نوێـژی تـرس وێـڕای ئـــەوەی بەشـــێوازی جیاجیـــا ئـــەنجام دەدرێ وەلێ لـــەواقیعدا یـــەك مانـــا دەبەخشێ.[1]

١- لە ئیبنو عومـەرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) رکاتێك نوێژی ترسی بەدەستـەیەك لـە هـاوەڵان کـردو دەسـتەکەی تریان بەچەکەوە بەرامبـەر دوژمن وەستابوون، پاشـان ئـەو دەسـتەیەی یەکـەم بۆ خۆیان رکاتی دووەمیان بەجێ هێناو سلاویان دایەوەو چون بـۆ بەرامبـەر

---

[1] شرح مسلم للنووی: ٦/١٣٦.

دوژمن‌و لەشوێنی دەستەکەی تر جێگیر بوون‌و ئەو دەستەکەی تر هاتن لەدوا پێغەمبەرەوە نوێژیان دابەست، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ ئەوانیشدا رکاتێکی کردو تەشریفی ئەو سلاوی دایەوە، ئەمانیش بۆ خۆیان رکاتی دووەمی نوێژەکەیان بەجەماعەت لەپاش پێغەمبەرەوە ئەنجامداو رکاتێکیشیان بەجیا بۆ خۆیان ئەنجامدا.[1]

٢- لە سەهلی کوڕی ئەبو حەثمەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ترسدا نوێژی بە هاوەڵانی کرد، تێکڕا هاوەڵانی کرد بەدوو ریز، رکاتێکی بەو ریزەی دوا خۆیەوە کرد، پاشان هەڵسایەوە بۆ رکاتی دووەم لەو رکاتەدا مایەوە هەتا ریزەکە بۆ خۆیان رکاتی دووەمیان کردو دوای تەحیات سلاویان دایەوە چوونە دوواوەو ریزی دووەم هاتنە پێشەوەو لەپشتی پێغەمبەرەوە نوێژیان دابەست‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەوانیش رکاتێ نوێژی کردو ئەمجار دانیشت چاوەڕێی کردن تا رکاتی دووەمیان ئەنجامداو بەیەکەوە تەحیاتیان خوێندو سلاویان دایەوە.[2]

٣- لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا نوێژی ترسم بەجێ هێنا، تەشریفی ئێمەی کرد بەدوو ریز، ریزێك لەدوا پێغەمبەرەوە بووین (دروودی خودای لەسەر بێ)، دوژمن لەنێوان ئێمەو قیبلەدا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) (ألله أكبر)ی نوێژ دابەستنی کردو ئێمەیش نوێژمان دابەست، دوا خوێندنی فاتیحە تەشریفی چووە روکوع، ئێمەیش هەموومان هەڵساینەوە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە سوژدە، ریزەکەی دوای پێغەمبەر (دروودی

---

[1] متفق عليه: م(١/٥٧٣/٨٣٩)، وهذا لفظه، خ(٢/٤٢٩/٩٤٢)، (٤/١١٨/١٢٣٠)، ت(٢/٣٩/٥٦١)، ن(٣/١٧١).

[2] متفق عليه: م(١/٥٧٥/٨٤١)، خ(٧/٤٢٢/٤١٣١) بنحوه ن(٣/١٧٠)، ت(٢/٤٠/٥٦٢).

خوداى لەسەر بێ) لەتەكیا چوونە سوژدەو ڕیزی دواوە بەرامبەر دوژمن مانەوە، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوژدەی تەواوكرد لەگەڵ ڕیزی دواوەی‌و هەڵسایەوە بۆ ركاتی دووەم، ڕیزی دووەم شۆڕبوونەوە بۆ سوژدەو هەڵسانەوە بۆ ركاتی دووەم ڕیزی دواوە هاتنە پێشەوەو ڕیزی پێشەوە چوونە دواوە، دوای ڕاوەستان‌و خوێندنی قورئان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە ڕوكوع‌و هەمووماں لەتەكیا چوینە ڕوكوع، پاشان پێغەمبەر لە ڕوكوع هەڵسایەوەو ئێمەیش هەمووماں هەڵساینەوە پاشان تەشریفی شۆڕبۆوە بۆ سوژدەو ڕیزی دواوەی لەتەكیا چوونە سوژدە، ڕیزی دواوە كە ڕیزی دووەم بوو بە پێوە مانەوە بەرامبەر دوژمن، جا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوژدەی تەواوكرد لەگەڵ ڕیزی دواوەی‌و هەڵسایەوە بۆ تەحیات خوێندن ڕیزی دووەم شۆڕبوونەوە بۆ سوژدە بردن‌و سوژدەیان تەواوكردو لەگەڵ پێغەمبەرو ڕیزی یەكەمدا تەحیاتیان خوێندو ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سلاوی دایەوەو ئێمەیش هەمووماں سلاوماں دایەوە.[1]

## باسی بەڕێكردنی مردو (كتاب الجنائز)

كەسێك كەوتە گیانەڵاوەوەو مردنی نزیك بۆوە، واباشە بۆ كەس‌وكاری كە ڕستەی شایەتومانی بەگوێدا بدەن، لەنزیكییەوە بەهێواشی زیكری (لا الە الا اللّٰه) بكەن‌و شایەتوماں بێنن.

لەئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ». ڕستەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بەگوێی ئەوانەتاندا بدەن كە دەكەونە حاڵەتی گیانەڵاوەوەو مردنیان

---

[1] صحيح: واللفظ لمسلم (ص.ن/١٤٥٦)، م(١/٥٧٤/٨٤٠)، ن(٣/١٧٥).

لێ نزیك دەبێتەوە[١] پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیە فەرمانی بەکەسوکاری نەخۆش کرد کە زیکری (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ)ی لەلابکەن، بەهیوای ئەوەی دواوتەی مردوەکە رستەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بێ.

لە موعازی کوڕی جەبەلەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّـهُ دَخَلَ الْجَنَّـةَ ». [٢] کەسێك دوا وتەی لەژیانـدا رستەی (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ) بێ دەچێتە بەهەشتەوە.

جا کەمردو گیانی سپارد پێویستە کەسوکاری یان ئەو موسوڵمانانەی بەدەوریەوەن پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن.

١ ، ٢- چاوەکانی لێك بنێنو دوعای لێخۆشبوونی بۆبکەن: لە ئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: ئەبو سەلەمە گیانی سپارد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتەسەری، چاوی بەملوق وەستابوون پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چاوەکانی ئەبو سەلەمەی وێکنانەوە، پاشان فەرمووی: «إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ». گیان کە لەجەستە دەرچوو چاو لەدوایەتی: ئیتر کەسوکارەکەی کردیانە هاوارو دادو فیغان. فەرمووی: «لاَ تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إِلاَّ بِخَيْرٍ فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ». دوعای شەڕ لەخۆتان مەکەن، هەر دوعای خێرو چاکە بۆ خۆتان بکەن، چونکە بێگومان فریشتە داوای گیرابوونی دوعاکانتان دەکەن، ئێوە هەر دوعایەك لەخۆتان بکەن، فریشتە دەڵێن: (آمین). پاشان تەشریفی فەرمووی: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَبِى

---

[١] صحيح: (الإرواء/٦٨٦)، م(٩١٦/٦٣١/٢)، د(٣١٠١/٣٨٦/٨)، ت(٩٨٣/٢٢٥/٢)، جـة(١٤٤٥/٤٦٤/١)، ن(٤/٥).

[٢] صحيح: (ص.د/٢٦٧٣)، د(٣١٠٠/٣٨٥/٨).

سَلَمَةَ وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي الْمَهْدِيِّينَ وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ فِي الْغَابِرِينَ وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ يَا رَبَّ الْعَالَمِينَ وَافْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ. وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ ».[١] خودایە بەرەحمەتی بۆ پایانت لەئەبو سەلەمە خۆش ببە، پلەی لەناو هیدایەتدراواندا بەرزبکەرەوە، خودایە لەوانەی پاش خۆی شوێنی پڕبکەرەوە، کەسانێك بخەرە شوێنی هیدایەتدراوو بەخۆ چاراوو صالّح بن. لەئێمەش‌و لە ئەویش خۆش ببە ئەی پەروەردگاری بونەوەر، گۆڕی بۆ فراوان‌و نورانی بکە.

٣- بە قوماش‌و شتێکی وا دایپۆشن:

لەخاتو عائیشەوە (خودای لێ رازی بێ) ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ گیانی دەرچوو بە چەرچەفێکی (حەبەرە) - جۆرە قوماشێکی یەمەنییە – داپۆشرا.[٢]

٤- پەلەبکەن لە شۆردن‌و کفن‌و دفن کردنی:

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا وَإِنْ تَكُنْ غَيْرَ ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ».[٣] خێرا تەرمی مردوو راگوێزی گۆڕستان بکەن ئەگەر ئەو مردووە صالّح‌و پیاو چاك بێ، ئەوە بەخێرو خۆشی خۆی دەگەیەنن، خۆ ئەگەر بە پێچەوانەوە بێ، ئەوە شەڕو نەگبەتیەکە لە کۆڵی خۆتانی دەکەنەوە.[٤]

---

[١] صحيح: (الجنائز/١٢)، م(٢/٦٣٤/٩٢٠)، د(٨/٣٨٧/٣١٠٢).

[٢] متفق عليه: م(٢/٦٥١/٩٤٢) هكذا مختصراً. خ(٣/١١٣/١٢٤١) مطولاً.

[٣] صحيح: (الجنائز/١٦)، ك(٢/٥٨) هق(٦/٧٤).

[٤] متفق عليه: خ(٣/١٨٢/١٣١٥)، م(٢/٦٥١/٩٤٤)، د(٨/٤٦٩/٣١٦٥)، ت(٢/١٠٢٠).

٥- دەبـێ هەنـدێ لـە کـەس‌وکاری پەلەبکـەن لەبەسـەرکردنەوەی ئـەو قەرزانـەی لـە ئەسـتۆیدایە لـەماڵی مردووەکـە بیاندەنـەوە، تەنانـەت ئەگـەر قەرزەکانی هەموو ماڵەکەشی لەبن بێنێ.

لەجابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پیاوێك مرد شۆردمان‌و کفنمان کردو بۆن‌و بـەرامەمان پێوەکردو ئامادەمـان کـرد بۆئـەوەی پێغەمبـەر تەشریفی بێ نوێژی لەسـەربکا، لەشوێنی تایبـەتی جـەنازە دانانـدا دامـان نـا، دوایی هەواڵمان دا بە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـە جەنازەکە ئامادەیـە بـۆ نوێـژ لەسـەرکردن تەشـریفی چـەند هـەنگاوێك لەگـەڵمان هـات، پاشان فەرمووی: « لَعَلَّ عَلَى صَاحِبِكُمْ دَيْنًا ». وێدەچـێ هاوەڵە مردووەکـەتان قـەرزی لەسـەربێ، بڵێـی قـەرزدار نـەبێ؟ عـەرزیان کـرد: بـەڵێ دوو دینـار قەرزدارە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەستاو قاچی گرتـەوە. پیاوێك لەئێمە کەناوی ئەبو قەتادە بـوو، وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەو ددوو دینارە لەسەر شانی من بێ، من دانەوەی قەرزەکە لەئەستۆ دەگرم. ئـیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوتە قسەو فـەرمووی: «هُمَـا عَلَيْـكَ وَفِي مَالِكَ وَالْمَيِّتُ مِنْهُمَا بَرِيءٌ». ئەو دوو دینارە لەئەستۆی تۆدایـە مـردووەکـە لێی بێ بەرییە، ئەبو قـەتادە وتـی: بـەڵێ، پاشـان پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەرکرد، لـەوەدوا پێغەمبـەر کـە ئـەبو قـەتادەی دەبینـی دەیفەرموو: «مَا صَنَعْتَ فِي الدِّينَارَيْنِ؟» ئەرێ دوو دینارەکە بوون بەچی؟ هـەتا دواجار ئەبو قەتادە، وتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! دامـەوە، فـەرمووی: «الآنَ حِينَ بَرَدَتْ عَلَيْهِ جِلْدُهُ». ئێستاکە پێستی ساردبۆوە.[1] واتـە: بەدواخسـتنەکەی پێ ناخۆش بوو.

---

[1] صحيح: (الجنائز/١٦)، ك(٢/٥٨)، هق(٦/٧٤).

★ ئەوەی دروستە بۆ کەسوکاری مردوو کەسانی دیکە دەربارەی مردووەکە ئەوەیە: کە بۆیان رەوایە روخساری مردو دەربخەنو ماچی بکەن. تاسێ رۆژیش تازیەی بۆ دابنێنو بەبێ دەنگ فرمێسکی بۆ برێژن.

لەخاتو عائیشەوە (رەزای خودای لێ بێ) گێڕاویەتیەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە سەر عوسمانی کوڕی مەظعون کە وەفاتی کردبوو، لەسەر روخساری هەڵدایەوە، خۆی بەسەرداداو ماچی کردو گریا، تەنانەت بینیم فرمێسك بەسەر دوو کوڵمیدا دەهاتنە خوار.[1]

لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە گێڕدراوەتەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی کەس‌وکاری جەعفەری دا تازیەی بۆ بگرنو بۆی بگرین، پاش تێپەڕبوونی سێ رۆژەکە هاتە ناویانو پێی فەرموون: «لاَ تَبْكُوا عَلَى أَخِي بَعْدَ الْيَوْمِ ».[2] لەمڕۆ بەولاوە بۆ جەعفەری برام مەگرین.

## ئەوەی پێویستە لەسەر کەس‌وکاری مردوو

پێویستە لەسەر کەس‌وکاری مردوو کاتێك هەواڵی مردنی کەسێکیان پێ دەگا دوکاری سەرەکی بەرچاو بگرن:

یەکەم: صەبرو ئارامیو رەزا بە قەزای پەروەردگار. چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ، الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ،أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ — البقرة/١٥٥ - ١٥٦}: بەتەئکید ئێمە ئێوە بەتاقی دەکەینەوە بەهەندێك ترسو بیمو برسیایەتیو فەوتانیماڵو سامانو لەدەستدانی کوڕو کچو

---

[1] صحيح: (الإرواو/٦٩٣)، (ص.جه/١١٩١)، جه(١٤٥٦/١/٤٦٨)، د(٣١٤٧/٨/٤٤٣)، ت(٩٩٤/٢/٢٢٩).

[2] صحيح: (ص.ن/٤٨٢٣) ، (الجنائز. ص/٢١)، د(٤١٧٤/١١/٢٤٥)، ن(٨/١٨٢).

خزمو خۆشەویستو بەروبومو میوەجات، مژدە بدە بەوانەی لەبەرامبەر ئەم بەڵاو کارەساتانەدا بەصەبرو ئارامو خۆڕاگرن، ئەوانەی کە بەڵاو کارەساتێکیان تووش بوو ددەڵێن: ئێمە هەموومان هی خوداینو بۆ بەرقاپی رەحمەتی ئەو دەگەڕێینەوە، ئەوانە لەلایەن پەروەردگاری خۆیانەوە رەحمەتو فەڕو بەخشش هەیە بۆیانو هەرئەوانە هیدایەتدراون سەرفرازن.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خودا بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕی لەسەر گۆڕێك دەگریاو شینی دەگێڕا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: «اتَّقِي اللَّـهَ وَاصْبِرِي». لەخودا بترسەو ئارام بگرە، ئافرەتەکە وتی: وازم لێ بێنەو ئەوە چ پەیوەندییەکی بەتۆوە هەیە، ئەتۆ چوزانی من تووشی چ موصیبەتو کارەساتێك هاتووم. ئەتۆ بەڵای لەوجۆرەی یەخەی منی گرتووە بەسەرت نەهاتووە. ئەنەس دەڵێ: ئافرەتەکە نەیزانیوە ئەوکەسە پێغەمبەرە، پێیان گوت: بابان شێواو ئەوە پێغەمبەری خودا بوو، تۆبە بێ نەزاکەت بەرویدا چوویەوە، ئیتر ئافرەتەکە لە تەریقیو شەرم هاتنەوەدا مردنی بەچاوی خۆی بینی. هات بۆ بەردەرگای مالی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)و بەئاسانی بەخزمەتی گەیشت چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەرگەوانو سکرتێرو حاجیبی نەبوو، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! (درودی خودای لەسەر بێ) من جەنابتم نەناسی ئەو قسە بێجاییو نەشیاوانەم ئاراستەکردی بمبەخشە. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ أَوَّلِ صَدْمَةٍ »[1]: صەبرو خۆڕگریو ئارامگرتن کاتێ گرنگو پەسەندە کە لەگەڵ ڕودانی بەڵایەکەدا بەرجەستە بێ.

[1] متفق علیه: م(٩٢٦/١٥-٢/٦٣٧) وهذا لفظه خ(١٢٨٣/١٤٨/٣)، د(٣١١٨/٣٩٥/٨).

**صەبرو نارامی لەسەر مردنی منداڵ پاداشی زۆر گەورەیە**

لە ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە کۆمەڵێك ئافرەت داوایان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد کە ڕۆژێکیان بۆ دیاری بکا ئامۆژگارییان بکا. ئەویش ئامۆژگاری کردنو فەرمووی: « أَيُّمَا امْرَأَةٍ مَاتَ لَهَا ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ كَانُوا حِجَابًا مِنَ النَّارِ»: هەر دایکێك (ئافرەتێك) سێ منداڵی بمرن، بۆی دەبنە پەردەو لەمپەر لەئاگری دۆزەخ. ئافرەتێك لەناویاندا وتی: ئەی دوو منداڵ؟ فەرمووی: دوو منداڵیش ئەو پاداشەی هەیە.[1]

دووەم شت کە لەسەر کەسوکاری مردو پێویستە پەیڕەوی بکەن وتنی ڕستەی «إِنَّا لِلَّهِ إِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ»: وەکوو لە قورئاندا ئاماژەی پێ کراوە ئێمە هەمووومان موڵکی خوداینو هەمووومان بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە واباشە ئەم دوعایەشی لێ زیاد بکاو بڵێ: «اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا» خودایە پاداشم بدەرەوە لەسەر ئەو بەڵاو بەتاقیکردنەوەیەو خەسارم بۆ پڕبکەیەوە بەباشتر لەوەی بردۆتەوە.

لە ئوممو سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەگێڕدرێتەوە دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: « مَا مِنْ مُسْلِمٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ مَا أَمَرَهُ اللَّهُ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا. إِلاَّ أَخْلَفَ اللَّهُ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا». هەر موسوڵمانێك بەڵاو چورتمێکی تووش بوو ئەوەی خودا فەرمانی پێ کردووە ئەوە دەڵێ: کەبریتیە لە (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ). ئێمە هەمووومان هی خوداینو هەمووشمان بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە، خودایە لەپاداشی موصیبەتەکەم پاداشم بدەرەوە بە باشترو

---

[1] متفق علیه: (٣/١١٨/١٢٤٩)، م (٤/٢٠٢٨/٢٦٣٣).

چاکتر لەوەی لێتان ستاندومەوە، بێ شك خودا بە باشتر قەرەبووی بۆ دەکاتەوە. جا ئومموسەلەمە دەڵێ: کە ئەبو سەلەمە وەفاتی کرد، وتم دەبێ چ موسوڵمانێك لە ئەبو سەلەمە باشتر بێ، یەکەم خێزانێك بوو کۆچی کرد بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)؟! جا کە ئەبو سەلەمە وەفاتی کرد من ئەو دوعاو پاڕانەویەم گوت، ئیتر خودا لەشوێنی ئەو پێغەمبەری بەنسیب کردم.[١]

## ئەوەی یاساغە لەسەر کەسوکاری مردو

١- گریانی بەدەنگو شینۆ شەپۆڕ. لە ئەبو مالیکی (الأشعری)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ لاَ يَتْرُكُونَهُنَّ الْفَخْرُ فِي الأَحْسَابِ وَالطَّعْنُ فِي الأَنْسَابِ وَالاِسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ وَالنِّيَاحَةُ». چوار شت لە ئوممەتی من کارو پیشەی سەردەمی نەزانینەو وازی لێ ناهێنن: شانازی بە باوكو باپیرو نژادو ماڵو سامان. تانەو تەشەردان لەنەژادی خەڵك، داوای باران بارین لە ئەستێرە، شینو شەپۆڕو وایەشێرە. هەروا فەرمووی: «النَّائِحَةُ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا تُقَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ مِنْ جَرَبٍ». شینو شەپۆڕگێڕ ئەگەر پێش مردن تۆبە نەکا، ڕۆژی قیامەت زیندو دەکرێتەوە، کراسێکی لەقەتران دروستکراوو زرێی گولی لەبەردایە.[٢]

٢ – ٣: لەدەموچاودانو یەخە دادڕین. لە عەبدوڵلاوە گێڕدراوەتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ

---

[١] صحيح: (ص. ج/٥٧٦٤)، الأحكام (ص/٢٣)، م (٢/٦٣١/٩١٨).

[٢] صحيح: (الجنائز. ص/٢٧)، (الصحيحة ٧٣٤)، م (٢/٦٤٤/٩٣٤).

الْخُدُودَ ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ»[١] لەپێڕی ئێمەی موسوڵمان نیە کەسێك لەڕوخساری خۆی بداو یەخە دابدڕێ‌و بانگەشەی سەردەمی نەزانی بکەن.

٤- قژ ڕنینەوەو سەرتاشین: لە ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسا (ڕەزای خودای لێ بێ) گێڕدراوەتەوە وتی: (ئەبو موسا توشی ئازارێك بوو، لەهۆش خۆی چوو سەری لەکۆشی ئافرەتێکی خزمیدا بوو، ئافرەتێك دایە شین‌و شەپۆڕو گریان، ئەبو موسا نەیتوانی هیچی پی بڵێ، کەدوایی هۆش خۆی هاتەوە، وتی: من بەریم لەو کەسەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی لێ بێ بەری کردووە) بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بێ بەری کردووە لەئافرەتێك کە لەکاتی بەڵاو کارەساتدا شین‌و شەپۆڕ دەکا، ئافرەتێك سەری خۆی بتاشێ ئافرەتێك یەخەی خۆی دابدڕێ.[٢]

٥- قژ بژکردنەوەو بڵاوکردنەوەی قژ. ئەمەش بەپێی حەدیسێك کە ئافرەتێك لەوانەی بەیعەتیان لەگەڵ پێغەمبەر کرد (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ لەوشتانەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی لێ وەرگرتین لەبواری چاکەو چاکەکاریدا سەرپێچی نەکەین‌و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەین. دەموچاوی خۆمان نەڕنینەوەو نەڕوشێنین، شین‌و شەپۆڕ نەگێڕین، یەخە دانەدڕین، قژ بژنەکەینەوە.[٣]

---

[١] متفق علیه: خ (٣/١٦٣/١٢٩٤)، م (١/٩٩/١٠٣)، ت (٢م٢٣٤/١٠٠٤)، ن (٤/١٩).

[٢] متفق علیه: خ (٣/١٦٥/١٢٩٦)، م (١/١٠٠/١٠٤)، ن (٤/٢٠).

[٣] صحیح: (الجنائز. صحیح: ص/٣٠)، د (٨/٤٠٥/٣١١٥).

## ئەوەی پێویستە لەگەڵ مردووەکە بکرێ

پێویستە بۆ مردو لەلایەن کەسوکارییەوە یان کەسانی دیکە چوار شتی بۆ بکرێ. شتن‌و پاککردنەوەی جەستەی. کفن کردنی. نوێژکردن لەسەری. دفنکردنی.

١- شتن: غوسڵ.

شتنی مردو پێویستە پێویستی‌یەکەشی لەفەرمانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) سەرچاوەی گرتووە. کە لەچەند فەرموودەیەکی‌دا ئاماژەی پێکراوە.

أ- فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی ئەو پیاوە ئیحرام بەستوەی حوشترەکەی بەری دابووەوەو گیانی دەرچوو بوو فەرمووی: « اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ».[1] بەئاوو سیدر بیشۆن.

ب- فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی خاتو زەینەبی کچی فەرمووی: « اغْسِلْنَهَا ثَلاثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ سَبْعًا».[2] فەرمووی: سێ جار غوسڵی لێ دەرکەن، یان پێنج جار یان حەوت جار.

### چۆنیەتی غوسڵ: (شۆردنی مردوو)

لە ئوممو عەطییەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بەو ئافرەتانەی فەرموو: کە خەریکی شۆردنی کچەکەی بوون «

---

[1] متفق علیه: خ (٣/١٣٥/١٢٦٥)، م (٢/٨٦٥/١٢٠٦)، د (٩/٦٣/٣٢٢٢)، ت (٢/٢١٤/٩٥٨)، ن (٥/١٩٥).

[2] متفق علیه: خ (٦٢، ٣/١٣٢/١٢٦٣، ٣/١٣٤)، م (٩٣٩- ٢/٦٤٧/٣٩).

ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا». یەکەمجار لە ئەندامە راستەکانیەوەو لە ئەندامی دەستنوێژەوە دەست پێ بکەن[1]

هەر لە ئوممو عەطییەوە گێڕدراوەتەوە: دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتەلامان لەوکاتەدا ئێمە خەریکی شتنی کچەکەی بووین؛ فەرمووی: «اغْسِلْنَهَا ثَلاثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مَنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي». سێجار بیشۆن یان پێنج جار یان زیاتر ئەگەر زانیتان پێویستە، دواجار بەکافور بیشۆرن یان بەکەمێك لەکافور، کە لەشۆردنی بوونەوە پێم بڵێن. جا کە لەشتنەکەی بووینەوە خەبەرمان بە پێغەمبەردا، تەشریفی هات، ئیزارەکەی بۆ هاویشتین فەرمووی: «أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ». لەسەر گۆشتیەوە تێوەی پێچن.[2]

هەر لەوەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: قژەکانیمان هۆنینەوە کردمانن بە سێ بەش: دوو زولفو قژی پێشەسەری.[3]

هەر لەوەوە هاتووە دەڵێ: «فَضَفَرْنَا شَعَرَهَا ثَلاثَةَ قُرُونٍ وَأَلْقَيْنَاهَا خَلْفَهَا». قژەکانیمان کردنە سێ گورزەو بەسەر پاشەسەریدا هەڵمان دانەوە.

## کێ سەرپەرشتی شتنی مردووەکە دەکا؟

کێ باشتر ڕێو شوێنی مردوو شۆرین دەزانێ ئەو ئەو ئەرکە بەجێ دێنێ بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسە خزمو کەسوکاری مردووەکەبێ. چونکە ئەوانەی ئەرکی شۆرینی پێغەمبەریان گرتە ئەستۆ خزمو کەسوکارەکانی بوون.

---

[1] متفق علیه: خ(١٢٥٥/١٣٠/٣)، م(٩٣٩-٤٣-٦٤٨/٢).

[2] متفـــــق علیـــــه: خ(١٢٥٣/١٢٥/٣)، م(٩٣٩/٦٤٦/٢)، د(٣١٢٦/٤١٦/٨)، ت(٩٩٥/٢٢٩/٢)، جة(١٤٥٨/٤٦٨/١)، ن(٢٨/٤).

[3] متفق علیه: خ(١٢٦٣،٦٢/١٣٣، ١٣٤/٣)، م(٩٣٩/٦٤٦/٢)، ن(٣٠/٤).

لەئیمامی عەلیەوە گێڕدراوەتەوە: فەرموویەتی: (پێغەمبەری خودام شۆری، سەرنجمدا لەو حاڵەتانەی بەسەر مردوو دێ ئاخۆ هیچ کام لەوانە لە پێغەمبەردا بەدی دەکەم هیچی وام نەبینی جێگای سەرنج بێ، ئەو تەشریفی بەزیندوویی‌و بەمردوویی بۆنخۆش‌و پاك‌و خاوێن بوو[1]).

پێویستە نێرینە پیاو بشواو مێینە ئافرەت بشوا. ژن‌و مێرد لەم حوکمە چەرت دەکرێن دروستە بۆ هەر یەکێکیان شۆردنی ئەوی تریان بگرێتە ئەستۆ.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: ئەگەر ئەوەی بەسەرمدا رابورد توشم بهاتایەوە لەخێزانەکانی بەولاوە کەسی تر پێغەمبەری نەدەشۆری.[2]

هەر لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناشتنی جەنازەیەك لەبەقیع گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆلام، من سەرم دەهێشاو هاوارم دەکرد: ئاخ سەرم. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵکوو من سەرم دێشێ‌و دەبێ هاوار بکەم ئای سەرم. چی دەبێ ئەتۆ پێش من بمری بۆ خۆم بتشۆرم‌و کفنت بکەم‌و نوێژت لەسەر بکەم‌و بتخەمە ناو گۆڕەوە.[3]

---

[1] صحیح: (ص.جة/١١٩٨) ، (الأحكام/٥٠)، جة(١٤٦٧/٤٧١/١).

[2] صحیح: (ص.جة/١١٩٦) ، (الجنائز/٤٩)، د(٣١٢٥/٤١٣/٨)، جة(١٤٦٤/٤٧٠/١).

[3] صحیح: (ص.جة/١١٩٧) ، (الجنائز: ص/٥٠)، (١٤٦٥/٤٧٠/١).

**ئاگادارییەك: شەهیدی گۆڕەپانی جەنگ ناشۆردرێ**

له جابیرەوه ڕیوایەتکراوه، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «ادْفِنُوهُمْ فِي دِمَائِهِمْ». شەهیدەكان بەخوێنەوه بنێژن، مەبەستی شەهیدەكانی جەنگی ئوحود بوو نەیانشۆردن هەر بەخوێنەوه ناشتیانن.[1]

٢- كفنكردنی: كفنكردنی مردوو پێویستە پێویستییەكەی لە فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەرگیراوه: كە دەربارەی ئەو پیاوەی حوشترەكەی كلاندبوی‌و مردبوو، فەرمووی: «اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ»: بەئاوو بەسیدر بیشۆرن‌و لەدوو توێ قوماشدا كفنی بكەن.[2]

كفن یان نرخەكەی دەبێ لەماڵی مردوەكەبێ، تەنانەت ئەگەر ئەو ماڵەی لەدوای بەجێ مابوو هەمووی هەر بەشی كفنەكەی دەكردو هیچی لێ زیادنەدەبوو. ئەمەش بەگوێرەی حەدیثی خەبابی كوڕی (الأرث) كە دەگێڕێتەوه دەڵێ: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا هیجرەتمان كرد مەبەستمان ڕەزامەندی خودابوو، پاداشمان لای خودایە، هەمانە زوو مردو هیچی لەبەروبوومی خۆی نەخوارد لەوانە موصعەبی كوڕی عومەیر بوو هەشمانبوو بەروبوومی پێگەیی‌و بەروبوومی ماندوبوونی خۆی دەچنێ. موصعەب (بەر ڕەحمەت خودا بكەوێ) ڕۆژی ئوحود شەهیدبوو هیچمان چنگ نەكەوت بیكەین بەكفن بۆی جگە لە بوردەكەی خۆی، ئەگەر لای سەریمان پێ داپۆشیبایە قاچی بەدەرەوه بوو، ئەگەر لای قاچیمان داپۆشیبایە سەری بەدەرەوه دەبوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ كردین

---

[1] صحيح: (ص.ن/١٨٩٣) ، (الجنائز: ص/٥٤ - ٥٥)، خ(٣/٢١١/١٣٤٦)، د(٨/٤١٢/٣١٢٢).

[2] لەوەپێش ئاماژەی پێكرا.

کـه بـه بوردەکـەی سـەری داپۆشـینو لای قاچـی کـە دەمێنێتـەوە بـەگیای (ئیزخیر) داپپۆشین.[(١)]

ئـەوەی پێویـستە لـەکفندا ئەوەیـە قوماشـێك بـێ هـەموو جەسـتەی مردووەکە داپۆشێ، ئەگەر تەنها کراسێکی کورت هەبوو بەشی ئەوەی نەدەکرد هەموو جەستەی داپۆشێ، ئەوە لای سەری پێ دادەپۆشێو لای قاچی بەگیای (ئیزخیر) دادەپۆشرێ. وەکوو لە حەدیثی خەبابدا ئاماژەی پێ کرا.

## واباشە کفن چەند شتێکی تێدا رەچاوبکرێ

أ- قوماشـی سـپی، چـونکە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: «الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ فَإِنَّهَا خَيْرُ ثِيَابِكُمْ وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ».[(٢)] پۆشـاکی سـپی ببپۆشـن، چـونکە پۆشـاکی سـپی باشـترین پۆشـاکی ئێوەیـە، لـە قوماشی سپیدا مردووەکانتان کفن بکەن.

ب- کفنەکە سێ کفن بێ، لەبەر حەدیثی خاتو عائیشە (رەزای خـودای لێ بـێ) کـە دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەسـێ تـوێ قوماشی سپی دەستکردی شاری سەحوی یەمـەنی لەلۆکە دروستکراودا کفن کرا، نەکراسو نە مێزەری تێدا نەبوو.[(٣)]

ج- ئەگـەر بگونجـێ یـەکێك لەکفنـەکان قوماشـی حەبـەڕەی خەتخـەتی یەمەنی بێ. ئاماژە بەو حـەدیثەی جابیر ریوایەتیکردووە، دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا تُوُفِّيَ أَحَدُكُمْ فَوَجَدَ شَيْئًا فَلْيُكَفِّنْ

---

(١) متفق عليه: خ(١٢٧٦/١٤٢/٣)، م(٩٤٠/٦٤٩/٢)، د(٢٨٥٩/٧٨/٨)، ن(٣٨/٤)، ت(٣٩٤٣/٣٥٤/٥٨).

(٢) صحيح: (ص.ج/٣٢٣٦) ، (الجنائز/٦٢)، ت(٩٩٩/٢٣٢/٢)، د(٣٨٦٠/٣٦٢/١٠).

(٣) متفق عليه: (١٢٦٤/١٣٥/٣)، م(٩٤١/٦٤٩/٢)، د(٣١٣٥/٤٢٥/٨)، ت(١٠٠١/٢٣٣/٢).

فِـي ثَـوْبِ حِبَـرَةٍ ». ئەگـەر یـەکێ لـەئێوە مـرد، مـاڵو سـامانێکی هـەبوو، بـا لەقوماشی حیبەرەدا کفن بکرێ.[1]

## نوێژ لەسەر تەرم

نوێـژ لەسـەر مـردوی موسـوڵمان فـەرزی کیفایەیـە، چـونکە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەچەند فەرمودەیەکدا فەرمانی پێ کردوە.

یەکێك لەو فەرموودانە، ئەو فەرموودەیەیـە: کـە زەیـدی کـوڕی خالیـدی (اَلْجُهَنِی) ریوایەتی کـردووە، دەڵـێ: پیاوێـك لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی خەیبەردا مرد، ئەو روداوەیان بـۆ پێغەمبـەر بـاس کرد، فـەرمووی: «صَلُّوا عَلَى صَـاحِبِكُمْ»: نوێـژی جـەنازە لەسـەر هاوەڵەکـەتان بکەن.

خەڵکەکە بەوە تێکچونو سەرسام بوون، فەرمووی: «إِنَّ صَاحِبَكُمْ غَلَّ فِـى سَـبِيلِ اللّـهِ». ئـەم هاوەڵـەتان لـەکاتی غـەزاکردن لەڕێگـەی خـودادا خیانـەتی کـردوە. جـا زەیـد دەڵـێ: شـتومەکەکانی مردوەکـەمان پـشکنی چـەند دەنکـە میرویـەکمان دۆزییـەوە لـەمیروی جولەکـەکان بـوون نرخـی دوو دیرهـەمیان نەبوو.[2]

**دووجۆر مرۆڤ هەن لەو حوکمەی پێشوو چەرت دەکرێن:**

یەکەم: منداڵی نابالغ. خاتو عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموویـەتی: ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گیانی سپارد تەمەنی

---

[1] صحيح: (ص.ج/٤٥٥) ، (الجنائز/٦٣)، د(٣١٣٤/٤٢٥/٨).

[2] صحيح: (الجنائز/٧٩)، (٣٧٨/٢٦٩٣)، جة(٢٨٤٨/٩٥٠/٢)، ن(٤/٦٤).

هـەژدەمانگ بـوو، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نوێـژی لەسـەر نەکرد.[١]

دووەم: شـەهید. لـە ئەنەسـەوە ڕیوایـەتکراوە: کـە شـەهیدەکانی غـەزای ئوحود نەشۆردران و بەخوێنی خۆیانەوە نێژران و نوێژیشیان لەسەر نەکرا.[٢]

وەڵێ واجب نـەبوونی نوێـژ لەسـەر ئـەو دووجـۆرە مردوانـە مانـای ئـەوە ناگەیەنێ نوێـژکردن لەسـەریان دروسـت نـەبێ. ئـەوەتا خـاتو عائیـشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: منداڵێکی مردوی ئەنصارییان هێنایـە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش نوێژی لەسەر کرد.[٣]

لـە شـەددادی کـوڕی (ألهـاد)ەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پیـاوێکی عـەرەبی دەشتەکی هاتە خزمـەت پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئیمـانی پـێ هێناو شوێنی کەوت، پاشان وتی: لەخزمەتتدا کۆچ دەکەم.... کـەمێك مانـەوە، پاشـان کەوتنـە شـەڕ دژی دوژمـن، هێنـدەی پـێ نەچـوو هێنرایـە خزمـەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو جوببەکەیدا هەڵگیرابوو، تیرێکی لێ درابـوو... پاشـان پێغەمبـەر لەجبەکەیـدا کفنـی کـرد، ئـەمجار خـستیە پێشەوەو نوێژی لەسەرکرد.[٤]

هەتا کۆمەڵی نوێژکەران زۆرتربن خێری بۆ مردووەکە زۆرتـرە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویـەتی: « مَـا مِـنْ مـسلم تُـصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ مِائَةً كُلُّهُـمْ يَـشْفَعُونَ لَـهُ إِلاَّ شُـفِّعُوا فِيـهِ».[٥] هیچ

---

[١] حسن الأسناد (الجنائز.ص/٨٠)، (ص.د/٢٧٢٩)، دقفقرمووآ:(٣١٧١/٨/٤٧٦).

[٢] حسن: (ص.د/٢٦٨٨)، د(٣١١٩/٨/٤٠٨) هكذا مختصراً. ت(١٠٢١/٢/٢٤١) مطولاً.

[٣] صحيح: (ص.ن/١٨٣٩) ، م(٢٢٦٢/٤/٢٠٥٠)، ن(٤/٥٧).

[٤] صحيح: (ص.ن/١٩٥٢) ، ن(٦٠، ٤/٦١)، ك(٥٩٥ و ٣/٥٩٦)، هق(١٠-٤/١٦).

[٥] صحيح: (ص.ن/١٨٨١) ، م(٩٤٧/٢/٦٥٤)، ت(١٠٣٤/٢/٢٤٧)، ن(٤/٧٥).

موسـولْمانێك نیـه بمـرێو كۆمـهڵێك لـه موسـوڵمانان نوێـژی لهسـهر بكـهن ژمارهیــان بگاتــه ســهدو هــهموویان داوای لێخۆشــبوونی بــۆ بكــهن ئــیللا شهفاعهتهكهیان بۆی قبوڵ دهبێ.

ههروا فهرموودهیهكی تر، كه دهفـهرموێ: «مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً لاَ يُشْرِكُونَ بِاللَّـهِ شَيْئًا إِلاَّ شَـفَّعَهُمُ اللَّـهُ فِيـهِ»[1]: هـیچ پیـاوێكی موسـوڵمان نیـه بمـرێو چـل كـهس لهسـهر جهنازهكـهی نوێژبكـهن، هـهموویان یهكتاپهرسـتبنو كـهس نهكـهن بـه هـاوهڵی خـودا ئـیللا خـودا شهفاعهتو دوعاكانیان گیرادهكاو لهمردوهكه خۆش دهبێ.

واباشه نوێژكـهرهكان ههرچـهند كـهمیش بـن، خۆیـان بكـهن بهسـێ ریـز. لهمهرثهدی (ألیزنی)یهوه لـه مـالیكی كوڕی هوبـهیرهوه ڕیوایـهتكراوه، دهڵـێ: پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) فهرمووی: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيُـصَلِّى عَلَيْهِ ثَلاَثَةُ صُفُوفٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ أَوْجَبَ»[2]: هـیچ موسـوڵمانێك نیـه بمـرێو سـێ ریـز موسـوڵمان نوێـژی لهسـهربكهنو داوای لێخۆشـبونی بۆبكـهن ئـیللا دوعـاو پاڕانهوهكـهیان گیرادهبـن. مـهرثـهد دهڵـێ: مـالیكی كوڕی هوبـهیره كـه سهرپهرشتی نوێژكردنی جهنازهی دهكرد، خهڵكهكهی دهكرده سێ ریز ئـهوجا نوێژهكهی بهجێ دێنا، لهبهر فهرموودهكه، ئهگهر چهند جهنازهیـهك لـهپیاوو ئـافرهت ئامـادهكران بـۆ نوێـژ لهسـهركردن، ئهگـهر بـهجیا جیـا نوێـژ لهسـهر ههریهكهیان بكرێ ئـهوه باشـهو ئـهوه بنهمایـه. ئهگـهر بـهتێكڕا یـهك نوێـژی لهسهر هـهموویان كـرد، ئـهوهش دروسـته، بـهڵام دهبـێ لـهدانانی جهنازهكانـدا

---

[1] صحيح: (الصحيحة/٢٢٦٧)، م(٩٤٨/٦٥٥/٢)، د(٣١٥٤/٤٥١/٨)، جة(١٤٨٩/٤٧٧/١) بنحوه.

[2] حسن: (الجنائز/٩٩ - ١٠٠)، د(٣١٥٠/٤٤٨/٨)، ت(١٠٣٣/٢٤٦/٢)، جة(١٤٩٠/٤٧٨/١).

مێینــه مردوەکــان بخەنــه پــێش مێینــه نێرینــەکان. واتــه ریــزی مێینــەکان لەپێشەوە دابندرێن ئەمجار ریزی دوا ئەوان نێرینەکان بن لەبەردەم ئیمامدا.

له نافیعەوە لەئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە: کەنوێژی کردوە لەسەر نـۆ جـەنازە بەیـەکجار، پیاوەکـانی کخـستنه ریـزی نزیـك ئیمـامو ئافرەتـەکانی خـستنه ریـزی پێـشەوە بـۆلای قیبلـه، مـردوە مێینـەکانی کردنـه یـەك ریـزو جـەنازەی ئوممـو کولثـوم کـچی عـەلیو خێزانـی عومـەری کـوری (الخطـاب)و کـورێکی ئوممـو کـولثـومـیش کـەناوی زەیـد بـوو لـەناو جەنازەکانـدا بـوون، هـەموویان دانـدرانو ریزکـران، پێـشنوێژی ئـەو نوێژکردنـه سـەعیدی کـوری (العـاص) بـوو لـەناو نوێژکەرەکانـدا ئیبنـو عـەبباسو ئـەبو هـورەیرەو ئـەبو سـەعیدو ئـەبو قـەتادە، ئامـادەبوون، منداڵـه مردوەکـەیان لەپـەنا دایکـی دانەنابوو بەڵکوو خستبویانه ریـزی بـەردەمی ئیمـام، پیاوێـك دەڵـێ: رەخنـەم گرت لەو ریزکردنەو لەوە کە بۆچی منداڵەکەیان لەریزی دایکی دانەناوە، جا دەڵێ تەماشای ئیبنو عەبباسو ئەبو هورەیرەو ئـەبو سـەعیدو ئـەبو قـەتادەم کـردو وتم ئـەم ریزکردنـه بۆوایـە؟ وتیـان: ئـەو سـوننەتەو پـەیرەوی کردنـی پێغەمبەره[1]

## نوێژی جەنازە لەکوێ ئەنجام دەدرێ؟

دروسته نوێژی جەنازە لەمزگەوتدا بکرێ.

لـەخاتو عائیـشەوە ریوایـەتکراوە، فەرموویـەتی: (کاتێـك سـەعدی کـوری ئـەبی وەقـاص کۆچـی دوایـی کـرد، خێزانـەکانی پێغەمبـەر داوایـان کـرد جەنازەکەی بەرن بۆ مزگەوت بۆئەوەی ئەوانیش ئامادەی نوێـژ لەسـەرکردنی بن، جەنازەکـەیان بـرد لەبـەردەم دەرگـای ژوورەکـانی خێزانـەکانی پێغەمبـەر

---

[1] صحيح: (ص.ن/١٨٦٩) ، (الجنائز/١٠٣)، ن(٤/٧١).

دایانناو نوێژیان لەسەرکرد، دوایی لەدەرگای (الجنائز)ەوە بردیانە دەرەوە کە دەکەوتە لای (المقاعد)ەوە.

دوایی هەواڵ بەخێزانەکانی پێغەمبەر گەیشتەوە: کە خەڵك رەخنەیان لەم کارەی خێزانەکان گرتووەو وتویانە: بۆچی جەنازەیان بردۆتە مزگەوت، ئەم هەواڵە بە خاتو عائیشە گەیشتەوە، وتی: خەڵك بۆوا بەپەلە رەخنە لەشتێك دەگرن کە زانیارییان دەربارەی نیە، رەخنەی ئەوەیان لەئێمە گرتووە: کە جەنازە بهێندرێتە مزگەوتو لەوێ نوێژی لەسەربکەین. خۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتدا نەبێ نوێژی لەسەر سوهەیلی کوڕی بەیضا نەکرد.[1]

وەڵێ واباشە نوێژ لەسەرمردوو لەدەرەوەی مزگەوت ئەنجام بدرێ، شوێنێکی تایبەتی دیاریی بکرێ بۆ نوێژکردنی جەنازە. وەکوو لەسەردەمی پێغەمبەر باوبوو بەشێوەیەکی بەرچاو.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: جولەکەکان ژنو پیاوێکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر داوێن پیسییان کردبوو، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بە بەردەبارانکردنیان لەشوێنێك نزیك لەجێگای نوێژکردن لەسەر جەنازەو شوێنی دانانی جەنازە لێی لەلای مزگەوتەوە.[2]

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی لەدونیا دەرچوونی نەجاشی راگەیاندو هەر لەوڕۆژەدا کە

---

[1] صحيح: (ص.ن/١٨٥٩) ، م(٩٧٣ — ٢/٦٦٨/١٠٠) هذا لفظه ورواه مختصراً، د(٨/٤٧٧/٣١٧٣)، ن(٤/٦٨).

[2] متفق عليه: (الجنائز/١٠٦)، خ(٣/١٩٩/١٣٢٩)، م(١٦٩٩).

تێیدا وەفاتی کردبوو تەشریفی هاتەدەر بۆ شوێنی نوێژکردن لەسەر مردوو، موسوڵمانانی ریزکردو نوێژی دابەستو چوارجار (الله أكبر)ی کرد.[١]

لەنوێژکردنی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر نەجاشی، بەڵگەی ئەوە هەیە کە نوێژکردن لەسەر مردوی غائیب: کە بزاندرێ نوێژی لەسەرنەکراوە لەو وڵاتو شارەی تێیدا مردووەو دفن کراوە، دروستو مەشروعە. وەڵێ: کە بزاندرێ نوێژی لەسەرکراوە، بە غائیبانە نوێژکردن لەسەری دروست نیە، چونکە هیچ شتێك لەوبارەوە لە پێغەمبەرەوە نەقڵ نەکراوە، نەش بیستراوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر غەیری نەجاشی نوێژی مردوی بە غائیبانە کردبێ. بۆیەش نوێژی لەسەرکرد چونکە موسوڵمان بوو لەناو موشریكو وڵاتی کوفردا. ئەمە رای پەسەندی شێخی بەرێزی موسوڵمانان ئیبنو تەیمییەیەو ئەو زانایانەی هاوڕان لەگەڵیدا. وەکوو ئیبنولقەییمی فوتابیو فەقێی باسی کردوە.[٢]

نوێژی جەنازە دروست نیە لەناو گۆڕستاندا ئەنجام بدرێ. ئەمەش بەپێی حەدیثی ئەنەس کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەوەکرد کە نوێژی مردو لەناو گۆڕستاندا بکرێ.[٣]

### لەکاتی نوێژکردن لەسەر مردو ئیمام لەکوێوە رادەوەستێ؟

لە ئەبو (غالب الخياط)ەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێ: بەچاوی خۆم دیم ئەنەسی کوڕی مالیك نوێژی لەسەر جەنازەی پیاوێك کردلەلای سەریەوە وەستا بوو، کە جەنازەکەیان لابرد، جەنازەی ئافرەتێکی قوڕەیشی یان ئەنصاری هێندرا، بە ئەنەسیان گوت ئەی ئەبو حەمزە! ئەمە جەنازەی فلان

---

[١] متفق عليه: خ(١٢٤٥/١١٦/٣)، م(٩٥١/٦٥٦/٢)، د(٣١٨٨/٥/٩)، ن(٤/٧٢).

[٢] زاد المعاد: ج١/٥١٩ – ٥٢١.

[٣] اسناده حسن: (الجنائز/١٠٨) قال الألباني: رواه: طس(٢/٨٠/١).

ئافرەتی کچی فلانەو نوێژی لەسەر بکە، ئەومیش نوێژی لەسەر کرد، راونیم لەئاستی ناوقەدی تەرمەکەوە ڕاوەستا بوو، لەناو نوێژکەرەکاندا (العلاء)ی کوڕی زیادی (العدوی) هەبوو، کەدیتی پێشنوێژ شوێنی ڕاوەستانی لەسەر جەنازە بەگوێرەی ڕەگەزی مردووەکە جوداوازی هەیە، وتی ئەی ئەبو حەمزە! ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا لەسەر جەنازەی پیاوو ئافرەت دەوەستا وەکوو وەستانی تۆ؟ وتی بەڵێ: راوی حەدیثەکە دەڵێ: (العلاء) ئاوڕی دایەوە بۆلای ئێمەو وتی ئەمە لەبەر بکەن‌و پابەندی بن.[1]

## چۆنیەتی نوێژی جەنازە

لەسەر جەنازە چوار جار، یان پێنج جار، تا نۆجار (الله أكبر) دەکرێ، پێشنوێژ سەرپشکە دەتوانێ شێوازێك پەیڕەو بکا.

چوارجار (الله أكبر) کردن، ئەوە بەپێی حەدیثی ئەبو هورەیرە، کە گێڕاویەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی مردنی نەجاشی ڕاگەیاند لەو ڕۆژەدا کە تێیدا مردبوو، هاتە دەرەوە بۆ شوێنی نوێژکردنی جەنازەو خەڵکەکەی ڕیز کردو چوارجار (الله أكبر)ی کرد.[2]

پێنج جاریش بەپێی ئەو حەدیثەی کە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا گێڕاویەتیەوە دەڵێ: زەیدی کوڕی ئەرقەم لەسەر جەنازەی مردووی ئێمە چوارجار (الله أكبر)ی کرد، جارێکیش (الله أكبر)ی کرد، پرسیارم لێ کرد ئەوە

---

[1] صحيح: (ص. جه/١٢١٤)، د (٨/٤٨٤/٣١٧٨)، ت (٢/٢٤٩/١٠٣٩)، جه (١/٤٧٩/١٤٩٤).

[2] إسناده صحيح: (الجنائز/١١٣)، ك (٣/٤٠٩)، هق (٤/٣٦). لەوەپێش تێپەڕی.

بۆ پێنج جار (الله أكبر)ت كرد؟ وتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە (الله اكبر)ی كردووە.[(١)]

شەش جار یان حەوت جار، ئەوەش بە پێی هەندێ ئاثاری مەوقوفە كەئاماژە بەوە دەكەن، ئەم ئاثارو ریوایەتە مەوقوفانە لەحوكمی مەرفوع دان چونكە برێ لە گەورە گەورەی هاوەڵان بەو شێوازە بەئاگاداری هاوەڵانی تری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی جەنازەی كردووەو كەس ڕەخنەی لێ نەگرتوون.

لە عەبدوڵڵای كوڕی مەعقەلەوە گێردراوەتەوە: كە عەلی كوڕی ئەبو طالیب نوێژی لەسەر سەهلی كوڕی حەنیف كرد، شەشجار (الله أكبر)ی لەسەر كرد، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆلای ئێمەو فەرمووی: ئەم زاتە لەبەدرییەكانە هاوبەشی غەزای بەدری كردووە.[(٢)]

لە موسای كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی یەزیدەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: ئیمامی عەلی نوێژی لەسەر ئەبو قەتادە كرد حەوتجار (الله أكبر)ی كرد، ئەویش لەهاوەڵانی بەدر بوو.[(٣)]

لە (عبدخير)ەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: كە عەلی كوڕی ئەبو طالیب لەسەر بەدرییەكان شەشجار (الله أكبر)ی دەكرد، لەسەر كەسانی تر چوارجار (الله اكبر)ی دەكرد.[(٤)]

---

[(١)] صحیح: (ص. جه/١٢٢٢)، م (٢/٦٥٩/٩٥٧)، د (٨/٤٩٤/٣١٨١)، ت (٢/٢٤٤/١٠٢٨)، جه (١/٤٨٢/١٠٠٥)، (٤/٧٢).

[(٢)] إسناده صحيح: (الجنائز/١١٣)، ك (٣/٤٠٩)، هق (٤/٣٦).

[(٣)] إسناده صحيح: (الجنائز/١١٤)، هق (٤/٣٦).

[(٤)] إسناده صحيح: (الجنائز/١١٣)، قط (٢/٧٣/٧)، هق (٤/٣٧).

نۆجار (الله أكبر) كردن، له عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر (حەمزە) نوێژی كرد، نۆجار (الله أكبر)ی كرد.[1]

***وا مەشروعە كە لەكاتی (الله أكبر) كردنی یەكەمدا هەردوو دەستی بەرز بكاتەوە**

له عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژی جەنازەدا لە یەكەم (الله أكبر)كردندا دەستی هەڵدەبڕی ئیتر له (الله أكبر) كردنەكانی تردا دەستی هەڵنەدەبڕی.

ئەمجار دەستی ڕاستی دەخستە سەر پشتە دەستی چەپی. مەچەكی، قۆڵی. بەتوندی لەسەر سنگی دایدەنان.

له سەهلی كوڕی سەعدەوە هاتووە دەڵێ: خەڵك فەرمانیان پێ دەكرا: كەپیاو لەنوێژدا دەستی ڕاستی لەسەر باسكی چەپی دابنێ.[2]

*** ئەمجار دوای (الله أكبر)ی یەكەم سورەتی فاتیحەو سەورەتێكی تری قورئانی دەخوێنێ.**

له طەلحەی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عەوفەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: لەپشتی ئیبنو عەبباسەوە نوێژم لەسەر جەنازەیەك كرد، سورەتی فاتیحەو سورەتێكی تری قورئانی بەدەنگی بەرز خوێند، بەجۆرێك گوێمان لێ بوو، كە لێ بۆوە، دەستیم گرتو پرسیارم لێ كرد لە وەڵامدا وتی: بۆیە بەدەنگی بەرز خوێندم تابزانن ئەوە حەقو سوننەتە[3] فاتیحەو قورئان بە ئەسپایی

---

[1] إسناده صحيح: (الجنائز/٨٢) شرح المعاني للطوى ج١/٢٩٠.

[2] لەوە پێش لەباسی (گردارە سوننەتەكانی نوێژدا تێپەڕی).

[3] صحيح: (الجنائز/١١٩)، ن (٤/٧٥). خوێندنی فاتیحە بەتەنها. بڕوانە خ (١٣٣٥/٢٠٣/٣)، د (٣١٨٢/٤٩٥/٨)، ت (١٠٣٢/٢٤٦/٢)، جه (١٤٩٥/٤٧٩/١).

دەخوێندرێن، ئەمەیش بەگوێرەی ئەو حەدیثەی ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل. کە دەڵێ: (سوننەت وایە لەنوێژی جەنازەدا کە لەپاش (الله أكبر) کردنی یەکەمجار بەئەسپایی سورەتی فاتیحە بخوێندرێ، پاشان سێ (الله أكبر)ی تر بکرێو لەدوا (الله أكبر) کردنی کۆتایی سڵاو بدرێتەوە)[1]

پاش خوێندنی فاتیحە (الله أكبر)ی دووەم دەکرێ صەلاوات لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەدرێ، ئەمەش بەگوێرەی حەدیثی (ئەبو ئومامە)ی ناوبراو، گوایە یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی پێداوە: کە سوننەت وایە بۆ نوێژی جەنازە، ئیمام (الله أكبر) بکا پاشان سورەتی فاتیحە بە ئەسپایی لەدوا (الله أكبر) کردنەکە بخوێنێ، ئەمجار (الله اكبر)ی دووەم بڵێو صەلاوات لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێ بدا، پاشان دوعا بۆ مردووەکە بکا لە دوا (الله أكبر)ی سێیەم، هیچ شتێ لەقورئان نەخوێنێ، ئەمجار (الله أكبر) بکاو بەئەسپایی سڵاو بداتەوە[2] ئەمجار (ألله أكبر)ی یەکەمو فاتیحە خوێندنو (الله اكبر)ی دووەمو صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەباقی (الله أكبر)ەکانی تردا دەبێ بەئیخلاصەوە لەناویاندا دوعا بۆ مردووەکە بکا، ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی: « إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى الْمَيِّتِ فَأَخْلِصُوا لَهُ الدُّعَاءَ »: کەنوێژتان لەسەر مردو کرد بەدڵو بەئیخلاص داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن[3] دەبێ لەنوێژەکەدا دوعا بۆ مردووەکە بکا بەو شێوەیەی لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستراوەو چەسپاوەو دەبێ بەو دوعایانەی ریوایەتکراون دوعا بۆ مردوەکە

---

[1] إسناده صحيح: (الجنائز/١١١)، ن (٤/٧٥).

[2] صحيح: (الجنائز/١٢٢)، فع فی الأم (١/٢٧٠)، هق (٤/٣٩).

[3] حسن: (الإرواء/٧٣٢)، (ص. ج/٦٦٩)، د (٨/٤٩٦/٣١٨٣)، جه (١/١٤٩٧).

بكا. بڕێ لەو دوعایانە ئەو دوعاو نزایەیە کە لە عەوفی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەر جەنازەیەك کرد، لەدوعایەکەی ئەمەم لەبەر کرد: کە فەرمووی: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ وَأَهْلاً خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ أَوْ مِنْ عَذَابِ النَّارِ». خودایە لێی خۆش ببە، بەزەییت پێدا بێتەوە، عەفوی بکە، لێی ببورە، ڕێزی بگرەو شوێنی خۆشی بدەرێ، جێگاو مەکانی فراوان بکە، بەئاوو بەفرو تەرزە بیشۆ، لەتاوان پاکی بکەرەوە، وەکوو چۆن قوماشی سپی لەچڵك پاك دەکرێتەوە. خانو جێگای حەوانەوەی پێ ببەخشە باشتر بێ لەخانوی جیهانی. خاوو خێزانێکی بدەرێ لەخاوو خێزانی دونیای چاکتر بێ، خێزانێکی وای پێ ببەخشە لەخێزانی دونیای باشتر بێ، بیخەرە ناو بەهەشتی خۆتەوە. عەوف دەڵێ: کە گوێم لەم دوعایەی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو، ئاواتەخوازی ئەوە بووم من ئەو مردووە بومایە.[1]

دوعاکردن لەنێوان (الله أکبر) کردنی کۆتاییو سلاّودانەوەدا مەشروعو ڕەوایە. بەگوێرەی حەدیثی ئەبو یەعفور: کە لە عەبدوڵلاّی کوڕی ئەبو ئەوفاوە دەیگێڕێتەوە، دەڵێ: عەبدوڵلاّم بینیو ئامادە بووم نوێژی لەسەر جەنازەیەك کردو چوارجار (الله أکبر)ی کرد، پاشان ماوەیەك وەستا خەریکی دوعاکردن بوو، پاشان وتی: ئەرێ واتان زانی من پێنج جار (الله أکبر)م کرد؟ وتیان نەخەیر، وتی: پێغەمبەر عادەتی وابوو چوارجار (الله أکبر)ی دەکرد[2]

---

[1] صحيح: (الجنائز/١٢٣)، م (٢/٦٦٢/٩٦٣)، جه (١/٤٨١/١٥٠٠)، ن (٤/٧٣).

[2] إسناده صحيح: (الجنائز/١٢٦)، هق (٤/٣٥).

پاشان دوو سڵاو دەداتەوە بەلای ڕاستیو بەلای چەپیدا وەکوو سڵاودانەوەی نوێژە فەرزەکان، ئەمەش بەپێی حەدیثی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) کە دەڵێ: سێ ڕەوشت هەن سێ کردار هەن. کاتی خۆی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیکردن، کەچی خەڵك وازیان لێ هێناوە، یەکێك لەوانە سڵاودانەوەیە لەنوێژی جەنازەدا وەکوو سڵاودانەوە لەنوێژە فەرزەکاندا.[1] دروستە هەر یەك سڵاو بدرێتەوە، بەسڵاودانەوە بەلای ڕاستدا کیفایەت بکا، بەگوێرەی حەدیثی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەر جەنازەیەك کرد، چوارجار (الله أكبر)ی کردو یەك سڵاوی دایەوە.[2]

لەبەر ناعیلاجی نەبێ دروست نیە نوێژکردن لەسەر جەنازە لەو کاتانەدا کەنوێژ کردن تێیاندا یاساغە. ئەمەش بەپێی حەدیثی عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) کە دەڵێ: سێ سەعات هەن سێ کات هەن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لێ دەکردین کەنوێژی تێدا بکەین، یان مردوومانی تێدا بنێژین، کاتێك خۆرهەڵدێ هەتا بەرز دەبێتەوە. کاتێك خۆر لەناوەڕاستی ئاسماندا دەبێ هەتا لادەدا، کاتێك خۆر بەرەو ئاوابوون شۆڕ دەبێتەوە هەتا ئاوا دەبێ.[3]

## گەورەییو فەڕی نوێژکردن لەسەر جەنازەو شوێنکەوتنی بۆ گۆڕستان

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ وَلَمْ يَتْبَعْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ فَإِنْ تَبِعَهَا فَلَهُ

---

[1] إسناده صحيح، (الجنائز/١٣٦)، هق (٤/٣٥).

[2] إسناده حسن (الجنائز/١٣٧)، هق (٤/٤٣).

[3] لەوە پێش لەباسی ئەو کاتانەدا کەنابێ نوێژی تێدا بکرێ رابورد.

قِيرَاطَانِ»: کەسێك نوێژ لەسەر جەنازەیەك بكاو لەگەڵیدا نەچێ بۆ گۆڕستان، ئەوە بەئەندازەی قیراتێك خێری دەگاتێ، ئەگەر وێڕای نوێژ لەسەر کردنی شوێنی کەوت بۆ گۆڕستان ئەوە بەئەندازەی دوو قیراط خێری دەگاتێ. گوترا (قیراط) چیە؟ فەرمووی: {أصغرهما مثل أحد} بچوكترینیان بە ئەندازەی کێوی ئوحودە. ئەم پاداشەی شوێنکەوتنی جەنازە تایبەتە بەپیاوانەوەو بۆ ئافرەت نیە. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە کە ئافرەت شوێن مردوو بکەون بۆ گۆڕستان، وەڵێ پێویستە ئەوە بزاندرێ کە نەهییەکە بۆ تەنزیهەو بۆ تەحریم نیە.

ئوممو عەطیە (رەزای خودای لێ بێ) لەم بارەوە دەڵێ: ئێمە نەهیمان لێ کراوە لەشوێنکەوتنی جەنازە بەڵام نەهی کردنەکە بەجەختکردنەوە نیەو تەحریم ناگەیەنێ.[1]

دروست نیە شوێن جەنازە بکەوی بەشتێکەوە پێچەوانەی شەرع بێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەق دوو شتی دیاری کردووە، فەرموویەتی: «لاَ تُتْبَعُ الْجَنَازَةُ بِصَوْتٍ وَلاَ نَارٍ».[2] نابێ لەکاتی بردنی جەنازە بۆ گۆڕستان گریانو دەنگە دەنگو بخور سوتاندنو شتیوا ئەنجام بدرێ، دەبێ بەبێ دەنگیو بیرکردنەوە لەدوارۆژو یادکردنەوەی پەروەردگارو تۆبەو ئیستغفار مردو بەرێ بکرێ.

تەنانەت دەنگ بەرزکردنەوە بەذیکرو صەڵاواتیش دەکەوێتە بەر نەهییەکەو نابێ لەپێش جەنازەکەوە، بەدەنگی بەرز ذیکری خودا بکرێ، چونکە بیدعەیەو داهێندراوە، هەم لەبەر ئەو قسەیەی (قیسی کوڕی عەبباد) کە دەڵێ: (هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێیان ناخۆش

---

[1] متفق علیه: خ (١٢٧٨/١٤٤/٣)، م (٩٣٨/٦٤٦/٢)، د (٣١٥١/٤٤٩/٨)، جه (١٥٧٧/٥٠٢/١).

[2] حسن: (الجنائز/٧٠)، د (٣١٥٥/٤٥٣/٨).

بوودەنگ بەرز بكرێتەوە لەكاتی بەرێ كردنی جەنازەدا)[١] هەروەها چونكە لاسایی كردنەوەی گاورەكانە لەكاتی بردنی مردوویاندا شتێك لەئینجیل بەدەنگی بەرز دەخوێننەوەو هەندێ ذیكرو طقوسی تایبەت بەخۆیان بەشێوەی لەحنو غەمباری بەدەنگی بەرز دەخوێنن.

لەوەش خراپتر بەرێ كردنی مردووە بەتەپڵو دەفو مۆسیقا بەشێوەیەكی حەزینو خەمۆكی، وەكوو لەهەندی وڵاتی ئیسلامیدا بەشێوەی لاسایی كردنەوەی كافرەكان پەیرەو دەكرێ.

پێویستە بەپەلەو خێرایی جەنازە ببرێ بۆ سەر گۆڕستان. بەبێ شانهەڵتەكاندنو گورگەلوقە، چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ عَلَيْهِ وَإِنْ تَكُنْ غَيْرَ ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ».[٢] بەخێرایی مردو بەرێ بكەن، چونكە ئەگەر صالحو چاك بێ، ئەوە بەخێرایی دەیگەیەننە ئەو خێرو خۆشییەی بۆی ئامادەكراوە، خۆ ئەگەر وانەبێ، ئەوە شەڕو نەگبەتیەكە لەشانی خۆتانی دادەماڵن.

دروستە لەكاتی بەرێ كردنی جەنازەدا لەپێشیەوەو لەدوایەوەو لەڕاستو چەپیەوە بڕۆی، بەمەرجێك لێیەوە نزیك بێ، مەگەر بەسواری، ئەگەر كەسێك سوار بوو، دەبێ لەدواوەی بڕوا، ئەمەیش بەگوێرەی حەدیثی (المغيرە)ی كوڕی شوعبە: كە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « الرَّاكِبُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ وَالْمَاشِي حَيْثُ شَاءَ».[٣] ئەوەی سوارە لەدوای جەنازەوە بڕوا، ڕۆیندە (پیادە) بەئارەزوی خۆی.

---

[١] رجاله ثقات: (الجنائز/٧١)، هق (٤/٧٤).

[٢] لەوە پێش رابورد.

[٣] صحيح: (ص. ج/٣٥٣٣)، ت (٢/٢٤٨/١٠٣٦)، ن (٤/٥٥)، د (٨/٤٦٧/٣١٦٤).

وەڵێ ڕۆیشتن لەدواوەی باشترە، چونکە فەرمودەکەی پێغەمبەر کە دەفەرموێ: «وَاتَّبِعُوا الْجَنَائِزَ»: شوێن جەنازەکان بکەون، ئەوە دەخوازێ کە لەدواوەی جەنازە بڕۆی. فەرموودەکەی ئیمامی عەلی پشتگیری ئەوە دەکاو دەفەرموێ: (ڕۆیشتن لەدوا جەنازەوە گەورەترە لەڕۆیشتن لەپێشەوەی بە ئەندازەی گەورەیی نوێژی پیاو بەجەماعەت لەبەرامبەر نوێژێ بەتەنیا بیکا)[1]

**دەبێ موسوڵمان کە چووە ناو گۆڕستانەوە یان بەلای‌دا تێپەڕی چی بڵێ؟**

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد ئەگەر ڕێم کەوتە گۆڕستان چییان پێ بڵێم؟ فەرمووی: « قُولِي السَّلاَمُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَيَرْحَمُ اللَّهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَلاَحِقُونَ».[2]

بڵێ: سڵاو لەسەر ئەهلی ئەم دەڤەرە بێ لەبڕواداران لە موسوڵمانان، خودا ڕەحم‌و بەزەیی خۆی بڕژێنێ بەسەر ئەوانەماندا کە پێشمان کەوتوون‌و ئەوانەمان کە دواکەوتوون، ئێمە خودا یار بێ پێتان دەگەین‌و دێینەلاتان.

لە سولەیمانی کوڕی بوڕیدەوە لەباوکییەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاوەڵانی فێردەکرد: کەچۆن بۆ گۆڕستان بڵێین: «السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَلاَحِقُونَ أَسْأَلُ اللَّهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ».[3] سڵاوتان لێ بێ ئەی ئەهلی

---

[1] إسناده صحيح: (الجنائز/٧٤)، هق (٤/٢٥).

[2] صحيح: (ص. ج/٤٤٢١)، (الجنائز/١٨٣)، م (٩٧٤ – ١٠٣/٦٦٩/٢)، ن (٤/٩١).

[3] صحيح: (ص. ن/١٩٢٨)، م (٢/٦٧١/٩٧٥)، ن (٤/٩٤).

وڵاتـی بـڕواداران و موسـوڵمانان، ئێمـه خـوا یاربـێ پێتـان دەگـەین داوای سەرفرازی لەخودا دەکەین و بۆ خۆمان و بۆ ئێوە.

## دفنکردن

ناشتن و ژێرخاك کردنی مـردو پێویـستەو دەبێ ئـەنجام بـدرێ تەنانـەت ئەگـەر مردووەکـە ناموسـوڵمانیش بـێ، چـونکە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) بەعەلی کوڕی ئـەبو طالیبی فـەرمووی: - کەهـەواڵی مردنـی ئـەبو طالیبی پێدرا – (إِذْهَبْ فَوارِهِ): برۆ ئەبو طالیب ژێر خاك بکەو بیشارەوە.[1]

سـوننەت وایـە مـردو لەگۆڕسـتاندا بخرێتـە گـۆڕەوە، چونکە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) هەمیـشە مـردووی لەگۆڕسـتانی (البقیـع)دا دفـن دەکردن، وەکوو بەتەواتور هەواڵی ئەوە ریوایـەتکراوە: هـەروەکوو نەبیـستراوە کەسێك لەسەلەفی صاڵح لەغـەیری گۆڕسـتاندا دفـن کرابـێ، جگـە لـەوەی کـە بەتـەواتور بەئێمـە گەیـشتووە کـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەحوجرەی خـۆی دفـن کـراوە، ئەمـەش شـتێکە تایبەتمەنـدە بـەخودی پێغەمبـەرەوە، وەکـوو حـەدیثی خـاتو عائیـشە دەیگەیـەنێ. کـە دەفـەرموێ: (کاتێك پێغەمبەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) گیـانی پـاکی سـپارد، هـاوەڵان کەوتنە کێشەی ئەوەوە لەکوێ بینێژن، حـەزرەتی ئـەبو بـەکر فـەرمووی: مـن شتێکم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بیستووە لەبیرم نەچۆتەوە، فـەرمووی: «مَـا قَـبَضَ اللّـهُ نَبِيًّـا إِلاَّ فِـي الْمَوْضِـعِ الَّـذِي يُحِـبُّ أَنْ يُـدْفَنَ فِيـهِ». پـەروەردگار گیـانی هـیچ پێغەمبـەرێکی وەرنەگرتۆتـەوە، ئـیللا لـەو شـوێنەدا مراندویـەتی کـەپێی خۆشـە تێیـدا دفـن بکـرێ. ئـیتر هـاوەڵان بڕیاریـان دا

---

[1] صحیح: (ص. ن/١٨٩٥)، ن (٤/٧٩).

لەشوێنی جێگا نوستنی حاڵی ژیانیدا دفنی بکەن، لەجێگای خۆی گۆڕیان بۆ هەڵکەندو دفنیان کرد.[١]

شەهیدانی گۆڕەپانی جەنگ لەم حوکمە چەرت دەکرێن، ئەوان لەو شوێنەی تێدا شەهید بوون دەنێژرێن‌و ناگوێزرێنەوە بۆ گۆڕستان، ئەمەیش بەپێی حەدیثی جابیر (رەزای خودای لێ بێ) کە دەڵێ: (کە ڕۆژی ئوحود ئەو کۆمەڵە هاوەڵە شەهید کران، هەڵگیران بۆ ئەوەی بگوازرێنەوە بۆ گۆڕستانی (البقیع) جاڕدەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جاڕیدا وتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانتان پێ دەکا: کە شەهیدەکان لەجێگای شەهیدبوونی خۆیان بنێژن)[٢]

* **دروست نیە مردو لەگۆڕنان لەم کاتانەدا کەباسیان دەکەین، مەگەر لەبەر ناعیلاجی.**

١- لەعوقبەی کوڕی عامیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: سێ کات هەن پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی لێ کردین کەنوێژی تێدا بکەین، یان مردووی خۆمانی تێدا لەگۆڕ بنێین. کاتێک خۆرهەڵدێ تا بەرزدەبێتەوە. کاتێک خۆر دەگاتە ناوەڕاستی ئاسمان تا لادەدا. کاتێک خۆر شۆڕ دەبێتەوە بۆ ئاوابوون تا ئاوا دەبێ.[٣]

٢- لەجابیرەوە هاتووە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) باسی پیاوێکی کرد لەهاوەڵانی کە گیانی سپاردووە، بەکفنێکی کەموکوڕ کفن کراوەو بەشەو لەگۆڕ نراوە، ئیتر پێغەمبەر ناڕەزامەندی خۆی دەربڕی لەوەی پیاو بەشەو لەگۆڕ بندرێ، هەتا نوێژی لەسەر نەکرێ، مەگەر بارودۆخەکە

---

[١] صحیح: (ص. ن/١٨٩٣)، د (٨/٤٤٦/٣١٤٩)، ن (٤/٧٩)، ت (٣/١٣٠/١٧٧١).

[٢] صحیح: (ص. ن/١٨٩٣)، د (٨/٤٤٦/٣١٤٩)، ن (٤/٧٩)، ت (٣/١٣٠/١٧٧١).

[٣] لەوەپێش تەخریج کرا.

وابخوازێو ناچاری پاڵیان پێوه بنێ، ئەگەر ناچار بوون بەشەو مردوو بنێژن ئەوە دروستە، تەنانەت ئەگەر پێویست بوو چرا بەکاربهێنن بۆ داهێڵانی جەنازەکە بۆ ناوگۆڕ، ئەمەیش بۆ کارئاسانی ناشتنەکە، هەروەها بەپێی حەدیثەکەی ئیبنو عەبباس کە دەفەرموێ: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی مردووی بەشەو خستە ناو گۆڕەوەو چرایەکی بۆ ئاسانکاری دفنکردنەکە بەکارهێنا)[١]

## پێویستە گۆڕ قوڵ بێو فراوان بێو ڕێكوپێك بێ

له هیشامی کوڕی عامیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کەرۆژی ئوحود هاتە پێشەوە ئەوەی کوژرا کوژرا لە موسوڵمانان، کەسانێکیش بریندار بوون، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! هەڵکەندنی گۆڕ لەئەستۆی ئێمەدایە، بۆ هەرکەسێ توانای هەبێ، چۆن فەرمانمان پێ دەکەی گۆڕەکان هەڵکەنین؟! فەرمووی: «احْفِرُوا وَأَوْسِعُوا وَأَعْمَقُوا وَأَحْسِنُوا وَادْفِنُوا الاِثْنَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ وَقَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآنًا»: گۆڕەکە هەڵکەنن، فراوانی بکەن، قوڵی بکەن، ڕێكوپێك راستەو پاستەی بکەن، دوو دوو سێ سێ بیانخەنە گۆڕەکەوە، کێیان پتر قورئانی لەبەرە ئەو پێش بخەن لەناشتندا. جا هیشام دەڵێ باوکم سێیەم کەس بوو، چونکە لەهەمووان پتر قورئانی لەبەر بوو، بۆیە خرایە پێشەوە.[٢]

دوو جۆر گۆڕ دروستە بەشێوەی (لحد) کەبریتیە لەوە گۆڕەکە قوڵ بکرێ ئەمجار لەقوڵاییدا لادڕ بکرێو شوێنی تەرمەکە بیبڕێزرێو تەرمەکەی تێبخرێ، یان بەشێوەی (شق) گۆڕپچە: کەبریتیە لەوەی لەتەختی گۆڕەکە شوێنی تەرمەکە بەصندوقی هەڵبکەندرێو تەرمەکەی بخرێتە ناو، سەری

---

[١] حسن: (الجنائز/١٤١)، ت (١٠٦٣/٣٦٠/٢).

[٢] صحيح: (الجنائز/١٤٦)، ن (٤/٨٠)، د (٣١٩٩/٣٤/٩)، ت (١٧٦٦/١٢٨/٣).

گۆڕیـچەکە بـە تەلەبـەردو شـتی وا داپۆشـرێ ئـەمجار گۆڕەکـە بـەگڵ پـڕ بکرێتەوە. ئەم دوو جۆرە پەسەندن، چونکە لەسـەردەمی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باوبوونو کاریان پێ کراوە، بەڵام یەکەمیان باشترە.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: کـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) وەفـاتی کـرد، لەمەدینـەدا پیاوێـك هـەبوو وەسـتای گـۆڕ لادرکردن بوو، پیاوێکی تـریش هـەبوو گـۆڕی هەڵدەکەنـد بەشـێوەی گۆڕیـچە، هاوەڵان وتیان ئێمە ئیستیخارە دەکەین لـەخودای خۆمـانو دەنێـرین بۆلایـان، کامەیان زوو هات گۆڕەکە بەئەو هەڵدەکەنین، ناردیان بۆلایان، ئەوەیان پێشتر هات کەپیشەی گۆڕهەڵکەند بوو بەشێوەی (لەحـد). ئـیتر گـۆڕی لەحـدیان بـۆ پێغەمبەر هەڵکەند.[1]

داهێڵانی تەرم بۆ نـاو گـۆڕ دەبـێ پیـاو ئـەنجامی بـدەن، تەنانـەت ئەگـەر مردووەکە مێینەش بـێ، نابـێ ئـەو ئەرکـە بخرێتـە ئەسـتۆی ئـافرەت، چونکە لەسـەردەمی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـەوە بـاوبووە، لـەدوای ئەویش موسوڵمانان پەیڕەوی ئەو ڕێبازەی پێغەمبەریان کردووە هەتا ئەمڕۆ.

خزمو کەسوکاری مردو لەکەسانی دی شیاوترن بـۆ داهێڵانـی مـردوو بـۆ نـاوگۆڕ، ئامـاژە بـە فـەرمووەدەی پـەروەردگار کـە دەفـەرموێ: {وَأُوْلُـو الْأَرْحَـامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّٰهِ – الأحزاب/٦}.

هەروا ئاماژە بەحەدیثی ئیمامی عەلی کە دەفەرموێ: (پێغەمبـەرم شـۆرد (دروودی خودای لەسەر بـێ) سـەرەنجم دا ئـاخۆ مـردو چـی لێ دێو جەسـتەی چۆن دەگۆڕێ، هیچم لـەو بارەیـەوە بـەدی نـەکرد، بەڕاسـتی پێغەمبـەر پـاكو بۆنخۆشو ڕوخسار شیرین بوو بەزینـدوییو بەمردووی، ئەوانـەی سەرپەرشـتی داهێڵانـی تـەرمی پێغەمبـەریان کـرد بـۆ نـاو گـۆڕو دەفنکردنـی چـوارکەس

---

[1] إسناده حسن: جه (١/٤٩٦/١٥٥٧).

لەئەستۆیان گرت (عەلی)و (العباس)و (الفضل)و (صالح)، کەمەولای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو، لادرێك بۆ پێغەمبەر لێ دراو ئەمجار تەرمی پیرۆزی خرایە ناوی‌و بەخشت زارکی لادرەکە هەڵچندرا.[1]

دروستە مێرد سەرپەرشتی لەگۆڕنانی ژنی خۆی بکا، ئەمەیش ئاماژە بەحەدیثی خاتو عائیشە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ژووری من لەو ڕۆژەدا کە نەخۆشییەکەی لێ دیاری دابوو، وتم ئای کەسەرم دێشێ، فەرمووی: (وددت أن ذالك كان وأنا حي، فَهَيّئتك ودفنتك): پێم خۆش بوو من زیندوو بومایە، کەتۆ دەمردی بۆئەوەی ئامادەم بکردییایە دفنم بکردیایە.[2]

وەلێ مەرجە ئەو پیاوەی ئەرکی لەگۆڕنانی مردوو دەخاتە ئەستۆی خۆی نابێ ئەو شەوە لەگەڵ خێزانی‌دا جوت بووبێ، ئەگینا نابێ ئەرکی دفن کردن بگرێتە ئەستۆی، یەکێکی تر شیاوترە بەدفنکردنی، تەنانەت ئەگەر بێگانەش بێ. ئەمەیش بەپێی حەدیثی ئەنەس: کە دەڵێ: ئێمە ئامادەی بەخاك سپاردنی کچێکی پێغەمبەر بووین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر گۆڕەکە دانیشتبوو، بینیم چاوەکانی فرمێسکیان دەباراند، پاشان فەرمووی: « هَلْ مِنْكُمْ رَجُلٌ لَمْ يُقَارِفِ اللَّيْلَةَ؟». پیاوێکتان تێدایە ئەمشەو لەگەڵ خێزانی جوت نەبووبێ؟ ئەبو طەلحە وتی: من ئەی پێغەمبەری خودا! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: {فَأنْزِلْ} دابەزە ناو گۆڕەکە، ئەنەس دەڵێ: ئیتر ئەبو طەلحە دابەزییە ناو گۆڕەکە.[3]

---

[1] إسناده صحيح: ك (١/٣٦٢)، هق (٤/٥٣).

[2] صحيح: حم (١٤٤/٦)، وهو فى صحيح البخارى بنحوه (١٠٢/١٠١/١٠)، ومسلم (١١٠/٧).

[3] صحيح: (الجنائز/١٤٩)، خ (٣/١٣٤٢).

سوننەت وایە مردو لەدوا گۆڕەکەیەوە، لەولایەوە کەدوایی قاچی دەکەنێ رادەست بکرێ بۆ ناو گۆڕ، ئەمەیش بەپێی حەدیثی ئەبو ئیسحاق: کە ریوایەت دەکا دەڵێ: (أَوْصَى الْحَارِثُ أَنْ يُصَلِّي عَلَيْهِ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ يَزِيدَ فَصَلَّى عَلَيْهِ ثُمَّ أَدْخَلَهُ الْقَبْرَ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيِ الْقَبْرِ وَقَالَ هَذَا مِنَ السُّنَّةِ).[1] حاریث وەصیەتی کرد: کەمرد عەبدوڵڵای کوڕی یەزید نوێژی لەسەر بکا، ئەویش نوێژی لەسەر کرد، دوایی لەلای شوێن قاچی مردووەکە، خستیە گۆڕەوە. وتی: ئەوە پەیڕەویکردنی سوننەتە.

مردوو لەناو گۆڕدا لەسەر لاتەنیشی راستی دادەنرێو روی لەقیبلە دەکرێ، سەری بۆلای راستی قیبلەو قاچی بۆلای چەپی قیبلە بێ. موسوڵمانان هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە تا ئەمڕۆ بەو شێوە مردویان لەگۆڕناون.

ئەو کەسەی مردووەکە دەخاتە ناو ئەلحەدەوە، دەڵێ: «بِسْمِ اللّٰهِ وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللّٰهِ أَو مِلَّةِ رَسُولِ اللّٰهِ». لەئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە مردوو دەخرایە ناو گۆڕەوە، دەیفەموو: «بِسْمِ اللّٰهِ وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللّٰهِ».[2]

هەروا ئاماژە بەحەدیثی (البیاضی) (رەزای خودای لێ بێ) کە لە پێغەمبەرەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « الْمَيِّتُ إِذَا وُضِعَ فِي قبره فليقل الذين يضعونه حين يوضع في اللحد: «بِسْمِ اللّٰهِ وَبِاللّٰهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللّٰهِ -صلى الله عليه وسلم-».[3] مردو کەخرایە ناو گۆڕەکەی، با ئەو کەسانەی لەناو گۆڕەکە دایدەنێن لەکاتی

---

[1] إسناده صحيح: (الجنائز/١٥٠)، د (٩/٢٩/٣١٩٥).

[2] صحيح: (الجنائز/١٥٢)، د (٩/٣٢/٣١٩٧)، ت (٢/٢٥٥/١٠٥١)، جه (١/٤٩٤/١٥٥٠).

[3] إسناده حسن (الجنائز).

دانانیدا لەناو ئەلحەدەکەی بڵێن: بەناوی خودا پشت بەستن بەخوداو لەسەر ئایینی پاکی ئیسلامو ئایینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

وا سوننەتە بۆ ئەو کەسەی لای گۆڕەکەیە کەدوای هەڵچنینی لادرەکە سێ چنگ گڵ هەڵبگرێ، بەسەر گۆڕەکەدا بڵاوی بکاتەوە، ئاماژە بەحەدیثی ئەبو هورەیرە کە ڕیوایەتی کردووە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەر جەنازەیەك کرد، دوایی تەشریفی هاتە سەر گۆڕەکەی سێ چنگ گڵی بەسەر لای سەری مردووەکەدا بڵاو کردەوە.[1]

## لەدوای دفنکردنی مردو چەند شتێك سوننەتن

یەکەم: گۆڕەکە بەئەندازەی بستێك لەزەوی بەرز بکرێتەوە، لەگەڵ زەویدا تەخت نەکرێ، ئەمەش بۆ ئەوەی بزاندرێ کە ئەوە گۆڕەو ڕێزی لێ بگیرێو ئیهانە نەکرێ، هەروا ئاماژە بە حەدیثی جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گۆڕەکەی بەشێوەی لەحد هەڵکەندرا، خشتی لەسەر ڕیزکران بە ئەندازەی بستێك لەزەوی بەرز کرابووەوە.[2]

دووەم: گۆڕەکە تەسنیم بکرێ: واتە ئەو بستەی بەرز دەکرێتەوە لای سەروی تەسك بکرێتەوە پێچەوانەی تەسطیح بێ. ئەمەیش بەگوێرەی حەدیثی سوفیانی (التمار) کە دەڵێ: (گۆڕی پێغەمبەرم بینی بەتەسنیم کراوی)[3]

---

[1] صحيح: (الإرواء/٧٥١)، جه (١٥٦٥/٤٩٩/١).

[2] صحيح: (الجنائز/١٥٤)، خ (١٣٩٠/٢٥٥/٣).

[3] حسن: (الجنائز/١٥٥)، د (٣١٩٠/٢٢/٩).

سێیەم: بە بەردو شتی وا سنوری دیاری بکرێو نیشانە بکرێ، واتە: کێلێ لەلای سەروی‌و خواروی بچەقێندرێ، بۆ ئەوەی خاوەن مردووی مردی خۆی بناسێتەوەو لەوەدوا ئەگەر مردوی تری هەبوون بتوانێ لەنزیك ئەوەوە بییان نێژێ، ئەمەیش بەپێی حەدیثی (المطلب)ی کوڕی ئەبو وەداعە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: کە عوثمانی کوڕی مەظعون وەفاتی کرد، جەنازەکەیان دەفنکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەپیاوێك کرد بەردێکی بۆ بێنێ، کابرا بەردەکەی بۆ هەڵنەگیرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بەلای بەردەکەوە قۆڵی لێ هەڵماڵین. (المطلب) دەڵێ: ئەو کەسەی ئەم حەدیثەی بۆ گێڕامەوە وتی: ئێستاش سپیایەتی قۆڵو باسکی پێغەمبەرم لەبەرچاوە، کە هەڵی کردن‌و پاشان بەردەکەی هەلگرت‌و هێنای لەلای سەری گۆڕەکەوە داینا، ئەمجار فەرمووی: «أَتَعَلَّمُ بِهَا قَبْرَ أَخِي وَأَدْفِنُ إِلَيْهِ مَنْ مَاتَ مِنْ أَهْلِي». بەهۆی ئەم بەردەوە گۆڕی براکەم دەزانم، هەر خزم‌و کەسوکارێکم مرد لەوەدوا لەنزیك ئەمەوە دەیان نێژم.

چوارەم: دوای دەفنکردنی لەسەر گۆڕەکەی ڕابوەستێ‌و دوعای باش وەڵامدانەوەو چەسپان لەسەر بیروباوەڕی ڕاست‌و صەحیح‌و نەشڵەژان لەکاتی پرسیاری فریشتەی مونکەرو نەکیری بۆبکا، هەروا داوا لێخۆشبوونی بۆ بکاو داوای لەئامادەبووانی سەر گۆڕەکەش بکا بەو دووعاو نزایانە بۆی.

ئەمەیش بەگوێرەی حەدیثی عوسمانی کوڕی عەفان کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داب‌و نەریتی وابوو، کە لەدەفنکردنی جەنازە دەبووەوە لەسەر گۆڕەکەی دەوەستاو دەیفەرموو: «اسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ وَسَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ فَإِنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ». داوای لێخۆشبوون بۆ برا موسوڵمانەکەتان

بكەن، لەخودا بپارێنەوە نەشڵەژێ، بێگومان ئێستا ئەو لەلایەن فریشتەی تایبەتەوە پرسیاری لێ دەكرێ.

دروستە لەكاتی دفنكردنی جەنازەدا لەلای گۆڕ دابنیشی، بە مەبەستی یاد خستنەوەی ئامادەبووان بە ڕوداوی مردنو قۆناغەكانی دوای ئەو كارەساتە، ئەمەیش بەپێی حەدیثی (البراء)ی كوڕی عازیب: كە دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕێو ڕەسمی بەخاكسپاردنی جەنازەی پیاوێكی ئەنصاریدا دەرچووین، گەیشتینە گۆڕەكە هێشتا لادڕ نەكرابوو، ئێمە لەوێ بەدەوریەوە دانیشتین، بێ دەنگو بێ چرپە گوێچكەمان كلۆر كردبوو بۆ فەرمایشتەكانی، دەتگوت باڵندە بەسەرمانەوە وەستاوە، تەشریفی چیلكەیەكی بەدەستەوە بوو زەوی بەردەمی خۆی پێ دەهاژنیەوە، سەری هەڵبڕیو فەرمووی: «اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ». پەنا بگرن بەخواد لە عەزابی گۆڕ، دووجار یان سێ جار ئەم فەرموودەیەی دووبارە كردەوە، پاشان فەرمووی:

«إِنَّ الْعَبْدَ الْمُؤْمِنَ إِذَا كَانَ فِي انْقِطَاعٍ مِنَ الدُّنْيَا وَإِقْبَالٍ مِنَ الآخِرَةِ نَزَلَ إِلَيْهِ مَلاَئِكَةٌ مِنَ السَّمَاءِ بِيضُ الْوُجُوهِ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الشَّمْسُ مَعَهُمْ كَفَنٌ مِنْ أَكْفَانِ الْجَنَّةِ وَحَنُوطٌ مِنْ حَنُوطِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَجْلِسُوا مِنْهُ مَدَّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَجِيءُ مَلَكُ الْمَوْتِ عَلَيْهِ السَّلاَمُ حَتَّى يَجْلِسَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَيَقُولُ أَيَّتُهَا النَّفْسُ الطَّيِّبَةُ اخْرُجِي إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ قَالَ: فَتَخْرُجُ تَسِيلُ كَمَا تَسِيلُ الْقَطْرَةُ مِنْ فِي السِّقَاءِ فَيَأْخُذُهَا فَإِذَا أَخَذَهَا لَمْ يَدَعُوهَا فِي يَدِهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ حَتَّى يَأْخُذُوهَا فَيَجْعَلُوهَا فِي ذَلِكَ الْكَفَنِ وَفِي ذَلِكَ الْحَنُوطِ وَيَخْرُجُ مِنْهَا كَأَطْيَبِ نَفْحَةِ مِسْكٍ وُجِدَتْ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ – قَالَ – فَيَصْعَدُونَ بِهَا فَلاَ يَمُرُّونَ – يَعْنِي بِهَا – عَلَى مَلإٍ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ إِلاَّ قَالُوا مَا هَذَا الرُّوحُ الطَّيِّبُ فَيَقُولُونَ فُلاَنُ بْنُ فُلاَنٍ بِأَحْسَنِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانُوا يُسَمُّونَهُ بِهَا فِي الدُّنْيَا حَتَّى يَنْتَهُوا بِهَا إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَسْتَفْتِحُونَ لَهُ فَيُفْتَحُ لَهُمْ فَيُشَيِّعُهُ مِنْ كُلِّ

سَمَاءٍ مُقَرَّبُوهَا إِلَى السَّمَاءِ الَّتِى تَلِيهَا حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ اكْتُبُوا كِتَابَ عَبْدِى فِى عِلِّيِّينَ وَأَعِيدُوهُ إِلَى الأَرْضِ فَإِنِّى مِنْهَا خَلَقْتُهُمْ وَفِيهَا أُعِيدُهُمْ وَمِنْهَا أُخْرِجُهُمْ تَارَةً أُخْرَى - قَالَ - فَتُعَادُ رُوحُهُ فِى جَسَدِهِ فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ فَيَقُولاَنِ لَهُ مَنْ رَبُّكَ فَيَقُولُ رَبِّىَ اللَّهُ. فَيَقُولاَنِ لَهُ مَا دِينُكَ فَيَقُولُ دِينِىَ الإِسْلاَمُ. فَيَقُولاَنِ لَهُ مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِى بُعِثَ فِيكُمْ فَيَقُولُ هُوَ رَسُولُ اللَّهِ. فَيَقُولاَنِ لَهُ وَمَا عِلْمُكَ فَيَقُولُ قَرَأْتُ كِتَابَ اللَّهِ فَآمَنْتُ بِهِ وَصَدَّقْتُ. فَيُنَادِى مُنَادٍ فِى السَّمَاءِ أَنْ صَدَقَ عَبْدِى فَأَفْرِشُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَأَلْبِسُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَافْتَحُوا لَهُ بَاباً إِلَى الْجَنَّةِ - قَالَ - فَيَأْتِيهِ مِنْ رَوْحِهَا وَطِيبِهَا وَيُفْسَحُ لَهُ فِى قَبْرِهِ مَدَّ بَصَرِهِ - قَالَ - وَيَأْتِيهِ رَجُلٌ حَسَنُ الْوَجْهِ حَسَنُ الثِّيَابِ طَيِّبُ الرِّيحِ فَيَقُولُ أَبْشِرْ بِالَّذِى يَسُرُّكَ هَذَا يَوْمُكَ الَّذِى كُنْتَ تُوعَدُ فَيَقُولُ لَهُ مَنْ أَنْتَ فَوَجْهُكَ الْوَجْهُ يَجِىءُ بِالْخَيْرِ فَيَقُولُ أَنَا عَمَلُكَ الصَّالِحُ. فَيَقُولُ رَبِّ أَقِمِ السَّاعَةَ حَتَّى أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِى وَمَالِى. قَالَ وَإِنَّ الْعَبْدَ الْكَافِرَ إِذَا كَانَ فِى انْقِطَاعٍ مِنَ الدُّنْيَا وَإِقْبَالٍ مِنَ الآخِرَةِ نَزَلَ إِلَيْهِ مِنَ السَّمَاءِ مَلاَئِكَةٌ سُودُ الْوُجُوهِ مَعَهُمُ الْمُسُوحُ فَيَجْلِسُونَ مِنْهُ مَدَّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَجِىءُ مَلَكُ الْمَوْتِ حَتَّى يَجْلِسَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَيَقُولُ أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْخَبِيثَةُ اخْرُجِى إِلَى سَخَطٍ مِنَ اللَّهِ وَغَضَبٍ - قَالَ - فَتُفَرَّقُ فِى جَسَدِهِ فَيَنْتَزِعُهَا كَمَا يُنْتَزَعُ السَّفُّودُ مِنَ الصُّوفِ الْمَبْلُولِ فَيَأْخُذُهَا فَإِذَا أَخَذَهَا لَمْ يَدَعُوهَا فِى يَدِهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ حَتَّى يَجْعَلُوهَا فِى تِلْكَ الْمُسُوحِ وَيَخْرُجُ مِنْهَا كَأَنْتَنِ رِيحِ جِيفَةٍ وُجِدَتْ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ فَيَصْعَدُونَ بِهَا فَلاَ يَمُرُّونَ بِهَا عَلَى مَلأٍ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ إِلاَّ قَالُوا مَا هَذَا الرُّوحُ الْخَبِيثُ فَيَقُولُونَ فُلاَنُ بْنُ فُلاَنٍ بِأَقْبَحِ أَسْمَائِهِ الَّتِى كَانَ يُسَمَّى بِهَا فِى الدُّنْيَا حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيُسْتَفْتَحُ لَهُ فَلاَ يُفْتَحُ لَهُ ». ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- (لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِى سَمِّ الْخِيَاطِ) « فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ اكْتُبُوا كِتَابَهُ فِى سِجِّينٍ فِى الأَرْضِ السُّفْلَى فَتُطْرَحُ رُوحُهُ طَرْحاً ». ثُمَّ قَرَأَ (وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ الرِّيحُ فِى

مَكَانِ سَحِيقٍ). « فَتُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَدِهِ وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ فَيَقُولاَنِ لَهُ مَنْ رَبُّكَ فَيَقُولُ هَاهْ هَاهْ لاَ أَدْرِى. فَيَقُولاَنِ لَهُ مَا دِينُكَ فَيَقُولُ هَاهْ هَاهْ لاَ أَدْرِى. فَيَقُولاَنِ لَهُ مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِى بُعِثَ فِيكُمْ فَيَقُولُ هَاهْ هَاهْ لاَ أَدْرِى. فَيُنَادِى مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ أَنْ كَذَبَ فَافْرِشُوا لَهُ مِنَ النَّارِ وَافْتَحُوا لَهُ بَاباً إِلَى النَّارِ فَيَأْتِيهِ مِنْ حَرِّهَا وَسَمُومِهَا وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِ قَبْرُهُ حَتَّى تَخْتَلِفَ فِيهِ أَضْلاَعُهُ وَيَأْتِيهِ رَجُلٌ قَبِيحُ الْوَجْهِ قَبِيحُ الثِّيَابِ مُنْتِنُ الرِّيحِ فَيَقُولُ أَبْشِرْ بِالَّذِى يَسُوءُكَ هَذَا يَوْمُكَ الَّذِى كُنْتَ تُوعَدُ. فَيَقُولُ مَنْ أَنْتَ فَوَجْهُكَ الْوَجْهُ يَجِيءُ بِالشَّرِّ فَيَقُولُ أَنَا عَمَلُكَ الْخَبِيثُ فَيَقُولُ رَبِّ لاَ تُقِمِ السَّاعَةَ».

بێگومان بەندەی موسوڵمان کەپشتی لەدونیا کردو رووی کردە قیامەتو دونیای بەجێ هێشت، چەند فریشتەیەك لەئاسمانەوە دادەبەزنە لای ڕوخسار سپیو ڕوناك دەڵێی ڕوخساریان خۆری روناکە، چەند کفنێکیان پێیە لەکفنی بەهەشت. دەرمانو بۆنی خۆش بۆ کفنیان پێیە لەدەرمانو بۆنی بەهەشت. لای دادەنیشن هەتا چاو بڕبکا فریشتەیەو دانیشتون، پاشان فریشتەی گیانکێشان (سڵاوی خودای لێ بێ) دێتە لایو لای سەریەوە دادەنیشێو دەڵێ: ئەی گیانی خاوێن! وەرەدەر بۆلای رەزامەندیو لێخۆشبوونی خودا، دەفەرموێ: ئیتر گیانەکە بەهێواشیو لەسەرەخۆیی دێتەدەر، وەکوو چۆن دڵۆپە ئاو لەزارکی گۆزەو شتی واوە دێتەدەر، ئیتر وەری دەگرێ، کە وەری گرت لای خۆی چاو لێکنانێك نایهێڵێتەوە، هەتا فریشتەکان وەری دەگرنو دەیخەنە ناو ئەو کفنو بۆنو بەرامەی لەبەهەشتەو هێناویانە، لەناو ئەو کفنو بۆنە خۆشە دێتەدەر وەکوو بۆنخۆشترین پارچە میسکی سەرزەوی.. دەفەرموێ: ئەمجار بەرزی دەکەنەوە، بەلای هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا بیبەن، دەڵێن: ئەو گیانە پاکە کێیەو چییە؟ دەڵێن: فلانی کوری فلانە بەجوانترین ناو ناوی دێنن، لەو ناوانەی کە لەژیانی دونیایدا بانگی پێ لێ دەکرا. هەتا

دەیگەیەننە ئاسمانی دونیا، دەرگای ئاسمانی بۆ دەکەنەوە، ئەمجار لەهەموو ئاسمانێك فریشتە موقەڕەبەکان بەڕێی دەکەن بۆ ئاسمانی ژوروتر، هەتا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم، ئەمجار پەروەردگار دەفەرموێ: نامەی کرداری بەندەی من لە (عیللیین)دا بنووسن‌و بیگێڕنەوە بۆسەر زەوی، چونکە من لەخاك دروستم کردوون دەشیانخەمەوە ناو زەوی‌و جارێکی تر لەو زەوییە دەیانهێنمەوە دەرو زیندوویان دەکەمەوە، دەفەرموێ: ئیتر گیانەکەی دەگەڕێندرێتەوە بۆناو لاشەی، ئەمجار دوو فریشتە دێنە لای‌و دادەنیشن‌و پێی دەڵێن: کێ خودای تۆیە؟ دەڵێ: خودای من (الله)یە، ئەمجار دەڵێن: ئایینت چییە؟ دەڵێ: ئایینی من ئیسلامە، دەڵێن: ئەی ئەو پیاوە کێیە نێردراوە بۆسەر ئێوە؟ دەڵێ: ئەوە پێغەمبەری خودایە، دەڵێن: چوزانی ئەو پێغەمبەرە؟ دەڵێ: قورئانم خوێندۆتەوە، بڕوام پێ کردووەو بەڕاستم زانیوە، ئیتر بانگدەرێك لەئاسمانەوە بانگ رادەدێرێ، بەڕاستی بەندەی من راست دەکا، لە بەهەشتەوە راخەرو پێخەفی بۆ بەرن‌و پۆشاکی بەهەشتی لەبەربکەن‌و دەرگایەکی لەبەهەشتەوە بۆ بکەنەوە، دەڵێ: ئیتر لە بۆن‌و بەرامی بەهەشت بۆنێکی بۆدێ‌و تاچاو بڕبکا گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ، ئەمجار پیاوێکی روخسار جوان، پۆشاك خاوێن‌و جوان دێ بۆلای‌و پێی دەڵێ: مزگێنی بەشتێك کە کەیفخۆشت دەکا، ئەمە ئەو رۆژەیە: کە وادەت پێ درابوو، دەڵێ ئەتۆ کێی؟ روخسارت بەخێرو فەرە؟ دەڵێ: من کردەوە باشەکەتم. ئەمجار دەڵێ: خودایە! وابکە قیامەت رابێ بەڵکوو بگەڕێمەوە بۆ ناو ماڵ‌و منداڵی خۆم.

دەڵێ: بەندەی بێباوەڕ کە لەدونیا دابڕاو روی کردە قیامەت‌و کەوتە گیانەڵاوەوە، لە ئاسمانەوە چەند فریشتەیەکی روخسار رەش‌و دیمەن ناشیرین دادەبەزنە لای، چندراوێکی زبری ئاڵۆشاوییان پێیە، هەتا چاو بڕبکا ئەو

فریشتانه لەدەوری دادەنیشن، پاشان فریشتەی گیانکێشان دێتە لای، تا لای سەرییەوە دادەنیشێ دەڵێ: ئەی گیانی پیس و بۆگەن؛ وەرەدەر بۆ قین و قاری خودا، دەڵێ: ئەو نەفسە کەرت و پەرت دەبێ لەناو جەستەیدا، دەری دەهێنێ وەکوو چۆن شیشی سوورەوەکراو بەناو خوری شێداردا بێنی، گیانەکە وەردەگرێ، جا کەوەری گرت، چاولێکنانێك مۆڵەتی نادەن هەتا دەیخەنە ناو ئەو چندراوە زبرە خەرار ئاسایە، بۆگەنێکی زۆر ناخۆشی لێ دێتەدەر، بەجۆرێك بۆگەنی وا لەسەر زەوی بۆن نەکرابێ، بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان، بەلای هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا تێپەڕن پێیان دەڵێن: ئەم بۆگەنە پیسە چیە؟ دەڵێن: گیانی فلانی کوڕی فلانە، بەناشیرین ترین ناوی کە لەژیانی دونیادا بانگی پێ لێ کراوە، ناوی دەهێنن هەتا دەیگەیەننە ئاسمانی دونیا، داوای دەرگا کردنەوەی بۆدەکەن، دەرگای بۆ ناکرێتەوە، ئەمجار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئایەتی {لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاء وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ – الأعراف/٤٠}ی خوێندەوە پەروەردگار دەفەرموێ: نامەی کرداری لە (سجّين)دا لەنزمترین شوێنی زەویدا بنووسن، ئەمجار گیانەکەی فڕێ دەدرێ، پاشان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئایەتی {وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ – الحج/٣١} خوێندەوە. ئەمجار فەرمووی: گیانەکەی دەگەڕێندرێتەوە بۆناو جەستەی و دوو فریشتە دێنە لای دادەنیشن و پێی دەڵێن: خودای تۆ کێیە؟ دەڵێ: ها ها نازانم، دەڵێن: ئایینت چیە؟ دەڵێ: هاها نازانم. دەڵێن: ئەو پیاوە کێیە کە کراوە بە پێغەمبەرتان؟ دەڵێ: هاها، نازانم. ئەمجار بانگکەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکا، ئەوە درۆدەکا، فەرشی ئاگرینی بۆ راخەن، دەرگای ئاگری بۆ بکەنەوە، ئیتر گەرمایی و بۆن و هاڵاوێکی بۆدێ کە تەنگی پێ هەڵدەچندرێ و گۆڕی لێ تەنگ دەبێ و گۆڕەوشار

دەدرێ بەجۆرێك پەراسوی تێك دەپەڕن، ئەمجار پیاوێكی پۆشاك ناشیرین‌و روخسار بەدو نەكڵەوەت‌و بۆگەن دێتەلای، پێی دەڵێ: موژدەی ئەوەت لێ بێ كە ناڕەحەت‌و سزا لەسەر توندكراوی، ئەمە ئەو رۆژەیە كەوادەت دراوەتێ، دەڵێ: تۆ كێی؟ روخسارت شەڕی لێ دەبارێ؟ دەڵێ: مـن كارە ناشیرینەكەتم. دەڵێ: خودایە وابكە قیامەت رانەبێ.

لە ریوایەتێكدا: (پاشان نەكڵەوەتێكی كوێرو كەڕو لاڵی بەسەر رادەگا، چەكوشێكی بەدەستەوەیە، ئەگەر بەكێو بكێشرێ دەیكاتە تەپ‌و تۆز، بەو چەكوشە لێی دەداو دەبێتە خۆڵەمێش، پاشان پەروەردگار وەك خۆی لێ دەكاتەوە، ئەمجار زەبرێكی ترێ ئاڕاستە دەكرێ، هاوارێك دەكا هەموو شتێك گوێی لێیە جگە لە ئادەمیزادو پەری.[1]

## تەعزیەو سەرەخۆشی

رەوایە سەرەخۆشی لە كەس‌وكاری مردوو بكرێ بەشتێك: كە ببێتە مایەی سێبوری‌و تەسەللا هاتنیان‌و غەمرەوێنییان‌و هەڵیان بنێ بۆ رازی بوون بە قەزاو بڕیاری پەروەردگار، خۆڕاگری‌و صەبرو ئارام بەو شێوەی لە پێغەمبەرەوە چەسپاوە: كە سەرەخۆشی لەخاوەن مردوو كردوە، ئەمە ئەگەر ئەو فەرموودەو دەقانەی لەبەربون‌و دەیتوانی بەكاریان بێنێ، ئەگەر هیچی لەو فەرمودانە لەبەرنەبوو، با بەقسەی كاریگەری خۆی‌و بەشێوەیەك مەبەستەكە بپێكێ‌و پێچەوانەی شەرع نەبێ سەرەخۆشی‌و تەعزیەكە ئاڕاستەی خاوەن مردو بكا.

لە ئوسامەی كوڕی زەیدەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) یەكێ لە كچەكانی هەواڵی بۆ

---

[1] صحیح: (الجنائز/١٥٩) ، حم(٥٣/٧٤/٧)، د(٤٧٢٧/٨٩/١٣).

نـارد کـە منـداڵێکی یـان کـوڕێکی لـە گیانـەڵاو دایـەو خەرێکـە گیـان دەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهەواڵ هێنی فەرمووی: «ارْجِعْ إليهـا فَأَخْبِرْهَا أَنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ ، وَلَهُ مَا أَعْطَى ، وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْـدَهُ بِأَجَـلٍ مُـسَمًّى ، فَمُرْهَـا فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ». بچۆرەوە بۆلای‌و پێی بڵێ: خـودا هەرچی بـداو هەرچی ببەخـشێ هـەمووی هـی خۆیـەتی، هـەموو شـتێك لای خـودا تەمـەنی دیـاری کراوی خۆی هەیە، ئـەمجار بـە فلانـی کـچم بڵـێ: بـە صـەبرو ئـارام بـێ داوای پاداش لەخودا بکا.[1]

## پێویستە خۆ لەدوو شت بپارێزێ، هەرچەند خەڵکی باری پێوە گرتبێ

١- کۆبوونـەوە بـۆ تـەعزییـەو سەرەخۆشـی لەشـوێنێکی تایبـەتی وەکـوو هۆڵ‌و خانوو مزگەوت.

٢- دروسـتکردنی خواردەمـەنی بۆئەوانـەی دێـن بـۆ تـەعزییـە لەلایـەن کـەس‌وکاری مـردووەوە، ئـەم دوو دیاردەیـە حـەرامن بـەپێی ئـەو حـەدیثـەی جەریری کوڕی عەبدوڵلای (البجلی) (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: ئێمـە کۆبوونەوەو فەرمباڵغی کردن لە دەورەی خاوەن مـردوو خـواردن دروسـتکردن لەلایەن ئەوەوە بۆ تەعزییەکاران دوای دفنکردنی مردووەکە، بەنیاحـەو وایـە شێرەکردن‌و شین‌و گریانی حەرامامان حسێب دەکردن.[2]

بەڵکوو سوننەت ئەوەیە خزم‌و جیرانـی خـاوەن مـردو خـواردن سـازبکەن بۆ ماڵی مردوەکەو تێریان بکەن. ئەمەش بەپێی حەدیثـی عەبـدوڵلای کـوڕی جەعفـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) ڕیوایـەت دەکـا دەفـەرموێ: کـە هـەواڵی شەهیدبوونی جەعفەر گەیشتە مەدینە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر

[1] صحيح: (الجنائز/١٥٩)، حم(٧/٧٤/٥٣)، د(١٣/٨٩/٤٧٢٧).

[2] صحيح: (ص.جة/١٣٠٨) ، (١/٥١٤/١٦١٢).

بێ) فەرمووی: « اصْنَعُوا لآلِ جَعْفَرٍ طَعَاماً فَقَدْ أَتَاهُمْ أَمْرٌ يَشْغَلُهُمْ أَوْ أَتَاهُمْ مَا يَشْغَلُهُمْ».[1] خواردن بۆماڵی جەعفەر دروست بکەن، ئەوان کارەساتێکیان هاتۆتەرێ کەنایان پرژێ بۆخۆیان خواردن بۆ خۆیان ئامادەبکەن.

## ئەوەی مردوو سوودی لێ دەبینێ

مردو سودمەند دەبێ لە کردارو گوفتاری کەسانی دی بەچەند شتێك:

١- دوعاو پاڕانەوەی موسوڵمان بۆی. وەکوو قورئان دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ – الحشر/١٠} ئەو موسوڵمانانەی دوا ئەوان دێنە گۆڕەپانی ژیانەوەو بۆ برا موسوڵمانەکانی پێش خۆیان دەپاڕێنەوە: دەڵێن: لێمان خۆشبە هەم لەوبرا موسوڵمانانەشمان خۆش ببە کەپێش ئێمە بەئیمانەوە گەڕاونەوە بۆلای تۆو دونیایان جێ هێشتووە. خودایە دڵمان پاك بکەیەوە هیچ کینو بوغزێکی تێدا نەهێڵیەوە. ئەی پەروەردگاری ئێمە بێگومان تۆ خودایەکی بەڕەحمو بەزەییو لێخۆشبونت زۆرە.

هەروەها ئامارە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ كُلَّمَا دَعَا لأَخِيهِ بِخَيْرٍ قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ آمِينَ وَلَكَ بِمِثْلٍ».[2] دوعاو پاڕانەوەی مرۆڤی موسوڵمان بۆ برای موسوڵمانی لە پاشملە گیرایەو دوعاو پاڕانەوەکەی لای خودا قبوڵە. لەلای سەریەوە فریشتەیەك ئەو ئەرکەی پێ

---

[1] حسن: (ص.ج/١٠١٥)، د(٣١١٦/٤٠١/٨)، ت(١٠٠٣/٢٣٤/٢)، ج(١٦١٠/٥١٤/١).

[2] صحيح: (ص.ج/٣٣٨١) ، م(٢٧٣٣/٢٠٩٤/٤).

سپێراوه: كه هەركاتێ دوعای خێری بۆ براكەی كرد، ئەو فریشتەیە دەڵێ: خودایە پاڕانەوەكەی لێ وەربگرە بۆ ئەمیش ئەوەندە خێرو فەڕ بنووسە.

٢- دانەوەی قەرز، مردو ئەگەر قەرزی لەسەربوو دەبێ بەزوویی قەرزەكەی بۆ بدرێتەوە، جا هەركەسێك بۆی بداتەوەو بەرعودەی قەرزەكانی بێ دروستە، وەكوو لەوەپێش ئاماژەی پێ كرا؛ كە ئەبو قەتادە بەرعودەی ئەو دوو دینارە بوو؛ كە لەسەر مردوەكە بوو.

٣- جێبەجێ كردنی نەزرو فۆتۆی مردوەكە، رۆژوبێ یان شتی تر. ئەمەش بەپێی حەدیثی سەعدی كوڕی عوبادە؛ كە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پرسیارم له پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد وتم: دایكم مردوە نەزری لەسەربوو چی بكەم؟ پێغەمبەر پێی فەرموو (إقضه عنها) لەجیاتی ئەو نەزرەكە جێبەجێ بكە.[1]

٤- هەر خێرو چاكەیەك منداڵی صاڵح بیكا، باوكو دایكی لێی سودمەند دەبن قورئان دەفەرموێ: {وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى – النجم/٣٩} ئادەمیزاد تەنها سود له كۆشش‌و كرداری خۆی دەبینێ.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ وَإِنَّ وَلَدَهُ مِنْ كَسْبِهِ». بێگومان باشترین خواردنێك مرۆڤ دەیخوا ئەوەیە بەروبومی دەستی خۆی بێ، بێگومان منداڵیش بەری كۆشش‌و كاسبییەتی.

٥- مردوو هەرشتێك لەدواخۆی جێ بێڵێ لەكرداری باش‌و صەدەقەی جاری، لێی سودمەند دەبێ.

[1] متفق علیه: خ(٥/٣٨٩/٢٧٦١)، م(٣/١٢٦٠/١٦٣٨)، د(٩/١٣٤/٣٢٨٣)، ت(٣/٥١/١٥٨٦)، ن(٧/٢١).

له ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ إِلاَّ مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ »[1]: کە مرۆڤ مرد پەیوەندی بەدونیاوە نامێنێ‌و سود لەکردەوە نابینی جگە لەسێ جۆر کردەوە یەکێکیان صەدەقەی جاری‌و بەردەوام، یان زانیارییەك کەسانی تر سودی لێ وەربگرن، یان منداڵێکی صالح دوعای بۆ بکاو بۆی لەخودا بپاڕێتەوەو داوای لێخۆشبوون لەتاوانی بۆ بکا.

## دیدەنی گۆڕستان

زیارەتی گۆڕستان بە مەبەستی پەند وەرگرتن‌و یادکردنەوەی ڕۆژی دوایی ڕەوایە، بەمەرجێك لەچوونەکەیدا شتێك نەڵێ‌و نەکا خودا لەخۆی بڕەنجێنێ، وەکوو ئەوە لەمردوی ناو گۆڕەکە بپاڕێتەوە، لەجیاتی لەخودا داوای پێداویستی‌و یارمەتیدان بکا داوا لە گۆڕەکە بکاو کارو گوفتاری لەم جۆرە.

له ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتکراوە، ووتویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنِّي نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا فَإِنَّ فِيهَا عبرة ولا تقولوا ما يسخط الرب»[2]: بێگومان من لەوەپێش نەهی ئەوەم لێ کردبوون کە زیارەتی گۆڕستان بکەن، ئێستا پێتان دەڵێم: دیدەنی گۆڕستان بکەن چونکە پەندو ئامۆژگاری لێ وەردەگرن. بەڵام کە دەچن بۆ دیدەنی گۆڕستان شتێك مەکەن‌و مەڵێن خودا لەخۆتان بڕەنجێنن.

---

[1] صحيح: (ص.ج/٧٩٣) ، م(١٦٣١/١٢٥٥/٣)، د(٣٨٦٣/٨٦/٨)، ت(١٣٦٩/٤٠٦/٢)، ن(٢٥/٦).

[2] صحيح: (الجنائز/١٧٩) ، ك(٣٧٤/١)، هق(٧٧/٤).

ئافرەت وەكوو پیاو وایە لەوەدا كە بۆی هەیە زیارەتی گۆڕستان بكا، چونكە ئەو عیللەتو بایيسەی پێغەمبەر دیاری كردوە بۆ ڕەوایی دیدەنی گۆڕستان بۆ پیاوو ئافرەت چون یەكە، هەروا ئاماژە بەو حەدیثەی لەوەپێش ئاماژەی پێكرا، دەربارەی ئەوەی ئاخۆ لەكاتی دیدەنی گۆڕستاندا چ بگوترێو چ دوعایەك بكرێ؟!

خاتو عائیشە دەفەرموێ: پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد ئاخۆ ئافرەت ئەگەر دیدەنی گۆڕستانی كرد چ بڵێ؟ ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فێری كرد چی بڵێو نەهی لێ نەكرد، ئەوەشی پێ نەفەرموو: كە ئافرەت بۆی نیە زیارەتی گۆڕستان بكا.

## وەلێ دیدەنی ئافرەت بۆ گۆڕستان چەند مەرجێكی هەیە

١- دەبێ باڵا پۆش بێو بە ئەدەبو حیشمەتەوە دەربچێو خۆ بۆنخۆش نەكاو مەظاهیری زینەو جوانی خۆی دەرنەخا.

٢- نابێ لای گۆڕەكە كردارو گوفتاری حەرام ئەنجام بدا وەكوو شینو شەپۆڕو وایەشێرە.

٣- نابێ زوو زوو دیدەنی گۆڕستان بكا، ئەمەش بەپێی ئەو فەرموودەی ئەبو هورەیرە ریوایەتی كردووە كە: (أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ –صلى الله عليه وسلم– لَعَنَ زَوَّارَاتِ الْقُبُورِ).[1] پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفرینی لەوانە كردووە كە زۆر دیدەنی گۆڕستان دەكەن.

٤- نابێ ڕۆژێكی دیاری كراو بكاتە ڕۆژی دیدەنییەكەی، وەكوو پێنج شەممەی یەكەمو دووەمی مانگ ڕۆژی چلەی مردوو ڕۆژی هەینیو جەژنەكانو ئەو جۆرە كاتانە.

---

[1] حسن: (ص. ت/١٠٥٦)، ت (٢/٢٥٩/١٠٦١)، جه (١/٥٠٢٠/١٥٧٦).

## ئەو شتانەی حەرامن لای گۆڕ بکرێن

١- ئاژەڵ سەربڕین لەلای گۆڕ بەمەبەستی ڕەزامەندی خودا، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « لاَ عَقْرَ فِي الإِسْلاَمِ ». لەئاینی ئیسلامدا ئاژەڵ سەربڕین لەسەر گۆڕ نیە، عەبدوڕەزاقی کوڕی هەممام دەڵێ: پێش هاتنی ئیسلام خەڵکی لەسەر گۆڕستان ڕەشەوڵاخ و مەڕیان سەردەبڕی.[1]

٢-٦: هەر کارێك ئەم حەدیثەی دوایی لەخۆی گرتبێ.

لەجابیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەوە کرد کە گۆڕ بەگەچ سواغ بدرێ، یان لەسەری دابنیشی، یان بینای لەسەر بکرێ، یان لەگۆڕەکە زیاد بکرێ، یان لەسەری بنوسرێ.[2]

٧- نوێژ کردن ڕووبەڕوی گۆڕ ئەمەش بەدەقی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی: «لاَ تُصَلُّوا إِلَى الْقُبُورِ».[3] نوێژ ڕووبەڕوی گۆڕ مەکەن.

٨- نوێژکردن لەلای گۆڕ، تەنانەت با ڕوویشی نەکاتە گۆڕ.

لە ئەبو سەعیدی (الخدري)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إِلاَّ الْمَقْبُرَةَ وَالْحَمَّامَ ».[4]

---

[1] إسناده صحيح: (الجنائز/٢٠٣)، د (٩/٤٢/٣٢٠٦).

[2] إسناده صحيح: (الجنائز/٢٠٤)، د (٩/٤٥/٣٢١٠٩)، م (٢/٦٦٧/٩٧٠)، ت (٢/٢٥٨/١٠٥٨)، ن (٤/٨٦).

[3] صحيح: (ص. ج/٧٣٤٨)، م (٢/٦٦٨/٩٧٢)، د (٩/٤٩/٣٢١٣)، ت (٢/٢٥٧/١٠٥٥).

[4] صحيح: (ص. ج/٢٧٦٧)، د (٢/١٥٨/٤٨٨)، ت (١/١٩٩/٣١٦).

زەوی هەمووی شوێنی نوێژە دەتوانـدرێ نوێـژی لێ بکـرێ، جگـە لەگۆڕسـتانو گەرماو.

٩- دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ. لەخاتو عائیشەو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ریوایەتکراوە فەرموویانە: (کە نەخۆشی گـران تووشـی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەبـوو دەسەسـڕێکی دەخـستە سـەر ڕوخـساری خۆی، جا ئەگەر پێـی دڵتـەنگ دەبـوو، پارچـە قوماشـەکەی لەسـەر ڕوخـساری خۆی لادەداو دەیفـەرموو: « لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ»: نەفرینی خودا لەجولەکەو فەلەکان بێ، کە گۆڕی پێغەمبـەرەکانی خۆیان کردووە بەمزگەوتو شوێنی نوێژ کردن[1] پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەم فەرمایـشتەی ئوممەتەکـەی دەترسـێنێ لـەم جـۆرە کـارەو نەهییان لێ دەکا لەوەی کاری وا رەچاو بکـەن! هـەر لـەخاتو عائیـشەوە (رەزای خـودای لێ بـێ) فەرموویـەتی: پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەو نەخۆشییەیدا: کەنەخۆشی لەدونیا دەرچوونی بوو، فـەرمووی: «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَـسَاجِدَ»: نـەفرینی خـودا لـە جولەکـەو فەلەکان بێ، کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بەمزگەوتو شـوێنی نوێـژ لێ کردن، عائیشە ئەوەشی فەرموو: ئەگەر لەترسی ئەوە نەبوایە گۆڕەکـەی بـەرز دەکرایـەوەبیناى لەسـەر دەکـرا، وەلێ لـەوە دەترسـا کـە گۆڕەکـەی بکرێتـە مزگەوتو شوێنی نوێژکردن.[2]

١٠- کردنی گۆڕ بەشوێنی کات بەسـەربردنو جـەژن کـردن لـەکاتی دیـاری کراودا لەوەرزو مەوسیمی بەرچاودا، بەمەبەستی (تعبّد)و خوداپەرستی، یـان

---

[1] متفق عليه: خ (٤٤٤٤/١٤٠/٨)، م (٥٣١/٣٧٧/١)، ن (٢/٤٠).

[2] متفق عليه: (١٣٣٠/٢٠٠/٢)، م (٥٢٩/٣٧٦/١)، ن (٢/٤١).

بۆ شتی تر، ئەمەش بەگوێرەی حەدیثی ئەبو هورەیرە کە ڕیوایەتی کردووە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لاَ تَتَّخِذُوا قَبْرِى عِيداً وَلاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُوراً وَحَيْثُمَا كُنْتُمْ فَصَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِى». [1] گۆڕەکەم مەکەن بەجەژنو ئاهەنگی لەدەور بگێڕن، ماڵەکانیشتان مەکەن بەگۆڕستانو هیچ نوێژێکی تێدا نەکەن، لەهەر جێگایەك بوون صەڵاواتم لەسەر لێ بدەن، چونکە صەڵاواتەکەتان پێم دەگا. [2]

١١- سەفەر کردن بۆسەر گۆڕ، لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى». [3] سەفەرناکرێو بارو بارگەنە نابەسترێ بۆ نوێژ تێداکردنو خوداپەرستی بۆ هیچ شوێنو جێگایەك جگە لەسێ مزگەوت: مزگەوتی (الحرام)، مزگەوتی پێغەمبەر، مزگەوتی قودس. واتە: نوێژکردنو خوداپەرستی لەهەموو مزگەوتێکدا وەکوو یەك وایە، جگە لەو سێ مزگەوتە ئەوان نوێژکردن تێیاندا خێری چەند چەندانەیەو دروستە سەفەریان بۆ بکرێ.

١٢- هەڵکردنی چرا لەسەری، چونکە بیدعەیەو سەلەفی صالح نەیانکردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِى النَّارِ». [4] هەموو بیدعەو داهێنراوێك لەئاییندا گومڕاییەو هەموو گومڕاییەکیش سەرەنجامی ناو دۆزەخە، جگە لەوەش هەڵکردنی چرا لەسەر گۆڕ ماڵ بەفیڕۆدانە ئەوەش کارێکی حەرامەو بەدەقی

---

[1] صحيح: (ص. ج/٧٢٢٦)، د (٦/٣١/٢٠٢٦).

[2] (ص. ج/٧٢٢٦)، د (٦/٣١/٢٠٢٦).

[3] متفق عليه: خ (٣/٦٣/١١٨٩)، م (٢/١٠١٤/١٣٩٧)، د (٦/١٥/٢٠١٧)، ن (٢/٣٧).

[4] لەوەپێش لەباسی (خطبة الحاجة)دا تێپەڕی.

فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلاَثًا قِيلَ وَقَالَ ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ».[1] بێگومان خودا سێ شتی بۆ ئێوە پێ ناخۆشە: گوترا گوتی. ماڵ بەفیڕۆدان. زۆر پرسیار کردن.

١٣- شکاندنی ئێسقانی مردو ئەمەش بەدەقی فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيًّا».[2] شکاندنی ئێسقانی مردو وەکوو ئەوە وایە بەزیندووی بیشکێنی.

## باسی ڕۆژو (كتاب الصيام)

## حوکمی ڕۆژو

ڕۆژوی ڕەمەزان پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلامو فەرزێکە لە فەرزەکانی ئیسلام.

پەروەردگار فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ – البقرة/١٨٣} تا دەگاتە ئایەتی {شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ – البقرة/١٨٥}. ئەی ئەوانەی بڕواتان بەتاكو تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی موحەممەد هێناوە، ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانتان لەسەر فەرزکراوە، وەکوو چۆن لەسەر ئەو گەلو نەتەوانەی پێش ئێوە پێویست کراوە، بەڵکوو تەقوای خودا بکەنو خۆتان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن............

---

[1] متفق عليه: (١٤٧٧/٣٤٠/٣)، م (١٧١٥/١٣٤٠/٣).

[2] صحيح: (ص. ج/٢١٤٣)، د (٣١٩١/٢٤/٩)، جه (١٦١٦/٥١٦/١).

مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەی قورئانی تێدا دابەزێندراوە، کە هیدایەتو ڕێنمونییە بۆ گرۆهی ئادەمیزادو بەڵگەی زۆرو گەورەی لەخۆ گرتووە لەهیدایەتو جیاکردنەوەی حەقو بەتاڵ.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ ، وَالْحَجِّ ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ».[1]

ئایینی ئیسلام لەسەر پێنج پایە بنیات نراوە: شایەتیدان بەوەی هیچ خودا نین جگە لە (الله) هەروەها شایەتیدان بەوەی کە حەزرەتی موحەممەد ڕەوانەکراوی خودایە، بەجێهێنانی نوێژو دەرکردنی زەکاتو حەجکردنو بەڕۆژو بوونی مانگی ڕەمەزان.

ئوممەتی ئیسلام کۆ ڕایان هەیە لەسەر ئەوەی ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان واجبەو پایەیەکە لەپایەکانی ئیسلامو بە بەشێکی گرنگی ئایین حسێب کراون، هەرکەسێ ئینکاری ئەوە بکا کافرەو بە هەڵگەڕاوە لە ئایین دەژمێردرێ.[2]

## گەورەییو فەڕی ڕۆژو

لە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[3]: کەسێك مانگی ڕەمەزان بەرۆژو بێ لەبەر خاتری خوداو بەئیمانی تەواوەوە

---

[1] لەوەپێش لەباسی نوێژدا تێپەڕی.

[2] فقه السنة ١/٣٦٦.

[3] متفق عليه: خ (٤/١١٥/١٩٠١)، ن (٤/١٥٧)، جه (١/٥٢٦/١٦٤١)، م (١/٥٢٣/٧٦٠).

بەهیوای وەرگرتنەوەی پاداش لەخودا، ئەوە لێخۆشبوون لەتاوانی لەوەپێشی بۆ دەستەبەر دەبێ.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « قَالَ اللَّهُ كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلاَّ الصِّيَامَ ، فَإِنَّهُ لِي ، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ . وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ ، وَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ ، فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَصْخَبْ ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ ، أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ . وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ يوم القيامة مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ ، لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ ، وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ ».[1] پەروەردگار دەفەرموێ: هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بۆخۆیەتی جگە لە ڕۆژو، بێگومان ڕۆژو بۆ منەو من پاداشی دەدەمەوە، ڕۆژو مەتاڵە، لەمپەڕە لەبەردەم ئاگر. جا ئەگەر یەکێك لەئێوە بەرۆژو بوو باقسەی نەشیاو نەڵێ، قیڕەو هەرانەکا، هیچ کارێکی نەفامانە ئەنجام نەدا، ئەگەر یەکێك جنێوی پێدا یان شەڕی لەگەڵ کرد با دووجار بڵێ من بەرۆژوم، سوێندم بەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لەلای خودا لەرۆژی قیامەت لەبۆنی میسك خۆشترە. ڕۆژوەوان دوو کەیفخۆشی بۆ دەستەبەر دەبێ، کە ڕۆژوی شکاند کەیفخۆش دەبێ، کە ڕۆژی قیامەتیش بەخزمەت پەروەردگار دەگاو پاداشی ڕۆژوەکانی وەردەگرێ کەیفخۆش دەبێ.

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَابًا يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ ، يَدْخُلُ مِنْهُ

---

[1] متفق علیه: خ (٤/١١٨/١٩٠٤)، م (١١٥١- ١٦٣/٨٠٧/٢)، ن (٤/١٦٣).

الصَّائِمُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ يُقَالُ أَيْنَ الصَّائِمُونَ فَيَقُومُونَ ، لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ ، فَإِذَا دَخَلُوا أُغْلِقَ ، فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أَحَدٌ».[1]

بێگومان لە بەهەشتدا دەرگایەك هەیە پێی دەگوترێ: (الريان)رۆژی قیامەت تەنها رۆژوگر لێیەوە دەچنە ژورەوە، جگە لە رۆژوەوان کەسی تر لەو دەرگایەوە ناچێتە ناو بەهەشتەوە، جاڕ دەدرێ دەگوترێ: رۆژوگرەکان لەکوێن؟ هەموویان ڕاست دەبنەوەو لێیەوە دەچنە ناو بەهەشتەوە، جگە لەوان کەسی تر لێیەوە ناچێتە ناو بەهەشتەوە. کە ئەوان چوونە ژورەوە دەرگاکە دادەخرێو کەسی لێوە ئەودیو ناکەوێ.

## رۆژوی رەمەزان بە بینینی مانگی یەکشەوە واجب دەبێ

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ فَإِنْ غُمِّيَ عَلَيْكُمُ الشَّهْرُ فَعُدُّوا ثَلاَثِينَ ».[2] کە مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانتان بینی بەڕۆژو بن، کە مانگی یەکشەوەی شەشەڵانتان بینی واز لەرۆژو گرتن بێنن، ئەگەر هەورو هەڵابوو سی رۆژ بژمێرن چ بۆ بەرۆژو بوون چ بۆ رۆژو شکاندن.

## بەچی دەزاندرێ مانگی رەمەزان هاتووە؟

هاتنی مانگی رەمەزان بەدیتنی مانگی یەکشەوە دەچەسپێ، تەنانەت ئەگەر تەنها یەك کەسیش بیبینێ بەمەرجێ عادل بێ، یان مانگی شەعبان سی رۆژەی خۆی تەواو بکا... لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕدرێتەوە کە

---

[1] متفق عليه: خ (٤/١١١/١٨٩٦)، وهذا لفظة، م (٢/٨٠٨/١١٥٢)، ت (٢/١٣٢/٧٦٢)، جه (١/٥٢٥/١٦٤٠)، ن (٤/١٦٨) بنحوه عند الثلاثة مع زيادة.

[2] متفق عليه: م (١٠٨١- ١٩ /٢/٧٦٢) وهذا لفظة. ج(٤/١١٩/١٩٠٩)، ن (٤/١٣٣).

گوتوویەتی: خەڵك بۆ مانگ دەگەڕان‌و دەیانڕوانی بۆ ئاسمان، عەرزی پێغەمبەرم کرد کە من مانگم بینی، ئیتر بڕوای پی کردم‌و بۆخۆی بەرۆژو بوو فەرمانیشی بە خەڵکەکە کرد کە بەرۆژو بن.[1]

ئەگەر مانگ نەدەبیندرا بەهۆی هەوروهەڵاوە یان بەهۆی تەمەوە ئەوە دەبێ سی رۆژی مانگی شەعبان تەواو بکەن، ئەمەیش بەپێی ئەوە دەبێ سی رۆژەی مانگی شابان تەواو بکەن، ئەمەیش بەپێی حەدیثی ئەبو هورەیرە کە تۆزێك لەمەوپێش ئاماژەی پێ کرا. وەڵێ بۆ بینینی مانگی شەشەڵان دەبێ دوو شایەت شایەتی بدەن.

لە عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی (الخطاب)ەوە ڕیوایەتکراوە: کەوتاری داوە لەو رۆژەی کە خەڵك گومانی هەبوو ئاخۆ مانگ نوێ بۆتەوە یان نا؟ وتی: من لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتنم کردووە، پرسیارم لێ کردوون، ئەوان بۆیان گێڕاومەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ وَانْسُكُوا لَهَا فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَأَتِمُّوا ثَلاثِينَ وَإِنْ شَهِدَ شَاهِدَانِ مُسْلِمَانِ فَصُومُوا وَأَفْطِرُوا».[2] کە مانگتان بینی بەرۆژو بن، کەمانگتان بینی رۆژو بشکێنن، ئەگەر ئاسمان هەور بوو سی رۆژ بژمێرن، ئەگەر دوو شایەتی موسوڵمان شایەتییاندا بە بینینی مانگ بەرۆژو بن‌و، رۆژو بشکێنن.

لە ئەمیری مەککەوە (الحارث)ی کوڕی حاطب ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردوین، کە بەدیتنی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان دەست بکەین بە رۆژو گرتن، ئەگەر خۆمان

---

[1] صحيح (الإرواء/٩٠٨)، فقه السنة ٣٦٧/١ والحديث رواه أبوداود (٦/٤٦٨/٢٣٢٥).

[2] صحيح: (ص. ج/٣٨١١)، حم (٥٠/٢٦٤و٩/٢٦٥)، ن (١٣٢و ٤/١٣٣).

نـەمانبينىو دوو شـايەتى عـادل شـايەتييانـدا دەسـت بكـەين بـە رۆژو گـرتن بەپێى شايەتيدانەكەيان.[١]

مەفهومى ئەم دوو حـەديثـە (حـەديثـى عبـدالرحمنو حـەديثـى الحارث) ئەوە دەگەيەنن كە شـايەتيدانى يـەك شـايەت بـۆ رۆژو بـوونو رۆژو شـكاندن وەرناگيرێ، بەڵام بەهۆى هەبوونى بەڵگە بۆ بەرۆژو بوون، كە حەديثى ئيبنـو عومەرە بەرۆژو بوون لـەو حوكمـە جـەرت دەكـرێو رۆژو شـكاندنەكە لەسـەر حوكمى خۆى دەمێنێتەوەو پێويستە دوو شايەت شايەتى بدەن.[٢]

**ئاگاداركردنەوەيەك:** كەسێك تـەنها بۆخۆى مـانگى بينـى، بـەرۆژو نابـێ هـەتا خەڵكەكـە بـەرۆژو نـەبن، رۆژوش ناشـكێنێ تـا خەڵكەكـە رۆژووەكـەيان نەشـكێنن. لـە ئـەبو هـورەيرەوە ڕيوايـەتكراوە، دەڵـێ: كـە پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بـێ) فەرمووويـەتى: «الـصَّوْمُ يَـوْمَ تَـصُومُونَ وَالْفِطْرُ يَـوْمَ تُفْطِـرُونَ وَالأَضْـحَى يَـوْمَ تُـضَحُّونَ».[٣] رۆژو كاتـێ حلێبـە لەگـەڵ كۆمەڵ بێ، رۆژو شكاندن دەبێ بەكۆمەڵ بێو جەژنى قوربـان كاتـێ بەجـەژن حسێبە كە لەگەڵ كۆمەڵدا بێ، بـەكورتى بـەرۆژو بـوونو رۆژو شـكاندن دەبـێ بەكۆمەڵو زۆرينە بێ.

بەڕاستى هەڵەيە كە هەندێ خەڵك خۆيان لەدانيـشتوان جيـا دەكەنـەوەو لەگەڵ دەوڵەتێكى جيراندا بەرۆژو دەبـنو لەگـەڵ ئەوانيـشدا رۆژو دەشـكێننو جـەژن دەكـەن. بەمـەش خۆيـان لـە خـەڵكى وڵاتـى خۆيـان جيادەكەنـەوە، هەڵوێستەكەشيان هەڵەيە چونكە جەماعەتو يەكدەنگىو يـەكڕيزى حەقـەو صەوابە، تەفرەقەو پەرتەوازەى لادانو عەزابە، بۆيە پـەروەردگار فـەرمان بـە

---

[١] صحيح: (ص. د/٢٠٥)، د (٢٣٢١/٤٦٣/٦).

[٢] بروانە تحفة الأحوذى ج٣/٣٧٣ – ٣٧٤.

[٣] صحيح: (ص. ج/٣٨٦٩)، ت (٦٩٣/١٠١/٢).

موسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ: {وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ – آل عيمران/١٠٣}. دەست بگرن بەڕێنمایی ئایینی خوداو ئەو پەیوەندییە مەپچڕێنن‌و خۆتان پەرتەوازە مەکەن.

## ڕۆژو لەسەر کێ پێویستە؟

زانایانی ئیسلام کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە کەڕۆژوی ڕەمەزان واجبە لەسەر موسوڵمانی عاقڵ‌و ڕەسیدەو لەشساغ‌و دانیشتوی شوێنی نیشتەمەنی خۆی، بەنیسبەت ئافرەتیشەوە دەبێ سەرباری ئەو مەرجانە لەحاڵەتی پاکی‌دا بێ، لەحاڵەتی بێنوێژیدا نەبێ.[1]

بەڵگەی ئەوە کە ڕۆژو لەسەر ئادەمیزادی نارەسیدەو بێ عەقڵ، واجب نیە فەرموودەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ: « رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ ».[2] ئەرك‌و بەرپرسیارێتی لەسەر سێ جۆر ئادەمیزاد هەڵگیراوە: لە شێت هەتا چاك دەبێتەوە، لەنوستوو هەتا بەخەبەر دێ، لەمنداڵ هەتا ڕەسیدە دەبێ.

سوننەت‌و باشە بۆ سەرپەرشتیاری منداڵ: کەفەرمانی پێ بکا بە بەڕۆژو بوون هەرکاتێ تێی رابینی کەدەتوانێ ڕۆژو بگرێ، بۆ ئەوەی رابێ لەسەر ڕۆژوو گرتن، هەروەها بەچاولێکەری‌و لاسایی کردنەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ منداڵەکانیان.

لە روبەیعی کچی موعەویزەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەیانی ڕۆژی عاشوراء ناردی بۆناو گوندو هۆبەی ئەنصارو پێیانی فەرموو: «مَنْ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ ، وَمَنْ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيَصُمْ».

---

[1] فقه السنة: ج١/٥٠٦.

[2] صحيح: (ص. ج/٣٥١٤)، ت (٢/١٠٢/٦٩٣).

هەرکەسێ شەوی بەرۆژ کردۆتەوە بەرۆژو نیەو نیەتی نەهێناوە با تا ئێوارە هیچ نەخواو خۆبگرێتەوە لەهەر شتێك رۆژو دەشکێنێ، کەسێکیش رۆژی لێ بوەتەوە بە رۆژەوانی با بەردەوام بێ لەسەر رۆژوەکەی. جا روبەیع دەڵێ: ئێمە لەوەدوا خۆمان بەرۆژو دەبووینو رۆژومان بە منداڵەکانیشمان دەگرت، بۆ ئەوەی رایان بێنین، لە لۆکەو شتی وا لوعبەو یاریمان بۆ دروست دەکردن، کە یەکێکیان بگریایە بۆ خواردنو برسی بوایە ئەو یاریەمان دەدانێ بۆ خافڵاندنو کات بەسەر بردن هەتا ئێوارەو کاتی رۆژو شکاندن.[1]

بەڵگەی ئەوەش کەرۆژو لەسەر نیشتەمەنی نەساغ واجب نیە. ئایەتی {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ – البقرة/١٨٤}: کەسێك لەمانگی ڕەمەزاندا نەخۆش بوو یان لەسەفەردا بوو، ئەوە دەتوانێ بەرۆژو نەبێو دوای رۆژووەکانی بەقەزا بگێڕێتەوە. جا ئەگەر نەخۆشو موسافیر وێڕای ئەوەی کە بۆیان هەیە بەرۆژو نەبن، ئەگەر بەرۆژو بوون ئەوە رۆژووەکەیان صەحیحە، چونکە ڕێگەپێدانیان بەوەی بەرۆژو نەبن ئەوە روخصەتە، ئەگەر ئەوان کار بەو روخصەتو ئاسانکارییەی بۆیان کراوە نەکەن لایەنی عەزیمەت رەچاو بکەن ئەوە باشترەو کارەکەیان شەرعییە.

**رۆژو شکاندن یان بەرۆژو بوون بۆ نەخۆشو مەسافیر کامیان باشترە؟**

ئەگەر نەخۆشو موسافیر رۆژو گرتن ناڕەحەتی نەدەکردنو زیانی بەجەستە نەدەگەیاندن، ئەوە بەرۆژوبوون بۆی باشترە، ئەگەر رۆژوگرتن زیانی پێ دەگەیاندنو ناڕەحەتی دەکرد ئەوە بەرۆژو نەبوون بۆی باشترە.

لە ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا لە ڕەمەزاندا لەغەزا بووین، هەمان بوو بەرۆژو بوو، هەمان بوو

---

[1] متفق عليه: خ (١٩٦٠/٢٠٠/٤)، م (٧٩٨/١١٣٦ و ٢/٧٩٩).

بەرۆژو نەبوو، نە ڕۆژووەوان ڕەخنەی لەئەوانە دەگرت کەبەرۆژو نـەبوون، نـە ڕۆژوشکێنەکان ڕەخنەیان لەرۆژووەوانەکان دەگرت، پێیان وابوو ئەوەی توانای ڕۆژوگرتنی هەبیٚو بەرۆژو بیٚ ئەوە باشە، ئەوەی لەخۆی ڕانـەبینیٚو بـەرۆژو نەبیٚ ئەوەش هەر باشە[1].

پێویست نەبوونی ڕۆژو لەسـەر ئـافرەتی بێنوێـژو زەیـستان، لـەکاتی ئـەو نەخۆشییەیاندا، ئـەوە بـەپێی حـەدیثی ئـەبو سـەعیدە کـە دەڵیٚ: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: «أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ ، وَلَمْ تَـصُمْ فَذَلِكَ نُقْصَانُ دِينِهَا».[2] ئەی ئەوە نیە کەئافرەت کەوتە حاڵەتی بێنوێـژییـەوە نوێژ ناکاو بەرۆژو نابیٚ؟ ئەوە نوقصانی ئایینو خوداپەرستیەکەیەتی.

ئەگـەر ئـافرەتی بێنوێـژ یـان زەیـستان بـەرۆژو بـوو، ئـەوە ڕۆژووەکـەی دروسـت نیـە، چـونکە مـەرجی سـەرەکی بـەرۆژو بـوون پـاکی ڕۆژوگرەکەیـە لەبێنوێـژیو زەیـستانی، بـەڵام دوای پاکبوونـەوەیان پێویـستە ڕۆژوەکانیـان بگرنەوە.

لـە خـاتو عائیـشەوە ڕیوایـەتکراوە دەفـەرمویٚ: ئێمـە لەسـەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بیٚ) دەکەوتینـە بێنوێژیـەوە، فـەرمانمان پـی دەکـرا بـەوەی دوای نـەمانی حاڵـەتی بێنوێـژیمان ڕۆژو بگرینـەوە، بـەڵام فەرمانمان پی نەدەکرا بەگێڕانەوەی نوێژەکانمان.[3]

---

[1] صحيح: (ص. ت/٥٧٤)، م (١١١٦- ٢/٧٨٧/٩٦)، ت (٢/١٠٨/٧٠٨).

[2] صحيح: (مختصر خ/٩٥١)، خ (٤/١٩١/١٩٥١).

[3] صحيح: (ص. ت/٦٣٠)، م (١/٢٦٥/٣٣٥)، د (١/٤٤٤/٢٥٩،٢٦٠)، ت (٢/١٤١/٧٨٤)، ن (٤/١٩١).

*** ئەوەی پێویستە لەسەر پیرەمێردو پیرەژن و نەخۆشێک کە بەتەما چاکبووونەوە نەبێ.**

کەسێك نەیتوانی بەرۆژو بێ لەبەر پیری یان عوزری تر، ئەوە رۆژوەکەی دەشکێنێ و لەجیاتی هەر رۆژێك ژەمێك هەژارێك تێر دەکا، ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ – البقرة/١٨٤}: ئەوانەی لەبەر پیریو نەخۆشی بێ دەرمان، ناتوانن بەرۆژو بن لەجیاتی هەر رۆژێك ژەمێك نان بدەن بەهەژار.

لە عەطائەوە ریوایەتکراوە کە لەئیبنو عەبباسی بیستووە کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە دەڵێ: ئیبنو عەبباس فەرمووی: ئەم ئایەتە حوکمەکەی نەسڕاوەتەوە، مەبەست لێی پیاوی پیری کەنەفتەو پیرەژنی پۆڵکاوە: کەناتوانن بەرۆژو بن ئەوانە دەبی لەجیاتی هەر رۆژێك هەژارێك تێر بکەن.[1]

## ئافرەتی سکپڕو ئافرەتی شیردەر

سکپڕو شیردەر ئەگەر نەیانتوانی بەرۆژو بن، یان ترسان زیان بە زارۆکەکەیان بگا، بۆیان هەیە بەرۆژو نەبن و فیدیە بدەن و گێڕانەوەی رۆژوەکانیشیان لەسەر نیە.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: روخصەت دراوە بە پیرەمێردی زۆر پیرو پیرەژنی بەساڵاچوو – کە بەناڕەحەتی زۆر رۆژویان بۆ دەگیرێ – رێگەیان پی دراوە بەویستی خۆیان رۆژو بشکێنن و لەجیاتی هەر رۆژێك هەژارێك نان بدەن و گێڕانەوەشیان لەسەر نیە، پاشان ئەو حوکمەی لەئایەتی {فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ – البقرة/١٨٥}: سڕایەوەو ئەوە چەسپا

---

[1] صحيح: (الإرواء/٩١٢)، خ (٤٥٠٥/١٧٩/٨).

کەرەوایە بۆ پیرە مێردی کەنەفتو پیرەژنی پۆڵکاو ئەگەر نەیانتوانی بەرۆژو بن، هەروا ئافرەتی سکپڕو ئافرەتی شیردەر ئەگەر ترسی ئەومیان هەبوو بەرۆژوبوونەکەیان زیان بەزارۆکەکەیان دەگەیەنێ ڕۆژوومکەیان دەشکێنن‌و لەجیاتی هەر ڕۆژێك هەژارێك نان دەدەن.[1]

هەر لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتککراوە ئەگەر ئافرەتی سکپڕ لەتەندرووستی خۆی ترسا، ئافرەتی شیردەر ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو بەرۆژو بوونەکەی زیان بەزارۆکەکەی دەگا، ڕۆژومکەیان دەشکێنن‌و لەجیاتی هەر ڕۆژێك هەژارێك نان دەداو ڕۆژو ناگێڕنەوە.[2]

لە نافیعەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئیبنو عومەر کچێکی هەبوو ژنی پیاوێکی قورەیشی بوو، ئافرەتەکە دووگیان بوو، لە ڕەمەزاندا تووشی تینوایەتی هات، ئیبنو عومەر فەرمانی پێ کرد ڕۆژوەکەی بشکێنێ‌و لەجیاتی هەر ڕۆژێك ژەمێك خواردن بدا بەهەژارێك.[3]

## ئەندازەی ئەو خواردنەی دەیدا بەهەژار

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە ساڵێك مانگی ڕەمەزان نەیتوانیوە بەرۆژو بێ، مەنجەڵێك تێکۆشاوی ئامادەکردو بانگی سی هەژاری کرد تێری کردن.[4]

---

[1] إسناده صحيح إبن جرير (٢/١٣٥)، هق (٤/٢٣٠).

[2] صحيح: غزاه الألباني فی الإرواء (٤/١٩)، الی الطبری (٢٧٥٨) وقال إسناده صحيح على شرط مسلم.

[3] صحيح لإسناد (الإرواء/٢٠)، قط (٢/٢٠٧/١٥).

[4] صحيح الإسناد: (الإرووا٤/٢١)، قط (٢/٢٠٧/١٦).

## روکنەکانی رۆژو

١- نیەتو نیازی بەرۆژو بوون. ئاماژە بە فەرموودەی پەروەردگار {وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ – البينة/٥}: نەوەکوو فەرمانیان پێ کراوە ئیللا ئەوە عیبادەتی خودا بکەنو راستاڵانە پەرستشی بۆ بکەن.

هەروا فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى».[1] کردەوە بەنیەتو نیازت چۆن بێ ئەوە حلێبە، پاداشی هەموو مرۆڤێك بەگوێرەی نیازەکەیەتی.

پێویستە نیەتی بەرۆژوو بوون پێش فەجر بێ، بۆ هەموو رۆژوێك، ئەمەش بەپێی حەدیثی خاتو حەفصە: کە گێڕاویەتیەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلاَ صِيَامَ لَهُ».[2] کەسێك پێش فەجر نیەتی بەرۆژوو بوونی نەبێ، رۆژوی دروست نیە.

٢- خۆگرتنەوە لەهەر شتێك رۆژوی پێ بشکێ لەکاتی هەڵاتنی فەجرەوە تا خۆرئاوابوون.

پەروەردگار دەفەرموێ: {فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ – البقرة/١٨٧} ئێستا دەتوانن لەگەڵ هاوسەرەکانتان سەرجێیی بکەن، داخوازی ئەوەبن کە خودا بۆی داناون، بخۆنو بخۆنەوە هەتا روناکی بەیانی لەتاریکی شەو جیادەبێتەوە؛ هەتا فەجر دیاریی دەدا، ئەمجار خۆتان بگرنەوە لەهەر شتێك رۆژوی پێ بشکێ تاشەو دادێ.

---

[1] لەوەپێش لەباسی مەرجەکانی دروستی دەستنوێژدا تێپەڕی.

[2] صحيح: (ص.ج/٦٥٣٨)، د(٢٤٣٧/١٢٢/١١٦)، ن(٤/١٩٦) بنحوه.

**ئەوەی ڕۆژوی پێ دەشکێ شەش شتە**

**١ -٢: خـواردن و خواردنــەوەی بەئەنقەسـت: ئەگـەر لـەیادی نـەبوو: کـە بەڕۆژووە شتی خـوارد یـان خواردیـەوە ئـەوە ڕۆژوەکـەی ناشکێ و گێڕانـەوەی لەسەرنیەو کەفارەتی ناوێ.**

**لە ئەبو هـورەیرە ڕیوایـەتکراوە: کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: «مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَـقَاهُ»[1]: کەسـێك لـەبیری چـوو کـە بـەڕۆژووە شـتی خـوارد، یـان شـتی خـواردەوە، ئـەوە بـا بـەردەوام بـێ لەسـەر ڕۆژوەکـەیو ڕۆژوەکـەی نەشـکاوە، طەعام و خواردنەوەیەکە خودا پێی نۆش کردوە.**

**٣- ڕشاندنەوەی بە ئەنقەست. ئەگەر بەناچاری ڕشایەوە ئەوە ڕۆژوەکـەی ناشکێ و کەفارەتیشی لەسەر نیە.**

**لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: «مَـنْ ذَرَعَـهُ الْقَـيْءُ فَلَـيْسَ عَلَيْـهِ قَـضَاءٌ وَمَـنِ اسْـتَقَاءَ عَمْـدًا فَلْـيَقْضِ»[2]: کەسـێك ڕشـانەوە تینـی بـۆ هێنـاو ڕشـایەوە ڕۆژوەکـەی ناشـکێ و گێڕانـەوەی لەسـەرنیە، کەسـێك خـۆی ڕشـاندەوە بەئەنقەسـت بـا ڕۆژوەکـەی بگیرێتەوە.**

**٤-٥: بێ نوێژی و زەیستانی، بـا دەمـەو ئێـوارەش توشـی ئـەو حاڵەتـە بـێ، چونکە کۆڕای زانایانی لەسەرە کە ئەم دوو حاڵەتە ڕۆژوو دەشکێنن.**

**٦- جوتبـوون: ئەمـە سـەرەڕای ڕۆژو شـکانەکەی دەبـێ کـەفارەتیش بـدا وەکوو لەم حەدیثەی دواییدا باس کراوە.**

---

[1] صـحيح: (ص.ج/٦٥٧٣) ، م(٢/٨٠٩/١١٥٥) وهـذا لفظـه، خ(٤/١٥٥/١٩٣٣)، ج(١/٥٣٥/١٦٧٣)، ت(٢/١١٢/٧١٧).

[2] صحيح: (ص.ج/٦٢٤٣) ، ت(٢/١١١/٧١٦)، د(٧/٦/٢٣٦٣)، ج(١/٥٣٦/١٦٧٦).

له ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: لەکاتێکدا ئێمە لەخزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووین، لەنکاوێك پیاوێك هاتە خزمەتی‌و وتی ئەی پێغەمبەر! (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهیلاك چوم، فەرمووی: چیت لێ ڕودراوە؟ عەرزی کرد: بەڕۆژوو بووم‌و چوومە لای خێزانەکەم. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەتوانی کۆیلەیەك ئازاد بکەی؟ وتی: نەخەیر، فەرمووی: ئایا دەتوانی خواردنی شەصت هەژار بدەی؟ وتی: نەخەیر. دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماوەیەك مایەوە، پوشە خورمایەکیان هێنایە خزمەتی هەندێکی خورما تێدابوون. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کابرای پرسیارکەر چی لێ هات؟ کابرا وتی: ئەمەتا لێرەم. فەرمووی: ئەم پوشە خورمایە بەرە بیکە بەخێرو بەسەر هەژاراندا دابەشی بکە. کابرا وتی: ئایا دابەشی بکەم بەسەر لەخۆم هەژارتردا؟ سوێندم بەخودا لەنێوان هەردوو بەردەڵانی ئەمسەرو ئەوسەری مەدینەدا خێزانێك نیە لەخێزانی من هەژارتر بێ. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێکەنی، تەنانەت پێکەنینەکەی بەجۆرێك بوو ددانەکانی دەرکەوتن. پاشان فەرمووی: دەبیبە دەرخواردی ماڵ‌و خێزانی خۆتی بدە.[١]

هەر لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەڕەمەزاندا ڕۆژوی شکاندبوو، دەڵێ: قەرتاڵە خورمایەکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزیکەی پانزە ڕبەی خورما تێدابوو، لە فەرموودەکە هاتووە: کە

---

[١] متفـــق علیـــه: خ(٤/١٦٣/١٩٣٦)، م(٢/٧٨١/١١١١)، د(٧/٢٠/٢٣٧٣)، ت(٢/١١٣/٧٢٠)، ج(١/٥٣٤/١٦٧١).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەکابرای فەرمووو: «كُلْـهُ أَنْـتَ وَأَهْـلُ بَيْتِكَ وَصُمْ يَوْمًا وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ».[1]

## ئادابی ڕۆژوو

سوننەتە بۆ ڕۆژەوان کە لەماوەی بەڕۆژوبوونی‌دا چەند خاڵێك بەرچاو بگرێو پەیڕەوییان بکا.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً».[2] پارشێوبکەن چونکە لە پارشێوکردندا بەرەکەت هەیە. هەڵبەتە قومە ئاو خواردنەوەیەك بە پارشێو حلێبە، ئەمەش بەپێی حەدیثی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر، کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «تَسَحَّرُوا وَلَو بِجُرْعَةِ مَاء» پارشێو بکەن، تەنانەت ئەگەر بەقومە ئاوێکیش بێ.[3]

واباشە پارشێو دوابخرێ: لە ئەنەسەوە لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پارشێومان کرد، پاشان تەشریفی هەڵسا نوێژبکا، عەرزیم کرد ماوەی نێوان پارشێوو بانگی بەیانی چەندە؟ فەرمووی: ئەندازەی خوێندنی پەنجا ئایەت.

ئەگەر یەکێك گوێی لەبانگ بوو پاروی خواردن یان پیاڵە ئاوی بەدەستەوە بوو، بۆی هەیە پاروەکە بخوا یان ئاوەکە بخواتەوە، بەپێی ئەو فەرموودەیەی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: «إِذَا سَمِعَ أَحَدُكُمُ النِّدَاءَ وَالإِنَاءُ عَلَى يَدِهِ فَلاَ يَضَعْهُ حَتَّى

---

[1] صحيح: (ص.د/٢٠٩٦) ، د(٧/٢٦/٢٣٧٦)..

[2] متفق عليه: (٤/١٣٩/١٩٢٣)، م(٢/٧٧٠/١٠٥٩)، ت(٢/١٠٦/٧٠٣)، ن(٤/١٤١)، جة(١/٥٤٠/١٦٩٢).

[3] صحيح: (ص.ج/٢٩٤٥) ، حب(٢٢٣/٨٨٤).

يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ». [١] ئەگەر یەكێ لەئێوە لە بەرەبەیاندا گوێی لەبانگ بوو پاروە خواردنێك یان پیاڵە ئاوێكی بەدەستەوە بوو بانۆشی بكاو بیخواتەوە.

٢- وازهێنان لە قسەی نابەجێو تانەو تەشەرو جوێن: كە لەگەڵ مانای رۆژودا ناگونجێن یەكدی ناگرنەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا كَانَ يَوْمُ صِيَامِ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَصْخَبْ وَلاَ يَجْهَلْ فَإِنْ شَاتَمَهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ». [٢] ئەگەر یەكێك لەئێوە بەڕۆژوو بوو باقسەی ناشیرینی بەدەمدا نەیە، قیڕەو هەرا بەرپا نەكا، جوێن بەكەس نەدا، ئەگەر یەكێك جوێنی پێدا یان شەڕی لەگەڵ كرد با بڵێ: من بەڕۆژومو وڵامت نادەمەوە.

هەر لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ». [٣] كەسێك بەڕۆژوبێو قسەی ناشیرینو درۆو بوختان واز لێ نەهێنێ، خودا چ پێویستی بەوە نیە واز لەخواردنو خواردنەوە بهێنێ.

٣-ماڵبەخشینو دەوركردنەوەی قورئان

لە ئیبنو عەبباسەوە (رەزای خودایان لێ بێ) ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەموو كەس سەخی تر بوو، ئەوكاتانەش كە لەرەمەزاندا حەزرەتی جوبرائیلی دەبینی لەهەموو كاتەكانی تری سەخی تر بوو، حەزرەتی جوبرائیلیش هەموو شەوێكی رەمەزان دەهاتە

---

[١] صحيح: (ص.ج/٦٠٧) ، د(٦/٤٧٥/٢٣٣٣)، ك(١/٤٢٦).

[٢] لەباسی گەورەیی رۆژودا تێپەڕی.

[٣] صحيح: (مختصر خ/٩٢١) ، خ(٤/١١٦/١٩٠٣)، د(٦/٤٨٨/٢٣٤٥)، ت(٢/١٠٥/٧٠٢).

خزمـەتیو پێغەمبـەر قورئـانی بەسـەردا دەخوێنـدەوە، جا کـە پێغەمبـەر حەزرەتی جوبرائیلی بدیبایە لەشنە بای رەحمەت سەخی تربوو.[1]

٤- ئێوارە رۆژو شکاندن بەزویی.

لەسەهلی کوڕی سەعدەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَزَالُ النَّـاسُ بِخَيْـرٍ مَـا عَجَّلُـوا الْفِطْـرَ».[2] خـەڵك تازوو رۆژوو بشکێنن نیشانەی ئەومیە خێریان تێدایە.

پەلەکردن لەشکاندنی رۆژوو مانای ئەوە ناگەیەنێ نوێـژی شـێوان دوابخـا بەهۆی خواردنو خواردنەوەوە. بەڵکوو رۆژو شکاندن بەخواردنی شتێکی کەم یان خواردنـەوەی قومـە ئاوێـك دێتـەجێ – وەکوو لـە فـەرموودەی داهـاتوودا باسکراوە – پاشان نوێژی شێوان بکا، ئەمجار بگەڕێتەوە بۆماڵەوە چی خـودا دابووی بیخوا.

٥- شکاندنی رۆژوو بەشتێکی کەم لەوەی لەبەردەستدایە.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆژووی دەشکاند بەچەند دەنکە خورمای تەڕو تـازە (روطـەب) پـێش ئـەوەی نوێژی شێوان بکا، ئەگەر ئەوجۆرە نەبوایە بەچەند دەنکـە خورمـای وشـکەڵ، ئەگـەر ئەومشـی دەسـت نەکەوتایـە بەچـەند لوێـچە ئاوێـك رۆژوەکـەی دەشکاند.[3]

٦- پاڕانەوە لەکاتی رۆژو شکاندن.

لـە ئیبنـو عومـەرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ): کە رۆژووی دەشکاند دەیفـەرموو: «ذَهَـبَ الظَّمَـأُ وَابْتَلَّـتِ الْعُـرُوقُ

---

[1] متفق علیه: خ(٦/٣٠/١)، م(٤/١٨٠٣/٢٣٠٨).

[2] متفق علیه: خ(٤/١٩٨/١٩٥٧)، م(٢/٧٧١/١٠٩٨)، ت(٢/١٠٣/٦٩٥).

[3] حسن صحیح: (ص.د/٢٠٦٥) ، د(٦/٤٨١/٢٣٣٩).

وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ».[١] تینوایەتیم نەماو رەگەکانی جەستەم تەڕبوونەوە، خوا یاربێ پاداشمان چەسپا.

## ئەوەی بۆ رۆژەوان رەوایە بیکا

١- خۆشتن بۆ خۆ فێنك كردنەوە

لە ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمانەوە، ئەویش لەبڕێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) ریوایەت دەکا دەڵێ: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی لەگوندی (عەرج)[٢] بەرۆژو بوو لەتینوان یان لە گەرمان ئاوی بەسەر سەری خۆیدا دەکرد.[٣]

٢- ئاو لەدەم وەردان‌و ئاو لەلوت رادان بەبێ زێدەرۆیی.

لە لەقیطی کوڕی صەبرەوە، ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «بَالِغْ فِي الاِسْتِنْشَاقِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِمًا».[٤]

٣- کەڵەشاخگرتن.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەڵەشاخی لەخۆی گرت لەوکاتەشدا بەڕۆژوو بوو.[٥]

ئەگەر لەکەمخوێنی خۆی‌و لاوازی ترسا کەڵەشاخ گرتن باش نیە.. لە ثابیتی کوڕی (ألبنانی)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیار لە ئەنەسی کوڕی

---

[١] حسن (ص.د/٢٠٦٦)، د(٦/٤٨٢/٢٣٤٠).

[٢] گوندێکە چەند رۆژە رێیەك لەمەدینە دوورە.

[٣] صحيح: (ص.د/٢٠٧٢)، د(٦/٤٩٢/٢٣٤٨)

[٤] لەوەپێش تێپەڕی.

[٥] صحيح: (ص.د/٢٠٧٩) ، خ(٤/١٧٤/١٩٣٩)، د(٦/٤٩٨/٢٣٥٥)، ت(٢/١٣٧/٧٧٢).

ماليك كرا؛ ئايا ئێوه پێتان خراپ بوو ڕۆژووەوان کەڵەشاخ بگرێ؟ فەرمووی: نەخەیر، مەگەر لەبەر لاوازی.

٤- ماچکردن‌و دەستبازی لەگەڵ خێزانی خۆیدا بۆ کەسێك خۆی پێ بگیرێ.

خاتو عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ خێزانەکانیدا ماچۆ مۆچی دەکردو بەڕۆژوش بوو، زۆر زیاتر لەئێوه خۆی پێ دەگیرا.[1]

٥- بە لەشپیسی شەوی لێ بێتەوه. لەعائیشەو ئوممو سەلەمەوه (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەگێڕنەوه دەفەرموون وادەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشی پیس بوو ڕۆژی لێ دەبووەوه، دوایی غوسڵی دەکردو بەڕۆژو دەبوو.[2]

٦- ویصال (ڕۆژو نەشکاندن تا پارشێو)

لە ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوه ڕیوایەتکراوە: کە لە پێغەمبەری بیستووه، فەرموویەتی: « لاَ تُوَاصِلُوا ، فَأَيُّكُمْ أَرَادَ أَنْ يُوَاصِلَ فَلْيُوَاصِلْ حَتَّى السَّحَرِ». بەڕۆژوبوون درێژ مەکەنەوه. کەخۆر ئاوابوو ڕۆژوو بشکێنن، ئەگەر یەکێ لەئێوه ویستی ویصال بکا با تاپارشێو ویصال بکا. هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەتۆ بۆچی ویصال دەکەی؟ فەرمووی: «إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ ، إِنِّي أَبِيتُ لِي مُطْعِمٌ يُطْعِمُنِي وَسَاقٍ يَسْقِينِ». ئەمن شەوانە خۆراك بەخشێکم هەیە خواردنم دەداتێ، ئاودەرێکم ئاوم دەداتێ.

---

[1] متفق علیه: خ(١٩٢٧/١٤٩/٤)، م(١١٠٦ – ٦٥ -/٧٧٧/٢)، د(٢٣٦٥/٩/٧)، ت(٧٢٥/١٣٩/٢).

[2] متفق علیه: خ(١٩٢٦/١٤٣/٤)، م(١١٠٩/٧٧٩/٤)، د(٢٣٧١/١٤/٧)، ت(٧٧٦/١٣٩/٢).

## ڕۆژوی سوننەت

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هانی موسوڵمانانی داوە کە ئەم ڕۆژانەی لەمەدوا ئاماژەیان پێ دەکەین بەڕۆژوبن.

١- شەشەڵان:

لە ئەبو ئەیوبی ئەلئەنصارییەوە هاتووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ».[1] کەسێك ڕەمەزان بگرێو دوایی شەش ڕۆژیش لە مانگی شەوال بەڕۆژوبێ، وەکوو ئەوە وایە ساڵەکە سەرانسەر بەڕۆژوبێ.

٢-٣: بەڕۆژوو بوونی عەرەفە بۆ غەیری حاجیو ڕۆژی عاشوراو ڕۆژی پێش عاشورا.

لە ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: دەربارەی بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفە پرسیار لە پێغەمبەر کرا؟ فەرمووی: دەبێتە کەفارەتی تاوانی ساڵی پێشوو ساڵی داهاتوو. هەروا پرسیاری لێ کرا دەربارەی ڕۆژی عاشوراء؟ فەرمووی: «يُكَفِّرَ السَّنَةَ الْمَاضِيَةَ». دەبێتە کەفارەتی ساڵی ڕابردو.[2]

لە ئوممولفەزلی کچی (الحارث)ەوە ڕیوایەتکراوە: کە کەسانێك لای ئەو لەڕۆژی عەرەفەدا کەوتنە مقۆ مقۆ دەربارەی ئەوە ئاخۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕۆژووە یان نا، هەندێکیان وتیان: بەڕۆژووە، هەندێکیان وتیان: بەڕۆژوو نیە. منیش پیاڵەیەکم شیر بۆ نارد، لەوکاتەدا تەشریفی سواری حوشترێك بوو، پیاڵەکەیان دایە دەستیو نۆشی گیانی کرد.[3]

---

[1] صحيح: (ص.د/٢١٢٥) ، م(١١٦٤/٢/٨٢٢)، ت(٧٥٦/٢/١٢٩)، د(٢٤١٦/٧/٨٦)، جـ(١٧١٦/١/٥٤٧).

[2] صحيح: (الإرواء/٩٥٥)، م(١١٦٢/٢/٨١٨).

[3] متفق عليه: خ(١٩٨٨/٤/٢٣٦)، م(١١٢٣/٢/٧٩١)، د(٢٤٢٤/٧/١٠٦).

له ئەبو غەطەفانی کوڕی طەریفی (الْمُرِّيّ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: گوێم لێ بوو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: ئەوکاتەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژی عاشوراء بەڕۆژوو بوو فەرمانیشی کرد موسوڵمانەکان بەڕۆژووبن. هاوەڵان عەرزیان کرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە جولەکەو گاور بە پیرۆزی دەزانن. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « فَإِذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ صُمْنَا الْيَوْمَ التَّاسِعَ». ساڵی داهاتوو خودا یاربێ ڕۆژی نۆیەمیشی دەگرین. دەڵێ: ئەوەبوو ساڵی داهاتوو تێوەرنە سوڕایەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد.[1]

٤- بەڕۆژوو بوونی زوربەی مانگی موحەڕەم.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ وَأَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلاَةُ اللَّيْلِ».[2] گەورەترین ڕۆژوو دوای ڕۆژووی ڕەمەزان ڕۆژوی مانگی موحەڕەمە، گەورەترین نوێژ دوای نوێژی فەرز شەونوێژە.

٥- بەڕۆژوو بوونی زوربەی مانگی شەعبان

لەخاتو عائیشەوە گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: نەم بینیوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچ مانگێك سەرانسەر بەڕۆژوو بووبێ جگە لەمانگی ڕەمەزان نەشم بینیوە لەهیچ کام لە مانگەکانی ساڵدا بە ئەندازەی مانگی شابان بەڕۆژوو بووبێ.[3]

---

[1] صحيح: (ص.د/٢١٣٦) ، م(٢/٧٩٧/١١٣٤)، د(٧/١١٠/٢٤٢٨).

[2] صحيح: (ص.د/٢١٢٢) ، م(٢/٨٢١/١١٦٣)، د(٧/٨٢/٢٤١٢)، ن(٣/٢٠٦)، ت(١/٢٧٤/٤٣٦).

[3] متفق عليه: خ(٤/٢١٣/١٩٦٩)، م(١٧٥/١١٥٦ -/٢/٨١٠)، د(٧/٩٩/٢٤١٧).

٦- دووشەممەو پێنج شەممە

لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عادەتی وابوو رۆژی دووشەممەو پێنج شەممە بەرۆژوو دەبوو کاتێ لەوبارەوە پرسیاری لێ کرا فەرمووی: « إِنَّ أَعْمَالَ الْعِبَادِ تُعْرَضُ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ »[1]: بێگومان کردەوەی بەندەکان لەرۆژی دوشەممەو پێنج شەممەدا رادەنوێنرێن.

٧- بەرۆژوبوونی سێ رۆژ لەهەموو مانگێکدا.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: «صُمْ مِنَ الشَّهْرِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ ، فَإِنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَذَلِكَ مِثْلُ صِيَامِ الدَّهْرِ».[2] لەهەموو مانگێکدا سێ رۆژ بەرۆژوبە، بێگومان چاکەیەك بەدەیە، کەوابێ کەسێك ئەم فەرمانە جێبەجێ بکا وەکوو ئەوە وایە هەمیشە بەرۆژوبێ.

واباشە ئەو سێ رۆژانەی بەرۆژو دەبێ رێکەوتی رۆژی سیانزەو چواردەو پانزەی مانگ بکا.

لە ئەبو هورەیرە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « يَا أَبَا ذَرٍّ إِذَا صُمْتَ مِنَ الشَّهْرِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَصُمْ ثَلاَثَ عَشْرَةَ وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ وَخَمْسَ عَشْرَةَ».[3] ئەی ئەبو ذەڕ ئەگەر لەمانگدا سێ رۆژ بەرۆژو بووی ئەوە با رۆژوەکانت بکەونە رۆژانی سیانزەو چواردەو پانزەی مانگەوە لەوسی رۆژەدا بەرۆژو ببە.

---

[1] صحيح: (ص.د/٢١٢٨) ، د(٢٤١٩/١٠٠/٧).

[2] متفق عليه: خ(١٩٧٦/٢٢٠/٤)، م(١١٥٩/٨١٢/٢)، د(٢٤١٠/٧٩/٧).

[3] صحيح: (ص. ج/٧٨١٧)، ت (٧٥٨/١٣٠/٢)، ن (٤/٢٢٢).

٨- ڕۆژە نارۆژێك بەرۆژو بوون.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (أَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ، كَانَ يَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمًا).[1] خۆشەویسترین ڕۆژو لای خودا ڕۆژو گرتنی داوودە ڕۆژێك بەرۆژو دەبوو ڕۆژێك دەیشکاند.

٩- ڕۆژوگرتنی دەیەمی ذیلحیجە.

لە هونەیدەی کچی خالیدەوە لەخێزانی خالیدەوە ئەویش لەهەندێ لەخێزانەکانی پێغەمبەرەوە، ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عادەتی وابوو ڕۆژی نۆیەمی ذیلحیجە بەرۆژو دەبوو هەروا ڕۆژی عاشوراو سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێك و یەکەم دووشەممەو پێنج شەممەی هەموو مانگێك بەرۆژو دەبوو.[2]

## ئەو ڕۆژانەی نەهی کراوە تێیاندا بەرۆژو بێ

١- ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان.

لە ئەبو عوبەیدەوە (مەولای کوڕی ئەزهەر) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لەخزمەت عومەری کوڕی خەتابدا (ڕەزای خودای لێ بێ) ئامادەی جەژن بووم، فەرموی: ئەم دوو ڕۆژە ڕۆژانێکن پێغەمبەر نەهی کردووە تێیاندا

---

[1] متفق عليه: خ (٣/١٦/١١٣١)، م (١١٥٩ — ١٨٩/٢/٨١٦)، ن (٣/٢١٤)، د (٧/١١٧/٢٤٣١)، جه (١/٥٤٦/١٧١٢).

[2] صحيح: (ص. د/٢١٢٩) ، د (٧/١٠٢/٢٤٢٠)، ن (٤/٢٢٠).

بەرۆژو بن، رۆژی جەژنی رەمەزان کە لەدوای بەرۆژو بوون دێ، رۆژەکەی تریش رۆژی جەژنی قوربانە، کە لەقوربانیەکانتان دەخۆن.[1]

٢- رۆژانی تەشریق کە دوو رۆژ یان سێ رۆژ دوای یەکەم رۆژی جەژنی قوربانن.

له ئەبو موررەوە (مەولای ئوممو هانی) هاتووە دەڵێ لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عەمردا چوینە خزمەت باوکی واتە: عەمری کوڕی (العاص) عەمر خواردنی خستە بەردەممان، وتی بخۆ، عەبدوڵڵا وتی ناخۆم بەرۆژوم، عەمر وتی بخۆ ئەم رۆژانە رۆژانێکن پێغەمبەر فەرمانی پێ کردووین تێیاندا بەرۆژو نەبین، ئیمام مالیك دەفەرموێ: ئەوە رۆژانی (أيام التشريق)ن.[2]

لەخاتو عائیشەو ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) ریوایەتکراوە، دەفەرموون: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نەداوە لەرۆژانی تەشریقدا بەرۆژو بن مەگەر بۆ کەسێك (هەدی) دەست نەکەوێ بۆی رەوایە لەجیاتی (هدی) سێ رۆژ بەرۆژو بێ لەحەجو حەوت رۆژیش کە گەڕایەوە.[3]

٣- بەرۆژو بوونی رۆژی جومعە بەتایبەتی.

له ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ يَصُومَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ، إِلاَّ يَوْمًا قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ».[4] با کەس لەئێوە بەتایبەتی رۆژی هەینی بەرۆژو نەبێ، مەگەر رۆژێکی پێشەوەی و رۆژێکی دوایی لەگەڵیا بەرۆژو بن.

---

[1] متفق عليه: خ (٤/٢٣٨/١٩٩٠)، م (٢/٧٩٩/١١٣٧)، د (٧/٦١/٢٣٩٩)، ت (٢/١٣٥/٧٦٩)، جه (١/١٧٢٢/٥٤٩).

[2] صحيح: (ص. د/٢١١٣) ، د (٧/٦٣/٢٤٠١).

[3] صحيح: (مختصر خ/٩٧٨) ، خ (٤/٢٤٢/١٩٩٧).

[4] متفق عليه: خ (٤/٢٣٢/١٩٨٥)، م (٢/٨٠١/١١٤٤)، د (٧/٦٤/٢٤٠٣)، ت (٢/١٢٣/٧٤٠).

٤- بەرۆژو بوونی رۆژی شەممە بەتایبەتی.

لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی بوسـری (الـسَّلَمِيّ) لەخوشـكەكەیەوە، کـەناوی (الصَّمَّاء)ە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلاَّ فِيمَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ وَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلاَّ لِحَاءَ عِنَبَـةٍ أَوْ عُودَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضُغْهُ».[1] رۆژی شـەممان بەتایبـەتی بـەرۆژو مـەبن، مەگـەر رۆژوی فـەرز بـێ، ئەگـەر هیـچتان دەسـت نەکـەوت رۆژوی پـێ بـشکێنن جگـە لەتوێکڵە عینبە یان چیلکە دارێك با بیجوێ.

٥- بـەرۆژوبوون لـەرۆژانی نیـوەی دووەمـی مـانگی شـەعبان بـۆ کەسـێك نەیکردبێ بەعادەت.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانُ فَلاَ تَصُومُوا».[2] کە مانگی شـابان بوو بەنیوە رۆژوی سوننەت مەگرن.

هـەر لـە ئـەوەوە هـاتووە: کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: «لاَ يَتَقَدَّمَنَّ أَحَدُكُمْ رَمَـضَانَ بِـصَوْمِ يَـوْمٍ أَوْ يَـوْمَيْنِ ، إِلاَّ أَنْ يَكُـونَ رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمَهُ فَلْيَصُمْ ذَلِكَ الْيَوْمَ».[3] با کەس لەئێوە بەرۆژێك‌و بەدوو رۆژ پێش ڕەمەزان بەرۆژو نـەبێ، مەگـەر کـابرا وا خـوی پێـوە گرتبـو هـەموو پێنج شەممەو جومعەیەك بەرۆژو بێ، جا ئەگەر بەرۆژوبوونەکەی ڕێکـەوتی ئەو رۆژانەی کرد ئەوە با بەرۆژو بێ.

---

[1] صحيح: (ص. د/٢١١٦) ، د (٧/٦٦/٢٤٠٤) ت(٢/١٢٣/٧٤١) جه (١/٥٥٠/١٧٢٦).

[2] صحيح: (ص. جه/١٣٣٩) ، د (٦/٤٦٠/٢٣٢٠)، ت (٢/١٢١/٧٣٥)، جه (١/٥٢٨/١٦٥١).

[3] متفـــق عليـــه: خ (٤/١٢٧/١٩١٤)، م (٢/٧٦٢/١٠٨٢)، د (٦/٤٥٩/٢٣١٨)، ت (٢/٩٧/٦٨٠)، ن (٤/١٤٩)، جه (١/٥٢٨/١٦٥٠).

٦- بەرۆژو بوونی رۆژی شك.

لە عەمماری كوڕی یاسرەوە (رەزای خودای لیٚ بیٚ) دەڵیٚ: (مَنْ صَامَ الْيَوْمَ الَّذِي يَشُكُّ فِيهِ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ).[1] كەسێك رۆژی شك‌و گومان بەرۆژو بیٚ بێگومان لەپەیڕەوكردنی ئایینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) لایداوە.

٧- بەرۆژوبوونی هەموو ساڵ، با رۆژە جەژنەكان‌و ئەو رۆژانەی نەهی كراوە تێیاندا بەرۆژو بی رۆژوو بشكێنیٚ.

لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە (رەزای خودای لیٚ بیٚ) دەڵیٚ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) پێی گوتم: ئەی عەبدوڵڵای كوڕی عەمر! «إِنَّكَ لَتَصُومُ الدَّهْرَ وَتَقُومُ اللَّيْلَ وَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ لَهُ الْعَيْنُ وَنَهِكَتْ لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الأَبَدَ».[2] ئەتۆ ساڵ سەرانسەر بەرۆژو دەبی‌و شەو بەخەبەر دەبی بۆ خوداپەرستی، ئەگەر وابكەی‌و بەردەوام بیٚ لەسەر ئەو حاڵە چاوت بەقوڵدا دەچن، بەرۆژو حلێب نیە، كەسێك هەمیشە بەرۆژو بیٚ.

لە ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵیٚ: كەپیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن بەرۆژو دەبی؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) بەقسەكەی تووڕە بوو، كە ئیمامی عومەر ئەو حاڵەی بینی، فەرمووی: ڕازین بەخودایەتی خودای خۆمان‌و ڕازین بەوەی كە ئیسلام ئاینمانەو حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بیٚ) پێغەمبەرمانە، پەنا دەگرم بەخودا لەڕق هەڵسانی خوداو لە ڕق هەڵسانی پێغەمبەری خودا، ئیتر حەزرەتی عومەر خێرا خێرا ئەم قسانەی

---

[1] صحيح: (الإرواء/٩٦١) ، ت (٢/٩٧/٦٨١)، د (٦/٤٥٧/٢٣١٧)، ن (٤/١٥٣)، جه (١/٥٢٧/١٦٤٥).

[2] متفق عليه: م (١١٥٩ – ٢/٨١٥/١٨٧)، خ (٤/٢٢٤/١٩٧٩).

دووبارەو سێبارە دەکردنەوە، تا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕقۆو تورەییەکەی دامرکایەوە، ئەمجار وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حوکمی ئەو کەسە چیە هەمیشە بەرۆژو دەبێ؟ فەرمووی: {لاصام ولاأفطر} بەهیچ بۆی حیسابە نە بەرۆژووە نە رۆژوشکێنە.[1]

## نابێ ئافرەت رۆژوی سوننەت بگرێ مێردی لەماڵ بێو ئیزنی نەدابێ

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَصُومُ الْمَـرْأَةُ وَبَعْلُهَـا شَـاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِـهِ»[2]: ئافرەت نابێ رۆژوی سوننەت بگرێو مێردەکەی لەماڵ بێو ئیزنی نەدا.

## ئیعتیکاف: مانەوە لەمزگەوت بەنیازی خوداپەرستی

مانەوە لەمزگەوتدا بەنیازی خوداپەرستی لە دە رۆژی کۆتایی مانگی رەمەزاندا سوننەتێکی گەورەو پەسەندە، بەهیوای خێرو بەرەکەتو رێکەوتی ئەو طاعەتە بەشەوی {ليلةالقدر}. قورئان دەفەرموێ: {إِنَّـا أَنزَلْنَـاهُ فِـي لَيْلَـةِ الْقَدْرِ – القدر/١}: ئێمە قورئانمان لەشەوی ڕێزدارو فەڕو بەرەکەتدا ناردۆتە خوار {وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ – القدر/٢}: تۆ چوزانی شەوی ڕێزو فەڕ چیە {لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ – القدر/٣}: شەوی ڕێزو قەدر لەهەزار مانگ چاکترە کە ئەو شەوە ڕێزدارەی تێدا نەبێ {تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَـةُ وَالـرُّوحُ فِيهَـا بِـإِذْنِ رَبِّهِم مِّـن كُـلِّ أَمْـرٍ – القـدر/٤}: لەو شەوە پیرۆزەدا فریشتەکان بەگشتیو حەزرەتی جوبرائیل بەتایبەتی، هەموو فەرمانو حوکمێکی خودای خۆیان

---

[1] صحيح: (ص. د/٢١١٩) ، م (٢/٨١٨/١١٦٢)، د (٧/٧٥/٢٤٠٨)، ن (٤/٢٠٧).

[2] متفـق عليـه: خ (٩/٢٩٣/٥١٩٢)، م (٢/٧١١/١٠٢٦)، د (٧/١٢٨/٢٤٤١)، ت (٢/١٤٠/٧٧٩)، جـه (١/٥٦٠/١٧٦١) بزيادة فيه.

دادەبەزێننە سەر زەوی {سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ – القدر/٥}: ئەو شەوە تابەیانی هەر سەلامو ڕەحمەتە.

لەخاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا لە دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا لەمزگەوتدا ئیعتیکافی دەکردو دەیفەموو: «تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ».[1] لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا بۆ شەوی (لیلةالقدر) بگەڕێنو ڕێکەوتی شەوێك لەو شەوانە دەکا.

هەر لە ئەوەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِنَ الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ».[2] بۆ شەوی (لیلةالقدر) لەشەوە تاکەکانی دە ڕۆژی دوایی مانگی ڕەمەزاندا بگەڕێن.

## پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمیشە هاوەڵانی هەڵدەنا بۆ ئەنجامدانی ئیعتیکاف

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».[3] کەسێك شەوی لەیلەتولقەدر بەزیندویی ڕاگرێ واتە بێداربێو لەمزگەوتدا بمێنێتەوە بەنیازی ئیعتیکاف خەریکی خوداپەرستی بێ، ئەم کارەشی لەئیمانەوە هەڵقوڵێو بەهیوای پاداشی دوارۆژ بێ لەتاوانی ڕابردوی لێخۆشبوونی بۆ دەستەبەر دەبێ.

ئیعتیکاف لە مزگەوتدا نەبێ نایەتە جێ، ئاماژە بەدەقی {وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ – البقرة/١٨٧}: لەو کاتانەدا کەئێوە

---

[1] صحيح: (مختصر خ/٩٨٧) ، خ (٤/٢٥٩/٢٠٢٠)، ت (٢/١٤٤/٧٨٩).

[2] متفق عليه: خ (٤/٢٥٩/٢٠١٧)، م (٢/٢٦٨/١١٦٩).

[3] متفق عليه: خ (٤/٢٥٥/٢٠١٤)، م (١/٥٢٣/٧٦٠)، د (٤/١٤٦/١٣٥٩)، ن (٤/١٥٧).

لەمزگەوتەکانـدا ئیعتیکـاف دەکـەن سـەرجێی لەگـەڵ خێزانـەکانتان مەکـەن. هـەروەها چـونکە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئیعتیکـافی هـەر لەمزگەوتـدا ئـەنجام داوە، شـوێنی ئـەو طـاعەتـەی پێغەمبـەر تـەنها مزگـەوت بووە.

واباشە بۆ ئەو کەسەی ئیعتیکاف دەکا: کە سەرگەرمی خوداپەرستی بێو خـۆ بەشـتی دونیـایی‌یـەوە مەشـغوڵ نـەکا، خـەریکی نوێـژکردنو خوێنـدنی قورئـانو تەسـبیحاتو ذیکـری تەحمیـدو تـەهلیلو تـەکبیرو ئیـستیغفارو صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەرو (دروودی خودای لەسەر بێ) دوعـاو پاڕانـەوەو وتووێژی زانستی ئایینی شتی وا.

باش نیە بۆ ئەو کەسەی لە ئیعتیکافدایە: کەخۆی بەشتی لاوەکیو کاری دونیای‌یەوە هەڵەگیر بکا، کردارو گوفتاری وابکا کە پەیوەندی بە ئیعتیکافەوە نیە، هەروەها مەکروهە کەخۆی لەقسەکردن بگرێتـەوەو پێـی وابـێ بێـدەنگی لەخودای نزیك دەکاتەوە!![1] بۆی ڕەوایە لەشـوێنی ئیعتیکافی خـۆی دەربـچێ بـۆ کـاری پێویـست، هـەروەکوو بـۆی ڕەوایـە سـەر بەشـانە بکـاو سەربتاشـێو نینۆکی بکاو جەستەی خۆی پاكو خاوێن بکاتەوە.

ئیعتیکاف پوچ دەبێتـەوە بەوەی بەبێ کاری پێویست لەشوێنی ئیعتیکـاف بچێتە دەر، هەروەها بەجووتبوون لەگەڵ خێزانـیدا.

## کتاب الزکاة (باسی زەکات)
## پلەوپایەی زەکات لەئاییندا

زەکات پایەیەکە لەپایەکانی ئیسلام، فەرزێکە لە فەرزەکانی.

---

[1] فقه السنة ج١/٤٠٤.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَإِقَامِ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَحَجِّ الْبَيْتِ وَصَوْمِ رَمَضَانَ».[1]

لەقورئانی پیرۆزدا لەهەشتاو دوو ئایەتدا زەکات لەگەڵ نوێژدا هێنراوە.

پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: {خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم – التوبة/١٠٣}: لەماڵو سامانی موسوڵمانان بەشێکی دیاری کراوە وەربگرە، بۆ ئەوەی دابەشی بکەی بەسەر هەژاراندا بەو زەکات وەرگرتنە دڵو دەروونی دەوڵەمەندەکان لەچروکیو ڕژدی پاك دەکەیەوە، دڵی هەژارەکانیش لەڕقو کینەو بەخیلی پاك دەکەیەوە، ماڵو سامانەکەش گەشەو نما دەکا.

هەروا پەروەردگار دەفەرموێ: {وَمَا آتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ – الروم/٣٩}:

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ وَلاَ يَقْبَلُ اللَّهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ وَإِنَّ اللَّهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ ، ثُمَّ يُرَبِّيهَا لِصَاحِبِهِ كَمَا يُرَبِّى أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ».[2] کەسێك بە ئەندازەی دەنکە خورمایەك لەکاسبی حەلاڵ – خودا جگە لە حەلاڵ ببەخشێ شتی تر قبوڵ ناکا – ئەوە بێگومان خودا بەدەستی ڕاستی وەری دەگرێ، پاشان بۆ خاوەنەکەی پەروەردەی دەکا وەکوو

---

[1] لەباسی نوێژدا تەخریجو مانا کراوە.

[2] متفق عليه: خ (١٤١٠/٣/٢٧٨) وهذا لفظه، م (١٠١٤/٢/٧٠٢)، ت (٦٥٦/٢/٨٥)، ن (٥/٥٧).

چۆن یەکێك لەئێوە جوانە ئەسپی تازە لەدیکبوو پەروەردە دەکا، هەتا گەورە دەبێ‌و بە ئەندازەی کێوێکی لێ دێ.

## هەڕەشە لەوانەی زەکات نادەن

قورئان دەفەرموێ: {وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلِلّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ – آل عمران/ ١٨٠}: با وانەزانن ئەوانەی رژدی دەنوێنن دەربارەی ئەو ماڵ‌و سامانەی خودا پێی داون. کە ئەو ماڵ‌و سامانە خێرە بۆیان، بەڵکوو ئەوە شەڕو نەگبەتییە، ڕۆژی قیامەت ئەو ماڵ‌و سامانەیان بۆ دەکرێ بە پشتێن‌و تۆقی ئاگر دەوریان دەدا، مڵك‌و میراتی ئاسمان‌و زەوی بۆ خودایە هەر ئەو خاوەنیانە، خودا ئاگادارە بەوەی دەیکەن‌و هیچی لێ گوم نابێ.

لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ریوایەتکراوە کە فەرموویەتی: « مَنْ آتَاهُ اللّهُ مَالاً ، فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ ، لَهُ زَبِيبَتَانِ ، يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ يَعْنِي شِدْقَيْهِ ثُمَّ يَقُولُ أَنَا كَنْزُكَ أَنَا مَالُكَ». کەسێك خودا ماڵ‌و سامانێکی پێداو زەکاتی لێ نەدا ڕۆژی قیامەت ئەو ماڵەی بۆ دەچێتە شێوەی مارێك کە لەبەر زۆر ژەهری سەری سپی بوو بێ. دوو لاشەویلە هەن، یان دوو خاڵی ڕەش بەپشتی چاوەکانیەوەن، خۆی تێدەهاڵێنێ پاشان قەپی پێدادەگاو بە لاشەویلەکانی دەیگرێ‌و دەڵێ من ماڵ‌و سامانەکەتم، پاشان پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلِلّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ – آل عمران/ ١٨٠}.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ – التوبة/٣٤}: ئەوانەی زێڕو زیو پەزمەندە دەکەن لەڕێگەی ڕەزامەندی خودادا خەرجی ناکەن، ئەوە مزگێنی سزای بەئێشیان پێ بدە.

{يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَـذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ – التوبة/٣٥}: لەو ڕۆژەدا لەناو ئاگری دۆزەخدا ئەو زێڕو زیوە سوردەکرێتەوە، ناوچاوان و لاتەنیشت و بەروپشتیانی پێ داخ دەکرێ، پێیان دەگوترێ ئەمە ئەو ماڵ و سامانەیە کە لەدونیادا بۆخۆتان پەزمەندە کردبوو، دەبچێژن سزای ئەو ماڵ و سامانەی کۆتان کردبووەوەو لێتان نەبەخشیبوو.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هیچ خاوەن زێڕو زیوێك نیە مافی ماڵ و سامانەکەی نەدا کە بریتییە لە زەکات، ئیللا ڕۆژی قیامەت ئەو زێڕو زیوەی بۆ دەکرێ بەپارچە پلێتی ئاگرین، بەئاگری دۆزەخ بۆی سور دەکرێتەوە، لاتەنیشت و ناوچەوانی و بەروپشتی پێ داخ دەکرێ. هەر کەسارد بۆوە بۆی سوردەکرێتەوە لەڕۆژێکدا ئەندازەی پەنجا هەزار ساڵە، هەتا حیساب و لێکۆڵینەوەی خەڵك کۆتایی دێ و هەرکەسە سەرەنجامی خۆی دەزانێ، یان بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێ یان بۆ دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێ. گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی خاوەن حوشتر؟ فەرمووی: خاوەنی حوشتریش ئەگەر حەقی خۆیان لێ نەدا هەروایە. بەشێ لەو حەقەی تێیاندا واجبە: کە ڕۆژی ئاودانیان بیاندۆشێ و لەشیرەکەیان بەشی ڕێبوارو ئاتاجان بدا، جا ئەگەر حەقی خۆیان لێ دەرنەکا ڕۆژی قیامەت خاوەنەکەیان فڕێ دەدرێتە گۆڕەپانێك، حوشترو ئاژەڵەکانیش بەتەواوی ژمارەیان و هێزو توانایان بەسمەکانیان دەیشێلن و پێخوستی دەکەن و

دەیسوونەوە، بەددانیان دەیگەزن، کە بەسەریا تێپەڕین سەرلەنوێ بەسەریا دەگەڕێندرێنەوەو بەهەمان شێوە سزای دەدەنەوە ئەمە لەڕۆژێکدا ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە، هەتا حیساب و لێکۆڵینەوەی نێوان مەخلوقات تەواو دەبێ و لێك دەکرێتەوەو هەرکەسە ڕێگای خۆی نیشان دەدرێ یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ.[1]

## حوکمی زەکات نەدەر

زەکات فەرزێکە لەو فەرزە سەرەکیانەی واجبییەکەی کۆڕای ئوممەتی لەسەرە: ئەوەندە مەشهورو باوە، بووەتە شتێکی زەروری لە ئایین، بەجۆرێك ئەگەر کەسێك ئینکاری واجببونی بکا پێی کافردەبێ و لە ئیسلام دەردەچێ و دەشکوژرێ، مەگەر تازە موسوڵمان بێ، ئەوە بۆی دەبێتە عوزرو بیانوی وەردەگیرێ بەهۆی نەزانی بە حوکمەکە.

وەڵێ کەسێك بڕوای وابێ زەکات واجبەو زەکات نەدا، ئەو تاوانبار دەبێ بەزەکات نەدانەکەی کافر نابێ، پێویستە حاکم و فەرمانڕەوای وەخت بەزۆر زەکاتەکەی لێ بستێنێ و[2] بەشێوەی سزاش نیوەی ماڵەکەی لێ زەوت دەکا.

لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە ئەویش لە باوکییەوە، لەباپیریەوە هاتووە دەڵێ: ژنەوتم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: « فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ ابْنَةُ لَبُونٍ لاَ يُفَرَّقُ إِبِلٌ عَنْ حِسَابِهَا مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِرًا فَلَهُ أَجْرُهَا وَمَنْ أَبَى فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ إِبِلِهِ عَزْمَةٌ مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى لاَ يَحِلُّ لآلِ مُحَمَّدٍ مِنْهَا شَيْءٌ»[3]:

---

[1] صحيح: (ص.ج/٥٧٢٩) ، م(٩٨٧/٦٨٠/٢)، د(١٦٤٢/٧٥/٥).

[2] فقه السنة ج١/٢٨١.

[3] حسن: (ص.ج/٤٢٦٥)، د(١٥٦٠/٤٥٢/٤)، ن(٥/٢٥)، حم(٢٨/٢١٧/٨).

لەهەموو گاڕانە حوشترێکدا بەدەمی خۆی بلەوەری زەکات هەیە، لەهەر چل سەرێکدا گۆلکە حوشتر (بنت لبون)ێك هەیە. جەڵە بەحوشترەکە لێك جیاناکرێنەوە، هەموویان دەژمێردرێن کزو قەڵەوو گەنجو پیر پێکەوە حیساب دەکرێن، یان مانای ئەوەیە: ئەگەر جەڵەبەکە هاوبەشی بوو لێك جیاناکرێنەوە.

عامیلی زەکاتیش دەبێ جۆری مامناوەند وەربگرێ. جا هەر خاوەن حوشترێك زەکاتی خۆی بەڕێك و پێکی داو بەهیوای پاداشی لای خودابوو، ئەوە پاداشی خۆی هەیە. کەسێك زەکاتەکە نەدا ئەوە ئێمە بەزۆر لێی دەستێنین و نیوەی ماڵەکەشی دەبەین وەکوو سزادانێك، ئەمەش جدییەت و بەهەند وەرگرتنێکە لەو شتانەی کەخودا فەرمانی پێکردوین گرنگییان پێ بدەین. هیچ شتی لەم ماڵە بۆ ئالی محمد حەڵاڵ نیە، ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێك زەکاتیان نەداو بڕواشیان وابوو واجبە، هێزو توانای بەربەرەکانیشیان هەبوو، ئەوە شەڕیان لەگەڵ دەکرێ ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: « أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّى دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ»[1]: فەرمانم پێ کراوە: کە شەڕ لەگەڵ خەڵکانی کافر بکەم هەتا شایەتی دەدەن کەهیچ خودانین جگە لە (الله) وە موحەممەد پێغەمبەری خودایە، نوێژدەکەن و زەکات دەدەن: جا کە ئەو ئەرکانەیان بەجێ هێنا خوێن و ماڵیان لەمن دەپارێزن، مەگەر بەحەقی ئیسلام و حیسابیان لای خودایە.

لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدونیا دەرچوو رۆژگار بوو بەسەردەمی

---

[1] متفق عليه: خ(١/٧٥/٢٥) وهذا لفظه م(١/٥٣/٢٢).

حـــەزرەتی ئەبوبـــەکر، هەنـــدێ هـــۆزو خێڵـــی عـــەرەب هەڵگەڕانـــەوەو کافربوونـەوە. حـەزرەتی ئەبوبـەکر بڕیـارێدا شـەڕیان لەگـەڵ بکـا، حـەزرەتی عومـەر فـەرمووی: ئـەتۆ چـۆن شـەڕ لەگـەڵ ئـەو زەکـات نەدەرانـە دەکـەی؟ لەحاڵێکدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویـەتی: « أُمِـرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ . فَمَنْ قَالَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّـى مَالَـهُ وَنَفْـسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ»؟ ئەبوبـەکر فـەرمووی: سـوێندم بـەخودا شـەڕدەکەم لەگەڵ هەرکەسێك جوداوازی بخاتە نێوان نوێژو زەکات، چونکە زەکات حـەقی مـاڵو سـامانە، وەڵڵاهـی ئەگـەر بێـچوە بـزنێکم لێ مـەنع بکـەن کـە لـەوەپێش دەیانـدا بـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) ئێـستا نایـدەن، بـەخودا شەڕیان لەگـەڵ دەکـەم لەسـەر نـەدانی، حـەزرەتی عومـەر فـەرمووی: بـەخودا ئەوە بڕیارێـك بـوو خـودا دڵـی حـەزرەتی ئەبوبـەکری بـۆ رونـاك کردۆتـەوەو زانیم ئەوە حەقەو کارێکی پەسەندە[1].

## زەکات لەسەر کێ واجبە؟

زەکـات واجبـە لەسـەر هـەموو موسـوڵمانێکی ئـازاد: کـە سـامانی بگاتـە ئەندازەیەك پێی بگوترێ: دەوڵەمەندو ساڵێکیش بەسـەر ئـەو خاوەنداریەتیـە تێپەڕیبێ، جگە لە کشتو کاڵ، ئەم بەدرووێنە کردنی زەکاتی تێدا واجب دەبێ بەمەرجێ بگاتە ئەندازەی زەکات تێدا واجببوون. قورئان دەفەرموێ: {وَآتُـواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ – الأنعام/١٤١}. دوای درووێنەو خەرمان سورکردن زەکات لـە کشتو کاڵ دەربکەن.

---

[1] متفق عليه: خ(١٣٩٩/١٤٠٠/٣/٦٢٦/٣)، م(١/٥١/٢٠)، د(٤/٤١٤/١٥٤١)، ن(٥/١٤)، ت(٤/١١٧/٢٣٣٤).

### ئەو ماڵو سامانەی زەکاتی تێدا واجب دەبێ

زەکات واجبە لە ماڵو سامانی نەخدینەو کشتو کاڵو بەروبوومو ئاژەڵو کانو کانزا.

### زەکاتی نەخدینە (زێڕو زیو)

### ئەو ئەندازەیەی زەکاتی تێدا واجب دەبێو ئەندازەی زەکاتەکە

نیصابی زێڕ بیست دینارە، نیصابی زیو دوسەد دیرھەمە. ھەرکاتێ ئەو دوو جۆرە گەیشتنە ئەو ئەندازەیە چواریەکی دەیەکی تێدا واجب دەبێ. لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « فَإِذَا كَانَتْ لَكَ مِائَتَا دِرْهَمٍ وَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ وَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ - يَعْنِي فِي الذَّهَبِ - حَتَّى يَكُونَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا فَإِذَا كَانَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا وَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ فَفِيهَا نِصْفُ دِينَارٍ فَمَا زَادَ فَبِحِسَابِ ذَلِكَ »[1]: ھەرکاتێ ئەتۆ دووسەد دیرھەمت ھەبوو ساڵی بەسەردا تێوەرسوڕایەوە پێنج دیرھەم زەکاتی لێ دەردەکرێ، لەبارەی زێڕیشەوە ھیچت لەسەر واجب نیە ھەتا دەبێە خاوەنی بیست دینار، ھەرکاتێ بیست دینارت بوو ساڵی بەسەردا ڕۆیی ئەوە نیو دیناری زەکات تێدا واجب دەبێ.

### زەکاتی خشڵ

زەکاتی خشڵ واجبە بەگوێرەی مانای گشتی ئایەتی قورئانو فەرموودە، ئەوکەسەی خشڵ لە حوکمی ئایەتەکانو فەرمودەکان دەردەھاوێو دەڵێ زەکاتی تێدانیە ئەوە ھیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە. وێڕای ئەوەش چەند دەقێکی تایبەتی ڕیوایەتکراون: کە ئەوە دەگەیەنن کە زەکات لەخشڵدا واجبە. لەوانە:

---

[1] صحيح: (ص.د/١٣٩١) ، د(٤/٤٤٧/١٥٥٨).

لە ئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: چەند پارچە زێڕێکم کردبوە خشڵو بەخۆمدا کردبوو بۆ خۆڕازاندنەوە، عەرزی پێغەمبەرم کرد ئایا ئەمە بەکەنزو پەزمەندە کردن حیساب دەکرێ؟ فەرمووی: «مَا بَلَغَ أَنْ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ فَزُكِّيَ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ». هەرماڵێك گەییشتە ئەندازەیەك زەكاتی لێ بدرێو زەكاتی لێ درا ئەوە بەكەنز حیساب نیە[1].

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ماڵەکەم لەپەنجەکانمدا هەندێ ئەنگوستیلەو خڕخاڵی بینین لەزیو دروستکرابون فەرمووی: «مَا هَذَا يَا عَائِشَةُ». ئەوە چیە ئەی عائیشە؟! وتم: دروستم کردون خۆیان پێ بڕازێنمەوە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: «أَتُؤَدِّينَ زَكَاتَهُنَّ ». ئایا زەکاتەکەیان دەدەی؟! وتم: ناوەڵڵا، یان (ئەگەر خودا بیەوێ). فەرمووی: «هُوَ حَسْبُكِ مِنَ النَّارِ». ئەوەندەت بەسە بۆ دۆزەخ.[2].*

## زەكاتی كشتو كاڵو بەروبومو میوە

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ جَنَّاتٍ مَّعْرُوشَاتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَاتٍ وَالنَّخْلَ وَالزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُتَشَابِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ –

---

[1] حسن: (ص.ج/٥٥٨٢)، (الصحيحه/٥٥٩)، د(١٥٤٩/٤٦٢/٤)، قط(٢/١٠٥).

[2] صحيح: (ص.د/١٣٨٤) ، د(١٥٥٠/٤٢٧/٤)، قط(٢/١٠٥).

* ئەم باسە لەكتێبە فیقهیەكاندا زۆر لێكۆڵینەوەو چەندو چوونی لەسەركراوە، بەم شەش حەوت دێڕەی ئێرە نابێ حوكم بدرێ، هەركەسێ دەیەوێ بە تەفصیلی لەم باسە ئاگاداربێو نەكەوێتە هەڵەوە با بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە فیقهیەكان بەتایبەتی كتێبە ناوازەكەی د. یوسف القرضاوی (فقه الزكاة) یان (الموسوعة الفقهیة الكویتیة). (ملا محمود).

الأنعام/١٤١}: پەروەردگار خودایەکی وەهایە بۆ ئێوەی بەدی هێناوە باخی کەپر بۆکراوو باخی بێ کەپر، درەختی خورماو کشتو کاڵی جۆراو جۆر کەتامی بەروبوومی هەریەکەیان لەوی دی جیاوازە. هەروا زەیتونو هەنار کە لەدیمەندا لێك دەچنو لەتامو خواردندا لێك جوداوازن، لەو بەروبوومو میوەجاتە بخۆن با بەتەواوی نەشگەیشتبێ، زەکاتی پێویستیش لەو کشتو کاڵو بەروبوومە دەربکەن لەکاتی خەرمان سورکردنو ترێ رنینو خورما چنینو حاصلات هەڵگرتندا. زێدەڕەوی مەکەن لە لێ خواردنو لێ بەخشیندا، بێگومان پەروەردگار ئەوانەی خۆش ناوێن کە زێدەڕۆیی دەکەن.

### ئەو جۆرانەی زەکاتیان تێدایە

ئیبنولمونزیر دەڵێ: کۆڕای زانایان لەسەرئەوەیە کە زەکات واجبە لە گەنمو جۆو، خورماو مێوژدا[1].

ئەمجار دەربارەی غەیری ئەم چوار جۆرە کەوتوونە راجیاییەوە، ئەوەی بە پەسەندو راجیح دەزاندرێ ئەوەیە زەکات لە غەیری ئەو چوار شتە وەرناگیرێ، ئەمەش بەپێی حەدیثی ئەبو بەرزە: کە لەئەبو موساو معازەوە ریوایەتی کردوە وتوویانە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردونی بۆ وڵاتی یەمەن بۆئەوەی خەڵك فێری ئایینی ئیسلام بکەن فەرمانی پێ کردون: کە زەکات وەرنەگرن جگە لەم چوار جۆرە کشتو کاڵو بەروبوومە: (گەنم – جۆ – خورما - مێوژ)[2].

---

[1] الإجماع/٩٢/٤٧.

[2] صحيح: (الصحيحة/٨٧٩)، ك(١/٤٠١)، هق(٤/١٢٥)..

### ئەندازە (نیصاب)

بەروبووم‌و کشت‌و کاڵ تا نەگاتە نیصاب‌و ئەندازەی زەکات تێدا واجب بوون زەکاتیان تێدانیە. بەمەرج گیراوە بۆ زەکات تێدا واجب بوونی کشت‌و کاڵ‌و بەروبووم: کە چەندیەتیان بگاتە ئەو ئەندازەیەی لەم حەدیثەی ئەبو سەعیدی (الخدری)دا دیاری کراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ مِنَ الإِبِلِ ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ»[1]: لەکەمتر لەپێنج سەر حوشتر زەکات نیە، لەکەمتر لەپێنج ئوقیە: کە دەکاتە دووسەد دیرهەم زەکات نیە لەکەمتر لەپێنج ویسق: کە دەکاتە سێ سەد ربە (صاع) زەکات واجب نیە.

### ئەو ئەندازەی واجبە بدرێ

لەجابیرەوە ڕیوایەتکراوە، پێغەمبەر فەرموویەتی: « فِيمَا سَقَتِ الأَنْهَارُ وَالْغَيْمُ الْعُشُورُ وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ نِصْفُ الْعُشْرِ».[2] ئەو کشت‌و کاڵ‌و بەروبوومەی بە ئاوی ڕوبارو باران ئاو دەدرێ زەکاتەکەی دەیەکە.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا الْعُشْرُ ، وَمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ»[3]: ئەو کشت‌و کاڵەی بە باران یان بەئاوی کارێز یان زلکاو نزیک ڕوباربوو، ئاودانی ئەرکی زۆری گەرەك نەبوو یان زەوییەکە

---

[1] متفق عليه: خ(١٤٤٧/٣١٠/٣)، وهذا لفظه. م(٩٧٩/٦٧٣/٢)، ت(٦٢٢/٦٩/٢)، ت(٥/١٧)، جة(١٧٩٣/٥٧١/١).

[2] صحيح: (ص.ج/٤٢٧١) ، م(٩٨١/٦٧٥/٢) وهذا لفظه، د(١٥٨٢/٤٨٦/٤)، ن(٥/٤٢).

[3] صحيح: (ص.ج/٤٢٧) ، خ(١٤٨٣/٣٤٧/٣) وهذا لفظه د(١٥٨١/٤٨٥/٤)، ت(٦٣٥/٧٦/٢)، ن(٥/٤١)، جة(١٨١٧/٥٨١/١).

شێداربوو ئاوی لەسەرەوە بوو رەگی درەختو روەکەکە دەگەیشتە ئاو ئەوە دەیەکی لەسەرە ئەگەر بەهۆی مەکائینو ناعورو شتی وا ئاودەدرا نیوەی دەیەکە.

## خەرساندنی خورماو ترێ

لە ئەبو حەمیدی (السّاعدی)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا چووین بۆ غەزای تەبوك. کە تەشریفی هاتە (وادی القری) ئافرەتێك لەناو باخەکەیدا بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەروبوومەکەی بۆ (خەرص) مەزندە بکەن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆی مەزندەکرد بە دەویسق، پاشان پێی فەرموو ئەوەی لێی بەرهەم دەهێنی حیسابی بکەو بیژمێرە... جادوایی کە تەشریفی هاتە (وادی القری) بە ئافرەتەکەی فەرموو: «كَمْ جَاءَ حَدِيقَتُكِ»؟ باخەکەت چەندی بەروبووم هێناوە؟ وتی: دەویسق، دەق وەکوو پێغەمبەر خەرساندبووی.[1]

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی دەنارد لەکاتی پێگەیشتنو گەییندا باخە خورماکەی دەخەرساندن پێش ئەوەی لێی بخورێ، پاشان جولەکەکانی سەرپشك دەکرد بەو مەزندەکردنو خەرساندنە باخەکە بخەنە ئەستۆی خۆیان یان لێی دەستبەرداربن بەو مەزندەکردنە، بۆئەوەی زەکاتەکە هەژمار بکا پێش ئەوەی میوەکە بخورێو لێك جیابکرێتەوە[2].

## زەکاتی ئاژەڵ

ئاژەڵی زەکات تێدا واجب بوو سێ جۆرە (حوشتر، رەشەوڵاخ، مەڕوبزن).

---

[1] صحيح: (ص.د/٢٦٤٣) ، خ(١٤٨١/٣٤٣/٣)، د(٣٠٧٩).

[2] حسن لغيره (الإرواء/٨٠٥)، د(٣٣٩٦/٢٧٦/٩).

**زەکاتی حوشتر:**

لەئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الإِبِلِ صَدَقَةٌ»[1]: لەکەمتر لەپێنج سەر حوشتر زەکات واجب نیە.

**ئەندازەی ئەو زەکاتەی لە حوشتردا واجبە:**

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە: کە حەزرەتی ئەبوبەکر ئەم نامەیەی بۆ نووسی کاتێك کە بەرەو وڵاتی بەحرەین ڕەوانەی کرد. «بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – عَلَى الْمُسْلِمِينَ ، وَالَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ ، فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى وَجْهِهَا فَلْيُعْطِهَا ، وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَهَا فَلاَ يُعْطِ فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ فَمَا دُونَهَا مِنَ الْغَنَمِ مِنْ كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ ، إِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ إِلَى خَمْسٍ وَثَلاَثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ أُنْثَى ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَثَلاَثِينَ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ أُنْثَى ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَأَرْبَعِينَ إِلَى سِتِّينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْجَمَلِ ، فَإِذَا بَلَغَتْ وَاحِدَةً وَسِتِّينَ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ ، فَإِذَا بَلَغَتْ – يَعْنِي – سِتًّا وَسَبْعِينَ إِلَى تِسْعِينَ فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْجَمَلِ ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ ، وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ إِلاَّ أَرْبَعٌ مِنَ الإِبِلِ فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا مِنَ الإِبِلِ فَفِيهَا شَاةٌ»[2]: بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان، ئەمە فەرزی زەکاتە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای

---

[1] صحيح: لەوەپێش تەخریج کرا.

[2] صـــــحيح: (ص.د/١٣٨٥) ، خ(١٤٥٤/٣١٧/٣)، (١٣٥٣/٣١٦/٣)، د(١٥٥٢/٤٣١/٤)، ن(١٨/٥)، جة(١٨٠٠/٥٧٥/١) الحديث الثاني فقط.

لەسەر بێ) فەرزی کردوە لەسەر موسوڵمانانو ئەومیە: کە خودا فەرمانی کردوە بە پێغەمبەرەکەی جا هەر موسوڵمانێك دوای زەکاتی لێ کرا بەورێو رەسمە، با زەکاتەکەی بێ چەندو چوون رادەستی زەکات وەرگرەکان بکا، کەسێك زیادی لێ داواکرا بانەیدا، لەبیستو چوار حوشترو کەمتردا مەڕ دەدرێ، لەهەموو پێنج سەر هەتا سیو پێنج ئەوە گۆلکە مێینە حوشترێکیان تێدا واجب دەبێ کە ساڵێکی تەواو کردبێو چوبێتە ساڵی دووەمەوە. کە ژمارەیان گەییشتە سیو شەش تا چلو پێنج سەر ئەوە نوینگینە حوشکترێکیان تێدا واجب دەبێ کە چوبێتە ساڵی سێیەمەوە. کەبوون بە چلو شەش تا شەصت سەر ئەوە حوشترە مێینەیەکیان تێدا واجب دەبێ، کەسێ ساڵی تەواوکردبێو چوبێتە ساڵی چوارەمەوەو کاتی ئەوەی هاتبێ کەڵ بگرێ. ئەگەر بوون بە شەصتو یەك تا حەفتاو پێنج سەر ئەوە حوشترێکیان تێدا واجبە کە چوبێتە ساڵی پێنجەمی تەمەنی، ئەگەر ژمارەیان گەییشتە حەفتاو شەش تا دەگاتە نەوەد سەر ئەوە دوو (بنت لبون) دوو حوشتری وا چووبنە ساڵی سێیەمی تەمەنیانەوە واجب دەبێ. ئەگەر بوون بە نەوەدو یەك سەر تا دەگەنە سەدو بیست، دوو حوشتری وا سێ ساڵیان تەواو کردبێو چوبنە ساڵی چوارەمەوە، کە ژمارەیان لەسەدو بیست تێپەڕی لەهەموو چل سەرێکدا (بنت لبون)ێك هەیەو لەهەموو پەنجا سەرێکدا حوشترێك واجب دەبێ کە سێ ساڵی تەواوکردبێو چوبێتە ساڵی چوارەمەوە کەسێك تەنها چوار سەر حوشتری هەبوون ئەوە زەکاتیان تێدانیە کەبوون بەپێنج سەر، دەبێ مەڕێك بدا بەزەکات.

**کەسێک جۆرە حوشترێکی لەسەر پێویست بوو بیدا بەزەکاتو دەست نەدەکەوت دەبێ چی بکا؟**

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە: کە حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خودای لێ بێ) نووسراوێکی بۆ نووسی دەربارەی چۆنیەتی وەرگرتنی زەکاتی ئاژەڵ بەوشێوەی خوداو پێغەمبەری خودا فەرمانیان کردبوو، کەسێك حوشترەکانی گەیشتنە ئەو ئەندازەیەی کە حوشکترێکی وابدا بەزەکات کە چوار ساڵی تەاوکردبێو چوبێتە ساڵی پێنجەمەوە وەڵێ ئەو جۆرە حوشترەی دەست نەدەکەوت، لەهەمان کاتدا حوشتری وای هەبوو سێ ساڵی تەواوکردبێو چوبێتە ساڵی چوارەمەوە ئەوە ئەو جۆرەی لێ وەردەگیرێزو دوو مەڕیشیان لەگەڵ دەدا، یان لەجیاتی ئەو دوو مەڕە بیست دیرهەم دەدا.

کەسێك حوشترەکانی گەیشتنە ژمارەیەك دەبوایە حوشترێکی وا بدا بەزەکات کە سێ ساڵی تەواوکردبێو چوبێتە ساڵی چوارەمەوە، بەڵام دەستی نەدەکەوت، حوشتری گەورەتری هەبوو، ئەوە لێی قبوڵ دەکرێو بیست دیرهەم یان دوو مەڕی دەدرێتەوە.کەسێك زەکاتی گەیشتە ئەو ئەندازەیەی حوشتری (حیقة) واتە: چوبێتە ساڵی چوارەمی تەمەنیەوە – بداو جگە لە (بنت لبون) کە حوشترێکە چوبێتە ساڵی سێیەمی تەمەنیەوە نەیبوو، ئەوە لێی وەردەگیرێ وێڕای دوومەڕ یان بیست دیرهەم.

کەسێك زەکاتەکەی گەیشتە ئەو ئەندازەیەی (بنت لبون) بدا بەڵام جگە لە (حِقّة) حوشتری تری نەبوو ئەوە لێی وەردەگیرێو بیست دیرهەم یان دوو مەڕی بۆ دەگەڕێندرێنەوە.

کەسێك زەکاتی گەییشتە ئەوەی (بنت لبون) بدا جگە لە (بنت مخاض) حوشتری تری نەبوو ئەوە لێی وەردەگیرێ‌و بیست دیرهەم یان دوو مەڕیشی لەگەڵ دەدا.[1]

*** زەکاتی ڕەشەوڵاخ: نیصابی زەکاتی‌و ئەندازەی زەکاتی واجب:**

لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردمی بۆ یەمەن‌و فەرمانی پێ کردم کە زەکاتی ڕەشەوڵاخ بەمجۆرە وەربگرم: کە لەهەموو چل سەرێك نوێنگینێکی دووساڵە وەربگرم لەهەموو سی سەرێك گۆلکێکی یەکساڵە وەربگرم.[2]

*** زەکاتی مەڕو بزن‌و ئەندازەی زەکاتی واجب بوو تێیاندا:**

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە: کە حەزرەتی ئەبوبەکر ئەندازەی زەکاتی مەڕو بزنی بۆ نووسی کە خوداو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانیان پێ کردوە کە زەکاتی مەڕوبزن بەم شێوەیە وەربگرێ، ئەوەی بەدەمی خۆی دەلەوەڕێ لەچل سەرەوە تا سەدوبیست سەر یەك مەڕە، کە لەسەدو بیست زیادبوو تا دووسەد سەر دوومەڕ دەدا. کە لەدووسەد تێپەڕی تا سێصەد سەر، سێ مەڕ دەدا. کە لەسێ سەد تێپەڕی لەهەموو سەد سەرێکدا مەڕێك واجبە، ئەگەر مەڕو بزنەکان لەچل سەر کەمتر بوون ئەوە زەکاتیان لێ ناکەوێ مەگەر خاوەنەکە بۆ خۆی ئارەزۆی بێ، زەکاتیان لێ بدا.[3]

---

[1] صــــــحیح: (ص.د/١٣٨٥) ، خ(١٤٥٤/٣١٧/٣)، (١٤٥٣/٣١٦/٣)، د(١٥٥٢/٤٣١/٤)، ن(١٨/٥)، جة(١٨٠٠/٥٧٥/١).

[2] صحیح: (ص.د/١٣٩٤) ، ت(٦١٩/٦٨/٢)، د(١٥٦١/٤٥٧/٤)، ن(٢٦/٢)، جة(١٨٠٣/٥٧٦/١) واللفظ له عنده غیره زیادة في آخره.

[3] صحیح: لەوەپێش تەخریج کرا.

## مەرجی واجبوونی زەکات لە ئاژەڵدا

١- دەبێ ژمارەیان بگاتە نیصابی زەکات لێ دەرکردن.

٢- دەبێ ساڵیان بەسەردا بسوڕێتەوە، ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: « لاَ زَكَاةَ فِي مَالٍ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ»[1]: لە هیچ ماڵو سامانێکدا زەکات واجب نیە تا ساڵی بەسەردا تێوەرنەسوڕێتەوە.

٣- دەبێ ئەو ئاژەڵانە بەدەمی خۆیان بلەوەڕێن، پێویست بە ئاڵفو لەوەڕ ئامادەکردن نەکا، بەدەمی خۆیان لەپاوانی موباحدا زوربەی ساڵ لەوەڕبخوا، ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «فِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ فِي سَائِمَتِها إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ الى عشرين ومَائة شَاةٌ»[2]: لە زەکاتی مەڕو بزنی (بۆخۆ لەوەڕ)دا ئەگەر بوون بەچل هەتا سەدو بیست سەر یەك مەڕ واجب دەبێ.

هەروا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) « فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ ابْنَةُ لَبُونٍ»: لە حوشتردا کە بۆ خۆی بلەوەڕێو پێویستی بە ئاڵف نەبێ لەهەموو چل سەرێکدا حوشترێکی تەمەن دووساڵ تەواوکردو واجب دەبێ.

## ئەوەی نابێ بەزەکات وەربگیرێ

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موعازی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: «وَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ

---

[1] صحيح: (ص.ج/٧٤٩٧) ، جة(١/٥٧١/١٧٩٢)، قط(٣/٩٠/٢). هق(٤/١٠٣).

[2] بەشێکە لەنامەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر کە لەوەپێش ئاماژەی پێ کرا.

أَمْــوَالِهِمْ»[1]: خــۆ بپــارێزە لــەوەی شــتە هــەرەباش‌و ماڵــە هەڵبژاردەكــەیان وەربگری لەجیاتی زەكات.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتكراوە: كە حـەزرەتی ئەبوبـەكر چۆنیەتی پـڕۆژەی زەكـات وەرگرتنـی بـۆ نووسـی بـەو شـێوەیەی خـوداو پێغەمبـەر فـەرمانیان كردوە، تێیدا هـاتبوو «وَلاَ يُخْرَجُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ ، وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ ، وَلاَ تَيْسٌ ، إِلاَّ مَا شَـاءَ الْمُـصَدِّقُ»[2]: لـە حیـسابی زەكاتـدا ئـاژەڵی پـیرو كوێرو عەیبـدارو نێرینە دەرناهاوێژرێ، مەگەر زەكاتدەر بەئارەزۆی خۆی جیایان بكاتەوە.

## حوكمی ئاژەڵی تێكەڵكراو

ئەگـەر دووكـەس یـان زیـاتر لەزەكاتـدەران ئاژەڵـەكانیان تێكـەڵاو كـرد بەجۆرێك كەماڵی هیچیان جیانەدەكرایەوە لەبەشی ئەوی تریان ئەوە زەكـاتی یەك كەس دەدەن ئەگەر زەكاتیان لێ بكەوێ.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتكراوە: كە حـەزرەتی ئەبوبـەكر پـڕۆژەی وەرگرتنـی زەكاتی بۆ نووسی بەوشێوەی خوداو پێغەمبەری خودا فەرمانیان پـێ كـردوە: تێیدا هاتووە «وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بِالسَّوِيَّةِ فَإِذَا)[3]:

مــاڵ‌و ســامانی لێــك جیــا تێكــەڵ نــاكرێن‌و مــاڵی تێكــەڵكراویش لێــك جیاناكرێنــەوە بەمەبەسـتی خۆرزگاركردن لـە زەكاتـدان یـان كەمكردنـەوەی. ئەگـەر دووكـەس مـاڵ‌و سـامانیان تێكـەڵاو بـوو ئـەوە زەكـاتی ماڵەكـەیان لێ وەردەگیرێ، ئەمجار هەریەكەیان بەپێی چەندییەتی ماڵەكەیان لەناو خۆیانـدا

---

[1] متفق علیه: خ(١٤٩٦/٣٥٧/٣)، م(١٩/٥٠/١)، ت(٦٢١/٦٩/٢)، د(١٥٦٩/٤٦٧/٤٤)، ن(٥/٥٥).

[2] صحیح: (ص: ١٤٥٥) .

[3] صحیح: (ص: ١٤٥٠، ١٤٥١).

زەكاتەكە بەش دەكەن بۆ نموونە ئەگەر بەهەردوكيان چل سەر مەڕيان هەبوو بۆ هەريەكەيان بيست سەر، كابراى زەكات وەرگر لە يەكێكيان مەڕێك وەردەگرێ، ئەو كەسەى مەڕەكەى داوە داوادەكا شەريكەكەى نرخى نيوەى مەڕەكەى بۆ رەت بكاتەوە.

## زەكاتى ماڵو سامانى دفنكراوى پێشينان (زكاة الركاز)

ريكاز: ماڵو سامانى دفنكراوى پێشينانە كە بەبێ ماندوبوونى زۆر دەست دەكەوێ، وەكوو دۆزينەوەى ئەو ماڵو سامانە شێردراوەى لێرەو لەوێ دەدۆزرێتەوە. ئەم جۆرە ماڵە هەر لەگەڵ دۆزرايەوەو كەوتە دەست، دەبێ زەكاتەكەى دەربكا بەبێ ئەوەى تێوەرسوڕانەوەى ساڵو گەييشتنى بە ئەندازەى نيصاب بە مەرج بگيرێ. ئەمەش بەپێى گشتگيرى فەرموودەكەى پێغەمبەر: كە فەرموويەتى: «وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ»[1]: لەماڵو سامانى دۆزراوەى ژێر زەويدا پێنج يەك هەيە.

## ئەوانەى زەكاتيان دەدرێتێ (مصارف الزكاة)

پەروەردگار دەفەرموێ: {إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ – التوبة/٦٠}: زەكات نەوەكوو دەدرێ ئيللا كە دەدرێ بۆ فەقيران و هەژاران و ئەوانەى ئەركى كۆكردنەوەى زەكاتيان لەئەستۆدايە. هەروا ئەوانەى نوێ موسوڵمانن، بۆ ئازادكردنى كۆيلە، بۆ قەرزداران، بۆ ئەوانەى لەپێناو رەزامەندى خودادا جيهاد دەكەن، بۆ رێبوارو دابڕاوان

---

[1] متفـــق عليـــه: خ(٣/٣٦٤/١٤٩٩)، م(٣/١٣٣٤/١٧١٠)، ت(٢/٧٧/٦٣٧)، ن(٥/٤٥)، جة(٢/٨٣٩/٢٥٠٩)، د(٨/٣٤١/٣٠٦٩).

لەزێدو نیشتمانی خۆیان، ئەمە فەریضەیەکە لەخوداوە بۆ ئێوە دیاریی کراوە، خودا زاناو کار دروستە، حەکیم‌و لێزانە، هەموو بڕیارو فەرمانەکانی لەجێی خۆیدایە.

ئیبنو کەثیر لە تەفسیرو ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: پەروەردگار (کاتێ ڕەخنەی دوڕووە نەزانەکانی باسکرد: کە ڕەخنەیان لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گرت دەربارەی دابەشکردنی زەکات، ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە کە چۆنیەتی دابەشکردنی زەکات‌و دەستنیشانکردنی ئەوانەی شیاون بەزەکات پێدان‌و بەیانی حوکمەکەی لەخوداوەیە، بۆ خۆی ئەوەی رون کردۆتەوە، کەچۆن دابەشکردنی بەسەر ئەو تاقم‌و پێڕانەی لە ئایەتەکەدا دیاری کراون ئەنجام بدرێ.

*** ئایا پێویستە کەسێک زەکات بدا بەسەر هەموو ئەو تاقمانەدا دابەشی بکا؟**

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: زانایانی ئیسلام ڕاجیاییان هەیە دەربارەی ئەو هەشت صنفانە، لەوەدا ئایا پێویستە زەکاتەکە هەموان بگرێتەوە یان ئەگەر دای بەدوو سێ کەس لەو هەشت صنفە کیفایەتە.؟ زانایان بوون بەدوو بەش.

هەندێکیان فەرموویانە پێویستە کابرا کە زەکات دەدا بیدا بەهەر هەشت صنفەکە، ئەمە ڕای ئیمامی شافیعی‌و کۆمەڵێکە.

کۆمەڵێکی تریان فەرموویانە پێویست ناکا بەسەر هەرهەشت صنفەکەدا دابەشی بکا، بەڵکوو دروستە زەکاتدەر زەکاتەکەی بەیەکێك لەو هەشت صنفەبدا وێڕای هەبوونی صنفەکانی تر، ئەمە ڕای ئیمام مالیك‌و کۆمەڵێك لە زانایانی سەلەف‌و خەلەفە، لەوانە ئیمامی عومەر، حوزەیفە، ئیبنو عەبباس، ئەبوالعالیە، سەعیدی کوڕی جوبەیر، مەیمونی کوڕی مەهران.

ئیبنو جەریر دەڵێ: ئەمە رای هەموو ئەهلی عیلمە. ئەم صنفانە کە دیاریی کراون بۆ رونکردنەوەی ئەوەیە: کە ئەمانەن زەکاتیان بەسەردا دابەش دەکرێ، نەك مانای ئەوەیە پێویستە زەکاتەکە هەموویان بگرێتەوە؛

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: با ئەو فەرموودانە باس بکەین کە دەربارەی هەریەك لەو تاقمانەی دروستە زەکاتیان بدرێتێ ریوایەت کراون

١- فەقیرەکان: لە ئیبنو عەمرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيّ وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيّ».[1] صەدەقەو زەکات حەڵاڵ نیە بۆ دەوڵەمەندو بۆ کەسێك لەشساغو بەهێزو توانابێ.

لە عوبەیدیللای کوڕی (الخیار) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: دوو پیاو بۆیان گێڕامەوە کە هاتوونە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای زەکاتیان لێ کرد، ئەویش تەشریفی لێیان وردبۆوەو چاوی پێداگێڕان، وای هاتنە بەرچاو کە بەهێزو تواناو گورجو گۆڵن. فەرمووی: «إِنْ شِئْتُمَا أَعْطَيْتُكُمَا وَلاَ حَظٌّ فِيهَا لِغَنِيّ وَلاَ لِقَوِيّ مُكْتَسِبٍ».[2] ئەگەر حەزتان لێ بێ لەزەکات بەشتان دەدەم، وەلێ ئەوە بزانن: کە زەکات بەشی دەوڵەمەندی تێدانیەو دەوڵەمەند بۆی رەوانیە زەکات وەربگرێ، هەروا بەکەسێکیش حەڵاڵ نیە هێزو توانای هەبێو بتوانێ کاسبی بکا.

٢- مسکێنەکان: لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « لَيْسَ الْمِسْكِينُ بِهَذَا الطَّوَّافِ الَّذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ فَتَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ». مسکێن ئەو کەسە نیە

---

[1] صحيح: (ص.ج/٧٢٥١) ، ت(٢/٨١/٦٤٧)، د(٥/٤٢/١٦١٨)، جة(١/٥٨٩/١٨٣٩)، ن(٥/٩٩).

[2] صحيح: (ص.د/١٤٣٨)، د(٥/٤١/١٦١٧)، ن(٥/٩٩).

مالەو ماڵ دەکاو بەسەر خەڵکدا دەسوڕێتەوە سواڵیان لێ دەکا، پاروە خواردنێك یان دوو پارو، دەنکە خورمایەك یان دوو دەنکە خورما دەیگێڕێتەوە. هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەدی مسکێن کێیە ئەی پێغەمبەری خودا؟! فەرمووی: مسکێن ئەو کەسەیە پێداویستی ژیانی نیە، کەس بەحاڵی نازانێ تاخێری پێ بکا، داوای هیچ شتێکیش لەخەڵك ناکا.[1]

٣- ئەوانەی ئەرکی زەکات کۆکردنەوەیان لەئەستۆدایە، ئەوانە کۆکەرەوەو زەکات وەرگرن، مافی خۆیانە بەشێك لەو زەکاتەیان پێ بدرێ، مەرجە نابێ زەکات وەرگرو فەرمانبەرانی زەکات کۆکردنەوە لە خزمو کەس‌وکاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بن، ئەوانەی زەکاتیان لێ حەرامەو نابێ وەری بگرن، چونکە لە صەحیحی موسلیمدا چەسپاوەو لە عەبدولموطەلیبی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی (ألحارث) ڕیوایەتکراوە: کە ئەوو (ألفضل)ی کوڕی (ألعباس) چون بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوایان لێ کرد بیانخاتە سەر کاروباری زەکات کۆکردنەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِنَّ هَذِهِ الصَّدَقَةَ لاَ تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ وَلاَ لآلِ مُحَمَّدٍ إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ».[2] زەکاتو صەدەقە بۆ موحەممەدو ئالی موحەممەد حەڵاڵ نیە، زەکاتو سەرفیترە چڵكو پۆخڵاواتی خەڵکە. خەڵك بەو زەکاتە ماڵو سامانی خۆیان پاك دەکەنەوە، دڵو دەرونی خۆیان لە ڕەوشتی چروکیو ڕژدی پاك دەکەنەوە.

٤- مؤلفة القلوب: نوێ موسوڵمان: ئەمانە چەند جۆرێکن: هەیە زەکاتی دەدرێتێ بۆئەوەی موسوڵمان ببێ، وەکوو چۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەستکەوتی حونەین بەشی صەفوانی کوڕی ئومەیەی دا،

---

[1] متفق عليه: م(١٠٣٩/٧١٩/٢)، خ(١٤٧٩/٣٤١/٣)، ن(٨٥/٥)، د(١٦١٥/٣٩/٥).

[2] صحيح: (ص.ج/١٦٦٤) ، م(١٠٧٢/٧٥٢/٢)، د(٢٩٦٩/٢٠٥/٨)، ن(١٠٥/٥).

صەفوان موشریك بوو هاوبەشی كرد، صەفوان بۆ خۆی دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەردەوام بەشی دەدام هەتاوای لێ هات لەهەموو كەسم خۆشتر دەویست، لەكاتێكا لەوەپێش لەهەموو كەس ناخۆشترم دەویست.[١]

هەیانە بۆیە زەكاتی دەدرێتێ تا ئایین لەدڵیدا جێگیر بێو دڵی دابمەزرێ. وەكوو چۆن رۆژی غەزای حونەین سەد حوشتری دا بەكۆمەڵێك لە گەورە گەورەكانی ئەسیرە بەرەڵلاكراوەكان، فەرمووی: «إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ ، خَشْيَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللَّهُ على وجهه فِي النَّارِ جهنم»[٢]: من بەخشش دەدەم بە پیاوێك كەسانی ترم لەو خۆشتر دەوێ. وەلێ بۆیە رێزی لێ دەگرم ماڵی دەدەمێ لەترسی ئەوە نەوەكوو خودا بەرەودەم فرێی داتە ناو دۆزەخەوە.

لە صەحیحەیندا لەئەبو سەعیدەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: حەزرەتی عەلی كەمی پارچە زێڕی پاڵفتە نەكراوی لە یەمەنەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نارد، ئەویش دابەشی كرد بەسەر چوار كەسدا (ئەقرەعی كوڕی حابیس، عویەینەی كوڕی بەدر، عەلقەمەی كوڕی عولاثە، زید الخیر) فەرمووی: بۆیە ئەمەیان دەدەمێ دڵیان وەگری ئیسلام بێ.[٣]

هەیانە بۆیە بەشیان دەدرێ بۆ ئەو هاوشانەكانیان تەماعیان بەركەوێو موسوڵمان بن.

---

[١] صحيح: (مختصر م/١٥٨٨) ، د(٢٠٥/٢٩٦٩ – ٨/٢٠٨)، ن(١٠٥ و ٥/١٠٦).

[٢] متفق عليه: (١/٧٩/٢٧)، م(١/١٣٢/١٥٠)، د(١٢/٤٤٠/٤٦٥٩)، ن(٨/١٠٣).

[٣] متفق عليه: خ(٨/٦٧/٤٣٥١)، م(٢/٧٤١/١٠٦٤)، د(١٣/١٠٩/٤٧٣٨).

هەيانە بۆیە دەیاندرێتێ هەتا زەکاتی سنووری ئەولای خۆیان بەلای ولاتی کوفردا کۆبکەنەوە، یان بۆئەوەی دیفاع لە حەوزەی موسوڵمانان بکاو زەرەریان لەولاتی موسوڵمانانو قەراغ بیجاغی ولاتی ئیسلام دووربخاتەوە.

**ئایا دوای وەفاتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشی (مؤلفة القلوب) ماوە.؟!**

ئیبنو کەثیر دەڵێ: راجیایی تێدایە:-

لە ئیمامی عومەرەوەو لە عامیری الشعبیۆ کۆمەڵێکی ترەوە ریوایەت کراوە: کە دوای لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشی (مؤلفة القلوب) نەماوەو نایاندرێتێ، چونکە پەروەردگار ئیسلامو موسوڵمانانی بەهێزو شکۆمەند کردوەو لە ولاتدا جێگیربونو دەسەلاتیان پەیدا کردوە، گەلو نەتەوەکانی تری بۆ ملکەچ کردون.

کۆمەڵێکی تر دەفەرموون: بەڵکوو ئەو بەشە بەردەوامەو دەیاندرێتێ چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوای فەتحی مەککەو تێکشکاندنی هۆزی هەوازین بەشی (مؤلفة القلوب) نۆ موسوڵمانی داوە، ئەمە دیاردەیەکەو پێویستە بەردەوامی هەبێ.

٥- پرۆسەی کۆیلە ئازادکردن، ریوایەتکراوە، لە حەسەنی بەصرییەوەو لە موقاتیلی کوڕی حەییانو عومەری کوڕی (عبدالعزیز)و سەعیدی کوڕی جوبەیرو (ألنخعی) و (ألزّهری)و ئیبنو زەید فەرموویانە وشەی (ألرّقاب) لێرەدا بریتییە لە ئەو کۆیلانەی نووسراویان لەگەڵ مۆر دەکرێۆ بە مەرجو بەپارە ئازاد دەکرێن لەماوەیەکی دیاریکراودا. هەمان راوبۆچون لەئەبو موسای ئەشعەرییەوە ریوایەت کراوە. ئەمە رای شافیعیو ئیمام (ألّلیث)یشە.

ئیبنو عەبباسو (ألحسن) دەفەرموون: هیچ خراپییەکی تێدانیە بەپارەی زەکات کۆیلە ئازادبکرێ. ئەمە رێبازی ئیمام ئەحمەدو ئیمام مالیكو

ئیسحاقیشه. واته: ئەمان پێیان وایە دەستەواژەی (في الرقاب) لەوە گشتی ترە: کە تایبەت بکرێ بە موکاتەبەوە یان سەرلەبەر کۆیلەی پێ بکڕدرێو ئازادبکرێ. بێگومان دەربارەی پاداشی بەندە ئازادکردنو ئەستۆ رزگارکردن فەرموودەی زۆر ریوایەت کراون، ئەومیان تێدا چەسپاوە: کە پەروەردگار بە ئازادکردنی هەموو ئەندامێکی کۆیلە ئەندامێکی ئازادکەرەکە لەئاگر رزگار دەکا، تەنانەت شەرمگای لەبەرامبەر شەرمگایدا[1]. ئەمەش لەڕوانگەی ئەوەوە دێ کە پاداش لەجینسی کردارە. قورئان دەفەرموێ: {وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ – الصافات/٣٩} پاداشتان نادرێتەوە مەگەر بە پێی کردەوەکانتان.

٦- الغارمون: چەند جۆرێکی هەیە. هەیانە خۆدەخاتە ژێر قەرزەوە لەبەر بەرژەوەندی گشتی، یان دەبێتە بەرعودەی قەرزێكو دەچێتە ئەستۆیو زیان بە ماڵەکەی دەگا. یان بۆخۆی قەرزدارەو ناتوانێ قەرزەکەی بداتەوە، یان لەتاوانێکدا تووشی قەرزداری بووەو دوایی تۆبەی کردوە ئەمانە هەموویان لەزەکات بەشیان دەدرێ بۆئەوەی هەموو پێداویستی یان بەشێکی پێداویستییەکانیان جێبەجێ بێ.

ئەصڵو بنەما لەم باسەدا حەدیثەکەی (قبیصة)ی کوڕی (مُخارق الهلالي)یە: کەدەڵێ: قەرزێکم خستە ئەستۆی خۆم، هاتمە خزمەت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) داوام لێ کرد لەو بارەوە فەرمبویەکم بکا، فەرمووی: چاوەڕوان بکە تا زەکاتمان بۆ دێ، ئەوکاتە بەشێکت بۆ دیاری دەکەین. دەڵێ: پاشان فەرمووی: ئەی (قبیصە)! سوالّ کردن حەڵاڵ نیە مەگەر بۆ یەکێك لەسێ جۆر کەس. پیاوێك بەرعودەی قەرزێك بێ بۆ

---

[1] صحيح: (ص.ج/٦٠٥١) رواه الترمذی من حدیث ابی هریرة قال سمعت رسول الله یقول: (من اعتق رقبة مؤمنة أعتق الله منه بكل عضو منه عضواً من النار حتى يعتق فرجه بفرجه (٣/٤٩/١٥٨١).

بەرژەوەندی گشتی بەهۆیـەوە توشی قـەرزداری بـوو، بۆی ڕەوایـە داوابکـا تـا وەنـدەی دەسـت دەکـەوێ خـۆی پـێ بگـرێ ئـیتر وازبێنـێ. پیاوێـك بـەڵاو كارەساتێك لەماڵو سامانەكەی دا هیچی نەما بۆی ڕەوایە داوابكا كۆمەكی پێ بكـرێ تـاخۆی دەگرێتـەوەو ژیـانی بـەرەو باشـی دەڕوا. پیاوێـك هـەژاریو نـەبوونی یەخـەی بگـرێ بـەجۆرێك سـێ كـەس لـە عاقڵمەنـدانی قەومەكـەی شایەتی بدەن بڵێن: فلاَنكەس توشی هـەژاری بـووەو نەدارایـە. ئـەوەش بـۆی هەیـە داوابكـا كۆمـەكی بكـرێ هـەتا ژیـانی مـسۆگەر دەبـێو پـشتی ڕاسـت دەبێتەوە، جگە لەم سێ حاڵە ئەی قەبیصە بزانە سواڵكردنو داواكردنـی مـاڵ لەمو لەو سوتخواردنەو حەرامێكە خاوەنەكەی دەیخواو سوتە[1].

٧- في سبيل الله: ئەو جەنگاوەرو غەزاكارانـەن، كـە لـەدیوانی حوكومەتـدا موچەیان نیە.

بەلای ئیمامی ئەحمەدو (الحسن)و ئیسحاقەوە حـەج دەچێتە نـاو بـواری (في سـبيل الله) لەبـەر حـەدیثـی ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خـودا لـە خـۆیو لەباوكی)، ڕیوایەت دەكا، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نیازی حـەجی هـەبوو، ئافرەتێـك بەمێردەكـەی گـوت: دەبـێ لەگـەڵ پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) حـەجم پـێ بكـەی، كـابرا وتـی: هیـچم نیـە پێداویستی حەجی تۆی پێ دابین بكەم، وتـی بـە حوشـتری فلاَن حـەجم پـێ بكە، كابرا وتی: ئەو حوشـترە تایبـەت كـراوە بـە بـواری (في سـبيل الله)، دوایـی كـابرا هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وتـی: خێـزانم داوای لێ كردم لەخزمەت جەنابتدا حەجی پێ بكەم، منیش پێم گوت هیچم نیە بیكەمە وڵاخی سواریت بۆ حـەج، پێی گوتم: بەسواری حوشـتری فلاَن بمنێرە، منیش پێم گوت: ئەو حوشترە تایبەت كراوە بۆ جەنگاوەرو غەزاكاران

[1] صحيح: (مختصر م/٥٦٨)، م(٢/٧٢٢/١٠٤٤)، د(٥/٤٩/١٦٢٤)، ن(٥/٩٦).

تايبەتە بە (في سبيل الله). پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەی ئەگەر بەسواری ئەو حوشترە حەجت پێ بکردایە، ئەوە دەچوە بواری (في سبيل الله)[1].

٨- ابن السبيل: = ڕێبوار، دابڕاو لە زێدو نیشتمان. کەسێکە سەفەری و ڕێبوار بە وڵاتێکدا بڕوا هیچی پێ نەبێ بۆ تەواوکردنی سەفەرەکەی و گەیشتن بە ئامانج. ئەم جۆرە کەسانەش لەماڵی زەکات ئەوەندەیان دەدرێتێ بیانگەیەنێتەوە وڵاتی خۆیان، ئەمە ئەگەر لە وڵاتی خۆی ماڵیشی هەبێ هەر زەکاتی پێ دەشێ.

ئەم حوکمە بۆ کەسێکیشە دەست بکا بەسەفەر لە وڵاتی خۆیەوەو هیچی پێ نەبێ ئەمەش لەماڵی زەکات ئەوەندەی دەدرێتێ بتوانێ کیفایەتی بکا بۆ چوون و هاتنەوەی. بەڵگە لەسەرئەوە دەقی ئایەتەکەیەو ئەو فەرموودەیە: کە ئیمام ئەبو داودو ئیبنو ماجە لە حەدیثی موعەممەر: کە لەیەزیدی کوڕی ئەسلەم ئەویش لە عەطای کوڕی یەسارەوە لەئەبو سەعیدەوە ریوایەتیان کردوە، دەڵێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيّ إِلاَّ لِخَمْسَةٍ لِعَامِلٍ عَلَيْهَا أَوْ رَجُلٍ اشْتَرَاهَا بِمَالِهِ أَوْ غَارِمٍ أَوْ غَازٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ مِسْكِينٍ تُصُدِّقَ عَلَيْهِ مِنْهَا فَأَهْدَى مِنْهَا لِغَنِيٍّ»[2]. واتە: زەکات وەرگرتن بۆ دەوڵەمەند حەڵاڵ نیە مەگەر بۆ پێنج کەس: ئەوکەسەی کاربەدەستی زەکات وەرگرتن و کۆکردنەوەیەتی، یان کەسێك بەشێك لەماڵی زەکات بەپارەی خۆی بکڕێ، یان کەسێك بەهۆی کاروبارێکی کۆمەڵایەتی و ڕێکخستنەوەی موسوڵمانان قەرزدار بووبێ، یان کەسێك جەنگاوەری غەزابێ

---

[1] حسن صحيح: (ص.د/١٧٥٣)، د(١٩٧٤/٤٦٥/٥)، ك(١٨٣/١)، هق(٦/١٦٤).

[2] صحيح: (ص.ج/٧٢٥٠)، د(١٦١٩/٤٤/٥)، جة(١٨٤١/٥٩٠/١).

لەرێگەی خودادا، یان کابرایەکی هەژار لەماڵی زەکات بەشێکی پێ درابێ ئەویش لەوبەشەی پێی دراوە هەندێکی لێ بکا بەدیاری بۆ دەوڵەمەندێك.

## سەرفیترە (زكاة الفطر)

سەرفیترە لەسەر هەموو موسوڵمانێك واجبە، ئاماژە بەحەدیثی ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: پێغەمبەر زەکاتی فیترەی واجب کرد لەسەر کۆیلەو ئازاد، نێرو مێ، گەورەو بچوك لەموسوڵمانان، ئەندازەکەشی ربەیەك خورما یان ربەیەك جۆیە، فەرمانیشی کرد پێش ئەوەی دەربچن بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان، ئەو زەکاتە بدەن بە ئاتاج.[1]

## حیکمەت‌و فەلسەفەی سەرفیترە

لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زەکاتی سەرفیترەی واجب کرد بۆ پاککردنەوەی رۆژووەوانە کە لەقسەی لەغوو ناشیرین، بۆ دابینکردنی بژێوی هەژاران، جا کەسێك پێش نوێژ بەجێی هێنا، ئەوە زەکاتێکی پەسەندو قبوڵکراوە، کەسێکیش دوای نوێژ دابەشی کرد، ئەوە خێرێکە کردوویەتی.[2]

## سەرفیترە لەسەر کێ واجبە؟

سەرفیترە واجبە لەسەر مرۆڤی ئازادی موسوڵمان، کە دارای بژێوی زیاد لەشەو رۆژی جەژن بۆخۆی‌و ماڵ‌و منداڵ‌و خێزانی‌و هەموو ئەوانەی بژێویان لەسەر ئەوە لەکورو خزمەتکار بەمەرجێ موسوڵمان بن.

---

[1] متفق علیه: خ (٣/٣٦٧/١٥٠٣)، م (٩٨٤، ٩٨٦/٦٧٧) د (٢/٦٧٩)، ت (٦٧٢،٦٧٠/٩٢ – ٢/٩٣) د (١٥٩٥،٤/٩٦، ٥/٥)، ن (٥/٤٨)، جه (١/٥٨٤/١٨٢٦).

[2] حسن (ص. جه/١٤٨٠)، جه (١/٥٨٥/١٨٢٧)، د (٥/٣/١٥٩٤).

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەهەموو موسوڵمانێك بەدەرکردنی زەکاتی سەرفیترە لەجیاتی خۆی‌و خێزانی لە بچوك‌و گەورەو ئازادو کۆیلە لەوانەی بژێویان لەسەر ئەوە.[1]

## ئەندازەی سەرفیترە

پێویستە بۆ هەر یەکێك نیو ڕبە گەنم یان ڕبەیەك جۆ یان مێوژ یان کەشك یان هەرشتێکی کە بەبژێو دەژمێردرێ وەکوو برنج‌و زوڕات‌و نۆك‌و ئەو جۆرە شتانە.

بەڵگەی ئەوە کە لە گەنم نیو ڕبە کیفایەتە حەدیثەکەی عوروەی کوڕی زوبەیدە کە دەفەرموێ: (خاتو ئەسمائی کچی ئەبو بەکر لەڕۆژگاری پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) زەکاتی سەرفیترەی دەردەکرد بۆ خێزانی خۆیان بۆ ئازادو بۆ کۆیلە دوو مود (مست) لەگەنم یان ڕبەیەك لەخورما، بەمست یان بەو ڕبەی قوتیان پێ دەپێوا).[2]

بەڵگەی ئەوە کە بۆ غەیری گەنم دەبێ ڕبەیەك بێ، حەدیثی ئەبو سەعیدی (الخدری)یە، کە دەفەرموێ: (ئێمە سەرفیترەمان دەردەکرد ڕبەیەك بژیو یان ڕبەیەك جۆ، یان ڕبەیەك خورما، یان ڕبەیەك کەشك، یان ڕبەیەم مێوژ).[3]

---

[1] صحيح: (الإرواء/٨٣٥) ، قط (١٢/١٤١/٢)، هق (٤٤/١٦١).

[2] الطماوى ٢/٤٣ وهذا لفظه.

[3] متفق عليه: خ (١٥٠٦/٣٧١/٣)، م (٩٨٥/٦٧٨/٢)، ت (٦٦٨/٩١/٢)، د (١٦٠١/١٣/٥)، ن (٥١/٥)، جه (١٨٢٩/٥٨٥/١).

زۆربەی فوقەهاو شەرعزانان پێیان وایە نابێ لەجیاتی سەرفیترە پارە بدرێ، ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: دروستە، ئیمامی نەوەوی لەشەرحی موسلیمدا ج٧/٦٠ باسی ئەوەی کردووە.

د. عبدالعظیم بدوی دەڵێ: من دەڵێم: قسەی ئەبو حەنیفە رەت دەکرێتەوە، چونکە ( وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ). خودای تۆ هیچی لەیاد ناچێ، ئەگەر پارە لەجیاتی سەرفیترە دروست بوایە خوداو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەیان روون دەکردەوە، بۆیە واجبە بەگوێرەی ظاهیری دەقەکان کار بکەین و ئەتویل و گۆڕانکاری نەکەین.

## کاتی دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە

لە ئیبنو عومەرەوە (رەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) ریوایەتکراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە بە دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە پێش دەرچوونی خەڵك بۆ نوێژی جەژن.

دروستە پەلە بکرێ ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش جەژن بدرێ بەوانەی کۆی دەکەنەوە: کە فەرمانبەری رەسمی ئەوکارەن. لەنافیعەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) زەکاتی سەرفیترەی دەدا بەو کەسانەی وەریان دەگرت و کۆیان دەکردەوە، ئەوانیش پێش جەژن بەرۆژێك دوو رۆژ دەیاندا بەهەژاران.[1]

سەرفیترە دەبێ هەر بدرێ بەهەژارو کەم دەرامەت، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەکوو لەحەدیثی ئیبنو عەبباسدا هاتووە فەرموویەتی: (وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ).[2] خۆراك و بژێوە بۆ هەژاران.

---

[1] متفق علیه: سبق تخریجه.

[2] حسن: سبق تخریجه.

## خێرو صەدەقەیەکە واجب نەبێ

سوننەتە موسوڵمانانی خودا پێداو زۆرو بەردەوام لەماڵو سامانی خۆیان ببەخشنو هەوڵ بدەن ڕەوشتی ڕەزیلیو چروکی لەناو خۆیاندا قەڵاچۆ بکەن، چونکە پەروەردگار موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ بەخشینو یارمەتیدانی ئاتاجانو دەفەرموێ: {مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ وَاللّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ — البقرة/٢٦١}: نمونەی پاداشی ئەوانەی ماڵو سامانی خۆیان لەڕێگەی خودادا دەبەخشن وەکوو دەنکە دانەوێڵەیەك وایە حەوت گوڵی لێ کەوتبنەوە لەهەموو گوڵێکیشدا سەد دەنکە دانەوێڵە هەبێ، پەروەردگاریش بەویستی خۆی پاداش دووچەندانە دەکاتەوە بۆ کەسانێك کەشیاوی ئەوە بن، پەروەردگار خەزێنەی ڕەحمەتی بەربڵاوو گوشادەو زانایە بەهەموو شتێك.

هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی هەڵنانی موسوڵمانان بۆ ماڵبەخشینو کۆمەکی کردن بە ئاتاجان، دەفەرموێ: « مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا ، وَيَقُولُ الآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا».[1] هەموو ڕۆژێ کە بەندەکان ڕۆژیان لێ دەبێتەوە دوو فریشتە دادەبەزن یەکیان دەڵێ خودایە! ببەخشە بەو کەسەی ماڵی خۆی لەڕێی ڕەزامەندی تۆدا دەبەخشێو یارمەتی ئاتاجان دەدا شوێنی بۆ پڕبکەرەوەو چەند دەبەخشێ پتری پێ بدەوە، ئەوی تریان دەڵێ: خودایە ئەو کەسەی ڕوژدو چروکە فەوتانی ماڵو سامانی بەسەردا نازڵ بکەو خێرو خۆشی لەماڵو دارایی خۆی نەبینێ.

شیاوترین کەس: کە موسوڵمان خێری پێ بکا، خزمو کەسوکارە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ

---

[1] متفق علیه: خ (١٤٤٢/٣٠٤/٣)، م (١٠١٠/٧٠٠/٢).

صَدَقَةٌ وَ عَلَى ذِي الرَّحِمِ ثِنْتَانِ: صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ».[١] خێر بەهەژارێك كەخزم نەبێ هەر صەدەقەیەو بەس، بەڵام خێر بەخزمو كەسوكار هەم صەدەقەیەو هەم صیلەی رەحمە.

## باسی حەج

### گەورەیی‌و خێرو فەڕی حەج‌و عەمرە

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: ((اَلْعُمْرَةُ إِلَى اَلْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ اَلْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا اَلْجَنَّةَ))[٢] عومرەكردن تا عومرەیەكی تر دەبێتە كەفارەتی گوناهی نێوانیان. حەجی پەسەندو قبوڵكراو پاداشی نیە جگە لەبەهەشت، كە بەهەشت خۆی پاداشی هەرە بەرزی خودایە دەیدا بە بەندەكانی.

لە ئیبنو مەسعوودەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ وَالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلَيْسَ لِلْحَجَّةِ الْمَبْرُورَةِ ثَوَابٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ».[٣] بەردەوام بن لەسەر ئەنجامدانی حەج‌و عومرە، چونكە ئەوان فەلاَچۆی تاوان‌و هەژاری دەكەن، وەكوو چۆن ئاگرو كورەی ئاسنگەرو زێڕینگەر چڵك‌و ژەنگی ئاسن‌و زێڕو زیو لادەبەن، حەجی قبوڵكراویش پاداشی نیە جگە لە بەهەشت.

---

[١] صحیح: (ص. ج/٣٨٥٨) ، ت (٢/٨٤/٦٥٣).

[٢] متفـق علیـه: (٣/٥٩٧/١٧٧٣)، م (٢/٩٨٣/١٣٤٩)، ت (٢/٢٠٦/٩٣٧)، جـه (٢/٩٦٤/١٨٨٨)، ن (٥/١١٥).

[٣] صحیح: (ص. ج/٢٩٠١) ، ت (٢/١٥٣/٨٠٧)، ن (٥/١١٥).

لـه ئـەبو هـورەيرەوە ڕيوايـەتكراوە، دەڵـێ: لـە پێغەمبـەرم بيـستووە دەيفەرموو: «مَنْ حَجَّ لِلَّهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ».[1] كەسێك بەمەبەستی ڕەزامەندی خودا حەج بکا قسەی ناشیرین‌و نەشیاو نـەکاو جوێن نەدا شەڕ نەکا، تاوانی لەسەر نامێنێ وەکوو ئەو ڕۆژەی لەدایك بـووە ئـاوای لێ دێتەوە.

لـە ئيبنـو عومـەرەوە ڕيوايـەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الْغَازِي فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْحَاجُّ وَالْمُعْتَمِرُ وَفْدُ اللَّـهِ دَعَـاهُمْ فَأَجَابُوهُ وَسَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ»: موسوڵمانی غەزاکەر لەڕێگەی خودادا حاجی‌و ئـەو کەسەی عەمرە دەکا وەفدی پەروەردگارن شاندو نوێنەرن بـۆلای خـودا، خـودا بانگی کـردوون بـەپیر بانگـەوازیی‌یـەکەیـەوە چـون، داوایـان لـەخودا کـردوووە ئەویش ناهومێدی نەکردوون داواکارییەکەیانی جێبەجێ کردوون.

## حوکمی حەج

حــەج‌و عــومرە لــەماوەی تەمەنــدا یــەکجار واجــبن لەســەر هــەموو موسوڵمانێکی بـاڵغ‌و عـاقڵ‌و خـاوەن توانـا. قورئـان دەفـەرموێ: {إِنَّ أَوَّلَ بَيْـتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ، فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَـن دَخَلَهُ كَـانَ آمِنًـا وَلِلّـهِ عَلَـى النَّـاسِ حِـجُّ الْبَيْـتِ مَـنِ اسْـتَطَاعَ إِلَيْـهِ سَـبِيلاً – آل عمــران/٩٦-٩٧ }: یەکـەم خـانوو کـەبنیات نـراوە بـۆ خوداپەرسـتی ئـەو خانووەیـە لەشـاری مەککـەدا دروسـتکراوە. ئـەو خانوەیـە کـە ئیـبراهیم‌و ئیـسماعیل بنیاتیـان نـاوە بـۆ خوداپەرسـتی، ئـەو ئاسـتانەیە سەرچـاوەی شارەزاییکردنی خەڵکە، نوێژکەرەکان لەکاتی نوێژو پاڕانەوەدا ڕوی تێدەکەن‌و

[1] متفــق عليــه: خ (٣/٣٨٢/١٥٢١)، م (٢/٩٨٣/١٣٥٠)، جــه (٢/٩٦٤/٢٨٨٩)، ن (٥/١١٤)، ت (٢/١٥٣/٨٠٨).

دڵی موسوڵمانانی پێوە بەندە، لەوماڵەدا نیشانەی ئاشکرای تێدان، یەکێ لەو نیشانانە شوێنی راوەستانی ئیبراهیمە تێیدا کە بۆ نوێژکردن لێی راوەستاوەو لەخودا پاڕاوەتەوە. هەرکەسێکیش تینی بۆهاتبێ‌و خۆی خستبێتە ناوی تا لەناویدا مابووبێتەوە پارێزراو بووە، پێویستیشە هەرکەسێك لە موسوڵمانان توانای دارایی‌و جەستەیی هەبوو لەماوەی تەمەنیدا جارێك دیدەنی ماڵی خودا بکا بەمەبەستی حەجکردن بۆ خودا، ئەمەش رێزلێنانێکی تایبەتییە بۆ ئەو خانە پیرۆزە.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری بۆ خوێندینەوە فەرمووی: «أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ فَرَضَ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ فَحُجُّوا»: ئەی خەڵکینە! پەروەردگار حەجی لەسەر فەرز کردوون حەجی ماڵی خودا بکەن.

پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا حەج کردن هەموو ساڵێ واجبە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێدەنگ بوو وەڵامی نەدایەوە، تا سێ جار کابرا پرسیارەکەی دوبارە کردەوە. فەرمووی: «لَوْ قُلْتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ» ئەگەر بمگوتایە بەڵێ، هەموو ساڵێ حەجتان لەسەر واجب دەبوو، نەشتان دەتوانی ئەنجامی بدەن، پاشان فەرمووی: «ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلاَفِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ».[1] ئەوەی پێتان نالێم‌و بێدەنگیم لێ کرد مەی وروژێنن، هەموو ئەو گەل‌و نەتەوانەی پێش ئێوە بەهیلاك بردووە زۆر پرسیار کردنیان‌و سەرپێچیکردنیان بۆ فەرمانی پێغەمبەرانیان بووە، کە فەرمانم پێ کردن بەکارێك بەگوێرەی توانا پێی

---

[1] صحيح: (مختصر م/٦٣٩) ، م (٢/٩٧٥/١٣٣٧)، ن (٥/١١٠).

هەڵسن، ئەگەر نەهیم لێ کردن لەشتێك سەرلەبەر وازی لێ بێنن‌و توخنی مەکەون.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ ، وَالْحَجِّ ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ».[1] ئایینی ئیسلام لەسەر پێنج روکن بنیات نراوە، شایەتومان بەوەی هیچ خودانین جگە لە زاتی (الله) هەروا شایەتی بەوەی حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەرە، بەجێ هێنانی نوێژ، زەکاتدان، حەجکردن، بەرۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزان.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «هَذِهِ عُمْرَةٌ اسْتَمْتَعْنَا بِهَا فَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ الْهَدْيُ فَلْيَحِلَّ الْحِلَّ كُلَّهُ فَإِنَّ الْعُمْرَةَ قَدْ دَخَلَتْ فِي الْحَجِّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ».[2] ئەمە عومرەیەکە بەشێوەی (تمتع)و سەربەخۆ ئیحرامان بۆی بەستووە، جا کەسێك هەدی‌و دیاری‌و قوربانی نیە با ئیحرامەکە بشکێنێ، چونکە عومرە چووەتە گەڵ حەج هەتا دونیا دونیایە.

لە (الصبی) کوڕی مەعبەدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: هاتمە خزمەت حەزرەتی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) عەرزم کرد: ئەی ئەمیری موسوڵمانان! من موسوڵمان بووم‌و وام زانیوە حەج‌و عەمرەم لەسەر واجبن، بەنیازی ئەنجامدانیان بەیەکەوە ئیحرامم بەستووە، عومەر فەرمووی: دەق بەپێی سوننەت‌و ڕێبازی پێغەمبەرت (دروودی خودای لەسەر بێ) کردووە.[3]

---

[1] متفق عليه: سبق تخريجه.

[2] صحيح: (الإرواء/٩٨٢) ، م (١٢٤١/٩١١/٢).

[3] صحيح: (الإرواء/٩٨٣) ، ن (١٤٦/٥)، د (١٧٢٢/٢٣٠/٥)، جه (٢٩٧٠/٩٨٩/٢).

## حەجی منداڵو کۆیلە

حەج لەسەر منداڵو شێت واجب نیە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ عَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ».[1] سێ جۆر ئادەمیزاد ئەرکیان لەسەرشان نیەو موکەلەف نین، نوستوو تا بەخەبەر دێ، شێت تا شێتیەکەی لێ دەرەوێتەوە، منداڵ تا باڵغو رەسیدە دەبێ، هەروا حەج لەسەر کۆیلە واجب نیە، چونکە توانای نیە نیمەی بەدەست خۆی نیە، ناچارە خزمەتکاری خەڵك بێ.

خۆ ئەگەر منداڵ یان کۆیلە بۆیان رێکەوت حەجیان کرد، حەجەکەیان صەحیحە، بەڵام لەبری حەجی واجبیان ناکەوێ، هەرکاتێ کۆیلەکە ئازاد بوو، یان منداڵەکە رەسیدە بوو، مەرجی حەجیان تێدا هاتە دی دەبێ حەج بکەن.

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: ئافرەتێك منداڵێکی بردە حزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد ئاخۆ ئەم بۆ ئەوە دەشێ حەجی پێ بکەم؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نعم ولك أجر) بەڵێ ئەگەر حەجی پێ بکەی خێرت دەگاتێ.[2]

هەر لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَيُّمَا صَبِيٍّ حَجَّ فَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى ، وَأَيُّمَا عَبْدٍ حَجَّ ، ثُمَّ أُعْتِقَ فَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى».[3] هەر منداڵێك حەجی کرد پاشان رەسیدە بوو توانای حەجکردنی هەبوو حەجێکی تری لەئەستۆیە، هەر کۆیلەیەك

---

[1] لەومپێش تێپەڕی.

[2] صحيح: (مختصر م/٦٤٨) ، م (٢/٩٧٤/١٣٣٦)، د (٢/١٦٠/١٧٢٠)، ن (٥/١٢٠).

[3] متفــق عليـــه: خ (٤/٦٦/١٨٥٥)، م (٢/٩٧٣/١٣٣٤)، ت (٢/٢٠٣/٩٣٢)، د (٥/٢٤٧/١٧٩٢)، ن (٥/١١٧).

حەجی کرد دوایی ئازاد کرا حەجێکی تری لەسەرە، واتە حەجی پێشویان بری حەجی فەرز ناکەوێ.

### توانای دارایی بۆ ئەنجامدانی حەج

هەر کەسێك توانای جەستەیی‌و ماڵو دارایی چونو هاتنەوەو پێداویستی ژیانی خۆی‌و ماڵو منداڵی هەبوو لەو ماوەیەدا ڕێگاوبانیش ئەمین بوون ئەوە حەجی لەسەر واجب بووە. (ئیستیطاعە) هاتۆتە دی. بەمەرج گرتنی لەشساغی بەپێی حەدیثی ئیبنو عەبباسە: کە دەفەرموێ: ئافرەتێکی خەثعەمی هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد ئەی ڕەوانەکراوی خودا باوکم حەجی لەسەر واجب بووەو پیرێکی پەککەوتەو بەساڵاچووە، ناتوانێ خۆ بەسەر وڵاخەوە ڕابگرێ، ئایا لەجیاتی ئەو حەج بکەم؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حجّ عنه). بەڵێ لەباتی ئەو حەج بکە.[1]

بەمەرجگرتنی ئەوە کەدەبێ کابرا ئەوەندەی هەبێ زیاد لەبژێوی خۆی‌و ئەوانەی بژێویان لەئەستۆی ئەوە بتوانێ تا دەچێ‌و دێتەوە پەکیان نەکەوێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ». بەسە بۆ پیاو لەتاوانباری کە ئەوانەی بژێویان لەسەر ئەوە بیانفەوتێنێ‌و توشی برسییەتی‌و ئاتاجییان بکا.

بەمەرجگرتنی ئاسایشی ڕێگاوبان، لەبەر ئەوەیە: کە بەواجبگێڕانی حەج لەگەڵ نەبوونی ئەمن‌و ئاسایشی ڕێگەوبان زیانبەخش‌و خۆخستنە ناو هیلاکەتە. ئەمەش شەرع پەسەندی ناکا.

---

[1] متفـــق عليــــه: خ (٤/٦٦/١٨٥٥)، م (٢/٩٧٣/١٣٣٤)، ت (٢/٢٠٣/٩٣٢)، د (٥/٢٤٧/١٧٩٢)، ن (٥/١١٧).

## حەجکردنی ئافرەت

هەرکاتێك مەرجەکانی ئیستیطاعە لە ئافرەتدا هاتنەدی، حەجی لەسەر پێویست دەبێ وەکوو پیاو، وەڵێ مەرجێکی تر هەیە دەبێ بۆ ئافرەت بێتەدی، ئەویش ئەوەیە دەبێ مێردی یان پیاوێکی مەحرەمی لەتەکدا بێ، ئەگەر ئەم مەرجەی نەیەتەدی ئەوە ئیستیطاعەی بۆ دەستەبەر نەبووە حەجی لەسەر فەرزنیە.

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: بیستم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِـامْرَأَةٍ إِلاَّ وَمَعَهَـا ذُو مَحْـرَمٍ وَلاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ إِلاَّ مَعَ ذِى مَحْرَمٍ». با پیاو لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا خەڵوە نەکا بەبێ ئەوەی ئافرەتەکە مەحرەمی لەگەڵ بێ، با ئافرەت سەفەر نەکا مەگەر لەگەڵ مەحرەمدا بێ، لەوکاتەدا پیاوێك هەڵسایە سەرپێ‌و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنەکەم بەرێ کەوتووە بۆ حەج‌و بۆ خۆشم ناونووس کراوم بۆ فلان غەزا. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «انْطَلِقْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ». برۆ فریابکەوە بگەرە ژنەکەت‌و لەگەڵ ئەودا حەج بکە.[1]

## حەج نابێ دوابخرێ

پێویستە لەسەر ئەوکەسەی کە توانای حەجکردنی هەیە حەج دوانەخاو هەر ئەو ساڵە خۆ ئامادەبکاو بەرێ بکەوێ بۆ ئەنجامدانی حەجەکەی. چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «مَنْ أَرَادَ الْحَجَّ فَلْيَتَعَجَّلْ فَإِنَّهُ قَدْ يَمْرَضُ الْمَرِيضُ وَتَضِلُّ الضَّالَّةُ وَتَعْـرِضُ الْحَاجَـةُ»[2]: کەسێك بەنیازی حەج بوو با پەلەبکاو دواى نەخا. چونکە لەوانەیە نەخۆش بکەوێ‌و نەتوانێ حەج

---

[1] متفق عليه: خ(٣٠٠٦/١٤٢/٦)، م(١٣٤١/٩٧٨/٢) واللفظ له.

[2] فقه السنة ج١/٥٤٩.

بكا، وێدەچێ ماڵو سامانو راحیلەكەی لێ گوم ببێ، یان بەربەستێكی بۆ بێتە پێشەوە رێگربێ لە حەجكردنەكەی.

## كاتو شوێنی حەجكردن. (المواقیت)

مواقیت: كۆی (میقات)ە میقاتیش دوو جۆرە (زەمانیو مەكانی)

## میقاتە زەمانییەكان

پەروەردگار دەفەرموێ: {يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ – البقـرة/١٨٩} پرسـیارت لێ دەكـەن دەربـارەی مـانگ كـە ئـەو هـەموو گۆڕانكارییـەی بەسـەردادێ دەمێـك باریـكو پـچوكەو دەمێـك دەبێتـە نیـوە كەوانەیی دوایی وردە وردە دەبێتە كەوانەیی تەواوو خشت دەبێ! پێیـان بڵـێ: ئەوە نیشانەیە بۆئەوەی خەڵك كاتەكانی خۆیانی پێ دیاری بكەن بەتایبـەتی وەرزی حەج.

یان دەفەرموێ: {الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ – البقـرة/١٩٧}: كاتـەكانی حـەج چەند مانگێكی دیاریكراون، مانگی شەوالو ذیلقەعیدەو دەشەوی ذیلحیجەن.

ئیبنو عومەر (رەزای خودا لـەخۆیو لـەباوكی) فەرموویـەتی: مانگـەكانی حەج شەشەڵانو ذیلقەعیدەو دەرۆژی ذیلحیجەن.[1]

## میقاتە مەكانییەكان

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتكراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) زولحولەیفـەی بەشـوێنی ئیحـرام بەسـتنی دانیـشتوانی مەدینـە دەستنیشان كـرد. بـۆ خـەڵكی وڵاتـی شـام (الجحفـة)ی دانـا. بـۆ خـەڵكی وڵاتـی

---

[1] صحيح الأسناد: (مختصر خ/٣١١، ص/٣٧٢)، خ(٣/٣١٩) تعليقاً.

نەجد (قرن المنـازل)ی دیـاری کـرد. بـۆ خـەڵکی وڵاتـی یەمـەن (یَلَمْلَم)ی کـرد بەشوێنی ئیحـرام بەسـتن. فـەرمووی: ئـەم شـوێنانە میقـاتن بـۆ خـەڵکی ئـەو شوێنانەو بۆ ئەوانەی بەسەر ئەواندا دێن لەدانیشتوانی وڵاتـی تـر بـۆ حـەجو عەمرە، کەسێکیش لەودیو ئەو شوێنانەوە بن، ئەوە لەشوێنی خۆیەوە ئیحرام دەبەستێو دەست دەکا بەحەجکردن تەنانـەت بـۆ دانیـشتوانی مەککـە خـودی مەککە میقاتەو لەوێدا ئیحرام دەبەستێ.[1]

لەخاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (درودی خـودای لەسەر بێ) بۆ خەڵکی وڵاتی عێراق (ذات عرق)ی کردوە بە میقات.[2]

هەرکەسێك ویستی بە مەبەستی حەجو عومرە بچێ بۆ مەککە نابێ لـەو میقـاتو شـوێنە دیاریکراوانـە بـەبێ بەسـتنی ئیحـرام تێپـەڕێ، مەکروهیـشە پێش ئەوەی بگاتـە ئـەو شـوێنانە ئیحـرام ببەسـتێ هـەموو ئـەو حـەدیثانـەی ریوایەتکراون دەربارەی هەڵنانی موسوڵمانان بۆ ئیحـرام بەسـتن پـێش ئـەوەی بگەنە ئەو شوێنو میقاتانـە صـەحیح نـین. بـەڵکوو فـەرموودەی پێچەوانەی ئەو حەدیثانە ریوایەتکراون.[3]

ئەو فەرموودەی ئیمام مالیك چەند جوانـە، کـە بـەو کابرایـەی فـەرموو: کە دەیەویست پێش ئەوەی بگاتە (زولحولەیفە) ئیحرام ببەستێ.

ئەوەبوو پێی فـەرموو: ئیحـرام پـێش گەیـشتن بـە میقـات مەبەسـتە مـن ترسی ئەوەم هەیە تووشی فیتنە ببێ، کابرا وتی: چ فیتنەیەك لەمەدا هەیـە؟ چەند میلێکە زیـادی دەکـەم، ئیمـام مالیـك پێـی فـەرموو: چ فیتنـەیـەك لـەوە گەورەترە ئەتۆ وابزانی فەضیلەو خێرێکت دەسـت خـۆ خـستووە، پێغەمبـەر

---

[1] متفق علیه: خ(١٥٢٤/٣٨٤/٣) وهذا لفظه. م(١١٨١/٨٣٨/٢)، د(١٧٢٢/١٦٢/٥)، ن(١٢٣/٥).

[2] صحیح: (الإرواء/٩٩٨)، د(١٧٢٣/١٦٣/٥) هکذا مختصراً، ن(١٢٥/٥).

[3] بڕوانە سلسیلة الأحادیث الضعیفة: ٢١٠/٢١٣.

(درودی خودای لەسەر بێ) نەیتوانیوە بیکا.؟ من ئایەتی قورئان دەبیستم کە دەفەرموێ: {فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ – النور/٦٣} با ئەوانەی سەرپێچی فەرمانەکانی پێغەمبەر دەکەن بترسن لەوەی تووشی فیتنەیەك ببن، یان سزایەکی بەئێش یەخەیان بگرێ.

### تێپەڕبوون لە میقات بەبێ ئەوەی ئیحرام ببەستێ

کەسێك بەنیازی حەج و عومرە دەیەویست بچێ بۆ مەککەو بەبێ ئەوەی ئیحرامی بەستبێ لە میقات تێپەڕی، ئەمجار ئیحرامی بەست، بێگومان تاوانی ئەنجامداوە، ئەو تاوانەی لەکۆڵ ناکەوێ مەگەر بگەڕێتەوە بۆ میقات و لەوێ ئیحرام ببەستێ و ئەمجار دەست بکا بە نوسوك و کارەکانی حەج و عومرە. ئەگەر نەگەڕایەوە نوسوك و کارەکانی صەحیحن بەڵام تاوانێکی ئەنجام داوە. فیدیەو سەربڕینی ئاژەڵیشی لەسەر نیە، ئاماژە بە حەدیثی صەفوانی کوڕی یەعلا، کە تێیدا هاتووە: یەعلا بە حەزرەتی عومەری گوت ئەو شوێنەم نیشان بدە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نیگای بۆ هات؟ حەزرەتی عومەر فەرمووی: لە کاتێکدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە (الجعرانة) بوو کۆمەڵێکیشی لە هاوەڵانی لەخزمەتدا بوو، پیاوێك هاتە خزمەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ چی دەفەرمووی: دەربارەی پیاوێك ئیحرامی بە عومرە بەستووەو بۆنێکی زۆری لەخۆی داوە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ساعەتێك بێدەنگ بوو، پاشان نیگای بۆ هات، حەزرەتی عومەر ئاماژەی بۆ یەعلا کرد، یەعلا هات، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پارچە قوماشێکی بۆ کرابوو بەچادر سێبەری لێ کردبوو حەزرەتی عومەر سەری بردە ژێر چادرەکە بینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) روخساری سوور هەڵگەڕاوە قوڵ بۆتەوە لەوەرگرتنی نیگادا، پاشان ئەو

حاڵەتەی ئەما، فەرمووی: کوا ئەو کەسەی پرسیاری دەربارەی عومرە کرد؟ کابرایان هێنایە خزمەتی. پێی فەرموو: «اغْسِلْهُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ وَأَمَّا الْجُبَّةُ فَانْزِعْهَا ثُمَّ اصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ كَمَا تَصْنَعُ فِي حَجِّكِ».[1] ئەو بۆن‌و ئارایشەی لەخۆت داوە بیشۆرەوە جوببەکەت دابکەنە، پۆشاکی دورواوت لەبەردانەبێ. کاروباری حەج چۆن دەکەی ئاوایش لە عومرەکەتدا رەفتار بکە.

بێگومان ئەم حەدیثە بەئاشکراو رون دەلالەت دەکا لەسەرئەوە کەسێك سەرپێچییەك بکا لە سەرپێچییەکانی ئیحرام هەر ئەوەندەی لەسەرە واز لە سەرپێچییەکەی بێنێ، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەکابرا خۆ ئارایشتکەرو جوببە لەبەرەکە نەکرد بەهیچ فیدیەو فەرمبویەك جگەلەوەی خۆبشواو بۆنەکەی پێوە نەمێنێ‌و جوببەکەشی دابکەنێ‌و دەست بکا بە نوسوك‌و کاروباری حەج‌و عومرە.

خۆ ئەگەر سەربڕینی ئاژەڵ بۆ فەرمبوی ئەو سەرپێچییە واجب بوایە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەکابرا دەکرد بیکا، چونکە قاعیدەیەکی ئوصولییە {لا يجوز تأخير البيان عن وقت الحاجة والحاجة قائمة} نابێ ڕێنمویی‌و رونکردنەوەی شەریعەت لەکاتی پێویستی دوابکەوێ لە حاڵێکدا پێویستی بەرێنمویی هەبێ‌و نەکرێ.

## ئیحرام بەستن لەمیقات

ئەگەر نیازی ئیحرام بەستنی بوو دەیەویست بەشێوەی قیران واتە: ئیحرام بە حەج‌و عومرە پێکەوە ببەستێ، (هدی) لەگەڵ بردبوو ئەوە نیەتی حەج‌و عومرە دێنێ‌و دەڵێ: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ). خۆ ئەگەر هەدیی نەبردبوو، ئەگەر (هیی) لەگەڵ خۆی نەبردبوو، - ئەمەش پەسەندە –

---

[1] متفق عليه: خ(١٥٣٦/٣٩٣/٢)، م(١١٨٠/٨٣٦/٢)، د(١٨٠٢-١٨٠٣-١٨٠٤/٢٦٥/٥).

ئیحرام بەعەمرە دەبەستێو بەس. پێویستە بڵێ: (لَبَّيْـكَ اللَّهُـمَّ بِعُمْـرَةٍ). جا ئەگەر لەوەپێش تەلبیەی تەنیا بەحەج کردبوو ئەوە دەبێ هەڵیوەشێنێتەوەو بیکات بە عومرە، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەهەموو هاوەڵانی کرد: کە تەواف‌و سەعییەکانیان بکەن بەعومرە. مەگەر کەسێك (هەدی) هێنابێ هەروەها چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)، لە هەڵوێستی ئەوانەش ناڕازی بوو کە دەست لەعاست بەبیستنی فەرمانەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕانەسان‌و کەمتەرخەمییان کرد. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جەختی ئەمەی کردەوە کە فەرمووی: «دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِي الْحَـجِّ إِلَـى يَـوْمِ الْقِيَامَـةِ». ئەم دەقە بەڕوونی ئەوە دەگەیەنێ کە عومرە بەشێکی جیانەبووەوەی حەجەو لەو هەڵناوێردرێ.

هەروا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لَوْ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا سُقْتُ الْهَدْيَ». ئەگەر جارێکی تر حەج بکەمەوە، ئەوەی توشم هات‌و تێپەڕی بێتەوەڕێم، ئیتر (هەدی) لەگەڵ خۆم نابەم بەشێوەی قیران ئیحرام بە حەج‌و عومرە نابەستم، ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کەبەهۆی ئیحرام بەستنی بەشێوەی قیران ڕەغبەتێکی خۆی لەدەست دابێ. بەڵکوو ئاماژەیە بەوە: کە حەجکردن بەشێوەی (تمتع) پەسەندترە لەشێوەی قیران هەموو حاجییەك دەبێ لەگەڵ جێبەجێ کردنی حەج عومرەش ئەنجام بدا یان عومرەکە پێش حەج دەخا ئەگەر هەدی نەبردبێ، ئەمە پێی دەڵێن: (تمتع)، یان ئیحرام بەهەردووکیان دەبەستێ چونکە هەدی هێناوە بەمەش دەگوترێ (قیران) هەر شێوەیەك لەم دوو شێوە حەج‌و عومرە هەڵبژێرێ پەسەندەو موافیقی سوننەت‌و ڕێنمویی پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێ) وەکوو لەپێشەوە رونمان کردەوە.

ماوەتەوە ئەوە بزانین پێویستە لەسەر ئەو کەسەی ئیحرام بەستنی بەشێوەی (موفرید) یان بەشێوەی (قیران) بێ‌و (هەدی) لەگەڵ خۆی نەهێنابێ – دوای تەوافو سەعی نێوان صەفاو مەروە ئیحرام بشکێنێ، چونکە ئیحرام بەستوو بە حەج‌و عومرە کاتی ئەوەی بەدەستەوە نابێ ئیحرام بشکێنێ‌و ئەمجار ئیحرام بەحەج ببەستێ پێش ئەوەی کاتی راوەستانی عەرەفە تێپەڕێ. لەسەر ئەم بنەمایە، دروست نیە بۆ کەسێك ئیحرام بە (موفرید)ی ببەستێ یان بەشێوەی (قیران) و (هەدی) نەهێنابێ: کە ئیحرامەکەی بشکێنێ ئیللا دوای شەیتان رەجم کردن رۆژی جەژن، ئەگەر کاتی ئەوەی لەبەردەمدا نەبوو بۆ ئیحرام شکاندن‌و ئیحرام بەستنەوەی سەرلەنوێ.

نموونەی ئەمە کەسێك شەوی نۆیەم گەیشتە مەککە، ترسی ئەوەی هەبوو راوەستانی عەرەفەی لەکیس بچێ لەبەر ماوە کەمی‌و نزیکبوونەوەی بەرەبەیان‌و دەرکەوتنی فەجر، ئەم کابرایە واجبە لەسەری خێرا بکەوێتەڕێ بۆ کێوی عەرەفە بۆئەوەی راوەستانی عەرەفەی لەکیس نەچێ‌و هەموو حەجەکەی بفەوتێ، ئا لەم کاتەدا حەجکردن بەشێوەی (ئیفراد) لە حاڵەتی ئاوادا دروستەو مەشروعە بەڵام لە سنورێکی زۆر تەسکدا. جا ئەگەر حاجیەك بەبێ ناچاری بەشێوەی ئیفراد حەجی کرد بەشێوەی (تەمەتوع‌و قیران) نەیکرد ئەوە گوناحبار دەبێ چونکە پابەندی فەرمانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەبوە - کە فەرمانی بە هاوەڵانی کرد حەجەکەیان بگۆڕن بە عومرە – بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەجەکەی صەحیحە.[1]

---

[1] ارشاد الساري للشيخ محمد ابراهيم شقره.

*** دروستە حاجی لەکاتی ئیحرام بەستندا ئەوە بەمەرج دانێ: کە کاتێ بوسهۆی نەخۆشی‌و شتی واوە نەیتوانی درێژە بەکارەکانی حەج بدا ئیحرامەکەی شکابێ.**

لەخاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چووە لای (ضباعة)ی کچی زوبەیر پێی فەرموو: «أَرَدْتِ الْحَجَّ». دەتەوێ بچی حەج بکەی؟ وتی: خۆم بەنەخۆش دەزانم لەوانەیە توشی ئازارێك بم. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «حُجِّي وَاشْتَرِطِي، قُولِي اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي»[1] بچۆ بۆ حەجەکەت‌و مەرج دابنێ، بڵێ: خودایە لەهەر شوێنێك توشی نەخۆشی بووم ئیحرامم شکابێ. جا کەسێك ئەوەی بەمەرج گرت‌و ئاوا نییەتی هێناو ئیحرامی بەست لەهەر شوێنێك‌و هەرکاتێك نەخۆشی‌و شتی وا حەبسی کرد یان دوژمن‌و شتی وا رێی لێ گرت، ئەوە ئیحرامی تەواو دەبێ‌و لەئیحرام دەردەچێ‌و ئاژەڵ سەربڕینیشی لەسەرنیە.

ئەگەر کەسێك ئەو مەرجەی دانەناو ئاوا نیەتی نەهێنا، هەرکاتێ لەمپەڕی بۆ دروست بوو حەجی بۆ تەواو نەکرا ئەوە دەبێ ئاژەڵێك سەربڕێ. چونکە خودا دەفەرموێ: {فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ – البقرة/١٩٦}: ئەگەر گیرۆدەبوون‌و لەمپەڕتان هاتە پێش، ئەوە چیتان بۆ دەستەبەربوو لە ئاژەڵ سەری ببڕن، ئەو حەیوانەی سەری دەبڕن دەبێ (حوشتر، رەشە وڵاخ، مەڕو بزن) بێ کامەتان دەست کەوت بەکەڵك دێ. ئەگەر بزن‌و مەڕ پەیدابوو باشە. حوشترو رەشە وڵاخ باشترە ئەگەر ئاژەڵ دەست

---

[1] متفق عليه: (٩/١٣٢/٥٠٨٩)، م(٢/٨٦٧/١٢٠٧)، ن(٥/١٦٨).

نەکەوت، دەبێ (دە) رۆژ بەرۆژوبێ وەکوو ئەو حاجییەی بەشێوەی (تمتع) ئیحرام دەبەستێو ئاژەڵی دەست ناکەوێ سەری ببڕێ.

## چۆنیەتی حەجی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)

ئیمامی موسلیم بەشێوە رشتەو سەنەدی خۆی ریوایەتی کردوە لە جەعفەری کوڕی موحەممەد ئەویش لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: چوینە خزمەت جابیری کوڕی عەبدوڵلا یەکە یەکە لە خەڵکەکەی پرسی تا سەرە گەیشتە من، عەرزم کرد من موحەممەدی کوری عەلی کوڕی حوسەینم. ئیتر دەستی شۆڕ کردەوە بۆ سەرم قۆپچەی لای سەرو لای خواروی دەرهێنام، پاشان بەری دەستی خستە سەر نێوان دوو گۆی مەمکم، ئەو دەمە من گەنج بووم فەرمووی: بەخێرهاتی ئەی برازای خۆم، پرسیاربکە چیت گەرەکە بڵێ: پرسیارم لێ کرد، ئەوکاتە ئەو نابینابوو، کاتی نوێژ هات، هەڵسا بۆ بەجێهێنانی، پارچە قوماشێکی لەخۆوە هاڵاندبوو، هەرکاتێ هەڵی دەدایەوە بۆسەر شانی، لەبەر تەسكو تروسکی قەراخەکانی بۆلای خۆی دەگەڕانەوە. ریداکەشی بەسەر سێ پایەکەوە بوو پێشنوێژی بۆکردین، پاشان عەرزم کرد پێم بڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چۆن حەجی کرد؟ بەدەستی ئاماژەی کردو نۆ پەنجەی گرێدان؛ ژماردنی، پاشان فەرمووی: بێگومان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نۆساڵ لەمەدینە مایەوە حەجی نەکرد، پاشان لەساڵی دەیەمدا بەناو موسوڵمانانندا بڵاوی کردەوە کە نیازی حەجی هەیە، لەهەموو لایەکەوە خەڵك رژایە ناو مەدینەوە هەموویان دەیانەویست لەخزمەتیدا حەج بکەن، شوێنی بکەونو چاوی لێ بکەن لە ئەنجامدانی کاروباری حەج ئێمە لەخزمەتیدا لەمەدینە دەرچوینو کەوتینەڕێ تا گەییشتینە (ذولحلیفە).

لەوکاتە خاتو ئەسماء کچی عومەیس، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری بە وەلەد هێنا. ناردی بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئاخۆ چی بکا؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: « اغْتَسِلِي وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ وَأَحْرِمِي». مِثْلَ « لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ ». خۆت بشۆرە، تۆپەوانەیەك بخەرە سەر ئەوشوێنەی خوێنی لێ دێ بە پەڕۆیەکی پان لەپێشەوەو لەدواوە شەتەکی بدە، نیەت بێنەو ئیحرام ببەستە. پاش ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان بۆ حەجکردن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە مزگەوتدا نوێژی کرد، پاشان سواری حوشترەکەی بوو کە ناوی (قەصوا) بوو، کە تەشریفی بەسواری حوشترەکەی کەوتەڕێ‌و لەمەدینە دەرچوو، لە بەیداء روانیم هەتا چاو بڕبکا لەپێشەوەی، موسوڵمانان بەسواری‌و بە پیادەیی جمەیان دەهات لەلای راستییەوە بەهەمان شێوە، لەلای چەپیەوە هەروا لەدوواوەی بەهەمان شێوە، ئەم خەڵکە زۆرو فەرمباڵغە کەوتبوەڕێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەناوماندا بوو، نیگای قورئانی بۆسەر دادەبەزی‌و دەیزانی ماناو تەئویلی چۆنەو مەبەست چیە. هەر کردارێکی بکردایە ئێمە چاومان لەئەو دەکردو وەکوو ئەو رەفتارمان دەکرد. ئەوەبوو دەستی کرد بە (لبێك) گوتن فەرمووی: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ». خەڵکەکەش تێکڕا ئەم تەلبییەیان دەگوت‌و پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هیچ رەتدانەوەو ناڕەزامەندییەکی دەرنەبڕی بەرامبەریان‌و لەسەر تەلبیە کردنی خۆی بەردەوام بوو.

جابیر دەفەرموێ: ئێمە تەنها نیازی حەجمان هەبوو نیەتی حەجمان هێنابوو، نەماندەزانی عومرە چیە، هەتا لەخزمەتیدا گەیشتینە کەعبە،

دەستی هێنا بەروکنی یەمانیدا، ئەمجار سێجار بە نەرمەراکردن و شان هەڵتەکاندن بەدەوری کابەدا سوڕایەوە چوار جاریش بەشێوە رۆیشتن، ئەمجار چوو بۆ مەقامی ئیبراهیم (سڵاوی خودای لێ بێ)و ئایەتی (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى)ی خوێندەوە ئەمجار وایکرد مەقامی ئیبراهیم بکەوێتە نێوان ئەوو کەعبە، دورکاتی نوێژکرد – باوکم دەیگوت: هەر لە پێغەمبەریشەوە ریوایەتی دەکرد – پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەو دوو رکاتە نوێژەدا سورەتی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ )و سورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی دەخوێند. پاشان گەڕایەوە بۆلای روکن و ماچی کردەوە، ئەمجار بەرەو صەفا رۆیی، کە لەصەفا نزیك بووە ئایەتی {إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ – البقرة/١٥٨} خوێندەوەو فەرمووی: « أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ ». دەست دەکەم بەو شوێنەی خودا خستویەتیە پێشەوە، لەسەرەتاوە لە گردی صەفاوە دەستی کرد بە هەڕوەلەو پێیدا هەڵگەڕا هەتا چووە سەری و کەعبەی لێ دەرکەوت، روی کردە قیبلەو تەوحیدو تەکبیری کردو فەرمووی: « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ ». پاشان دوعاو پاڕانەوەی کردو تەوحیدو تەکبیری دوبارە کردەوە، لەنێوان هەر جارێکی تەوحیدو تەکبیرەکەیدا دەپاڕایەوەو دوعای دەکردن تا سێجار، ئەمجار لە صەفاوە دابەزی بەرەو گردی (مروە) رۆیی، کە قاچی لەناو شیوەکە دانا سنگی لەهەورازدا دەستی کرد بە هەروەلەکردن تا سەرکەوت، ئەمجا چووە سەرگردی (مروة) لەوێش چی لەسەر گردی صەفا گوتبوو، دووبارەی کردەوە هەتا دوا تەوافی لەسەر گردی مەڕوە کۆتایی پێ هێنا. ئەمجار فەرمووی: «لَوْ أَنِّي اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ لَمْ أَسُقِ الْهَدْيَ وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ لَيْسَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيَحِلَّ وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً». تازە لەدەستم چوو، ئەگینا دیاری بەیتم لەگەڵ خۆم

نەدەهێنا، دەمكرد بەعومرە، جا هەركەسەتان كە دیاری پێ نیە با ئیحرام بشكێنێو بیكا بە عومرە.

سوراقەی كوڕی مالیك هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە هەر بۆ ئەمساڵ وایە یان بۆ هەتا هەتایەبەردەوام دەبێ؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پەنجەكانی خۆی تێك پەڕاندو دوجار فەرمووی: عومرە تێكەڵی حەج بوو بۆ هەتاهەتایە. ئیمامی عەلیش لەیەمەنەوە حوشتری قوربانی هێنابوو بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). عەلی كەهات ڕوانی فاطیمە (ڕەزای خودای لێ بێ) ئیحرامی شكاندووە پۆشاكی ڕەنگاو ڕەنگی پۆشیوەو چاوەكانی ڕشتون، جا گوتی: ئەمە چیە؟ فاطیمە وتی: باوكم فەرموویەتی: وا بكەن. دەڵێ كاتێ عەلی لەعێراق بوو دەیگوت: چووم بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تا لە فاطیمەی تورە بكەم كە بۆ وای كردووە وەبۆ چوونە بنج‌و بناوانی ئەو قسەیەش كە گوتی باوكم فەرموویەتی وا بكەن، هەر لێم پرسی‌و عەرزیشم كرد كە من ئەو كارەی ئەوم پێ خۆش نەبوو، ئیتر حەزرەت فەرمووی: « صَدَقَتْ صَدَقَتْ مَاذَا قُلْتَ حِينَ فَرَضْتَ الْحَجَّ». بەڵێ فاطیمە ڕاست دەكا، من خۆم پێم گوتووە، ئەی تۆ، كە ئیحرامی حەجت دابەست چیت گوت؟ وتی: گوتوومە: ئەی خودایە ئەوا نیەتی حەجم هێنا لەسەر ئەو نیەتەی كە پێغەمبەری تۆ دەیهێنێ، فەرمووی: « فَإِنَّ مَعِيَ الْهَدْىَ فَلاَ تَحِلُّ ». دەی كەوابێ من (هەدی) دیاری كەعبەم لەگەڵ خۆم هێناوە. تۆیش ئیحرام مەشكێنە، ئەو كۆمەڵە (هەدی)یەی عەلی لە یەمەنەوە هێنابوونی‌و لەگەڵ ئەو (هەدی)یانەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ خۆی هێنابوونی سەد حوشتر بوون. وتی: ئیتر خەڵكەكە هەموویان ئیحرامیان شكاندو مووی سەریان كورت كردەوە، جگە لە پێغەمبەرو ئەوانەی دیاری كەعبەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، جا كەڕۆژی (تەڕوییە) هات كە

ڕێکەوتی هەشتی مانگی ذیلحیجەیە، بەرەو مینا ڕۆیشتن‌و ئیحرامی حەجیان بەست، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سواربوو، نوێژی نیوەڕۆو عەصرو شێوان‌و خەوتنان‌و بەیانی لەوێ کرد. ئەمجار کەمێك مایەوە هەتا خۆر کەوت. فەرمانی دا کەبچن لە (نەمیرە) دەوارێکی بۆ هەڵبدەن، جا کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەڕێ کەوت، قوڕەیش پێیان وابوو: کە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) وەکوو سەردەمی نەفامی ئەمان لە مەشعەرولحەرام دەوەستێ، بەڵام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەوێ ڕەتبوو نەوەستا تا چووە نزیکی عەرەفە، ڕەوانی لە (نەمیرە) دەوارەکەیان بۆ هەڵداوە، ئتر لەوێ دابەزی‌و مایەوە تاخۆر لایدا. ئەوجار فەرمانی کرد قەصوایان بۆ زین کردو چوو بۆ ناو پانتایی شیوەکەو وتارێکی بۆ خەڵکەکە داو فەرمووی:

«إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ وَإِنَّ أَوَّلَ دَمٍ أَضَعُ مِنْ دِمَائِنَا دَمُ ابْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ كَانَ مُسْتَرْضِعًا فِي بَنِي سَعْدٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ وَأَوَّلُ رِبًا أَضَعُ رِبَانَا رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ. فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَقَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ كِتَابَ اللَّهِ. وَأَنْتُمْ تُسْأَلُونَ عَنِّي فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ»:

خەڵكینە خوێن‌و سەرو ماڵ‌و ناموستان لەیەکتری زۆر حەرامە، وەکوو چۆن شکاندنی ڕێزی ئەم ڕۆژە پیرۆزەتان لەم مانگە پیرۆزەتاندا لەم شارە پیرۆزەتاندا زۆر حەرامە ئاوا بزانن‌و دڵنیابن: کە هرچی کاروبارو داب‌و

نەرێتی سەردەمی نەزانییە پووچەو بەتاڵەو بێ بایەخە، خوێنی سەردەمی نەزانی پوچ‌و بەتاڵە، یەکەم خوێن لەخوێنی کەس‌وکاری خۆم کە بایەخی پێ نادەم‌و بەتاڵ‌و پوچە، خوێنی کوڕەکەی‌رەبیعەی کوڕی حاریثە کە لەناو هۆزی بەنی سەعددا درابوو بەدایەن‌و هۆزی هوزەیل کوشتوویانە.

سودو ریبای سەردەمی نەفامی هەمووی پووچ‌و بەتاڵەوە بووە، یەکەم سوودیش لە سوودی کەس‌وکاری خۆم کە بەتاڵی دەکەمەوە سودو قازانجی عەبباسی کوڕی (عبدالمطلیب)ە ئەو سوودە هەمووی بەتاڵەو بایەخی نیە.

دەربارەی ئافرەتانیش لەخودا بترسن‌و ستەم‌و بیدادییان دەرحەق ئەنجام مەدەن، ناهەقییان لەگەڵ مەکەن، بە رەفتارو گوفتاری جوان لەگەڵیان بجوڵێنەوە، چونکە ئەوان ئەمانەتی خودان، خودا بەئێوەی سپاردوون، پیاو هەر خیانەت بکا نابێ خیانەت لە ئەمانەتی خودا بکا! ئەوان لەسەر فەرموودەی خوداو بەگوێرەی شەریعەتی ئەو بۆ ئێوە حەلاڵ بوون دێنە باخەڵتانەوەو دەچنە لایان.

مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە: کە ئەوکەسەی ئێوە حەزی لێ ناکەن نەیهێننە سەر بەرەتان‌و رێگەنەدەن بێتە ماڵتان، هەرکاتێ شتی وایان کرد: کە ئێوە بەدڵتان نەبێ، ئەوە تا بۆتان دەکرێ چاو پۆشییان لێ بکەن‌و بە نەرم‌و نیانی هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵدا بکەن. بەبێ هۆیەکی رەواو شەرعی تەلاقیان مەدەن، جا ئەگەر بەم رەفتارانەش چاریان نەکرا، ئەوە شەریعەت رێگەتان دەدا: کە بەئەسپایی لێیان بدەن. مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە باشی بژێوو پۆشاکیان بۆ دابین بکەن بەجۆرێك هەست بە ئەوڵاش کەمی نەکەن. بزانن من یاسایەکی وەهام بۆ جێهێشتوون ئەگەر لەدوا خۆم پەیرەوی بکەن هەرگیزاو هەرگیز لەناو خۆتان سەرتان لێ ناشێوێ‌و تووشی گومڕایی

نابنەوە. ئەویش قورئانی پیرۆزە کەنامەی خودایە. ئێوە لەدوا رۆژدا لەبارەی منەوە پرسیارتان لێ دەکرێ، ئاخۆ وەڵامتان چی دەبێ؟

گوتیان: شایەتی دەدەین: کەتۆ هیچ درێغیت نەکردووە، تەبلیغی خۆتت کردووەو ئەرکی سەرشانی خۆتت ئەنجامداوە، ئامۆژگاری خێری ئێمەت کردووە!

ئەمجار حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) سێ‌جار پەنجەی شایەتومانی هەڵبڕی بۆ ئاسمان‌و دایبەوانەوە بۆ ناو خەڵکەکە، هەموو جارێکیش لەگەڵ پەنجە راداشتنەکەیدا دەیفەرموو: خودایە! تۆ بەشایەت بە. پاشان فەرمانی‌دا بانگ دراو قامەت کرا، نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، فەرمووی: قامەت بکەنەوە، قامەت کرایەوە نوێژی عەصریشی بۆ کردین بە (جەمع)و تەقدیم. لەنێوانیاندا هیچ نوێژی سوننەتی نەکرد. دوای ئەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سواربوو تا گەیشتە ویستگەی خۆی لەعەرەفات، ئەمجار رووی حوشترەکەی کردە تاوێرە بەردەکانی داوێنی (جبل الرحمة) — ئەم چیایە بۆخۆی داخڵی خاکی عەرەفاتە — کۆمەڵی حاجییە پیادەکانی خستە بەردەمی خۆی‌و روی کردە قیبلەو لەوێدا راوەستا تا خۆر ئاوابوو شەو داهات ئەمجار ئوسامەی خستە پاشکۆی خۆیەوە بەرەو موزدەلیفە داگەڕایە خوار، جڵەوی (قەصوای) ئەوەندە توند کردبوو بۆئەوە خێرا نەڕوا تەنانەت سەری قەصوا لە قەڵبوزی کۆپانەکەی دەدا، بە دەستی راستیشی ئاماژەی دەکردو دەیفەرموو: خەڵکینە لەسەرەخۆبن، بەهێواشی بڕۆنە خوارێ پەلەمەکەن، بەڵام کە دەگەیشتە ماسولکە لێ کەمێ جڵەوی بۆ قەصوا شل دەکرد تا سەردەکەوتە سەری. تەشریفی درێژەی بە رۆیشتنەکەیدا تا گەیشتە موزدەلیفە، لەوێ نوێژی شێوان‌و خەوتنانی بە جەمعە تەئخیر کرد بەیەك بانگ‌و دووقامەت هیچ نوێژی سوننەتی لەنێوانیاندا نەکرد. ئەمجار

تەشریفی خەوت تا شەبەقی بەیانیدا، جا کەئاسۆ رون بووە فەرمانی دا بانگ درا، نوێژی بەیانی کرد ئەمجار سواری (قەصواء) بووەوە رۆیشت تا گەیشتە (مشعرالحرام) روی کردە قیبلەو ئەللاهوئەکبەرو تەلیلەی کرد، لەخودا پاڕایەوەو ناوی خودای بەتاكو تەنیا هێنا.

ماوەیەك لەوێ مایەوە تا دونیا روناك بۆوە، هێشتا خۆر دەرنەکەوتبوو تەشریفی بەرەو مینا کەوتەڕێ، فەضلی کوڕی عەبباسی خستە پاشکۆی خۆی، فەضل پیاوێکی شۆخو شەنگو قۆزو قژڕەشو سپی پێست بوو، لەوکاتەدا: کە حەزرەت کەوتەڕێ تاقمێ ئافرەت لەناو کەژاوەدا بەلایاندا تێپەڕین، فەضلیش چاوی تێبڕین، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی نا بەڕوی فەضلەوەو بەرچاوی گرت، فەضلیش رووی وەرچەرخاند بەولاداو لەولاوە سەیری دەکردن. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی لەولاوە گواستەوە بۆ لایەکەی ترو بەرچاوی فەضلی گرتەوە بۆئەوەی نەهێڵی تەماشای ئافرەتەکان بکا. ئیتر تەشریفی رۆییشت تاگەیشتە شیوی (محسّر) لەوێ کەمێ وڵاخەکەی بەخێرایی لێ خوڕی، پاشان رێگای ناوەڕاستی گرتەبەر کە دەچێ بۆسەر کۆگا گەورەکە (الجمرة الکبری) کە لای درەختەکەیە حەوت بەردی بۆ فڕێ دا بەردەکان وابوون بە پەلەپیتکە دەهاوێژران، هەموو جارێ: کە بەردێکی تێ دەگرت (الله اکبر)ی دەکرد، لەناو شیوەکەوە بەردەکانی تێدەگرت.

پاشان رۆیی بۆ (منحر) کوشتارگە، لەوێ بەدەستی خۆی شەستو سێ سەر حوشتری سەربڕی، پاشان کێردەکەی دایە دەست عەلی ئەویش باقی ماندەی حوشتر دیارییەکانی سەربڕی، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەلی کردە هاوبەشی خۆی لەم حوشترە دیارییانەدا، ئەمجار فەرمانی دا لەگۆشتی هەر حوشترێك پارچەیەکیان هێناو خستیانە ناو مەنجەڵێکەوەو

کولاَنـدیانو خـۆیو عـەلی لەگۆشـتەکەیان خـواردو گۆشـتاوەکەیان خـواردەوە. ئەمجار پێغەمبەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) سـواربوو ڕۆیـشت بـۆ کەعبـەو (طواف الافاضة)ی بەجێ هێنا، نوێژی نیـوەڕۆی لەمەککە کـرد، ئـەمجار چـوو بۆلای (بەنی عبدالمطلب) کە لەسەر بیری زمزم ئاویان هەڵدەگواسـتو دەیانـدا بـەحاجیان، فـەرمووی: ئـەی نـەوەی (عبـدالمطلب) ئـاو هـەلگۆزنو بیـدەن بـە حاجییـانو بەخــەڵکی، نــەبادا خــەڵکی وا تێبگــەن: کــە ئــاو هــەلگۆزینیش لـەکردارەکانی حەجـەو لـەم حاڵـەدا زۆرتـان بـۆ بێـننو ڕێگـەتان نـەدەن بـە ئاسایی‌و ئاسانی ئاوبدەن بـە حاجییـان، نـەبادا ئەمـە روبـدا دەنـا ئـەم ئیشەی ئێوە ئەوەنـدە کـارێکی پەسـەندە منـیش ئـاوم هەڵدەگواسـت لەگەڵتانـدا، ئـیتر ئەوانیش سەتڵێك ئاویان بۆ برد حەزرەت لێی خواردەوە.

ئیمامی نەوەوی لەشەرحی موسلیمدا (ج٨/١٧٠) دەفەرموێ: (ئەوەی رابرد حەدیسێکی گەورەیـە، کۆمـەڵێك فائیـدەو شـتی بـەنرخی لـەخۆگرتووە یاسـای فیقهی گرنگی تێدان. (ألقاضی) فەرموویەتی: زانایان قسەیان لێ کردووەو زۆر مەسەلەی فیقهـی جـۆراو جۆریـان لێ ددەرهێنـاوە، ئەبوبـەکری کـوڕی (ألمنـذر) جـوزئێکی قـەبارە گـەورەی تێـدا نووسـیوە سـەدو پـەنجاو ئەوەنـدە مەسـەلەی فیقهـی تێـدا دەستنیـشان کـردووە خـۆ ئەگـەر لێـی بکۆڵدرێتـەوە زۆر لـەم ئەندازەیە مەسەلەی تێدا دیاری دەکرێن.

## حەج عیباداتێکە لە عیباداتەکانی ئەرکانو واجباتو سوننەتی تێدان

## یەکەم: سوننەتەکانی حەج

**أ / سوننەتەکانی ئیحرام بەستن:**

١- خۆشـۆردن لـەپێش ئیحـرام بەسـتندا، ئامـاژە بـەو فەرمووددمیـەی کـە زەیدی کوڕی ثابت دەیگێڕێتەوە: کە دەڵێ: پێغەمبـەرم بینـی (درودی خـودای لەسەر بێ) کە نیازی ئیحرام بەستنی کرد خۆی رووتکردەوەو خۆی شۆرد.[1]

٢- بۆنی خۆش لەخۆدان پێش ئیحرام بەستن: ئاماژە بەحەدیثی عائیـشە کە دەفەرموێ: (بـۆنی خۆشـم لەجەسـتەی پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) هەڵدەسـوو کاتێـك کـە دەیەویـست ئیحـرام ببەسـتێ، کـاتێکیش کـە دەیەویست ئیحرام بشکێنێ پێش ئەوەی تەوافی بەیت بکا).[2]

٣- ئیحرام بەستنەکەی بە پشتە ماڵێـكو ریـدائێکی سپی بێ. ئامـاژە بـە حەدیثی ئیبنو عەبباس کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بـێ) لەمەدینە بەڕێ کەوت دوای ئەوەی خۆیو هاوەڵانی (ئیـزار) پەشـتە ماڵێـكو ریدائێکیان پۆشی، واچاکە سپی رەنـگ بـن. هـەر ئامـاژە بـە حـەدیثی ئیبنـو عەبباس، (رەزای خودایان لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: «الْبَـسُوا مِـنْ ثِيَـابِكُمُ الْبَيَـاضَ فَإِنَّهَـا مِـنْ خَيْـرِ ثِيَـابِكُمْ وَكَفِّنُـوا فِيهَـا مَوْتَاكُمْ».[3] پۆشاکی سپی بپۆشن، بێگومان پۆشاکی سـپی باشـترین پۆشـاکتانە، مردوەکانیشتان بەو پۆشاکە کفن بکەن.

٤- نوێـژکردن لـە (وادی العقیـق) بـۆ کەسـێك لـەوێوە بـڕوا. ئامـاژە بەحـەدیثـی عومـەر (رەزای خـودای لێ بـێ) دەڵـێ: لـە (وادی العقیـق)دا لـە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: «أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِـنْ رَبِّـي فَقَـالَ صَـلِّ فِـي هَـذَا

[1] صحیح: (ص.ت/ ٦٦٤)، ت(٢/١٦٣/٨٣١).

[2] متفـق علیـه: خ(٣/٣٩٦/١٥٣٩)، م(١١٨٩/ - ٣٣ -٢/٨٤٦)، ت(٢/١٩٩/٩٢٠) بزیـادة فیـه، د(٥/١٦٩/١٧٢٩).

[3] صحیح: لەباسی (الجنائز)دا تێپەڕی.

الْوَادِي الْمُبَارَكِ وَقُلْ حَجَّةٍ فِي عُمْرَةٍ».[١] ئەمشەو لەلایەن خودای خۆمەوە یەکێك هات پێی گوتم: لەم شیوە پیرۆزەدا نوێژبکەو بڵێ: (عُمْرَةً فِي حَجَّةٍ).

٥- دەنگ بەرزکردنەوە بە (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ........) کردن، ئاماژە بە حەدیثی (السائب)ی کوڕی خەللاد. کە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَتَانِي جِبْرِيلُ فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالإِهْلاَلِ وَالتَّلْبِيَةِ».[٢] جوبرائیل هات بۆلام فەرمانی پێکردم: کە فەرمان بە هاوەڵانم بکەم لەکاتی (الله أكبر) کردنو (لبيك) گوتندا دەنگیان بەرزبکەنەوە.

بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەگوتنی (لَبّيك أللّهمّ لبيك)دا بەهەموو هێزی خۆیان دەیاننەڕاند. ئەبو حازم دەفەرموێ: هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ): کە ئیحرامیان دەبەست، نەدەگەییشتنە (ألرّوحاء) دەنگیان بەرزدەبووەوە.[٣]

تەلبییە بریتییە لەوە بڵێی «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ».[٤] خودایە من هەمیشە پشتێنی بەندایەتیم بەستووە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی تۆ، تۆ خودایەکی بێ چونو بێ هاوەڵی، سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە، بەخششو نازو نیعمەتو دارایی و پادشایی و خاوەنداری هەر لەخۆت دێو هەر لەخۆت جوانە بێ چونی و بێ هاوەڵی زاتی پاکت ئاشکرایەو وەکوو رۆژی روناك دیارە.

---

[١] صحيح: (ص.جة/ ٢٤١٠)، خ(١٥٣٤/٣/٣٩٢)، د(١٧٨٣/٢/٢٣٢)، جة(٢٩٧٦/٢/٩٩١).

[٢] صحيح: (ص. ت/٦٦٣)، ت(٨٣٠/٢/١٦٣)، د(١١٩٧/٥/٢٦٠)، جة(٢٩٢٢/٢/٩٧٥.)

[٣] صحيح الأسناد رواه سعيد بن منصور كما في المحلى: ٧/٩٤.

[٤] متفـــق عليـــه: خ(١٥٤٩/٣/٤٠٨)، م(١١٨٤/٨٤١ و ٢/٨٤٢)، ت(٨٢٥/٢/١٦٠)، د(١٧٦٥/٢٥١ و ٥/٢٥٢)، ن(١٥٩ و ٥/١٦٠)، جة(٢٩١٨/١/٩٧٤).

حاجی بەردەوام دەبێ لە (تەلبیـە) کـردن هـەتا شـەیتانی گـەورە رەجـم دەکـا. ئامـاژە بـە حـەدیثـی ئیبنـو عـەبباس (رەزای خودایـان لێ بـێ): کـە دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) (ألفضل)ی کوڕی عەبباسی خستبووە پاشکۆی خۆی. جا (ألفضل) بۆ ئیبنو عەبباسی گێڕاوەتەوە: کە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) هـەتا شـەیتانی رەجـم کـردووە هـەر تەلبییەی کردوە.[1]

چ خراپیەکی تێدا نیە: کە زیکرو تەسبیحاتی تر تێکەڵ بە تەلبییـە بکا، ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو مەسعود (رەزای خودای لێ بێ): کە دەڵێ: لەخزمـەت پێغەمبەردا بووم (درودی خودای لەسەر بێ) وازی لـە تەلبییـە کـردن نـەهێنا تا لەشەیتان رەجمکردن بۆوە. وەڵێ ئەوەندە هەیە تەلبییە کردنەکەی تێکەڵ دەکرد بە (ألله أكبر) کردنو تەلیله کردن.[2]

٦- تەحمیـد کـردنو تەسـبیح کـردنو (ألله أكـبر) کـردن پـێش ئیحـرام بەستنو دەستکردن بە کارەکانی حەج، ئەمـەش ئامـاژە بـە حـەدیثـی ئەنـەس (خودای لێ رازی بێ): کە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) – ئێمـە لەخزمەتیدا بووین – لەمەدینە نوێژی نیوەڕۆی بەچوار رکات کـرد، نوێـژی عەصری لە ذولحولەیفە بـە دوورکات کـرد، ئـەمجار لـەوێ مایـەوە تـا بـەیانی، پاشان سواربوو تا تەشریفی چووە سەر (البیداء) دەستی بـەگوتنی (الحمـدلله)و (سبحان الله)و (ألله أكبر) کرد ئەمجار: کە ئیحرامی بەسـت بـە حـەجو عـومرەو دەستی کرد بە گوتنی (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ).[3]

---

[1] متفق عليه: خ(١٦٨٥/٣/٥٣٣)، م(١٢٨١/٢/٩٣١)، د(١٧٩٨/٥/٢٦١)، ت(٩٢١/٢٠٠/٢).

[2] اسناده حسن: (الإرواء/٢٩٦)، طح(٢/٢٢٥)، حم(٣٩٦١/٧٢/٧).

[3] صحيح: (ص.د/١٥٥٨)، خ(١٥٥١/٤١١/٣)، د(١٧٧٩/٢٢٣/٥) نحو.

٧- نیەتهێنانی حەج و عومرە رووەو قیبلە، ئاماژە بە فەرموودەیەك: كە نافیع ریوایەتی كردووە، دەڵێ: (ئیبنو عومەر كە نوێژی بەیانی لە ذولحولەیفە كرد، فەرمانی كرد وڵاخەكەیان بۆ ئامادەكرد پاشان سواری بوو، كەچووە سەر گردی (البیداء)روی كردە قیبلە بەراوەستانەوە. ئەمجار دەستی كرد بە تەلبیە كردن، پێی وابوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وای كردبوو.[1]

**ب/ سوننەتەكانی چوونە مەككە:**

٨، ٩، ١٠- شەومانەوە لە (ذیطوی)، خۆشۆردن بۆ چوونە ناو مەككە، چونە ناو مەككە بەڕۆژ.

لە نافیعەوە ریوایەتكراوە، دەفەرموێ: (ئیبنو عومەر عادەتی وابوو كە داخڵی مەككە دەبوو لە حەرەم نزیك دەبووەوە، وازی لە تەلبییە كردن دەهێنا، پاشان شەو لە (ذیطوی) دەمایەوە، ئەمجار نوێژی بەیانی لەوێ دەكردو خۆی دەشۆرد، وای باس دەكرد: كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئاوهای كردووە.[2]

١١- چوونە ژورەوە بۆ ناو مەككە لە (الثنیة العلیا)وە، ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە (الثنیة العلیا)وە دەچووە ناو مەككە لە (الثنیة السفلی)وە دەهاتە دەرەوە.[3]

---

[1] صحیح: خ(٣/٤١٢/١٥٥٣).

[2] متفق علیه: خ(٣/٤٣٥/١٥٧٣) وهذا لفظه ونحوه: م(٢/٩١٩/١٢٥٩)، د(٥/٣١٨/١٨٤٨).

[3] متفق علیه: خ(٣/٤٣٦/١٥٧٥) وهذا لفظه، م(٢/٩١٨/١٢٥٧)، ن(٥/٢٠٠)، جة(٢/٩٨١/٢٩٤٠).

١٢- لەکاتی چوونە ژوورەوە بۆ ناو مزگەوتی حەرام قاچی راستی پێش بخاو بڵێ: «أَعُوذُ بِاللّٰـهِ الْعَظِـيمِ وَبِوَجْهِـهِ الْكَـرِيمِ وَسُـلْطَانِهِ الْقَـدِيمِ مِـنَ الـشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، بِسْمِ اللّٰهِ وَالسَّلاَمُ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ اللّٰهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ ».[١]

١٣- کـە مـاڵی کەعبـەی بینـی، دەسـت بەرزبکاتـەوە، چـونکە لـەئیبنو عەبباسەوە چەسپاوە – بەدڵی خۆی دوعاو پاڕانەوە بکا، خۆ ئەگەر حەزی لێ بوو واباشە دوعاکەی حەزرەتی عومەر بخوێنێ کە ئەمە دەقەکەیـەتی: «اللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ الـسَّلاَمُ فَحَيِّنـا ربنـا بالـسَّلاَمْ»: چونکە لـەو گێڕدراوەتـەوەو چەسپاوە.

ج/ سوننەتەکانی تەواف:

١٤- ئیضطیباع: بەمجۆرە ئیزارەکەی لەژێر بنهەنگڵی راستی‌یەوە بەری بۆسەر شانی چەپی، شانی راستی روتبێ، ئامـاژە بـە حـەدیثی یـەعلای کوڕی ئومەییە: کە ریوایـەتی کـردوە دەڵێ: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) بەشێوەی (ئیضطیباع) تەوافی کەعبەی کرد[٢]

١٥- دەست پێداهێنانی (الحجر الأسود) بەردە رەشەکە. ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عومـەر کـە دەفـەرموێ: پێغەمبـەرم بینـی (درودی خـودای لەسـەر بـێ) کاتێك دەهاتە ناو مەککەو دەستی بە بەردە رەشەکەدا دێنا لەیەکەم تەوافدا سێ تـەوافی بـە نەرمـە راکـردنو گورگـە لوقـە لـە حـەوت تەوافەکـە ئـەنجام دەدا.[٣]

---

[١] صحیح: (الکلم الطیب/٦٥).

[٢] حسن: (ص.جة/٢٣٩١)، د(١٨٦٦/٣٣٦/٥)، ت(١٦١/١٧٥/٢)، جة(٢٩٥٤/٩٨٤/٢).

[٣] متفق علیه: خ(١٦٠٣/٤٧٠/٣)، م(١٣٦١ – ٢٢٣ –/٩٢٠/٢)، ن(٥/٢٢٩).

١٦- ماچكردنی بەردە ڕەشەكە. ئاماژە بە حەدیثی زەیدی كوڕی ئەسلەم: كە لەباوكییەوە گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی: عومەری كوڕی خەتتابم بینی حەجەرولئەسوەدی ماچكردو وتی: (ئەگەر من بەچاوی خۆم نەمدیبایە كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ماچی كردی من ماچم نەدەكردی).[1]

١٧- سوژدەبردن لەسەر حەجەرولئەسوەد، ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) كە دەفەرموێ: عومەری كوڕی خەتتابم بینی بەردە ڕەشەكەی ماچكردو ناوچەوانی خستە سەرو سوژدەی لەسەر برد، پاشان گەڕایەوە ماچی كردەوەو سوژدەی لەسەر بردەوە، پاشان فەرمووی: پێغەمبەرم بینی (درودی خودای لەسەر بێ) ئاوای كرد.[2]

١٨- تەكبیركردن لەلای ڕوكن. ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) ڕیوایەتی كردوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەسواری حوشترەكەی تەوافی كرد، هەركە دەگەیشتە ڕوكن بەشتێك كە پێی بوو ئاماژەی بۆ دەكردو (الله أكبر)ی دەكرد.[3]

١٩- خێرا ڕۆیشتن – نەرمە غار – گورگە لوقەكردن لەسێ تەوافی یەكەمدا، ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) كە ڕیوایەتی كردوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ): كە تەوافی یەكەمجاری بەدەوری ماڵی بەیتدا ئەنجام دەدا، سێ تەوافی یەكەمی

---

[1] متفق علیه: خ(٣/٤٦٢/١٥٩٧)، م(٢/٩٢٥/١٢٧٠)، د(٥/٢٢٥/١٨٥٦)، جـة(٢/٩٨١/٢٩٤٣)، ت(٢/١٧٥/٨٦٢)، ن(٥/٢٢٧).

[2] حسن: (الإرواء: ٣١٢)، ألبزار (٢/٢٣/١١٤).

[3] صحیح: (الأرواء/١١١٤)، خ(٣/٤٧٦/١٦١٣).

بـه گورگـه لوقـەو خێـرا رۆیـشتن دەكـردو لەچـوار تەوافـەكانی دیكـەدا بـە رۆیشتنی ئاسایی لە حەجەرەوە بۆ حەجەر دەڕۆیشت.[1]

٢٠- دەست پێداهێنانی روكنی یەمانی: ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عومـەر (رەزای خودایـان لێ بـێ) دەفـەرموێ: نـەمبینیوە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) دەست لەهیچ بەشێكی كەعبە بداو دەستی پێدابێنێ جگـە لـەدوو روكنە یەمانییەكان.[2]

٢١- لەنێوان دوو روكنەكاندا ئەم دوعایە بخوێنێ: (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).[3]

٢٢- بەجێهێنانی دووركات نوێژ دوای تەواف لەپاش مەقامی ئیبراهیمـەوە ئامـاژە بـە حـەدیثی ئیبنـو عومـەر (رەزای خودایـان لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) تەشـریفی گەیـشتە نـاو مـاڵی خـودا حەوت جار بەدەوری كەعبەدا سوڕایەوە، پاشان لەپشتی مەقامی ئیبراهیمـەوە دووركـات نوێـژی كـرد، ئـەمجار هاتوچۆی نێـوان صـەفاو مـەڕوای ئەنجامـدا. فەرمووی: {لقد كان لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ – الأحزاب/٢١}.

٢٣- دەبێ لـەلای مـەقامی ئیـبراهیم ئایـەتی {وَاتَّخِـذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْـرَاهِيمَ مُصَلًّى – البقرة/١٢٥}. بخوێنێ، لەدوو ركاتە نوێژەكان سـورەتی (الكافرون) و سـورەتی (الأخـلاص) بخوێنـێ. ئامـاژە بـە حـەدیثی جـابیر: كـە دەفـەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كە گەیـشتە مـەقامی ئیـبراهیم (درودی

---

[1] صـحیح: (ص.جـة/٢٣٨٧)، جـة(٢٩٥٠/٩٨٣/٢) وهـذا لفظـه وبنحـوه خ(١٦٠٣/٤٧٠/٣)، م(١٢٦١/٩٢٠/٢)، د(١٨٧٦/٣٤٤/٥)، ن(٢٢٩/٥).

[2] متفق علیه: خ(١٦٠٩/٤٧٣/٣)، م(١٢٦٧/٩٢٤/٢)، د(١٧٥٧/٣٢٦/٥)، ن(٢٣١/٥).

[3] حسن: (ص.د/١٦٦٦)، د(١٨٧٥/٣٤٤/٥).

خودای لەسەر بێ) ئایـەتی {وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى – البقرة/١٢٥}ی خوێند، ئەمجار دووركاتی نوێژ كردن لەركاتە نوێژەكاندا سورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) و سورەتی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)ی خوێند.

٢٤- خۆنوساندن بە روكن‌و لـەنێوان روكـن‌و دەرگـەی كەعبـەدا. بـەمجۆرە سـنگی‌و روخـساری‌و دوو دەسـتی‌و باسـكی بخاتـە سـەر. ئامـاژە بـە حـەدیثی عەمری كوڕی شوعەیب لەباوكییەوە لە باپیرییەوە: كە ریوایەتی كردوە دەڵێ: (لەگـەڵ عەبـدوڵلای كـوڕی عـەمردا تـەوافم كـرد، كـە لەحـەوت تەوافەكـە بووینەوە، لەپشتی كەعبەوە چوینە روكوع، وتم ئەوە بۆ پەنا نـاگری بـەخودا لـەئاگری دۆزەخ؟ وتـی: {أعـوذ بـالله مـن النـار}. دەڵـێ: ئـەمجار هەڵسا رۆیـی دەستی بەروكنی یەمانیدا هێنا، ئـەمجار لـەنێوان حەجەرولئەسودو دەرگـەی كەعبە راوەستا سنگی‌و باسكی‌و روومەتی نوساند بەروكنەوە، پاشان فەرمووی: پێغەمبەرم دیوە ئاوای كرد.[1]

٢٥- خواردنەوەی ئاوی زمزم‌و شتنی سەر بـەو ئـاوە، ئامـاژە بـە حـەدیثی جابیر: كە ریوایەتی كردوە دەڵێ: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) وای كرد.

د/ سوننەتەكانی هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە:

٢٦- دەست پێداهێنانی روكن بەوشێوەی پێشوو.

٢٧- خوێندنی ئایەتی: {إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَـوَّعَ خَيْـرًا فَـإِنَّ اللّـهَ شَـاكِرٌ عَلِـيمٌ –

[1] لەوەپێش لەحەدیثی جابیردا تێپەڕی.

البقرة/١٥٨}. ئەمجار بڵێ: (لەوشوێنەوە دەست پێ دەکەم کەخودا دەستی پێ کردوە) ئەمە کاتێك دەڵێ: کەبۆ سەعی لەصەفا نزیك بۆوە.[1]

٢٨- روکردنە قیبلە کاتێك کە لەسەر صەفایە، لەگەڵ گوتنی (الله أكبر) سێ‌جار، « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ ». پاشان بە ئارەزۆی خۆی دوعاو پاڕانەوە بکا، سێ‌جار ئەمە بکا.

٢٩- خێرا رۆیشتن لەنێوان دوو نیشانە سەوزەکاندا بەشێوەی راکردن.

٣٠- چی لەسەر صەفا کردوەو چی گوتووە، لەسەر مەڕوەش هەمان شێوە وەستانو زیکرو ویردەکان دووبارە بکاتەوە.

هـ/ سوننەتەکانی رۆیشتنو چوون بۆ مینا:

٣١- ئیحرام بەستن بەحەج لەڕۆژی تەروییەدا لە مەنزڵو شوێنی حەوانەوەی خۆیەوە.

٣٢- کردنی نوێژی نیوەڕۆو عەصرو مەغریبو عیشا لەمینادا رۆژی تەڕوییەو شەو مانەوە لەوێ تانوێژی بەیانی دەکاو خۆر هەڵدێ.

٣٣- ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆو عەصر بە قەصرو جەمع لەڕۆژی عەرەفەدا لە (نمرە).

٣٤- مانەوە لە عەرەفەتا تا خۆرئاوا دەبێ واتە: پیش خۆرئاوابوون نەکەوێتەڕێ.

## روکنەکانی حەج

١- نیەتهێنان: ئاماژە بە فەرموودەی خودا: کە دەفەرموێ: {وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ – البينة/٥} هەروەها چونکە پێغەمبەر (درودی

[1] لەوەپێش لەحەدیثی جابیردا تێپەڕی.

خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ».[1] کردەوە بەپێی نیازو نیەتە.

٢- راوەستان و مانەوە لەکێوی عەرەفە. چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (ألحج عرفة)[2]. هەروا ئاماژە بە حەدیثی (عروة الطائی): کە دەڵێ: لە مزدەلیفە هاتمە خزمەت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ کە دەرچوو بۆ نوێژ، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! (درودی خودای لەسەر بێ) من لەکێوی (طيّ)ەوە هاتووم ولاخەکەم زۆر ماندوو کردووەو خۆم زۆر شپرزە. سوێندم بەخودا کێوێکم بەجێ نەهێشتووەو بەسەریا تێنەپەڕیوم ئیللا لەسەری وەستاوم، ئایا ئەمەم بۆ بەحەج حیساب ناکرێ؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ شَهِدَ صَلاَتَنَا هَذِهِ وَوَقَفَ مَعَنَا حَتَّى نَدْفَعَ وَقَدْ وَقَفَ بِعَرَفَةَ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلاً أَوْ نَهَارًا فَقَدْ أَتَمَّ حَجَّهُ وَقَضَى تَفَثَهُ»[3]: کەسێك لەگەڵ ئێمە ئامادەی ئەم نوێژەی بەیانی بێ، لەگەڵ ئێمە رابوەستێ تا دەکەوینە رێ لەوەپێشیش بەشەو یان بەرۆژ لەکێوی عەرەفە وەستابێ ئەوە حەجەکەی تەواو کردوە کاری بەجێهێناوەو کاتی ئەوەی هاتووە ئیحرام بشکێنێ.

٣- مانەوە لە موزدەلیفە هەتا فەجر دەردەکەوێ و نوێژی بەیانی لەوێ دەکا. چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە عوروەی فەرموو: (کەسێك لەگەڵ ئێمە ئامادەی ئەم نوێژەی بەیانی بێ، لەگەڵ ئێمە وەستابێ

---

[1] متفق علیه: لەباسی مەرجەکانی صیحەتی دەستنوێژدا تێپەڕی.

[2] صحیح: (ص.جة/٢٤٤١)، ت(٢/١٨٨/٨٩٠)، ن(٥/٢٦٤)، جة(٣٠١٥/١٠٠٣/٢)، د(١٩٣٣/٤٢٥/٥).

[3] صحیح: (ص.جة/٢٤٤٢)، ت(٢/١٨٨/٨٩٢)، د(١٩٣٤/٤٢٧/٥)، جة(٣٠١٦/١٠٠٤/٢)، ن(٥/٢٦٣).

تا دەگەوینە رێ، لەوەپێشیش بەشەو یان بەڕۆژ لەکێوی عەرەفە وەستابێ ئەوە حەجەکەی تەواوەو کاروباری ئیحرام شکاندنی بۆ دەستەبەر بووە[1].

٤- طەوافی ئیفاضە: ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار {وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ – الحج/٢٩}: لەخاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە، فەرموویەتی: صەفییەی کچی حویەی دوای (طواف الافاضة) کەوتە حاڵەتی بێ نوێژییەوە، دەڵێ: ئەو حاڵەتەی صەفییەم بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) باس کرد، فەرمووی: «أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟». ئایا ئەو ماتڵمان دەکا.؟ خاتو عائیشە دەفەرموێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو طەوافول ئیفاضەی کردوە، فەرمووی: کەوابێ: «فَلْتَنْفِرْ اذن».[2] با لەمەککە دەرچێ و حەجەکەی تەواو بووە. فەرموودەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ): کە فەرمووی: «أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟». بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە طەوافول ئیفاضە مەرجە بۆ تەواوکردنی حەج و دەبێ ئەنجام بدرێ.

٥- سەعیی نێوان صەفاو مەروە چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ خۆی سەعیی کردوەو فەرمووشیەتی: « اسْعَوْا فَإِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَيْكُمُ السَّعْيَ ».[3]

## واجباتی حەج: کارە پێویستەکانی حەج

١- ئیحرام بەستن لە میقات، بەم جۆرە هەموو پۆشاکی ئاسایی خۆی دادڕنێ و پۆشاکی ئیحرام بپۆشێ. پاشان نیەت بهێنێ و بڵێ: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ بِعُمْرَةٍ).

---

[1] صحيح: (ص.جة/٢٤٤٢)، ت(٢/١٨٨/٨٩٢)، د(٥/٤٢٧/١٩٣٤)، جة(٢/١٠٠٤/٣٠١٦)، ن(٥/٢٦٣).

[2] متفق عليه: خ(٣/٥٦٧/١٧٣٣)، م(٢/٩٦٤/١٢١١)، د(٥/٤٨٦/١٩٨٧)، ن(١/١٩٤)، ت(٢/٢١٠/٩٤٩)، جة(٢/١٠٢١/٣٠٧٢).

[3] صحيح: (الإرواء/١٠٧٢)، حم(١٢/٧٦/٢٧٧)، ك(٤/٧٠).

یان بڵێ: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ). ئەمەش ئاماژە بەوەی لەوەپێش لەباسی دیاریکردنی ئەو شوێنانەی ئیحرامیان لێ دەبەسترێ تێپەڕی. کە ئیبنو عەبباس ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەهلی مەدینەو ئەوانەی بەسەر مەدینەدا دێن بۆ حەج (ذیلحولەیفە)ی دیاریی کرد.....).

لە فەرموودەکەدا هاتووە دەفەرموێ: {وقت رسول الله..........} واتە: ئەم شوێنانەی دیاری کرد بۆ ئیحرام بەستن، مانای دیاری کردنی ئەم شوێنانە بۆ ئیحرام بەستن لەلایەن پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوە دەگەیەنێ دروست نیە بۆ کەسێك بەنیازی حەج یان عومرە بچێ بۆ مەککە بەبێ پۆشینی ئیحرام لەم شوێنانە تێپەڕێ. هەرچەندە وشەی (وقت) لە فەرموودەکەدا بەئاشکرا وجوب ناگەیەنێ، وەڵێ لەریوایەتی تردا دەقی تر هەن وجوب دەگەیەنن، وەکوو لەغەیری ئەو ریوایەتەدا دەقێکی تر هاتووە: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: {مُهَلُّ أهل المدينة} شوێنی ئیهلال کردنو ئیحرام بەستن بۆ دانیشتوانی مەدینەو دواوەی (ذیلحولەیفە)یە ئەم دەقە بەشێوەی خەبەر هاتووەو بەمانا (ئەمر)ە هەروەکوو چۆن لە ریوایاتی تردا بەئاشکرا لەفظی (ئەمر) هاتووە.[1]

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەتکراوە: کە پیاوێك لە مزگەوت هەڵسایە سەرپێو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! «مِنْ أَيْنَ تَأْمُرُنَا أَنْ نُهِلَّ». لەکوێوە فەرمانمان پێ دەکەی ئیحرام ببەستینو نیەت بەحەج یان بە عومرە بهێنین.[2]

---

[1] أحكام الأحكام: ٣/٣.

[2] خ (١/٢٣٠/١٣٣).

ئیمامی بوخاری بە (فەرض‌و واجب) ئاماژەی بۆئەوە کردووە فەرموویەتی: (باب فرض مواقيت الحج والعمرة). پاشان بەرِشتەو سەنەدی خۆی لە زەیدی کوڕی جوبەیرەوە ریوایەتی کردوە کە زەید هاتووە بۆلای عەبدوڵلای کوڕی عومەر لە مەنزلگەی خۆی، خێمەو ساباتێکی هەبوو – دەڵێ پرسیارم لێ کرد لەکوێوە دروستە ئیحرام بە عەمرە ببەستم‌و نیەت بێنم؟ عەبدوڵلا فەرمووی: (فَرَضَـهَا رَسُـولُ اللَّـهِ لأَهْـلِ نَجْـدٍ قَرْنًـا) تا کۆتایی فەرموودەکە. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ دانیشتوانی نەجد (قرن)ی کردوە بە میقات.[1]

٢- مانەوەی شەوانی تەشریق (ليالي التشريق) لەمینادا، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لێی ماوەتەوەو روخصەتی بەشوانە حوشترەکان داوە: کە نەمێننەوە. ئەوان رەمی جەمەرات لەرۆژی قوربانیدا ئەنجام دەدەن، پاشان رۆژی دوایی رەمی جەمەرات دەکەنەوە دوائەوە بەدوو رۆژ واتە رۆژی تەنفیر (مەککە جێهێشتن) سێیەم رەمی جەمەرات دەکەن[2].

دەی رێگەپێدانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەشوانە حوشترەکان کەشەو لەمینا نەمێننەوە بەڵگەیە: کە لەسەر غەیر ئەوان واجبە.

٣- رەمی جیمار بەشێوەی رێك‌و پێك، بەمجۆرە رۆژی قوربانی واتە رۆژی یەکەمی جەژن رەمی (جمرة العقبة) بکا، حەوت بەردی پێدادا. ئەمجار رەمی سێ (جمرە)کانی تر لەسێ رۆژی تەشریقدا (سێ رۆژی دوای رۆژی یەکەمی جەژن) ئەنجام بدا، هەموو رۆژی دوای نیوەرۆ شەیتان رەجمکردنەکان بەجێ

---

[1] خ (٣/٣٨٣/١٥٢٢).

[2] صحيح: (ص.جه/٢٤٦٣)، د(٥/٤٥١/١٩٥٩)، ت(٢/٢١٥/٩٦٢)، جه(٣٠٣٧/١٠١٠/٢)، ن(٥/٥٧٣).

بێنێ، بۆهەر جەمرەیەك حەوت بەرد فڕێ بدا، یەکەمجار دەست بکا بـەرەجم کردنی جەمرەی یەکەم ئەمجار ناوەڕاست پاشان (جمرة العقبة).

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەرم بینـی (درودی خـودای لەسەر بێ) بەسواری وڵاخەکەیەوە ڕەجمی شەیتانەکانی دەکـردو دەیفـەرموو: « لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ فَإِنِّي لاَ أَدْرِي لَعَلِّي لاَ أَحُـجُّ بَعْـدَ حَجَّتِـي هَـذِهِ»[1]: لەمنـەوە چۆنیەتی مەناسیكو کاروباری حەج فێرببن، ئەمن نازانم لەوانەیە لەم جارە بەولاوە مەرگ ڕێگەم پێ نەدا حەجی تر بکەم.

## کاتی شەیتان ڕەجمکردن

لە جابیری کوڕی (عەبـدوڵلا)وە ڕیوایـەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبـەرم بینـی (درودی خودای لەسەر بـێ) چێشتەنگاوی ڕۆژی قوربـانیکردن شـەیتانی ڕەجـم دەکرد، بەڵام دوائەوە شەیتان ڕەجمکردنەکانی دەخستە دوانیوەڕۆ.[2]

## کاتی شەیتان ڕەجمکردن لەدوای زەوالەوە تا ئێوارەیە

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسـەوە ڕیوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: پێغەمبـەری خـودا (درودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕۆژی قوربـانیکردن لـەمینا پرسـیاری لێ دەکـراو دەیفـەرموو: پیاوێـك پرسـیاری لێ کـرد وتـی: مـن پـێش ئـەوەی قوربانییەکەم سەرببڕم سەرم تاشیوە حوکمەکەی چیە؟ فـەرمووی: (إذبـح ولا

---

[1] م(١٢٩٧/٩٤٣/٢)، د(١٩٥٤/٤٤٥ و ٤٤٦/٥)، ن(٢٧٤/٥).

[2] م: (١٢٩٩/٩٤٤/٢)، ت(٨٩٥/١٩٠/٢)، د(١٩٥٥/٤٤٦ و ٤٤٧/٥)، ن(٢٧٠/٥) ورواه البخـاری معلقـا (٥٧٩/٣).

حرج) بەوشێوە حەیوان سەربڕەو چ خراپیەکی تێدانیە وتی: دوای ئێوارە شەیتانم رەجم کردوە! فەرمووی: (ولا حرج): قەیناکا.[1]

## (تنبیه) ورِیایی کردنەوەیەیێك

پێویستە هەموو ئەو بەردانەی دەهاوێژرێن بە مەبەستی شەیتان رەجمکردن بکەونە ناو حەوزی جەمەرەکەوە، جا ئایا تێیدا بمێنێتەوە یان هەڵبەزێتەوەو لەوێدا نەمێنێ، بۆیە پێویستە حاجی هەموو ئەوبەردانەی دەیانهاوێژێ ئاڕاستەی حەوزو چاڵەکەیان بکا نەك عەمودە چەقێندراوە بەرزەکە، چونکە ئەو عامووده بۆیە نەچەقێندراوە بەردی شەیتان رەجمکردنی ئاڕاستە بکرێ. شوێنی بەرد تێدا فرێدانیش نیە، بەڵکوو چەقێندراوە لەوێ بۆئەوەی ببێتە نیشانەی (جەمرە)کە، شوێنی بەرد بۆهاویشتن‌و بەرد تێگرتنەکە خودی ناو چاڵ‌و حەوزەکەیە، جا ئەگەر بەردێك لە عامودەکەی داو هەڵبەزییەوە نەچووە ناو حەوزەکە ئەوە حسێب ناکرێ‌و دەبێ دووبارەی بکاتەوە.

**فائیدەیەك:** ئەگەر حاجی چێشتەنگاوی رۆژی یەکەمی جەژن رەجمی شەیتانی گەورەی کرد، ئەوە تەحەلولی یەکەمی بۆ دەستەبەر دەبێ. هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێتەوە جگە لەچوونە لای ئافرەت.

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە: فەرموویەتی: کە حاجی رەمیی جەمەرەی کرد، ئەوە هەموو شتێکی کەبەهۆی ئیحرامەوە لێی حەرام بوو بوو بۆی حەڵاڵ دەبێ جگە لەچوونە لای ئافرەت. گوترا: بۆنی خۆشیش؟

---

[1] خ (٣/٥٦٨/١٧٣٥)، د(٥/٤٥٧/١٩٦٧)، ن(٥/٢٧٢)، جة(١٠١٣/٣٠٥٠ و ٢/١٠١٤).

فەرمووی: ئەمن بۆ خۆم پێغەمبەرم دیوە میسکی لەخۆی هەڵدەسوو، ئەری ئەوە بەبۆنی خۆش حسێب ناکری؟[١]

کە قوربانی سەربڕیو سەری تاشی، دوایی دابەزی بۆ ناو مەککەو تەوافی کەعبەی کردو هاتوچووی نێوان صەفاو مەروەی کرد ئەوە کاروباری حەجی بەجێهێناوە نوسوکی خۆی تەواو کردوە. بەتەواوی تەحەللولی بووەو هەموو شتێکی پێش ئیحرام بەستن کەبۆی رەوابووە بۆی حەلاڵە.

٤- تەوافی خودا حافیزی: ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عەبباس: کە تێیدا هاتووە: (خەڵکی فەرمانیان پێ کراوە: کە دواکاریان لە مەککە سوڕانەوەبێ بەدەوری بەیتدا، وەلێ ئەم فەرمانە ئافرەتی بی نوێژ ناگرێتەوە بۆئەوان بارسوکی کراوە.[٢]

٥- سەرتاشین یان کورتکردنەوەی موو؛ تاشینی مووی سەر یان کورت کردنەوەی بە قورئانو حەدیثو ئیجماع چەسپاوە، قورئان دەفەرموێ: {لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا – الفتح/٢٧}؛

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (أَللّهمّ إرْحَم المحلقين) خودایە رەحم بەوانە بکە کەبۆ شکاندنی ئیحرام سەریان دەتاشن. عەرزیان کرد: ئەی ئەوانەی موویان کورت دەکەنەوە؟ فەرمووی: (أَللّهُمّ ارحم المحلقين). گوتیان: ئەوانەی موویان

---

[١] صحيح: (ص.ن/ ٣٠٨٤)، ن(٥/٢٧٧)، جة(٢/٣٠٤١).

[٢] متفق عليه: خ(٣/٢٨٥/١٧٥٥)، م(٢/٩٦٣/١٣٢٨).

كورت دەكەنەوە ئەی پێغەمبەری خودا!. فەرمووی: (والمقصرين) خودا رەحم بەوانەش بكا: كەمووی سەریان كورت دەكەنەوە.[1]

بێگومان شەرعزانان كەوتوونە راجیایی دەربارەی حوكمی مووی سەر تاشین یان كورت كردنەوەی، زوربەیان پێیان وایە واجبەو ئەگەر نەكرا بەخوێن قەرەبوو دەكرێتەوە. شافیعییەكان پێیان وایە روكنێكە لە ئەركەكانی حەج.

هۆی راجیاییەكەیان وەكوو شێخی ئەلبانی دەڵێ: نەبوونی بەڵگەیە لەسەر ئەوە یان ئەمە.

## مەرجەكانی تەواف

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتكراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الطَّوَافُ حَوْلَ الْبَيْتِ مِثْلُ الصَّلاَةِ إِلاَّ أَنَّكُمْ تَتَكَلَّمُونَ فِيهِ فَمَنْ تَكَلَّمَ فِيهِ فَلاَ يَتَكَلَّمَنَّ إِلاَّ بِخَيْرٍ»[2]: تەواف بەدەوری كەعبەدا وەكوو نوێژ وایە، بەس ئەوە هەیە ئێوە قسەی تێدادەكەن، جا كەسێك لەكاتی تەوافدا قسەی كرد با قسەی خێربكا.

كە مادام تەواف وەكوو نوێژ وابێ ئەوە چەند مەرج هەن دەبێ تێیدا بێنەجێ:

١- پاكی لە لەشپیسیو بێ دەستنوێژی: چونكە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلاَةً بِغَيْرِ طُهُورٍ»[3]: خودا هیچ

---

[1] متفق عليه: خ(٣/٥٦١/١٧٢٧)، م(١٣٠١/٩٤٥/٢)، ت(٩١٦/١٩٨/٢)، د(١٩٦٣/٤٥٤/٥)، جة(٣٠٤٤/١٠١٢/٢).

[2] صحيح: (الإرواء/١٢١)، ت(٩٦٧/٢١٧/٢)، خز(٢٧٣٩/٢٢٢/٤)، حب(٩٩٨/٢٤٧)، مي(١٨٥٤/٣٧٤/١)، ك(١/٤٥٩)، هق(٥/٨٥).

[3] صحيح: لەباسی دەستنوێژ گرتن بۆ نوێژ باسكرا.

نوێژێك بەبێ دەستنوێژو پاكو خاوێنی قبوڵ ناكا. هەروا چونكە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە خاتو عائیشەشی فەرموو – كە كەوتبووە بێ نوێژییەوە لەحەج – «افْعَلِي مَا يَفْعَلُ الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَغْتَسِلِي»[1]؛ هەركردارو هەڵسو كەوتێك حاجی دەیكا تۆش بیكە، وەڵێ تەوافی كەعبە مەكە تا غوسڵ دەكەی.

٢- داپۆشینی شەرمگا: ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار كە دەفەرموێ: {يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ – الأعراف/٣١} هەروەها حەدیسێك ئەبوهورەیرە ریوایەتی كردوە: كە ئەبوبەكری صەدیق (رەزای خودای لێ بێ) لەو حەجەدا: كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كردبویە ئەمیری حەج لەپێش حەجیماڵئاواییدا رۆژی یەكەمی جەژن، ئەمی ناردووە لەگەڵ كۆمەڵێك موسوڵمانی تر كە جاڕبدەنو بەناو خەڵكدا بڵاوی بكەنەوە (أَلاَ يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ ، وَلاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ)[2]: لەدوا ئەمساڵ موشریك رێگای پێ نادرێ حەج بكا، نابێ كەسیش بەروتی تەوافی كەعبە بكا.

٣-دەبێ سوڕانەوە بەدەوری كەعبەدا حەوتجاربێ، چونكە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) حەوتجاری تەواو سوڕایەوە وەكوو ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆیو باوكی)، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هاتە ناو حەرەم، حەوتجار بەدەوری كەعبەدا سوڕایەوە، لەپاش مەقامی ئیبراهیم دووركات نوێژی كرد، حەوتجار لەنێوان صەفاو مەروەدا هاتوچۆی كرد. بێگومان بۆ ئێوەی موسوڵمانان كرداری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەرمەشقو (أسوة)ی حەسەنەیە. ئەم كردارو شێوە هەڵسوكەوتانەی

---

[1] متفق علیه: م(١١١٢ – ١١٩ -/٢/٨٧٣)، خ(١٦٥٠/٥٠٤/٣).

[2] متفق علیه: (٣٦٩/٤٧٧/١)، م(١٣٤٧/٩٨٢/٢)، (١٩٣٠/٤٢١/٥)، ن(٢٣٤/٥).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەبەستو مانای وردو ڕونی ئایەتی {وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ – الحج/٢٩} ئاشكرا دەكاو تەفسیری دەكاتەوە.

جا ئەگەر حاجی لەو حەوتجار سوڕانەوەیە شتێكی لێ چەرت كرد – هەرچەندە كەمیش بێ – تەوافەكەی بەكەڵك نایە، ئەگەر كەوتە گومانەوە، ئاخۆ پێنج جار یان شەش جار سوڕاوەتەوە ئەوە لایەنی كەمەكە وەردەگرێو لەسەر ئەوەوە تەوافەكانی تەواو دەكا. بۆئەوەی دڵنیابێ زیادی كردووە كەمی نەكردووە.

٤ ، ٥- دەبێ لە حەجەرولئەسوەدەوە دەست بەتەوافكردن بكاو لەوێش كۆتایی پێ بێنێ، لە تەوافدا دەبێ كەعبە بخاتە لای چەپی، ئاماژە بە فەرموودەیەك جابیر ریوایەتی كردوە، دەفەرموێ: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ناو مەككە، هاتە لای بەردە ڕەشەكەو دەستی پێداهێنا، پاشان لەلای ڕاستی بەردەكەوە كەوتە سوڕانەوە سێجار بەگورگە لوقەو ڕۆیشتنی خێرا، چوار جاریش بەڕۆیشتنی ئاسایی.

ئەگەر وا تەوافی كرد، كەعبە كەوتە لای ڕاستییەوە، ئەوە تەوافەكەی دروست نیە.

٦- پێویستە تەوافكردنەكەی لەدەرەوەی كەعبەوە بێ. چونكە قورئان دەفەرموێ: {وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ – الحج/٢٩}: بەدەوری خانوی لەمێژینەو شیعاری خودا پەرستیدا بسوڕێنەوە، ئەمەش ئەوە دەخوازێ بەدەوری هەموو كەعبەدا تەوافەكە بكرێ. ئەگەر لەناوەوەی حیجر تەوافی كرد دروست نیە چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (الحجر من البيت) حیجر بەشێكە لەكەعبە.

٧- ئەنجامدانی تەوافەكان بەشوێن یەكدا. چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەوافەكانی بەشوێن یەكدا ئەنجام دانو ناوانی تێنەخستن،

فەرمووشی: «خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ». لەمنەوە فێری ئەنجامدانی کاروبارەکانی حەج ببن‌و چاو لەمن بکەن.

ئەگەر تەوافەکەی بڕی بۆئەوەی دەستنوێژ بگرێ، یان یەکێ لەنوێژە فەرزەکان ئەنجام بدا، یان بۆئەوەی ماندوی بحەسێتەوە، ئەوە: کە دەستی پێ کردەوە لەو شوێنە دەست پێ دەکاتەوە کە لێی راوەستابوو، بەڵام ئەگەر وازهێنانەکەی لە تەواف زۆری خایاند ئەوە لە ئەوەڵەوە دەست پێ دەکاتەوە.

## مەرجەکانی هاتووچۆی نێوان صەفاو مەڕوە

بۆئەوەی سەعیی نێوان صەفاو مەڕوە دروست‌و ڕەوابێ چەند مەرجێک دەبێ بێنەجێ:

١- دەبێ هاتووچۆکە حەوتجار بێ.

٢- دەبێ لە صەفاوە دەست پێ بکاو لەمەڕوە کۆتایی پێ بێنێ.

٣- دەبێ هاتووچۆ لەڕێڕەوی نێوان صەفاو مەڕوە بێ چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەوشێوە سەعیی نێوان صەفاو مەڕوەی کرد، فەرمووشی: «خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ». چاو لەمن بکەن‌و بەشێوەی من کاروباری حەج ئەنجام بدەن.

## کارە ناڕەواکانی ئیحرام: ئەو کارانەی یاساغە لەسەر ئیحرام بەستوو

١- لەبەرکردنی قوماشی دورواو. ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی) کە دەفەرموێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئیحرام بەستوو پۆشاکی چۆن بپۆشێ؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ يَلْبَسُ الْقُمُصَ وَلاَ الْعَمَائِمَ وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ وَلاَ الْبَرَانِسَ وَلاَ الْخِفَافَ». نابێ نەکراس لەبەربکا نە مێزەر لەسەرنێ نە دەرپێ لەپێ بکا نە ڕۆب‌و پاڵتۆو شتی وا بپۆشێ، نە خوف‌و گۆرەوی لەپێ بکا (إلاَّ

أَحَدٌ لاَ يَجِدُ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ) مەگەر کەسێك نـەعلی چنگ نەکـەوت ئـەوە خـوف لـەپێ دەکـا. (وَلْيَقْطَعْهُمَـا أَسْـفَلَ مِـنَ الْكَعْبَـيْنِ) بـا لـەخوار قاپـە رەقـەوە خوفەکان بـبڕێ (وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَـسَّهُ الزَّعْفَـرَانُ أَوْ وَرْسٌ) پۆشـاکێك مەپۆشن زەعفەران یا (وەرس)ی لێ درابێ.[1]

بارسوکی دەکرێو ڕێگە دەدرێ بەکەسـێك جگـە لـەدەرپێو خـوف هیـچی تری نەبێ: کـە بیانپۆشـێ بـەبێ هەڵدڕینو بـڕین، ئەمـەش بـەپێی حـەدیثی ئیبنو عەبباس: کە دەفەرموێ: گوێم لێ بـوو لەعەرەفاتـدا پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) وتـاری دەداو دەیفـەرموو: کەسـێك جوتـێ نـەعلی دەست نەکەوت با دەرپێ بپۆشێ.[2] ئەمە بۆ ئیحرام بەستوو.

٢- داپۆشینی روخـسارو دوو دەسـتی ئـافرەت، ئامـاژە بـە حـەدیثی ئیبنـو عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) کە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «وَلاَ تَنْتَقِـبِ الْمَـرْأَةُ الْمُحْرِمَـةُ وَلاَ تَلْـبَسِ الْقُفَّازَيْنِ»[3]: ئافرەتی ئیحـرام بەسـتوو روبەنـد ناپۆشـێو دەسـتکێش لەدەست ناکا.

دروستە بۆ ئافرەت کە هەرکاتێ پیاوی بێگانە بەلایدا تێپەڕین روخساری خۆی دابپۆشێ. ئاماژە بە حەدیثی هیشامی کوڕی عوروە کە لـەخاتو فاتیمـەی کـچی (المنـذر)ەوە ریوایـەت دەکـا، دەڵـێ: ئێمـە لەئیحرامـدا بـووین روخـساری خۆمان دادەپۆشی. ئێمـە لەوکاتـەدا لەگـەڵ خـاتو ئـەسمائی کچی ئەبوبـەکری صدیق دا بووین.[4]

---

[1] متفق عليه: خ(٣/٤٠١/١٥٤٢)، م(٢/٨٣٤/١١٧٧)، (٥/٢٦٩/١٨٠٦)، ن(٥/١٢٩).

[2] متفق عليه: خ(٤/٥٧/١٨٤١)، ن(٥/١٣٢)، م(٢/٨٣٥/١١٧٨)، ت(٢/١٦٥/٨٣٥)، د(٥/٢٧٥/١٨١٢).

[3] صحيح: (الإرواء/١٠٢٢)، خ(٤/٥٢/١٨٣٨)، د(٥/٢٧١/١٨٠٨)، ن(٥/١٣٣)، ت(٢/١٦٤/٨٣٤).

[4] صحيح: (الإرواء/١٠٢٣)، ط(٢٢٤/٧٢٤)، ك(١/٤٥٤).

٣- داپۆشینی سەر بۆ پیاو بە مێزەرو شتی وا، ئاماژە بە فەرمایشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە لە حەدیثی ئیبنو عومەردا هاتووە: کە فەرمووی: «لاَ يَلْبَسُ الْقُمُصَ وَلاَ الْعَمَائِمَ»[1]: پیاو لەئیحرامدا نەکراس لەبەردەکا، نەمێزەر لەسەر دەنێ.

بۆی دروستە بچێتە ژێر سێبەری خێمەو چەترو شتی وا. ئاماژە بەو حەدیثەی لەوەپێش تێپەڕی کە تێیدا هاتووە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد لە (نەمیرە) رەشماڵێکیان بۆ هەڵداو تەشریفی چووە ژێری بۆ پشودانو حەسانەوە.

٤- بۆنی خۆش لەخۆدان، ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ أَوْ وَرْسٌ».[2] شتێك مەپۆشن زەعفەرانو (ورس)ی لێ درابێ.

هەروەها لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی ئەو پیاوە ئیحرام بەستووەی حوشترەکەی گلاندبوویو گیانی لەدەست دابوو فەرمووی: «وَلاَ تُحَنِّطُوهُ وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا».[3] بۆنی خۆشی پێوە مەکەنو سەریشی دامەپۆشن، بێگومان ئەو رۆژی قیامەت بەئیحرام بەستوویی زیندو دەکرێتەوە.

٥ – ٦- نینۆك کردنو موتاشین یان کورتکردنەوەی یان لابردنی بە هەرشتێکی تر. چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى

---

[1] صحيح: (الإرواء/١٠١٢).

[2] متفق عليه: خ(١٥٤٢/٤٠١/٣)، م(١١٧/٨٣٤/٢)، د(١٨٠٦/٣٦٩/٥)، ن(٥/١٢٩).

[3] متفق عليه: خ (١٢٦٥/١٣٥/٣)، م (١٢٠٦/٨٦٥/٢)، د (٣٢٢٢/٣٢٢٣/٦٣/٩)، ن (٥/١٩٦).

يَبْلُغَ الْهَـدْيُ مَحِلَّـهُ – البقـرة/١٩٦}: سـەرتان مەتاشـن هـەتا قوربانییەكـەتان سەردەبڕن، زانایانیش كۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە كە ئیحرام بەسـتوو حەرامـە نینۆكی بكا.[1]

كەسـێك بەنەتاشـینی سـەریو موهێـشتنەوە بەجەسـتەیەوە تووشـی ئەزیـەتو ئـازار دەبـوو، بـۆی هەیـە سـەری بتاشـێو مـوی جەسـتەی لابـەرێو فیدیە بدا، ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار كە دەفەرموێ: {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَـدَقَةٍ أَوْ نُـسُكٍ – البقـرة/١٩٦}: ئەگەر یەكێك لەئێوە نەیتوانی مەرجەكانی ئیحرام بەجێ بێنێ سـەری تاشـی یـان كـورتی كـردەوە بـەهۆی نەخۆشـیو برینـدار بـوونو ئەسـپێ لێدان ئـەوە فیدیە دەدا؛ بەئارەزووی خۆی یان سێ ڕۆژ بەڕۆژو دەبێ یان خواردن دەدا بـە شەش هەژار یان مەڕێك سەردەبڕێ.

لەكەعبی كوڕی (عجرة)وە ڕیوایـەتكراوە، كـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لەوكاتـەدا كـە لەحودەیبییـە بـوو هێـشتا داخڵی مەككە نـەبووە، بەلایدا تێپەڕیوە، كەعب لەئیحرامدا بووەو خەریكی ئاگر كردنەوە بوو لەژێر مەنجەڵێكدا، ئەسپێ بەسـەر ڕوخساریدا هـاتوونو چـوون، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویـەتی: « أَيُؤْذِيكَ هَوَامُّكَ هَـذِهِ ». ئـەو ئەسپێیانەت نارەحەتت ناكەن؟ وتـی بـەڵێ: پێیـان تەنگـەتاوم. فـەرمووی: «فَـاحْلِقْ رَأْسَـكَ وَأَطْعِمْ فَرَقًا بَيْنَ سِتَّةِ مَسَاكِينَ – وَالْفَرَقُ ثَلاَثَةُ آصُعٍ – أَوْ صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّـامٍ أَوِ انْـسُكْ نَسِيكَةً»[2] سەرت بتاشە (فَرَق)ێك سێ ربە خواردن بدە بـە شـەش هـەژار یـان سێ ڕۆژ بەڕۆژوبە یان حەیوانێك سەرببڕە.

---

[1] الإجماع لإبن المنذر/٥٧.

[2] متفق عليه: م (١٢٠١ – ٢/٨٦١/٨٣) وهذا لفظه، خ (٤/١٢/١٨١٤)، د (٥/٣٠٩/١٧٣٩)، ن (٥/١٩٤).

٧- جيماع كردن لەگەڵ خێزانی یان ماچکردنیو ئەو جۆرە شتانە.

٨- تاوانکردن.

٩- دەمەدەمێو کێشە نانەوە.

بەڵگە لەسەر حەرامی ئەم سێ شتە ئایەتی {الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ – البقرة/١٩٧}؛

١٠ – ١١- خوازبێنیو ژن مارە کردن، ئامـاژە بەو حەدیثەی حەزرەتی عوسمان ریوایەتی کردووە، کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لاَ يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ وَلاَ يُنْكَحُ وَلاَ يَخْطُبُ».[1] ئیحرام بەستوو تا لەئیحرامدا بێ، نەژن ماردەکا، نە مارە دەکرێ نەخوازبێنی دەکا.

١٢- دەست وەشاندنو زیانگەیاندن بەنێچیری دەشتەکی؛ بیانکوژێ یان سەریان ببڕێ، یان یارمەتی کەسانی دی بدا بۆ ئەو کارە، چونکە خودا دەفەرموێ: {وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا – المائدة/٩٦}: هەتا لەئیحرامدا بن حەرامە بۆتان راوکردنی نێچیری دەشتەکی.

هەروا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێك هاوەڵان پرسیاریان لێ کردووە دەربارەی ئەو دێڵە کەرە کێویەی ئەبو قەتادە نێچیری کردبوو – ئەوکاتە خواردنی حەڵاڵ بوو – هاوەڵان لە ئیحرامدا بوون، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموون «أَمِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَنْ يَحْمِلَ عَلَيْهَا أَوْ أَشَارَ إِلَيْهَا ». ئایا کەس لەئێوە فەرمانی بە ئەبو قەتادە کرد بێچیری بکا؟ عەرزیان کرد نەخەیر کەسمان ئەوەی نەکردووە. فەرمووی {فکلوا} کەوابێ بیخۆن بۆتان حەڵاڵە.[2]

---

[1] صحيح: (مختصر م/٨١٤)، م (١٤٠٩/١٠٣٠/٢)، د (١٨٢٥/٢٩٥/٥)، ت (٨٤٢/١٦٧/٢)، ن (٥/١٩٢).

[2] متفق عليه: خ(١٨٢٤/٢٨/٥)، م (١١٩٦ – ٦٠/٨٥٣/٢)، ن (٥/١٩٢).

١٣- خواردن لەهەر نێچیرێك لەبەر خاتری ئەو یان بەفەرمان و رێنمایی و یارمەتی ئەو نێچیر کرابێ، ئاماژە بەماناو مەفهومی فەرموودەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەربارەی نێچیرەکەی ئەبو قەتادە فەرمووی: «أَمِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَنْ يَحْمِلَ عَلَيْهَا أَوْ أَشَارَ إِلَيْهَا». [1] وتیان نەخەیر کەسمان ئەوەمان نەکردووە، فەرمووی: دەسا لێی بخۆن.

## ئەو شتانەی حەج بەتاڵ دەکەنەوە

**حەج بەیەکێک لەم دوو شتە بەتاڵ دەبێتەوە:**

یەکەم: جیماع پێش رەمیی جەمەرەی عەقەبە. بەڵام ئەگەر دوای رەمیی جەمەرە عەقەبە بوو پێش تەوافی ئیفاضە ئەوە حەجەکە بەتاڵ نابێتەوە، گوناهبار دەبێ.

ئیبنولمنزیر دەڵێ: کۆڕای زانایان لەسەر ئەوەیە: کەسێك بەئەنقەست لەحەجدا پێش ڕاوەستانی عەرەفە جیماعی کرد حەجەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، پێویستە لەسەری لەساڵی داهاتوودا حەجەکەی بکاتەوەو ئاژەڵیش سەرببڕێ و قوربانی بکا. [2]

دووەم: بەجێ نەهێنانی روکنێك لە ئەرکەکانی حەج.

جا هەرکاتێ حەجەکەی بە یەکێك بەم دوو شتە بەتاڵ بۆوە واجبە لەسەری لەساڵی داهاتوودا ئەگەر توانای هەبوو (ئەو توانایەی کە بۆ حەجکردن پێویستە، بەو شێوەی لەوەپێش ئاماژەی پێ کرا) دەبێ حەجەکەی

---

[1] لە کتێبی (إرشاد الساری) دانراوی شێخ محمد ابراهیم شقرە راگوێزراوە.

[2] الإجماع/٥٦.

بكاتـەوە، ئـەگینا هـەرکاتێ ئـەو توانایـەی بـۆ دەسـتـەبەر بـوو دەبـێ فـەورەن لەکاتی حەجدا حەجەکەی بکاتەوە.[1]

## ئەو شتانەی لە حەرەمین (مەککەو مەدینە)دا حەرامە بکرێن

لـە صـەحیحەین‌و غـەیری صەحیحەینیـشدا فەرمووده‌یـەك لـە عـەبادی کوڕی تەمیم ئەویش لەمامیەوە گێڕدراوەتەوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « أَنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ ، وَدَعَا لَهَا ، وَحَرَّمْـتُ الْمَدِينَـةَ كَمَـا حَـرَّمَ إِبْـرَاهِيمُ مَكَّـةَ». حـەزرەتی ئیـبراهیم مەککەی کـردووە بەحـەرەم‌و شـوێنی پـیرۆزو لـەخودا پاڕاوەتــەوە ئـاوەدانی‌و فـەڕو بەرەکـەتی تـێ بخـاو لەهـەموو لایەکـەوە خـەڵکی بـێن زیـارەتی کەعبـە بکـەن‌و خوداپەرسـتی‌و یەکتاپەرستی رابگەیەنن. منیش مەدینەم کـردووە بەحـەرەم‌و شوێنی پیرۆز وەکوو چۆن ئیبراهیم مەککەی کردووە بە بەست‌و حەرەم.

بــە حــەرەمکردنی مەککــەو مەدینــە بــەنیگای یــەزدانی بــووە، نیگـای پـەروەردگار کـە ئاراسـتەی هـەردوو پێغەمبـەرە بـەڕێزەکانی خـۆی کـردووە (درودی خودایان لەسەر بێ) هـەرکاتێ گـوترا: (الحرمين) مەبەست مەککـەو مەدینەیــە، وشــەی حــەرەم = بەســت. هــەر بــۆ ئــەو دوو شــارە پــیرۆزە بەکاردەهێندرێ‌و بەس، تەنانەت دروست نیـە وشـەی (حـەرەم) بـۆ مزگـەوتی قودس‌و مزگـەوتی ئیـبراهیم خـەلیلیش بـەکار بهێنـدرێ، چونکە بەسروش‌و نیگا تەنها ئەم ناوە بـۆ مەککـەو مەدینـە نـاودێرکراوە، کـارێکی تەشـرعیـیەو عەقڵ رۆڵی تێدا نابینێ.

---

[1] إرشاد الساري: دانراوی: محمد إبراهيم شقرة.

چەند شتێك لەخاكی حەرەمەیندا كردنیان حەرامەو نابێ بكرێن، چی بۆ ئەوانەی ژیان تێیاندا بەسەر دەبەن‌و دانیشتویانن، یان ئەوانەی بەنیازی حەج‌و عەمرەو مەبەستی تر زیارەتیان دەكەن.

**ئەو كارە حەرام‌و نادروستانەش ئەمانەن:**

١- نێچیركردنی ئاژەڵ‌و باڵندە، یان دەركردن‌و راونانیان، یان یارمەتیدانی كەسانی دیكە بۆ ئەو مەبەستانە.

٢- دروونەوەو هەڵپروكاندن‌و هەڵكێشانی رووەك مەگەر پێویست‌و زەرور بێ.

٣- هەڵگرتنی چەك.

٤- هەڵگرتنەوەی شتی كەوتوو لەناو بەستی مەككەدا بەنیسبەت كەسێك دانیشتووی ئەوێ نەبێ، وەڵێ بۆ كەسێك خەڵكی ئەوێ بێ بۆی دروستە شتی كەوتوو هەڵبگرێتەوەو جاڕی بۆ بدا بەهیوای ئەوەی خاوەنی بۆ پەیدا ببێ‌و بیداتەوە. لەمەشدا جوداوازی لەنێوان حاجی‌و دانیشتوانی مەككەدا ئاشكرایە دەڵێم: بەڵگە لەسەر حەرامی ئەو شتانەی ئاماژەیان پێ كرا فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كە لە رۆژی رزگار كردنی مەككەدا فەرمووی: « إِنَّ هَذَا الْبَلَدَ حَرَّمَهُ اللَّهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ ، فَهْوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، وَإِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ الْقِتَالُ فِيهِ لأَحَدٍ قَبْلِي ، وَلَمْ يَحِلَّ لِي إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، فَهْوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، لاَ يُعْضَدُ شَوْكُهُ ، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهُ ، وَلاَ يَلْتَقِطُ لُقَطَتَهُ إِلاَّ مَنْ عَرَّفَهَا ، وَلاَ يُخْتَلَى خَلاَهُ » . فَقَالَ الْعَبَّاسُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلاَّ الإِذْخِرَ ، فَإِنَّهُ لِقَيْنِهِمْ وَلِبُيُوتِهِمْ . فَقَالَ «إِلاَّ الإِذْخِرَ».[1] ئەم شارە كەشاری مەككەیە پەروەردگار رێزو حورمەتی داوەتێ‌و كردویەتی بە بەست‌و حەرەم لەو ڕۆژەوەی خودا ئاسمانەكان‌و زەوی پەدیهێناون، ئەوشارە پیرۆزە

---

[1] متفق عليه: خ (٤/٤٦/١٨٣٤)، م (٢/٩٨٦/١٣٥٣)، ن (٥/٢٠٣).

بەوەی خودا پیرۆزی داوەتیٚو ئەم پیرۆزیو حورمەتەی هەیەتی هەتا رۆژی پەسلاّن بەردەوامە، پێش من بۆ کەس حەلاڵ نەبووە شەڕی تێدا بکا. بۆ منیش تەنها یەك سەعات شەڕ حەلاڵ بوو بەس! ئەو شارو دەڤەرە حورمەتو پیرۆزی خۆی هەیە، خودا ئەو رێزو قەدرەی داوەتیٚو تا رۆژی قیامەت بەردەوامە، دڕكو شتی وای پاكۆ نادریٚ، رووەكو درەختی نابڕدریٚ نێچیرو ئاژەڵی راوناكرێنو دەرناپەڕێندرێن، شتی كەوتووی هەڵناگیرێتەوە، مەگەر بۆ كەسێك هەڵی بگرێتەوەو جاڕی بۆ بدا بۆ ئەوەی خاوەنی پەیدا ببیٚو بیداتەوە، گیاوگژی تەڕی نادورێتەوە ناڕندرێتەوە. عەبباسی كوڕی عبدالمطلب كە ئامادەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر بوو (درودی خودای لەسەر بیٚ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! جگە لە ڕووەكی (إذْخِر) سوڕناتك، چونكە ئەم ڕووەكە بۆ سوتەمەنی ناو ماڵو بۆ سەرگرتنی سەری گۆڕ بەكار دێنین، حەزرەتیش فەرمووی: باشە تەنیا ڕووەكی سوڕناتكی لیٚ دەرچیٚ، ئەو لەبەر زۆر پێویستی دروونەوەی دروستە.

لە جابیرەوە ریوایەتكراوە، دەفەرمویٚ: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: «لاَ يَحِلُّ لأَحَدِكُمْ أَنْ يَحْمِلَ بِمَكَّةَ السِّلاَحَ».[1] ڕوانیە بۆ هیچ كەس لەئێوە لە مەككەدا چەك هەڵبگریٚ.

لە ئیمامی عەلیەوە ریوایەتكراوە، دەفەرمویٚ: كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) دەربارەی مەدینە فەرموویەتی: « لاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا وَلاَ تُلْتَقَطُ لُقَطَتُهَا إِلاَّ لِمَنْ أَشَادَ بِهَا – أنشدها – وَلاَ يَصْلُحُ لِرَجُلٍ أَنْ يَحْمِلَ فِيهَا السِّلاَحَ لِقِتَالٍ وَلاَ يَصْلُحُ أَنْ يُقْطَعَ مِنْهَا شَجَرَةٌ إِلاَّ أَنْ يَعْلِفَ رَجُلٌ بَعِيرَهُ».[2]

---

[1] صحيح: (ص. ج/٧٦٤٥)، م (٢/٩٨٩/١٣٥٦).

[2] صحيح: (ص. د/١٧٩)، د (٦/٢٠/٢٠١٨).

ڕووەك‌و گژوگیا نادروێتەوە، نێچیرەكانی تەرە ناكرێن‌و ڕاو نانرێن، شتی داكەوتووی هەڵناگیرێتەوە، مەگەر بۆ كەسێك جاڕی بۆ بداو هەوڵ بدا خاوەنی بۆ بدۆزێتەوە، نابێ هیچ پیاوێك چەكی تێدا هەڵبگرێ بە مەبەستی شەڕ. نابێ درەختی ببڕدرێ مەگەر بە مەبەستی ئاڵفدان بەحوشتر گەڵاو پرژو پاڵی لێ هەڵپاچی.

شێخ محمد شقرە دەڵێ: كەسێك شتێكی لەم كارە یاساغانە ئەنجامدا تاوانبار دەبێ، پێویستە تۆبە بكا داوای لێخۆشبوون لەخودا بكا جگە لەڕاوكردنی نێچیر ئەوە بەتۆبە كردن تەواو نابێ، دەبێ خوێنی قەرەبوو بدا سەرباری تۆبەكردنەكەی.

### قەرەبوو كردنەوەی كوشتنی نێچیر

پەروەردگار دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَو عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ عَفَا اللّهُ عَمَّا سَلَف وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللّهُ مِنْهُ وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ – المائدة/٩٥}. ئەی ئەو كەسانەی ئیمانتان هێناوە، لەو كاتەیدا ئێوە لەئیحرامدان نێچیر ڕاومەكەن، كەسێك بە ئەنقەست نێچیرێكی كوشت ئەوە حەیوانێك سەربڕێ لەقەبارەی ئەو نێچیرەی ڕاوی كردووە، دوو كەسی عادڵ لەنێوە ئاژەڵی هاوتای ئاژەڵە ڕاوكراوەكە دیاری دەكەن‌و دەیكاتە دیاری كەعبەو لەپەنا كەعبەدا سەری ببڕێ، یان كەفارەت بدا ئەویش خواردن دانە بەهەژاران یان ئەوەندەی ئەو كەفارەتە بەڕۆژو بێ، ئەمەیش بۆ ئەوەیە تاڵاوی كردەوە یاساغەكەی بچێژێ، پەروەردگار لەوجۆرە تاوانانەی لەوەپێش ئەنجام دراون خۆش بووەو سزاتان نادا، هەركەسێ ئەو جۆرە تاوانە دووبارە بكاتەوە، خودا تۆڵەی لێ دەستێنێ‌و سزای دەدا، خوای گەورە بەتواناو تۆڵەئەستێنە.

ئیبنو کەثیر دەڵێ: ئەمە یاساغکردنی پەروەردگارە بۆ نێچیر کوشتن لەکاتی ئیحرامدا، نەهی کردنیەتی لەوەی لەکاتی ئیحرامدا پەنا بۆ راوکردنو راوەدونانو تەراندنی ئاژەڵی کێوی بەری.

لەروی ماناوە ئەم نەهی کردنو یاساغکردنە ئاژەڵە کێوییەك دەگرێتەوە گۆشتی بخورێ، یان ئاژەڵێك لەم جۆرەو لەجۆری تر بەوە لەدبوو بێ، وەڵێ ئاژەڵێك کە گۆشتی نەخورێ لە ئاژەڵە کێوییەکان، ئەوە بەلای شافیعیەوە دروستە مرۆڤی ئیحرام بەستوو بیانکوژێ، بەڵام جەماوەری زانایان کۆکن لەسەر ئەوە کە ئەوانیش بۆ ئیحرام بەستوو حەرامە کوشتنیان، لەم حوکمە تەنیا ئەو چەند گیانلەبەرە چەرت دەکرێن کە لە صەحیحەیندا چەسپاون لەرێگەی (الزهری)یەوە لە عوروەوە لەخاتو عائیشەوە (رەزای خودا لەهەموویان بێ) کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « خَمْسُ فَوَاسِقَ يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ». [1] پێنج گیانلەبەری زێنەخرۆ هەن لەدەرەوەی بەستو لەناو بەستدا دەکوژرێن، قەلەرەشە، کۆلارە، دوپشك، مشك، سەگی نهێنگر.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: جەماوەری زانایان پێیان وایە ئیحرام بەستوو بە ئەنقەست راوی نێچیر بکا یان لەبیری بچێتەوەو بەنەزانی ئەو کارە بکا قەرەبوو کردنەوەی لەسەر پێویستە.

ئیمامی (الزهری) دەڵێ: قورئان قەرەبوو کردنەوەی نێچیرکوشتنی چەسپاندووە، بەپێی سوننەتیش قەرەبوو کردنەوەی ناسیو لەبیرچۆوە چەسپاوە، مانای ئەمە ئەوەیە: کە قورئان ئەوەی چەسپاندووە کە کەسێك بە

---

[1] متفق علیه: خ (١٨٢٩/٣٤/٤)، م (١١٩٨/٨٥٦/٢)، ت (٨٣٩/١٦٦/٢).

ئەنقەست راو بكاو نێچیر بكوژێ دەبێ خوێنەكەی بدا وێڕای ئەوەش تاوانبار دەبێ، ئاماژە بەئایەتی {لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ عَفَا اللّهُ عَمَّا سَلَف وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللّهُ مِنْهُ – المائدة/٩٥}.

بەگوێرەی سوننەتو حوكمی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)و حوكمی هاوەڵانی؛ كەسێك بە هەڵەو نەزانیش نێچیر راوبكا دەبێ لە قەرەبووی ئەوەدا ئاژەڵێكی هاوتا سەرببڕێ، وەكوو چۆن لەراوكردنی بە ئەنقەستدا قورئان قەرەبووكردنەوەی لەسەر بكەرەكە چەسپاندووە، لە لایەكی ترەوە بێگومان كوشتنی نێچیر فەوتاندنو بە تەلەفدانە، فەوتاندنو بە تەلەفدان بە ئەنقەست بێ یان بەهەڵە بكەرەكەی بەرپرسیارەو ضامن دەبێ، وەلێ ئەوەندە هەیە بكەری بەئەنقەست تاوانباریش دەبێ، بەڵام بكەری بەهەڵەو نەزانی سەرزەنشتی ناكرێ.

ئیبنو كەثیر دەڵێ: كە پەروەردگار دەفەرموێ: {فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ – المائدة/٩٥}. بەڵگەیە لەسەر ئەو بۆچوونەی ئیمام مالیكو شافیعیو ئەحمەدو جەماوەری زانایان كە فەرموویانە واجبە لەسەر نێچیركوژی ئیحرام بەستوو كە: ئاژەڵێكی ماڵی لە هاوشێوەو هاوتای نێچیرەكە سەرببڕێ ئەگەر نێچیرەكە هاوشێوەی ئاژەڵی ماڵی هەبوو، ئەگەر هاوشێوەی نەبوو، ئەوە ئیبنو عەبباس وای فتواداوە كە نرخەكەی لەمەككەدا خەرج بكا، بەیهەقی ریوایەتی كردووە.[1]

*** چەند نمونەیەك لەبڕیارو حوكمی پێغەمبەرو هاوەڵانی دەربارەی دیاری كردنی هاوتایی نێوان نێچیری كێویو ئاژەڵی ماڵی:**

---

[1] تفسیر القرآن العظیم ٢/٩٩.

لە جابیرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پرسیارم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کرد دەربارەی کەمتیار فەرمووی: ئەوە نێچیرەو ئەگەر کەسێ راوی کرد دەبێ مەڕێك لەفەرەبوویدا سەربڕێ.[1]

هەر لەجابیرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: کە عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خودای لێ بێ) بڕیاریدا بۆ راوکردنی کەمتیار مەڕێك سەربڕدرێ، بۆ نێچیرکردنی ئاسك بزنێكو بۆ کەروێشك بەرخۆلەیەکی تەمەن یەکساڵو کەمتر، بۆ جرج کاریلەیەکی یەکساڵو کەمتر.[2]

لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە کەفتوای داوە بۆ کەسێك ئیحرام بەستوو بێ یان نا لە فەرەبووی نێچیرکردنی هەر کۆترێکی حەرەمدا مەڕێك سەربڕێ.[3]

ئیبنو کەثیر[4] دەفەرموێ: کە پەروەردگار فەرمووی: (هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ). مەبەست ئەوەیە کە لەحەرەمدا حەیوانەکە سەربڕدرێو گۆشتەکەی بەسەر فەقیرو هەژاری ئەوێدا دابەش بکرێ. ئەمە شتێکە کۆڕای زانایانی لەسەرە.

کە دەفەرموێ: {أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَو عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا - المائدة/٩٥} واتە: ئەگەر ئیحرام بەستوو ئاژەڵی ماڵی وای دەست نەکەوت هاوتای ئەو گیانلەبەرە بێ کەنێچیری کردووە، یان ئاژەڵە نێچیرکراوەکە لەو جۆرە حەیوانانە نەبوو، کەوێنەی لە ئاژەڵی ماڵیدا هەبێ، یان بڵێین: ئیحرام

[1] صحیح: (ص. د/٣٢٢٦)، د (١٠/٢٧٤/٣٧٨٣).

[2] (الإرواء/١٠٥١)، ط (٢٨٥/٩٤١)، هق (٥/١٨٣).

[3] صحیح الإسناد (١٠٥٦)، هق (٥/٢٠٥).

[4] ج ٢/١٠٠.

بەستووەکە بەگوێرەی ظاهیری مانای (أو) موخەییەرە لەنێوان حەیوان سەربڕینو خۆراك دان بەهەژارانو بەرۆژو بوندا، ئەوە بەم شێوەیە دەبێ.

کابرای ئیحرام بەستوو ئەگەر ویستی قەرەبووی نێچیرەکە بە بەخشینی خۆراك پڕ بکاتەوە، دەچێ ئاژەڵە نێچیرکراوەکە دەنرخێنێ بەپارە ئەمجار بەپارەکە خواردن دەکڕێو بۆ هەر هەژارێك (مورد)ێك دادەنێ، ئەمجار ئەگەر پارەی نەبوو یان بڵێین کابرا موخەییەرە لەنێوان بەخشینی خواردنو بەرۆژو بووندا ئەوە لەجیاتی خواردنی هەر هەژارێك ڕۆژێك بەرۆژو دەبێ.

## سزای جیماعکردن لەحەجدا

کەسێك پێش تەحەلولی یەکەم جیماعی کرد، حەجەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو دەبێ حوشترێکیش سەرببڕێ، ئەگەر جیماعکردنەکە لەدوای تەحەلولی یەکەمو پێش تەحەلولی دووەم بوو، ئەوە مەڕێك سەرببڕێو حەجەکەشی بەتاڵ نابێتەوە.

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: کە پیاوێك لەئیحرامدا بوو لەميناو پێش تەوافی ئیفاضە جیماعی لەگەڵ ژنەکەی کرد، هات پرسیاری لە ئیبنو عەبباس کرد ئەویش فەرمانی پێ کرد کە حوشترێك سەرببڕێ.[1]

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لەباوکیەوە گێڕدراوەتەوە، کە پیاوێك هاتە لای عەبدوڵلای کوڕی عەمر پرسیاری لێ کرد دەربارەی کابرایەکی ئیحرام بەستوو: کە دەستی لەگەڵ خێزانەکەیدا تێکەڵاو کردبوو، ئەویش ناردی بۆلای عبدڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بڕۆ بۆلای ئەو پرسیاری لێ بکە، دەڵێ پیاوەکە نەشارەزا بوو عەبدوڵلای کوڕی

---

[1] صحيح موقوف: (الإرواء/١٠٤٤)، هق (٥/١٧١).

عومەری نەدەناسی، من لەگەڵی چووم، کە پیاوەکە لەئیبنو عومەری پرسی، لە وەڵامدا وتی: حەجەکەت بەتاڵ بۆتەوە، پیاوەکە وتی دەی باشەئێستا من چی بکەم؟ فەرمووی: لەگەڵ خەڵکەکە برۆ ئەوان چییان کرد تۆش وا بکە، ئەگەر ساڵی داهاتوو لەژیاندا مای‌و توانات هەبوو حەجەکەت بکەرەوەو ئاژەڵێکیش سەرببڕە، کابرا گەڕایەوە بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی عەمرو فتواکەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: دەبڕۆ بۆلای ئیبنو عەبباس پرسیار لەویش بکە، شوعەیب دەڵێ لە تەکیا چووم بۆلای ئیبنو عەبباس پرسیاری لێ کرد، ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە کە ئیبنو عومەر فەرمووی، کابرا گەڕایەوە بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی عەمرو منیش لەگەڵی بووم، فتواکەی ئیبنو عەبباسیشی بۆ گێڕایەوە، پاشان کابرا بە عەبدوڵڵای گوت: ئەدی جەنابت لەم بارەیەوە چی دەڵێی؟ وتی: کاکە قسەی منیش قسەی ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباسە.[1]

لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: کە پیاوێك خۆی‌و ژنەکەی ئیحرامیان بەعەمرە بەست: ژنەکە هەموو ئەرکەکانی عەمرەی جێبەجێ کرد جگە لەموو کورتکردنەوە، پێش ئەوەی موو کورت بکاتەوە، مێردەکەی سواری بوو، لەم بارەوە پرسیار لەئیبنو عەبباس کرا، فەرمووی: دیارە خانم زۆر تامەزرۆ بووە رانەوەستاوە مووەکانی کورت بکاتەوە پیاوەکەی سواری خۆی کردووە، بە ئیبنو عەبباسیان گوت: قوربان ژنەکە گوێی لێیە، ئیبنو عەبباس بەخۆیدا شکایەوەو فەرمووی: بۆچی پێتان نەگوتم کە ئافرەتەکە نزیکەو گوێی لەم قسانەیە؟ ئەمجار بەژنەکەی فەرموو ئاژەڵێك سەرببڕە، ئافرەتەکە وتی چی سەرببڕم؟ فەرمووی: حوشترێك یان

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٣٤)، هق (٥/١٦٧).

ڕەشـەوڵاخێك یـان مـەڕێك، ئافرەتەكـە گـوتی: كامیـان باشـترە؟ فـەرمووی: حوشترێك باشترە.[1]

جا كەسێك حوشتر یان مەڕی چنگ نەكەوت، پێویستە لەسـەری سێ ڕۆژ لەحـەج و حـەوت ڕۆژیـش كـە گەڕایـەوە بـەڕۆژو بـێ، چـونكە پـەروەردگار دەفەرموێ: {فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ – البقرة/١٩٦}.

واباشە بەڕۆژو بوونەكەی پێش ڕۆژی عەرەفە بێ، خۆ ئەگەر وای نەكرد، ئەوە بۆی ڕەوایە ڕۆژانی (أيـام التـشريق) بـەڕۆژو بێ، ئامـاژە بەقـەولی ئیبنـو عومەرو خاتو عائیشە (ڕەزای خودایان لێ بێ) كە فەرموویانە: ڕێگـە نـەدراوە لە ڕۆژانی (تەشریق)دا بەڕۆژو بن، مەگەر بۆ كەسێك ئاژەڵی دەست نەكـەوێ بیكاتە هەدیو سەری ببڕێ.[2]

* **هۆشـدارییەک**: پێویـستە ئـەوە بزانـدرێ، كـە ئـافرەتیش لـەم بـارەوە هەمان حوكمی پیـاوی هەیـە، وەلێ ئەوەنـدە ئەگـەر ئافرەتەكە بـەزۆر سواری بـوون و جیماعیـان لەگـەڵ كـرد حەجەكـەی بـەتاڵ نابێتـەوەو ئـاژەڵ سەربڕینیـشی لەسـەر نیـە، بەپێـچەوانەی مێردەكـەی كـە بـەزۆر ئـەو كـارەی لەگەڵ كردووە ئەوە حەجەكەشی بەتاڵەو ئاژەڵ سەربڕینیشی لەسەرە.[3]

لە سەعیدی كوڕی جوبـەیرەوە ڕیوایـەتكراوە، دەفـەرموێ: پیاوێـك هاتـە لای ئیبنو عەبباس و وتی: لەگەڵ ژنەكەمدا توشی دەست تێكەڵاو كـردن بـووم پێش ئەوەی زیارەت بكەم، لە وەڵامدا فەرمووی: ئەگەر ژنەكە هاوبەش بووبێ ئەوە لەسەر هەر یەكێك لـەئێوە حوشـترێكی سـاغ و بـێ عـەیب واجبـە، ئەگـەر

---

[1] صحيح: (الإرواء/٤/٢٣٣)، هق (٥/١٧٢).

[2] صحيح: (الإرواء/١٠٤٢)، خ (٤/٢٤٢/١٩٩٧).

[3] إرشاد الساري.

ژنەکەت هاوکاری نەکردبێ‌و تۆ بەزۆر سواری بووبی، ئەوە لەسەرت پێویستە حوشترێکی ساغی بێ عەیب سەرببڕی.[1]

## خوێنەکانی حەج

١- یەکەم خوێن ڕشتنی تەمەتتوع‌و قیران. ئەم خوێن ڕشتن‌و ئاژەڵ سەربڕینە ئەوەیە: کە پێویست دەبێ لەسەر ئەو حاجییەی ئیحرامی بەعەمرە بەستبێ‌و دوایی ئیحرام بەحەج ببەستێ، یان ئیحرامی بەحەج‌و عەمرە بەستبێ بەیەکەوە، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ – البقرة/١٩٦}.

٢- خوێنی فیدیە: ئەو خوێن ڕشتن‌و ئاژەڵ سەربڕینەیە: کە پێویستە لەسەر حاجی کە لەبەر نەخۆشی یان نارەحەتبوون بەهۆی ئەسپێ‌و شتی واوە سەری بتاشێ، قورئان دەفەرموێ: {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ – البقرة/١٩٦}.

٣- خوێنی جەزاو قەرەبوو کردنەوە: ئەو خوێن ڕشتن‌و ئاژەڵ سەربڕینەیە: لەسەر ئیحرام بەستوو پێویست دەبێ ئەگەر نێچیرێکی کێوی کوشت. وەلێ نێچیری دەریا هیچ قەرەبوویەکی بۆ ناکرێتەوە.

٤- خوێنی ڕێ لێ گیران‌و پەیدابوونی بەربەست‌و ئاستەنگ کە نەتوانێ کارەکانی حەج بکا، جا بەربەستەکە نەخۆشی بێ یان دوژمن بێ یان شتی تر بێ، قورئان دەفەرموێ: {فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ – البقرة/١٩٦}.

٥- خوێنکردن‌و ئاژەڵ سەربڕین لە ئاکامی ئەوەی حاجی بەئیحرام بەستوویی سەرجێی ژنی خۆی بکا.

---

[1] صحيح: (الإرواء/١٠٤٤)، هق (٥/١٦٨).

## عەمرە

عومرە یەکێکە لەعیبادەتە گەورەکانو گەورەترین هۆکارو وەسیلەیە بۆ لەخودا نزیکبوونەوە، عیبادەتێکە پەروەردگار پایەو پلەی بەندەکانی پێ بەرز دەکاتەوە، تاوانو هەڵەیان پێ لادەباو پاکیان دەکاتەوە. بێگومان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەگوفتارو بە کردار موسوڵمانانی هەڵناون بۆ ئەنجامدانی، فەرموویەتی: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا»[1] عەمرە بۆ عەمرە دەبێتە کەفارەتی تاوانی نێوانیان. هەروەها فەرموویەتی: «تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ وَالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ».[2] بەردەوام بن لەسەر ئەنجامدانی حەجو عەمرە، بێگومان ئەو دوو عیبادەتە هەژاریو تاوان لادەبەنو وەکوو چۆن کورەی ئاگرو موشە دەمە چڵکو ژەنگی ئاسنو زێڕو زیو لادەبەن.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەژیانیدا ئەو عیبادەتەی بەجێ هێناوە هاوەڵانی لەخزمەتیا عەمرەیان کردووە دوای لەدونیا دەرچوونیشی هاوەڵانی بەردەوام بوون لەسەر عەمرە کردنو بەجێ هێنانی.

### ئەرکەکانی عەمرە

١- ئیحرام بەستن واتە نیەتی چوونە ناو عەمرەو دەستکردن بەکارەکانیەتی بە بەرگێکی تایبەتەوە. چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ».[3]

---

[1] متفق علیه: خ (٣/٥٩٧/١٧٧٣)، م (٢/٩٨٣/١٣٤٩)، ت (٢/٢٠٦/٩٣٧)، ن (٥/١٥)، جه (٢/٩٦٤/٢٨٨٨).

[2] صحیح: (ص. ج/٢٨٩٩)، ت (٢/١٥٣/٨٠٧)، ن (٥/١١٥).

[3] متفق علیه: خ (لە باسی دەستنوێژدا رابورد).

٢-٣- تـەوافكردن و هاتووچـۆی نێـوان صـەفاو مـەروە، چـونكە قورئـان دەفەرموێ: {وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ – الحج/٢٩} هەروەها دەفەرموێ: {إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ – البقرة/١٥٨}. پێغەمبـەریش (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «اسْعَوْا إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَيْكُمُ السَّعْيَ».[١] هاتوچۆی نێوان گردی صەفاو گـردی مـەروە بكـەن، بێگومـان پـەروەردگار ئـەو كارەی لەسـەر پێویست كردوون.

٤- تاشینی موو یان كورتكردنەوەیان، ئەمەش ئاماژە بەو حەدیثەی ئیبنو عومەر ریوایەتی كردووە، دەفەرموێ: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: «مَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَهْدَى فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ ، وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ ، وَلْيُقَصِّرْ ، وَلْيَحْلِلْ».[٢] كەسێك ئـاژەڵی قوربـانی لەگـەڵ خـۆی نـەهێناوە، بـا تـەوافی كەعبـە بكـاو سـەعیی نێـوان صەفاو مـەروە ئـەنجام بـداو مـوی سـەری كـورت بكاتەوەو ئیحرام بشكێنێ.

### كارە پێویستەكانی عەمرە

پێویـستە لەسـەر كەسـێك نیـازی عـەمرەی هەیـە، كـە لـەمیقات ئیحـرام بەعەمرە ببەستێ، ئەگەر دانیـشتووی شـوێنێك بـێ پـێش میقـات بـێ، ئەگـەر دانیشتووی ئەودیو میقات بـێ، ئـەوە لـە مـەنزڵی خۆیـەوە ئیحـرام دەبەسـتێ، ئەمما كەسێك دانیشتووی مەككە بێ، ئەوە پێویستە لەسەری بێتـە دەرەوە بۆ

---

[١] صحیح: (لەوەپێش لەباسی روكنەكانی حەجدا ئاماژەی پێ كرا).

[٢] متفق علیه: خ (١٦٩١/٣/٥٣٩)، م (١٢٢٧/٩٠١/٢)، د (١٧٨٨/٢٣٧/٥)، ن (٥/١٥١).

دەرەوەی بەستو لەوێوە ئیحرام ببەستێ، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە عائیشە کرد کە لە (التنعیم) ئیحرام ببەستێ.[1]

### کاتی عەمرە کردن

هەموو ڕۆژانی ساڵ کاتی عەمرە کردنە، بەڵام ئەنجامدانی لەمانگی ڕەمەزاندا خێری زیاترە، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً».[2] عەمرەیەك لەڕەمەزاندا بکرێ خێری حەجێکی سوونەتی هەیە.

### دروستە پێش بەجێ هێنانی فەرزی حەج عەمرە بکرێ

لە عیکریمەی کوڕی خالیدەوە ریوایەتکراوە، کەپرسیاری لەئیبنو عومەر کردووە (خودایان لێ ڕازی بێ) دەربارەی ئەنجامدانی عەمرە پێش حەج، لە وەڵامدا فەرمووی: هیچ خراپەیەکی تێدا نیە.

عیکریمە دەفەرموێ: ئیبنو عومەر فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێش ئەوەی حەج بکا عەمرەی بەجێ هێناوە.

### دووبارە کردنەوەی عومرە لەیەك سەفەردا

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چوار عەمرەی کردوون لەچوار ساڵدا، لەهیچ سەفەرێکیدا لەعەمرەیەك زیاتری نەکردووە، هەروا ئەو هاوەڵانەی لەخزمەتیشیدا بوون لەعەمرەیەك زیاتریان ئەنجام نەداوە، لەهیچ ڕێگایەکەوە بەئێمە نەگەیشتووە کە یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر (درودی

---

[1] متفق علیە: خ (٣/٦٠٦/١٧٨٤)، م (٢/٨٨٠/١٢١٢)، د (٥/٤٧٤/١٩٧٩)، ت (٢/٢٠٦/٩٣٨)، جە (٢/٩٩٧/٢٩٩٩).

[2] صحیح: (ص. ج/٤٠٩٧)، ت (٢/٢٠٨/٩٤٣)، جە (٢/٩٩٦/٢٩٩٣).

خودای لەسەر بێ) لە سەفەرێکیدا دووجار عومرەی کردبێ. نەبیستراوە چ لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) یان دوای لەدونیا دەرچوونی یەکێك لەهاوەڵان لەسەفەرێکیدا دوو عەمرەی بەجێ هێنا بێ، جگە لەخاتو عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) لەو حەجەیدا، کە لەتەك پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە (عبدالرحمن)ی کوڕی ئەبو بەکر کرد: کە لەگەڵی بچێ بۆ (التنعیم)و لەوێوە ئیحرام بە عەمرە ببەستێ، چونکە خاتو عائیشە پێی وابوو ئەو عومرەیەی لەتەك حەجەکەیدا ئەنجامی دابوو پوچ بۆتەوە، دەستی کرد بەگریان، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئیزنیدا عومرەیەکی تر بکا بۆ دڵنیایی ئەو.

ئەم عومرەیەی خاتو عائیشە کردی تایبەت بووە بە ئەوەوە بەس. چونکە نەبیستراوە لەهیچ کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) - بەئافرەتو پیاویانەوە – کەدوای حەج چووبێ لە (التنعیم) ئیحرامی بەعەمرە بەستبێ، وەکوو ئەوەی خاتو عائیشە پەیڕەوی کرد، خۆ ئەگەر هاوەڵان بیانزانیایە ئەوەی خاتو عائیشە کردی بۆ ئەوانیش دروستە دوای حەجەکەیان بچن لە (التنعیم) ئیحرام بەعەمرە ببەستن، بە بەرفراوانی لێیانەوە نەقڵ دەکراو مەشهور دەبوو.

ئیمامی شەوکانی دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) قەت نەبووە لەناو بەستی مەککەوە بێتەدەر بۆ خاریجی حەرەمو سەرلەنوێئیحرام بەعەمرە ببەستێو دەست بکا بە ئەنجامدانی کارەکانی عومرە. وەکوو ئەوەی ئەمڕۆ هەندێ خەڵك دەیکەن، هەروا کاری لەوجۆرە لەهیچ یەکێ لەهاوەڵان ریوایەت نەکراوە، هەروا لەهاوەڵانەوە (رەزای خودایان لێ بێ) نەبیستراوەو نەچەسپاوە کە لەدوای تەواوکردنی حەج عومرەیان دووبارە کردبێتەوە، ثابیت نەبووە لەهاوەڵانەوە (رەزای خودایان لێ بێ) لەماوەی هەموو ساڵەکەدا

عومرەیان دووبارە کردبێتەوە، ئەوان تاك تاكو کۆمەڵ کۆمەڵ ساڵانە رویان لە مەککە کردووە بەنیازی ئەنجامدانی عومرە، ئەوان ئەوەیان دەزانی: کە عومرە بریتیە لە زیارەتو دیدەنی بە مەبەستی تەوافی کەعبەو هاتووچۆی نێوان صەفاو مەروە، ئەوەشیان دەزانی: کە تەوافی کەعبەو سوڕانەوە بەدەوریدا گەورەترە لەهاتووچۆی نێوان صەفاو مەروە، جا لەجیاتی ئەوەی خۆیان خەریك بکەن بە چوونە دەر بۆ (التنعیم)و خەریکبوون بە ئەنجامدانی دووبارەکردنەوەی عومرەیەکی تر، دەیانزانی کەباشتر وایە تەوافی کەعبە بکەن، ئاشکراشە ئەو کاتەی عومرەکار صەرفی دەکا بۆ دووبارە کردنەوەی عومرە: کەبریتیە لەچوونەدەر بۆ (التنعیم) بۆ ئیحرام بەستن بەنیەتی عومرەیەکی تر دەتوانێ لەو ماوەیەدا سەدان جار بەدەوری کەعبەدا بسوڕێتەوەو تەوافی بکا.

ئیمامی طاوس دەفەرموێ: ئەوانەی لە (التنعیم)ەوە ئیحرام دەبەستن نازانم ئاخۆ لەپای ئەو ماندو بوونەیان پاداش وەردەگرن یان عەزاب دەدرێن!! عەرزیانکرد قوربان! عەزاب دەدرێن؟ فەرمووی: بەڵێ چونکە ئەو کەسەی وادەکا ناچێ لەجیاتی ئەوەی چوار میل ڕێگا ببڕێ بۆ چوونو چوار میل بۆ هاتنەوە، خەریکی تەوافی کەعبە بێ کە دەتوانێ لەو ماوەیەدا دووسەدجار تەوافی کەعبە بکاو بەدەوریدا بسوڕێتەوە، ئاشکراشە کابرا تەواف بکا خێری زیاترە لەوەی بەبێ هودە ڕێگایەکی دورو درێژ ببڕێ!!

فتوادانو قەول بەوەی دووبارە کردنەوەی عومرە نامەشروعەو شەرع پەسەندی ناکا شتێکە سوننەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە کردار دەیگەیەنێو هەروا کردەوەی هاوەڵانی، واتە: دووبارە کردنەوەی عومرە نە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی کردوویەتی، نە هاوەڵانی، بێگومان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردووین:

کەئێمە شوێن سوننەتی خۆی‌و ڕێبازی هاوەڵانی دوای خۆی بکەوین، ئەوەتا دەفەرموێ: «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ من بعدى، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ». لەسەر ڕێبازو سوننەتی من بڕۆن‌و دوای لەدونیا دەرچوونیشم پەیڕەوی ڕێبازی جێنشین‌و هاوەڵانم بکەن‌و بە ددانەکانتان ئەو ڕێبازە بگرن‌و لەو ڕێگە ڕاستە شەقامەڕێیە لامەدەن.

## دیدەنیکردنی شاری مەدینەی مونەوەرە
## ڕێزو قەدری مەدینە

لە جابیری کوڕی سەمورەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: بیستم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: « إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى سَمَّى الْمَدِينَةَ طَابَةَ».[1] پەروەردگار مەدینەی ناوناوە (طابة) پاك‌و پیرۆز.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (إِنَّ الْمَدِينَةَ كَالْكِيرِ تُخْرِجُ الْخَبِيثَ. لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَنْفِيَ الْمَدِينَةُ شِرَارَهَا كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ».[2] مەدینە وەکوو کورە ئاگر وایە چڵك‌و پیسی دادەماڵێ، قیامەت ڕانابێ هەتا شاری مەدینە پیاوخراپ‌و شەڕەنگێزەکانی وەدەرنەنێ، وەکوو چۆن کورەی ئاسنگەر چڵك‌و پیسی ئاسن ڕادەماڵێ.

## ڕێزو فەضلی مزگەوتی مەدینەو نوێژکردن تێیدا

لە ئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەك ریوایەتکراوە لە پێغەمبەرەوە ڕاستەوخۆ بیستراوە کە فەرموویەتی: حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَبْدِ

---

[1] صحيح: (ص. ج/١٧٧٥)، م (٢/١٠٠٧/١٣٨٥).

[2] صحيح: (مختصر مسلم/٧٨٢)، م (٢/١٠٠٥/١٣٨١).

الْمَلِكِ سَمِعْتُ قَزَعَةَ مَوْلَى زِيَادٍ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ – رضى الله عنه – يُحَدِّثُ بِأَرْبَعٍ عَنِ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – فَأَعْجَبْنَنِي وَآنَقْنَنِي قَالَ «لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ مَسْجِدِى هذا مَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَسْجِدِ الأَقْصَى ».[1]

باروبارگنه ناپێچرێن‌و سەفەرو ماندوبوونی ڕێگا ناخرێتە ئەستۆ مەگەر بۆ دیدەنی سێ مزگەوت نەبێ. مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینە، مزگەوتی کەعبە، مزگەوتی قودس.

هەر لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِي غَيْرِهِ مِنَ الْمَسَاجِدِ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ».[2] ئەنجامدانی نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا خێری زیاترە لەهەزار نوێژ لەمزگەوتێکی تردا بکرێ جگە لەمزگەوتی حەرام.

لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدەوە ریوایەتکراوە، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ».[3] نێوانی ماڵەکەم‌و مینبەرەکەم باغێکە لەباغەکانی بەهەشت.

## ئاداب‌و ڕێ‌و شوێنی زیارەتی مزگەوت‌و گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)

بێگومان ئەو ڕێزو قەدرەی تایبەتە بەمزگەوتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە مەدینەو مزگەوتی حەرام لەمەککەو مزگەوتی قودس ڕێزو نرخێکە پەروەردگار داویەتی بەو سێ مزگەوتە پیرۆزە، خێرو

---

[1] متفق عليه: خ (٣/٦٣/١١٨٩)، م (٢/١٠١٤/١٣٩٧)، د (٦/١٥/٢٠١٧)، ن (٢/٣٧).

[2] متفق عليه: خ (٣/٦٣/١١٩٠)، م (٢/١٠١٢/١٣٩٤)، ت (١/٢٠٤/٣٢٤)، ن (٢/٣٥).

[3] متفق عليه: خ (٣/٦٣/١١٩٠)، م (٢/١٠١٢/١٣٩٤)، ت (١/٢٠٤/٣٢٤)، ن (٢/٣٥).

بەرەکەتو گەورەیی نوێژ تێداکردنیانو زێدە فەضلیان بەسەر مزگەوتەکانی تردا، پەروەردگار چەسپاندویەتی.

جا کەسێك زیارەتی ئەم مزگەوتانە بکا، ئەوە بەتەمای ئەو ئەوابو بەرەکەتە زیارەتیان دەکاو وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەداتەوە کە موسوڵمانانی هەڵناوە سەفەر بکەنو باروبارگەنە بپێچنەوە بۆ چون بۆ زیارەتیان.

دیدەنی کردنی ئەم مزگەوتانە هیچ ئادابو ڕێو ڕەسمێکی تایبەتییان نیە: کە جیایان بکاتەوە لەمزگەوتی تر، تەنها ئەوەندە هەیە، هەندێ کەس لەخۆیانەوە ئادابو ڕێو ڕەسمی تایبەتیان بۆ مزگەوتی مەدینە دیاری کردووە، ئەمەشیان کە کردووە بەهۆی ئەوەوەیە کە گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەوتۆتە ناو مزگەوتەکەوە.

جا بۆ ئەوەی کە موسوڵمان بزانێ کە چووە مەدینە چۆن زیارەتی ئەو مزگەوتە پیرۆزە دەکا هەندێ ڕێنموی زیارەتکردنەکەی بۆ دیاری دەکەین.

١- کەچووە ژورەوە دەبێ قاچی ڕاستی پێش بخاو ئەمجار بڵێ: « اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلِّمَ، اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِك». یان بڵێ: « أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ».[1]

٢- ئەمجار دوو ڕکات نوێژی (تحية المسجد) بکا پێش ئەوەی دابنیشێ.

٣- نابێ بەهیچ شێوەیەك لەکاتی نوێژکردنیدا ڕوبکاتە گۆڕی پیرۆزی، هەروا کە دوعاو پاڕانەوە دەکا نابێ ڕوبکاتە گۆڕەکە.

٤- ئەمجار بڕوا بۆلای گۆڕی پیرۆزیو سەلام لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بکا، دەست بەسنگی خۆیەوە نەگرێ، سەری نزم نەکاتەوە، خۆ

[1] لەوەپێش لەباسی چوونە ناو مزگەوتدا تێپەڕی.

بپـارێزێ لـه خـشوعو ملکەچـکردنێك کەهـەر شايـستەی خودايـەو بـەس. خۆبپارێزێ لەوەی هاوار لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بكا، هـاوارو ئيـستيغاثە هـەر ئاڕاسـتەی پـەروەردگار دەكـرێ، بـا موسـوڵمان كـە دەچـێ بـۆ زيـارەتی گـۆڕی پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) سـڵاوی لێ بكـاو بـەو وشەو ڕستانەی كە كاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) بـەكاری دەهێنـان بـۆ سـڵاوكردن لـەو هاوەڵانـەی لەگۆڕسـتانی (البقيـع)دا نێـژ رابـوون، بێگومـان چـەند شـێوە سـڵاو دوعايـەك لـە پێغەمبـەرەوە ريوايـەتكراون‌و صەحيحن، يەكێ لەو شێوانە: «السَّلاَمُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُـسْلِمِينَ وَيَرْحَمُ اللَّهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُـسْتَأْخِرِينَ وَإِنَّـا إِنْ شَـاءَ اللَّـهُ بِكُـمْ لَلاَحِقُـونَ». [1] سڵاوی خودا لەسەر مردوانی موسوڵمانی ئەم دەڤەرە، خودا ڕەحم بەوانـە بكـا كەپێش ئێمە وەغريان كردووە ئەوانەی لەوەدوا پێيان دەگەن‌و دەچـنە ڕيـزی كاروانی ئەوانەوە، ئێمەيش هەركاتێ خودا ويستی بەتەئكيـد پێتـان دەگـەين‌و دەبينە ڕێڕەوی كاروانی ئێوە، ئەمجار سڵاو لـە حـەزرەتی ئەبوبـەكرو عومـەر دەكا وەكوو چۆن سڵاوی لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كرد.

٥- لـە ئـادابی زيـارەت نيـە كـە لەمزگـەوتی پێغەمبـەردا يـان لای گـۆڕی پيرۆزی دەنـگ بەرز بكاتەوە، با دوعـاو پاڕانەوەكـە بـەدەنگی نـزم بـێ، چـونكە ئەدەب لەگەڵ پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەحاڵی ژيانيـدا چـەند پێويستە، لەحاڵی دوای مردنيشيدا ئەوەندە پێويستە.

٦- باهەوڵ بدا لەنوێژی بەجەماعەتـدا لـەڕيزەكانی پێـشەوە بـێ، چـونكە خێرو بەرەكەتی زۆری تێدايە، پاداشی گەورەی هەيە.

---

[1] لە باسی (موسوڵمان چی دەڵێ كە بەلای گۆڕستاندا تێپەڕی) ئەم فەرموودەيە تەخريج كراوە.

٧- با سوربوونی لەسەرئەوە نوێژ لەرەوضەی پیرۆزدا بکا، هەڵی نەنیٚو وای لیٚ نەکا لەریزەکانی پیٚشەوە دوابکەویٚ، چونکە نوێژکردن لە رەوضەی پیرۆزدا چ زێدە فەضلیکی نیە بەسەر بەشەکانی تری مزگەوتەکەدا.

٨- هیچ سوننەت نیە: کە بابای موسوڵمان سوربیٚ لەسەر ئەوەی چل نوێژ لەسەریەك لەمزگەوتی مەدینەدا بکا، چونکە ئەمە پشت دەبەستیٚ بە حەدیثیکی زەعیفو ناراست کە لەسەر دەمو زوبانی خەڵکی بڵاوەو گوایە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) فەرموویەتی: «مَنْ صَلَّى فِي مَسْجِدِي أَرْبَعِينَ صَلَاةً لاَ يَفُوتُهُ صَلاَةٌ كُتِبَتْ لَهُ بَرَاءَةٌ مِنَ النَّارِ وَنَجَاةٌ مِنَ الْعَذَابِ وَبَرِئَ مِنَ النِّفَاقِ». [1]

٩- هەروا رەوا نیە، کە زۆرو زوزوو زیارەتی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) بکا بە مەبەستی سڵاو لیٚ کردنی، چونکە سەلام کردن لە پێغەمبەر لەهەر جێگایەکەوە بیٚ – بازۆر دوریش بیٚ – پیٚی دەگا. ئەتۆ لەوپەڕی جیهانەوە سڵاوی لیٚ بکەی یان لە بەردەم گۆڕەکەیەوە لەخێرو ئەوابدا چونیەکن.

١٠- کە لەمزگەوت هاتە دەر، با پاشەوپاش نەکشێتەوە، بەڵکوو بە ئاسایی بێتەدەرو قاچی چەپی پێش بخاو ئەم دوعایە بخوێنیٚ: «اللَّهُمَّ صلى على محمد، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ». [2]

---

[1] ئەم دەقە ئەلبانی بەزەعیفی داناوەو لەزنجیرەی حەدیثە زەعیفەکاندا تۆماری کردووەو دەڵیٚ: أخرجه أحمد٣/١٥٥ والطبراني في المعجم الأوسط ١/١٢٥/٢........

[2] لە باسی (مايقول عند دخول المسجد).

## مزگەوتی قوبا

سوننەتە بۆ کەسێك دەچێتە مەدینە زیارەتی مزگەوتی قوبا بکاو نوێژی تێدا بکا، وەکوو پەیڕەوکردنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەسواریو بەپیادەیی زیارەتی ئەم مزگەوتەی کردووە، ڕۆژانی شەممە دەچوو دوو ڕکات نوێژی تێدا دەکرد.[1]

دەشی فەرموو: «مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ أَتَى مَسْجِدَ قُبَاءٍ فَصَلَّى فِيهِ صَلاَةً كَانَ لَهُ كَأَجْرِ عُمْرَةٍ».[2] کەسێك لەماڵەوە دەستنوێژ بگرێو پاشان بچێتە مزگەوتی قوبا نوێژی تێدا بکا، خێری ئەو نوێژە بە ئەندازەی عومرەیەکە.

## بەقیعو ئوحود

بەقیع گۆڕستانی موسوڵمانانە لەمەدینە، ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵان تێیدا نێژراون، هەتا ئەمڕۆش موسوڵمانی تێدا بەخاك دەسپێردرێن. زۆر لە موسوڵمانانی جیهان دێنە مەدینە تەماعی ئەوەیان هەیە لەوێ بمرنو لە گۆڕستانی بەقیعدا بنێژرێن.

«أُحُدٌ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ».[3] ئوحود کێوێکە خۆشی دەوێین، خۆشمان دەوێ. کێوی ئوحود کێوێکە لەباوەشیدا حەفتاو ئەوەندە شەهیدی لەهاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تێدا نێژراوە، کەهەموویان لەشەڕی بەناوبانگی ئوحوددا شەهید بوونو هەرلەوێش نێژراون.

جا ئەگەر کەسێك ویستی بچێتە مەدینە، دیدەنی گۆڕستانی بەقیعو شەهیدانی ئوحود بکا چ خراپەیەکی تێدا نیە، چونکە پێغەمبەر (درودی

---

[1] متفق علیه: خ (١١٩٣، ١١٩٤/٦٩/٣)، م (١٣٩٩/١٠١٦/٢)، د (٢٠٢٤/٢٥/٦)، ت (٣٧/٢).

[2] صحیح: (ص. جه/١١٦٠)، جه (١٤١٢/٤٥٣/١).

[3] متفق علیه: خ (٤٠٨٣/٣٧٧/٧)، م (١٣٩٣/١٠١١/٢).

خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لەدیدەنی گۆڕستان، پاشان ڕێگەیدا دیدەنی گۆڕستان بکرێ، چونکە ڕۆژی قیامەت دەخاتە بیرو هۆشی دیدەنیکارەکان، پەند وەردەگرن لەسەرەنجامی ئەوانەی لەوشارە خامۆشەدا نێژراون، وەلێ پێویستە زۆر حەزەر بکرێو دیدەنیکاران خۆ لەوە بپارێزن تەبەروك بەگۆڕەکان بکەن، یان هاوارو نزا لەو مردوانە بکەن کە تێیاندا نێژراون، بیانکەنە شەفاعەتخوازو وەسیلەو هۆکار بۆلای خوداو وابزانن ئەو مردوانە کاریگەریان هەیە لای خودا!!

ڕەوا نیە بۆ کەسێك سەردانی کێوی ئوحود دەکا: کە هەوڵ بدا خۆ بکوتێ بۆ دامێنی کێوەکە بەو نیازە لەو شوێنەی کاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لێ کردووە، نوێژی لێ بکا، یان بەنیازی تەبەروك بەکێوی ئوحوددا هەلگەڕێ، یان سەربکەوێ بۆسەر کێوی تیرهاوێژەکان بەنیازی شوێن پێ هەلگرتنی هاوەلانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم جۆرە شتانە لەچوارچێوەی ئیسلامدا جێگایان نابێتەوە، دوعاکردن بۆ شەهیدانی ئوحود سوننەت نیەو کارێکی پەسەندیش نیە، بەلکوو لەو کارانەیە کە شەرع نەهی لێ کردووە، هەر لەم بارەیەوە ئیمامی عومەر دەفەرموێ:«إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بتتبعهم آثار أَنْبِيَائِهِمْ».
ئەو گەلو نەتەوانەی پێش ئێوە کە بەهیلاك چوون هۆیەکەی ئەوەبوو زۆر ئاثارو جێگەو ڕێگەی پێغەمبەرانی خۆیان ڕەچاو کردووەو سەرەنجی شوێنی تێدا ژیانیانو مەنزڵو کەلو پەلیان داون زێدەڕۆییان تێدا کردووەو خۆیان بەفتارە داوە، زیاد لەپێویستو واجب تەتەببوعیان کردوون، دەی با ئەم فەرموودەی ئیمامی عومەر بۆ ئێمە ببێتە جێگای قەناعەتو بتمانەو خالی وەرچەرخانو لێکترازان لەگەڵ شتی بیدعەو تازە قەللا.

## زیارەتگاکانی مەدینە

لە مەدینەی مونەوەرەدا چەند شوێنێك هەن بەزیارەتگاو مەزار ناسراون وەکوو (المساجد السبعة) کەنزیکی شوێنی غەزای خەندەقن. مزگەوتی دوو قیبلەو برێ بیری ئاو، مزگەوتی (الغمامة) هەروا ئەو مزگەوتانەی بەناوی ئەبوبەکرو عومەرو خاتو عائیشەوە ناونراون. هەموو ئەم شوێنانە مەزاری مەشروع نینو دیدەنیکار وانەزانێ بەزیارەت کردنیان خێرو ئەوابی بۆ دەنوسرێ، چونکە شوێن پێ هەلگرتنی پێغەمبەرانو پیاوچاکانو تەتەببوعی ئاثارو مەنزڵو شوێنی دانیشتنو خەوتنو ئەم جۆرە شتانەیان لە رابوردودا بوونە هۆکاری فەوتانو تێداچوونی گەلو نەتەوەکان، ڕەوا نیە بۆ موسوڵمانان کەپێچەوانەی هەدیو ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانی بجوڵێنەوە، چونکە خێرو فەڕ لەپەیڕەوی کردنی هەدیی پێغەمبەرو هاوەڵانیدایە، شەڕو نەگبەتی ئەوەیە ئێمە لەهەدیو ڕێبازی ئەوو هاوەڵانی لابدەین.

## دوو هۆشیارکردنەوەی گرنگ

یەکەم: زۆر لەحاجییەکان سورن لەسەر ئەوە کە ماوەی مانەوەیان لەمەدینە زۆرتر بێ لەو ماوەیەی لەمەککە دەمێننەوە، لەکاتێکدا نوێژێك لە (مسجدالحرام)دا خێری سەد هەزار نوێژی هەیە کە لەشوێنێکی تر بکرێ، نوێژێك لەمزگەوتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە بکرێ خێری هەزار نوێژی هەیە کە لەشوێنێکی تردا بکرێ، دەی جوداوازی گەورەو بەرفراوان لەنێوان نوێژکردن لە (مسجدالحرام)و مزگەوتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەبوایە حاجییەکانی هەڵبنایە بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن مانەوەیان لەمەککەدا درێژخایەن تر بێ لەمانەوەی لەمەدینە.

دووەم: زۆرێك لەحاجییەکان وادەزانن: زیارەتی مزگەوتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە بەشێکە لەمەناسیکی حەج، بۆیە

ئەوەندە سورن لەسەر چون بۆ مەدینەو زیارەتکردنی مزگەوتو گۆڕی پیرۆز! تەنانەت پێیان وایە ئەگەر یەکێك حەج بکاو نەچێتە مەدینە حەجەکەی ناتەواوە!! لەم بارەیەوە چەند حەدیسێکی هەڵبەستراو ریوایەت دەکەن و پشتیان پێ دەبەستن وەکوو حەدیثی (من حج فلم یزرنی فقد جفانی) لەکاتێکدا شتەکە پێچەوانەیەو گومانیان نەی پێکاوە زیارەتی مزگەوتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سوننەتێکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆی دیاری کردووین بۆ ئەوەی بچین و نوێژی تێدا بکەین، وەلێ هیچ پەیوەندییەك نیە لەنێوان زیارەتی مزگەوتی مەدینەو حەجدا، کەسێکیش بچێ حەج بکاو نەچێتە مەدینە حەجەکەی تەواوەو هیچ کەموکوڕی تێدا نابێ. چونکە زیارەتی مزگەوتی مەدینە بەشێك نیە لە مەناسیکی حەج، بەڵکوو زیارەتی مزگەوتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی سوننەتێکی سەربەخۆیە.....

## باسی هاوسەرگیری (کتاب النکاح)

هاوسەرگیری و ژنهێنان لەهەرە سوننەتە جەخت لەسەر کراوەکانی پێغەمبەرانە، پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً – الرعد/٣٨}: بێگومان ئێمە لەپێش تۆدا ئەی محمد! چەند پێغەمبەرمان رەوانە کردوون، بەخشیومانە پێیان هاوسەرو منداڵ و نەوە.

ژن نەهێنان و شونەکردن بەبێ عوزر مەکروهو ناباشە، ئەمەش بەگوێرەی حەدیثی ئەنەسی کوڕی مالیك کە دەڵێ: سێ تاقم هاتن بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پرسیاریان لە خێزانەکانی کرد دەربارەی چۆنیەتی و چەندیەتی خوداپەرستی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەبۆیان باس کردن – وەکوو ئەوە بەلایانەوە کەم بێ –

وتیان: جا ئێمە لەکوێو پێغەمبەری خودا لەکوێ؟ ئەو خودا لەگوناهی ڕابردوو داهاتووی خۆش بووە – لە فەرزێکدا ئەگەر هەیبێ – جا یەکێکیان وتی: بەڵام من ئیتر لەمە بەولاوە شەو تابەیانی نوێژ دەکەم، ئەویتریان وتی: منیش سەرلەبەر ڕۆژگار بەرۆژو دەبمو هەرگیز ڕۆژو ناشکێنم، سێیەمیان وتی: منیش ناچمە لای ئافرەتو خۆم لە ئافرەت گۆشەگیر دەکەمو هەرگیز ژن ناهێنم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە لایانو فەرمووی: «أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي». [1] ئەوە ئێوە واوواتان گوتووە؟ دەسا بەخودا من لەهەمووتان پتر لەخودا دەترسمو خۆم دەپارێزم لەبێ ئەمری ئەو، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژی وا هەیە بەرۆژومو ڕۆژی وایش هەیە بەرۆژو نیم، شەو کاتی وا هەیە خەریکی شەونوێژمو کاتی وایش هەیە دەخەوم، ژنیش مارە دەکەمو کاری شەرعیشی لەگەڵ ئەنجام دەدەم، جا کەسێك لەسوننەتو ڕێبازی من لادا ئەوە لە ئوممەتی من نیە.

ژنهێنان واجبە لەسەر کەسێك تواناى ژنهێنانی هەبێو ترسی ئەوەشی هەبێ ئەگەر ژن نەهێنێ توشی داوێن پیسی بێ، چونکە زینا حەرامە، هەروا هەرشتێك سەربکێشێ بۆ ئەو کارە حەرامو نەشیاوەو ڕێخۆشکەر بێ بۆی حەرامە. جا کەسێك ترسی ئەوەی هەبوو بکەوێتە ناو ئەم تاوانە پێویستە لەسەری ئەم جۆرە تاوانە لەخۆی لابدا. ئەگەر تاقە ڕێگای خۆپاراستن لەوتاوانە ژن هێنان بوو پێویستە لەسەری ژن بهێنێ. [2]

---

[1] متفق عليه: خ وهذا لفظه (٩/١٠٤/٥٠٦٣)، م (٢/١٠٢٠/١٤٠١)، ن (٦/٦٠).

[2] السيل الجرار ج٢/٢٤٣.

کەسێك حەزی لە ژن هێنان بوو بەڵام توانای ماڵی نەبوو، یان ژنی دەست نەدەکەوت پێویستە بۆ دامرکاندنەوەی حەزو شەهوەتی بەرۆژو بێ.
ئاماژە بەحەدیثی ئیبنو مەسعود دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێمانی فەرموو: « يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ ». ئەی کۆمەڵی گەنج هەرکەسێ لەئێوە توانای ژنهێنانی هەیە با ژن مارە بکا، ژن بێنێ چونکە بێگومان ژنهێنان چاو لەدەرەوەیی ناهێڵێ‌و شەرمگا لەشەڕو پیسی دەپارێزێ، کەسێك نەیتوانی ژن بهێنێ با بەرۆژو بێ، بێگومان رۆژو ئارەزووی دادەمرکێنێ‌و خەسێنەرە.

### چ جۆرە ژنێك باشە بیخوازی‌و هاوسەرگیری لەگەڵدا گرێ بدەی؟

کەسێك ویستی ژن بهێنێ با چاو ورد کاتەوە بڕوانێ چ ئافرەتێك ئەم ڕەوشتە پەسەندانەی تێدان.

١- یەکەم: خاوەن ئایین بێ، چونکە ئەبو هورەیرە فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا ، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ». ژن لەبەر چوار ڕەوشت‌و هۆکار مارە دەکرێ: لەبەر دەوڵەمەندی‌و سامانداریەتی، لەبەر حەسەب‌و بنەماڵەی، لەبەر شۆخ‌و شەنگی‌و جوانی، لەبەر دینداری. ئەتۆ ئافرەتی ئایندار هەڵبژێرە گرەوی خۆتت بردۆتەوە.

٢- ئەو ئافرەتەی دەیخوازی کچ بێ. مەگەر بەرژەوەندیەك هەبێ لەمارەکردنی بێوەژندا، ئەمەیش بەگوێرەی حەدیثی جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، کە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ)

ئافرەتێکم مارە کرد، ڕۆژێك توشی پێغەمبەر بووم فەرمووی: « يَا جَابِرُ تَزَوَّجْتَ» قُلْتُ نَعَمْ. قَالَ « بِكْرٌ أَمْ ثَيِّبٌ»؟ ئەی جابیر ژنت هێناوە؟ وتم بەڵێ: کچ بوو یان بێوەژن بوو؟ وتم: بێوەژن بوو، فەرمووی: « فَهَلاَّ بِكْرًا تُلاَعِبُهَا »؟ ئەی بۆ کچت نەهێنا دەست بازیت لەگەڵ بکردایە؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من کۆمەڵێك خوشکم هەبوون من بەرپرسیار بووم لێیان، ترسام ئەگەر کچ مارەبکەم وام لێ بکا لەخوشکەکانم دام ببڕێ، فەرمووی: «فَذَاكَ إِذًا. إِنَّ الْمَرْأَةَ تُنْكَحُ عَلَى دِينِهَا وَمَالِهَا وَجَمَالِهَا فَعَلَيْكَ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ». کەوابێ باشت کردووە، بێگومان ئافرەت مارە دەکرێ لەبەر ئایینداری یان لەبەر ماڵو سامانی یان جوانی، ئەتۆ ئافرەتی خاوەن دین هەڵبژێرە سەرکەوتوو دەبی.

٣- وا باشە ئافرەتی وا مارە بکەی، منداڵبوونی لێ چاوەڕوان بکرێ:

ئەمەش بەگوێرەی حەدیثی ئەنەس کە لە پێغەمبەرەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ».[1] ئافرەتی وا مارەبکەن خۆشەویست بن لاتانو لێیان چاوەڕوان بکرێ منداڵیان ببێ، چونکە من ڕۆژی قیامەت شانازی بەژمارە زۆری ئێوەوە دەکەم بەسەرگەلو نەتەوەکانی تردا.

## ج پیاوێك باشە ئافرەت شوی پێ بکا

لەکاتێکدا پێویستە پیاو چاو ورد بکاتەوە بۆ دۆزینەوەی ئافرەتی گونجاوو خاوەن ڕەوشت بەو شێوەی باسمان لێوە کرد، ئەوە پێویستە لەسەر وەلی ئافرەت چاو وردبکاتەوەو هەوڵبدا پیاوێکی شیاو بۆ هاوسەرگیری ئافرەتەکە بدۆزێتەوە، پیاوێك بێ خاوەن ڕەوشتی بەرزو هاوشانو صاڵح.

---

[1] صحيح: (ص. ج/٢٩٤٠)، (الإرواء/١٧٨٤)، د (٦/٤٧/٢٠٣٥)، ن (٦/٦٥).

ئەمەیش بەپێی حەدیثی ئەبو حاتەمی (المزنی) کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ إِلاَّ تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ».[1] ئەگەر هاتە خوازبێنی ئافرەتی ئێوە پیاوێك لەئایینو رەوشتی ڕازی بوون، ئەوە بەپیر داخوازییەکەوە بچنو ئافرەتی خۆتانی لێ مارە بکەن، ئەگەر وانەکەن فیتنەو ئاشوب لەسەر زەوی بەرپا دەبێو فەسادو گەندەڵی بەناو وڵاتو ئوممەتدا بڵاو دەبێتەوە.

هیچ خراپیو نەنگی تێدا نیە کە مرۆڤ کچی خۆی یان خوشکی پێشنیار بکا بۆ کەسانێك کە ئەهلی خێرو صەلاحن بەمەبەستی دامەزراندنی کچەکەی یان خوشکەکەی، ئەمەش ئاماژە بەو فەرموودەیەی ئیبنو عومەر گێڕاویەتەوە، دەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب لەوکاتەدا کەخاتو حەفصەی کچی بێوەژن بوو، چونکە خونەیسی کوڕی حوذافەی (السهمي) کەمێردی بوو یەکێك بوو لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە وەفاتی کرد. جا عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی: چوومە لای عوسمانی کوڕی عەففان، پێشنیاری ئەوەم بۆ کرد، حەفصە مارە بکا، وتی بیری لێ دەکەمەوە بزانم چۆنم بۆ دەگونجێ، چەند شەوێکی بەسەردا ڕۆیی، پاشان توشم بوو، وتی: وام بۆ دەرکەوتووە لەم ڕۆژگارەمدا ژن نەهێنم، حەزرەتی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) وتی: توشی حەزرەتی ئەبو بەکر بووم پێم گوت: ئەگەر بتەوێ ژن بهێنی حەفصەت لێ مارە دەکەم، ئەبو بەکر بێ دەنگ بوو (نەبە ئا نەبە نا) وەڵامی نەدامەوە، بەمەش ڕقم زیاتر لە ئەو هەڵسا تا عوسمان، چەند شەوێك ئاوا بە چاوەڕوانی مامەوە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خوازبێنی کردو لێم مارە کرد، دوایی تووشی حەزرەتی ئەبوبەکر بوومەوە، فەرمووی: پێدەچێ ڕقت لێم هەڵسابێ بەهۆی ئەوەی

---

[1] صحيح: (ص. ت/٨٦٦)، ت (١٠٩١/٢٧٤/٢).

پێشنیاری ئەوەت بۆ کردم خاتو حەفصەی کچت مارە بکەم من بێدەنگیم لێ کردو هیچ وەڵام نەدایەوە، عومەر دەڵێ: وتم بەڵێ ڕقم لێت هەڵسا. حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی: هیچ شتێك نەبوو بە لەمپەڕ کە وەڵامت بدەمەوە دەربارەی پێشنیارەکەت، جگە لەوەی ئەمن زانیبووم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو بارەیەوە قسەی کردبوو، ئیتر من نەمویست نهێنییەکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاشکرا بکەم، خۆ ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو بڕیارەی وازی بهێنایە ئەمن پێشنیارەکەتم قبوڵ دەکرد.[1]

### تەماشاکردنی ئافرەتێك کە بەنیازی خوازبێنی بکەی

کەسێك نیازی بوو ئافرەتێك خوازبێنی بکا، بۆی ڕەوایە پێش خوازبێنی تەماشای بکاو سەرنجی بداتێ، ئەمەش بەگوێرەی حەدیثی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە کە ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: خوازبێنی ئافرەتێکم کرد، ئیتر خۆم لێ مەڵاس دەدا بۆئەوەی سەیری بکەم، هەتا ڕۆژێك بۆم هەڵکەوت لەپەنا درەختی خورماوە تەماشام کردو تێر لێم ڕوانی پێی گوترا: ئەتۆ چۆن لای خۆت هاوەڵی پێغەمبەریو شتی وا دەکەی؟ وتی: من لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: « إِذَا أَلْقَى اللَّهُ فِي قَلْبِ أمرئ خِطْبَةَ امْرَأَةٍ فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَيْهَا».[2] هەرکاتێ خودا خستیە دڵی مرۆڤێکەوە کە خوازبێنی ئافرەتێك بکا، چ خراپیەکی تێدانیە کە سەیری بکاو لێی وردبێتەوە.

لە (المغيرة)ی کوڕی شوعبە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی ئافرەتێکم بۆکرد کە نیازم هەیە

---

[1] صحيح: (ص. ن/٣٠٤٧)، خ (٩/١٧٥/٥١٢٢)، ن (٦/٧٧).

[2] صحيح: (ص.جة/١٥١٠)، جة(١/٥٩٩/١٨٦٤).

بیخوازم، فەرمووی: « اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا ». بڕۆ سەیری بکە، چونکە تەماشاکردنی باشترە بۆئەوەی پەیوەندی نێوانتان بەردەوامو پایەداربێ.[١]

## خوازبێنی

خوازبێنی: بریتییە لەوەی داوا بکرێت لە ئافرەتێك رازی بێ بۆ هاوسەرگیری بە دابو نەریتی خۆیو وەکوو لەناو کۆمەڵگادا باوە، جا ئەگەر رەزامەندی نیشان درا ئەوە تەنها وادە دانە بە هاوسەرگیری، دروست نیە بۆ خوازبێنی کەر هیچ شتێك لەگەڵ ئەو ئافرەتە بکا، بەڵکوو بەبێگانە دەژمێردرێ بۆی هەیە گرێ بەستی مارەیی لەگەڵدا ئەنجام نەدا.

دروست نیە بۆ موسوڵمان: کە خوازبێنی لەسەر خوازبێنی برای موسوڵمانی بکا، ئاماژە بە فەرموودەی ئیبنو عومەر (رەزای خودا لە خۆیو لە باوکی) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەوەکرد: کە هەندێك لەئێوە سەودا لەسەر سەودای هەندێکتان دا بکەن. نابێ پیاو خوازبێنی بەسەر خوازبێنی برای موسوڵمانیدا بکا، هەتا دڵنیا دەبێ لەوەی خوازبێنی کەری پێش خۆی وازی هێناوە، یان خوازبێنیکەر ئیزنی دەدا، دەڵێ: بچۆ خوازبێنی بکە.[٢]

هەروەها دروست نیە بۆ پیاو خوازبێنی ئافرەتێك بکا لە عیددەی تەڵاقی ریجعیدا بێ، چونکە لەروانگەی شەرعەوە ئەو ئافرەتە لە حوکمی ژنی خاوەن مێرددایە، هەروەکوو بۆی رەوا نیە بە صەراحەت خوازبێنی ئافرەتێك بکا لە عیددەی تەڵاقی (بائن)دا بێ، یان لە عیددەی مێرد مردنی دابێ، بەڵام

---

[١] صحیح: (ص.ت/٨٦٨) ، ن(٦/٦٩) وهذا لفظه، ت(٢/٢٧٥/١٠٩٣) لەلای ئەم (فانه أخرى)یە.

[٢] صحیح: (ص.ن/٣٠٣٧) ، خ(٩/١٩٨/٥١٤٢)، ن(٦/٧٣).

ئەگەر بە درکەو کینایە لەبەری رابھاویٚ ئەو چ خراپیەکی تیٚدا نیە، ئەمەش بەگویٚرەی فەرموودەی پەروەردگار، کە دەفەرمویٚ: {وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاء أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَكِن لاَّ تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلاَّ أَن تَقُولُواْ قَوْلاً مَّعْرُوفًا وَلاَ تَعْزِمُواْ عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىَ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ – البقرة/٢٣٥}. چ خراپیەك لەسەر ئیٚوە نیە ئەگەر بەکینایەو ناراستەوخۆ پیٚشنیاری خوازبیٚنی ئافرەتی تەلاّقدراو بەشیٚوەیەك: کە ریٚگای ریجعەی نەمابیٚ، هەروا میٚرد مردوو بکەن، یان لەدلّی خۆتاندا بەتەمای خوازبیٚنی کردنی بن دوای تەواوبوونی عیددەکەی.

## گریٚبەستی مارەبرِین

مارەکردن دوو روکنی سەرەکی هەن ئەوانیش ئیجابو قبولّن مەرجە بۆئەوەی نیکاح صەحیح بیٚ

١- سەرپەرشتیار (ولی)ی ئافرەتەکە رزای بیٚو ئیزنی مارەکردنەکە بدا، قورئان دەفەرمویٚ: {فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ – النساء/٢٥ }. ئافرەت مارەبکەن بە رەزامەندی وەلیو سەرپەرشتیارەکانیان.

لەخاتو عائیشەوە هاتووە فەرموویەتی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: « أَيُّمَا امْرَأَةٍ لَمْ يُنْكِحْهَا الْوَلِيُّ فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ فَإِنْ أَصَابَهَا فَلَهَا مَهْرُهَا بِمَا أَصَابَ مِنْهَا فَإِنِ اشْتَجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لاَ وَلِيَّ لَهُ».[1] هەر ئافرەتیٚك وەلیو سەرپەرشتیارەکەی سەرپەرشتی مارەکردنەکەی نەکا نیکاحەکەی بەتالّە، مارەکردنەکەی پووچە، نیکاحەکەی دانامەزریٚ ئەگەر لە ئاکامی ئەو مارەکردنە بەتالّەدا پیاوەکە چووە لای

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٥٢٤) ، جة(١٨٧٩/١/٦٠٥)، وهذا لفظه د(٢٠٦٩/٦/٩٨)، ت(١١٠٨/٢٨٠/٢).

ئافرەتەکە ئەوە مارەیی خۆی دەکەوێ بەهۆی ئەو چوونە لایە، ئەگەر ناکۆکی کەوتە ناویانەوە، ئەوە سوڵتان وەلی و سەرپەرشتیاری هەرکەسێکە کە وەلی و سەرپەرشتیاری نەبێ.

٢- ئامادەبوونی شایەت: لەخاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ». نیکاح دانامەزرێ مەگەر بە ئامادەبوونی وەلی و دوو شایەتی عادڵ.[1]

### پێویستە پێش مارەبڕین ئیزن لە ئافرەت وەربگیرێ

ئەگەر مارەبڕین بەبێ ئامادەبوون و ڕەزامەندی وەلی دانەمەزرێ، ئەوە پێویستە لەسەر وەلی پێش ئەنجامدانی گرێبەستەکە، ئیزن و ڕەزامەندی ئەو ئافرەتە وەربگرێ کە مارەی دەبڕێ. هەروا بۆ وەلی و سەرپەرشتیار دروست نیە بە زۆرە ملێ ئافرەتەکە ملکەچی مارەکردن بکا، بەبێ ڕازی بوونی خۆی مارەی بکا لەکەسێك کە ئەم نایەوێ ببێتە هاوسەری. ئەگەر بەبێ ڕازیبوونی ئافرەتەکە، وەلییەکە مارەی کرد ئەوە ئافرەتەکە دەتوانێ گرێبەستەکە فەسخ بکاتەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « لاَ تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ وَلاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ»: بێوەژن مارەنابڕدرێ تا بۆخۆی فەرمان نەکاو بڕیارنەدا، کچیش مارەناکرێ تا ئیزنی لێ وەرنەگیرێ، هاوەڵان عەرزیان کرد چۆن چۆنی ئیزن بدا؟ فەرمووی: « أَنْ تَسْكُتَ». ئیزن دانەکەی بێدەنگییەتی.

---

[1] صحيح: (ص.ج/٧٥٥٧) ، هق(٧/١٢٥)، حب(١٢٤٧/٣٠٥).

له خەنسائی کچی خوددامی (الأنصارية) گێڕدراوەتەوە: کە باوکی ئەوی بە بێوەژنی لە پیاوێك مارەکردوە، پێی ناخۆش بووە، هاتووە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شکایەتی کردوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نیکاحەکەی ڕەتکردەوە.[1]

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە: کچێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شکایەتی ئەوەی کرد باوکی لە پیاوێکی مارەکردوەو پیاوەکەی بەدڵ نیە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرپشکی کرد لەنێوان ئەوەدا ڕازی بێو گرێبەستەکە درێژە پێ بدا یان نیکاحەکە هەڵبوەشێنێتەوە...[2]

## وتاری مارەبڕین

سوننەتە پێش مارەبڕین وتارێك بدرێ کە بە (خطبة الحاجة) ناوزەد کراوە دەقەکەشی بەم جۆرەیە: «إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ – آل عمران/١٠٢}. {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا – النساء/١}. {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ

---

[1] متفق عليه: خ(٥١٣٦/١٩١/٩)، م(١٤١٩/١٠٣٦/٢)، د(٢٠٧٨/١١٥/٦)، ت(١١١٣/٢٨٦/٢)، جة(١٨٧١/٦٠١/١)، ن(٨٥/٦).

[2] صحيح: (الإرواء/١٨٣٠)، خ(٥١٣٨/١٩٤/٩)، د(٢٠٨٧/١٢٧/٦)، جة(١٨٧٣/٦٠٢/١)، ن(٨٦/٦).

فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا – الأحزاب/٧٠-٧١}. « أما بعدُ: فإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ وَخَيرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ».[1]

## واباشه پیرۆزبایی بکرێ بەبۆنەی مارەبڕینەوە

له ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیرۆزبایی له هاوسەرگیران دەکرد، دەیفەرموو: « بَارَكَ اللَّهُ لَكُم وَبَارَكَ عَلَيْكُم وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ»[2]: خودا لێتان پیرۆز بکا، فەڕو خێر بڕژێنێ بەسەرتاندا لەسەر خێرو خۆشی ژیانی خۆتان بەسەر بەرن.

## مارەیی

قورئان دەفەرموێ: {وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا – النساء/٤}: ئەی ئەو کەسانەی ژن مارە دەکەن! بدەن بە ئافرەتان مارەییەکەیان وەکوو بەخشین‌و شیرینی‌و فەرزو پێویست. جا ئەگەر ئەو ئافرەتانە بە ویستی خۆیان بەشێك لەو مارەییە کە مافی خۆیانە بیدەن بەئێوە، ئەوە بیخۆن‌و نۆشی بکەن بە حەلاڵی. مارەیی مافی ئافرەتە بەسەر پیاوەوە، ئەو مارەییە ماڵێکی حەلاڵی شەخصی ئافرەتەکەیە. بۆ هیچ کەس ڕەوانیە باوکی بێ یان برای بێ یان هەرکەسێکی تر بێ – شتێك لەو مارەییە هەڵبگرێ بۆ خۆی، مەگەر ئافرەتەکە بە ویستی خۆی‌و لەناخی دڵیەوە بەوە ڕازی بێ.

---

[1] لەومپێش لەباسی وتاری ڕۆژی هەینی دا تێپەڕی.

[2] صحيح: (ص.جة/١٥٤٦)، جة(١٩٠٥/٦١٤/١) وهذا لفظه د(٢١١٦/١٦٦/٦)، ت(١٠٩٧/٢٧٦/٢).

شـەریعەت ئەنـدازەی مـارەیی دیـاری نـەكردوەو سـنورێكی بـۆ زۆریو كەمی مارەیی دانەناوە. بەڵام هەمیشە بانگەوازی ئـەوەی كـردوە كـە: مـارەیی كـەم بكەنــەوەو زێـدەڕۆیی تێدانەكـەن، بۆئــەوەی پــڕۆژەی هاوســەرگیری ئاســانكاری تێـدا بكـرێو ئـەركی ئـەو گەنجانــە قـورس نـەكرێ كـە نیـازی ژنهێنانیان هەیەو لێی هەڵنەسڵەمنەوە.

قورئان دەفەرموێ: {وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئًا – النساء/٢٠}. ئەگەر لەبەر هەر هۆیـەك ویـستتان دەستبەرداری ژنێك بنو ژنێكی تر مارەبكەن، مارەییـیەكی زۆرتـان دابـوو بـە یەكێكیان، ئەوە هیچی لێ مەسەننەوەماڵی حەڵاڵی خۆیەتی.

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕیوایەتكراوە: (كە عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف (ڕەزای خودای لێ بێ) هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شوێن زەردییەكی زەعفەرانی بەجەستەوە دیـاربوو، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیاری لێ كرد، ئاخۆ ئەو دیاردەیـە چیە؟ وتـی: قوربـان ئافرەتێكی ئەنصاریم مارەكردووە، فەرمووی: چەندت مـارەیی بـۆ بـرد؟ وتـی: چەند مسقاڵە ئاڵتونێـك. پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: دەعوەتێكیش بكە تەنانەت ئەگەر تەنها بەسەربڕینی مەڕێكیش بێ.[1]

لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: من لەگەڵ كۆمـەڵێك لـە هـاوەڵان لـە خزمــەت پێغەمبــەردا بــووین، ئافرەتێـك هەڵـسا وتـی: ئـەی پێغەمبەری خودا! ئەمن دەمەوێ ببم بە خێزانتو خۆمت پێ ببەخشم، ڕای خۆتم لەمبارەوە پێ بڵێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچ وەڵامـی نەدایـەوە دوایـی دوبـارە هەڵسایەوەو وتـی: ئـەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای

---

[1] متفـــق علیـــه: خ(٥١٥٣/٢٢١/٩)، م(١٤٢٧/١٠٤٢/٢)، د(٢٠٩٥/١٣٩/٦)، ت(١١٠٠/٢٧٧/٢)، جة(١٩٠٧/٦١٥/١)، ن(٦/١١٩).

لەسەر بێ) ئەوە خۆی بەتۆ بەخشیوەو دەیەوێ ببێتە خێزانت رای خۆت بدرکێنە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچ وەڵامی نەدایەوە بۆ جاری سێیەم هەڵسایەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوە خۆی بە تۆ بەخشیوەو دەیەوێ خۆی لەتۆ ماربکا، رای خۆت بفەرموو دەڵێی چی؟ پیاوێك هەڵسایە سەرپێ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەمنی مارە ببڕە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هیچت هەیە بۆی بکەی بەمارەیی؟ وتی: نەخەیر هیچم نیە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « اذْهَبْ فَاطْلُبْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». برۆ شتێك پەیدابکە بیکە بەمارەیی بۆی، تەنانەت ئەگەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ. پیاوەکە رۆیی‌و هەوڵی‌دا هیچی دەست نەکەوت، پاشان هاتەوە وتی: هیچم بۆ هەڵنەسوڕا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چەندت لە قورئان لەبەرە! وتی: فلان سورەت‌و فلان سورەت. فەرمووی: «اذْهَبْ فَقَدْ أَنْكَحْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ». دەی باشە ئەوا لێتم مارەکرد لەسەر ئەو چەند سورەتە قورئانەی لەبەرتە.[1]

دروستە هەموو مارەیی پێش بخرێ، هەروەکوو دروستە هەمووی دوابخرێ، هەروا دروستە هەندێکی حازربێ‌و هەندێکی قەرزبێ. دروستە بیگوێزێتەوەو بچێتە لای با مارەییەکەی تەسلیم نەکردبێ... ئەگەر ناوی مارەیی‌و ئەندازەکەی ناو نەبرابوو، ئەوە مارەیی ئافرەتە هاوشانەکانی خۆی دەکەوێ، ئەگەر مارەیی ناوبرابوو دەبێ ئەوەی بداتێ کە باسکراوە. دەخیلتان بم خۆ لەوە بپارێزن: کە پابەندی ئەو شەرت‌و بەڵێنانە نەبن کە دەیدەن بە ئافرەت. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « أَحَقُّ

---

[1] متفــق عليــه: خ(٥١٤٩/٢٠٥/٩) واللفــظ لــه، م(١٤٢٥/١٠٤٠/٢)، د(٢٠٩٧/١٤٣/٦)، ت(١١٢١/٢٩٠/٢)، جة(١٨٨٩/٦٠٨/١) مختصراً، ن(١٢٣/٦).

مَا أَوْفَيْتُمْ مِنَ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِـهِ الْفُـرُوجَ»[١]: شياوترين ماف؛ كه ئێوه پابەندی بن‌و جێبەجێیان بکەن ئەو مەرج‌و بەڵێنانەن کە بەهۆیەوە ئافرەتتان لەخۆتان حەڵاڵ کردوە.

ئەگەر مێرد مرد دوای گرێبەست‌و پێش چوونە لای، ئەوە ئافرەتەکە مارەیی تەواوی دەکەوێ

لە عەلقەمەوە ڕیوایەتکراوە: مەسەلەیەك هێنرایە لای عەبدوڵڵا دەربارەی ئافرەتێك پیاوێك مارەی کردبوو، پاش مارەکردنەکە پیاوەکە مردبوو، نەمارەیی بۆ دیاریی کردبوو نە چوبووە لای، دەڵێ: کێشەیان تێکەوتبوو، بۆیە هاتبوونە لای عەبدوڵڵا، ئەویش فەرمووی: ئەمن پێم وایە مارەیی هاوشانانی خۆی دەکەوێ‌و میرات دەگرێ‌و پێویستە لەسەری تازیەو عیددە بگرێ، ئیتر مەعقیلی کوڕی سینانی (الأشجعی) شایەتی دا: کە پێغەمبەری خودا دەربارەی بیروەعی کچی واشیق بەم شێوەیە حوکمی کرد.[٢]

## کەی باشە ئافرەت بگوێزرێتەوە؟

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا لەمانگی شەشەڵاندا منی مارەکردو هەر لەمانگی شەوالدا گواستمیەوە، چ ژنێکی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەمن بە بەخت ترە؟!

هەمیشە خاتو عائیشە پێی خۆشبوو ئافرەتەکان لەمانگی شەشەڵاندا بگوێزرێنەوە.[٣]

---

[١] متفق علیه: خ(٩/٢١٧/٥١٥١)، م(٢/١٠٣٥/١٤١٨)، د(٦/١٧٦/٢١٢٥)، جـة(١/٦٢٨/١٩٥٤)، ت(٢/٢٩٨/١١٣٧)، ن(٦/٩٢).

[٢] صحيح: (الإرواء/١٩٣٦)، ت(٢/٣٠٦/١١٥٤)، د(٦/١٤٧/٢١٠٠)، جة(١/٦٠٩/١٨٩١)، ن(٦/١٢٢).

[٣] صحيح: (ص.جة/١٦١٩) ، م(٢/١٠٣٩/١٤٢٣)، ت(٢/٢٧٧/١٠٩٩)، ن(٦/١٣٠)، جة(١/٦٤١/١٩٩٠).

**چی باشە کردنی: کە زاوا چووە لای بوک؟**

واباشە بۆ زاوا کەچووە ژوری بوک بەنەرمو نیانی لەگەڵیدا هەڵسو کەوت بکا، وەکوو ئەوە شتێکی پێشکەش بکا بۆ خواردنەوە، ئەمەش بەپێی حەدیثی ئەسمائی کچی یەزید کە دەگێڕێتەوە، دەڵێ من خاتو عائیشەم کرد بەبوکو رازاندمەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پاشان هاتمە خزمەتی بانگم کرد بێتە ژورەوە تارای لەسەر لابا، ئەوەبوو تەشریفی هاتە ژوورەوەو لە تەنیشتیەوە دانیشت، جامە شیرێکیان بۆ هێناو لێی خواردەوە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دای بەخاتو عائیشە ئەویش شەرمی کردو سەری خۆی داخست، ئەسماء دەفەرموێ: منیش لە عائیشە توڕە بوومو پێم گوت: پیاڵەکە لەدەستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەربگرە؛ دەڵێ: ئیتر پیاڵەکەی وەرگرتو کەمێکی لێ خواردەوە.[1]

وا پێویستە زاوا دەستی بخاتە سەر ناوچاوانی بوکو ناوی خودا بێنێو لەخودا بپاڕێتەوە خێرو فەڕی بەنسیب بکا. وەکوو لە فەرموودەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتووە: کە فەرموویەتی: « إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمُ الْمَرْأَةَ أَوِ اشْتَرَى خادماً فَلْيَأْخُذْ بِنَاصِيَتِهَا وَلْيُسَمِّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَلْيَدْعُ بِالْبَرَكَةِ وَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ »[2]: ئەگەر یەکێ لەئێوە ئافرەتێکی مارەکردو گواستیەوە، یان خزمەتکارێکی کۆیلەی کڕی. با دەست بخاتە سەر ناوچاوانی ناوی خودای بەرزو شکۆمەند بێنێو لەخودا بپاڕێتەوە پێو قەدەمی خێرو فەڕبێ. با بڵێ: خودایە من داوات لێ دەکەم: کە سروشتی ئەمت لەسەر

---

[1] الحمیدی (١/١٧٩/٣٦٧)، حم(٦/٤٣٨ و ٤٥٢و ٤٥٣و ٤٥٨).

[2] حسن (ص.جة/١٥٥٧)، د(٦/١٩٦/٢١٤٦)، جة(١/٦١٧/١٩١٨).

دامەزراندوە پەنا دەگرم لەشەڕو نەگبەتی ئەم ئافرەتەو ئەو شەڕو شومەی لە سروشتی دایە.

وا باشە بۆ بوكو زاوا بەیەكەوە دوو ركات نوێژ بكەن، چونكە ئەوە دابو نەریتی سەلەفی صالح بووەو دوو سەرگوزشتەی تێدا ریوایەتكراوە.

یەكەم: لە ئەبوسەعید مەولای ئەبو ئوسەیدەوە ریوایەتكراوە: دەڵێ: ژنم مارەبڕی لەوكاتەدا كۆیلە بووم، چەند كەسێكم لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەعوەت كرد، ئیبنو مەسعودو ئەبو زەڕوو حوزەیفەیان لەگەڵ بوو، دەڵێ كاتی نوێژ هاتو قامەت كرا، ئەبو زەڕر چووە پێشەوە ببێتە پێشنوێژ، هاوەڵان ئاماژەیان بۆمن كرد ببمە پێشنوێژ، چونكە من ژنم گواستۆتەوەو دەبمە زاوا، ئەبو زەڕ فەرمووی: ئایا وایە! هاوەڵان وتیان: بەڵێ، دەڵێ: ئیتر من پێش كەوتمو پێشنوێژیم بۆ كردن من لەوكاتەدا كۆیلە بووم. ئەمجار هاوەڵان فێریان كردم وتیان: كە دەستگیرانەكەت گواستەوەو هاتە ماڵەوە بۆلات یەكەم شت دووركات نوێژبكە، ئەمجار لەخودا بپاڕێوە خێرو بەرەكەتی زۆرت بداتێ لەوەی هاتۆتە ماڵتو بووە بەهاوسەرت، پەنابگرە بەخودا لەشەڕو شومی، ئەمجار ئیتر خۆتو خێزانی خۆت خەریكی خێری خۆت بە.[1]

دووەم: لە شەقیقەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: پیاوێك هات پێیان دەگوت: (أبو حريز)، وتی: من كچێكم مارەكردووە زۆر گەنجە ترسی ئەوەم هەیە ناخۆشی بوێم. عەبدوڵلا واتە: (ئیبنو مەسعود) فەرمووی: خۆشویستن لەخوداوەیە، ناخۆشویستن لە شەیتانەوەیە دەیەوێ ئەوەی خودا لێی حەڵاڵ كردون دزێوی بكا لەلاتان، جا: كە گواستەوە داوای لێ بكە لەدواتەوە دووركات نوێژ بكا. لە ریوایەتێكی تردا لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە ئەمەی لێ

---

[1] سندە صحیح: (آداب الزمان/٢٢، ئیبنو ئەبی شەیبە (٤/٣١١).

زیادكردووه (أللّهم بارك لي في أهلي، وبارك لهم فِيّ، أللّهم اجمع بيننا ما جمعت بخير، وفرّق بيننا اذا فرّقت الى خير).[١]

پێویسته لەوكاتەدا كە دەیەوێ لەگەڵی جوتبێ، بڵێ «بِسْمِ اللّٰهِ اللّٰهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا»: بەناوی خودا، خودایە شەیتانمان لێ دوور بخەرەوە، شەیتان دووربخەرەوە لەوەی پێمان دەبەخشی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «فَإِنْ قَضَى اللّٰهُ بَيْنَهُمَا وَلَدًا لَمْ يَضُرَّهُ الشَّيْطَانُ أَبَداً». ئەگەر خودا منداڵێك لەنێوانیاندا بخولقێنێ قەت شەیتان زەفەری لێ ناهێنێ.[٢]

دروستە لە هەرلایەكەوەبێ، هێنەكەی ئاراستەی پێشەوەی بكا، لەپێشەوە رابێ یان لەدواوەبێ، هەردەبێ جوتبوونەكە لەپێشەوە ئەنجام بدرێ، پەروەردگار دەفەرموێ: {نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ – البقرة/٢٢٣ }. ژنەكانتان جێگای كشتو كاڵ كردنتانن، بچنە لای ژنەكانتان لەو شوێنەوە كە هیوای منداڵبوونی لێ دەكرێ.

لە جابیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) ریوایەتكراوە، دەڵێ: جولەكەكان دەیانگوت: ئەگەر پیاو لەدواوە بچێتە لای خێزانیو هێنەكەی ئاراستەی پێشەوەی بكا، منداڵی خێلیان لێ دەكەوێتەوە. ئیتر ئایەتی {نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ – البقرة/٢٢٣ }.[٣] نازڵ بوو.

---

[١] سنده صحيح: (آداب الزفاف/٢٢٣)، ئیبنو ئەبی شەیبە (٤/٣١٢).

[٢] متفــــق عليـــــه: خ(٥١٦٥/٢٢٨/٩)، م(١٤٣٤/١٠٥٨/٢)، د(٢١٤٧/١٩٧/٦)، ت(١٠٩٨/٢٧٧/٢)، جة(١٩١٩/٦١٨/١).

[٣] متفق عليه: خ(٤٥٢٨/١٨٩/٨)، م(١٤٣٥/١٠٥٨/٢)، د(٢١٤٩/٢٠٣/٦)، جة(١٩٢٥/٦٢٠/١).

له ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: (ئەم خێڵەی ئەنصاری) بتپەرست بوون، لەگەڵ ئەم خێڵە جولەکەیە بوون کە ئەهلی کیتاب بوون، ئەنصارە بتپەرستەکان ڕێزو نرخێکیان دادەنا بۆ خێڵو هۆزی جولەکە لە زانستو زانیاریدا. لەزۆر شتدا لاسایی جولەکەکانیان دەکردەوەو هەڵسو کەوتی ئەوانیان پەیڕەو دەکرد. دابو نەریتی جولەکەکان وابوو: کە هەر لەسەر لاتەنیشت لەگەڵ ژنەکانیاندا جوتبن. بەمە ئافرەتەکە کەمتر لەشو لاری دەردەکەوت. ئەم خێڵە ئەنصارەش ئەم شێوە هەڵسو کەوتەی جولەکەکانیان وەرگرتبوو.

دابو نەریتی ئەم خێڵە قورەیشییەش وەهابوو ئافرەتیان بەتەواوی بەڕوتی بڵاو دەکردەوەو لەزەتیان لێ دەبینی بەهەموو شێوەیەکو لەهەموو لایەکەوە لەگەڵیان جوت دەبوون، کە موهاجیرەکان هاتنە مەدینە پیاوێکیان ئافرەتێکی ئەنصاری مارەکرد، ویستی بەو شێوە باوەی لەناو قورەیشدا هەبوو لەگەڵی جووت بێ، ئافرەتەکە نەیهێشت وتی: هەردەبێ لەسەر لاتەنیشت بێیتە لام، ئەگینا ناهێڵم. بوو بەکێشەیانو سەرەنجام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەوکێشەی زانی. ئیتر ئایەتی ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ – البقرة/٢٢٣ ﴾. نازڵ بوو، واتە: هیچ مانیعێك نیە لەوەدا لەپاشەوەڕا بچنە لای ژنەکانتان یان لەدواوە یان لەسەر لاتەنیشت یان بەهەر شێوەیەکی تر بێ بەمەرجێ هێنەکە ئاڕاستەی شوێنی منداڵبوون بکرێ.[1]

حەرامە پیاو لەکونی دواوە بچێتە لای خێزانی، ئەمەش بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «مَنْ أَتَى حَائِضًا أَوِ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا أَوْ كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى

---

[1] سنده حسن (آداب الزفاف/٢٨)، د(٢١٥٠/٢٠٤/٦).

مُحَمَّدٍ» [١]: کەسێك لەکاتی بێنوێژیدا چووە لای خێزانی، یان لەکونی دواوە لەگەڵی جوتبوو، یان چووە لای کاهین‌و کوڵەوەنانی‌و بڕوای بەقسەکانی کرد، ئەوە بڕوای نیە بەو ئایینەی هاتۆتە خوار بۆسەر موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ).

پێویستە لەسەر پیاوو ئافرەت نیازیان لە هاوسەرگیری‌و ژن‌و مێردایەتی داوێنپاکی خۆیان بێ، خۆ پارێزییان بێ لەوە بکەونە ناو تاوانەوەو توشی ئەوەبن کە خودا لێی حەرام کردون، ئەوکاتە هەر خۆشی‌و لەززەتێك لەیەکتر ببینن‌و سەرجێیکردنیان بەخێرو حەسەنە بۆ دەنووسرێ. ئاماژە بەو حەدیثەی ئەبو زەڕ ریوایەتی دەکا، دەڵێ: کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پێغەمبەریان گوت: دەوڵەمەندە خودا پێداوەکان هەموو خێرو بێرێکیان بۆ خۆیان برد، وەکوو ئێمە نوێژدەکەن، وەکوو ئێمە ڕۆژوو دەگرن سەرباری ئەوەش زێدەی ماڵی خۆیان دەبەخشن‌و پاداشی باشیان بۆ مسۆگەر دەبێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أَوَلَيْسَ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ مَا تَصَّدَّقُونَ إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً وَكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةً وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةً وَكُلِّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةً وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ»: ئەی ئەوەنیە خودا چەند بوارێکی بۆ ڕەخساندون بۆ ئەوەی خێرتان بەنسیب بێ ئەوەتا بەهەر گوتنی (سبحان الله)یەك خێرێکتان بۆ دەنووسرێ بەهەر (الله أكبر)ێك خێرێکتان بۆ دەنووسرێ بەوتنی (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ) خێرو بۆ دەنووسرێ، بەگوتنی (الحمدلله) خێرو پاداشتان بۆ دەنووسرێ فەرمانکردن بەچاکە خێرو پاداشی هەیە نەی کردن لەخراپە خێرو پاداشی هەیە. یەکێکتان لەگەڵ

---

[١] صحيح: (الإرواء/٢٠٠٦) ، جة(٦٣٩/٢٠٩/١)، ت(١٣٥/٩٠/١)، د(٣٨٨٦/٣٩٨/١٠).

خێزانی خۆیدا جوت دەبێ خێرو پاداشی بۆ دەنووسرێ، هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی ئەگەر یەکێك لەئێمە ئارەزۆی خۆی دابمرکێنێتەوە خێرو پاداشی هەیە؟! فەرمووی: ئەی نابینن ئەگەر شەهوەتی خۆی بخاتە حەرامەوە تاوانباردەبێ؟ ئاشکرایە ئەگەر بیخاتە حەڵاڵەوە پاداشی هەیە![1]

## نان ئامادەکردن بەبۆنەی ژن گواستنەوە واجبە

پێویستە دوای گواستنەوەو چوونە لای بوك. دەعوەتێك ئەنجام بدرێ. ئەمەش بەگوێرەی فەرمانەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): کە ئاڕاستەی (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوفی کرد، وەکوو لەوەپێش ئاماژەی پێ کرا.

هەروا حەدیثی بورەیدەی (ألحصیب): کە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێك عەلی خوازبێنی فاتیمەی کرد، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّـهُ لاَ بُـدَّ لِلْعُـرْسِ مِـنْ وَلِيمَـةٍ»: بێگومان بوك گواستنەوە دەبێ دەعوەتو نانو چێشت دروستکردنی لەگەڵدا بێ.

پێویستە چەند شتێك لەدەعوەتی بووك گواستنەوەدا بەرچاو بگیرێ

یەکەم: دەبێ دوای گواستنەوەی بوك بێو سێ ڕۆژبێ، چونکە ئەوە لە پێغەمبەرەوە نەقڵ کراوە.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) صەفیەی مارەکرد، مارەییەکەی خستە بری ئازادکردنی، سێ ڕۆژیش وەلیمەی نانو چێشتی دەرخواردی خەڵکدا.[2]

---

[1] صحيح: (ص.ج/٢٥٨٨) ، م(١٠٠٦/٦٩٧/٢).

[2] سنده صحيح: (آداب الزفاف/٧٤) اخرجه أبو يعلى بسند حسن وهو في صحيح البخارى بمعناه: (١٥٥٩/٢٢٤/٩).

دووەم: دەبێ مرۆڤی صاڵحو خوداپەرست بانگ بکا بە دەوڵەمەندو هەژارەوە چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِنًا وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ».[١] هەر هاورێیەتی موسوڵمان بکە، جگە لەخاوەن تەقواوو خوداپەرست کەسی تر مەبەرە سەر سفرەو خوانت.

سێیەم: دەبێ مەڕێك سەربڕێ یان زیاترلەوە ئەگەر لەتوانایدا هەبوو، ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئاڕاستەی (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوفی کرد فەرمووی: « أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ »[٢]؛ دەعوەت بکە تەنانەت ئەگەر بەسەربڕینی مەڕێکیش بێ.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: نەم بینیوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەعوەت بکا بۆ هیچ خێزانێکی وەکوو ئەوەی بۆ زەینەبی کرد، ئەوەبوو مەڕێکی سەربڕی.

دەعوەتکردن بەهەر خواردنێك دێتەجێ کە لەبەردەست دابێ. تەنانەت یا گۆشتو شتی واشی تێدا نەبێ، ئاماژە بە حەدیثی ئەنەس: کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنێوان مەدینەو خەیبەردا سێ ڕۆژ مایەوە، لەو ماوەیەدا صەفیەی کچی حوییەی گواستەوە، ئەنەس دەڵێ: من موسوڵمانەکانم بانگ کرد بۆسەر دەعوەتەکەی، خواردنەکە نەنانی تێدا بوو نەگۆشت، فەرمانی کرد کەوڵێکیان ڕاخست، ئیتر خورماو کەشك ڕۆنی لەسەر دانرا، ئەوەبوو دەعوەتو خواردن ئامادەکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)[٣] دروست نیە دەعوەت کردنەکە تایبەت بێ بە دەوڵەمەندەکانەوەو هەژار بانگێشت نەکرێن. چونکە پێغەمبەر (دروودی

---

[١] حسن (ص.ج/٧٣٤١)، د(٤٨١١/١٧٨/١٣)، ت(٢٥٠٦/٣٧/٤).

[٢] سبق في الصداق.

[٣] متفق عليه: خ (٥١٥٩/٢٢٤/٩)، وهذا لفظه، م (١٣٦٥/١٠٤٣/٢)، ن (٦/١٣٤).

خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ يُمْنَعُهَا مَنْ يَأْتِيهَا وَيُدْعَى إِلَيْهَا مَنْ يَأْبَاهَا وَمَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ».[1] خراپترین خواردن سفرەو خوانی ژن گواستنەوەیە: کە ئەوەی دەیەوێ ئامادەی بێ بانگ ناکرێو ئەوەی نایەوێ ئامادەی بێ بانگ دەکرێ کەسێك بانگ بکرێ بۆ داوەتی ژن گواستنەوەو نەچێ ئەوە لەخوداو پێغەمبەری خودا یاخی بووە.

هەرکەسێك بانگ کرا بۆ دەعوەتی ژن گواستنەوە واجبە لەسەری ئامادە بێ، ئاماژە بەفەرموودەی پێشوو هەروا ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: « إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا».[2] ئەگەر یەکێك لەئێوە بانگ کرا بۆ دەعوەتی ژن هێنان با بچێ...

پێویستە ئەگەر بەرۆژوش بێ هەربچێ، ئاماژە بە فەرموودەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی: « إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ فَلْيُجِبْ فَإِنْ كَانَ مُفْطِرًا فَلْيَطْعَمْ وَإِنْ كَانَ صَائِمًا فَلْيُصَلِّ. يَعْنِي الدُّعَاءَ».[3] ئەگەر یەکێ لەئێوە بانگ کرا بۆ خواردن بابچێ ئەگەر بەرۆژوو نەبوو خواردن بخوا، ئەگەر بەرۆژو بوو با دوعاو نزا بکا، دەشتوانێ ئەگەر رۆژوەکەی رۆژوی سوننەت بێ بیشکێنێ، بەتایبەتی ئەگەر خاوەن دەعوەتنامەکە پێکیشی لێ کرد؛ لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: {اذا دعي احدکم الی طعام فَلْيُجِبْ، فان شاء طَعِمَ، وان شاء ترك}.[4]

---

[1] متفق علیه: خ (١٤٣٢/١١٠/١٠٥٥/٢)، خ (٥١٧٧/٢٤٤/٩).

[2] متفق علیه: خ (٥١٧٣/٢٤٠/٩)، م (١٤٢٩/١٠٥٢/٢)، د (٣٧٢٨/٢٠٢/١٠).

[3] صحیح: (ص. ج/٥٣٩)، هق (٧/٢٦٣) وهذا لفظه م (١٤٣١/١٠٥٤/١)، د (٣٧١٩،١٨/٢٠٣/١٠).

[4] صحیح: (الإرواء/١٩٥٥)، م (١٤٣٠/١٠٥٤/٢)، د (٣٧٢٢/٢٠٤/١٠).

سوننەتە بۆ ئەو کەسەی ئامادەی دەعوەتەکەی دەبێ دووشت ڕەچاو بکا

یەکەم: دوای نانخواردن دوعاو نزا بکا بۆ خاوەن دەعوەتەکە بەوشێوەی لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتکراوە، ئەمەش چەند جۆرێکن:

أ- (أللّٰهُمّ اغفر لهم، وأرحمهم، وبارك لهم فيما رزقتهم)[1] خودایە لەم خێزانو ماڵە خۆش ببە، ڕەحمو بەزەیی خۆت برژێنە، فەڕو بەرەکەت بخەرە ناو ڕزقو ڕۆژییان.

ب- «اللّٰهُمَّ أَطْعِمْ مَنْ أَطْعَمَنِي وَأَسْقِ مَنْ أَسْقَانِي».[2] خودایە! خواردنو خۆراك بدە بەوانەی خواردنیان بەمن دا، تێرئاو بکە کەسێك منی تێراوکرد.

ج- «أَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ».[3] پیاوچاکان خواردنی ئێوەیان خوارد، فریشتە داوای ڕەحمەتو بەزەیی بۆکردن ڕۆژووەوانان لەسەر سفرەو خوانی ئێوە ڕۆژویان شکاند.

دووەم: دوعا کردن بۆ مێردو بۆ ژنەکەشی بەخێرو بێرو بەرەکەت.

وەکوو لەوەپێش لەباسی پیرۆزبایی بەبۆنەی ژن مارەکردنەوە تێپەڕی، دروست نیە بچێ بۆ دەعوەتو بانگێشتکردنێك کاروگوفتاری ناشەرعی تێدا بێ، مەگەر بەمەبەستی ئەوە بچێ نارەزایی بەرامبەر دەربڕێو هەوڵی نەهێشتنی بدا، جا ئەگەر بۆی لاچوو مەنعی کرد ئەوە باشە، ئەگینا دەبێ بگەڕێتەوەو نەچێ، لەم بارەوە چەند حەدیسێك هاتووە.

لە ئیمامی عەلیەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: خواردنم دروست کرد، دەعوەتی پێغەمبەرم کرد، تەشریفی هات لەناو ماڵی ئێمە هەندێ وێنەو شتی وای بینی لەسەر قوماشێکی پەردە، یەکسەر گەڕایەوەو دانەنیشت، عەرزم کرد

---

[1] صحيح: (مختصر م/١٣١٦)، م (٣/١٦١٥/٢٠٤٢)، د (١٠/١٩٥/٣٧١١).

[2] صحيح: م (٣/١٦٢٥/٢٠٥٥).

[3] صحيح: (ص. جه/٢٧٠٨)، جه (٢/١١١٤/٣٣٥٩) وأبو يعلى في مسنده (ق/٣١و ١٣٧و ٢/٣٩).

ئـەی پێغەمبـەری خـودا! بـەدایكو باوكمـەوە بـەقوربانت بم، چـی وای كـرد جەنابت بگەڕێیتەوە؟ فەرمووی: «إِنَّ فِي البيت سِتْرًا فِيهِ تَـصَاوِيرُ وَإِنَّ الْمَلاَئِكَـةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ تَـصَاوِيرُ». [١] لەماڵەكەتـدا پەردەیـەكم بینـی وێنـەو صورەتی تێدا بوو، بێگومان فریشتە ناچنە ماڵێكەوە وێنەی تێدا بێ.

لەسـەر ئـەم بنەمایـە سـەلەفی صـاڵح هەڵسوكـەوتیان كـردووە، (رەزای خودایـان لێ بـێ) لـە ئـەبو مەسـعودەوە (عقبـة بـن عمـرو) ریوایـەتكراوە، كەپیاوێك خواردنی بۆ ئامادە كـردو دەعـوەتی كـرد، ئـەبو مەسـعود پرسـیاری كـرد: ئـاخۆ لـەو ماڵـەدا وێنـە هەیـە؟ كـابرا وتـی بـەڵێ، ئـیتر ئـەبو مەسـعود نەچووە ژوورەوە تاكابـرا وێنەكانی شكاندن، پاشان كە دڵنیابوو وێنەكان شـكاون چووە ژوورەوە.

ئیمـامی بوخـاری دەفـەرموێ: [٢] ئیبنـو عومـەر دەعـوەتی ئـەبو ئـەییوبی كرد، ئەبو ئەییوب پەردەیـەكی بـەدیواری ژوورەكـەوە بینـی وێنـەو شـتی وای لەسەر بوو، ئیبنو عومەر فەرمووی: ئافرەت زاڵن بەسـەرمانەوەو رای خۆیـان فەرز كردووە! ئەبو ئەییوب وتی: كەسانێك هەبوون ترسم لێیان هەبوو، بەڵام هەرگیز ترسم لەتۆ نەبوو ئاوا كاری بێ شەرعی قبوڵ بكەی، سوێندم بـەخودا من نانی ئێوە ناخۆم، ئەوەبوو گەڕایەوە.

دروستە رێگە بـدرێ بـە ئـافرەت لەحەفلـەو زەماوەنـدی ژن گواسـتنەوەدا دەف لێ بدەن، گۆرانی وابڵێن، كەوەصفی جوانیو قسەی فیـسقو فجوری تێـدا نەبێ. لەم بارەیەوە چەند حەدیـسێك هـاتووە. وەكوو فـەرموودەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) «أَعْلِنُـوا النِّكَـاحَ». [٣] ژن مـارەبڕین رابگەیـەننو

---

[١] سنده صحيح: (آداب الزفاف/٩٣)، هق (٧/٢٦٨).

[٢] (٩/٢٤٩).

[٣] حسن: (ص. جه/١٥٣٧)، حب (٣١٣/١٢٨٥).

ئاشکرای بکەن، یان ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرمویێ: « فَصْلُ مَا بَيْنَ الْحَلاَلِ وَالْحَرَامِ الدُّفُّ وَالصَّوْتُ فِي النِّكَاحِ».[1] نێوان پەیوەندی حەڵاڵو حەرامی لە نێوان پیاوو ئافرەتدا دەف لێدانو ئاشکراکردنی مارەبڕینو گرێبەستی هاوسەرگیرییە.

لەخالیدی کوڕی ذەکوانەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ڕوبەیعی کچی موعەویذی کوڕی عەفراء گێڕایەوە وتی: لەوکاتەدا منیان مارە بڕیبوو گواستبوویانمەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات لەنزیکەوە دانیشت وەکوو چۆن تۆ ئێستا لەپەنام دانیشتووی، چەند کچۆڵەیەکی ئێمە دەفیان لێ دەداو ئەوانەیان دەلاواندەوە کە لەغەزای بەدردا شەهید بووبوون، هێندەی نەبرد یەکێك لەگۆرانی بێژە کچەکان وتی: ( وَفِينَا نَبِيٌّ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ) پێغەمبەرێکمان لەناودایە دەزانێ بەیانی چی دەبێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « دَعِي هَذِهِ، وَقُولِي بِالَّذِي كُنْتِ تَقُولِينَ».[2] واز لەگوتنی ئەو بێنە، ئەوە بڵێ: کە لەوەپێش دەتگوت.

سوننەتە ئەگەر کچی بەسەر بێوەژن هێنا حەوت شەو لای بمێنێتەوە دوای ئەوە دەست بکا بەخۆ دابەشکردن بەسەریاندا، ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچدا سێ شەو لای دەمێنێتەوە، ئەمجار دەست دەکا بەخۆ دابەشکردن بەسەریاندا. بەم شێوە ئەبو قیلابە لە ئەنەسەوە گێڕاویەتەوە، ئەبو قیلابە وتی: ئەگەر بمەوێ دەتوانم بڵێم: ئەنەس ئەم فەرموودەی بەرزکردۆتەوە بۆسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) واتە (حەدیثی مەرفوعە).[3]

---

[1] حسن: (ص. جه/١٥٣٨)، ن (٦/١٢٧)، جه (١/٦١١/١٨٩٦)، ت (٢/٢٧٥/١٠٩٤).

[2] صحيح: (الزفاف/١٠٨)، خ (٩/٢٠٢/٥١٤٧)، د (١٣/٢٦٤/٤٩٠١)، ت (٢/٢٧٦/١٠٩٦).

[3] متفق عليه: خ (٩/٣١٤/٥٢١٤)، م (٢/١٠٨٤/١٤٦١)، د (٦/١٦٠/٢١١٠)، ت (٢/٣٠٣/١١٤٨).

واجبە لەسەر پیاو هەڵسوکەوتی جوان لەگەڵ خێزانەکەیدا بکا بەوشێوەی خودا بۆی حەڵاڵ کردووە، بەتایبەتی ئەگەر ئافرەتێکی منداڵکاری تازە پێگەیشتوو بوو، لەمبارەیەوە چەند فەرموودەیەك ڕیوایەتکراوە، لەوانە:

أ- فەرموودەی « خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأَهْلِهِ وَأَنَا خَيْرُكُمْ لأَهْلِي».[1] چاکترینتان ئەو کەسەیە بۆ خێزانی باش بێ، من باشترین کەستانم بۆ خێزانم.

ب- « أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ خُلُقًا».[2] تەواوترین موسوڵمانان لەروی ئیمانەوە ئەوانەیانن ڕەوشتیان جوانە، باشترینتان ئەو کەسانەن بۆ خێزانەکانیان باشن.

ج- فەرموودەی «لاَ يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ».[3] با موسوڵمان ڕقی لەخێزانی موسوڵمانی نەبێتەوە، کاتێ ڕەوشتێکی ئەوی نابەدڵ بوو، چونکە ئەگەر ڕەوشتێکی تێدا بێ جێگای گلەیی بێ ڕەوشتێکی تری هەیە جێگای ڕەزامەندییە.

د- ئەو فەرموودەی لەحەجیماڵئاواییدا ئاراستەی موسوڵمانانی کرد کە تییایدا فەرمووی: « أَلاَ وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّمَا هُنَّ عَوَانٌ عِنْدَكُمْ لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئًا غَيْرَ ذَلِكَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ فَإِنْ فَعَلْنَ فَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً أَلاَ إِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقًّا وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ أَلاَّ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ وَلاَ يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ أَلاَ وَحَقُّهُنَّ عَلَيْكُمْ أَنْ

---

[1] صحيح: (ص. ج/٣٢٦٦)، ت (٥/٣٦٩/٣٩٨٥).

[2] صحيح: (ص. ج/٣٢٦٥)، ت (٢/٣١٥/١١٧٢).

[3] صحيح: (ص. جه/٧٧٤١)، م (٢/١٠٩١/١٤٦٩).

تُحْسِنُوا إِلَيْهِنَّ فِي كِسْوَتِهِنَّ وَطَعَامِهِنَّ».[١] ئاگادار ببنەوە ئامۆژگاری یەکتری بەباشی بکەن دەربارەی ئافرەتان، چونکە ئەوان لەژێر دەستی ئێوەدان، کەوتوونە ئامێزی ئێوەوە، جگە لەوە ئێوە هیچ دەسەڵاتێکی ترتان بەسەر ئەوانەوە نیە، لەقسەی ناشیرین‌و هەڵس‌وکەوتی نەشیاو، مەگەر فاحیشەو تاوانێکی ئاشکرایان لێ دەربکەوێ، ئەگەر شتێکی وایان کرد جێگەی نووستنیان لێ جیابکەنەوە، لێیان بدەن بەلێدانی پەروەردە ئامێزو تەمێ کردن ئازاری جەستەیان پێ نەگا، ئەگەر فەرمانبەردارو گوێڕایەڵ بوون ئیتر زۆر زەختیان لێ مەکەن‌و مەیانچەوسێننەوە. ئاگادارین ئێوە بەسەر ژنەکانتانەوە مافتان هەس، ژنەکانیشتان مافیان بەسەر ئێوەوە هەیە، مافی ئێوە بەسەر ژنەکانتانەوە ئەوەیە ڕێگە نەدەن کەسێك ئێوە ناخۆشتان دەوێ بێتەماڵتان، ئاگادارین مافی ئەوان بەسەر ئێوەوە ئەوەیە مامەڵەی چاکەو جوانیان لەگەڵدا بکەن، پۆشاك‌و مەسکەن‌و خۆراکی پێویستیان بۆ دابین بکەن،[٢] پێویستە لەسەر پیاو عەداڵەتکار بێ لەنێوان خێزانەکانیدا لەڕوی خۆراك‌و مەسکەن‌و پۆشاك‌و شەومانەوە لەلایان‌و هەروا لەهەموو شتێکی مادیدا، ئەگەر تەرازوی عەداڵەتکاری بەلای یەکێکیاندا خوار کرد، ئەوە بەرهەڕەشەی توندی پێغەمبەر دەکەوێ، کە دەفەرموێ: « مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ يَمِيلُ مَعَ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَحَدُ شِقَّيْهِ سَاقِطٌ».[٣] هەر پیاوێك دوو ژنی هەبوو لەسەر حیسابی یەکێکیان ستەمی لەوەی تریان دەکرد ڕۆژی قیامەت دێتە مەیدانی حەشر لایەکی خوارە.

---

[١] حسن: (ص. جه/١٥٠١)، ت (٢/٣١٥/١١٧٣).

[٢] حسن: (ص. جه/١٥٠١)، ت (٢/٣١٥/١١٧٣).

[٣] صحيح: (ص. جـه/١٦٠٣)، جـه (١/٦٣٣/١٩٦٩)، وهـذا لفظـه، د (٦/١٧١/٢١١٩)، ت (٢/٣٠٤/١١٥٠)، ن (٧/٦٣).

ئەگەر بەدڵ یەكێكیانی لەوی تر خۆشترویست ئەوە تاوانی لەسەر نیە، چونكە ئەوە كاری دەرونەو دەسەڵاتی بەسەردا نیە. بۆیە قورئان دەفەرموێ: {وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلاَ تَمِيلُواْ كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ – النساء/١٢٩}: چەندێك هەوڵ بدەن لەگەڵ ژنەكانتاندا بۆ جیاوازی رەفتار بكەن ناتوانن. مەبەست بەم عەدالەتو بۆ جیاواز رەفتاركردنە خۆشەویستی دڵە: كە كەس ناتوانێ بەسەریدا زاڵ بێ، هەموو مەیلی خۆتان مەدەن بە یەكێكیان و ئەوی تریان وەلا بنێن و لەخۆتانی دوور بخەنەوە بەجۆریك بیانكەنە هەڵپەسێراوو داماو، واتە: نە تەڵاقدراو بێ بۆخۆی بچێ شوبكاتەوە، نەمێردەكەشی خۆی تێدەگەیەنێ و مافی خۆی دەداتێ.

بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەموو رویەكی مادییەوە عەدالەتی تەواوی لەنێوان خێزانەكانیدا ئەنجام دەداو هیچ جوداوازی نەدەخستە نێوانیانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خاتو عائیشە خۆشەویسترین خێزانی بوو.

لە عەمری كوڕی (العاص)ەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە فەرماندەی سوپای (ذات السلاسل) ناردمی، هاتمە خزمەتی، عەرزم كرد چ كەسێكت لەهەموو خەڵك خۆشتر دەوێ؟ فەرمووی: (عائیشە) وتم: لەپیاواندا كێت لەهەموو كەس خۆش دەوێ، فەرمووی: باش ئەبوبەكر عومەری كوڕی خەطاب، ئەمجار چەند پیاوێكی تری ناو هێنان.[1]

---

[1] صحيح: (ص. ت/٣٠٤٦)، ت (٥/٣٦٤/٣٩٧٢).

**پیاوی ئازاد دەتوانێ چەند ژن بخاتە ژێر نیکاحی خۆی؟**

دروست نیە پیاو لەچوار ژن زیاتری لەژێر نیکاحدا بن، ئەمەیش بەدەقی قورئان، کە دەفەرموێ: {فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ – النساء/٣} واتە: بۆتان ڕەوایە مارە بکەن لەو ژنانەی پێتان دەشێت دوو دوو سێ سێ چوار چوار، واتە: هەر یەکێکتان دەتوانن تا چوار ژن مارە بکەن.

هەروا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی غەیلانی کوڕی سەلەمە کاتێك موسوڵمان بوو، دە ژنی لەژێر نیکاحدا بوو، پێی فەرموو: « أَمْسِكْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا وَفَارِقْ سَائِرَهُنَّ».[1] چواریان بهێڵەوەو لەوانی تریان جیابەرەوە.

هەروا لە قەیسی کوڕی (الحارث)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: موسوڵمان بووم هەشت ژنم هەبوو، هاتمە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو مەوزوعەم بۆ باس کرد فەرمووی: چواریان هەڵبژێرە.

**ئەو ئافرەتانەی مارە کردنیان حەرامە**

قورئان دەفەرموێ: {وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاء سَبِيلاً. حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا. وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللّهِ عَلَيْكُمْ

---

[1] صحيح: (ص. جه/١٥٨٩)، ت (١١٣٨/٢/٢٩٥)، جه (١٩٥٣/١/٦٢٨).

وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَلِكُمْ أَن تَبْتَغُواْ بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ — النساء/٢٢-٢٤}: ئەو ئافرەتانە مەخوازن كە باوكانی ئێوە مارەيان كردوون، واتە باوەژن لێتان ياساغە مارەی بكەن، هەر ئافرەتێك باوك لەخۆی مارە بكا، نەشی گوازێتەوە لەكوڕو نەوەكانی حەرام دەبێ، مەگەر ئەوەی لەسەردەمی نەزانيدا بووبێ، ئەوە گوناهتان ناگاتێ، چونكە تێپەڕيوە، لەناو عەرەبدا وابـاو بوو كەسانێك كە باوكيان دەمرد باوەژنی خۆيان مارە دەكردەوە، بێگومان مارە كردنو سەرجێی كردنی باوەژن كارێكی ناپەسەندو بێزراوەو ڕێبازو دابو نەريتێكی ناشيرينو خراپو بێ ڕەوشتييە.

حەرامە لەسەرتان دايكی خۆتانو دايكی باوكتانو دايكی دايكتان، هەروا حەرامە لێتان كچانتانو خوشكانتان، خوشكی باوكتانو خوشكی دايكتان، برازاو خوشكەزا، ئەو ئافرەتانەی كاتی ساواييتان شيريان پێداون، خوشكی شيريتان، خەسوتان، ئەو كچانەی خۆتان بەخێوتان كردوون، واتە: (زڕكچ = كۆڵەبەسە) كەلەو ژنانە بن ئێوە مارەتان كردبنو چوبنەلايان، خۆ ئەگەر نەتانگواستبنەوەو سەرجێيتان نەكردبوون ئەوە گوناحتان ناگاتێ كچەكەيان بخوازنو مارەيان بكەن، هەروا لێتان حەرامە مارەكردنی ژنی كوڕو كوڕەزاتان ئەگەر بەڕاستی ئەو كوڕانە لەپشتی خۆتان بوون، هەروا لێتان حەرامە لە يەك كاتدا دوو خوشك بكەن بەهاوسەری خۆتان، مەگەر لەرابردودا شتی واتان كردبێ، ئەوە تێپەڕيوەو لەسەرتان ناكەوێ. بێگومان پەروەردگار سەبارەت بەوانە لێبوردەو ميهرەبانە، هەروا ئەو ئافرەتانەشتان لێ حەرامە مارەيان بكەن كەمێرديان هەيەو ئازادن يان كەنيزەن، مەگەر ئەو كەنيزەكانەی لەجەنگدا دەستتان كەوتوونو بوونەتە ملكی خۆتان، ئەمانە ئەگەر مێرديشيان هەبێ حەڵاڵن بۆتان بەمەرجێ دووگيان نەبن.

ئەمە سنورو یاسای خودایە بۆی دیاری کردوون‌و بۆی بڕیار داون. جگە لەو ئافرەتانەی ئاماژەیان پێ کرا، بۆتان حەڵاڵە، کەبەماڵ‌و دارایی خۆتان ئافرەتی تر مارە بکەن، تا چوار، ئەمەیش بەشێوەی داوێن پاکی‌و شەرعیانە نەك بەداوێنپیسی‌و نامەردانە، واتە دەبێ لەمارە کردنیاندا ڕێ‌و شوێنی شەرع بەرچاو بگیرێ، نیکاحێکی شەرعی‌و پەسەند بێ.

پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئەو ئافرەتانەی دیاری کرد کەمارە کردنیان حەرامەو نابێ گرێبەستی هاوسەرگیرییان لەگەڵدا ببەسترێ.

## حەرامی مارەکردنی ئەو ئافرەتانە دوو جۆرن

١- حەرامی هەتا هەتایی: واتە یاساغە ئەو ئافرەتە ببێتە هاوسەری پیاو لەهەموو حاڵێکدا.

٢- حەرامبوونی کاتی: ئەوەیە مەمنوع بێ مارەکردنی ئافرەتەکە مادام حاڵەتێکی تایبەتی دەرحەق بەئافرەتەکە پایەدار بێ، جا ئەگەر حاڵەکە گۆڕا حەرامی‌یەکە نامێنێ‌و مارەکردنی حەڵاڵ دەبێ.

هۆکاری تەحریمی هەتا هەتایی سێ شتن: (نەسەب – خەسوو خەزوری - شیرخواردن).

**یەکەم: ئەو ئافرەتانەی بەهۆی نەسەب‌و نەژادەوە حەرامن ئەمانەن:** (دایك‌و نەنك، کچ‌و کچەزا، کچی کوڕو خوشك، پور بەهەردوو نەوعەکەیەوە، برازا خوشکەزا).

**دووەم: ئەو ئافرەتانەی بەهۆی ژن‌و ژنخوازییەوە حەرامن، ئەمانەن:**

١- خەسو: تەنها بەمارەکردنی کچەکەی خەسو دەبێتە دایك‌و مارەکردنی حەرامە.

٢- كچی ژن كه لەمێردی تری بێ واتە: (كۆڵەبەسە) بەمەرجێك پیاوەكە ئەو ژنەی گواستبێتەوەو چوبێتەلای، بەلاّم ئەگەر وارێكەوت دایكەكەی مارەكرد بەلاّم نەیگواستەوە دەستبەرداری یەكتری بوون بەهەر هۆیەك بێ، ئەوە بۆی حەلاّلە كچی ئەو ژنە واتە: (كۆڵەبەسە)كە مارە بكا، چونكە قورئان دەفەرموێ: {فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ – النساء/٢٣}. ئەگەر ژنتان مارە بڕیو نەچوونەلایو مردن یان تەلاّق لێكی دابڕین بۆتان حەلاّلە كۆڵەبەسەكەی مارە بكەن.

٣- ژنی كوڕ: هەر بەمارەكردنی لەكوڕەكە دەبێتە كچی بابی كوڕەكەو مارەكردنی لە ئەو حەرام دەبێ.

٤- هاوسەری باوك (زڕدایك) هەر بەمارەكردنی لەباوك ئیتر دەبێتە دایكی كوڕەكەو مارەكردنی لەو حەرام دەبێ.

**سێیەم: ئەو ئافرەتانەی بەهۆی شیر پێدانەوە حەرام دەبن:**

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ – النساء/٢٣} حەرامە لێتان ئەو ئافرەتانەی لەكاتی منداڵیتاندا شیریان پێ داون، مەمكی ئەوانتان مژیوە، هەروا خوشكی شیریتان لێ قەدەغەیە مارەیان بكەن.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «الرَّضَاعَةُ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلاَدَةُ».[1] شیرخواردن حەرام دەكا ئەوەی لەدایكبوون حەرامی دەكا، واتە: هەر ئافرەتێك بە لەدایكبوون لێت حەرام بێ بەشیرخواردنیش حەرام دەبێ.

---

[1] متفــق عليـــه: خ (٥٠٩٩/١٣٩/٩)، م (١٤٤٤/١٠٦٨/٢)، ت (١١٥٧/٣٠٧/٢)، د (٢٠٤١/٥٣/٦) ن (٦/٩٩).

جا لەسەر ئەم بناغەو پاسایە دایکی شیردەر حوکمی دایکی حەقیقی هەیە، کەوابوو شیردەر خۆی حەرام دەبێو هەر ئافرەتێکیش لەسەر کوڕ حەرام بێ مارەکردنی بەهۆی دایکی حەقیقی، بەهۆی دایکی شیردەریشەوە حەرام دەبێ. کەوابوو لەسەر شیرەخۆرە حەرامە مارەکردنی:

١- شیردەرەکە.

٢- دایکی شیردەرەکە.

٣- دایکی مێردی شیردەرەکە.

٤- خوشکی شیردەر.

٥- خوشکی مێردی شیردەرەکە.

٦- کچی کوڕی شیردەر کچی شیردەر.

٧- خوشکی شیری.

## شیرخواردنێك کە دەبێتە هۆی حەرام بوونی مارەکردن

لە عائیشەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لاَ تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَالْمَصَّتَانِ».[1] قومێكو دوو قوم حەرامی پەیدا ناکا.

لە ئوممولفەضیلەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لاَ تُحَرِّمُ الرَّضْعَةُ أَوِ الرَّضْعَتَانِ أَوِ الْمَصَّةُ أَوِ الْمَصَّتَانِ».[2] جارێك شیرخواردنو دووجار یان قومێكو دوو قوم حەرامی ناهێنێتەدی.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: (كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآنِ عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ. ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ –

---

[1] صحيح: (ص/١٥٧٧)، (الإرواء/٢١٤٨)، م (١٤٥٠/١٠٧٣/٢)، ت (١١٦٠/٣٠٨/٢)، د (٢٠٤٩/٦٩/٦).

[2] صحيح: (مختصر/٨٧٨)، م (١٤٥١ – ١٠٧٤/٢٠/٢) وهذا لفظه، ن (١٠١/٦).

صلى الله عليه وسلم- وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ).[١] ئەوەی لەقورئان نازڵ بوو بوو دە ژەم شیرخواردنی تەواو دەبوونە هۆی حەرامی، پاشان دە ژەمەکە نەسخ کرانەوە بوون بەپێنج ژەمی تەواو ڕێکوپێك. پێغەمبەری خودا وەفاتی کرد، ئەو پێنج ژەمە لەقورئاندا دەخوێندران مەرجە دەبی شیرخواردنەکە لەماوەی تەمەنی پێش دوو ساڵیدا بێ، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ – البقرة/٢٣٣} واتە: دایکەکان دەتوانن شیر بدەن بەمنداڵەکانیان تا دوو ساڵی تەواو. دەشتوانن پێش تەواوبوونی دوو ساڵەکە بەپێی بەرژەوەندی منداڵەکەو دایکەکە شیرپێدان بەکۆتا بێنن.

لەئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ يُحَرِّمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ إِلاَّ مَا فَتَقَ الأَمْعَاءَ فِي الثَّدْيِ وَكَانَ قَبْلَ الْفِطَامِ».[٢] شیرخواردنی منداڵ نابێتە هۆی حەرامی مەگەر شیرخواردنێك ڕیخۆڵە بکاتەوەو لە مەمکەوە بیمژێو پێش ماوەی لەشیر بڕینەوە بێ کە دوو ساڵی تەواو نەکردبێ.

## ئەو ئافرەتانەی بەشێوەی کاتی مارەکردنیان حەرامە

١- کۆکردنەوەوی دوو خوشك. قورئان دەفەرموێ: {وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ – النساء/٢٣}. حەرامە دوو خوشك لە یەك کاتدا پێکەوە بکەیتە هاوسەری خۆت.

---

[١] صحيح: (مختصر م/٨٧٩)، م (٢/١٠٧٥/١٤٥٢)، د (٦/٦٧/٢٠٤٨)، ت (٢/٣٠٨/١١٦٠)، جه (١/١٢٥/١٩٤٢) بمعناه ن (٦/١٠٠).

[٢] صحيح: (الإرواء/٢١٥٠)، ت (٢/٣١١/١١٦٢).

٢- كۆكردنـەوەی ئـافرەت لەگـەڵ پـوریدا. جا خوشـکی بـاوکی بێـت یـان خوشکی دایکی بێت، ئەمەیش بەپێی حەدیثی ئەبو هورەیرە کە ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا ، وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا».[1]

٣- ژنێك مێردی هەبێ. یان هێشتا عیدەی لەمێردەکەی تەواو نەبوو بوو ئەمەش بەپێی ئایەتی {وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ – النساء/٢٤} واتە: حەرامە لەسەر ئێوە مارەکردنی ژنی مێرد دار. تا لەژێر نیکاحی مێردەکەی دابێو تا لەعیدەی ئەودا بێ. مەگەر ئافرەتی فڕێندراو لە کافران، ئەم ئافرەتانە هەرچەندە مێردی کافریان هەس، وەڵێ بۆ ئەو کەسەی دەیفڕێنێ دوای تەواوبوونی عیدەکەی ڕەوایە بچێتەلایو لەگەڵیدا جوت ببێ، ئەمەش بەپێی حەدیثی ئەبو سەعید: کە ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوپایەکی نارد بۆ ئەوطاس، توشی شەڕکردن بوون لەگەڵ دوژمنداو بەسەریاندا زاڵ بوون، هەندێ ئافرەتیان لێ فڕاندن، هەندێ لەهاوەڵان سڵیان دەکردەوە لەچوونە لای ئەم ئافرەتانە، لەبەر ئەوەی پێش فڕاندنەکەیان مێردی کافریان هەبوون. ئیتر پەروەردگار ئایەتی {وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ – النساء/٢٤} نازڵ کرد واتە: بۆتان حەڵاڵە بچنەلای ئەو ئافرەتانە دوای تێپەڕبوونی عیدەیان.[2]

٤- ئافرەتی تەڵاقدراو بە (سێ بە سێ) هەر ئافرەتێك بەو شێوە تەڵاقدرا دروست نیە بۆ مێردە تەڵاقدراوەکەی مارەی بکاتەوە هەتا شونەکا

---

[1] متفق عليه: خ (٥١٠٩/١٦٠/٩)، م (١٤٠٨/١٠٢٨/٢)، د (٢٠٥٢/٧٢/٦)، ت (١١٣٥/٢٩٧/٢)، جه (١٩٢٩/٦٢١/١). بمعناه، ن (٩٨/٦).

[2] صحيح: (مختصر م/٨٣٧)، م (١٤٥٦/١٠٧٩/٢)، ت (٥٠٠٥/٣٠١/٤)، ن (١١٠/٦)، د (٢١٤١/١٩٠/٦).

بەمێردێکی تر بەنیکاحێکی شەرعی، ئەمجار بەهەر هۆیەك بێ ئەم مێردەی تەڵاقی بداو عیدەی تەواو بێ ئەوکاتە دروستە بۆ مێردی پێشووی مارەی بکاتەوە. چونکە قورئان دەفەرموێ: {فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ – البقرة/٢٣٠} واتە: ئەگەر مێردەکەی سێ بەسێ تەڵاقی دا ئیتر بۆی ڕەوا نیە مارەی بکاتەوە هەتا ئافرەتەکە بەشێوەی شەرعی شوو دەکا بەمێردێکی تر، جا کە ئەم مێردەش بەهۆیەك لەهۆیەکان تەڵاقی دا ئەوکاتە ڕەوایە بۆ مێردی یەکەمی گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجام بدا، ئەگەر هەردووکیان (ژن‌و مێرد) پێیان وابوو دەتوانن پابەندی سنورەکان بن‌و لەفەرمانی خودا دەرناچن.

٥- مارەکردنی ئافرەتی داوێنپیس: حەڵاڵ نیە بۆ پیاو ئافرەتی زیناکار مارە بکا، هەروا حەڵاڵ نیە بۆ ئافرەت شوبکا بەپیاوی زیناکەر، مەگەر هەردووکیان تۆبە بکەن‌و واز لەو کارە قیزەونە بێنن، قورئان دەفەرموێ: {الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ – النور/٣} واتە: پیاوی داوێن پیس هەر ئافرەتی زیناکار مارە دەکا یان ئافرەتی موشریکە دەکاتە هاوسەری خۆی، ئافرەتی زیناکاریش هەر پیاوی داوێن پیس دەیکاتە هاوسەری خۆی، ئەمانە بۆ موسوڵمان حەرامن.

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە ئەویش لەباوکیەوە، لەباپیریەوە ریوایەتکراوە: کە مەرثەدی کوڕی ئەبو مەرثەدی غەنەوی دیلی دەگواستەوەو لەناو مەککەدا، ئاڵ‌و وێری پێوە دەکردن، لەناو مەککەدا، ئافرەتێکی داوێنپیس هەبوو پێی دەگوترا (عناق) دۆست‌و هەواداری عەمر بوو دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتم: ئەی پێغەمبەری

خودا! عەناق مارە بکەم؟ دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێدەنگ بوو وەڵامی پرسیارەکەمی نەدایەوە، ئیتر ئایەتی {وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ – النور/٣} نازڵ بوو، دوایی بانگی کردمو ئایەتەکەی بەسەردا خوێندمەوە، فەرمووی: مارەی مەکە.[١]

## مارەبڕینە گەندەڵەکان (الأنكحة الفاسدة)

١- نیکاحی شیغار: (ژن بەژن) ئەوەیە پیاو کچی یان خوشکی یان ئافرەتێکی تر لەوانەی کە دەسەڵاتو ویلایەتی بەسەریاندا هەیە مارە بکا لەپیاوێك بەو مەرجەی کچی یان خوشکی یان کچی خوشکی یان ئافرەتێکی تر لەوانەی دەسەڵاتی بەسەریاندا هەیە مارە بکا لەکوڕی یان لەبرای یان لەخۆی.

ئەم جۆرە گرێبەستە بەو شێوە گەندەڵو دانەمەزراوو نادروستە. جا لەگرێبەستەکەدا ناوی مارەیی هاتبێ یان نا. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەم جۆرە عەقدانە کردووەو هەڕەشەی توندی لە ئەنجامدەرانی کردووە. قورئانیش دەفەرموێ: {وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا – الحشر/٧} واتە: ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانتان پێ دەکا وەری بگرنو کاری پێ بکەن، ئەوەی نەهیتان لێ دەکا، خۆتانی لێ بپارێزن.

لە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمدا فەرموودەیەك ڕیوایەتکراوە، لەئیبنو عومەرەوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لە ژن بەژن کردووە[٢] لەصەحیحی موسلیمدا لە ئەبو هورەیرەوە

---

[١] حسن الإسناد (ص. ن/٣٠٢٧)، د (٢/٤٨/٢٠٣٧)، ن (٦/٦٦)، ت (٥/١٠/٣٢٢٧).

[٢] متفق عليه: خ (٩/١٦٢/٥١١٢)، م (٢/١٠٣٤/١٤١٥)، ن (٦/١١٢).

ڕیوایەتکراوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەشیغار کردووە، نیکاحی شیغار ئەوەیە: پیاو بەپیاو بڵێ: (زَوِّجْنِي ابْنَتَكَ وَأُزَوِّجُكَ ابْنَتِي أَوْ زَوِّجْنِي أُخْتَكَ وَأُزَوِّجُكَ أُخْتِي).[1] کچەکەتم لێ مارە بکە منیش لە بارتەقای ئەوەدا کچەکەمت لێ مارە دەکەم، یان خوشکەکەتم لێ مارە بکە، منیش لەبەرامبەر ئەوەدا خوشکەکەمت لێ مارە دەکەم.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ شِغَارَ فِي الإِسْلاَمِ».[2] ژن بەژن لەئایینی ئیسلامدا نیە.

ئەم فەرموودە صەحیحانە هەموویان ئەوە دەچەسپێنن: کە نیکاحی شیغار (ژن بەژن) حەرامەو گرێبەستەکەی گەندەڵەو پێچەوانەی بنەماکانی شەریعەتی پەروەردگارە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە نەهی لەم جۆرە عەقدە کردووە جوداوازی نەخستۆتە نێوان ئەوەی ناوی مارەیی تێدا هاتبێ یان ناوی هیچ نەبرابێ.

ئەو دەستەواژەیەی لەحەدیثی ئیبنو عومەردا هاتووە دەربارەی پێناسەی (الشغار) ژن بەژن. کە دەڵێ: بریتییە لەوەی پیاو کچی خۆی لەپیاوێك مارە بکا بەمەرجی ئەوەی ئەویش کچی خۆی لەو مارە بکاو مارەیی لەنێوانیاندا نەبێ. ئەهلی عیلم فەرموویانە: ئەم تەفسیرو شیکردنەوەیە قسەی (نافیعە) کەراوی حەدیثەکەیە لە ئیبنو عومەرەوە، فەرموودەی پێغەمبەر نیە (دروودی خودای لەسەر بێ) بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەکوو لەحەدیثی ئەبو هورەیرەدا ڕیوایەتکراوە، (نیکاحی شیغاری) تەفسیر

[1] صحيح: (مختصر م/٨٠٨)، م (١٤١٦/١٠٣٥/٢).

[2] صحيح: (ص. ج/٧٥٠١)، م (١٤١٥ – ٦٠/١٠٣٥/٢).

کردۆتەوە بەوشێوەی لەوەپێش ئاماژەی پێ کرا، کە فەرمووی: (هُوَ أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ أَوْ أُخْتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ الآخَرُ ابْنَتَهُ أَوْ أُخْتَهُ). دەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم تەفسیرکردنەدا باسی ئەوەی نەفەرمووە مارەیی ناوی هاتبێ یان نەهاتبێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەناوبردنی مارەیی یان ناو نەهێنانی هیچ کاریگەرییەکی ئەرێنیو نەرێنی نیە بەسەر گرێبەستەکەوە. بەڵکوو ئەوەی داخوازی گەندەڵی لێ فەهم دەکرێ هۆکارە بۆ نادروستی گرێبەستەکە، پێك گۆڕینەوەی ئافرەتەکانە، ئەمەیش فەسادو گەندەڵییەکی گەورەو زیانبەخشە، چونکە سەردەکێشێ بۆ ئەوەی ئافرەت بەنابەدڵ بەشووبدرێو لەپیاوێك مارە بکرێ: کەخۆشی ناوێ، مافی پێشێل بکرێو بەرژەوەندی سەرپەشتیارو وەلیو کەسوکارەکەی تێدا بەرچاو بگیرێ، بەرژەوەندی ئافرەتەکە وەلابخرێ، ئەمەش ستەمو ناڕەواییەکە بەرامبەر ئافرەت دەکرێو پێچەوانەی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامە. هەروەها چونکە ئەوە سەردەکێشێ بۆ بێ بەشبوونی ئافرەتان لەمارەیی هاوشانانی خۆیان، وەکوو دیارەو ئاشکرایە ئەم جۆرە ستەمە پەیڕەو دەکرێ لەناو ئەو کەسانەدا ئەم گرێبەستە ناشەرعیانە ئەنجام دەدەن، بەدەگمەن نەبێ ئەم جۆرە ژن هێنانو شوکردنو هاوسەرگیرییە سەرکەوتوو نابێ. زۆرێکیان سەردەکێشن بۆ کێشەو نیزاع دوای گواستنەوەو خۆشی لەیەکتر نابینن‌و ئیستیراحەت لەیەکتر ناکەن، هەڵبەتە ئەمە سزای پێشینەی هەموو ئەوانەیە کە بەگوێرەی شەرعی خودا ناجوڵێنەوە، سزای ئەو دونیاش خودا بۆخۆی دەزانێ.[1]

٢- نیکاحی مارە بەجاش: ئەوەیە ژنی تەڵاقدراو سێ بەسێ دوای تێپەڕبوونی عیدەی مارە بکاو بچێتە لای، ئەمجار تەڵاقی بداتەوە بۆ ئەوەی بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ بێ مارەی بکاتەوە.

---

[1] بڕوانە: رسالة حكم السفور والحجاب ونكاح الشغار. للإبن باز.

ئـەم جـۆرە مـارەکردن‌و گرێبەسـتە تاوانێکـە لەتاوانـە گـەورەکان‌و فاحیـشەیەکی ڤیزەونـەو بـەهیچ جۆرێـك ڕەوا نیـە، جـا لەگرێبەسـتەکەدا مەرجی تەڵاقدانەوەکە باس بکرێ، یان لەپێش گرێبەستەکەدا لەسـەری پێـك بێن، لایەکیان لـەدڵیدا ئـەو نیـازە هـەبێ چـون یەکـەو بکەرەکـەی نـەفرین لێ کراوە.

لـەئیمامی عـەلیـەوە ڕیوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَـهُ).[1] پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بێ) نـەفرینی لـەو کەسـە کردووە دەبێتە جاش‌و بـەونیازە ژنـی سێ بەسێ تەڵاقـدراو مـارە دەکـاو ئـەو کەسەش کـە ئـەو گرێبەسـتەی بـۆ ئـەنجام دەدرێ بـۆ ئـەوەی بـۆی حـەڵاڵ بـێ ژنەکەی مارە بکاتەوە.

لـە عوقبـەی کـوڕی عـامیرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِـالتَّيْسِ الْمُـسْتَعَارِ»؟ پێتـان نـەڵێم: نێرییـە قـەرەی بـەکرێگیراو کـێیـە؟ هـاوەڵان عـەرزیان کـرد بـەڵێ: ئـەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: « هُوَ الْمُحَلِّلُ لَعَنَ اللَّهُ الْمُحَلِّـلَ وَالْمُحَلَّـلَ لَـهُ».[2] ئـەوە ئـەو جاشـەیە کەبـەنیازی ئـەوەی ژنـە تەڵاقدراوەکـە (سـێ بـە سـێ) لەمێردەکەی مارە بکرێتەوە ئەم خۆی مـارەی دەکـاو پـاش لەگـەڵ جوتبـوونی تەڵاقی دەداتەوە تا مێردی یەکەمی لەخۆی مارە بکاتەوە. دەی نەفرینی خودا لەو کەسەی بۆی حەڵاڵ دەکاو ئەو کەسـەیش بـۆی حـەڵاڵ دەکـرێ سـەرلەنوێ ژنەکە مارە بکاتەوە.

---

[1] صحيح: (ص. ج/٥١٠١)، د (٦/٨٨/٢٠٦٢)، ت (٢/٢٩٤/١١٢٨)، جه (١/٦٢٢/١٩٣٥).

[2] حسن (ص. جه/١٥٧٢)، جه (١/٦٢٣/١٩٣٦)، ك (٢/١٩٨)، هق (٧/٢٠٨).

له عومەری كوڕی نافیعەوە لەباوكیەوە ڕیوایەتكراوە، كە دەڵێ: پیاوێك هاتەلای ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوكی بێ) پرسیاری لێ كرد دەربارەی پیاوێك ژنەكەی خۆی سێ بەسێ تەڵاق دابوو، برایەكی مارەی كردۆتەوە – بەپێی پیلانی پیاوەكە – بۆ ئەوەی حەڵاڵی بكاتەوە بۆ پیاوەكە مارەی بكاتەوە. ئا بەم شێوە مارەكردنەو دوایی تەڵاقدانەوەی بۆ مێردی یەكەمی حەڵاڵە مارەی بكاتەوە؟ فەرمووی: نەخەیر نیكاحی دووەم دانامەزرێ چونكە بە مەبەستی ڕەغبەت نیە. ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەمان بەجۆرێك لەداوێنپیسی لە قەڵەم دەدا.[1]

٣- نیكاحی موتعە: ژن مارە كردن بۆ ماوەیەك، ژن مارەكردنی ناوبەناو ئەوەیە پیاوێك ئافرەتێك مارە بكا بۆ شەوێك یان بۆ حەفتەیەك یان بۆ مانگێك یان بۆ هەركاتێكی دیاری كراو، ئەوە گرێبەستێكی حەرامەو كۆڕای زانایانی ئەهلی سوننە لەسەر ئەوەن كە ئەو گرێبەستە بەتاڵو پوچەو دانامەزرێ.

لە (سَبْرَةَ)وە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: (أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– بِالْمُتْعَةِ عَامَ الْفَتْحِ حِينَ دَخَلْنَا مَكَّةَ ثُمَّ لَمْ نَخْرُجْ مِنْهَا حَتَّى نَهَانَا عَنْهَا).[2] پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ساڵی ڕزگاركردنی مەككە كە چووینە ناویەوە ڕێگەی داین نیكاحی موتعە بكەین، پاشان هێشتا لەمەككە دەرنەچووبووین نەهی لێ كردین، فەرمووی: مەیكەن.

---

[1] صحيح: (الإرواء٦/٣١١)، ك (٢/١٩٩)، هق (٧/٢٠٨).

[2] فقه السنة ٢/٣٥.

## حوكمی مارەبڕینی ئافرەتێك كە پیاوەكە نیازی تەڵاقدانی هەبێ

شێخ سەید سابق لەكتێبی (فقه السنة)دا ج٢/٣٨. دەڵێ: شەرعزان‌و فەقیهەكان كۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە ئەگەر كەسێك ئافرەتێكی مارەكرد بەبێ ئەوەی كات دیاری بكا، لەنیەتی‌دا هەبێ كەپاش ڕۆژگارێك تەڵاقی بدا، یان دوای جێبەجێ كردنی كارەكەی لەو وڵاتەی نیشتەجێ بووە تێیدا تەڵاقی بدا. هاوسەرگیرییەكەیان صەحیحەو دامەزراوە.

ئیمامی ئەوزاعی لەم بارەیەوە ڕای جیاوازی هەیەو پێی وایە ئەوە نیكاحی موتعەیە (ژن مارەكردنی كاتییەو نادروستە).

شێخ ڕەشید ڕەضا لەتەفسیری (المنار)دا تەعلیقی هەیە دەڵێ: توندڕەوی زانایانی سەلەف‌و خەلەف لە مەنعكردنی مارەبڕینی كاتی (زواج المتعة) ئەوە دەخوازێ ژن مارەكردن بەنیازی تەڵاقدانەوەی وەكوو زیواجی موتعە نادروست بێ. هەرچەندە فوقەها فەرموویانە: گرێبەستی نیكاح بەنیازی تەڵاقدانەوەی پاش ماوەیەك صەحیحەو بەمەرجێك لەگرێبەستەكەدا دەری نەبڕێ.

وەڵێ شاردنەوەی ئەو نیازەو دەرنەبڕینی بەفێڵ‌و غەش دەژمێردرێ‌و دەبێ ئەم جۆرە عەقدە نادروستتر‌و بەتاڵ تر بێ لەعەقدێك كە كاتی تێدا دیاری دەكرێ‌و دەكرێتە مەرجێكی ڕاگەیەندراو لەناوەڕۆكی عەقدەكەدا بەڕەزامەندی مێردو ئافرەتەكەو وەلی ئافرەتەكە ئەنجام دەدرێ. ئەمە هیچ فەسادو فرت‌و فێڵێكی تێدا نیە جگە لەگاڵتەجاڕی كردن بەم پەیوەندییە گەورەو پیرۆزە كە لەڕاستی‌دا بە گەورەترین پەیوەندییە پیرزەكانی نێوان ئادەمیزادەكان دەژمێردرێ، هەروەها جگە لەوەی كە لەنیكاحی موتعەدا هەڵبژاردنی لایەنی گۆڕانكاری‌و گواستنەوە هەیە لەم پاوانەوە بۆ پاوانێكی تر

لەلایەن مرۆڤە هەوەس پەرستەکانەوە، هەڵبەتـە ئەمـەش کارێکی مونکەرەو هەرشتی نەشیاویشی لێ بەرهەم دێ.

جا عەقدێك کە لەناوەڕۆکی عەقدەکە کات نەکرێتە مەرج بەڵام لەنیازدا هەبێ وێڕای ئەوەی غەش و فرت و فێڵی تێدایە، چەند مەفسەدەیەکی لێ وەدی دێ کەبریتیـە لەدوژمنایـەتی و ڕق و قـین و نـەمانی بتمانـە، تەنانـەت بـەو کەسـانەش کـە بـەنیازی پـاك و خاوێنـەوە هـەوڵی ژن هێنـان دەدەن و دەچـنە خوازبێنی بەمەبەستی داوێنپاکی و پێکەوە نـانی خێزانـی هـەتا هـەتایی و پـڕ لەدڵسۆزی و خۆشەویستی و هاریکاری نێوان ژن و مێـرد. بەمەبەستی پێکەوە ژیـانی بەختـەوەری و خـستنەوەی منـداڵی صالح و ڕازی کردنـی پـەروەردگارو دەست خستنی پاداشی دوا ڕۆژ، کە بەهەشتی بەرین و ڕازاوەیە.

دەڵێم: بۆ پشتگیری ئەو راوبۆچونەی شێخ ڕەضا پـەنا دەبەینـە بـەر ئـەو (أثر)ەی عومەری کوڕی نافیع کـە لەباوکیـەوە، ریوایـەت دەکا دەڵـێ: (پیاوێـك هاتـە لای ئیبنـو عومـەر (رەزای خـودا لـەخۆی و لـەباوکی) پرسـیاری لێ کـرد دەربـارەی پیاوێـك ژنەکـەی سێبەسـێ تەڵاقـداوە برایـەکی پیاوەکـە بـەبێ هانـدان و پـلان بۆدانـانی ئـەم ژنەکـەی مـارەکردووە لـەخۆی بۆئـەوەی دوایـی تەڵاقی بداتەوەو بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ بێ مارەی بکاتەوە. ئایا بەم جۆرە مارەکردن و تەڵاقدانەوە بۆ مێردی یەکەم حەڵاڵ دەبێ مارەی بکاتەوە؟ ئیبنو عومەر فەرمووی: نەخەیر. مەگەر نیکاحێك بێ بە مەبەستی خێزان دروست کردن و پێکەوە ژیانی هـەتا هـەتایی. ئێمـە لەسـەردەمی پێغەمبـەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم جۆرە مارەکردن و سەرجێیی کردنەمان بەداوێنپیسی و زینا هەژمار دەکرد.[1]

---

[1] لەوەپێش تێپەڕی.

**مافی ژن‌و مێردایه‌تی (مافی خێزان به‌رامبه‌ر یه‌کتر)**

خێـزان له‌کۆمـه‌ڵگادا بـه‌ردی بناغـه‌ی کۆمه‌ڵـه، ئه‌گـه‌ر رێـك‌و پێـك‌و ته‌ندروسـت بـوو، هـه‌موو کۆمـه‌ڵگا راسـتاڵ‌و ته‌ندروسـت ده‌بـێ. خـۆ ئه‌گـه‌ر خوانه‌خواسـته خێـزان گه‌نـده‌ڵ‌و نـه‌خۆش بـوو کۆمـه‌ڵگا هـه‌مووی گه‌نـده‌ڵ‌و داوه‌شاو ده‌بێ، بۆیه ئایینی ئیسلام گرنگی زۆری داوه به خێزان‌و زۆر مـه‌رج‌و لایه‌نی به‌رچاو گرتـووه بۆئـه‌وه‌ی به‌شێوه‌یه‌کی ته‌ندروست دابمـه‌زرێ‌و پێك بێ، به سه‌لامه‌تی‌و به‌خته‌وه‌ری هاوسـه‌رگیرییه‌که بـه‌رده‌وام بـێ‌و ژن‌و مێـردو باقی ئه‌ندامه‌کانی له‌ژێر سایه‌ی دا بحه‌سێنه‌وه‌و ژیـان به‌سـه‌ربه‌رن. هه‌ڵبه‌تـه کۆمه‌ڵگایـه‌ك لـه‌خێزانی به‌ختـه‌وه‌ر پێـك بـێ، کۆمه‌ڵگایـه‌کی نمونـه‌یی‌و به‌خته‌وه‌ر ده‌بێ.

بۆیـه ئـاییـنی ئیـسلام خێزانـی وا حیـساب کـردووه کـه دامه‌زراوه‌یـه‌کی هاوبه‌شـه لـه‌نێوان دووکه‌سـدا: کـه ژن‌و مێـرده. به‌رپرسـی یه‌کـه‌میش لـه‌و دامه‌زراوه‌دا پیاوه. په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ: {الرِّجَالُ قَوَّامُـونَ عَلَـى النِّسَاءِ بِمَـا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَـاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ – النساء/٣٤}. پیاوان مافی به‌رێوه‌بـه‌ری‌و لێپرسـراوییان به‌سـه‌ر ئافره‌تانـه‌وه هه‌یـه. ده‌تـوانن پارێزگـاری‌و چـاودێرییان بکـه‌ن، ئافره‌تانیش ده‌بێ به‌پێی پلان‌و نه‌خشه رێگای ئه‌وان ره‌فتاربکه‌ن. ئه‌م قیوامه لێپرسـراویه‌تیه بۆیـه دراوه بـه‌پیاو چـونکه پـه‌روه‌ردگار فـه‌زڵی هه‌نـدێ ئاده‌میزادی داوه به‌سه‌ر هه‌ندێکی تریانـدا، لـه‌م روه‌وه کـه پیـاوان جه‌سـته‌یان تونـدو تـۆڵ تـره‌و بـه‌هێزترن لـه ئافره‌تـان. وێـڕای ئـه‌وه‌ش پیـاوان ئـه‌رکی بـه‌خێوکردن‌و ماڵبه‌خـشینیان له‌ئه‌سـتۆیه بـۆ به‌ڕێوه‌چـوونی خێـزان. جـا ئافره‌تـانی راسـتاڵ‌و گوێڕادێر بـۆ مێرده‌کانیـان شـه‌رمگای خۆیـان ده‌پـارێزن‌و

خیانەت لە مێردەکانیان ناکەن، وەکوو خودا فەرمانی پێکردون ئاوا رەفتار دەکەن.

هەڵبەتە ئایینی ئیسلام بۆ هەریەکێك لەو دوو هاوبەشەی خێزانیان پێکەوە ناوە ئەرك‌و مافی داناوە، بە پابەندبوون بەو ئەرك‌و مافانە ئەم دامەزراوە خێزانییە جێگیرو پایەدار دەبێ. لەهەمان کاتدا ئیسلام هەردوك هاوبەش (ژن‌و مێرد)ی هەڵناون بۆئەوەی هەریەکەیان لە عاست خۆیەوە ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکاو چاوپۆشی لەهەندێ هەڵەو کەمتەرخەمی لایەنی بەرامبەری بکا کە هەندێ جار روو دەدەن.

### مافی ژن بەسەر مێردەوە

قورئان دەفەرموێ: {وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً – الروم/٢١}: لەنیشانەکانی بون‌و بەدەسەلاتی خودا ئەوەیە: کە لە رەگەزی خۆتان هاوسەری بۆ دروستکردون تا لەپاڵیاندا بحەسێنەوەو ئارام بگرن. هەروەها خۆشەویستی خستۆتە نێوانتانەوە بۆئەوەی بتوانن بەیەکەوە ئەرکی گرانی ژیان هەڵبگرن‌و بەهاوکاری یەکتر ژیان بەسەربەرن.

بەڕاستی ئەوە فەضل‌و گەورەیی خودایە بەسەر بەندەکانییەوە، رەحمەت‌و بە بەزەیی خۆیەتی رژاندویەتیە نێوان ژن‌و مێردەوە، ئەو خۆشەویستی‌و سۆزەی لەنێوان ژن‌و مێردا هەیە، لەنێوان هیچ دوو کەسێکدا نیە، پەروەردگار پێی خۆشە خۆشەویستی‌و سۆز لەنێوان ژن‌و مێردا بەردەوام بێ، بۆیە بۆ هەریەکەیان مافی دیاریی کردووە، بەجۆرێك بەرچاوگرتنی ئەو مافەو لەئەستۆ گرتنی پارێزگاری ئەو سۆزو خۆشەویستییە دەکاو ناهێڵێ بفەوتێ‌و زایع بێ.

ئەوەتا دەفەرموێ: {وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ – البقـرة/٢٢٨}. هەیە بۆ خێزانەکانتان لەسەر ئێوە لەماف بە ئەنـدازەی مـافی ئێوە بەسـەر ئەوانەوە. ئەم رستەو کەلامە کورتو پوختەی قورئـان وێـڕای کورتبڕییەکەی ئەوەنـدە مانـای کۆمەڵایـەتیو عەداڵـەتی لـەخۆ گرتـووە: کـە شـیکردنەوەو تەفصیل پێدانی جلدێکی گەورەی گەرەکەو هێشتا ماناکەی تەواو نەبووە، ئەم رسـتە کورتـە کـورتبڕە پاسـایەکی گشـتییـەو ئـەوە رادەگەیـەنێ: کـە ئـافرەت لەهـەموو مـافو حقوقێـکدا هاوشـانی پیـاوەو لەگـەڵ ئـەودا یەکسانە، جگـە لەیـەك شـتێك کـە قورئـان چـەرتی کـردووەو لـەو قاعیـدە کوللیـە ئیخراجـی فـەرمووە، ئـەویش ئەوەیـە کـە دەفـەرموێ: {وَلِلرِّجَـالِ عَلَـيْهِنَّ دَرَجَـةٌ – البقرة/٢٢٨}: پیـاوان یـەك پلـەیان بەسـەر ئافرەتانـەوە هەیـە، ئـەو پلەیـەش ئەوەیـە: کـە پیـاو دەتوانـێ دوای تەڵاقـدان ژنەکـەی ریجعـە بکاتـەوە، بـەڵام ئافرەت ئەو دەسەڵاتەی نیە یان پلە زیادەکە بریتییە لەو (قەووامە)ی کـە لـە سورەتی (النساء)دا ئاماژەی پێ کراوە.

بێگومان قورئان، زانینی ئەو مافەی ئافرەتان هەیانەو ئەو مافەی لەسەر ئافرەتانە بەرامبەر مێردەکانیان حەواڵە کردوە بۆ عورفو عادەتی بـاو لـەناو خەڵکداو چۆنیەتی هـەڵسو کـەوت کردنیـان لەگـەڵ خـاوو خێزانیـان لـەژێر چەتری پاساو بیرو باوەڕو ئادابو رەوشتیان.

ئەم رستە کورتە پڕمانایەی قورئان تەرازوییەکە مامەڵەو هەڵسو کەوتی خۆی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ هەموو بارو دۆخێـك پـێ کێشانە دەکا. ئەگـەر داوای ئەنجامـدانی کـارێکی لێ کـرد دەبـێ ئـەوە بخاتـە مێـشکی خۆیـەوە: کـە ئـەویش لەبەرامبـەردا بـۆ ژنەکـەی ئـەرکێکی لەسـەرە بۆیـە ئیبنـو عـەبباس

(رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرموویەتی: من خۆم بۆ رەزامەندی خێزانم قۆزدەکەم وەکوو چۆن ئەویش خۆی بۆ من دەرازێنێتەوە.[1]

موسوڵمانی راست‌و راستاڵ دان بەوەدا دەنێ کە: خێزانی مافی زۆرو جۆراو جۆری هەن بەسەریەوە، وەکوو پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ – البقرة/٢٢٨} هەروەها وەکوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «إِلاَّ إِنَّ لَكُمْ مِنْ نِسَائِكُمْ حَقًّا وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا»[2]: بزانن ماف هەیە بۆ ئێوە بەسەر خێزانەکانتانەوە، خێزانەکانیشتان مافیان بەسەر ئێوەوە هەیە.

موسوڵمانی واعی‌و هۆشمەند، هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدا: کە مافی خێزانەکەی ئەنجام بدا بەبێ ئەوەی ئەوە لەبەرچاو بگرێ ئاخۆ خێزانی هەمان هەڵوێستی هەیە یان نا. چونکە ئەو سورە لەسەر پتەوکردنی پەیوەندی نێوانیان‌و زیادکردنی خۆشەویستی نێوانیان‌و دڵسۆزی بۆ یەکتری. لەهەمان کاتدا سورە لەسەر دەرگا داخستن بەڕوی شەیتاندا؛ ئەو شەیتانەی هەمیشە دەنە دەنەی ژن‌و مێرد دەدا بۆئەوەی کێشەو ناخۆشی بخاتە نێوانیانەوە لێك جیاببنەوە.

هەر لەڕوانگەی دەستەواژەی (ألدين النصيحة) لێرەدا باسی مافی ئافرەت بەسەر پیاوەوە دەکەین، پاشان مافی پیاو بەسەر ئافرەتەوە. بەهیوای ئەوەی پیاوانی خاوەن خێزان پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن‌و وصیەتی حەق‌و حەقخوازی بۆ یەکتر بکەن‌و صەبرو ئارامی بخەنە دڵی یەکترەوە.

«إِنَّ لِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا». بێگومان خێزانەکانتان مافی زۆریان بەسەرتانەوە هەیە. سەرەتایی ترین‌و دەستەگوڵی ئەو مافانە ئەومیە هەڵس‌و

---

[1] ابن جرير ج(٢/٤٥٣).

[2] حسن (ص.جة/١٥٠١)، ت(١١٧٣/٣١٥/٢)، جة(١٨٥١/٥٩٤/١).

کەوتی پیاو لەگەڵ خێزانەکەی بەمەعروف بێ چونکە قورئان دەفەرموێ: {وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ – النساء/١٩}. مامەڵەو هەڵس و کەوتتان لەگەڵ ئافرەتاندا بە نەرم و نیانی و چاکە خوازی بێ، بژیوو پۆشاك و شوێنی حەوانەوەیان بەگوێرەی بۆ گونجان و دەسەڵات بۆ دابین بکرێ. نەصیحەت و ئامۆژگاری بکا، هەرکاتێ ترسی ئەوەی لێ کرد ناشیزەبێ، ئەدەبی دادا بەو شێوەیەی خودا فەرمانی پێ کردوە دەربارەی ئەدەبدادانی ئافرەتان بەم جۆرە مەوعیزەی جوانی بکا جوێن و قسەی ناشیرینی لەگەڵدا بەکارنەهێنێ، جا ئەگەر بەوە تەمبێ خواردو بوو باشە ئەگینا جێی لێ جیابکاتەوە، ئەگەر بەوە هاتە سەر رێ و چاکبوو باشە، ئەگینا بەمەبەستی شکاندنی ناز بەهێواشی لێی بداو دەست بپارێزێ لە دەم و چاوی. چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا – النساء/٣٤}. هەروەها لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ پرسیاری لێ کرا ئاخۆ مافی ئافرەتی هەریەکێ لەئێمە چیە بەسەر مێردەکەیەوە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: «أَنْ تُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمْتَ وَتَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ – أَوِ اكْتَسَبْتَ – وَلاَ تَضْرِبِ الْوَجْهَ وَلاَ تُقَبِّحْ وَلاَ تَهْجُرْ إِلاَّ فِى الْبَيْتِ».[1] ئەوەیە بژیوی پێویست و پۆشاکی هاوشانی خۆی بۆ دابین بکەی، لە دەم و چاوی نەدەی، جوێن و قسەی ناشیرینی پێ نەڵێی دەنگی لێ دانەبڕی مەگەر لەماڵدا جێگای نوستنی لێ جیابکەیەوە.

بێگومان نیشانەو دیاردەی ئیمانی تەواو ئەوەیە پیاو لەگەڵ ئەهل و خاوو خێزانیدا نەرم و نیان بێ. وەکوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر

[1] (ص.جة/١٥٠٠)، د(٢١٢٨/١٨٠/٦)، جة(١/٥٩٣/١٨٥٠).

بێ) دەفەرموێ: «أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ خُلُقًا»[1]: تەواوترین موسوڵمان لەڕوی ئیمانەوە کەسانێکن رەوشتیان جوانە، باشترینی ئێوە کەسێکە بۆ خێزانەکەی باش بێ.

رێزگرتنی ئافرەت لەلایەن پیاوەوە کیشانەی کەسایەتی تەواوو کامڵە، سوکایەتی پێکردنی نیشانەی خوێڕییەتیو نەفس نزمیەتی. هەڵسوکەوتی نەرمو نیان لەگەڵ ئافرەتدا، گاڵتەو سوعبەت لەگەڵ کردنی لاسایی کردنەوەی پێغەمبەرەو شوێنکەوتنی رێبازی پیرۆزیەتی، ئەوەبوو بە مەبەستی مولاطەفەو سوحبەت پێشبڕکێی لەگەڵ خاتو عائیشەدا دەکرد، بەجۆرێك کە خاتو عائیشە خۆی دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشبڕکێی لەگەڵدا کردمو پێشی کەوتم. دوا ماوەیەك من قەڵەو گۆشتن بوو بووم پێشبڕکێی لەگەڵدا کردمەوە پێشم کەوت، فەرمووی: ئەمە لەبەرامبەر ئەوە.[2]

بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهوو لەعبی بە پوچو بەتاڵ داناوە مەگەر گاڵتەو سوحبەت کردن لەگەڵ خێزاندا. فەرموویەتی: «كُلُّ شَيْءٍ يَلْهُو بِهِ ابْنُ آدَمَ فَهُوَ بَاطِلٌ إِلاَّ ثَلاَثاً رَمْيَهُ عَنْ قَوْسِهِ وَتَأْدِيبُهُ فَرَسَهُ وَمُلاَعَبَتُهُ أَهْلَهُ فَإِنَّهُنَّ مِنَ الْحَقِّ»[3]: هەرشتێك ئادەمیزاد کاتی پێ بەسەربەرێ بەتاڵو بێ خێرە جگە لەسێ شت، تیر ئەندازیو مەشقکردنی تفەنگچیەتی، راهێنانی ئەسپ بۆ سواری، گاڵتەکردن لەگەڵ خێزانیدا، ئەوانە حەقن جێگای بایەخن.

---

[1] حسن صحيح: (ص.ت/٩٢٨) ، ت(٢/٣١٥/١١٧٢).

[2] صحيح: (الزفاف/٢٠٠)، د(٢٥٦١/٢٤٣/٧)..

[3] صحيح: (ص.ج/٤٥٣٤) ، النسائي في العشرة (ق/٧٤).

٢- مافی ئافرەتە بەسەر پیاوەوە کە لەبەرامبەر ئەزیەتو دەمشڕیو چەنەبازیا بەئارام بێ، لەهەڵەی بچوكو زەللاتەکانی چاوپۆشی بکا چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ».[1]: با پیاوی ئیماندار رقی لە ئافرەتی موسوڵمان هەڵنەسێ، چونکە ئەگەر رەوشتێکی تێدابوو بەدڵی ئەو نەبوو، رەوشتی تری تێدایە کە جێگای رەزامەندی ئەوبێ.

هەروەها فەرموویەتی: «وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا ، فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ ، وَإِنَّ أَعْوَجَ مَافِي الضِّلَعِ أَعْلاَهُ ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا».[2] راسپاردەی یەکتر بەخێرو چاکە بکەن دەربارەی ئافرەت، ئافرەت لە پەراسوو دروستکراوە، خوارترین پەراسوو پەراسووی لای سەرەوەیە، ئەگەر بتەوێ راستی بکەیەوە دەشکێ، ئەگەر وازیشی لێ بهێنی وەك خۆی دەمێنێتەوە.

هەندێ لە عولەمای سەلەف فەرموویانە: پێویستە ئەوە بزاندرێ: کە رەوشت جوانی پیاو لەگەڵ ئافرەتدا ئەوەنیە ئەزیەتی نەداو بەس! بەڵکوو رەوشت جوانی ئەوەیە، تەحەمولی خراپەکاریەکانی بکاو بەرامبەر رەوشتە خراپەکانی بەصەبر بێو بارقوڵی بەکاربێنێ، لەعاست تورەییو هێرشی نارەوای خۆگربێ، شوێن پێغەمبەر بکەوێو چاو لەئەو بکا.

بێگومان خێزانەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەڵپیان پێ دەگرتو ئەزیەتیان دەدا، ئەویش وادەبوو لە بەیانییەوە تا شەو دەنگی دادەبڕی لەوەیان کە: ئەوە هەڵوێستی بووە.[3]

---

[1] صحيح (الزفاف/١٩٩)، م(٢/١٠٩١/٤٦٩).

[2] متفق عليه: خ(٩/٢٥٣/٥١٨٦)، م(١٤٦٨ — ٢/١٠٩١/٦٠).

[3] مختصر منهاج القاصرين (ص: ٧٨ - ٧٩).

٣- هەروەها مافی ژنە بەسەر پیاوەوە: کە بیپارێزێو چاودێری بکا لەهەرشتێك کە کەسایەتی ناموسی دەڕوشێنێ، کەرامەتو نرخی لەکەدار دەکا. نەهێڵێ تێکەڵ بە نامەحرەمو هاوەڵی خراپ بێ.....

هەروا پێویستە لەسەری حەصانەی تەواوو چاودێری تەواوی بۆ دابین بکا نەهێڵێ رەوشتو ئایینی لەدەست بدا، رێگەی نەدا لە چوارچێوەی ئایین دەربچێو فەرمانو نەهیەکانی پەروەردگارو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێشێل بکاو دەست بکا بە فیسقو فجور. چونکە پیاو سەرپەرشتیارو پارێزەری ئافرەتی لەئەستۆیەو بەرپرسە لە پاراستنی، ئاماژە بە فەرموودەی پەروەردگار {الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء – النساء/٣٤}.

هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی: (الرجل راع في أهله وهو مسؤول عن رعيته).[١] پیاو شوانو پارێزەرە لەناو ماڵو خێزانیداو ئەو بەرپرسیارە لە رەعیەتو خێزانی.

٤- هەر لەمافی ئافرەتە بەسەر پیاوەوە: کە پێویستیاتی ئایینی فێربکا، یان ئیزنی بدا ئامادەی کۆڕو کۆمەڵی فێربونو خوێندن ببێ، چونکە پێداویستیو ئاتاجی بۆ ئیصلاحی ئایینیو پاڵفتەکردنی گیانی کەمترنیە لە پێداویستی بۆ خۆراکو خواردنەوە؛ کە ئەم دووانە ئەرکی سەرشانی پیاوە بۆ خێزانی فەراهەم بێنێو بۆی دابین بکا. چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ – التحريم/٦}: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە خۆتانو ماڵو منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێك سوتەمەنییەکەی ئادەمیزادو بتە داتاشراوەکانتان؛ کە لەبەرد دایاندەتاشنو دەیانکەنە خودای خۆتانو پەرستشیان بۆدەکەن.

---

[١] متفق عليه: خ(٨٩٣/٣٨٠/١)، م(١٨٢٩/١٤٥٩/٣).

ئاشكرايه وشەی (أهل) له ئايەتەكەدا ژنيش دەگرێتەوە، پاراستنی لەئاگر بە چاندنو گەشەپێدانی ئيمانو رەوشتی جوانو كرداری چاك لەدڵو دەرونیدا دەستەبەر دەبێ، بۆيە دەبێ فێری عيلمو زانست ببێ تابتوانێ بەگوێرەی شەرعو ئايين بڕوای خۆی بەهێز بكاو كردەوەكانی بەجێ بێنێو ببێتە بەندەيەكی صاڵحو راستاڵ.

٥- هەر لەمافی ئافرەتە بەسەر پياوەوە: كە پياو فەرمان بە ئافرەت بكا بە رێكو پێكی ئايينی خودا پەيڕەوبكاو پارێزگاری نوێژەكانی بكا چونكە خودا دەفەرموێ: {وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا – طه/١٣٢}.

٦- هەروا مافی ئافرەتە بەسەر پياوەوە: كە رێگەی بدا لە ماڵ دەربچێ لەكاتی پێويست، وەكوو ئەوە بچێ سەردانی كۆمەڵێك ناسياوی بكا، يان ديدەنی ماڵە باوانی بكا، يان بچێ بۆ ماڵی جيرانو هاوسێيانی، بەلام بەمەرجێ فەرمانی پێ بكا بەوە خۆی باڵا پۆش بكاو جەستەی خۆی بۆ بێگانە دەرنەخا، هەروا نەهی لێ بكا لەوەی عەترو بۆنی خۆش لەخۆی بدا، نەهی لێ بكا لەوەی تێكەڵی پياوی بێگانە ببێو تۆقەيان لەگەڵ بكا، دەبێ بيترسێنێ لە تەماشاكردنی فليمو شتی نەشياوی تەلەفيزيونو گوێڕاگرتن لەگۆرانیحەرام!

٧- هەروا مافی ئافرەتە بەسەر پياوەوە: كە نهێنييەكانی بلاونەكاتەوە، عەيبو عارەكانی باس نەكا، چونكە پياو ئەمێندارە بەسەر ئافرەتەوە، ئەركی سەرشانيەتی پابەندبێ بە ريعايەتكردنیو پارێزگاری كردنی. ترسناكترين نهێنی نهێنی نێوان ژنو مێردە، بۆيە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڕەشەی لە موسوڵمانان كردوە: كە بەهيچ جۆرێ ئەو جۆرە نهێنيانە بلاونەكەنەوە، ئاماژە بە حەديثی ئەسمائی كچی يەزيد: كە دەڵێ لای پێغەمبەر بووم (دروودی خودای لەسەر بێ) ئافرەتو پياو لە خزمەتيدا

دانیشتبوون، فەرمووی: وێدەچێ، پیاو هەبێ چی لەگەڵ خێزانی دەکا بۆ خەڵکی باس بکا، لەوانەشە ئافرەتی وابێ چی لەگەڵ مێردەکەی دەکا بیگێڕێتەوە، خەڵکەکە بێدەنگ بوونو هیچیان نەگوت، ئەسماء دەفەرموێ: وتم: ئەرێ وەڵلا، ئەی پێغەمبەری خودا! ئافرەتان ئەوە دەکەنو پیاوانیش ئەوە دەکەن. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « فَلاَ تَفْعَلُوا فَإِنَّمَا مِثْلُ ذَلِكَ مِثْلُ الشَّيْطَانِ لَقِيَ شَيْطَانَةً فِي طَرِيقٍ فَغَشِيَهَا وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ».[1] شتی وامەکەن، بێگومان ڕەوشتی ئاواو کاری ئاوا وەکوو ئەوە وایە شەیتانێك لە ناوەڕاستی ڕێگایەکدا تووشی شەیتانێکی مێینە ببێو لەپێش چاوی خەڵکدا سواری ببێ.

٨- مافی ژنە بەسەر مێردەکەیەوە: کە لەکاروباردا راوێژی پێ بکا، بەتایبەتی ئەو کارانەی تایبەتن بە هەردووکیانەوەو بە منداڵەکانیانەوە. ئەمەش بە چاولێکەری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چونکە ئەو تەشریفی راوێژی بەخێزانەکانی دەکردو راو بۆچونەکانیشیانی بەهەند وەردەگرت. بۆ نمونە ئەوەتا رۆژی (الحديبية) کاتێك صوڵحەکەی ئەنجامداو پەیماننامەکەی مۆرکرد، بە هاوەڵانی فەرموو: « قُومُوا فَانْحَرُوا ثُمَّ احْلِقُوا». هەستن قوربانییەکانتان سەرببڕنو ئیحرام بشکێنن موی سەرتان بتاشن، سوێندم بەخودا کەس لەشوێنی خۆی نەجولا، سێجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی گوتەوە، جا کەکەس فەرمانەکەی پێغەمبەری تەنفیز نەکرد، تەشریفی چووە لای ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) ئەو حاڵەی بۆ گێڕایەوە، ئوممو سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دەتەوێ بەگوێت بکەن؟ تەشریفت بچۆرە ناو خەڵکەکە قسە لەگەڵ کەسیان مەکە حوشترە قوربانیەکەی خۆت سەرببڕە، بانگی سەرتاش بکە سەرت بتاشێ.

---

[1] صحيح: (آداب الزفاف/٧٢).

تەشریفی هاتە دەرەوە لەگەڵ هیچ کەسیان قسەی نەکرد تا ئەوکارانەی ئەنجام دا، کە هاوەڵان دیتیان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قوربانییەکەی سەربڕی‌و سەری خۆی تاشی‌و ئیحرامی شکاند، هاوەڵان کەوتنە پەلە پەل‌و قوربانی خۆیان سەربڕی‌و ئەم سەری ئەوی دەتاشی‌و ئەو سەری ئەمی دەتاشی، هەتا ئەوەندە پەلە پەلیان پێکەوت‌و خەفەتیان خوارد بەوەی زوو بەگوێی پێغەمبەریان نەکردووە خەریکبوو یەکتر بریندار بکەن[1]. بەم جۆرە پەروەردگار لە بەگوێکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئوممو سەلەمەی خێزانی خێرو فەڕێکی زۆری بەدی هێنا.

بە پێچەوانەی ئەو نمونە ستەمکارانەی کە نەی لەوە دەکەن راوێژ بە ئافرەت بکرێ‌و بەقسەی بکرێ، وەکوو ئەوەی بەزمانی عامی‌و ناشارەستانیانە دەڵێن: (راوێژکردن بە ئافرەت ئەگەر بەسوود بوو ساڵێکی تەمەنت بەفیڕۆ داوە، ئەگەر بێ سوود بوو هەموو تەمەنت لەکیس چووە).

٩- مافی ئافرەتە بەسەر پیاوەوە: کە لەدوا نوێژی خەوتنان راستەوخۆ پیاوەکە خۆ ماتڵ نەکاو بگەڕێتەوە بۆلای، نابێ لەدەرەوەی ماڵ خەریکی رابواردن‌و گفت‌و گۆبێ لەگەڵ برادەرو ناسیاودا تا درەنگانی شەوو خێزانیشی لەماڵەوە چاوەڕوانی بێ بێگومان هەڵس‌و کەوتی لەوجۆرە ئافرەتەکە ئیزعاج دەکاو توشی دڵەڕاوکێ‌و ئەزیەت دەبێ. جگە لەوە لەوانەیە ئەگەر مانەوەی لە دەرەوەی ماڵ دوبارەو سێبارە بۆوە، ئافرەتەکە شکو گومان پەیدابکاو دڵی لە مێردەکەی کرمێ بێ. بەڵکوو لەمافی ئافرەتە بەسەر پیاوەوە کە تەنانەت بۆ نوێژکردنیش بێ شەو لەخێزانی دوورنەکەوێتەوە، لەدەرەوەی ماڵ نەمێنێتەوە، ئەمەش بۆئەوەی ئافرەتەکە مافی نەفەوتێ هەر لەم روەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناڕەزامەندی خۆی بەرامبەر

---

[1] صحيح: خ(٢٧٣١ و ٥/٣٢٩/٢٧٣٢).

عەبـدوڵڵای کـوڕی عومــەر دەربـڕیو کاتێـك زانـی عەبـدوڵڵا شـەوانە زۆر بەخەبەرەو خەریکی عیبادەتەو لە ژنەکەی گۆشەگیر دەبێ پێی فـەرموو: «إنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا»[1]: بێگومان ژنەکەشت مـافی بەسـەرتەوە هەیـەو شـەوانە ئەوەندە لێی دامەبڕێ.

١٠- هـەروەها مـافی ئافرەتـە بەسـەر پیـاوەوە: کـە عەداڵـەتکاربێ لـەنێوان ئــەوو هەوێکەیــدا، ئەگــەر هــەوێی هــەبوو، پێویــستە لەســەر پیاوەکــە عەداڵـەتکاربێ لەنێوانیانــدا لـە خـواردنو خواردنــەوەو پۆشـاكو نیـشتەجێ بـوونو مانـەوە لایـانو نووسـتن لەگـەڵیان، دروسـت نیـە بـەهیچ شـێوەیەكو بەهیچ بیانوێك لەم بوارانەدا پاساوی ژنێکیان بەسەر ئەوی تردا بداتـەوە، بـۆ رازی کردنی ئەمیان مافی ئەویتریان پێشێل بکا، زوڵمو ستەم لە یەکیان بکـاو مافی خـۆی نـەداتێ، چونکە پـەروەردگار ئـەو هـەڵسو کەوتـە ناعەداڵەتیـەی حەرام کردووە بە زوڵمو سـتەمی دانـاوە. پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرموویـەتی: «مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا دون الأخـرى، جَـاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ»[2]: کەسـێك دووژنـی هـەبێ مـەیلی بـەلای یەکێکیانـەوە بێ ئەوی تر پاشگوێ بخاو وەکوو یەك هەڵسو کەوتیان لەگەڵ نـەکاو بەیـەك چاو سەیریان نەکا، رۆژی قیامەت بەلا خـواری دێتـە گۆڕەپـانی مەحـشەرەوە. ئەمانــە مــافی ئــافرەتن بەســەر پیــاوەوە، جــا کەســێك دەیــەوێ ژیــانی بەختــەوەربێ، دەبــێ هــەوڵ بــداو ســووربێ لەســەر دەســتەبەرکردنی مــافی خێزانیو حەقی خـۆی بـداتێ، هـەروا پێویـستە ئـافرەتیش چاوپۆشـی بکـا لـە مێردەکـەی ئەگـەر هەنـدێ جـار کەمتەرخـەمی نوانـد بەرامبـەری، نەچـێ

---

[1] متفق علیه: خ(١٩٧٥/٢١٧، ٤/٢١٨)، م(١١٥٩ – ١٨٢ – ٢/٨١٣)، ن(٤/٢١١).

[2] صــــحیح: (الإرواء/٢٠١٧)، (ص.جـــــة/١٦٠٣)، د(٦/١٧١/٢١١٩)، ت(٢/٣٠٤/١١٥٠)، ن(٧/٦٣)، جة(١/٦٣٣/٦٩١٩) بألفاظ متقاربة.

ئەویش لەبەرامبەر کەمتەرخەمی مێردەکەی کەمتەرخەمی بنوێنێ‌و تۆڵەی لێ بکاتەوە، بەڵکوو پێویستە لەسەری هەوڵ بدا ئەرکی سەرشانی جێبەجێ بکاو مافی خۆی بداتێ. هەرکاتێ ژن‌و مێرد بەم گیانە ئیسلامییە هەڵس‌و کەوتیان کرد، خێزانەکان ئاسوودە دەبن‌و لە ئاژاوەو پشێوی ناو ماڵ دوورو پارێزراو دەبن.

## مافی پیاو بەسەر خێزانیەوە

بێگومان مافی پیاو بەسەر هاوسەرەکەیەوە گەورەیە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکی دا گەورەیی ئەو مافەی دیاریی کردوە، فەرموودەکە (الحاكم)و هی تریش لەئەبو سەعیدەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: «حَقُّ الزَّوْجِ عَلَى زَوْجَتِهِ أَنْ لَوْ كَانَتْ لَهُ قُرْحَةٌ فَلَحِسَتْهَا مَا أَدَّتْ حَقَّهُ»[١]: مافی مێرد لەسەر ژنی ئەوەندە زۆرو گەورەیە تەنانەت ئەگەر پیاوەکە برینێکی پێوەبوو ئافرەتەکە لستیەوە هێشتا بەتەواوی مافی خۆی نەداوەتێ.[٢]

ئافرەتی عاقڵ‌و زیرەك‌و وەجاخزادە ئەوەیە رێز دابنێ بۆ شتێك کە خوداو پێغەمبەر فەرمانیان پێ کردوە رێزی لێ بگرێ، ئەو ژنە سالارو خانەدانە: کە رێزی مێردەکەی بگرێ‌و هەوڵ بدا رازی بکاو فەرمانبەرداری بێ چونکە گوێڕایەڵی ئافرەت بۆ مێردەکەی هۆکارێکە بۆ چوونە ناو بەهەشت. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « إِذَا صَلَّتِ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا وَصَامَتْ شَهْرَهَا وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا قِيلَ لَهَا ادْخُلِي

---

[١] صحيح: (ص.جة/٦٦٠)، حم(١٦/٢٢٨/٢٥٠).

[٢] صحيح: (ص.ج/٣١٤٨) ، حم(١٦/٢٢٧/٢٤٧).

الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ».[١] ئەگەر ئافرەت پێنج فەرزە نوێژەکانی ئەنجامدان، رەمەزان بەڕۆژو بوو، نامووسی خۆی پاراست، گوێڕایەڵی مێردەکەی بوو، رۆژی پەسڵان پێی ددەگوترێ: بچووره ناو بەهەشتەوه لەهەر دەرگایەکەوه ئارەزۆ دەکەی.

دەی خوشکی موسوڵمان تێبفکره چۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێڕایەڵی بۆ مێرد کردوه بە هۆکاری چوونه بەهەشت، وەکوو چۆن نوێژو رۆژو هۆکارن بۆ ئەو بەمراز گەییشتنه. کەوابوو ئەی خوشکی خاوەن باوەڕ! گوێڕایەڵی مێردەکەت بەو، خۆ بپارێزه لەسەرپێچیکردنی، چونکه بەگوێ نەکردنی دەبێته هۆی توڕەیی خودا لێت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا مِنْ رَجُلٍ يَدْعُو امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهَا فَتَأْبَى عَلَيْهِ إِلاَّ كَانَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ سَاخِطًا عَلَيْهَا حَتَّى يَرْضَى عَنْهَا».[٢]

سوێندم بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، هەر پیاوێك بانگی ژنەکەی بکا بۆ سەر جێیی، ژنەکە بەگوێی نەکا، ئیللا ئەو خودایەی لە ئاسمانە (واتە: پەروەردگار) لێی توڕەیەو رقی لێیەتی تا وادەکا مێردەکەی لێی رازی بێ.

ئەوەی پێویستە لەسەرت ئەی خوشکی موسوڵمان ئەوەیە گوێڕایەڵی هاوسەرت بی لەهەرشتێك داوات لێ دەکا بەمەرجێ پێچەوانەی شەریعەت نەبێ، ئاگاداربە نەچێ زێدەڕۆیی بکەی لەهەموو شتێکدا بەقسەی مێردەکەت بکەی، تەنانەت ئەگەر سەرپێچی فەرمانی شەریعەتیش بێ، ئەگەر وابکەی ئەوە تاوانبار دەبی. بۆ نمونە گوێڕایەڵی بکەی لەهەڵگرتنی مووی دەمو چاو بە مەبەستی خۆڕازاندنەوه بۆی، چونکه ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای

---

[١] صحيح: (ص.ج/٦٦٠) ، حم(١٦/٢٢٨/٢٥٠).

[٢] صحيح: (ص.ج/٧٠٨٠) ، م(١٤٣٦ - ١٢ -/٢/١٠٦٠).

لەسەر بێ) نەفرینی کردوە لەو ئافرەتانەی مووی روخساریان هەڵدەکێشن یان بۆیان هەڵدەگرن.[١]

یان گوێڕایەڵی بکەی بۆ خۆ سفورکردنو سەرپۆش فرێدان لەکاتی چوونە دەرەوە لەماڵ، بەم نیازو مەبەستە شانازی بەجوانی تۆوە بکا لەبەردەم خەڵکدا، بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «صِنْفَانِ مِنْ أُمَّتِي مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا، قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا».[٢] دوو تاقم لە ئوممەتی من لە ئەهلی دۆزەخن، من نەمدیون، تاقمێکیان ئەوانەن دەبنە یاساوڵی کاربەدەستی ستەمکارو قەمچییان بەدەستەوەیە وەکوو کلکی مانگا، بەو قەمچییانە لە خەڵکی دەدەن. تاقمی دووەمیان ئەو ئافرەتانەن بەرواڵەت پۆشاکیان پۆشیوە بەڵام لەواقیعدا روتن، نیوەی جەستەیان پۆشتەیەو ئەوی تریان روتە! خەڵکی هەڵدەخەڵەتێننو بۆ خۆشیان هەڵخەڵەتاون و لەخشتە چوون. قژی سەریان بە بارۆکەو کۆکردنەوەی لە تەوقی سەریاندا وەکوو دوگی لاری حوشتر زل دەکەن، ئەم جۆرە ئافرەتانە رێگەی چوونە بەهەشتیان نابێو بۆنو بەرامی بەهەشت ناکەن. هەرچەندە بۆنو بەرامی خۆشی بەهەشت ئەوەندەو ئەوەندە ساڵەڕێ دەڕوا.

پێویستە ئافرەت فەرمانبەرداری مێردەکەی نەبێ بۆ سەرجێیی کردن لەکاتی بێنوێژیدا، یان چوونە لای لەدواوە، چونکە پێغەمبەر (دروودی

---

[١] متفق علیه: خ(٤٨٨٦/٦٣٠/٨)، م(٢١٢٥/١٦٧٨/٣)، د(٥١٤١/٦٢٥/١١)، ن(١٤٦/٨)، ت(٢٩٣٢/٦٩٣/٤)، جة(١٩٨٩/٦٤٠/١).

[٢] صحيح: (ص.ج/٣٧٩٩) ، مختصر م(١٣٨٨)، م(٢١٢٨/١٦٨٠/٣).

خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ أَتَى حَائِضًا أَوِ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا أَوْ كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ»[1]: کەسێك سەرجێیی ئافرەتی بێنوێژ بکا، یان لەدواوە بچێتە لای خێزانی، یان بچێتە لای کاهین‌و فالگرەوەو کوڵەومنانی‌و بڕوای پێ بکا، ئەوە بێگومان بڕوای بەو پەیامە نیە: کە بۆ موحەممەد (درودی خودای لەسەر بێ) نێردراوە.

هەروا پێویستە تۆی ئافرەتی موسوڵمان گوێڕایەڵی مێردت نەکەی لەوەدا: کە داوات لێ بکا خۆت نیشانی پیاوی بێگانە بدەی‌و لەگەڵیان هەڵسی‌و دانیشی‌و تۆقەو دەست گوشینیان لەگەڵ بکەی. قورئان دەفەرموێ: {وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ - الأحزاب/٥٣}.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ». خۆتان بپارێزن لەچونە خەڵوەت لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا عەرزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کرا: ئایا بۆ برای مێردو برازای‌و مام‌و ئامۆزاشی حەرامە خەڵوەت لەگەڵ خێزانی دا بکەن؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ»[2]: خزمی ژن لەلایەن مێردەکەیەوە وەکوو برای مێردو برازایی‌و مام‌و ئامۆزای هەر زۆر خەتەرەو نابێ بەهیچ جۆرێ ئافرەتەکە خەڵوەتیان لەگەڵ بکا.

دەی ئەمجار خوشکی بەڕێز بۆ خۆت بەراوردی هەموو ئەو کارانە بکە: کە پێچەوانەی شەریعەتی خودان، بەوە لەخۆت بایی مەبەو هەڵمەخەڵەتێ بڵێی ئەوە گوێڕایەڵی کردنی مێردەکەمەو پێویستە لەسەرم، نەخەیر، بە

---

[1] صحيح: (آداب الزفاف/٣١)، جة(١/٢٠٩/٦٣٩)، ت(١/٩٠/١٣٥).

[2] متفق عليه: خ(٩/٣٣٠/٥٢٣٢)، م(٤/١٧١١/٢١٧٢)، ت(٢/٣١٨/١٨١١).

گوێکردنی مێرد کاتێ واجبە کە پێچەوانەی شەریعەت نەبێ، نا فەرمانی خودای تێدا نەبێ. (لاَ طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْخَالِقِ).

٢- هەروا مافی مێردە لەسەر خێزانی: کە ناموسو شەرەفی بپارێزێ، بە دڵسۆزی چاودێری منداڵو ماڵو سامانو ناوماڵی بکا، کاروباری ناوماڵ بە لێزانیو دڵسۆزی بەڕێوەبەرێ، بەجوانی پەروەردەی منداڵی بکا. چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ — النساء/٣٤}. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَمَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا»[1]: ئافرەت چاودێرو بەرپرسە لەماڵی مێردەکەی داو پرسیاری لێ دەکرێ.

٣- هەروەها مافی مێردە لەسەر ژنەکەی: کە خۆی برازێنێتەوەو ئارایش بکا بۆ مێردەکەی. بەدەمیەوە پێ بکەنێو زەردەخەنەو بزەی لەسەر لێو بێو هیچ کاتێ لەبەرامبەر هاوسەریدا روگرژو مۆن نەبێ. واخۆی دەرنەخا مێردەکەی بەرچاوی بکەوێ، تا بۆی بکرێ خۆی بەجوانیو رازاوەیی نیشان هاوسەری بدا. بێگومان طەبەرانی حەدیسێکی لە عەبدوڵلای کوڕی سەلام ریوایەتکردوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (خير النساء من تسرّك اذا أبصرت، وتطيعك اذا أمرت، وتحفظ غيبتك في نفسك ومالك).[2] چاکترین ئافرەتی هاوسەر ئەوەیە: کە سەیری بکەی کەیفخۆشت بکا، ئەگەر فەرمانت پێ کرد بەگوێت بکا: کە لەماڵ نەبووی پارێزگاری ناموسی خۆیو ماڵو سامانت بکا.

---

[1] بەشێکە لە حەدیثی (كلكم راع.......) لەوەپێش تێپەڕی.

[2] صحيح: (ص.ج/٣٢٩٩) .

بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانو سەرنجە ئافرەتی واهەیە لەناو ماڵداو لەبەرامبەر مێردەکەیدا پیسو پەڵۆخو پۆشاك شڕو روگرژە، کەچی کە لەماڵ دەردەچێ خۆی دەڕازێنێتەوەو ئارایشو میکیاجی جۆراو جۆر ئەنجام دەدا، بەجۆرێك ئەو پەندەی بەسەردا پراکتیزە دەکرێ: کە دەگوترێ مەیمونی ناو ماڵو ئاسکی سەرجادەو کۆڵانە. ئەی خوشکی موسوڵمان! لەخودا بترسەو بزانە لەپێشترین کەس کەخۆتی لەبەرامبەردا برازێنیەوە مێردەکەتە. وریابەو خۆت بپارێزە لە بەدەرخستنی زینەتو جوانی خۆت بۆ کەسانێکی بێگانە کە رەوانیە جوانی تۆ ببینن. بێگومان ئەم خۆرازاندنەوەو خۆ دەرخستنە جۆرێکە لە سفورو حەرامە.

٤- هەروا مافی مێردە لەسەر خێزانی: کە لەماڵی خۆیدا دابنیشێو بەبێ رەزامەندی مێردی تەنانەت بۆ مزگەوتیش نەچێ. چونکە خودا دەفەرموێ: {وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ – الأحزاب/٣٣}.

٥- هەروا مافی مێردە لەسەر هاوسەری: کە بەبێ ئیزنی مێردەکەی رێگای کەس نەدا بێتە ماڵەوە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «فَحَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ أَلاَّ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ وَلاَ يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ».[1] مافی ئێوەی مێرد بەسەر ژنەکانتانەوە ئەومیە نەهێڵنو رێگە نەدەن کەسانێك بێنە سەر بەڕەتان: کە رقتان لێیانە، ئیزن نەدەن بە کەسانێك بێنە ناو ماڵتان: کە خۆشتان ناوێن.

٦- مافی مێردە بەسەر ژنەکەیەوە: کە پارێزگاری ماڵو سامانی بکاو بەبێ رەزامەندی ئەو لێی نەبەخشێ. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ تُنْفِقُ امْرَأَةٌ شَيْئًا مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا».

---

[1] ئەم دەقە بەشێکە لە حەدیسێك لەوەپێش تێپەڕی (ألا ان لكم على نسائكم حقاً).

قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ الطَّعَامُ قَالَ « ذَاكَ أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا ».[١] نابێ ئافرەت بەبێ ئیزنی مێردەکەی هیچ شتێك لەماڵو سامانی ئەو ببەخشێ. گوترا: خواردنیش هەرنابێ؟ فەرمووی: خۆراك بەنرخترین ماڵو سامانمانە.

بەڵکوو مافی مێردە بەسەر هاوسەریەوە کە لەماڵی خۆیشیدا – ئەگەر ماڵی هەبوو – بەبێ ئیزنی مێردی لێی نەبەخشێ. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێت: (لیس للمرأة أن تنتهك شيئاً من مالها الا بأذن زوجها)[٢] بۆ ئافرەت رەوانیە کە بەبێ ئیزنی مێردەکەی لەماڵی خۆیشی ببەخشێ.

٧- هەروا مافی مێردە بەسەر ژنەکەیەوە: کە بەبێ ئیزنی مێردەکەی رۆژووی سوننەت نەگرێ، ئەمە کاتێك وایە ئەگەر مێردەکەی لەماڵ بێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ ، وَلاَ تَأْذَنَ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ»[٣]: رەوانیە بۆ ئافرەت رۆژو بگرێ وەلحاڵ مێردەکەی لەماڵ بێ مەگەر ئیزنی بدا.

٨- هەروا مافی پیاوە بەسەر ژنەکەیەوە: کە منەتو نازونوز بەسەر مێردەکەیەوە نەکا ئەگەر شتێکی لەماڵی خۆی خەرج کرد بۆ مەسرەفی ماڵو خێزان، چونکە منەتکردن پاداشو ئەجر پوچ دەکاتەوە. قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى – البقرة/٢٦٤} ئەی ئەو کەسانەی بڕوادارو خاوەنی ئیمانی راستین نەچن خێرو پیاوەتی خۆتان بەمنەتکردن پوچ بکەنەوە.

---

[١] حسن (ص.جة/١٨٥٩)، ت(٢٢٠٣/٢٩٣/٣)، د(٣٥٤٨/٤٧٨/٩)، جة(٢٢٩٥/٧٧٠/٢).

[٢] أخرجه الألباني في الصحيحة (٧٧٥).

[٣] أخرجه الألباني في الصحيحة (٧٧٥).

٩- مـافی پیـاو بەسـەر خێزانیـەوە: كـە بەكـەم ڕازی بـێ‌و بـەوەی هەیـە قەناعەت بكاو مێردەكەی هەڵنەپێچێ بۆ زێدەڕەوی‌و داوای بـژێوی زۆر نـەكا، شتێك داوا لەمێردەكەی نەكا كە لەوزمیـدا نـەبێ‌و بـۆی هەڵنەسوڕێ. قورئـان دەفـەرموێ: {لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّـهُ لَـا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَا آتَاهَـا سَيَجْعَلُ اللَّـهُ بَعْـدَ عُـسْرٍ يُـسْرًا – الطـلاق/٧}. بـا مێردی خاوەن سامان‌و دارایی بەگوێرەی دەوڵەمەندییەكەی بژێو بـۆ خێزانـی دیاری بكا، كەسێكیش ڕزق‌و ڕۆژی تەنگ بوو، كەمدەرامەت بوو، با بەگوێرەی ئەوەی خودا پێی داوە بژێوی ژن‌و منداڵی دابین بكا، خودا ئەرك ناخاتە سەر هـیچ كەسـێك مەگـەر بـەگوێرەی ئـەوە نـەبێ كەداویـەتێ، كـەوابوو پێویـستە ئـافرەت بـەگوێرەی دارایـی مێردەكـەی داوای بـژێوی لێ بكـاو بـەوەی هەیـەتی ڕازی بێ، بەڵكوو خودا لەداهاتوودا دوای كەمدەرامەتی‌و دەستكورتی مێردەكە دەوڵەمەند بكا ئەوكاتە داوای بژێوی باشی لێ بكا.

١٠- مافی پیاوە بەسەر خێزانیەوە: كە بەجوانی‌و ڕێك‌و پێكی منداڵەكانی پـەروەردە بكـاو چـاودێرێكی دڵـسۆزو دایكێكـی سـالارو بەخێوكـەرێكی بـە بەزەیی‌و خەندان بێ، لێیان توڕە نـەبێ لەبـەر چاوی مێردەكـەی، دوعایـان لێ نەكا، جنێویان پێ نەداو نەیانگریـەنێ، ئـاژاوەو شـەڕو هـەرایان لەگـەڵ بـەرپا نـەكا، چـونكە ئـەم كارانـە دەبنـە هـۆی ئەزیەتـدانی مێردەكـەی، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: «لاَ تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَـا فِـي الـدُّنْيَا إِلاَّ قَالَتْ زَوْجَتُهُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ لاَ تُؤْذِيهِ قَاتَلَكِ اللَّهُ فَإِنَّمَا هُوَ دَخِيلٌ عِنْدَكِ يُوشِـكُ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا».[1]

١١- هەروا مافی مێردە بەسەر خێزانیـەوە: كەمامەڵەی جوان بكا لەگەڵ بـاوك‌و دایـك‌و كەسـوكاری مێردەكـەیدا، چـونكە ئەگـەر ژنێـك مامەڵـەو

---

[1] ت (١١٨٤/٣٢٠/٢).

هەڵسوکەوت لەگەڵ باوك‌و دایك‌و خزمی مێردەکەی جوان نەبێ مانای وایە لەگەڵ مێردەکەی خراپ‌و ناچیزمیە.

١٢- هەروەها مافی مێردە بەسەر ژنەکەیەوە هەرکاتێ داوای لێ کرد مانیع نەبێ‌و خۆی لێ یاساغ نەکا. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَلَمْ تَأْتِهِ فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ».[1] ئەگەر مێرد داوای لەژنەکەی کرد بچێتە سەرجێی‌و نەچوو، مێردەکەشی بەم سەرپێچی کردنەی رقی لێی هەڵسا، ئەو شەوە هەتا بەیانی فریشتە نەفرینی لێ دەکەن، هەروا فەرموویەتی: «إِذَا الرَّجُلُ دَعَا زَوْجَتَهُ لِحَاجَتِهِ فَلْتَأْتِهِ وَإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُّورِ».[2] ئەگەر پیاو بانگی خێزانەکەی کرد بۆکاری پێویست با ئافرەتەکە بەدەنگیەوە بچێ تەنانەت ئەگەر لەسەر تەنور بێ‌و خەریکی نانکردن بێ.

١٣- هەروا مافی مێردە بەسەر خێزانیەوە: کەنهێنی ژن‌و مێردایەتی خۆیان بپارێزێ، نهێنی ناو ماڵ‌و خێزان بڵاو نەکاتەوە، بێگومان خەتەرترین نهێنی کە بەداخەوە هەندێ لەئافرەتان بێ موبالات بڵاوی دەکەنەوە نهێنی پێکەوە نوستنی ژن‌و مێردە، نهێنی ئەو هەڵس‌و کەوتانەی لەنێوان ژن‌و مێردا روو دەدا، بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەوە کردووەو بەکاری نەشیاوو حەرامی داناوە.

لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەردا بووم، زۆرێك لەپیاوو ئافرەت دانیشتبوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموون: «لَعَلَّ رَجُلاً يَقُولُ مَا يَفْعَلُ بِأَهْلِهِ وَلَعَلَّ امْرَأَةً تُخْبِرُ بِمَا فَعَلَتْ مَعَ زَوْجِهَا ». فَأَرَمَّ الْقَوْمُ فَقُلْتُ إِى وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُنَّ لَيَقُلْنَ

---

[1] متفق علیه: خ (٥١٩٤/٢٩٤/٩)، م (١٤٣٦/١٠٦٠/٢١٢٧/١٧٩/٦).

[2] صحیح: (ص. ج/٥٣٤)، ت (١١٦٠/٣١٤/٢).

وَإِنَّهُمْ لَيَفْعَلُونَ. فَقَالَ « فَلاَ تَفْعَلُوا فَإِنَّمَا مِثْلُ ذَلِكَ مِثْلُ الشَّيْطَانِ لَقِيَ شَيْطَانَةً فِي طَرِيقٍ فَغَشِيَهَا وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ». لەوانەیە پیاوی وا هەبێ شەو چی لەگەڵ خێزانی دەکا بەیانی بیگێڕێتەوە، هەروەها وێدەچێ ئافرەت هەبێ چی لەگەڵ مێردەکەی دەکا بڵاوی بکاتەوە، ئەسماء وتی: بەڵێ وایە ئەی پێغەمبەری خودا! ئافرەتان ئەوە دەکەن، پیاویش بەهەمان شێوە ئەوە بڵاو دەکەنەوە، پێغەمبەر فەرمووی: وامەکەن، بەهیچ شێوەیەك ئەو جۆرە نهێنیانە بڵاو مەکەنەوە، بێگومان نمونەی ئەو ژن و مێردانەی ئەو نهێنیانە بڵاودەکەنەوە وەکوو ئەوە وایە شەیتانێکی نێر لەچەقی ڕێگایەکدا تووشی شەیتانێکی مێینە ببێ و سواری بێ و خەڵکی سەیری بکەن.

١٤- هەروا مافی مێردە بەسەر ژنەکەیەوە: کەسور بێ لەسەر ژیان بردنە سەر لەگەڵیداو بەهیچ شێوەیەك داوای تەڵاقدان و جیابوونەوەی لێ نەکا، مەگەر هۆکارێکی واهەبێ نەتوانێ لەگەڵیدا هەڵبکا. لە ئەوبانەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلَاقًا فِي غَيْرِ مَا بَأْسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ».[1] هەر ژنێك داوای تەڵاقدان لەمێردەکەی بکا بەبێ هۆکارو سەبەبی مەعقول، ئەوە بۆنی بەهەشتی لێ حەرامە. هەروا فەرمووی: «الْمُخْتَلِعَاتُ هُنَّ الْمُنَافِقَاتُ». ئەو ژنانەی ماڵی خۆیان دەدەن بۆ ئەوەی مێردەکانیان تەڵاقیان بدەن ئەوانە لەپێڕی دوو ڕووەکانن.

ئەمانەی گوتراو ئاماژەیان پێ کرا مافی پیاوانە بەسەر ئافرەتانەوە، پێویستە لەسەر ئەو ئافرەتانەی دەیانەوێ ژیانی هاوسەری بەخۆشی و بەختەوەری بەسەربەرن و پاشان ژیانی جاویدانی و هەتا هەتاییان بەختەوەر

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٠٣٥)، ت (٢/٣٢٩/١١٩٩)، د (٦/٣٠٨/٢٢٠٩)، جه (١/٦٦٢/٢٠٥٥).

بێ. کە هەریەکەیان هەوڵ بدا ئەرکی سەرشانی بەرامبەر مێردەکەی جێبەجێ بکا، چاوپۆشی بکا لەو کەم‌و کورِیانەی لەمێردەکەیەوە بەرامبەری دەکرێن، بێگومان بەم شێوە هەڵس‌وکەوتانە خۆشەویستی‌و رەحمی نێوانیان بەردەوام دەبێ، خێزانەکان ئاسودەو کۆمەڵگا بەختەوەر دەبێ.

پێویستە دایکەکان کچەکانیان فێربکەن کەشویان کرد چاودێری مافی مێردەکانیان بکەن‌و هەوڵ بدەن رەزامەندی ئەوان دەستەبەر بکەن، پێویستە هەموو دایکێك پێش شووکردن‌و گواستنەوەی کچەکەی سوننەت‌و رێبازی ژنانی سەلەف‌و ئافرەتانی صالح‌و راستاڵ بەگوێچکەیدا بداو ئامۆژگاری دڵسۆزانەی بکا.

دەگێرِنەوە عەمری کورِی حەجەر مەلیکی کیندە خوازبێنی ئوم ئییاس کچی عەوفی شەیبانی کرد، جا کە کاتی گواستنەوەی هات، دایکی کچەکە دوو بەدوو لەگەڵ کچەکەی کۆبووەوە بەم شێوەی خوارەوە ئامۆژگاری کچەکەی کرد؛ لەم ئامۆژگاری کردنەیدا بناغەی ژیانی کامەرانی بۆ دەستنیشان کرد، ئەرکی سەرشانی بەرامبەر مێردەکەی بۆ روونکردەوەو پێی وت:

ئەی کچی خۆشەویستم! نەصیحەت‌و ئامۆژگاری ئەگەر بەهۆی عاقڵمەندی‌و ئەدەب‌و رەوشتی جوان پاشگوێ بخرایە، بێگومان ئەتۆ پێویستت بەئامۆژگاری نەدەبوو، بەڵام ئامۆژگاری‌و نەصیحەت یادخەرەوەی غافڵ‌و یارمەتیدەری عاقڵە. خۆ ئەگەر ئافرەتێك پێویستی بەشوکردن نەبوایە بەهۆی دەوڵەمەندی باوك‌و دایکی‌و پێویستیان بەکچەکەیان، ئەوە بێگومان ئەتۆ لەهەموو کەس زیاتر بێ ئاتاج دەبووی لەشوکردن، بەڵام یاسای بوونەوەر وایە ئافرەتان دەبێ شوبکەن‌و پیاوان ژن بێنن، ئافرەت بۆ پیاو دروست کراوەو پیاو بۆ ئافرەت دروست کراوە.

ئەی کچی خۆم ئەتۆ ئەو کەش‌وهەوایەی تا ئێستا تێیدا ژیاوی بەجێی دێڵی، ئەو لانەو ماڵو خێزانەی تێیدا پەروەردە بووی لێی جیادەبیەوە، دەچیە لانەو ماڵو حاڵێك لەوەپێش پێی ئاشنانەبووی، دەبیە هاوسەری کەسێك نەتناسیوەو هۆگری نەبووی، بەگوێرەی دابو نەریتو شەریعەتو یاسا ئەو کەسە چاودێرو خاوەنی تۆیە ئەتۆ ببە بە کارەکەرو ئەمەتە، ئەو بۆت دەبێتە رەنجبەرو کۆیلە. لەبەرامبەریدا دە رەوشت رەچاوبکە بۆت دەبنە مایەی هێزو تێشوو هۆکاری بەختەوەری لە ژیانتدا.

یەکەمو دووەم: بەدڵو بەگیان پێی رازی بەو بە قەناعەتەوە رێزی لێ بگرە، گوێڕایەڵی بەو فەرمانبەرداریی بۆ بنوێنە.

سێیەمو چوارەم: هەوڵ بدە چاوی شتی ناشیرینت لێ نەبینێ، لوتی بۆنی ناخۆشت لێ نەکا.

پێنجەمو شەشەم: بزانە کەی کاتی خەویەتیو کەی وەختی خواردنیەتی، چونکە هێرشی برسییەتی رق هەڵسێنەو خەو زڕاندن هۆکاری تورە بونو هەڵچوونە.

حەوتەمو هەشتەم: چاودێری ماڵو سامانی بە، پارێزگاری خێزانو حەشەمو عەیالی بە. جەمسەرو مەلاکی کار لە ماڵو ساماندا جوان مەزندە کردنو رێز گرتنیەتی، لەناو خاوو خێزاندا جوان بەڕێوەبردنو تەدبیرە.

نۆیەمو دەیەم: سەرپێچی فەرمانی مەکە، نهێنی بلاّو مەکەرەوە چونکە تۆ ئەگەر بێ فەرمانیت کرد دڵت کرمێ کردوە، ئەگەر نهێنی ئەوت بلاّوکردەوە ئەمین نابی لە غەدرو تۆڵەی. پاشان خۆ بپارێزە لەوەی خۆشحاڵی خۆت دەربڕی لەکاتێکا ئەو خەفەتی هەبێ، یان خۆت غەمبار نیشان بدەی لەکاتێکا ئەو کەیفخۆش بێ.

(الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وأجعلنا للمتقين اماماً). خودايه ببه‌خشه پێمان له‌ خێزان‌و وه‌چه‌و نه‌وه‌ كه‌سانێك كه‌ ببنه‌ هۆی فێنكایی چاومان، بمانكه‌ به‌ پێشه‌واو ئیمام بۆ ته‌قواكاران.

## كێشه‌و چورتمی نێوان ژن‌و مێرد

هه‌موو خێزانێك كێشه‌و نیزاعی تێده‌كه‌وێ، به‌ده‌گمه‌ن رێ ده‌كه‌وێ خێزانێك كه‌م تا زۆر كێشه‌یان تێنه‌كه‌وێ. وه‌لێ خێزانه‌كان كێشه‌كانیان جیاجیان‌و هه‌ر خێزانه‌ جۆره‌ خیلافاتێكی له‌نێواندا روده‌دا، بێگومان ئایینی ئیسلام ژن‌و مێردی هه‌ڵناون هه‌وڵ بده‌ن چاره‌سه‌ری كێشه‌كانیان بكه‌ن‌و ناكۆكی‌و چورتمی نێوانیان نه‌هێڵن، رێنمویی هه‌ریه‌ك له‌ ژن‌و مێردی كردوه‌: كه‌ رێگه‌ چاره‌ی كێشه‌كه‌ بدۆزێته‌وه‌و به‌كاری بێنێ له‌به‌رامبه‌ر هاوسه‌ره‌كه‌یدا، هه‌روه‌كوو چۆن هه‌ڵیناون: كه‌زوو به‌پیر چاره‌سه‌ری كێشه‌كه‌یانه‌وه‌ بچن‌و نه‌هێڵن ناكۆكییه‌كه‌یان ته‌شه‌نه‌ بكاو ئه‌سته‌م ببێ. قورئان ده‌فه‌رموێ: {وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ – النساء/٣٤} ئه‌و ئافره‌تانه‌ی ترسی ئه‌وه‌تان لێیان هه‌یه‌ ناچیزه‌بن‌و سه‌رپێچی ئێوه‌ی مێردیان بكه‌ن، ئامۆژگارییان بكه‌ن، ئه‌گه‌ر به‌ ئامۆژگاری نه‌هاتنه‌وه‌ سه‌ر رێی راست ئه‌وه‌ له‌گه‌ڵیان مه‌خه‌ون، ئه‌گه‌ر به‌وه‌ش عاریان نه‌نا به‌ ئه‌سپایی‌و بۆ ته‌مێ كردن لێیان بده‌ن.

یان ده‌فه‌رموێ: {وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ – النساء/١٢٨} ئه‌گه‌ر ئافره‌تێك ترسا له‌وه‌ی مێرده‌كه‌ی لێی هه‌ڵگه‌رێته‌وه‌، یان پشتی تێ بكاو روی لێ وه‌رگێرێ، ئه‌وه‌ واباشه‌ روبكه‌نه‌ صوڵح‌و ئاشته‌وایی‌و بواری صوڵح ره‌چاو

بکەن‌و بە گفت‌و گۆ کێشەی نێوانیان چارەسەر بکەن. بێگومان ڕەچاو کردنی بواری صوڵح‌و ئاشتەوایی خێرو فەڕەو هیچ خەراپیەکی تێدانیە.

بەڵێ: پەیڕەوو پرۆگرامی ئیسلامی چاوەڕوانی ئەوە ناکا تا کێشەکە گەورە دەبیٚ‌و بە بنبەست دەگا. ناچیزەبووون‌و سەرپێچیکردنەکە رودەداو زەق دەبێتەوەو ئاڵای سەرپێچی‌و دەست لێك بەردان بەرزدەکرێتەوە، قەوامەو شکۆمەندی پیاو بەسەر خێزانیەوە کرموڵ دەبیٚ‌و لاساریی‌و سەرپێچیکردنەکە ئاشکرا دەبیٚ‌و ناشاردرێتەوە خێزان دوولەت دەبیٚ‌و دەبێتە دوو کەمپی دژبەیەك. ئیتر ئەودەمە کەکار گەیشتە ئەو ئاستە عیلاج‌و چارەسەر گران دەبن‌و هەوڵی یەکخستنەوەو ئاشتبوونەوە بێهودە دەبیٚ. کەوابیٚ پێویستە دەست پێشخەری بکریٚ بۆ چارەسەریکردنی هۆکارە سەرەتاییەکانی ناچیزەبون پێش ئەوەی جڵەو لەدەست دەرچیٚ‌و شتەکە گەورەبیٚ. چونکە سەرەنجامی گویٚ پێنەدان‌و نەدۆزینەوەی چارەسەر لێك هەڵوەشانی خێزانەو روخانی کۆمەڵ‌و پچڕانی حەبلی پتەوی نێوان ژن‌و مێردو هەردوو بنەماڵەی ئافرەت‌و پیاوەکەیە. خۆ ئەگەر جودابونەوەکەش زوو بەزو نەیەتە دی، کێشەو دڵەڕاوکیٚ‌و خەم‌و رق‌و قین باڵی بەسەر ئەو خێزانەدا دەکێشیٚ‌و ئاسودەیی‌و ئارامی نامێنیٚ، تەربیەو بەخێوکردنی منداڵ‌و وەچەی تێدا گونجاو نابیٚ‌و ئەو ماڵە دەبێتە کانی ئاشوب‌و ململانیٚ‌و شەڕو هەرا، تا سەرەنجام لێك پچڕان دێتە دی‌و خێزان پەرتەوازەو منداڵ بیٚ سەرپەرشتیارو نازی باوك‌و دایك دەمێننەوە، بەخێوکردن‌و پەروەردەکردنیان لەناو کەش‌و هەوایەکی ناسروشتی‌و نەگونجاودا دەستەبەر دەبیٚ: کە زۆربەی کات سەردەکێشیٚ بۆ گیرۆدەبوونیان بە نەخۆشی دەرونی‌و دەمارگیری‌و جەستەیی‌و لەدەستدانی رەوشت‌و ئەخلاق‌و تێکڕوخانی کەسایەتی‌و ئالودەبوونیان بەچەند شێوە (شذوذ)و لاڕیٚ بوون.

کەوابێ کارەکە خەتەرناکەو پێویستە هەر لەگەڵ نیشانە سەرەتاییەکانی ناچیزەبوون سەریان هەڵداو هەستیان پێ کرا زوو بەرەو رویان ببینەوەو چارەسەریان بکەین‌و نەهێڵین پەرەبسێنن‌و لەکۆنترۆڵ دەربچن.

### چارەسەری ناچیزەبوونی ئافرەت

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا – النساء/٣٤} یەکەم چارەسەرو هەنگاو نان بۆ زاڵبون بەسەر دیاردەی ناچیزەبوونی ئافرەت ئامۆژگاریکردن‌و گفت‌و گۆی حەکیمانەیە هەڵبەتە نەصیحەت‌و ئامۆژگاری یەکەم ئەرکی سەرشانی سەرۆکی خێزانە، دەبێ حەکیمانە ئەنجامی بدا، ئامۆژگاریکردن‌و ڕێنمویی کارێکی پیرۆزو چاکسازییە هەموو کاتێك پێویستە لێپرسراوی خێزان بەرچاوی بگرێ‌و ئەنجامی بدا. {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ – التحريم/٦}: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە خۆتان‌و ماڵ‌و منداڵتان بپارێزن لەئاگرێك: کە سوتەمەنییەکەی ئادەمیزادی بتپەرست‌و بتەکانیانن، ئامۆژگارییان بکەن لەڕێی ڕاستەقینەی ئایین لانەدەن‌و پابەندی ئەخلاق‌و ڕەوشتی ئیسلامی‌و شەریعەتی پیرۆزی بن.

وەلێ لەم حاڵەدا نەصیحەت‌و ئامۆژگاریی ڕێڕەوێکی تایبەتی‌و ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە: کە بریتییە لە چارەسەرکردنی ناچیزەبوونی ئافرەت پێش ئەوەی کێشەی لەگەڵ مێردەکەیدا بگاتە بنبەست‌و دەرو جیران‌و خزم‌و کەس پێی بزانن.

بەڵام پەندو ئامۆژگاری جاری واهەیە لەم بارودۆخانەدا بێ سودەو کاریگەریی خۆی نابێ، کاتێك ئافرەتەکە هەواو لوتبەرزییەکی تێدا هەبێ، یان

هەڵچوون و خۆبەزلزانی و باڵا دەستییەك لەخۆیدا بەدی بکاو خۆی پێ لەمێردەکەی بەرزتر بێ بەهۆی جوانی یان دەوڵەمەندی یان پلەو پایەی خێزانی یان هەر ئیعتیبارێکی تر؛ کە ئافرەتەکە وا لێ بکا ئەوەی لەبیر بچێتەوە، کە هاوبەش و هاوسەرە لە خێزاندا نەك دژو دوژمن و رکابەرو خۆ بەزلزان و لوتبەرز!

ئالێرەدا چارەسەری دووەم دێتەکایەوە بۆئەوەی خۆبەزلزانی ئافرەتەکەو شانازیکردنی بەسەر مێردەکەیدا بەرپەرچ بدرێتەوە تێی بگەیەندرێ: کە ئەوشتانەی ئەو پێیان دەنازێ لە جوانی و دەوڵەمەندی و خانەدانی چ نرخێکیان نیەو نابێ بیانکاتە چەکی دەستی بۆ بەربەرەکانی مێردەکەی. ئەمەش بەچی دەستەبەر دەبێ بە پشت تێکردنی و لەگەڵ نەنووستنی، بۆیە قورئان دەفەرموێ: {وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ – النساء/٣٤}: لەژووری نووستندا روویان لێ وەرگێڕن و دەستیان لەگەڵ تێکەڵاو مەکەن. وشەی (ألمضاجع) کۆی (مَضْجَعَ) کە بەمانا شوێنی ئیغراو کێشکردنە: کە ئافرەت بەهۆیەوە پیاو کەمەند کێش دەکاو دەسەڵاتی خۆی بەسەردا دەسەپێنێ. جا هەرکاتێ پیاو توانی خۆڕاگریێ و ئەم دەسەڵاتەی ژنەکە نازی پێوەدەکا تێك بشکێنێ، ئەوە بێگومان کاریگەرترین چەکی دەستی ژنەکەی داگیر کردوەو دەسەڵاتی لێ ستاندوە.

هەڵبەتە بۆ ئەم حاڵەتەش رێو شوێنێکی تایبەتی هەیە، پێویستە بگیرێتەبەر، ئەم پشت تێکردن و روو لێ وەرگێڕان و لەگەڵ نەنووستنە نابێ لە دەرەوەی ژووری نووستن بێ، نابێ وابکا منداڵ و خاوو خێزان پێی بزانن، نەوەکوو کاریگەری دەروونی بکاتە سەر منداڵەکان، نابێ بەئاگاداری دەروجیران و خزم و بێگانەبێ، نەوەکوو کەسایەتی ئافرەتەکەی پێ بشکێ و وای لێ بکا هەوڵی تۆڵەکردنەوە بداو ناچیزە بوونەکەی زیادبکا. چونکە مەبەست

لەهەجرو پشت تێكردن چارەسەری ناچیزەبوونەكەیە نەك زەلیل كردنی ئافرەتەكەو روشاندنی كەسایەتیەكەی. یان توشكردنی منداڵەكانیان بە نەخۆشی دەروونی.

وەلێ رێدەكەوێ ئەم چارەسەرەش سەركەوتن بەدەست نەهێنێ، ئایا دەبێ دەسەوەسان دانیشن‌و بیر لەچارەسەری تر نەكرێتەوەو لێ بگەڕێین ئەم موئەسسەسە پیرۆزە تێك بروخێ؟! بێگومان لێرەدا ئیجرائاتێكی تر هەیە، هەرچەندە عونفێكی تێدایە بەڵام لەبەرامبەر روخانی موئەسسەسەی خێزان ناچار پەیڕەوی دەكرێ. چونكە عیلاجەو دەرمانە، دەرمان تاڵیش بێ ناچاری بیچێژی. ئەم عیلاجەش لێدانە بۆ تەمبێ كردن‌و بەرەنگاربوونەوەی ناچیزەبوون، پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێ: {وَاضْرِبُوهُنَّ – النساء/٣٤} هەڵبەتە ئەم لێدانە بە مەبەستی ئەشكەنجەو تەعزیب‌و تۆڵە ساندنەوە نیە، سوكایەتی پێكردن‌و مل پێ شۆڕكردن نیە، هەروەها نابێ لێدانەكە بۆ مل پێ شۆڕكردن‌و ناچاركردن بێ بە ژیانێك كە پێی نارازییەو بیەوێ بەزۆر وای لێ بكا بە ژیانەكە رازی بێ... بەكورتی دەبێ لێدانەكە بەمەبەستی ئەدەب دادان‌و راهێنان بێ، دەبێ دافیع‌و پاڵنەرەكەی رق‌و قین نەبێ، دەبێ سۆزو رەحمی لەگەڵ بێ، دەق دەبێ لە ئەدەب دادانی باوك بۆ منداڵی یان مامۆستا بۆ قوتابی بچێ. بێگومان ئەم ئیجرائات‌و كارانە دروستن بۆ چارەسەركردنی دیاردەی ناچیزەیی‌و تۆران‌و سەرپێچیكردن پێش ئەوەی كارەكە لەدەست دەرچێ‌و گەورە ببێ‌و چارەسەركردنی زەحمەت بێ، بەڵام لەهەمان كاتدا ئایینی ئیسلام هۆشداری داوە بەوەی كە پراكتیزە كردنی ئەو چارەسەرانە توندڕەوی تێدا نەبێ‌و خراپ بەكارنەهێندرێ‌و نەبێتە هۆكارو رێخۆشكردن بۆ زیان گەیاندن بە ئافرەتەكەو چەوساندنەوەی. بێگومان پێغەمبەری مەزن بەشێوەی كردەیی‌و عەمەلی، بە رێنمویی‌و گوفتار پراكتیزەی ئەو چارەسەری

کـردووەو دەرحـەق بـە خێزانـەکانیو هـەوڵی داوە زوو بـەپیر چارەسـەری ناچیزەبوونەوە بچێو نەهێڵێ کارەکە تەشەنە بکاو لەدەست دەرچێ، لەزۆر بۆنەو روداویشدا ئەوەی دوپات کردۆتەوە: کە نابێ لەبەکارهێنانی چارەسەری ناچیزەبووندا زیادەڕەوی بکرێ.

لە معاویەی کوڕی حەیدەرەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! مـافی ئـافرەتی هەریـەکێکمان بەسـەر مێردەکەیەوە چیە؟ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: «أَنْ تُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمْتَ وَتَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ - أَوِ اكْتَسَبْتَ - وَلاَ تَضْرِبِ الْوَجْهَ وَلاَ تُقَبِّحْ وَلاَ تَهْجُرْ إِلاَّ فِي الْبَيْتِ»[1]: مافی ئافرەت بەسەر پیاوەوە ئەوەیە بژیوو پۆشاکی بۆ دابین بکا، بەهیچ شێوەیەك لـە دەمو چاوی نـەدا، جنیـوو توانجو تەشەری ئاڕاستە نەکا لەژووری نووستندا نەبێ خۆی لێ گۆشەگیر نەکا.

لـە ئیاسـی کـوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی ئـەبو زوبـاب ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: «لاَ تَـضْرِبُوا إِمَـاءَ اللَّـهِ». لەبەنـدە مێینـەکانی خـودا مـەدەن. عومـەری کـوڕی خـەتاب هاتـە خزمـەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئافرەتـان وایـان لێ هـاتووەو شوڵیان لێ هەڵکێشاوە بەسەر مێردەکانیاندا هەڵدەشاخێن، پێغەمبەر ڕێگـای دا لـەژن بـدرێ، ئافرەتگـەلێك دەورەی مـاڵی پێغەمبـەریاندا، شـکایەتیان لـە مێردەکانیان دەکردو نارەزایی خۆیان دەربڕی بەرامبەر ئەو ڕێگـە پێدانـە بـە مێردەکانیان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لَقَـدْ أَطَـافَ بِـآلِ بيـت مُحَمَّـدٍ نِـسَاءٌ كَـثِيرٌ يَـشْكُونَ أَزْوَاجَهُـنَّ لَـيْسَ أُولَئِـكَ بِخِيَـارِكُمْ ».[2] ئافرتگـەلێکی زۆر دەورەی ماڵـە محمـدیان داوە نـارەزایی خۆیـان دەردەبـڕن

---

[1] لەوەپێش لەباسی (مافی ئافرەت بەسەر پیاوەوە) باسکرا.

[2] حسن صحيح: (ص.جة/١٦١٥) ، د(٢١٣٢/١٨٣/٦)، جة(١٩٨٥/٦٣٨/١).

بەرامبەر هەڵس و کەوتی مێردەکانیان کە لێیان داون، هەڵبەتە ئەو مێردانە باش نین و باشینەکانی ئێوەنین.

لە عەبدوڵڵای کوڕی زەمعەوە ڕیوایەتکراوە: کە گوێی لێ بوو پێغەمبەری خودا دەیفەرموو: «يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ يَجْلِدُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ ، فَلَعَلَّهُ يُضَاجِعُهَا مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ».[1] وادەبێ یەکێك لەئێوە پەلاماری ژنەکەی دەداو دایدەپلۆسێ دارکاری دەکاو وەکوو چۆن کۆیلەکەی دارکاری دەکا، لەوانەشە کۆتایی ڕۆژەکە سەرجێی لەگەڵدا بکا.

هەرچۆنێك بێ ئەو ئیجرائات و چارەسەریانەی دانراون بۆ ناچیزەبوون ئەندازەیەکیان هەیە، هەرکاتێ گەیشتە ئەو ئەندازەیە دەبێ ڕابگیرێن و کاریان پێ نەکرێ، چونکە ئەوانە هۆکارو وەسیلەن مەبەست و غایەنین، هەرکاتێ مەبەست هاتەدی، هۆکارەکان پێویست نامێنن، قورئان دەفەرموێ: {فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً – النساء/٣٤} ئافرەتە ناچیزەبووەکان کە هاتنەوە ژێر ئیطاعەو بەگوێکردن و فەرمانبەرداری، ئیتر واز لەکاراکردنی چارەسەریەکان بێنن، چونکە ئەو هۆکارانە بۆیە دەگیرێنەبەر بۆ قەلاچۆکردنی ناچیزەبوونەکەو دەستەبەربوونی فەرمانبەرداریی و ئیطاعەکردنە. کە ئەمانە هاتنەدی، ئیتر چیدی هۆکارەکان ناگیرێنەبەر، بەڵام مەرجە دەبێ بەگوێ کردن و طاعەتەکە بە تۆبزی نەبێ، بەڵکوو بە ویست و ئیختیار بێ، بۆئەوەی بتواندرێ بکرێتە بناغەی دامەزراندنی خێزان و کۆمەڵ، چونکە ملکەچکردنی بەتۆبزی و زەخت بەرهەمی باشی نابێ و ئەو ژن و مێردە لێك ناحەسێنەوە.

دەقی قورئان ئاماژە بەوەدەکا: کە پەیڕەوکردنی چارەسەریەکان دوای دەستەبەربوونی ئاکام و مەبەستەکان زێدەڕۆیی و ستەمکردنە، سەرپێچی

---

[1] متفق علیه: خ(٤٩٤٢/٧٠٥/٨)، م(٢٨٥٥/٢٠٩١/٤)، ت(٣٤٠١/١١١/٥).

کردنی فەرمانی خودایە {فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً – النساء/٣٤} دوای ئەوەی ئافرەتە ناچیزەبووەکان هاتنەوە سەر خەتو فەرمانبەرداری مێردەکانیان بوون، ئیتر واز لە رێگای چارەسەرییەکان بێنن‌و وەلایان بنێن.

ئەمجار دوا بەدوای ئەو نەهیە صەریحە، ئەوە بەگوێچکەی مێردەکاندا دەدا: کە خودا باڵا دەستو گەورەو بەتوانایەو هەرچی بیەوێ دەیکاو هیچی لێ عاصی نابێ. بۆئەوەی دڵەکان ئارام بگرن سەر رەقی قەڵاچۆ بکرێ، یاردەی بەغیی‌و سەرپێچی بپوکێتەوە، ئەمەش ئوسلوبێکی قورئانە دەیەوێ بەشێوەی تەرغیبو تەرهیب ئەگەر بڕی دڵو دەروون دیاردەی بەغیی‌و خۆبەزلزانی تێدابێ لەبێخی دەربێنێ.

## چارەسەری یاخی بوونی مێرد

قورئان دەفەرموێ: {وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا – النساء/١٢٨}: ئەگەر ئافرەتێك ترسا لەوەی مێردەکەی لێی یاخی بێ، بەگوێرەی پێویست هەڵس‌و کەوتی مێردانەی لەگەڵ نەکا، روی نەدەدایە، بژیوی پێویستی بۆدابین نەدەکرد، بە سۆزو رەحمەوە لەگەڵی نەدەدوا، لەبەر هەر هۆیەك لە هۆیەکانی (ناشیرینی، پیری، نەخۆشی ... هتد) ئەوە لەو حاڵانەدا ج خراپیەك نیە: کە پەنا ببرێتە بەر صوڵح‌و ئاشتەوایی‌و رێکەوتن، بەمجۆرە ئافرەتەکە واز لەهەندێ مافی خۆی بێنێ بۆئەوەی لەژێر نیکاحی مێردەکەیدا بمێنێتەوەو رێگابدا مێردەکەی ژنێکی تر بێنێ، یان برێ لە ماڵی خۆی بدا بە مێردەکەی بۆئەوەی تەڵاقی بداو لەدەستی رزگاری بێ، هەڵبەتە هەموو کاتێ صوڵح‌و رێککەوتن باشترە لە لێك جیابونەوەو تەڵاقدان، یان لەناچیزەبون‌و روو لێ وەرگێڕان، یان لەشەڕو ئاژاوەو پشێوی ناو خێزان. ئەمەش بۆ پارێزگاریکردن

لەسەر مانەوەی چەتری خێزانو تێك نەڕوخانیو بەرقەراربوونی گرێبەستی ژنو مێردایەتی. خۆ ئەگەر ئەو مێردانەی گلەییان لەژنەکانیان هەیە لەڕوی ناشیرینی، پیری، نەخۆشی....هتد. ئارام بگرنو چاوپۆشی بکەن لە کەمو کوڕی خێزانەکانیانو پەنا نەبەنە بەر ناچیزمبوونو توندو تیژی لەگەڵ ژنەکانیانو ئاژاوەو پشێوی نەنێنەوە، ئەوە خودا ئاگاداری ئەو چاکەیەو پاداشی ئەو مێردە خۆگرانە دەداتەوە.

بێگومان لەوەپێش مەنهەجی ئیسلامی حاڵەتی ناچیزمبوونی ئافرەتی رونکردەوە، باسی ئەو ئیجرائاتانەی کرد کە بەرچاو دەگیرێن بۆ پارێزگاریکردنی کیانی خێزانو پەیوەندی نێوان ژنو مێرد.

ئێستا باسی رێکخستنو چارەسەرکردنی حاڵەتی ناچیزمبوونی مێرد دەکا، کاتێ هەست دەکرێ دیاردەی ناچیزمبوون لەلایەن پیاوەوە سەر هەڵدەداو ئەمنو کەرامەتی ئافرەت دەخاتە خەتەرەوە، کەرامەتو ئاسایشی خێزان بەرەو هەڵدێرو روخان دەبا.

بێگومان دڵەکان گۆڕانکارییان بەسەردا دێو هەستو شعورەکان دەگۆڕێن، ئایینی ئیسلامیش مەنهەجی ژیانە، هەموو کێشەو گیرو گرفتەکانی ژیان چارەسەر دەکاو رێگا چارەیان بۆ دەدۆزێتەوە، بۆ هەموو چورتەو گیرو گرفتێکی ژیان چارەسەرو دەرمانی داناوە، نەخشەو پلانی دامەزرانی کۆمەڵو بەڕێوەچوونی داناوە. داوادەکا کۆمەڵگاو خێزانو تاك بەپێی ئەو بەرنامەو نەخشەو پلانە بەڕێوە بچنو رەفتاربکەن.

هەرکاتێك ئافرەت هەستی کرد کە لەلایەن مێردەکەیەوە پاشگوێ خراوەو ئەم پاشگوێ خستنەش سەردەکێشێ بۆ تەڵاقو دەست لێك بەردان – کەلای خودا دزێوترین حەڵاڵە – یان سەردەکێشێ بۆئەوە مێردەکەی بە تەواوی پشتی تێ بکاو بە موعەللەقی بیهێڵێتەوە، نە ژنی مێرداربێ نە ژنی

تەلاقدراوبێ بتوانێ بۆ خۆی داهاتووی خۆی دەست نیشان بکا، ئەوە لەم حاڵەدا هیچ خراپیەکی تێدانیە بۆ خۆیو بۆ مێردەکەی؛ کە پەنابەرنە بەر صوڵحو ئاشتەوایی‌و لەنێو خۆیان رێک بکەون؛ بەم جۆرە ئافرەتەکە چاوپۆشی لەهەندێ بەرژەوەندی خۆی بکا، لەبەشێک لە مارەیی‌و بژێوی خۆی گەردنی مێردەکەی ئازادبکا، یان ئەگەر مێردەکەی ژنی تری هەبوو رێگای بدا زیاتری کات لای ژنەکەی تری بمێنێتەوەو واز لە بەرژەوەندی خۆی بێنێ بۆ هەوێیەکەی بەتایبەتی ئەگەر ئەم خۆی پیربوبوو تەڕو تازەیی نەمابوو جازیبییەتی ژنانەی لەدەست دابوو.

هەموو ئەم چاوپۆشی‌و وازهێنان لە بەرژەوەندی‌و ئیثارو شتانە بە ویستو ئیرادەی خۆی بێ‌و زۆرە ملێ‌و زەختی لەسەر نەبێ، بۆ خۆی بارودۆخو بەرژەوەندیی خۆی مەزندەبکاو بڕیاری لەسەربداو بگاتە قەناعەت کە ئەمەی باشترە لەوەی تەلاق بدرێ، ئەمەیە کە قورئان ئاماژەی پێ کردووەو فەرموویەتی: {وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا – النساء/١٢٨}.

ئەمجار بەشوێن ئەم ئامۆژگاری‌و حوکمەدا، ئاماژە بەوەدەکا کە بەشێوەیەکی گشتی صوڵح کردن باشترە لە تەلاقدان‌و ناچیزەبون‌و روێ وەرگێڕان‌و پشت تێکردن، دەفەرموێ: {وَالصُّلْحُ خَيْرٌ – النساء/١٢٨}.

ئەمجار پیاو هەڵدەنێ بۆئەوەی چاکەکاربێ لەگەڵ ژنێک کە لایەنی ئاشتەوایی بگرێتەبەرو واز لەهەندێ بەرژەوەندیی خۆی دەهێنێ بۆ رازی کردنی مێردەکەی‌و رونەدانی تەلاق‌و نانەوەی ئاشوب‌و کێشە. ئەوەش رادەگەیەنێ: کە پەروەردگار ئاگادارو زانایە بە چاکەو رەفتار باشی پیاوەکە لەگەڵ ئافرەتەکەداو پاداشی باشی دەداتەوە. دەفەرموێ: {وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا – النساء/١٢٨}.

دەربارەی هۆكاری نازڵبوونی ئەم ئایەتە ئەبو داود ریوایەتێك لە هیشامی كوڕی عورووە دەگێڕێتەوە دەڵێ: خاتو عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) پێی وتم: ئەی خوشكەزای خۆشەویستم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەیەكچاو سەیری خێزانەكانی دەكرد هیچ كاممانی لەوی تر بەلاوە لەپێشتر نەبوو وەكوو یەك لەلامان دەمایەوەو چ فەرقو جوداوازی لەنێوانماندا نەدەكرد، كەم وارێ كەوتووە شەوێك هەمووومانی بەسەر نەكردبێتەوە، بەسەرماندا دەگەڕاو ئەحواڵپرسی دەكردین، تا دەگەیشتەماڵی ئەوەمان كە نۆرەی بوو شەو لای بمێنێتەوە، ئیتر لای دەمایەوە. سەودەی كچی زەمعە كاتێ كەوتە ساڵەوەو ترسا لەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی جیابێتەوە، عەرزی پێغەمبەری كرد: كە نۆرە مانەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای، دەبەخشێ بە خاتو عائیشە، پێغەمبەریش ئەوەی لێ قبوڵ كرد، عائیشە دەفەرموێ: ئایەتی {وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا – النساء/١٢٨} دەربارەی سەودەو ئافرەتی تری لەوجۆرە نازڵ بووە.

### كاتێك كێشەی نێوان ژنو مێرد پەرەی سەند چی بكرێ باشە؟

قورئان دەفەرموێ: {وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا – النساء/٣٥}: ئەگەر كێشەی نێوان ژنو مێرد پەرەی سەندو ترسی ئەوەتان هەبوو كێشەكەیان سەربكێشێ بۆ تەڵاقو لێك جودابوونەوەو شەڕو ئاژاوەی بەردەوام، ئەوە هەوڵی ئاشتبوونەوەو ئاشتەواییان بدەن حەكەمێك لە خزمی ئافرەتەكەو حەكەمێك لەخزمی پیاوە كە دەست نیشان بكەنو بیاننێرن

بۆئەوەی لەنزیکەوە گوێ لەڕازو گلەیی هەردوو ژنو مێردەکە بگرن؛ بزانن خەتای کامیانە، ئەوجا هەوڵی ڕێکخستنەوەو کوژانەوەی ئاژاوە بدەن، ئەگەر ئەو دوو حەکەمەو ژنو مێردەکە مەبەستیان بی ڕێك بکەونەوە خودا سەرکەوتوویان دەکا بۆ پێکهاتنەوەو ئاشتبوونەوە، بێگومان خودا زاناو خەبەرداره بەنیازو مەبەستی هەموو لایەکیان.

ئەوەی لەوەپێش باسکرا بۆ چارەسەری ناچیزەبوونی ژنو مێرد بۆ کاتێکە کەناچیزەبوونەکە رووی نەدابێ‌و رانەگەیەندرا بێ، هەوڵی ئەوە بدرێ نەهێڵدرێ دیاردە سەرەتاییەکانی سەرهەڵبدەن، بەڵام کاتێ ناچیزەبوونەکە روویدا، ئیتر ئەو ئیجرائاتو چارەسەریانە پەیڕەو ناکرێن، چونکە پەیڕەوکردنیان بێ هودەیە، بەرهەمی نابێ، ئێستا ناچیزەبوون روویداوەو بەربەرەکانی‌و شەڕوکێشە ئیعلان کراوە، هەریەکەیان دەیەوێ سەری ئەویتریان پان بکاتەوە، کەواتە ئەم حاڵەتە چارەسەری تری گەرەکە، دەردەکە دەرمانی تری دەوێ.

هەروەها کەبیندرا بەکارهێنانی ئەم ئیجرائاتانە بێ سودە پتر ئاژاوەکەی نێوان ژنو مێردەکە بەهێز دەکەن‌و ناچیزە بوونەکە بەدی دێنن‌و هێڵەکانی نێوانیان کەهێشتا نەپچڕاون دەپچڕێنن، یان کەزانی پەیڕەوکردنی ئەو ئیجرائاتو هۆکارانە بێ ئاکامن‌و نەتیجەیان نابێ، لەم حاڵەتانەدا بەگشتی مەنهەجی ئیسلامی ئاماژە بە چارەسەرییەکی تر دەکاو دەرمانێکی تر بۆ نەخۆشییەکە دەستنیشان دەکا، بۆ ئەوەی ئەو خێزانە نەڕوخێ‌و ئەو گرێبەستو دامەزراوەیە هەڵنەوەشێتەوە، ئەو پەیوەندییە گیانی‌و مادییە نەپچڕێ‌و ئەو هێلانە تێك نەچێ، نەهێڵدرێ هەروا بەهەوانتە ئەو خێزانە تێك بچن‌و ئەو گرێبەستە پیرۆزە هەڵبوەشێتەوە. بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ

اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا – النساء/٣٥}: بەڵێ ئەوە مەنهەجی ئیسلامییە، بانگەوازی ناکا بۆ دەستەوەستانبوونو ملکەچکردن بۆ دیاردەی ناچیزەبوونو بەرپابوونی ئاژاوەی ناو خێزان، هەروا ڕێگە نادا خێرا گرێبەستی نێوان ژنو مێردەکە لەڕێگەی تەڵاقەوە پچڕانی بەسەردا بێو خێزان تێك بچێو لانە لەمناڵو زاڕۆك تێك بچێو خەسوو خەزورو کەسانی تر خەفەتبار بکرێن، خزمایەتی بگۆڕدرێ بە دوژمنایەتیو خۆشەویستی بەرقو کینە، کە لەڕوخانی خێزاندا جگە لەژنو مێرد کە دەستیان هەیە لە ڕوخانەکەدا کۆمەڵێك خەڵکی تر بەمنداڵو گەورەوە دەبنە قوربانیو ستەم لێ کراو هیچ دەسەڵاتێکیشیان نیە.

جا لەڕوانگەی ئەوەوە کە دامەزراوەی خێزان دامەزراوەیەکی پیرۆزو بەنرخە لەدیدی ئیسلامدا، ڕۆڵی هەیە لەپێکهاتەی کۆمەڵگادا لە گەشەکردنو بەرەو پێشەوە چوونیو تەزویدکردنی بەچینی تازەو پێشکەوتنی لە ڕەوڕەوەی مێژوودا، بۆیە ئیسلام پەنا دەباتە بەر ئەم دوا چارەسەرییە، ئەویش ئەوەیە: هەرکاتێ ترسی شیقاقو دەست لێك بەردان هاتە کایەوە ئیسلام فەرمان دەکا بە بنەماڵەو خانەوادەی هەردوولا: کە هەرلایەکیان حەکەمێك دەست نیشان بکەن، حەکەمێك لەخانەوادەی ئافرەتەکەو حەکەمێك لەخانەوادەی پیاوەکە بەهێدیو لەسەرەخۆ کۆببنەوە بە ئەعصابێکی ساردو دوور لەهەڵچوونو ئینفیعالو هەڵدانەوەی لاپەڕەی کۆنو ئەو هۆکارانەی جەوی ژنو مێردایەتی لێ لێڵ کردوونو کێشەکەیانی بە بنبەست گەیاندووە، شتی بچوکی لێ گەورە کردوون، پەیوەندییە ئەرێنیو هۆکارە جوانەکانی ژنو مێردایەتی لێ پەردەپۆش کردوون، هەروا دەبێ ئەو حەکەمە حەریص بن لەسەر پارێزگاری سومعەی هەردوو بنەماڵەو بەسۆزو ڕەحم بن بۆ منداڵی ژنو مێردەکەو پاشەڕۆژیان، گیانی تۆڵە ساندنەوەو

سەرخستنی لایەکیان بەسەر لاکەی تریاندا تێدا نەبێ، بەیەك چاو سەیری هەردوو لابکەن، بەرژەوەندیو خێری هەردوولایان مەبەست بێ، بیانەوێ ئەو خێزانە لە لێك هەڵوەشانو دەست لێك بەردان بپارێزنو نەهێڵن ئەو لانە پیرۆزە تێك بچێ.

لەهەمان کاتدا هەردوو لە حەکەمەکان ئەمینو باوەڕ پێکراون لەسەر پاراستنی نهێنی ژنو مێردەکان چونکە خزمو ئەهلی خۆیانن، ئەگەر نهێنییەکیش هەبێ ئەوان دەیپارێزنو بڵاوی ناکەنەوە، چونکە هیچ بەرژەوەندییان لە ئاشکراکردنی ئەو نهێنییەدا نیە بەڵکوو بەرژەوەندییان لەوەدایە سوڕگومی بکەنو موداراتی لەگەڵدا بکەن.

هەردوو حەکەمەکە کۆدەبنەوە بە مەبەستی ڕێکخستنەوەو چاککردنەوەی نێوان ژنو مێردەکە، ئەگەر لەناخی ژنو مێردەکەدا رەغبەتی ڕێککەوتنەوە هەبێو بیانەوێ دەست لێك بەرنەدەن، ئەوەی کەوتۆتە نێوانیانەوە ڕق هەڵسانێك بووە ئەو ڕەغبەتەی داپۆشیوە، ئەوە بێگومان بەیارمەتی ئەو ڕەغبەتەی ئەوانو دڵسۆزی خۆیان خودا بەرەکەت دەخاتە هەوڵەکانیانەوەو سەرکەوتوو دەبن لەصولحو ڕێکخستنەوەکەیاندا {إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا – النساء/٣٥} ئەوان بەدڵسۆزی هەوڵی صولح دەدەن خوداش یارمەتیدەریان دەبێو سەرکەوتوویان دەکا لەئیشەکەیاندا.

### شتێك حەڵاڵ بێ بۆ لەخۆمانی حەرام بکەین؟
### بۆ شتێك حەڵاڵە بۆت لەخۆتی حەرام دەکەی؟

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەتەیەکی هەبوو دەچووەلای، خاتو عائیشەو خاتو حەفصەی خێزانی هەمیشە دژی بوونو باسیان دەکرد تا وایان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردلەخۆی حەرام بکا! ئیتر پەروەردگار ئایەتی {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ

تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ – التحريم/١} نازلكرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی شتێك لەخۆت حەرام دەکەی کە خودا بۆی حەلاڵ کردووی؟ دەتەوێ بەوکارەت خێزانەکانت ڕازی بکەی.

لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: ئەگەر پیاو خێزانی خۆی لەخۆی حەرام کرد ئەوە بەسوێند دادەنرێو پێویستە کەفارەتی بدا، ئەمجار ئایەتی {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ – الأحزاب/٣١} خوێندەوە: بێگومان لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئێوە قودوەتو چاولێکەری هەیەو شوێنی بکەون.[1]

کەسێك بەژنەکەی بڵێ ئەتۆ لەمن حەرام بی کەفارەتی سوێندی دەکەوێتە سەر، هەر ئەوەشە لەقورئاندا ئاماژەی پێ کراوە دەفەرموێ: {لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ – المائدة/٨٩}.

## سوێندخواردنی مێرد لەخێزانی (الایلاء)

ئەگەر پیاو سوێندی خوارد لەژنەکەی کە سەرجێی نەکا بۆ ماوەیەك کەمتر لەچوار مانگ، ئەوە واباشە کەفارەتی سوێندەکەی بداو بچێتە لای ژنەکەی. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيَأْتِهَا وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ».[2] کەسێك

---

[1] متفق عليه: م (١٤٧٣/١١٠٠/٢) وهذا لفظه، خ (٥٢٦٦/٣٧٤/٩).

[2] صحيح: (ص/٦٢٠٨)، م (١٦٥٠/١٢٧١/٣)، ن (١١/٧)، جه (٢١٠٨/٦٨١/١).

سوێندی خوارد کە کارێك نەکا یان بیکا دوایی بۆی دەرکەوت پێچەوانەکەی باشترە باسوێندەکەی لەخۆی بخاو کەفارەتی بدا.

ئەگەر کەفارەت نەدا دەبێ خۆبگرێ تا ماوەکە بەسەر دەچێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوێندی لەخێزانەکانی خوارد کە بۆ ماوەی مانگێك نەچێتە لای خێزانەکانی «آلَى رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – مِنْ نِسَائِهِ ، «وَكَانَتِ انْفَكَّتْ رِجْلُهُ ، فَأَقَامَ فِي مَشْرُبَةٍ تِسْعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً».

وتیان ئەی پێغەمبەری خودا! (دروودی خودای لەسەر بێ) جەنابت سوێندەکەت بۆ مانگێك خواردبوو؟ فەرمووی: «إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ» مانگ‌و بیست‌و نۆ رۆژ دەبێ.

وەڵێ ئەگەر مێرد سوێندی خوارد کە هەرگیز نەچێتە لای خێزانی، یان ماوەی دیاری کرد زیاد لەچوار مانگ بوو، ئەوە ئەگەر کەفارەتی سوێندەکەی داو چووە لای خێزانی ئەوە باشە، ئەگینا چاوەڕێ دەکرێ تاماوەی چوار مانگ تێپەڕ دەبێ، پاشان ئافرەتەکە داوای لێ دەکا یان هەڵس‌وکەوتی ژن‌و مێردایەتی لەگەڵ بکا، یان تەلاقی بدا، چونکە خودا دەفەرموێ: {لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ. وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ – البقرة/٢٢٦-٢٢٧}: ئەوانەی سوێند لەژنەکانیان دەخۆن بۆ ماوەی چوار مانگ مۆڵەتیان دەدرێتێ، جا ئەگەر لەو ماوەدا مێرد کەفارەتی سوێندەکەی داو هەڵس‌وکەوتی خۆی لەگەڵ خێزانیدا ئاسایی کردەوە، ئەوە خودا لێخۆشبووەو بە بەزەییە، خۆ ئەگەر مێردەکان لەو هەڵس‌وکەوتەی خۆیان پەشیمان نەبوونەوەو بڕیاری دەست لێك بەردان‌و تەلاقیان گرتە بەر ئەوە خودا شنەواو بینایە.

لەئیمامی نافیع ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەربارەی ئەو (ئیلا)یەی خودا لە قورئاندا ناوی هێناوە، دەیفەرموو:

حـەڵاڵو ڕەوا نیـە بـۆ مێردەکـەی دوای تـەواوبوونی مـاوەی سـوێندەکە بـە موعەللـەقی ژنەکـە بهێڵێتـەوە بـەڵکوو دەبـێ یـان بەشـێوەیەکی ئاسـاییو مەعروف ژنەکە لای خۆی بهێڵێتەوەو ژیانی ژنو مێردایەتی لەگەڵدا دەست پـێ بکاتـەوە یـان پەنابەرنـە بـەر ڕێگاچـارەی تـەڵاق، وەکـوو خـودا فـەرمانی کردووە.

## ظیهار کردنی مێرد لەژنی خۆی

کەسـێك بـەخێزانی خـۆی بڵـێ: تـۆ وەکـوو دایکـم وای بـۆمن، ئـەوە بەظیهارکەر حیساب دەکرێو یەکسەر ژنەکەی لێ حـەرام دەبـێ. نابـێ بـەهیچ شێوەیەك توخنی بکەوێ، هـەتا ئـەو کەفارەتـەی کە لـەم ئایەتانـەی دواییـدا دیاری کراوە دەفعی دەکا کە دەفـەرموێ: {وَالَّـذِينَ يُظَـاهِرُونَ مِـن نِّسَائِهِمْ ثُـمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْـلِ أَن يَتَمَاسَّـا ذَٰلِكُـمْ تُوعَظُـونَ بِـهِ وَاللَّـهُ بِمَـا تَعْمَلُـونَ خَـبِيرٌ. فَمَـن لَّـمْ يَجِـدْ فَـصِيَامُ شَـهْرَيْنِ مُتَتَـابِعَيْنِ مِـن قَبْـلِ أَن يَتَمَاسَّـا – المجادلة/٣}: ئەوانەی ظیهار لەژنـەکانیان دەکـەن بـەم جـۆرە مێـرد بـەخێزانی بڵێ: تۆ وەکوو پشتی دایکم وای، وەکوو دایکـم سـەیرت دەکـەم، ئـەوە یـەکسەر ژنەکەی لێ حەرام دەبێ، دەبـی پـێش ئـەوەی بچنە لایـانو سـەرجێیان بکـەن، کـەفارەتی سـوێندەکەیان بـدەن: کەبریتیـە لـەئازادکردنی کۆیلەیـەك {ذَٰلِكُـمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ. فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِـسْكِينًا ذَٰلِـكَ لِتُؤْمِنُـوا بِاللَّـهِ وَرَسُـولِهِ وَتِلْـكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ – المجادلة/٤}: کەسێك کۆیلەی دەست نەکەوت یان بـۆی هەڵنەسـوڕا دەبـێ دوو مـانگ لەسـەریەك بـەرۆژو بـێ، پـێش ئـەوەی سـەرجێی لەگـەڵ ژنەکـەی بکـا، ئەگـەر نـەیتوانی بـەرۆژو بـێ دەبـێ خـۆراکی شەسـت هـەژار بـدا؛ شەسـت کەسـی هـەژار ژەمێـك تێـر بکـا لـەخواردنێکی

مامناوەندی کەخۆی دەیخوا {ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ - المجادلة/٤}.........

لەخوومیلەی کچی مالیکی کوڕی ثەعلەبەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: مێردەکەم کەناوی ئەوسی کوڕی صامیت بوو ظیهاری لێ کردم، منیش هاتمە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شکاتم لە ئەوس کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی ئەوس بەرپەرچی دەدامەوە، دەیفەرموو: لەخودا بترسە ئەو کوڕی مامی خۆتە، زۆری پێ نەچوو، نیگا هاتە خوارەوە {قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ - المجادلة/١}. بێگومان خودا وتەو سکاڵای ئەو ئافرەتەی بیست کە دەربارەی مێردەکەی لەگەڵ تۆ دەدوا ئەی پێغەمبەری خودا!

کە ئەم نیگایە دابەزی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەبێ کەفارەت بداو کەفارەتەکەشی ئازادکردنی کۆیلەیەکە، خوومیلە وتی: ناتوانێ کۆیلە بکڕێو ئازادی بکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەبێ دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژو بێ، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو پیرەمێردێکی کەنەفتە ناتوانێ بەرۆژو بێ، فەرمووی: دەی با خۆراکی شەست مرۆڤی هەژار بدا، وتی: ئەوس هیچی نیە خۆراکی شەست کەس بدا، جا خوومیلە دەڵێ: لەوکاتەدا عەربەخورمایەکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! (دروودی خودای لەسەر بێ) منیش دەتوانم عەربەخورمایەکی بدەمێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « قَدْ أَحْسَنْتِ اذْهَبِي فَأَطْعِمِي بِهَا عَنْهُ سِتِّينَ مِسْكِينًا وَارْجِعِي إِلَى ابْنِ عَمِّكِ». هەڵوێستێکی باش دەنوێنی بڕۆ

ئەو خورمایە بەسەر شەست هەژاردا دابەش بکە. دەڵێ: (العَرَق) شەست ربە خورما دەگا.[1]

لە عورەوەی کوڕی زوبەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: خاتو عائیشە فەرمووی: پاكو مونەزەهە ئەو خودایەی گەشنەوای هەموو شتێکە، وەڵلاهی من قسەکانی (خولە) لەگوێچکەمدا دەزرنگێتەوەو هەندێ لەقسەکانیم لەبیر چۆتەوە، ئێستا لەیادمە کە خەولە چۆن سکاڵای خۆی لەخزمەت پێغەمبەردا دەکردو دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوس گەنجی منی فەوتاندووە تا گەنج بووم‌و بە بەرمەوە بوو لەگەڵی رابواردم منداڵم لێی بوون، ئێستا کەپیر بووم‌و لەسكوزا وەستاومەوە ظیهاری لێ کردووم‌و وەلای ناوم، خودایە من سکاڵای خۆم لای تۆ دەکەم لەسەر ئەو ستەمەی لێی کردووم، ئیتر ئەوەندەی نەبرد حەزرەتی جوبرائیل ئەم ئایەتە قورئانیانەی هێنان. دەفەرموێ: {قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ – المجادلة/١}.[2]

کەسێك ظیهاری لەژنەکەی بکا بۆماوەی ڕۆژێك یان مانگێك یان ماوەیەکی لەو جۆرەو پێی گوت: ئەتۆ بۆ ماوەی مانگێك وەکوو دایکم وابێ، ئەوە بە ظیهارچی دەژمێردرێ، جا ئەگەر لەو ماوە دیاریکراوەدا پابەندی ظیهارەکە بوو، ئەوە هیچی ناکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر پێش تەواوبوونی ماوەی ظیهارەکە چووە لای ژنەکە ئەوە دەبێ کەفارەتی ظیهاربدا، کۆیلەیەك ئازاد بکا، ئەگەر بۆی هەڵنەسوڕا دوومانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێ، ئەگەر نەیتوانی خۆراکی شەصت هەژاربدا.

---

[1] حسن (ص/١٩٣٢)، دون قوله (والعرق)، د (٦/٣٠١/٢١٩٩).

[2] صحيح: (ص.جة/١٦٧٨)، جة(١/٦٦٦/٢٠٦٣).

له سەلەمەی کوڕی صەخری (البیاضی)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: من زۆرم ئارەزۆ لەسەر جێیی کردنی ئافرەت بوو، بڕواناکەم کەس بە ئەندازەی من کاری سێکسی لەگەڵ خێزانی خۆی کردبێ، ساڵێك کە مانگی رەمەزان داهات ظیهارم لە خێزانم کرد: وتم: هەتا رەمەزان تەواو دەبێ ئەتۆ وەکوو دایکم وابی، ماوەیەکی پێچوو شەوێك ژنەکەم قسەی بۆ دەکردم شوێنێکی جەستەییم بەرچاوکەوت، خۆم پێ نەگیراو عەمبازی بومێو سواری بووم، بۆ بەیانی کە چوومە ناو دۆستو برادەرەکانم ئەم روداوەم درکاندو پێم گوتن پرسیارم بۆ لە پێغەمبەر بکەن ئاخۆ حوکمی ئەم کارەی من چۆنەو چییە؟ وتیان بەخودا ئێمە شتی واناکەین ئەگەر پرسیاری لەوجۆرە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بکەین نیگای خودایی دەربارەمان نازڵ دەبێ، یان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوبارەوە فتوایەك دەفەرموێ: ئەوکاتە عەیبەمان توش دێ، لەبەرئەوە رومان نایە ئێمە پرسیاری لەو جۆرەت بۆ بکەین. ئێمە بەو تاوانە دەتدەینە دەست پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). بڕۆ بۆخۆت ئەوکارەی خۆت بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسبکە. سەلەمە دەڵێ: ئیتر بۆخۆم چووومە خزمەت پێغەمبەرو روداوەکەم بۆ باسکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَنْتَ بِذَاكَ»؟ ئەتۆ شتی وات لێ رودراوە؟ عەرزم کرد بەڵێ من ئەوەم لێ هەوماوە. ئەوەتا ئێستا ملکەچی فەرمانی خودامو چی پێویست بێ لەسەرم ئەنجامی دەدەم. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کۆیلەیەك ئازادبکە، دەڵێ وتم: سوێندم بەوکەسەی تۆی کردووە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچم نیەو دارای هیچ کۆیلەیەك نیم، تەنها خۆم شك دەبەم. فەرمووی: دەی کەوایە دوومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوبە. دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! من بەهۆی رۆژووەوە تووشی ئەم بەڵایە بوم،

بەهیچ جۆرێك ناتوانم بەڕۆژووبم. فەرمووی: دەی کەوایە ژەمێك خواردنی شەصت هەژاربدە، دەڵێ: وتم: سوێند بەوکەسەی تۆی کردووە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمشەو بەبێ شێو سەرمان ناوەتەوەو هیچمان نەبوو بیخۆین، فەرمووی: دەبڕۆ بۆلای بەرپرسی زەکات کۆکەرەوەی هۆزی (زریق) پێی بڵێ: با باربۆت بکاو یارمەتیت بدا لەو باربووکردنە خۆراکی شەصت هەژاری لێ بدەو ئەوی مایەوە بۆ خۆت کەڵکی لێ وەربگرە.[1]

شایەت لەم فەرموودەدا ئەوەیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئینکاری ظیهارکردنەکەی نەکرد بەڵکوو ئەوەی پێ ناخۆش بوو کەپێش تێپەڕبوونی ماوەکە سەرجێیی خێزانەکەی کردوە.

## حوکمی ظیهار

ظیهارکردن حەرامەو کارێکی باش نیە، خودا بەوە وەصفی کردوە کە وتەیەکی مونکەرو بوختان ئامێزە. ئەوەتا قورئان دەفەرموێ: {الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ - المجادلة/٢}. ئەوانەی لەئێوە - ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان - ظیهار لەگەڵ ژنەکانیان دەکەن، ژنەکانیان دەشوبهێنن بە دایکیانو بەمجۆرە یەکێك بەژنەکە دەڵێ: تۆ وەك پشتی دایکم وای بۆ من، واتە: لێم حەرامی وەکوو چۆن دایکم لێم حەرامە، ئەوانە بەهەڵە چوون، درۆیەکە دەیکەن بەو قسە پڕوپوچە ژنەکانیان نابن بەدایکیان. دایکیان ئەوانەن بەوەلەدیان هێناون بێگومان ئەوانەی ظیهار دەکەن بەمجۆرە مێرد بەژنەکەی دەڵێ: تۆ وەکوو پشتی دایکم وای بۆ من، قسەیەکی ناشیرینو قێز لێکراو دەڵێن، قسەیەك دەڵێن شەرع بەڕەوای

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٦٧٧) ، جة(٢٠٦٢/٦٦٥/١)، د(٢١٩٨/٢٩٨/٦)، ت(١٢١٥/٣٣٥/٢) مختصراً.

نازانیو عەقڵ وەری ناگرێ. بێگومان خودا لێبوردنی زۆرەو لێخۆشبوە کەفارەتی دیاری کردووە بۆئەوەی لەو تاوانە رزگارتان بێ.

## الطلاق (تەڵاق)

لەوەپێش زانیمان ئیسلام چەند سوورە لەسەر پێکهێنانی خێزانو پارێزگاریکردنیو ژیان تێدا بەسەربردن بەشێوەی ئاشتیو خۆشەویستیو بەختەوەری بۆ هەموو تاکەکانی، هەروا زانیمان چۆن رێگاچارەی داناون بۆ هەر تەنگژەو ناکۆکییەك کە دەکەوێتە ناو خێزانەوە، جا هۆکارەکەی یەکێك لەژنو مێرد بێ یان هەردوکیان بن.

وەلێ جاری واهەیە ئەم چارەسەریانە سوودیان نابێو کێشەکە لەوە گەورەترە چارەسەری بکرێو نەهێڵدرێ لانەو چەتری خێزان هەڵنەوەشێتەوە. لەم حاڵەدا ناچار پەنا بۆ چارەسەری تەڵاق دەبردرێ.

هەرکەسێك لە حوکمەکانی تەڵاقو قۆناغەکانی وردبێتەوە بۆی دەردەکەوێ ئایینی ئیسلام چەند حەریصە لەسەر دامەزراوەی خێزانو بەردەوامبوونی تەبایی نێوان ژنو مێردو پەروەردەکردنی منداڵ تێیدا بەشێوەیەکی رێكو پێك.

ئەوەتا ئایینو شەریعەتی ئیسلام لە کاتێکدا کە رێگای داوە رێگای تەڵاق بگیرێتەبەر، نەهاتووە بەیەکجار کۆتایی بە تەڵاقدانەکە بهێنێو پەیوەندی نێوان ژنو مێردەکە بپچڕێنێو رێگای سەرلەنوێ دەستپێکردنەوەی ژیانی ژنو مێردایەتی ببەستێ، بەڵکوو کە رێگای داوە پەناببرێ بۆ تەڵاق فەرمانی کردوە بەسێ قۆناغ ئەنجام بدرێ. ئەوەتا قورئان دەفەرموێ: {الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ – البقرة/٢٢٩}.

تەڵاق دووجارەو دەبێ هەرجارەی تەڵاقێك بداو تەڵاقدانەکەش لەکاتی وادابێ کاریگەری لەسەر ماوەی عیددە نەبێ. ماوەی نێوان تەڵاقدانەکان وابێ

ژن‌و مێردەكە بیر لە قازانج‌و زەرەری خۆیان بكەنەوە بتوانن ئەگەر بیانەوێ ڕێك بكەونەوەو لانەی خێزان تێك نەدەن. جا ئەگەر مێرد جاری یەكەم تەلاقێكی ژنەكەیدا نابێ شوێن‌و مەكان لەژنەكە تێك بدا لە ماڵ‌و شوێنی خۆی دەری بكا هەتا عیددەی تێپەڕدەبێ، بەڵكوو ژنەكەش نابێ لەو شوێن ماڵە دەربچێ، عیلەت‌و باپیسیش بۆئەوە هیوای نەمان‌و قەلاچۆ بوونی ئەو ڕق‌و عەزمەبەیە كە بۆتە هۆكاری تەلاقەكە. وێڕای ئەوەش ئیسلام دوای ڕودانی تەلاق ژن‌و مێرد هەڵدەنێ بۆ ئاشتبوونەوەو ئاسایی كردنەوەی بارودۆخی نێوانیان. ئەوەتا پەروەردگار دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا – الطلاق/١}:

ئایەتەكە بەڕوونی ئاماژە بۆ ئەوەدەكا: كە لەوانەیەو وا هیوا دەكرێ لەدوای تەلاقی یەكەم‌و دووەم پیاوەكە پەشیمان بێتەوە، خودا ئەوە بخاتە دڵیەوە ژنەكەی ریجعە بكاتەوەو سەرلەنوێ لانەی خێزان دروست بكەنەوە... هەڵبەتە ئەگەر لەماوەی عیدەكەدا ئافرەتەكە لەسەر ماڵ‌و حاڵی خۆی بێ‌و دەرنەكرێ ریجعە كردنەوەكە ئاسانتر‌و بەیدەست تر دەبێ.

## جۆرەكانی تەلاق

* یەكەم لەڕوی وشەوە:

تەلاق دەبێتە دووجۆر: تەلاقی صەریح، تەلاقی كینایە (دركە):

١- تەلاقی صەریح ئەوەیە: لەكاتی گوتنیدا مەعنای تەلاقی لێ وەربگیرێ مانای تر لەوشەكە دەرك نەكرێ وەكوو (انت طالق) پیاو بەژنەكەی بڵێ: تۆ

تەڵاقت کەوتووە، تەڵاقت بکەوێ. (أنت مطلقة)... هەر وشەیەك لەچاوگی (طلاق) وەربگیرێ.

هەرکاتی ئەم وشەی (طلاق)ە یان موشتەقەکانی بەڕاست یان بە قەشمەری بەنیازو بێ نیاز بگوترێ لەلایەن ئەوکەسەی تەڵاقی بەدەستە، تەڵاق دەکەوێ. ئەمەش بەپێی ئەو حەدیثەی ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «ثَلاَثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ النِّكَاحُ وَالطَّلاَقُ وَالرَّجْعَةُ».[1] سێ شت بەڕاست یان بە گاڵتە بگوترێ: بەڕاست دەژمێردرێ حوکمی پێ جێگیر دەبێ. ئەو سێ شتە مارەکردن‌و تەڵاق‌و ڕیجعە کردنەوەیە.

٢- تەڵاقی کینایە ئەوەیە: ئیحتیمالی تەڵاق‌و غەیری تەڵاقی هەبێ. وەکوو ئەوە مێرد بە ژنەکەی بڵێ: «الْحَقِي بِأَهْلِكِ » بڕۆرەوە ماڵی باوانت یان هەر ڕستەو قسەیەکی لەم جۆرە.

تەڵاقی کینایە پێویستی بەنیازو نیەت هەیە. ئەگەر بەوتەکەی نیازی تەڵاقی بوو تەڵاقەکە دەکەوێ... ئەگەر نیازی بە وتەکە تەڵاق نەبوو، تەڵاقی ناکەوێ.

لەخاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئافرەتێکی مارەکرد ناوی (عمرة بنت الجون) بوو، کە گواستیەوەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی نزیك بووە ئافرەتەکە وتی: (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ).! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: «لَقَدْ عُذْتِ بِعَظِيمٍ ، الْحَقِي بِأَهْلِكِ».[2] لەڕاستیدا ئەتۆ

---

[1] حسن: (الإرواء/١٨٢٦)، جە(٢٠٣٩/٦٥٨/١)، د(٢١٨٠/٢٦٢/٦)، ت(١١٩٥/٣٣٦/٢).

[2] صحيح: (ص.ن/٣١٩٩) ، خ(٥٢٥٤/٣٥٦/٩)، ن(٦/١٥٠) ئەم دەڵێ: ئافرەتەکە ناوی (الكلابية) بووە.

پەنات بەزاتێکی گەورە گرت، کەسێکی گەورەت بەگژدا کردم بڕۆرەوە ماڵە باوانی خۆت.

لە حەدیثی کەعبی کوڕی مالیك ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئەوکاتەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەنگی لێ دابڕیبون لەسەر ئەوەی لە غەزای تەبوك کەعبو دوو هاوەڵەکەی خۆیان پاشدابوو، کەعب دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆ لامو فەرمووی: (اعْتَزِلِ امْرَأَتَكَ). خۆت لەژنەکەت دابڕە. لە وەڵامدا کەعب عەرزی پێغەمبەری کرد تەڵاقی دەم؟ چی بکەم؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بَلِ اعْتَزِلْهَا فَلاَ تَقْرَبَنَّهَا). بەڵکوو لێی گۆشەگیربەو لەگەڵی مەخەوە، کەعبیش بە ژنەکەی خۆی گوت (الْحَقِي بِأَهْلِكِ).[1] بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوانت.

***دووەم: تەڵاقدان بەشێوەی تەعلیق (هەڵواسین). یان بەشێوەی صیغەی تەڵاق یان بەشێوەی تەنجیز دەبێ یان پەیوەستی دەکا بەشتێکەوە:**

تەڵاقی مونجەزە ئەو تەڵاقەیە ئەوکەسەی تەلەفوظی پێ دەکا مەبەستی کەوتنی تەڵاق بێ دەست بەجێ. وەکوو ئەوە مێرد بەژنی بڵێ: (أنت طالق): ئەتۆ تەڵاقت کەوتبێ، یان ئەتۆ تەڵاقت کەوتووە.

حوکمی ئەم جۆرە تەڵاقدانە ئەوەیە دەست بەجێ تەڵاقەکە دەکەوێ بەمەرجێ ئەوکەسەی تەڵاقەکەی لێ صادر دەبێ ئەهل بێو تەڵاقەکەش ئاڕاستەی شوێنی خۆی بکرێ.

وەلێ تەڵاقی هەڵواسراو کە بریتییە لەوەی مێرد ژنەکەی تەڵاق بدا بەڵام تەڵاقدانەکە پەیوەست بکا بە مەرجێکەوە، بەم جۆرە بە ژنەکەی بڵێ ئەگەر بچی بۆ فلان شوێن تەڵاقت بکەوێ.

---

[1] متفق علیه: خ(٤٤١٨/١١٣/١٣)، م(٢٧٦٩/٢١٢٠/٤)، د(٢١٨٧/٢٨٥/٦)، ت(١٥٢/٦).

حوكمی ئەو جۆرە تەڵاقدانە ئەوەیە: ئەگەر مەبەستی ئەوەبوو لەکاتی وەدی هاتنی مەرجەکە تەڵاقەکە بکەوێ، بەدەستەبەر بوونی مەرجەکە تەڵاقەکە دەکەوێ.

بەڵام ئەگەر مەبەستی بە پەیوەستکردنی تەڵاقەکە هەڵنان بوو بۆ کردنی کارێك یان نەکردنیو شتی لەوجۆرە، ئەوە بەسوێند دادەنرێو تەڵاق نیە، جا ئەگەر ئەو شتەی سوێندەکەی لەسەر خواردبوو نەهاتە دی، ئەوە هیچی ناکەوێتە سەر، خۆ ئەگەر شتەکە هاتەدی، ئەوە پێویستە کەفارەتی سوێندەکە بدا (ئەمە رێبازی شێخی ئیبنو تەیمییەیە وەکوو لە (مجموع الفتاوی دا ج٣٣/٤٤ - ٤٨ - ٥٨ - ٦٠- ٦٤- ٦٦) ئاماژەی پێ کردووە.

* سێیەم: تەڵاقدان لەڕوی سوننیو بیدعییەوە:

تەڵاق لەڕوی سوننیو بیدعییەوە دابەش دەبێ بۆ تەڵاقی سوننیو تەڵاقی بیدعی.

تەڵاقی سوننی: ئەوەیە پیاو ژنەکەی خۆی تەڵاق بدا تەڵاقدانەکەی لەکاتی پاکی ژنەکەیدا بێو دوای پاکبوونەوەی نەچوبێتە لایو یەك تەڵاقیشی بدا، یان ئافرەتەکە دووگیان بێو دوگیانییەکەی دیاربێ.

قورئان دەفەرموێ: {الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ – البقرة/٢٢٩}.

یان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ – الطلاق/١}. ئەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر خۆتو موسوڵمانان گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە تەڵاق چارەسەرەو ویستتان ژنەکانتان تەڵاق بدەن ئەوە لەکاتی پاکبوونەوەیان لەبێنوێژی تەڵاقیان بدەن.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێك ئیبنو عومەر خێزانەکەی لە بێنوێژی دا تەڵاق داو ئیمامی عومەر پرسیاری بۆ لە

پێغەمبەر کرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەفسیری ئایەتەکەی شیکردۆتەوەو فەرموویە: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ ، ثُمَّ تَطْهُرَ ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ».[1] بە عەبدوڵڵای کوڕت بڵێ خێزانەکەی ڕیجعە بکاتەوەو لەلای خۆی بیهێڵێتەوە تا پاك دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتەوە بێنوێژییەوە پاشان پاك دەبێتەوە، ئەمجار ئەگەر حەزی لێ بوو دوای ئەوە پرۆژەی تەڵاق وەلانێ‌و ژیانی ئاسایی خۆیان پەرە پێبدەن، خۆ ئەگەر حەزی لێ بوو لەدوای پاکبوونەوە بێ ئەوەی بچێتە لای، تەڵاقی بدا، ئەوە ئەو عیددەیە کە پەروەردگار فەرمانی کردوە ئافرەتی تێدا تەڵاق بدرێ.

لە (سالم)ەوە لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە: کە خێزانەکەی خۆی لەکاتی بێنوێژیدا تەڵاق دا، ئیمامی عومەر ئەو روداوەی عەبدوڵڵای کوڕی‌و خێزانەکەی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویە: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا طَاهِرًا أَوْ حَامِلاً».[2] بە عەبدوڵڵای کوڕت بڵێ: خێزانەکەی ڕیجعە بکاتەوە، پاشان با لەکاتی پاکیدا یان لەکاتی سکپڕیدا تەڵاقی بدا.

تەڵاقی بیدعی: ئەو تەڵاقدانەیە بە پێچەوانەی ڕێنومایییە شەرعییەکان روی دابێ. وەکوو ئەوە ژنەکە لە عادەی مانگانەی دابێ تەڵاقدرابێ، یان پاکبووبێتەوە بەڵام مێردەکەی لەو پاکییەدا چووبێتە لای، یان سێ تەڵاقەکەی بەیەك وشە دەربڕێ وەکوو ئەوە بڵێ: بەژنەکەی ئەتۆ تەڵاقت کەوتبێ، ئەتۆ تەڵاقت کەوتبێ، ئەتۆ تەڵاقت کەوتبێ. ئەم شێوە تەڵاقدانە حەرام‌و ناشەرعییە ئەوەی ئاوا ژن تەڵاق بدا گوناهبارە، جا ئەگەر مێرد ژنەکەی

---

[1] متفق عليه: خ(٥٣٣٢/٤٨٢/٩)، م(١٤٧١/١٠٩٣/٢)، د(٢١٦٥/٢٢٧/٦).

[2] م(١٤٧١ — ٥ -/٢٠٩٥/٢).

لەحاڵی بێنوێژیدا تەڵاق دا، ئەوە تەڵاقێکی دەکەوێ، ئەگەر مەجالی ریجعە کردنەوە هەبوو داوای لێ دەکرێ ریجعەی بکاتەوەو لای خۆی بیهێڵێتەوە تا پاك دەبێتەوەو پاشان دەکەوێتەوە عادەی مانگانەیەوە، ئەمجار پاك دەبێتەوە، ئەوکاتە ئەگەر بیەوێ لەگەڵیا بمێنێتەوەو پرۆسەی تەڵاقدان وەلابنێ، یان ئەگەر بیەوێ تەڵاقی بدا پێش ئەوەی بچێتە لای تەڵاقی بدا، وەکوو چۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە ئیبنو عومەر کرد.

بەڵگەی ئەوە کە تەڵاقێکی پێ دەکەوێ ئەو فەرموودەیە بوخاری لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتی کردوە کە دەفەرموێ: ( حُسِبَتْ عَلَيَّ بِتَطْلِيقَةٍ).[1] ئەو تەڵاقە بیدعییەم لەسەر حیساب کرا بەیەك تەڵاق، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە (فتح الباری)دا دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە ریجعەکردنەوەی خێزانی ئیبنو عومەر کرد، ڕێگای چۆنیەتی تەڵاقدانی نیشان دا، ئەگەر لەوەدوا ویستی ژنەکەی تەڵاق بدا. جا ئەگەر ئیبنو عومەر هەواڵی ئەوەی داوە گوایە ئەو تەڵاقە بیدعییەی بەیەك تەڵاق لەسەر حیساب کراوە ئیحتیمالی ئەوە: کە ئەوکەسەی ئەوەی لەسەر حیساب کردووە غەیری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووبێ زۆر دوورە، وێڕای هەبوونی قەرینەی جۆراوجۆر لەسەر ئەم ڕوداوە، چونکە ناگونجێ ئیبنو عومەر لەم ڕوداوەدا کارێکی کردبێ پشتی بەرای خۆی بەستبێ لەکاتێك زانیویەتیو بۆخۆی بۆمان دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕقی هەڵساوە لەشێوە تەڵاقدانەکە، پێناچێ ئیبنو عوومەر لەم کارەیدا پرسی بە پێغەمبەر نەکردبێ؟!

هەروا ئیبنو حەجەر دەفەرموێ: ئیبنو وەهەب لە موسنەدەکەیدا لە ئیبنو ئەبی زیئبەوە ڕیوایەت دەکا: کە ئیمامی نافع هەواڵی ئەوەی بۆ

---

[1] صحيح: (الإرواء/١٢٨)، خ(٩/٣٥١/٥٢٥٣).

گێڕاوەتەوە کە ئیبنو عومەر ژنەکەی خۆی لەکاتی بێنوێژیدا تەڵاقدا، ئیمامی عومەر لەم بارەوە پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد لەوبارەوە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ». جا ئیبنو ئەبی زیئب لەم حەدیثەدا لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە: کە ئەو تەڵاقە بەیەك تەڵاق حسێبە. ئیبنو ئەبی زیئب دەڵێ: حەنظەلەی کوڕی ئەبو سەفیان بۆیگێڕامەوە کە لە سالمی بیستووە ئەویش لەباوکییەوە لە پێغەمبەرەوە هەمان حوکمی ریوایەت کردوە. کە ئەو تەڵاقە بیدعییە بەیەك تەڵاق حلێب بووە.

هەر ئیبنو حەجەر دەفەرموێ: دارە قوطنی لەڕێگای یەزیدی کوڕی هارونەوە لە ئیبنو ئەبی زیئبەوەو لە ئیبنو ئیسحاقەوە، هەموویان لە نافیعەوە لەئیبنو عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە ریوایەتی کردوە فەرموویەتی: (هـي واحـدة) ئەو تەڵاقە بیدعییە بەیەك تەڵاق حسێبە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەقێکە لەشوێنی خیلافو راجیاییدا پێویستە پەنای بۆ ببرێ بۆ یەکالاکردنەوە.

### تەڵاقی سێ بەسێ

ئەگەر مێرد ژنی خۆی سێبەسێ تەڵاقدا، واتە: بەیەکجارو بەیەك رستەو لەیەك مەجلیسدا سێ تەڵاقەی ژنەکەی دا یەك تەڵاقی دەکەوێ، ئاماژە بەو حەدیثەی ئیمامی موسلیم لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردوە فەرموویەتی: (كَانَ الطَّلاَقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَأَبِى بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ طَلاَقُ الثَّلاَثِ وَاحِدَةً فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِنَّ النَّاسَ قَدِ اسْتَعْجَلُوا فِى أَمْرٍ قَدْ كَانَتْ لَهُمْ فِيهِ أَنَاةٌ فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عَلَيْهِمْ. فَأَمْضَاهُ عَلَيْهِمْ)[1]: تەڵاق لەسەردەمی پێغەمبەرداو لەڕۆژگاری خەلافەتی ئەبوبەکرو دوو ساڵیش

---

[1] م (٢/١٠٩٩/١٤٧٢).

له خەلافەتی حەزرەتی عومەردا سێ تەڵاقە بەیەك تەڵاق حسێب دەکرا.. ئەگەر کەسێك بەیەك جار ژنەکەی سێ تەڵاقە بدایە بەیەك تەڵاق لەسەری حسێب دەکرا، ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەم خەڵکە پەلە پەل دەکەن لەشتێکدا کە حەق وایە بەهێدی‌و لەسەرەخۆیی‌و بە قۆناغ ئەنجامی بیکەن، ئەگەر لەسەریان بڕۆین‌و لەسەریان بسەپێنین ڕەنگە کارێکی باش بکەین! ئیتر حوکمی کەوتنی سێ تەڵاقەی بەسەردا سەپاندن. بێگومان ئەم رایەی ئیمامی عومەر ئیجتیهادی خۆی بووە، مەبەست‌و غایەکەی دەگونجێ لەبەر بەرژەوەندییەك بووبێ، وای بەباش زانیبێ، دەی خۆ دروست نیە فتوای پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) وەلابنرێ فەرموودەو عەمەلی پێغەمبەر لەماوەی ژیانیدا پابەندبوونی حەزرەتی ئەبوبەکر لەماوەی خەلافەتیدا هەروا دووساڵیش لە خەلافەتی ئیمامی عومەر خۆی‌و پابەندبوونی هاوەڵان بەو حوکمەی کە تەڵاقی سێ‌بەسێ بەیەك تەڵاق حسێبە هەموو ئەمانە پاشگوێ بخرێ‌و کار بەئیجتیهادو رای ئیمام عومەر بکرێ.

***چوارەم: تەڵاق لەڕوی ریجعی‌و نا ریجعییەوە**

تەڵاق دوو جۆرە یان ریجعییە یان (بائینە) بائینەش یان بەینونەی پچوکە یان گەورەیە‌و کۆتاییە.

تەڵاقی ریجعی: ئەو تەڵاقەیە کە ئافرەتەکە گواسترابێتەوەو دخولی پیکرابێ‌و تەڵاقدانەکەشی لەبەرامبەر ماڵ‌و سامان نەبێ یەکەمجار بێ یان دووەم جاربێ تەڵاقی ئاراستە بکرێ.

قورئان دەفەرموێ: {الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَإِنْ

خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ – البقرة/٢٢٩}.

ئافرەتی تەڵاقدراو بەشێوە تەڵاقی ڕیجعی تا لەعیددەدابێ بەژنی مێردار حسێب دەكرێو مێردەكەی دەتوانێ هەركاتێ بیەوێ، ڕیجعەی بكاتەوە، بەمەرجێ عیددەی تەواو نەبووبێ، پێویست بەڕازیبوونی ئافرەتەكەش ناكا، هەروا ئیزنی (وەلی)یەكەشی پێویست نیە. قورئان دەفەرموێ: {وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحًا – البقرة/٢٢٨}. ئافرەتانی تەڵاق دەدرێن دەبێ بكەونە عیددەوەو چاوەڕوانی سێجار پاكبوونەوە بكەن، نابێ ئەو ئافرەتانە ئەوە بشارنەوە كە دووگیانن‌و لە منداڵدانیاندا خودا زارۆكی خولقاندوە ئەگەر ئەوان بڕوایان بەخوداو ڕۆژی دوایی هەیە دەبێ پابەندی ئەحكامەكانی خودابن. مێردەكانیان مافی خۆیانە ڕیجعەیان بكەنەوە بەمەرجێ مەبەستیان ئاشتەوایی‌و ڕێككەوتنەوە بێ.

## خولعكردن (دەست لێك بەردانی ژن‌و مێرد لەسەر ماڵ)

**الخلع**: لە زمانەوانیدا واتە: داكەندن‌و داڕنین. دەگوترێ (خلع الثوب) كراسەكەی داكەند. چونكە ژن‌و مێرد بۆ یەكتری پۆشاكن، قورئان دەفەرموێ: {هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ – البقرة/١٨٧}. شەرعزانان (خلع)یان واپێناسە كردوە كە بریتییە لە جیابوونەوەی پیاو لەژنەكەی لەسەر بڕێك ماڵ كە لەژنەكەی وەری دەگرێو پێشی دەگوترێ: (فیدیە) و (افتداء). (فقه السنة: ج٢/٢٥٣).

## خولعكردن ڕەوایە

هـەرکاتێ خـیلافو کێـشەی نێـوان ژنو مێـرد پـەرەی سـەندو ڕێکخستنەوەی نێوانیـان نـەدەگونجا، ئافرەتەکـە دەیەویـست جیابێتـەوە، بـۆی هەیە بە ماڵ خۆی ڕزگاربکا، بڕێ لە ماڵی خۆی بداتە مێردەکەی بۆ قـەرەبوو کردنەوەی ئەو زیانەی بـەهۆی جودابوونـەوەی ژنەکـەی توشـی بـووە. قورئـان دەفەرموێ: {وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَّ أَن يَخَافَـا أَلاَّ يُقِيمَـا حُدُودَ اللّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَـلاَ جُنَـاحَ عَلَيْهِمَـا فِيمَـا افْتَـدَتْ بِـهِ – البقرة/٢٢٩}.

لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) ڕیوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: ژنی ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شـەمماس هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عـەرزی کـرد وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەمن لـەڕوی ئایینو ڕەوشتەوە چ ڕەخنەیەکم لە (ثابت) نیە، بەڵام نەکڵەوەتو ناشـیرینەو هەرچەندە لێـی ورد دەبمـەوە ناچێتە دڵمـەوە، دەترسـم تووشـی کـاری کـوفر ئـامێزبمو خـودا لـەخۆم بـڕەنجێنم، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: «فَتَـرُدِّينَ عَلَيْـهِ حَدِيقَتَـهُ؟». ئەگـەر دەستبەردارت بـێ باخەکـەی بـۆ دەگێڕیـەوە؟ وتـی: بـەڵێ، باخەکـەی بـۆ گەڕانـدەوە، پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە (ثابت) کرد تەڵاقی بدا ئەویش دەستبەرداری بۆوەو ژنەکەی خولع کرد.

## خولعکردن بەبێ بایسو عیلەتی مەعقول ناپەسەندە

لـە ئـەوبانـەوە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلاَقًا فِي غَيْـرِ

مَا بَأْسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ».[1] هەر ئافرەتێك بەبێ هۆیەكی ڕەوا داوا لە مێردەكەی بكا تەڵاقی بدا، ئەوە بۆنی بەهەشت لەو حەرامەو بۆنی بەهەشت ناكا.

هەر لە ئەوبانەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «الْمُخْتَلِعَاتُ هُنَّ الْمُنَافِقَاتُ». ئەو ئافرەتانەی بەبێ هەبوونی عوزر داوای تەڵاق دەكەن ئەوانە لەپێڕی دووڕوو مونافیقانن.

## هەڕەشە لەو پیاوانەی ژنەكانیان ناچاردەكەن داوای تەڵاق بكەن

ئەگەر پیاو لەبەر هەر هۆیەك ژنەكەی بەدڵ نەبوو، نیازی ئەوەی كرد لێی جیابێتەوەو دەست بەرداری بێ، پێویستە بەشێوەیەكی باش‌و عادڵانە دەست بەرداری بێ، دیقە دیقەی پێ نەكا بۆئەوەی ناچاری بكا بە ماڵ‌و سامان خۆ لەدەستی رزگاربكا. قورئان دەفەرموێ: {وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النَّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لَّتَعْتَدُواْ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلاَ تَتَّخِذُوَاْ آيَاتِ اللّهِ هُزُوًا وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُمْ مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ – البقرة/٢٣١}: ئەگەر ئافرەتتان تەڵاقدان‌و نزیك بەتەواوبوونی عیددە بوونەوە، ئەوە بە یەكێك لەم دوو شێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵ بكەن؛ یان ڕیجعەیان بكەنەوەو بەتەبایی‌و ئاشتی ژیانیان لەگەڵدا بەسەر بەرن، یان مەرەخەسیان بكەن‌و لێیان بگەڕێن با تەڵاقەكەیان بكەوێ‌و بۆخۆیان ژیانی داهاتووی خۆیان دیاری بكەن. {وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لَّتَعْتَدُواْ} ڕیجعەیان مەكەنەوە بۆ ئەوەی بیانخەنەوە ژێر دەستی خۆتان‌و زیانیان پێ بگەیەنن‌و تەنگیان پێ هەڵچنن‌و عیددەكەیان پێ درێژ بكەنەوە تا ناچاریان

[1] صحيح: (ص.جة/١٦٧٢) ، د(٢٢٠٩/٣٠٨/٦)، ت(١١٩٩/٣٢٩/١)، جة(٢٠٥٥/٦٦٢/١).

بكەن بە پارە تەلاقەكەيان بكرنـەوە {وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ} كەسێك ئاوا بـەو جۆرە ژنەكـەی ڕيجعـە بكاتـەوەو ئـازاری بـداو ستەمی لێ بكا، ئـەوە بێگومان ستەمی لەخۆی كردووە لەژيانـدا بـەوە كـەرێگای شـەڕو شـەڕەنگێزی گرتـووە. ويـژدانی خـۆی ئـازار دەداو كـەس‌و كـاری ژنەكـەی لـەخۆی كـردووە بـەدوژمن، لەقيامەتيـشدا سـزا دەدرێ چـونكە سەرپێـچی فرمـانی خـودای كردووە. {وَلاَ تَتَّخِذُوَاْ آيَاتِ اللّهِ هُزُوًا} فـەرمانی خـوداو حـوكم‌و سـنوورەكانی بەگاڵتە مەگرن‌و شوێن داب‌و نـەريتی سـەردەمی نـەزانی مەكـەون، وريـان بـن سنوور بەزێنی مەكەن {وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ} يـادی نيعمـەتی خـودا بكەنەوە، كەبرێ لـەو نيعمەتـە خۆشەويـستی نێـوان ژن‌و مێـردە بـۆ يـەكتری. {وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُمْ مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ} هەروەها يادی نيعمەتی ئەوە بكەنەوە كە چەند ئايەتی پيرۆزی دەربارەی ياسای ژن‌و مێردايەتی بۆ ناردونە خوارێ؛ كە خۆشبەختی ژيانی دونياو قيامـەتی تێدايـە. بەشێكيش لەنيعمـەتی خـودا ئەوميـە لەگـەڵ دانـانی تەشـريعدا مەبەسـتە سـەرەكی‌يـەكەشـی بـۆ روون كردوونەوە.

هەروا دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهًا} ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێنـاوە ڕەوانيـە بـۆ ئێـوە؛ كـە ئـافرەت بەكەلـەپور داگير بكـەن، ڕەوانيـە: كـە چـاو لەسـەردەمی نـەزانی بكـەن، ئـافرەت بـەكاڵاو شتومەك حسێب بكەن، بەناوی ميراتـەوە داگيريـان بكـەن‌و بـەئارەزوی خۆتـان تەصەروفيان تێدا بكەن‌و بۆ خۆشيان نارازی بن ويستتان مارەيـان بكـەن، يـان لەخەڵكی تريـان مـارە بكەن‌و شيربايييان بخۆن، يـان شـوكردنيان لێ قەدەغـە بكەن‌و ناچاريان بكەن خۆيان بكرنـەوە، يـان بەناڕەحـەتی ژيـانی كولەمـەرگی بەسەر بەرن {وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ} نەچـن شـوكردنيان لێ مەنع بكەن‌و تەنگيان پـێ هەڵبـچنن بـۆ ئـەوەی ناچاريان بكـەن ئـەو ميـرات‌و

مارەییەی وەریان گرتووە بتاندەنەوەو خۆیان ڕزگار بکەن {إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ} مەگەر ئەو ئافرەتانە تاوانێکی حەیابەرە ئەنجام بدەن، بە ئاشکرا تاوانێکی وەکوو زینا، دزی، هەڵگەڕانەوە لەمێردو ئەو جۆرە شتانەی؛ کە شەرع بەناپەسەندیان دادەنێ بکەن، ئالەم حاڵەتانەدا سزادان‌و تەنگ پێ هەڵچنینیان ڕەوایە بەمەبەستی ئەوەی پێتان داون لێیان بستێننەوە. جا مارەیی بێ یان ماڵی تر بێ. {وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ} بەچاکەو دڵسۆزی‌و ویژدانەوە هەڵس‌وکەوتیان لەگەڵ بکەن، تەنانەت {فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا – النساء/١٩} ئەگەر شتێکتان لەوان پێناخۆش بوو بەم جۆرە لە ڕەوشتیاندا شتێکتان بەدڵ نەبوو، یان شێوەو ڕوخساریانتان لەلا پەسەند نەبوو، یان گلەییتان لەهەڵسوڕان‌و کاروباری ناو ماڵیان هەبوو، یان حەزتان لە ئافرەتێکی تر بوو، ئەوە صەبر بگرن‌و پەلە مەکەن لەجودا بوونەوە لێیان، یان لە تەنگ پێ هەڵچنینیان، چونکە لەوانەیە خودا مانەوەیان لەژێر نیکاحی ئێوەدا بکاتە خێروبێر بۆتان، وایان لێ بکا ببنە جێگای ڕەزامەندی ئێوە، ڕەوشتی خۆیان چاك بکەن، یان منداڵی ڕێك‌وپێك‌و صاڵح‌و خێرئاوەرتان لێیان ببێ‌و بۆتان پەروەردە بکەن، بەوە نەقصی خۆیان پڕ بکەنەوە.

## خولع فەسخ کردنەوەی نیکاحە تەڵاق نیە

ئەگەر ئافرەت ماڵی خۆی دا بەمێردەکەی بۆئەوەی دەستبەرداری ببێ، خۆی دەبێتە مالیکی نەفسی خۆی، مێردەکەی ناتوانێ بەبێ ئیزنی خۆی، ڕیجعەی بکاتەوە، چونکە ئەم دەست لێك بەردانە بە تەڵاق حسێب ناکرێ، هەرچەندە بە وشەی تەڵاق ئەنجام دەدرێ، بەڵکوو ئەم جودابوونەوەی ژن‌و

مێرد هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی نیکاحەکەیە بۆ بەرژەوەندی ئافرەتەکەیە لەبەرامبەر ئەندازەیەك ماڵ کە داویەتی بە مێردەکەی.

ئیبنولقەیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: ئەوەی دەبێتە بەڵگە لەسەرئەوەی کە خولع بە تەڵاق حسێب ناکرێ ئەوەیە پەروەردگار بۆ تەڵاقی یەك‌و دوو – واتە: جگە لە تەڵاقێك ژمارەی تەواوبووبێ – کەدوای دخول روبدا سێ حوکمی داناوە. هیچ کام لەو حوکمانە لە خولعدا نین.

١- لە تەڵاقدا مێرد دەتوانێ بەبێ رەزامەندی ئافرەتەکە ریجعەی بکاتەوەو بیهێنێتەوە ژێر نیکاحی خۆی.

٢- ئەو تەڵاقە ریجعەیە لەسێ تەڵاقەکە چەرت دەکرێ، دوای تەواوبوونی سێ تەڵاقەکە مێردەکە ناتوانێ مارەی بکاتەوەو بۆی حەڵاڵ نیە، مەگەر ئافرەتەکە شوبکاتەوە بە پیاوێکی ترو دخولی حەقیقی روبدا ئەمجار لەبەر هەرهۆیەك بێ ئەو پیاوەی دووەم تەڵاقی بداو عیدەی تەڵاقی بەسەربچێ ئەودەمە مێردی یەکەمی دەتوانێ بە نیکاحێکی تازە مارەی بکاتەوە.

٣- عیددەی تەڵاق سێ‌جار پاکبوونەوەیەتی لە بێنوێژی. بە نەص‌و بە کۆرای زانایان لەدوای خولع ریجعە کردنەوەی نابێ.

بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتەی هاوەڵانی، ئافرەتی خولع کراو دوای پاکبوونەوەی لەیەك بێنوێژی عیدەی تەواو دەبێ.

بە (دەق)یش ئەوە چەسپاوە کە دروستە دوای دوو تەڵاق خولع ئەنجام بدرێ، هەروەکوو چۆن دوای خولع دروستە تەڵاقی سێیەم بدرێ.

ئەمە ئاشکرایە کە خولع تەڵاق نیە، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا

آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ – البقرة/٢٢٩}: تەڵاق دووجارە هەرجارەی تەڵاقێکی بدا لێك دووربکەونەوە، پێش ئەوەی عیددەی بڕوا مێردەکەی دەتوانێ ریجعەی بکاتەوە، بەڵام ئەگەر سێیەم جار تەڵاقی دا ئیتر مەجالی ریجعەکردنەوە نامێنێ، دەبێ وازی لێ بێنێ ئافرەتەکە بۆ خۆی موستەقبەلی خۆی دیاریی دەکا، حەڵاڵو رەوانیە بۆ ئێوەی مێرد: کە ئەو مارەییو دیاریو شتەی پێتان داون لێیان وەربگرنەوە.

هەرکاتێك ژنو مێردەکە ترسی ئەوەیان هەبوو کە: بەیەکەوە ژیانیان ناگونجێو وێدەچێ سنوری خودا ببەزێنن نەتوانن ئەرکو مافی ژنو مێردایەتی بەجێ بێنن توشی تاوان ببن، ئافرەتەکە ویستی بەماڵی خۆی خۆی لەدەست مێردەکەی رزگاربکا، داوای لە مێردەکەی کرد لەسەر بڕێ ماڵ تەڵاقی بدا، ئەوە دروستە بۆ پیاوەکە ئەو ماڵە وەربگرێ چونکە ئەوە ماڵێکە ئافرەتەکە بە ئیزنو رەزای خۆی دەیداتە کابراو دەیەوێ خۆی لەدەست رزگاربکا. بەم شێوە دەست لێك بەردانە دەگوترێ: (خولع)، دوای (خولع)کردنەکە دەبێ ئافرەتەکە عیددەی بڕوا ئەمجار دەتوانێ شوبکاتەوە، بە رەزامەندیو داخوازی ئافرەتەکەش نەبێ ریجعەکردنەوەی دروست نیە.

هەڵبەتە ئەم حوکمە ئەگەر تایبەت نەبێ بە ئافرەتێك دوو تەڵاقی درابێ، ئەوە بەبێ شك دەیگرێتەوە، شموولی ئەوو هی دیکەش دەکا، نابێ راناو بگەڕێتەوە بۆ مەرجیعێکی باس نەکراوو مەرجیعی باسکراو وەلا بنێی. بەڵکوو یان دەبێ تایبەت بێ بە مەرجیعی پێشوو یان دەبێ ئەویشو هی دیکەش بگرێتەوە..... پاشان فەرمووی: {فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ – البقرة/٢٣٠}. ئەم دەقەش ئافرەتێك دەگرێتەوە کە بە فیدیە تەڵاق درابێ، هەروا ئافرەتێکیش کە دوجار تەڵاق درابێ، ئیبنو عەبباس کە بە تەرجومانی

قورئان ناسراوەو پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دوعای ئەوەی بۆ کردوە، کە باش فێری شیکردنەوەی قورئان بێ، وا لەمانای ئەو ئایەتانە حاڵی بووە.

جا ئەگەر ئەحکامی فیدیە (خولع) جودابێ لە ئەحکامی تەڵاق، دیارە خودی (خولع)لە جینسی تەڵاق نیەو دووشتی لێك جوداوازن، بێگومان ئەمە داخوازی نەص‌و قیاس‌و بیروڕای هاوەڵانی پێغەمبەرە.

## عیدە

پێناسەی عیددە: ئەم وشە لە عەدەدو (إحصاء) وەرگیراوە واتە: ئەو ماوەیەی ئافرەت هەژماری دەکا لەڕۆژانی بێنوێژی‌و پاکبوونەوەی.

عیدە: ناوە بۆ ئەو ماوەیەی ئافرەتی مێرد مردو یان ئافرەتی جودابووە لەمێرد، شوناکاتەوەو چاوەڕوانی دەکا بەسەریدا تێپەڕێ یان بە منداڵبون یان بەسەردا هاتنی بێنوێژی‌و پاکبونەوەی یان بە تێپەڕبوونی چەند مانگێك.

## جۆرەکانی عیدە

ئافرەتی مێرد مردوو عیدەی چوار مانگ‌و دەڕۆژن چوبێتە لای مێردەکەی یان نا چونکە قورئان دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا – البقرة/٢٣٤ }. ئەو پیاوانەی لەئێوە دەمرن‌و ژنیان لەپاش بەجێ دەمێنێ، پێویستە ئەو ژنانە چوار مانگ‌و دەڕۆژ چاوەڕوانی بکەن شونەکەنەوە، بۆئەوەی عیدەیان بەسەربچێ‌و دڵنیابن منداڵدانیان خاڵییە لە ئاساری مێردە مردوەکانیان.

مەگەر ئافرەتە مێرد مردووەکە دوگیان بێ ئەوە عیدەکەی بەدانانی سکەکەیەتی، هەرکاتێ منداڵەکەی بوو عیدەی تەواو دەبێ. قورئان دەفەرموێ:

{وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ – الطلاق/٤}. ئەو ئافرەتانەی دوگیانن ماوەی عیدەکەیان بەوە تەواو دەبێ کە سکەکەیان دابنێن.

لە (الزبیر)ی کوڕی (العوام)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئوممو کلثومی کچی عوقبەم لابوو، دوگیان بوو، وتی: پێم خۆشە تەڵاقم بدەی بەیەك تەڵاق، ئەویش تەڵاقێکی دا، پاشان زوبەیر چوو بۆ نوێژ کە هاتەوە ئوممو کولثوم منداڵەکەی بوو. زوبەیر وتی: ئەم فێڵەی بۆ لێکردم خودا تۆڵەی لێ بستێنێ؟! پاشان هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیاری لەم بارەوە لێ کرد، فەرمووی: «سَبَقَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ اخْطُبْهَا إِلَى نَفْسِهَا».[1]

ئەگەر ئافرەتی تەڵاقدراو لەو ئافرەتانەبوو دەکەوتە عادەی مانگانەوە، ئەوە تەواوبوونی عیدەکەی سێجار کەوتنە ناو عادەو پاکبوونەوەیەتی. قورئان دەفەرموێ: {وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوَءٍ – البقرة/٢٢٨}. ئافرەتی تەڵاقدراو چاوەڕوان دەکەن بۆ بەسەرچوونی عیدەکەیان سێجار کەوتنە ناو بێنوێژییەوەیە.

(قرء) بەمانا چوونە ناو بێنوێژییەوەیە ئاماژە بە حەدیثی خاتو عائیشە، دەفەرموێ: ئوممو حەبیبە دەکەوتە عادەی مانگانەوە، پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد فەرمانی پێ کرد کە ڕۆژانی (قورء) بێنوێژی واز لە نوێژکردن بێنێ.[2]

ئەگەر ئافرەتی تەڵاقدراو منداڵکاربوو نەکەوتبوە عادەی مانگانەوە یان پیرە ژن بوو لە عادەی مانگانە وەستابۆوە، ئەوە عیدەکانیان سێ مانگە. قورئان دەفەرموێ: {وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٦٤٦) ، جة(٢٠٢٦/٦٥٣/١).

[2] صحيح لغيره: (ص.د/٢٥٢)، د(٢٧٨/٤٦٣/١).

ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ – الطلاق/٤}.
ئەو ئافرەتانەی لە حەیز وەستاونەوە عیدەکەیان سێ مانگە هەروا ئەو ئافرەتانەش کە هێشتا نەکەوتوونە عادەی مانگانەیانەوە.

## ئەوەی پێویستە ئافرەتی مێرد مردو ئەنجامی بدا

پێویستە لەسەر ئافرەتی مێردمردو کە تازیە بگرێ هەتا عیدەکەی بەسەردەچێ.

تازیە بریتییە لەوە ئافرەتەکە خۆ رەشپۆش بکاو بۆنی خۆش لەخۆی نەدا خشڵو شتی وا بەخۆدا نەکا، سەر لەخەنەو وسمە نەگرێ، دەست لەخەنە نەگرێ چاو نەرێژێ سوراو سپیاو نەکا، خۆ لە ئارایشت کردن بپارێزێ.

لە ئوممو عەطییەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: ئێمە نەهیمان لێ دەکرا: کە تازیە بۆ مردو بگرین زیاد لەسێ رۆژ مەگەر بۆ مێرد، دەبوایە ژن چوار مانگو دەشەو تازیە بۆ مێردی مردوی بگرێ، نەهیمان لێ کراوە چاو بڕێژین، بۆنی خۆش لەخۆ بدەین، جلی رەنگاو رەنگ بپۆشین، جگە لە پۆشاکی (عَصْب) کە بوردەیەکی یەمەنییە دەچندرێ پاشان رەنگ دەکرێ. رێگەمان پێ دەدرا لەکاتی پاکبوونەوەمانو غوسڵ کردنمان لە بێنوێژی: کەمێك بخورد بۆنبرە لەخۆبدەین بۆ نەهێشتنی بۆنی ناخۆشی جەستەمان نەهیشمان لێ دەکرا لەوەی شوێن جەنازە بکەوین.[1]

لە ئوممو سەلەمە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا لاَ تَلْبَسُ الْمُعَصْفَرَ مِنَ الثِّيَابِ وَلاَ الْمُمَشَّقَةَ

---

[1] متفق عليه: خ(٩/٤٩١/٥٣٤١)، م(١/١١٢٨/٦٧/٩٣٨) و بنحوه د(٦/٤١١/٢٢٨٥)، ن(١/٤١٤/٢٠٣)، جة(١/٦٧٤/٢٠٨٧).

وَلاَ الْحُلِيَّ وَلاَ تَخْتَضِبُ وَلاَ تَكْتَحِلُ).[1] ئـافرەتی مێردمـردو پۆشـاكی رەنگكـراو بە زەعفەران ناپۆشـێ، هـەروا پۆشـاكی بـە قـوڕە سور رەنگكـراو، هـەروا نابـێ خشڵ بەخۆیدا كاو خەنەو وسمە لەدەستو قژی بگرێ، نابێ چاویشی بڕێژێ.

## ئەوەی پێویستە لەسەر ئافرەتی خاوەن عیدە بەهۆی تەڵاقی ڕیجعییەوە!

پێویـستە ئـافرەتی عیـدە گرتـوو بـەهۆی تـەڵاقی ڕیجعییـەوە لـەماڵ دەرنەچێ تا عیدەكەی تەواو دەبێ، نابێ لـەماڵ دەربـچێ، هـەروا دروست نیـە مێردەكەی دەری بكا، چونكە قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَـا تُخْرِجُـوهُنَّ مِـن بُيُـوتِهِنَّ وَلَـا يَخْـرُجْنَ إِلَّـا أَن يَـأْتِينَ بِفَاحِـشَةٍ مُّبَيِّنَـةٍ – الطـلاق/١}: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! (دروودی خودای لەسەر بێ) هەركاتێك ویستتان ژن تـەڵاق بـدەن، لـە كاتێكدا تـەڵاقیان بـدەن كـە ئافرەتەكـە لەبێنوێـژی پـاك بوبێتـەوەوە مێردەكەشـی نەچـوبێتە لای، مـاوەی عیدەكـە هـەژمار بكـەن، لـەخودا بترسـن، لەشـوێنی حەوانـەوەی خۆیـان دەریـان مەكـەن، بـاوانیش بـە ویـستی خۆیـان لەشـوێنی حەوانەوەو ماڵو حاڵی خۆیان دەرنەچن، مەگەر تاوانێكی ئاشكرا بكەن.

## ئافرەتی تەڵاقدراوی (بائینە) تەڵاق كەوتوو

ئـــافرەتی تەڵاقـــدراوی سێبەســـێ: كـــە تـــەڵاقی كـــەوتبێو مـــەجالی ڕیجعەكردنەوەی نـەمابێ، نەفەقـەو شـوێنی حەوانـەوەی لەسـەر مێـردی نیـە، ئاماژە بە حەدیثی فاتیمـەی كچی قـەیس: كـە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پێغەمبـەر

---

[1] صحيح: (ص.د/٢٠٢٠) ، د(٦/٤١٣/٢٢٨٧)، ن(٦/٢٠٣).

(دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی تەڵاقدراوی سێبەسێ فەرمووی: «لَيْسَ لَهَا سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةٌ».[١] نەشوێنی حەوانەوە، نە بژێوی لەسەر مێردی نیە.

پێویستە لەسەر ئافرەتی لەوجۆرە کە لەماڵی باوانیدا عیدە بگرێ بۆکاری پێویستیش نەبێ نابێ لەماڵ دەربچێ.

لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پورم تەڵاق درا، ویستی بچێ خورماکانی بچنێ‌و مشتاغە خورما بنێتەوە. پیاوێك ناڕازی بوو بەوکارەی‌و وتی: نابێ لەماڵ دەربچی، ئەویش هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «بَلَى فَجُدِّى نَخْلَكِ فَإِنَّكِ عَسَى أَنْ تَصَدَّقِي أَوْ تَفْعَلِي مَعْرُوفًا».[٢] بەڵێ، بڕۆرە دەر خورماکەت بچنە ئەوە کاری پێویستە، تۆ لەوانەیە خورماکانت بکەی بەخێرو صەدەقە یان بۆ کارێکی باشی خۆت بەکاریان بێنی.

## (الاستبراء): چاوەڕوانکردنی پاکبوونەوەی منداڵدان

ئەگەر پیاوێك چەتیوە کۆیلەیەك بوو بەملکی‌و بەکەڵکی کاری جنسی دەهات، نابێ توخنی بکەوێ هەتا چەتیوەکە منداڵدانی پاك دەبێتەوە، جا ئەگەر دووگیان بوو ئەوە بەدانانی منداڵەکە رەحمی پاك دەبێتەوە، ئەگەر لەوانەبوو کە عادەی مانگانەی هەبێ ئەوە بەیەکجار کەوتنە عادەوە رەحمی پاك دەبێـەوە.

---

[١] صحيح: (مختصر م/٨٨٨)، م(١٤٨٠ — ٤٤ -/٢/١١١٨).

[٢] صحيح: (الإرواء/٢١٣٤)، م(٢/١١٢١/١٤٨٣)، ن(٢/٢٠٩)، د(٦/٣٩٨/٢٢٨٠)، جة(١/٦٥٦/٢٠٣٤).

لە (روەیفیعی کوڕی ثابیت)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَسْقِ مَاءَهُ وَلَدَ غَيْرِهِ». [1]

لە ئەبو سەعیدەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی ئافرەتە ڕفێندراوەکانی ئەوطاس (سبي أوطاس) فەرمووی: ئافرەتە دووگیانەکان سەرجێیی ناکرێن هەتا سکەکەیان دادەنێن. ئەوانەشیان کە حامیلەنین دەبێ بکەونە بێنوێژییەوەو پاك ببنەوە ئەمجار ئێوە بچنە لایان. [2]

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئەگەر چەتیوە کۆیلەیەك بەخشراو بەکەڵکی (چوونە لا) دەهات، یان فرۆشرا، یان ئازادکرا با بە یەکجار کەوتنە ناو عادەی مانگانەوە ڕەحمی خۆی پاك بکاتەوە. ئەگەر کۆیلەکە دەست لێ نەدراوبوو ئەوە پێویست ناکا ڕەحمی پاك بکاتەوە.

## حەضانە (منداڵ لەخۆگرتنو بەخێوکردنی)

حضانة: بریتییە لە پارێزگاریکردنی منداڵ لەهەرشتێك زیانی پێ بگەیەنێ، هەوڵ بدرێ بەرژەوەندییەکانی بپارێزرێ.

هەرکاتێك پیاو لەژنەکەی جیابووەو منداڵی لێی هەبوو، ژنەکە شیاوترین ئافرەتە بۆ بەخێوکردنی منداڵەکە تا تەمەنی دەبێتە حەوت ساڵ، بەمەرجێك شوو نەکاتەوە. جا کە منداڵەکە تەمەنی بوو بەحەوت ساڵ سەرپشك دەکرێ لەنێوان باوکیو دایکی دا، لای کامیانی هەڵبژارد دەتوانێ لەخۆی بگرێو بەخێوی بکا.

---

[1] حسن: (ص.د/١٨٩٠)، ت(٢/٢٢٩/١١٤٠)، د(٦/١٩٥/٢١٤٤).

[2] صحيح: (ص.د/١٨٨٩) ، د(٦/١٩٤/٢١٤٣).

لە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئافرەتێك عەرزی پێغەمبەری کرد (درودی خودای لەسەر بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم کوڕەم بە پێستی سك هەڵگرتووە بە مەمکم شیرم داوەتێ، باوەشم شوێنی حەوانەوەی بوو، ئێستا باوکەکەی تەلاقی داوم، دەیەوێ کوڕەکەم لێ بستێنێ... پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مَا لَمْ تَنْكِحِي ».. ئەتۆ شیاوترین ئافرەتی بە بەخێوکردنی بەمەرجێك شوونەکەیەوە.[1]

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: (ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! مێردەکەم دەیەوێ کوڕەکەم لێ بستێنێ، منیش پێویستیم پێیەتی لەبیری (ئەبو عینەبە) ئاوم بۆ دێنێو سودم لەزۆر کاری تری پێ دەگا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە منداڵەکەی فەرموو: ئەمە باوکتەو ئەوەش دایکتە دەستی کامیان دەگریو پێت خۆشە لەلای کامیان بی ئارەزۆی خۆتە کوڕەکە دەستی دایکی گرتو وتی: پێم خۆشە لای ئەم بم ئیتر دایکەکە کوڕەکەی بردەوە.[2]

## كتاب النفقات

## نامەی بژێوی بەهەموو جۆرەکانیەوە

پەروەردگار بە فەضڵو گەورەیی خۆی رزقو رۆزیی بەندەکانی فەراهەم هێناوە، فەرمانی پێ کردون کە لەو رزقو رۆزییەی پێی داون ببەخشن، وادەی داونێ: کە هەرچەندێك ببەخشن قەرەبویان بۆ بکاتەوە لەدونیاداو لەقیامەتشدا پاداشیان بداتەوە، دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ

---

[1] حسن: (الإرواء/٢١٨٧)، د(٦/٣٧١/٢٢٥٩).

[2] صحيح: (ص.د/١٩٩٢) ، ن(٦/١٨٥)، د(٦/٣٧١/٢٢٦٠).

أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لاَّ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خُلَّةٌ وَلاَ شَفَاعَةٌ – البقرة/٢٥٤}: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە لەو ماڵو سامانەی پێمان داون ببەخشن، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێ کە کڕینو فرۆشتنی تێدا نیە، دۆستایەتیو شەفاعەتکردن نیە. هەروا دەفەرموێ: {قُل لِّعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُواْ يُقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلانِيَةً مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لاَّ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خِلاَلٌ – إبراهيم/٣١}: ئەی پێغەمبەر! بەو بەندانەی من بڵێ کە ئیمانیان هەیە، نوێژەکانیان بەجێ بێننو لەو ڕزقو ڕۆزییەی پێمان بەخشیون بەنهێنیو بەئاشکرا ببەخشن، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێ کڕینو فرۆشتنی تێدا نیە، دۆستایەتیو خزمایەتی هیچ ڕۆڵێکیان نامێنێ، یان دەفەرموێ: {قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ – سبأ/٣٩}: هەر شتێك ببەخشن خودا بۆتان قەرەبوو دەکاتەوە، ئەو پەروەردگارە باشترین ڕزقو ڕۆزیدەرە، یان دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَّن تَبُورَ. لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ – فاطر/٢٩-٣٠}: ئەوانەی نامەی خودا دەخوێننەوەو کاری پێ دەکەن، نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن، لەو ماڵو سامانەی پێمان بەخشیون بەنهێنیو بەئاشکرا لێی دەبەخشن، بەتەمای ئەوەی پاداشیان بدرێتەوەو مامەڵەکەیان سودبەخش بێو زەرەر نەکەن، ئەو ماڵو سامانەیان دەبەخشن بۆ ئەوەی لەقیامەتدا خودا پاداشی باشیان بداتەوەو بەفەضلو گەورەیی خۆی زێدەیان بداتێ، بێگومان خودا غەفورو شەکورە.

هەروا پەروەردگار ماڵبەخشینی بەڕەوشتی تەقواکاران حسێب کردووە، دەفەرموێ: {الم . ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ. الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ – البقرة/١-٣}: ئیبنو عەبباس

دهفهرموێ: مانای {وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ} واته: زهكاتی شهرعی لهماڵی خۆیان دهردهكهن.

وهلێ لهفظی نهفهقه گشتگیرهو شمولی زهكاتو غهیری زهكاتیش دهكا له نهفهقه واجبهكان، بۆیه ئیبنو جهریر دهڵێ: باشترین تهئویلو مانا لێدانهوه بۆ ئایهتهكه ئهوهیه بڵێین: ههرچی پێویست بێ لهسهریان دهربارهی ماڵو سامانیان بهرێكو پێكی ئهنجامی دهدهن، زهكات بێ یان غهیری زهكات بێ، وهكوو بژێوی ئهوانهی نهفهقهیان لهسهر كهسانی ترهو پێویسته بهخێویان بكهن، كهواته: پهروهردگار وهصفی ئیماندارانی كردووهبه صیفهتێكی گشتی بهخشین، زهكات بێ یان نهفهقهو كۆمهكی كردن بێ به ئاتاجان، نهفهقه كێشانی ماڵو منداڵو زهكات دهركردن كاری پهسهندو ههڵوێستی مهردانهو موسوڵمانانهیه.[1]

ئیبنو كهثیر دهفهرموێ: زۆرجار پهروهردگار له قورئاندا باسی نوێژو ماڵبهخشین به پهنا یهكهوه دێنێ، چونكه نوێژ مافێكی خودایه لهسهر بهندهكانیو عیبادهته، تاكو تهنهایی خوداو حهمدو ئهناو تهمجیدی زاتی بێچونیو پاڕانهوه لێیو پشت بهستن بهزاتی پاكی له خۆگرتووه، ماڵ بهخشینیش بریتییه له چاكهكردن لهگهڵ مهخلوقاتدا بهوه سودیان پێ بگهیهنێ، پێشترین كهس كهپێویست بێ چاكهیان لهگهڵ بكرێو مرۆڤ سودیان پێ بگهیهنێ ماڵو خێزانو خزمو كهسوكارو كۆیلهو ژێردهستهكانن، پاشان دۆستو ئهحبابه، ههموو ماڵ بهخشینێك كهواجب بێ، ههروا زهكاتی شهرعی دهچنه چوارچێوهی دهقی {وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ}.[2]

---

[1] جامع البيان فی تفسير القرآن للقرطبی ج١/١٠٥.

[2] تهفسیری ئیبنو كهثیر ج١/٤٢.

## نەفەقەی پیاو بۆ خێزانی

قورئان دەفەرموێ: {وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ - البقرة/٢٣٣}.

دایکەکان دەبێ شیر بدەن بە منداڵەکانیان بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو، لەسەر باوکی منداڵەکە (یان ئەو کەسەی دەبێتە جێگری) پێویستە بژێوو پۆشاکی شیاو بەگوێرەی تواناو عورفو عادەت بۆ دایکەکان دابین بکەن.

لە حەکیمی کوڕی معاویەوە ڕیوایەتکراوە، ئەویش لەباوکیەوە دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: مافی ژن لەسەر مێردەکەی چیە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَنْ يُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمَ وَأَنْ يَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَى».[1] خواردنی پێویستی بۆ دابین بکا، پۆشاکی پێویست بەگوێرەی عورفو عادەت بۆی فەراهەم بێنێ.

لە سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی (الأحوص)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَلاَ وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّمَا هُنَّ عَوَانٌ عِنْدَكُمْ لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئًا غَيْرَ ذَلِكَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ فَإِنْ فَعَلْنَ فَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً أَلاَ إِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقًّا وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ أَلاَّ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ وَلاَ يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ أَلاَ وَحَقُّهُنَّ عَلَيْكُمْ أَنْ تُحْسِنُوا إِلَيْهِنَّ فِي كِسْوَتِهِنَّ وَطَعَامِهِنَّ».[2] ئاگادار ببنەوەو ئامۆژگاری یەکتری بکەن دەربارەی ئافرەتان، بێگومان ئەوان سپاردەو ئەمانەتن لاتان. ئێوە دەسەڵاتی موڵکیەتتان بەسەر ئەواندا نیە، نابێ بیان چەوسێننەوە، مەگەر کارێکی خراپ ئەنجام بدەن، ئەگەر شتێکی وایان لێ

---

[1] صحيح: (ص. ج/١٥٠٠)، جه (١/٥٩٤/٥٩٣/١٨٥٠)، د (٦/١٨٠/٢١٢٨).

[2] حسن (ص. ت/٣٠٨٧)، ت (٢٣٧/٥٠٨٢ و ٤/٣٣٨)، جه (١/٥٩٤/١٨٥١).

رودرا، ئێوه بەمەبەستی تەمبێ کردن، لەگەڵیان مەخەون، بەشێوەیەك لێیان بدەن کە ئازاری جەستەیان پێ نەگا. جا ئەگەر تەمبێ خواردو بوون‌و هاتنە ژێر فەرمانتانەوە، ئەوە ئیتر دژیان مەجوڵێنەوەو زەختیان لێ مەکەن، ئاگاداربن ئێوه مافتان بەسەر ژنەکانتانەوە هەیەو ژنەکانیشتان مافیان لەسەر ئێوه هەیە، مافی ئێوه بەسەر خێزانەکانتانەوە ئەوەیە: رێگە نەدەن کەسانێك کەئێوه ناخۆشتان دەوێن بێنە ماڵتان‌و پێ بخەنە سەر بەڕەو راخەرتان، رێگە نەدەن کەسانێك بێتە ماڵتان کە ئێوه ڕقتان لێیەتی، هەقی ئەوانیش بەسەر ئێوەوە ئەوەیە چاکەیان لەگەڵ بکەن‌و بەگوێرەی عورف‌و عادەت بژێوو پۆشاکیان بۆ دابین بکەن.

بژێوی ژن لەسەر مێردەکەی واجبەو پیاوەکە لەسەر دابینکردنی ئەو بژێوە ئەجرو ئەوابی لای خودا بۆ دانراوە.

لە ئەبو مەسعودی (البدری)ەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا أَنْفَقَ الْمُسْلِمُ نَفَقَةً عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا ، كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً». بێگومان موسوڵمان کە بژێوو پێداویستی بۆ ماڵ‌و منداڵی دابین دەکاو بڕوای وایە فەرمانی خودا جێبەجێ دەکاو بەهیوای پاداشە، ئەوە بەصەدەقەو خێر بۆی دەنوسرێ.[1]

لە سەعدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی گوتم: «إِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلاَّ أُجِرْتَ عَلَيْهَا ، حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ».[2] ئەتۆ هەر نەفەقەو بژێوێك ببەخشی‌و مەبەستت

---

[1] متفق عليه: خ (١/١٣٦/٥٥)، م (٢/٦٩٥/١٠٠٢)، ن (٥/٥٩٤).

[2] متفـــق عليـــــه: خ (١/١٣٦/٥٦)، م (١٢٥٠/١٦٢٨ و ٣/١٢٥١)، د (٦٤/٢٨٤٧ — ٨/٦٦)، ن (٦/٢٤٢/٢٤١).

بەو بەخشینە ڕەزامەندیی خودا بێ، دڵنیابە پاداشی خۆت وەردەگریەوە، تەنانەت تەنانەت پاروە خواردنێکیش کە دەیخەیە دەمی ژنەکەتەوە.

بەڵکوو پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نەفەقەکێشانی خێزانی بە گەورەترین نەفەقە حیساب کردووەو فەرموویەتی: «دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ أَعْظَمُهَا أَجْرًا الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ».[1] دینارێك دەبەخشی لەڕێگەی خودادا، دینارێك خەرج دەکەی بۆ ڕزگارکردنی کۆیلەیەك، دینارێك دەبەخشی بەهەژارێك، دینارێك دەدەی بەخێزانت، لەناو ئەم بەخشین‌و خێراتەدا ئەو دینارەی دەیدەی بەخێزانت لەهەموویان پاداشی گەورەترە.

## نەفەقەکێشانی پیاو بۆ ماڵ‌و منداڵی

هەرکاتێ خودا منداڵی بەپیاو بەخشی، پێویستە لەسەری بەشێوەی ڕێك‌وپێك پەروەردەیان بکاو نەفەقەیان بکێشێ، قورئان دەفەرموێ: {وَلاَ تُؤْتُواْ السُّفَهَاء أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ قِيَاماً وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلاً مَّعْرُوفًا – النساء/٥} ماڵ‌و سامانی خۆتان مەخەنە ژێردەستی کەودەن‌و گێل‌و نەفامەکانەوە، ئەو ماڵ‌و سامانەی خودا ئێوەی کردووە بە بەرپرسی‌و دەسەڵاتدار تێیدا. لەو ماڵ‌و سامانەتان خواردنیان بدەنێ، پۆشاکیان بۆ دابین بکەن، ئامۆژگارییان بکەن‌و هەوڵ بدەن فێری هەڵس‌وکەوتی باشیان بکەن.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: نەکەی ئەو ماڵ‌و سامانەی خودا پێی داوی‌و کردوویەتی بەبژێو بۆ خۆت‌و خێزانت ڕادەستی ژن‌و منداڵەکانتی بکەی‌و بۆ خۆت تێیان ڕامێنی، بەڵکوو پێویستە بۆخۆت سەروکاری ماڵ‌و سامان بکەی‌و

---

[1] م (٢/٦٩٢/٩٩٥).

بەرێك و پێكی وەگەڕی بخەی و نەهێڵی لەژێر دەسەڵاتی خۆت دەربچێ، لەهەمان کاتدا بژێوو پۆشاك و پێداویستی خێزان منداڵەکانتی بەجوانی لێ دابین بکەی.[1]

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ نەفەقەکێشانی ژن و منداڵ و هەموو ئەوانەی نەفەقەیان لەسەر پیاوە. دەفەرموێ: «أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ مَا تَرَكَ غِنًى ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى ، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ. تَقُولُ الْمَرْأَةُ إِمَّا أَنْ تُطْعِمَنِي وَإِمَّا أَنْ تُطَلِّقَنِي . وَيَقُولُ الْعَبْدُ أَطْعِمْنِي وَاسْتَعْمِلْنِي . وَيَقُولُ الابْنُ أَطْعِمْنِي ، إِلَى مَنْ تَدَعُنِي».[2] باشترین صەدەقەو خێر ئەوەیە دەوڵەمەندی بۆ خاوەنەکەی بەجێ بێڵێ، دەستی بەرزو بەخشندە باشترە لەو دەستەی وەردەگرێ و پان دەکرێتەوە، کە تۆ ماڵ دەبەخشی و نەفەقە دەکێشی سەرەتا لەوانەوە دەست پێ بکە کەواجبە نەفەقەیان بکێشی، کوردی گوتەنی (تا ماڵ پێویستی بێ بەمزگەوت حەرامە) ژن دەبێژێ یان بژێوم بۆ دابین بکە یان تەڵاقم بدەو با بۆخۆم ڕێگایەك بۆ خۆم ڕەچاو بکەم، کۆیلە دەڵێ: بژێوم بۆ دابین بکەو کارم پێ بکە، کوڕ دەڵێ: من منداڵم پێویستە بەخێوم بکەی، ئەی کە وانەکەی دەمدەیە دەست کێ؟!

لە ئەوبانەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أَفْضَلُ دِينَارٍ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ دِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى عِيَالِهِ».[3] باشترین دینارو پارە کەپیاو دەیبەخشێ پارەیەکە بەسەر خێزانەکەیدا دەیبەخشێ.

لەهەمان کاتدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هۆشداری دەدا بە خەتەرناکی بوخل و دەست قوچاوی و دەفەرموێ: « كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ

---

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج/٤٥٢/٢.

[2] خ (٩/٥٠٠/٥٣٥٥).

[3] م (٢/٦٩٢/٩٩٤)، ت (٣/٢٣٢/٢٠٣٢).

مَـنْ يَقُـوتُ». [١] بەسـە بـۆ پیـاو تاوانبـاریو خراپـی کـە: گـوێ بەوانـە نـەدا کەبژێویان لەسەریەتی.

جا ئەگەر پیاو بەرێكو پێكی بـژێوی ژنو منـداڵی خـۆی دابـین کـردو پێی وابوو ئەوە ئەركێکە لەسەر شانیەتیو بەهیوای پاداش بوو، ئەوە پاداشـی خۆی وەردەگرێ، خۆ ئەگەر وەکوو پێویست بەو ئەرکە هەڵنەسا، بـۆ ژنەکـەی ڕەوایە بەئەندازەی پێویستی خۆیو منداڵەکانی لەماڵی مێردەکەی هەڵبگرێو بەدزیو دەست پیسی بۆی حیساب ناگرێ.

لـە خـاتو عائیـشەوە ڕیوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: هینـدی کـچی (عتبـە) کەژنی ئەبو سـوفیان بـوو، هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو سوفیانی مێردم پیاوێکی دەست قوچاوی چـروکە، ئەوەنـدەم نەفەقـە ناداتـێ بەشـی خـۆمو منداڵـەکانم بکـا، مەگەر هەوڵ بـدەم بـدزمو نـەهێڵم پێـی بزانـێ، ئایـا مـن بـەم کـارەم تاوانبـار دەبم؟ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: «خُـذِي مِـنْ مَالِـهِ بِالْمَعْرُوفِ مَا يَكْفِيكِ وَيَكْفِي بَنِيكِ». [٢] بەبێ ئەوەی پێی بزانێ لە مـاڵو دارایـی ئەو ئەوەندە وەلا بنێ کە بەشی خۆتو منداڵەکانت بکاو زێدەڕەوی مەکە.

## نەفەقەکێشانی باوكو دایك

لەو نەفەقە پێویستانەی لەسەر شانی مرۆڤە دابینکردنی بژێوی باوكو دایکە ئەگەر نەدارابوون، هەرکاتێ باوك هەژار بوو کوڕەکەی دەوڵەمەند بـوو، پێویـستە لەسـەر کوڕەکـە بـژێوی بـاوکی دابـین بکـا، بـۆ باوکەکـەش دروسـتە

---

[١] حسن (ص/١٦٩٢)، د (٥/١١١/١٦٧٦).

[٢] متفق عليه: خ (٩/٥٠٧/٥٣٦٤)، م (٣/١٣٣٨/١٧١٤)، د (٩/٤٤٧/٣٥١٥).

لەماڵی کوڕەکەی بەبێ ئەوەی ئیزنی بدا بەگوێرەی پێداویستی خۆی بڕێو وەلا بنێ.

لە عوممارەی کوڕی عوصەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیارم لەخاتو عائیشە کرد (ڕەزای خودای لێ بێ) وتم منداڵێکم لایە ماڵو سامانی تایبەتی خۆی هەیە ئایا من دەتوانم لێی بخۆم؟ وتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ مِنْ أَطْيَبِ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ وَوَلَدُهُ مِنْ كَسْبِهِ».[1] بێگومان پاکترین خواردنێك کەپیاو دەیخوا ئەوەیە لەبەروبومی دەستی خۆیو ڕەنجی شانی بخوا، منداڵیش بەشێکە لەڕەنجی شانی ئەو.

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لەباوکیەوە لەباپیریەوە دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتی: باوکم ماڵەکەمی برد تالآنی کردم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَنْتَ وَمَالُكَ لأَبِيكَ». ئەتۆ خۆتو ماڵەکەت هی باوکتن. ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ أَوْلاَدَكُمْ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِكُمْ فَكُلُوا مِنْ كَسْبِ أَوْلاَدِكُمْ».[2] بێگومان منداڵەکانتان بەشێکن لەکردو کۆو کارو کاسبیتان لەماڵو سامانیان بخۆن حەڵاڵە.

### نەفەقەی خزمو کەسوکاری ئاتاج

قورئان دەفەرموێ: {وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ – الإسراء/٣٦}: ببەخشن بەخزمو کەسوکارتان مافو حەقی خۆیان، هەروا بە هەژارانو ڕێبوار بەشی خۆیان بدەنێ.

---

[1] صحيح: (ص. د/٣٠١٥)، د (٩/٤٤٤/٣٥١١)، ت (٢/٤٠٦/١٣٦٩)، جه (٢/٧٢٣/٢١٣٧).

[2] حسن صحيح: (ص. د/٣٠١٥)، د (٩/٤٤٥/٣٥١٣)، جه (٢/٧٦٩/٢٢٩٢).

هەروەها دەفەرموێ: {فَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ ذَلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ – الروم/٣٨}. خزمو کەسوکار مافی خۆیان بدەرێ هەروەها بەهەژاران‌و ڕێبوارانیش، ئەو ئاکارو ڕەفتارە باشە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ خودا لێیان ڕازی بێ‌و هەر ئەوانەش سەرفرازو ڕزگاربوو بەختەوەرن.

لە طاریقی (المحاری)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: هاتینە ناوشاری مەدینە لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر مینبەر وتاری دەدا بۆ خەڵکەکەو دەیفەرموو: «يَدُ الْمُعْطِي الْعُلْيَا وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ أُمَّكَ وَأَبَاكَ وَأُخْتَكَ وَأَخَاكَ ثُمَّ أَدْنَاكَ أَدْنَاكَ».[1] دەستی بەخشندە بەرزو ڕێزدارە، ئەتۆ لەو کەسانەوە دەست پێ بکە بۆ نەفەقەکێشان کە نەفەقەیان لەسەرتە، دایکت‌و باوکت‌و خوشك‌و برات ئەمجار کێ نزیکە بەتۆ ئەوە پێش بخە بەسەر کەسانی تردا.

قورئان دەفەرموێ: {يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَا أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ – البقرة/٢١٥}: پرسیارت لێ دەکەن چی ببەخشن؟ پێیان بڵێ: هەر ماڵ‌و سامانێك دەبەخشن بیدەنە باوك‌و دایکتان‌و خزم‌و کەسوکارتان‌و هەتیوان‌و هەژاران‌و ڕێبوار، هەر خێرو چاکەیەك بکەن خودا ئاگای لێیە. واتە خێرو صەدەقەتان بەسەر ئەو جۆرە کەسانەدا دابەش بکەن، وەکوو لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتووە: «أُمَّكَ وَأَبَاكَ وَأُخْتَكَ وَأَخَاكَ ثُمَّ أَدْنَاكَ أَدْنَاكَ».

---

[1] صحيح: (ص. ن/٢٥٣١)، ن (٥/٦١).

مەیمونەی کوڕی میهران ئەو ئایەتەی خوێندەوە، پاشان وتی: ئەمانە ئەوانەن کە نەفەقەیان بەسەردا دابەش دەکرێ {هیچ باسی تەبڵو زوڕناو پەیکەرو پەردەی دیواری تێدا نەکراوە}.[١]

لە سەلمانی کوڕی عامیری (الضبی) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ وَهِيَ عَلَى ذِي الْقَرَابَةِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ». [٢] بەخشینی ماڵو سامان بەهەژار خێرە بەخزمی هەژار لەدوولاوە خێرە صەدەقەو صیلەی ڕەحمە.

لە مەیمونەی کچی (الحارث) ڕیوایەتکراوە، کە مەیمونە لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆیلەیەکی ئازاد کرد دوای ئەم کارەی خۆی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باس کرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَوْ أَعْطَيْتِيهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لأَجْرِكِ».[٣] ئەگەر بتبەخشیایە بەخاڵوانت خێرت زیاتر دەست دەکەوت.

لە ئەنەسی مالیکەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئەبو طەلحە دەوڵەمەندترین کەس بوو لەناو مەدینەدا، ماڵو سامانێکی زۆری هەبوو، خۆشەویسترین ملکی بەلایەوە باخی (بەیرەحا) بوو، ئەم باخەی ئەبو طەلحە لەڕووی قیبلەی مزگەوتەوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچووە ناو ئەم باخەو لەئاوی سازگاری باخەکەی دەخواردەوە ئەنەس دەفەرموێ: کە ئایەتی {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ – آل عمران/٩٢}. نازڵ بوو، ئەبو طەلحە چووە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا

---

[١] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج١/٢٥١.

[٢] صحيح: (ص. ن/٢٥٨١)، ن (٥/٩٢)، ت (٢/٨٤/٦٥٣)، جه (١/٥٩١/١٨٤٤).

[٣] متفق عليه: خ (٢١٧/٢٥٩٢، ٢/٢١٨)، م (٢/٦٩٤/٩٩٩)، د (٥/١٠٩،١١٠/٦٧٤).

تُحِبُّـونَ – آل عمـران/٩٢}. منـيش خۆشەويـسترين ملّـكو سـامانم بـاخى (بەيرەحا)يە، ئەوا كردم بەخێر لەرێگەى خوداو بۆ ڕەزامەندى ئەو، هيوادارم خودا بۆم بكا بەتێشووى قيامەتو لاى خۆى بۆم هـەڵبگرێ، ئـەى پێغەمبـەرى خودا! بۆخۆت چۆنت دەوێ ئاوا تەصەروفى تێدا بكە، پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: «بَخْ ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ قَدْ سَمِعْتُ مَـا قُلْتَ فِيهَـا وَإِنِّـى أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَـا فِـى الأَقْـرَبِينَ». بەهبـەه، ئـەوە ماڵێكە سـوود بـەخشو قـازانجى بـاش دەكا، ئـەوە ماڵێكە قـازانج دەكا دەزانم چيت گوتو گوێم لێ بوو، من وام پێ باشە بيكەيە خێرو بيدەيە خزمە هەژارەكانت، ئـيتر ئەبو طەلحە باخەكەى بەسەر خزمەكانىدا دابەش كرد.

### نەفەقەى خزمەتكار

لـە ئـەبو هـورەيرەوە ڕيوايـەتكراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسەر بێ) فەرمانى بەهاوەڵانى كرد خێرو صەدەقە بكەن، پياوێك وتى: ئەى پێغەمبەرى خودا! من دينارێكم هەيە بەكێى ببەخشم، فەرمووى: « تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى نَفْسِكَ». بۆخۆتى خەرج بكە، وتـى: دينـارێكى تريـشم هەيـە، فـەرمووى: «تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى وَلَدِكَ». بيـدە بەمندالەكەت. وتـى: قوربـان دينـارێكى تريـشم هەس. فەرمووى: «تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى زَوْجَتِـكَ». بـۆ ژنەكـەتى خـەرج بكـە. وتـى: قوربان دينارێكى تريشم لايە بيدەم بەكێ؟ فەرمووى: « أَنْتَ أَبْصَرُ » تۆ خۆت باشتر دەزانى، بزانە كێ ئاتاجە بيدە بە ئەو.[1]

لە ئەبو زەڕەوە ڕيوايەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودى خـوداى لەسـەر بێ) فـەرمووى: «إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ ، جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَـنْ كَـانَ أَخُـوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلاَ تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ ، فَـإِنْ

[1] حسن: (ص.د/١٤٨٣)، د(٥/١١٠/١٦٧٥)، ن(٥/٦٢).

كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ».[1] براكانتان لەژێر چاودێری ئێوەدان‌و خودا خستونیە ژێر دەستی ئێوەوە، جا کەسێك براکەی کەوتە ژێر چاودێری ئەوەوە با بۆخۆی چی دەخوا لەو خواردنە بەشی ئەویش دابین بکا.

بۆخۆی چی دەپۆشێ لەو پۆشاکە بۆ ئەویش پۆشاك بکا، کارێك نەخاتە ئەستۆیان بۆیان ئەنجام نەدرێ، ئەگەر ئەرکیان پێ سپاردن با یارمەتییان بدەن.

لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: « إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ ، فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ فَلْيُنَاوِلْهُ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ ، أَوْ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ ، فَإِنَّهُ وَلِيَ حَرَّهُ وَعِلاَجَهُ».[2] ئەگەر یەکێ لەئێوە خزمەتکارەکەی خواردنی بۆ هێنا ئەگەر لەگەڵ خۆی لەسەر سفرەکە داینەنیشێنێ با پارچەیەك یان دوو پارچە، یان پارویەك یان دوو پاروی لە خواردنەکەی بداتێ چونکە پێوەی ماندوو بووە هاڵاوو بۆن‌و بەرامی بەسەردا هاتووە...

خەیثەمە دەفەرموێ: ئێمە لەخزمەت عەبدوڵڵای کوڕی عەمر دانیشتبووین لەنکاوێك سەرکارو میرزاکەی هاتە ژورەوە، عەبدوڵڵا پێی گوت: بژیوو تفاقت دایە کۆیلەکان؟ وتی: نەخەیر، فەرمووی: رامەوەستە بڕۆ بژیویان بدەرێ ئەمجار فەرمووی: پێغەمبەر فەرموویەتی: «كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ».[3] بەسە بۆ پیاو تاوانباری‌و گوناه: کە بژیو لەوانە بگرێتەوە کە لەژێر دەستی دان‌و خاوەنیانە.

---

[1] متفق عليه: خ(٣٠/١/٨٤)، م(١٦٦١/١٢٨٢/٣)، د(٥١٣٥/٦٥/١٤).

[2] خ (٥٤٦٠/٥٨١/٩).

[3] م(٩٩٦/٦٩٢/٢).

## بژێوی گیانلەبەران

کەسێك بوو بەخاوەنی برێك لە گیبانلەبەران پێویستە لەسەری لـەوەڕو ئاویان بۆ دابین بکا، کە کاری پێکـردن زۆریـان ماندونـەکا... جا کەسـێك بـەو جـۆرە مامەڵـەی لەگـەڵ کـردن ئـەوە بەهەشـتییە، کەسـێکیش ئـاوا مامەڵـەی لەگەڵ نەکردن دەچێتە دۆزەخەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ ، فَوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ فَقَالَ الرَّجُـلُ لَقَـدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِى كَانَ بَلَغَ بِى ، فَنَـزَلَ الْبِئْـرَ فَمَـلأَ خُفَّـهُ ، ثُـمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ ، فَسَقَى الْكَلْبَ ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ » . قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنَّ لَنَا فِى الْبَهَائِمِ أَجْرًا . فَقَالَ « فِى كُلِّ ذَاتِ كَبِـدٍ رَطْبَـةٍ أَجْـرٌ».[1] لەکاتێکدا پیاوێك بەڕێگایەکدا دەڕۆیشت تینوایەتی تینی بۆهێنا، بیرە ئاوێکی دۆزیـەوە بـەناویا ڕۆیشتە خوار تێر ئاوی لێ خواردەوە، پاشان هاتەوەدەر، سـەگێکی بینـی هانکە هانکی پێ کەوتبوو لەتینواندا گڵی دەخـواردو هاروشـێت بوبـوو. پیاوەکە کە ئەوەی بینی وتی: ئەم سەگە دیـارە تینوایـەتی تینـی بـۆ هێنـاوە وەکوو چۆن تینـی بـۆمن هێنـابوو، ئـیتر چـووەوە نـاو بیرەکـەو خوفەکـەی پڕکـرد لـەئاو، ئـەمجار بـەدەم خوفەکـەی گـرتو هاتـەدەرو سـەگەکەی ئـاودا، ئـیتر خـودا هەڵوێـستەکەی پـێ خـۆش بـوو لەتاوانـەکانی خۆشـبوو. هـاوەڵان وتیـان: ئـەی پێغەمبەری خودا! بۆ ئێمـە ئەگـەر چاکە لەگـەڵ ئـەو گیانلەبەرانـەش بکـەین خێرمان دەگاتێ؟ فەرمووی: «فِى كُلِّ كَبِـدٍ رَطْبَـةٍ أَجْـرٌ». لەچاکەکردن لەگەڵ هەموو خاوەن جگەرێکی تەڕدا پاداش و ئەواب هەیە.

---

[1] متفق عليه: خ(٢٣٦٣/٤٠ و ٥/٤١)، م(٢٢٤٢/١٧٦/٤)، د(٢٥٣٣/٢/٢٢٢/٧).

لە نافیعەوە لە عەبدوڵلاوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ سَجَنَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ لاَ هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَسَقَتْهَا إِذْ حَبَسَتْهَا وَلاَ هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ».[1] ئافرەتێك دەربارەی پشیلەیەك سزا دەدرێ، بەندی کرد هەتا مردار بۆوە، نەخواردنی دایەو نە ئاوی دایە بە بەندکراوی، نە بەرەڵلاشی کرد ملێو موشی خۆی لەزەوی بکاو شتێکی بەلوتەوە بچێ.

لە عەبدوڵلای کوڕی جەعفەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر لەپاشکۆی خۆیەوە سواری کردم، بەسرتەوە قسەیەکی پێ گوتم بەکەسی ناڵێم، باشترین شتێك کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیکردە پەنا پاسارو نەدیو بۆ قەضای حاجەتی «هَدَفًا أَوْ حَائِشَ نَخْلٍ»، پەنادیوارو پەنا بەردێك یان کۆمەڵە دارخورمایەکی تێکچڕژاو. عەبدوڵلا دەڵێ: ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە ئەو دیو دیواری پیاوێکی ئەنصاری، حوشترێکی لێ بوو کە پێغەمبەری بینی کورکاندیو ئاو بەچاویدا هاتەخوار، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە لایو فرمێسکەکانی سڕینەوە: حوشترەکە لە کورکاندن کەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خاوەنی ئەم حوشترە کێیە؟ ئەم حوشترە هی کێیە؟ گەنجێکی ئەنصاری هاتە خزمەت پێغەمبەرو وتی: هی منە ئەی پێغەمبەری خودا! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَفَلاَ تَتَّقِي اللَّهَ فِي هَذِهِ الْبَهِيمَةِ الَّتِي مَلَّكَكَ اللَّهُ إِيَّاهَا فَإِنَّهُ شَكَى إِلَيَّ أَنَّكَ تُجِيعُهُ وَتُدْئِبُهُ».[2] ئەتۆ بۆ لەئاستی ئەم ئاژەڵە بەستەزمانەی خودا کردویەتی بە ملکی تۆ ناترسیو

---

[1] متفق عليه: خ(٣٤٨٢/٦/٥١٥)، م(٢٢٤٢/١٧٦٠/٤).

[2] صحيح: (ص.د: ٢٢٢٢) ، د(٢٥٣٢/٢٢١ – ٢٢٣/٧).

بەزەییت پێیدا نایەتەوە؟! ئەوەتا لای من شکاتی لێ کردی بەوەی برسی دەکەی‌و زۆریش ماندوی دەکەی.

## باسی کڕین‌و فرۆشتن (كتاب البيوع)

وشەی (ألبيوع) کۆی (بيع) بۆیەش جەمع کراوەتەوە چونکە جۆراو جۆرە.

(بَيع): کە بەمانا فرۆشتنە، گواستنەوەی ملك‌و سامانە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر لەبەرامبەر پارەو بەهادا. (شراء) قبولکردنی ئەو گواستنەوەیە... هەریەك لە وشەی (بيع) و (شراء) لەشوێنی یەکتر بەکاردەهێندرێن.

مامەڵەو کڕین‌و فرۆشتن ڕەوایە، ئاماژە بە ئایەتی {وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا – البقرة/٢٧٥}: خودا بەیع‌و مامەڵەی حەڵاڵ کردوەو ڕیبای حەرام کردوە.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ – النساء/٢٩} ئەی خاوەن باوەڕان، ئەی خودا ناسان؛ ماڵ‌و سامانی یەکتری بە ناڕەواو بێ جێ مەخۆن، مەگەر لەڕێگەی مامەڵەو کڕین‌و فرۆشتنەوەو بە ڕەزامەندی خۆتان کڕین‌و فرۆشتن بکەن.

لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا».[1] فرۆشیارو کڕیار خیاریان بۆ هەیە دەتوانن ژێوان ببنەوە لەدوای سەوداو مامەڵەکەیان‌و هەڵیبوەشێننەوە بەمەرجێ هێشتا لێك جیانەبوبنەوەو هەر لە مەجلیسی

[1] متفق عليه: خ(٢١١٠/٣٢٨/٩)، م(١٥٣٢/١١٦٤/٣)، د(٣٤٤٢/٣٣٠/٩)، ت(١٢٦٤/٣٥٩/٢)، ن(٧/٢٤٤).

بەیعەکەدا مابنەوە. بەمە دەگوترێ (خيار المجلس) موسوڵمانانیش کۆڕایان هەیە لەسەر ڕەوایی‌و حەڵاڵی کڕین‌و فرۆشتن... حیکمەت‌و تێفکرینی عاقڵمەندانیش وای دەبینن کە سەوداو مامەڵە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی پێویستەو کۆمەڵگا بەبێ هەبوونی ئەم دیاردەیە ژیانی بۆ بەڕێوە ناچێ‌و مرۆڤ ناتوانێ پێداویستی ژیانی خۆی‌و خێزانی وەکوو پێویست دابین بکا.

چونکە زۆرجار ئاتاجی مرۆڤ دەکەوێتە شتێك کە لەدەستی کەسانی تردایە، ئەو کەسانەش لەوانەیە بەخۆڕایی ئەو پێداویستییەی رادەست نەکەن‌و پێی نەبەخشن، کەوابوو رێگا چارە بۆ گەیشتن بەو شتەی مرۆڤ پێویستییەتی کڕین‌و فرۆشتنە، تەشریعکردنی سەوداو مامەڵە هۆکارێکی سروشتییە بۆئەوەی مرۆڤ پێداویستی خۆی دابین بکا بەبێ لەرودامان‌و حەرەج.

لە (المقدام)ەوە (رەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ دَاوُدَ – عَلَيْهِ السَّلَامُ – كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ».[1] کەس خواردەمەنییەکی پاك‌و خاوێنی نەخواردووە لەوەی: کە بەدەستی خۆی بەرهەمی دێنێ، بێگومان داود پێغەمبەریش لە کاسبی‌و داهاتی دەستی خۆی بژیوی خۆی دابین دەکرد.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لأَنْ يَحْتَطِبَ أَحَدُكُمْ حُزْمَةً عَلَى ظَهْرِهِ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ أَحَدًا ، فَيُعْطِيَهُ أَوْ يَمْنَعَهُ»[2]: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەکۆڵ داربێنێ لە کەژو بیفرۆشێ باشترە لەوە دەست لە خەڵکی پان بکاتەوە جا بیدەنێ یان نەیدەنێ.

---

[1] صحيح: (ص.ج/٥٥٤٦) ، خ(٢٠٧٢/٣٠٣/٤).

[2] صحيح: (ص.ج/٧٠٦٩) ، خ(٢٠٧٤/٣٠٣/٤)، ت(٦٧٥/٩٤/٢)، ن(٥/٩٦).

## دەوڵەمەندی ج خراپیەکی تێدانیە بۆ کەسێك لەخودا ترس بێ

لـە موعـازی کـوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی خوبەیبـەوە لەباوکییـەوە لـە مامیـەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: «لاَ بَأسَ بِالْغِنَى لِمَنِ اتَّقَى وَالصِّحَّةُ لِمَنِ اتَّقَـى خَيْـرٌ مِـنَ الْغِنَـى وَطِيـبُ الـنَّفْسِ مِـنَ الـنِّعَمِ».[1] دەوڵەمەنـدیو سـامانداری ج خراپیـەکی تێدانیـە بـۆ کەسێك تەقواکاربێ لەشساغیش بۆ تـەقواکار لـە دەوڵەمەنـدی باشـترە دەروون پاکی جۆرێکە لە نیعمەتەکانی خودا.

## هەڵنان بۆ بەرهەمهێنانو کاسبی کردن بۆ دابینکردنی بژیو

لە جابیری کوڕی عەبـدوڵڵاوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا اللَّهَ وَأَجْمِلُـوا فِـى الطَّلَـبِ فَـإِنَّ نَفْسًا لَنْ تَمُوتَ حَتَّى تَسْتَوْفِىَ رِزْقَهَا وَإِنْ أَبْطَأَ عَنْهَا فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَجْمِلُوا فِى الطَّلَـبِ خُذُوا مَا حَلَّ وَدَعُوا مَا حَرُمَ»[2]: ئەی خەڵکینە! لـەخودا بترسـن، تـەقوای خـودا بکەن، بەشێوەی ڕێكو پێك هەوڵی دابینکردنی ژیان بدەن، هەر داواکاریەکتان بوو بەجوانی دەری ببڕن، دڵنیابن هیچ کەسێك نامرێ هەتا رزقو ڕۆژی خۆی تەواونـەکا، هەرچـەندە هەنـدێ جار بەسـستیو کـەمو کوڕی دەسـتی بکـەوێ، تەقوای خودا بکەنو بەجوانی داوای شت بکـەن، لەڕێگـەی ڕەواو شـەرعییەوە هەوڵی دابینکردنی بژیوبدەن، حەڵاڵ وەربگرنو واز لە حەرام بێنن.

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٧٤١) ، جة(٢/٧٢٤/٢١٤١).

[2] صحيح: (ص.جة/١٧٤٣) ، جة(٢/٧٢٥/٢١٤٤).

## هەڵنان بۆ راستگۆیی‌و هەڕەشەکردن لە درۆزنی

لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتفرَّقَا – أَوْ قَالَ حَتَّى يَتفرَّقَا – فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا ، وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا ».[١] فرۆشیارو کڕیار مافی ژێوان بوونەومیان هەیە، بەمەرجێ دوای مامەڵەکردنەکە لەیەکتر جیانەبووبنەوە، جا ئەگەر لە مامەڵە کردنەکەیاندا راستگۆ بوون‌و عەیب‌و خەوشی کالاکەیان نەشاردەوە بەرەکەت دەکەوێتە مامەڵەکەیانەوە، ئەگەر وانەبوون‌و عەیب‌و خەوشی کالاکەیان شاردەوە درۆو دەلەسەیان تێداکرد بەرەکەت‌و گەشەی مامەڵەکەیان پوچ دەبێتەوەو خێرو خۆشی لێ نابینن.

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ بَاعَ مِنْ أَخِيهِ بَيْعًا فِيهِ عَيْبٌ إِلاَّ بَيَّنَهُ لَهُ».[٢]: موسوڵمان برای موسوڵمانە، حەلاڵ نیە بۆ موسوڵمان کالایەك بەبرای موسوڵمانی بفرۆشێ‌و عەیبێکی تێدابێ پێی نەڵێ‌و وەکوو پێویست بۆی رون نەکاتەوە.

## هەڵنان بۆ ئاسانکاری‌و لێبوردەیی لە مامەڵەو کڕین‌و فرۆشتندا

لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «رَحِمَ اللَّهُ رَجُلاً سَمْحًا إِذَا بَاعَ، وَإِذَا اشْتَرَى،

---

[١] لەوەپێش تێپەڕی.

[٢] صحيح: (ص.ج/٦٧٠٥) ، جة(٢/٧٥٥/٢٢٤٦).

وَإِذَا اقْتَضَى»[١]: رەحمەتی خودا لەپیاوێك لێبوردەبێ لەكاتی فرۆشتندا، لەكاتی كڕیندا، لەكاتی داواكردنو بڕیارداندا.

## مۆڵەتدانی نەبوو تا سەرخۆی دەكەوێتەوەو تەنگژەی نامێنێ

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «كَانَ تَاجِرٌ يُدَايِنُ النَّاسَ، فَإِذَا رَأَى مُعْسِرًا قَالَ لِفِتْيَانِهِ تَجَاوَزُوا عَنْهُ، لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنَّا، فَتَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهُ».[٢] بازرگانێك هەبوو قەرزی دەدا بە خەڵك، جا ئەگەر بیزانیایە یەكێك لە قەرزدارەكانی نەبووە بە پیاوەكانی خۆی دەگوت: لە قەرزەكەی خۆشبنو بیكوژێننەوە، بەڵكوو خودا لێمان خۆشبێ، لەپاداشی ئەوەدا خودا لە تاوانەكانی خۆش بوو.

## نەهیكردن لەغەش

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەلای پیاوێكدا تێپەڕی خواردەمەنی دەفرۆشت (دانەوێڵەیەك بوو) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی بردە ناو كۆمەڵە دانەوێڵەكەیەوە، بینی غەشی تێدابوو، شێدار بوو. فەرمووی: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ غَشَّ»[٣]: كەسێك غەش بكا لەپێڕی ئێمە نیە.

---

[١] صحيح: (ص.ج/٤٤٥٤) ، خ(٢٠٧٦/٢٠٦/٤).

[٢] صحيح: (ص.ج/٣٤٩٥) ، خ(٢٠٧٨/٣٠٨/٤).

[٣] صحيح: (الإرواء/١٣١٩) ، (ص.جة/١٨٠٩)، جة(٢٢٢٤/٧٤٩/٢)، د(٣٤٣٥/٣٣١/٩)، ت(١٣٢٩/٣٨٩/٢)، م(١٠٢/٩٩/١).

## هەڵنان بۆ زوو دەست بەکاربوون لەپێناو بەدەستهێنانی رزق

لە صەخری (الغامدی)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا»[1] خودایە بەرەکەت بخەرە کاروباری ئومەتەکەم ئەوانەی بەیانیان زوو دەچنە سەر ئیشەکانیان‌و زوو دەست بەکاردەبن.

لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە لە باوکییەوە لە باپیریەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ قَالَ حِينَ يَدْخُلُ السُّوقَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ كُلُّهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ - كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ وَمَحَا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ وَبَنَى لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ»[2]: کەسێك لەوکاتەدا دەچێتە ناو بازاڕەوە بڵێ {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ كُلُّهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} پەروەردگار هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنووسێ‌و هەزار هەزار تاوانی لێ دەکاتەوەو خانوێکی لەبەهەشتدا بۆ بنیات دەنێ.

## ئەو شوێنانەی نابێ مامەڵەو کڕین‌و فرشتنیان تێدابکرێ

لە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ فَقُولُوا لاَ أَرْبَحَ اللَّهُ تِجَارَتَكَ».[3] ئەگەر بینیتان کەسێك لەمزگەوتدا کاڵا دەفرۆشێ یان دەیکڕێ، بڵێن: یاخودا سەوداو مامەڵەکەت بەرەکەت ئامێز نەبێ.

---

(1) صحيح: (ص.جة/١٨١٨) ، جة(٢/٧٥٢/٢٢٣٦)، ت(٢/٣٤٣/١٢٣٠)، د(٧/٢٦٥/٢٥٨٩).

(2) حسن: (ص.جة/١٨١٧)، جة(٢/٧٥٢/٢٢٣٥).

(3) صحيح: (ص.ت/١٣٢١)، ت(٢/٣٩١/١٣٣٦).

## ئەو کاتانەی سەوداو مامەڵەیان تێدا دروست نیە

قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ. فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ – الجمعة/٩ – ١٠}: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە؛ ئەگەر لەڕۆژی هەینیدا بانگدراو بانگکران بۆ نوێژ بەپەلە بڕۆن بۆ بەجێهێنانی نوێژو واز لەسەوداو مامەڵە بێنن، ئەو باش‌و پەسەندە بۆ ئێوە ئەگەر ئێوە بزانن. جا کە نوێژ ئەنجام درا ئەوە بە ناو زەویدا بڵاو ببنەوەو خەریکی کارو کاسبی خۆتان بن‌و هەوڵ بدەن فەضل‌و نیعمەتی خودا بەدەست بێنن، یادی خودا زۆر بکەن بەڵکوو بەختەوەری هەردوو جیهان بەدەست بێنن.

ئیبنولعەرەبی دەڵێ: ئەوەی ئایەتەکە ئاماژەی پێ کرد کۆڕای زانایانی ئیسلامی لەسەرەو خیلاف لەوەدانیە کە لەکاتی نوێژی جومعەدا مامەڵە حەرامە. ئەگەر سەودایەك لەوکاتەدا کرا فەسخ دەبێتەوە. هەر سەوداو کاروبارێك مرۆڤ لە نوێژی جومعە مەشغوڵ بکا ئەوە حەرام‌و یاساغەو دانامەزرێ‌و بە هەڵوەشاو حیساب دەکرێ... ئەم حوکمەش بە مەبەستی رەدع‌و وازهێنانە لە ئەنجامدانی مامەڵە کردن لەکاتی نوێژی هەینیدا.[1]

## خودا کڕین‌و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە

لە ئەصڵ‌و بناغەدا هەموو کڕین‌و فرۆشتنێك دروستە بەهەر شێوەیەك بێ، مادام رەزامەندی کڕیارو فرۆشیاری تێدا بێتەجێ‌و شاریع نەی لێ نەکردبێ.

---

[1] احكام القرآن/١٨٠٥ – ٤/١٨٠٦.

## ئەو كڕين‌و فرۆشتنانەی شەرع نەی لێ كردون

١- بيع الغرر: سەودای زيانئاميز:

بریتییە لە هەر كڕین‌و فرۆشتنێك نەزانی لەخۆ گرتبێ، یان موجازەفەو خەتەریات‌و قوماری تێدابێ.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی كرد لە كڕین‌و فرۆشتنی كاڵایەك نادیاریی تێدابێ‌و كاڵاو سیعر نادیاربێ یان نادیاریی تێدابێ. هەروا نەهی كرد لە (بيع الحصاة) ئەم جۆرە مامەڵەیە بریتییە لەوە فرۆشیار بڵێ ئەم بەردوچكە دەهاوێژم كەوتەسەر كام كاڵا ئەوەم پێ فرۆشتی. یان ئەم بەردە هەڵدەدەم تاكوێ گەیی ئەو مەسافەیەت لە زەوییەكە پێ دەفرشم. یان ئەم سەودایەت لەگەڵ دەكەم‌و ئەتۆ خیارت هەبێ هەتا ئەم بەردە دەهاوێژم. یان خودی بەرد هاویشتنەكە بكەنە عەقدی فرۆشتنەكە. بڵێ هەركاتێ بەردم گرتە ئەو قوماشە ئەو كاڵایە ماڵت بێ‌و پێم فرۆشتی.

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی موسلیمدا (ج١٠/١٥٦) دەفەرموێ: نەهی كردن لە (بيع الغرر) مامەڵەی فرت‌و فێڵاوی، بنەمایەكی گەورەیە لە بنەماكانی باسی سەوداو مامەڵە، بۆیە ئیمامی موسلیم ئەم باسەی لە كتێبەكەیدا پێش خستووە، چەند نموونەی سەوداو مامەڵەی ناشەرعی تێدان‌و هەموویان دەچنە بواری بەیعی غەرەرەوە. وەكوو فرۆشتنی كۆیلەی راكردو، فرۆشتنی شتی نەبوو، شتی نەزانراوو نامەعلووم، هەر كاڵایەك نەتوانی تەسلیمی بكەی، كاڵایەك بەتەواوی ملكی فرۆشیار نەبێ، فرۆشتنی ماسی لە ئاوی زۆردا، شیر لە گواندا، فرۆشتنی بێچوو لەسكی دایكەكەیدا. فرۆشتنی كۆمەڵێكی نادیار لەچەند كۆمەڵە گەنمێك، فرۆشتنی كراسێك لەچەند كراسێك، مەڕێك یان بزنێك لە رانە مەڕێكداو شتی لەوجۆرە هەموو

ئەو سەوداو مامەڵانە نادروستو ناشەرعین. چونکە زیانی بۆ کڕیار تێدایەو هیچ پێویستیاتێکیش نیەحەڵاڵی بکا.

هەر ئەوەوی دەفەرموێ: ئەگەر پێویستیاتێك هەبوو داخوازی ئەوەبوو مل بدەین بۆ مامەڵەیەك کە (بیع الغرر) بێو بە نارەحەتیو موشەققەت نەبایە نەدەتواندرا خۆی لێ بپارێزی، زیانەکەش زۆر نەبوو، مامەڵەکە لەبەر ناچاریی دروستە، بۆیە موسوڵمانان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوەی جبەو کەوای ناوهاخندراو – هەرچەندە ناوهاخنەکە نابیندرێ – دروستە، خۆئەگەر بەتەنیا ناوهاخنەکەی پێ بفرۆشی دروست نیە.

هەروا فەرموویەتی: پێویستە بزانرێ کە (بيع الملامسة) خاوەن کاڵا بڵێ ئەگەر دەستت ڕێی کەوت ئەوەماڵت بێ (بيع المنابذة) هەر لەگەڵ کاڵاکەم بۆ هاویشتی ئەوە ماڵت بێو دەبێ قبوڵت بێ، هەروا (بيع حَبَل الحبلة) بڵێ: ئەگەر حوشترەکەم زا بێچوی بوو پاشان ئەم بێچوە گەورەبوو ئاوس بوو بێچوی ئەوم پێ فرۆشتی هەروەها (بيع الحصاة) بڵێ: ئەم بەردە هەڵدەدەم لەکامیان کەوت لەو کاڵایانە ماڵتەو دەبێ بەهاکەیم بدەیتێ. هەروا تۆوی ئەسپو ئاژەڵی تری نێرو شتی لەو جۆرەی باسکران فرۆشتنیان حەرامە، دەچنە بواری (بيع الغرر)ەوە. بەڵام بەتایبەتی ئەم چەند شتە ناویان هێنراوە چونکە ئەو جۆرە مامەڵانە لەسەردەمی نەزانیدا باوبوون.

### نەی کردن لە بەیعی مولامەسەو مونابەزە

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: نەی کراوە لەدوو جۆرە سەوداو مامەڵە: کە سەودای مولامەسەو مونابەزەن. مولامەسە ئەوەیە هەریەك لە کڕیارو فرۆشیار بەبێ تێفکرین دەست بدەن لە پۆشاکی یەکتریو دەست لێدانەکەیان بریتی بێ لە عەقدەکە. یان مولامەسە بریتییە لەوە پیاو

بە پیاو بڵێ: ئەم قوماشەت پێ دەفرۆشم بەو قوماشەو هیچیان سەیری قوماشەکان نەکەن بەڵکوو دەستیان لێ بدەن.

منابذە - مونابەذە: ئەوەیە کابرا بڵێ ئەوەی لامە بۆتی هەڵدەدەم ئەوەی لاتە بۆم هەڵبدە، ئیتر هەریەکەیان ئەوەی لایەتی هەڵی بدا بۆ ئەوی تریان‌و هیچیان نەڕوانێ بۆ قوماش‌و کاڵای ئەویتریان[1].

لە ئەبو سەعیدی (الخدری)یەوە ڕیوایەتکراوە: (نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– عَنْ بَيْعَتَيْنِ وَلِبْسَتَيْنِ نَهَى عَنِ الْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ فِى الْبَيْعِ).[2]

دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەدووجۆر مامەڵەو دوو شێوە پۆشاك نەیی لێ کردین.

الملامسة: بریتییە لەوەی پیاو دەست لە قوماشی یەکێکی تر بدا، جا بەشەو بێ یان بەڕۆژ بێ.

المنابذة: ئەوەیە پیاو پۆشاك یان بڵێ کاڵاکەی هەڵبدا بۆ پیاوێکی ترو ئەویش قوماشەکەی یان بڵێ کاڵاکەی بۆئەم هەڵبدا ئەمە شێوەی سەوداکەیان بێ بەبێ تێفکرین‌و ڕەزامەندی نواندن.

### فرۆشتنی بێچووی بێچوویێك کە هێشتا لەدایك نەبوە (بیع حبل الحبلة)

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: خەڵکی سەردەمی نەفامی گۆشتی نوێنگینە حوشتریان دەفرۆشت، کە هێشتا حوشترەکەیان نەبوو تەنانەت گۆشتی بێچوی بێچوە حوشترێك کە هێشتا لەدایك نەبووبوو. هۆی دروست نەبوونی ئەم جۆرە مامەڵەیە نەزانینی ماوەکەیە.

---

[1] صحيح: (مختصر م/٩٣٨) ، م(١٥١١-٢-/١١٥٢/٣).

[2] متفق عليه: م(١٥١٢/١١٥٢/٣) وهذا لفظه، خ(٤٤، ٢١٤٧/٣٥٨/٤)، د(٣٣٦٢/٢٣١/٩)، ن(٢٦٠/٧).

حَبَل الحبلة: ئەوەیە حوشتر لەدایك بێ، پاشان ئەم حوشترە لەدایك بووە گەورەببێ سكو زا بكا. كابرا بێ پێش ئەوەی حوشترە دایكەكە لەدایك بێ بێچووەكانی بفرۆشێ. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لێ كردن لەوەی ئەو جۆرە سەودایە بكرێ.

**بيع الحصاة**: **فرۆشتن بە بەردوچكە بۆهاویشتن**

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەی كرد لە فرۆشتنی كاڵا بەشێوەی بەردوچكە بۆ هەڵدان، هەروا هەر مامەڵەیەك فێڵو هەڵخەڵەتاندنی تێدابێ. (لەوەپێش ئەم باسە تێپەڕی).

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی موسلیمدا (ج١٠/١٥٦) دەفەرموێ: (بيع الحصاة) سێ تەئویلی بۆ دەكرێ:

١- بەم جۆرە فرۆشیار بڵێ: ئەم بەردە دەهاوم، كەوتە سەر كام جۆر لەم كراسانە؛ لەم تۆپە قوماشانە ئەوە ماڵت بێ. یان لێرەوە ئەم بەردە هەڵدەدەم تا كوێ گەیشت لێرەوە تا ئەوێت پێ دەفرۆشم.

٢- بڵێ من ئەم كاڵایەم پێ فرۆشتی، ڕێگەی خیارو هەڵوەشاندنەوەت هەبێ تا ئەم بەردە دەهاوم لەگەڵ بەردەكەم فڕێ دا ئیتر ماڵت بێو مافی هەڵوەشانەوەت نەبێ.

٣- ئەوەیە خودی هەڵدانی بەردەكە بریتی بێ لە مامەڵەكە بەم جۆرە بڵێ: هەركاتێ ئەم بەردەم هەڵدا بۆسەر ئەو كراسە ئەوە لێم كڕیویو ماڵمە.

## فرۆشتنی تۆماوی نێر

له ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لە فرۆشتنی تۆماوی فەحل، واتە: تۆماوی ئەسپو کەڵەگاو نێرەکەرو نێریو بەران.[1]

## فرۆشتنی کاڵایەك کەنەتبێ

لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد؛ وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاو هەیە داوام لێ دەکا شتێکی پێ بفرۆشم منیش شتەکەم نیە، ئایا پێی بفرۆشم؟ فەرمووی: « لاَ تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ».[2] شتێك مەفرۆشە کەنیتە.

## فرۆشتنی کاڵا پێش ئەوەی بکەوێتە ژێر دەستت

له ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ». کەسێك تەعامێکی کڕی با نەیفرۆشێتەوە تا دەکەوێتە ژێردەستی، کە کەوتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی ئەوجا دەتوانێ بیفرۆشێتەوە، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێم وایە هەموو کاڵایەك وەکوو خۆراك وایە.[3]

ئەم بۆچوونەی ئیبنو عەبباس لە حەدیسێکی مەرفوعدا چەسپاوە، وادیارە ئیبنو عەبباس فەرموودەکەی پێ نەگەیشتووە.

لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بە پێغەمبەرم گوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمن معامەلە چیم، دەکڕمو دەفرۆشم چیم بۆ

---

[1] صحيح: (مختصر م/٩٣٩) ، خ(٤/٤٦١/٢٢٨٤)، د(٩/٢٩٦/٣٤١٢).

[2] صحيح: (الإرواء/١٢٩٢) ، جة(٢/٧٣٧/٢١٨٧)، ت(٢/٣٥٠/١٢٥٠)، د(٩/٤٠١/٨٦٣٤).

[3] متفق عليه: م(١٥٢٥ -٣٠-/٣/١١٦٠) واللفظ له خ(٤/٣٤٩/٢١٣٥)، د(٩/٣٩٣/٣٤٨٠).

حەڵاڵەو چیم لێ قەدەغەیە؟ فەرمووی: « فَإِذَا اشْتَرَيْتَ بَيْعاً فَلاَ تَبِعْهُ حَتَّى تَقْبِضَهُ»[1]: ئەگەر کاڵایەکت کڕی تا وەری نەگری‌و نەیخەیە ژێر دەستی خۆت مەیفرۆشەوە.

لە طاوسەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَكْتَالَهُ».[2] کەسێك طەعامێکی کڕی با نەیفرۆشێتەوە تا دەیخاتە ژێر دەستی خۆی. بە ئیبنو عەبباسم وت: بۆ؟ فەرمووی: ئەی ئەوەنیە ئەو فرۆشیارو کڕیارە مامەڵە بەپارەکە دەکەن‌و هێشتا کاڵاکە وەرنەگیراوە.

## سەودا لەسەر سەودا

لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ».[3] هیچ کام لەئێوە نابێ سەودا لەسەر سەودا بکا.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ يَسُمِ الْمُسْلِمُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ».[4] با موسوڵمان سەودا لەسەر سەودای برای موسوڵمانی نەکا.

هیچ خراپیەك نابیندرێ ئەگەر یەکێك لە مەزادکردندا سەودا لەسەر سەودای برای موسوڵمانی بکا بە مەرجێ نیازی کڕین بێ.

---

[1] صحيح لغيره: حم(٢٤/٣٢/١٥٣١٦).

[2] متفق عليه: م(١٥٢٥-٣١/١١٦٠/٣) وهذا لفظه خ(٤/٣٤٧/٢١٣٢)، د(٩/٣٩٢/٣٤٧).

[3] متفق عليه: خ(٤/٣٧٣/٢١٦٥)، م(٣/١١٥٤/١٤١٢)، جة(٢/٧٣٣/٢١٧١).

[4] صحيح: (الإرواء/١٢٨٩)، م(٣/١١٥٤/١٥١٥).

عـەطـاء دەفـەرموێ: مـن زۆرم لـەم باسـە كۆڵیوەتـەوەو گەیـشتومە ئـەو قەناعەتە: كە هیچ خراپیەك نابینـدرێ لـەوەدا زەمكـردنو زیـادكردن بەسـەر موشتەرىدا بكـرێ، وەڵێ ئەگـەر زیادكردنەكە بـەنیازی كـڕین نـەبوو، بـەڵكوو بۆئەوە بوو كاڵاكە بەرزبكەیەوە ئەوە ناشەرعییەو دروست نیە. چونكە ئـەوە ئەو پێدا هەڵگوتنو چاووڕاو كردنەیە كە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) نەهی لێ كردوە.[1]

ئیبنو ئەبو ئەوفا دەڵێ: (الـنـاجش) واتـە: چـاووڕاوكەر ریـبـا خـۆرەو بـە خائین حلێبە.

## پێش فرۆشی مودەكاری (بیع العینة)

ئەم جۆرە مامەڵەیە ئەوەیە كاڵایەك بفرۆشی بەنرخێك بەقەرز پاشـان پێش ئەوەی كڕیار ماڵەكە وەربگرێ بەحازر لێی بكڕێتەوە بەنرخێكی كـەمتر لەو نرخەی پێی فرۆشتووە.

لـە ئیبنـو عومـەرەوە ڕیوایـەتكراوە: كـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بـێ) فەرموویـەتی: «إِذَا تَبَـايَعْتُمْ بِالْعِينَـةِ وَأَخَـذْتُمْ أَذْنَـابَ الْبَقَـرِ وَرَضِـيتُمْ بِالزَّرْعِ وَتَرَكْتُمُ الْجِهَادَ سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ ذُلاًّ لاَ يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ».[2] ئەگەر بەشێوەی (عینة) سەوداو مامەڵەتان كرد هەركاتێك خـەڵكی چـروكیان نواند رژدو چاو چنۆك بوون لە دینارو درەمدا، مامەڵەی عینـەیان كـرد: واتـە بازرگانـەكان كـاڵای خۆیـان فرۆشـت بـە قـەرزو لەپاشـان هـەمان كاڵایـان لـە كڕیارەكان كڕیەوە بە حازرو بەكەمتر لەو نرخەی پێیان فرۆشـتووە، لـەكاتێكا غـەزاو جیهـاد پێویـست بـوو ئـەوان خـەریكی جـوتكردنو كـشتو كـاڵ كـردن بووونو وازیان لە جیهاد هێناو خۆشیان بـۆ حازرنـەكرد، ئـەوە خـودا تـەنگـو

---

[1] متفق علیه: (٢١٤٢/٣٥٥/٤)، م(١٥١٦/١١٥٦/٢).

[2] صحیح: (ص.ج/٤٣٢) ، د(٣٤٤٥/٣٣٥/٩).

چەڵمەو گرفتاربوونتان بەسەردا دەداو پێوەی دەتلێنەوەو لەسەرتان لانابا هەتا نەگەڕێنەوە بۆ پەیڕەویکردنی ئایینەکەتان.

## فرۆشتنی بەقەرز بە نرخی زیاد (فرۆشتنی بەقیسط)

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « مَنْ بَاعَ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ فَلَهُ أَوْكَسُهُمَا أَوِ الرِّبَا »[1]: کەسێك دوو سەودا بەیەك سەودا ئەنجام بدا، وەکوو ئەوە بڵێ ئەم کراسەم پێ فرۆشتی بەحازر بە دەدینارو بە قەرز بە دوانزە دینارو بەلایەکدا ساغی نەکردەوە دەبێ بەبەها کەمەکە رازی بێ‌و خۆی‌و بەرامبەرەکەی تووشی سودخۆریی نەکا، خۆ ئەگەر لەسەر شێوەیەك ڕێك کەوتن ئەوە سەوداکەیان دروستە.

لە سیماکەوە لە (عبدالرحمن)ی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە لە باوکییەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لەوەی دوو سەودا لەیەك سەودادا بکرێ.

سیماك دەفەرموێ: شێوەی ئەنجامدانی دوو سەودا لەیەك سەودادا بەم جۆرەیە پیاوێك سەودابکا بڵێ: ئەم کاڵایە بەقەرز بە ئەوەندە پارە بە حازریش بە ئەوەندە، بەلایەکدا نەی بڕێنێتەوە.[2]

## (بيع المعاومة) فرۆشتنی بەروبوومی درەخت دوو ساڵ‌و زیاتر

لە ئیبنو زوبەیرو سەعیدی کوڕی (میناء)وە، لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی

---

[1] حسن (ص.ج/٦١١٦)، د(٣٤٤٤) ولمزيد من التفصيل راجع السلسلة الصحيحة للألباني/٢٣٢٦).

[2] صحيح لغيره حم: (٣٧٨٣/٣٢٤ و ٦/٣٢٥)، ت الأرناؤوط.

کردووه له مامەڵە بەشێوەی (معاومـة) راوییـەکیان دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەجیاتی (ألمعاومة) وشەی (بیع السنین) فەرمووە.[١]

ئیبنولونذیر دەڵێ: فوقـەها کۆڕایـان هەیـە لەسـەر ئـەوە: کـە فرۆشـتنی میوەی درەخت بۆ چەند ساڵێك دروست نیە.[٢]

خەطابی دەڵێ: وشەی (ألمعاومة) لەسەر کێشی (ألمفاعلـة)یـەو لـە (ألعـام) وەرگیراوە بـریتییە لە فرۆشتنی میوەی درەخـت بۆمـاوەی چـەند سـاڵێك. بـەم جـۆرە پیـاو بـەری درەختـە خورمایـەك یـان چـەند درەختێـك بفرۆشـێ بـە یەکێکی تر بۆماوەی چەند ساڵێك، ئەم جۆرە مامەڵەیە زیانی تێدایە. چـونکە ئەو شتێك دەفرۆشێ: کە بـوونی نیـە لـەکاتی مامەڵەکەدا، شـتە فرۆشـراوەکە هەر نەهاتۆتـەدی، ناشـزاندرێ ئـاخۆ دێتـە دی یـان نـا؟ نازانـێ ئـاخۆ درەختـە خورماکە بەر دەگرێ یان نا.[٣]

## قەرزو کڕینو فرۆشتن بەیەك سەودا (سلف وبیع)

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لاَ يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ ».[٤]

خەطابی دەڵێ: مانای (سلف) قەرزە. ئەم مامەڵەیە بـەم جۆرەیـە کـابرا بڵێ: ئەو کاڵایەت پێ دەفرۆشم بەئەو نرخە بەمەرجێ هەزار دینـارم بەقـەرز بدەیتێ، ئەم مامەڵەیە فاسیدەو دانابەسترێ چونکە ئەو بۆیە قەرزی پێ دەدا: کـە لـەکڕینی کاڵاکـەدا خـاتری بگـرێ، کـەوابوو نـرخـی کاڵاکـە نادیـار دەبـێ.

---

[١] م(١٩٣٦ -٨٥-/١١٧٥/٣)، د(٣٣٥٩/٢٢٩/٩)، جة(٢٢١٨/٧٤٧/٢).

[٢] الإجماع: (١١٥/٤٧٩).

[٣] معالم السنن ج٥/٤٤.

[٤] حسن صحيح: (ص.د/٢٩٩٢) ، د(٣٤٨٧/٤٠٢/٩)، ت(١٢٥٢/٣٥١/٢)، ن(٢٨٨/٢٩٥/٧).

هەروەها چونکە هەر قەرزێك سود بۆ خاوەن قەرزەکە رابکێشێ دەچێتە چوارچێوەی ریباوە.[١]

## نەیکردن لە فرۆشتنی (طەعام) هەتا دوجار نەپێورێ

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەی کرد لەفرۆشتنی (طەعام) هەتا ربەی فرۆشیارو ربەی کڕیار تێیدا بەکار نەبێ.[٢]

لە ئیمامی عوسمانەوە دەگێڕدرێتەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووە: «إِذَا بِعْتَ فَكِلْ ، وَإِذَا ابْتَعْتَ فَاكْتَلْ»: کە خۆراکت فرۆشت پێوانەی بکە بۆ کڕیار کە کڕیشت شتەکردراوەکە بپێوە.[٣]

## فرۆشتنی حەیوان بە حەیوان بەقەرز (بيع الحيوان بالحيوان نسيئة)

لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیکردوە لە فرۆشتنی حەیوان بەحەیوان بەقەرز.[٤]

ئەگەر حەیوان بەحەیوان فرۆشرا دروستە زیدەی تێدابێ بەمەرجێ حازر بەحازر بێ.

لە جابیرەوە ریوایوەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ بَأْسَ الْحَيَوَانُ بِالْحَيَوَانِ وَاحِدًا بِاثْنَيْنِ يَدًا بِيَدٍ وَكَرِهَهُ نَسِيئَةً».[٥]

---

[١] معالم السنن (٥/١٤٤).

[٢] حسن: (ص.جة/١٨١٢)، جة(٢٢٢٨/٧٥٠/٢).

[٣] خ: (٣٤٣ و ٤/٣٤٤).

[٤] صحيح: (ص.د/٢٨٦٩) ، د(٣٣٤٠/٢٠٥/٩)، جة(٢٢٧٠/٧٦٣/٢)، ن(٧/٢٩٢).

[٥] صحيح: (ص.جة/١٨٤٢) ، جة(٢٢٧١/٧٦٣/٢).

فرۆشتنی گیانلەبەر بە گیانلەبەر دروستە حەیوانێك بەدوو حەیوان حازر بەدەستو دەست بەدەست. بەڵام بەشێوەی قەرز بەلایەوە پەسەند نەبوو.

## فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشك (بیع الرطب بالتمر)

لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیاری لێ کرا دەربارەی فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشکەوە بوو. فەرمووی: «أَيَنْقُصُ الرُّطَبُ إِذَا يَبِسَ».؟ ئایا خورما تەڕەکە کەوشکبۆوە کەم دەکا؟ وتیان: بەڵێ، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لێ کردن کە ئەو جۆرە مامەڵەیە بکەن.[1]

## فرۆشتنی میوە بە خواردەمەنی بە پێوانە

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لە مامەڵەکردن بەشێوەی موزابەنە، بەمجۆرە بەروبوومی پەرژینی باخەکەی ئەگەر خورمابوو بفرۆشێ بە خورمای وشکەوەکراو ئەگەر دارمێو بوو بەرەکەی بفرۆشێ بەمێوژ بەپێوانە، ئەگەر کشتو کاڵی تر بوو بیفرۆشێ بە خواردەمەنی بە پێوانە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەهەموو ئەم جۆرە سەودایانە کرد.[2]

ئیبنو بەطال دەڵێ: زانایان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە کە دروست نیە فرۆشتنی بەروبووم پێش لێکردنەوەو چنینی بە خواردەمەنی چونکە فرۆشتنی کاڵای نادیارو نەزانراوە بەکاڵای دیاریکراو.

---

[1] صحيح: (ص.ت/١٢٢٥) ، ت(١٢٤٣/٣٤٨/٢)، د(٣٣٤٣/٢١١ – ٢١٣/٩)، ن(٢٦٩/٧)، جة(٢٢٦٤/٧٦١/٢).

[2] متفق عليه: خ(٢٢٠٥/٤٠٣/٤)، م(١٥٤٢ -٧٦/١١٧٢/٣)، د(٣٣٤٥/٢١٤/٩).

**بەرەوپیر چوونی کاروانو قەتار کەشت دێنن بۆشار**

ئەم جۆرە مامەڵەیە ئەوەیە بازرگانی شار بەرەوپیری کاروانو قەتار بڕوا بۆئەوەی پێش ئەوەی کاروانەکە بگاتە شارو نرخی کاڵاکەیان بزانن کاکی بازرگان لێیان بکڕێ [1] بەمەش قەتارچیو کاڵا هێنەکان چونکە ئاگاداری نرخ نین دەکەونە زەرەرەوە.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ تَلَقَّوُا السِّلَعَ حَتَّى يُهْبَطَ بِهَا إِلَى السُّوقِ». [2] بەپیر کاڵای قافڵەو کاروانەوە مەچن بۆ دەری شارو لێیان بکەڕێن با بەشێوەی ئاسایی کاڵاکەیان بخەنە بازاڕەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ تَلَقَّوُا الْجَلَبَ. فَمَنْ تَلَقَّاهُ فَاشْتَرَى مِنْهُ فَإِذَا أَتَى سَيِّدُهُ السُّوقَ فَهُوَ بِالْخِيَارِ». [3] بەپیر کاڵا هێنەرانەوە مەچن کەسێك بەپیریانەوە چوو شتێکی لەیەکێك کڕی دوایی خاوەن کاڵاکە هاتە بازاڕو هەستی کرد خەڵەتاوەو نرخی کەمی دراوەتێ بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە.

**فرۆشتنی کاڵای لادێیی لەلایەن بازرگانی شارەوە (بیع الحاضر للباری)**

ئەم جۆرە مامەڵەیە ئەوەیە لادێیی کاڵاکەی بەرێ بۆشار بۆ فرۆشتن بە نرخی ڕۆژو بگەڕێتەوە بۆ گوند، کابرای دوکانداری شارنشین بچێتە بن

---

(1) أحكام الأحكام ج٣/١١١).

(2) متفق عليه: خ(٢١٦٥/٣٧٣/٤)، واللفظ له، م(١٥١٧/١١٥٦/٣)، د(٧٤٧٣/٣٨٠/٩).

(3) م(١٥١٩/١١٥٧/٣)، ت(١٢٣٩/٣٤٦/٢)، د(٣٤٢٠/٣٠٣/٩)، ن(٢٥٧/٧)، ج(٢١٧٨/٧٣٥).

کلێشەیەوەو پێی بڵێ: لای من دای بنێ من بەکاڵەخۆ بەنرخی زیاد بۆت دەفرۆشم، ئەمەش زیان دەگەیەنێ بە دانیشتوانی شار.[1]

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەوەکرد: کە دوکاندارو بازرگانی شار شتومەك بۆ گوندنشینەکان بفرۆشن با باوکیشی بێ یان برای بێ.[2] واتە: تەنانەت ئەگەر خاوەن کاڵای لادێییو دوکانداری شار باوكو کوڕ یان برای یەکتریش بن هەرنابێ کابرای دوکانداری شار کاڵا بۆ لادێیی بفرۆشێ.

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقِ اللَّهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ».[3] نابێ دوکاندارو بازرگانی شارنشین کاڵا بۆ گوندنشینەکان بفرۆشێ، واز لەخەڵك بێنن با بۆخۆیان کاڵای خۆیان بفرۆشنو خودا رزقو رۆزی هەندێکیان لە هەندێکیان بەدەست بێنن.

## ئەو کاڵایانەی فرۆشتنیان دروست نیە

١- شەراب: لەخاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: کاتێك ئایەتەکانی سورەتی (البقرة) بەتەواوی نازڵ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی لەماڵ دەرچوو فەرمووی: (حُرِّمَتْ التِّجَارَةِ فِي الْخَمْرِ).[4] بازرگانیکردن بە مەیو شەراب یاساغ کرا.

---

[1] احكام الأحكام (ج٣/١١٤).

[2] م(١٥٢٣/١١٥٨/٣)، د(٣٤٢٣/٣٠٦/٩)، ن(٧/٢٥٦).

[3] م(١٥٢٢/١١٥٧/٣)، ت(١٢٤١/٣٤٧/٢)، د(٣٤٢٥/٣٠٩/٩)، ن(٧/٢٥٦)، جة(٢١٧٦/٧٣٤/٢).

[4] متفق عليه: خ(٢٢٢٦/٤١٧/٤)، م(١٥٨٠/١٢٠٦/٣)، د(٣٤٧٣/٣٨٠/٩)، ن(٧/٣٠٨).

٢- فرۆشتنی تریێ بەکەسێك بیكا بەمەی: قورئان دەفەرموێ: {وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ – المائدة/٢}. هاوكاری یەكتربكەن لەسەر كاری چاكو خۆپارێزی لەسزای خودا، یارمەتی یەكتر مەدەن لەسەر خراپەو كاری سنوور بەزێنیو شكاندنی فەرمانەكانی خودا.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لُعِنَتِ الْخَمْرُ عَلَى عَشَرَةِ أَوْجُهٍ بِعَيْنِهَا وَعَاصِرِهَا وَمُعْتَصِرِهَا وَبَائِعِهَا وَمُبْتَاعِهَا وَحَامِلِهَا وَالْمَحْمُولَةِ إِلَيْهِ وَآكِلِ ثَمَنِهَا وَشَارِبِهَا وَسَاقِيهَا».[1] لە دەلاوە لەعنەتو نەفرین كراوە لە عەرەقو مەی. خودی عەرەق خۆی، ئەوكەسەی دەیگوشی ئەوەی بۆی دەگوشن، ئەوەی دەیفرۆشێ ئەوەی پێی دەفرۆشن ئەو كەسەی هەڵی دەگرێ ئەوەی بۆی هەڵدەگرنو بۆی دەبەن، ئەوەی نرخەكەی دەخوا، ئەوەی دەیخواتەوە ئەوەی دەیگێڕێ.

٣- فرۆشتنی ئامێری شاییو زەماوەندو دەهۆڵو زوڕناو شتی وا: لە ئەبو ئومامەوە لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتكراوە: فەرموویەتی:(لاَ تَبِيعُوا الْقَيْنَاتِ وَلاَ تَشْتَرُوهُنَّ وَلاَ تُعَلِّمُوهُنَّ وَلاَ خَيْرَ فِي تِجَارَةٍ فِيهِنَّ وَثَمَنُهُنَّ حَرَامٌ). چەتیوی كۆیلەی گۆرانی بێژ مەفرۆشن، مەشیان كڕن، گۆرانیشیان فێرمەكەن، خێرو بێرو بەرەكەت لە مامەڵەكردن بەم جۆرە كۆیلانەوە نیە، بەهاكەشیان حەرامە. دەربارەی ئەم شتە خراپو نەشیاوانە ئەم ئایەتە نازڵ بووە: كە دەفەرموێ: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ – لقمان/٦}.

٤- گۆشتی مردارەوەبوو، گۆشتی بەراز، بتو صەنەم:

---

[1] صحيح: (ص.جة/٢٧٢٥) ، جة(٢/١١٢١/٣٣٨٠) واللفظ له، د(١٠/١١٢/٣٦٥٧).

لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتکراوە: کە بەگوێچکەی خۆی ساڵی ڕزگارکردنی مەککە لە مەککەدا لەدەمی پێغەمبەری بیست فەرمووی: «إِنَّ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ حَـرَّمَ بَيْـعَ الْخَمْـرِ وَالْمَيْتَـةِ وَالْخِنْزِيـرِ وَالأَصْـنَامِ». پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی فرۆشتنی عەرەقیان حەرام کردووە، هەروەها فرۆشتنی گۆشتی مردارەوەبوو گۆشتی بەراز هەروا بتو صەنەم.

گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی پیوی ئاژەڵی مردارەوەبوو حوکمەکەی چیە؟ ئەوەتا کەشتی پێ ڕوکەش دەکرێ، پێستی پێ چەوردەکرێ، دەشکرێ بە ڕۆنی فتیلەو چرا بۆ روناکی، فەرمووی: « لاَ ، هُوَ حَرَامٌ » نابێ، بەکارهێنانی پیوی لەو جۆرە حەرامەو فرۆشتن‌و کڕینیشی حەرامە. پاشان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «قَاتَـلَ اللَّـهُ الْيَهُودَ ، إِنَّ اللَّهَ لَمَّـا حَـرَّمَ شُـحُومَهَا جَمَلُـوهُ ثُـمَّ بَـاعُوهُ فَـأَكَلُوا ثَمَنَـهُ».[1] خودا جولەکە لەناوبەرێ: کە پەروەردگار پیوی مردارەوەبووی حەرام کرد هاتن پیوەکەیان تواندەوەو فرۆشتیان پاشان بەهاکەیان خوارد.

٥- فرۆشتنی خوێن: لە عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: باوکی خۆم بینی بەندەیەکی کەڵەشاخگری کڕی ( فَـأَمَرَ بِالْمَحَـاجِمِ فَكُسِرَتْ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ)؟ فەرمانی پێدا کەڵەشاخەکەی بشکێنێ، پرسیارم کرد بۆ؟ لە وەڵامدا وتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردوە لەبەهای خوێن.[2]

---

[1] متفـــق عليـــه: خ(٤/٤٢٤/٢٢٣٦٥)، م(٣/١٢٠٧/١٥٨١)، ت(٢/٢٨١/١٣١٥)، د(٩/٣٧٧/٣٤٦٩)، جة(٢/٧٣٧/٢١٦٧)، ن(٧/٣٠٩).

[2] خ(٤/٤٢٦/٢٢٣٨).

ئیبنولمونزیر دەڵێ: زانایانی ئیسلام کۆڕایان هەیە لەسەر حەرامی ئەو شتانەی خودا حەرامی کردون: لە مردارەوەبوو لەخوێنو لەبەراز.[1]

٦- سەگ: لەئەبو مەسعودی ئەنصارییەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لەبەهای سەگو لەکرێی زیناو لە شیرینیو بەخشیشی کاهینو کوڵەوەنانی.[2]

سەگی ڕاو واتە سەگی تەربیە دادراو ڕاهێنراو لەم حوکمە چەرت دەکرێ، ئەم جۆرە سەگە کڕینو فرۆشتنیان دروستە.

لە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: نەهی کراوە لەبەهاو نرخی سەگ جگە لەسەگی ڕاو.[3]

٧- پشیلە: لە ئەبو زوبەریرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیارم لە جابیر کرد دەربارەی بەهای سەگو پشیلە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر بەتوندیو توڕەییەوە نەهی لەو جۆرە مامەڵەیە کرد.[4]

٨- وێنەی ئەو شتانەی گیانیان لەبەرە، لە سەعیدی کوڕی ئەبولحەسەنەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لای ئیبنو عەبباس بووم، پیاوێك هات بۆلام وتی: ئەی ئیبنو عەبباس! من مرۆڤێکم ژیانم لەسەر بەرهەمی دەستی خۆمە، من وینەکێشم ئەم وێنانەم بەدەستی خۆم دروست کردووە، ئیبنو عەبباس فەرمووی: ئەمن ئەوەی لە پێغەمبەرم نەبیستبێ بۆت ناگێڕمەوە، بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیست، فەرمووی: «مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فَإِنَّ اللَّهَ مُعَذِّبُهُ

---

[1] الإجماع: (١١٤/٤٧٤).

[2] متفق عليه: خ(٢٢٣٧/٤٢٦/٤)، م(١٥٦٧/١١٩٨/٣)، د(٣٤٦٤/٣٧٤/٩)، ت(١٢٩٣/٣٧٢/٢)، جة(٢١٥٩/٧٣٠/٢)، ن(٣٠٩/٧).

[3] حسن (ص.ت/١٣٨١)، ت(١٢٩٩/٣٧٥/٢).

[4] م (١٥٦٩/١١٩٩/٣)، د (٣٤٦٢/٣٧٢/٩)، ت (١٢٩٧/٣٧٤/٢).

، حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فِيهَا أَبَدًا». کەسێك وێنەی گیانلەبەرێك بکێشێ، ڕۆژی قیامەت پەروەردگار سزای دەدا تاگیانی بە بەردا دەکا، هەرگیز توانای ئەوەی نیە گیانی بە بەردا بکا، کابرا هەڵسڵەمیەوەو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، ئیبنو عەبباس پێی گوت: ماڵوێران، کە هەر ناچار بی وێنە بکێشی، وێنەی درەختێك بکێشە، یان هەرشتێك کە گیانی لەبەردا نەبێ.[1]

٩- میوە پێش ئەوەی کامڵ بێ، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لەفرۆشتنی بەروبووم تا نیشانەی کامڵ بوونی دەردەکەوێ، هەروا نەهی کرد لەفرۆشتنی بەری درەختی خورما هەتا وای لێ دێ ئاڵو بۆڵی تێدەکەوێ، واتە: تا خورماکانی سور دەبن یان زەرد دەبن.[2]

هەر لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لە فرۆشتنی میوەو بەروبوم هەتا کامڵ دەبن. گوترا کامڵ بوون چۆنە؟ فەرمووی: هەتا سور دەبێ، ئەمجار فەرمووی: ئەی ئەگەر خودا بەروبومەکەی وانێ نەکرد هەڵی پێچێ‌و پوح بوو، لەبەرامبەر چیدا یەکێك لەئێوە ماڵی براکەی وەرگرێ؟[3]

١٠- فرۆشتنی بەروبومی کشتوکاڵی پێش ڕەقبوونی دەنکەکانی.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەفرۆشتنی خورما تا کامڵ دەبێ، فرۆشتنی

---

[1] متفق عليه: خ (٢٢٢٥/٤١٦/٤)، وللفظ له م (٢١١٠/١٦٧٠/٣)، ن (٨/٢١٥) مختصراً.

[2] متفق عليه: خ (٢١٩٨/٣٩٨/٤)، وللفظ له م (١٥٥٥/١١٩٠/٣)، ن (٧/٢٦٤).

[3] کامڵبوون بۆ دانەوێڵە سپی هەڵگەڕانیەتی‌و ڕەقبوونی دەنکەکانیەتی.

دانەوێڵە تا ڕەق دەبێ، دڵنیا دەبن لەوەی کە پێگەیشتووەو لە ئافات ڕزگاری بووە، نەهیەکە ئاڕاستەی فرۆشیارو کڕیار کراوە.[1]

١١- هەر کاڵایەك حەرام بێ لەخۆراكو خواردنەوەو پۆشاكو ئەو جۆرە شتانە.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ، إِذَا حَرَّمَ عَلَى قَوْمٍ أَكْلَ شَيْءٍ حَرَّمَ عَلَيْهِمْ ثَمَنَهُ».[2] پەروەردگار ئەگەر لەسەر گەلو نەتەوەیەك خواردنی شتێکی حەرام کرد بەهاکەشی حەرام دەکا لەسەریان.

١٢- پۆشاکی ئافرەت کە مەرجەکانی پۆشاکی شەرعی تێدا نەیەتەجێ. چونکە فرۆشتنی کاڵای لەو جۆرە فاحیشەو فەساد لەناو موسوڵمانان‌دا بڵاو دەکاتەوە، قورئان دەفەرموێ: {وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ – المائدة/٢}. یان دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ – النور/١٩} بێگومان ئەوانەی هەوڵ دەدەنو دەیانەوێ فاحیشەو فەساد لەناو خاوەن باوەڕاندا بڵاوبێتەوە سزای بەئێشیان بۆ دانراوە چ لە دونیادا چ لەقیامەتدا. خودا دەزانێ بڵاوکردنەوەی فاحیشە چەند زیانبەخشو دژە مرۆڤە، ئێوە نازانن.

**(الخيار): مافی ژیوانبوونەوە**

پێناسەی خییار: داواکردنی باشترین دوو ئەمر لە ڕویاندنی سەودا یان هەڵوەشاندنەوەی.

---

[1] صـــحيح: (مختــصر م/٩١٧)، م (٣/١١٦٥/١٥٣٥)، د (٩/٢٢٢/٣٣٥٢)، ت (٢/٣٤٨/١٢٤٥)، ن (٧/٣٧٠).

[2] صحيح: (مختصر م/٩١٧)، م (٣/١١٦٥/١٥٣٥)، د (٩/٢٢٢/٣٣٥٢)، ت (٢/٣٤٨/١٢٤٥).

## جۆرەكانی خییار

١- خییاری مەجلیسی مامەڵەكە، ئەم مافە بۆ فرۆشیارو كڕیار چەسپاوە لەكاتێ سەودا دەكەن تا لێك جیادەبنەوە بەمەرجێ لەناوەڕۆكی سەوداكەیاندا ئەومیان دیاری نەكردبێ كە خییاری نەبێ، یان دوای بڕاندنەوەی سەوداكەیان نەیان وتبێ خییارمان نەبێ، یان یەكێكیان خییاری خۆی ساقط نەكردبێ، ئەگەر یەكێكیان خییاری خۆی پوچاندەوە، ئەوە خۆی خییاری نابێ بەڵام بەرامبەركەی خییاری دەمێنێ.

لە ئیبنو عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) كە فەرموویەتی: «إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلاَنِ فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ، مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، وَكَانَا جَمِيعًا، أَوْ يُخَيِّرُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ فَتَبَايَعَا عَلَى ذَلِكَ، فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ، وَإِنْ تَفَرَّقَا بَعْدَ أَنْ يَتَبَايَعَا، وَلَمْ يَتْرُكْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا الْبَيْعَ، فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ».[1] ئەگەر دوو پیاو سەودایان كرد هەریەكەیان بۆی هەیە سەوداكە راگرێ یان بیڕۆیەنێ مادامێ لێك جیا نەبنەوە، ئەگەر یەكێكیان ئەویتری موخەیەر كردو سەوداكەیان كرد ئەوە مامەڵەكەیان دادەمەزرێ، ئەگەر دوای سەوداكە لێك جیابوونەوەو هیچ كامیان خییاری پەیڕەو نەكرد ئەوە بەیعەكەیان چەسپاوە.

حەرامە یەكێك لەكڕیارو فرۆشیار لە مەجلیسی عەقدەكە خۆ بدزێتەوە لەترسی ئەوەی بەرامبەرەكەی سەوداكە پوچ بكاتەوە.

لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە لەباوكیەوە لە باپیریەوە ڕیوایەتكراوە، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَفْقَةَ خِيَارٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يُفَارِقَ صَاحِبَهُ خَشْيَةَ أَنْ يَسْتَقِيلَهُ».[2] فرۆشیارو كڕیار خاوەنی خییارن، بۆیان هەیە لە مەجلیسی

---

[1] متفق علیه: خ (٢١١٢/٣٣٢/٤)، م (١٥٣١- ٤٤- ١١٦٣/٣)، ن (٧/٣٤٩).

[2] صحیح: (ص. ج/٢٨٩٥)، د (٩/٣٢٤/٣٤٣٩)، ت (٣/٣٦٠/١٢٦٥)، ن (٧/٢٥١).

عەقدەکەدا مامەڵەکە رابگرن‌و ژێوان ببنەوە. مەگەر خییار دابنێن، بەم جۆرە یەکێکیان بەوی تریان بڵێ: بەویستی خۆت بڕیار بدە مامەڵەکە بڕوا یا ڕای بگرین، جا ئەگەر یەکێکیان بڕیاری ڕۆیاندنی دا ئەوی تریش ڕازی بوو مامەڵەکە دادەبەسترێ، دروستیش نیە هیچ کام لە فرۆشیارو کڕیار خۆ بدزێتەوە لە بەرامبەرەکەی لەترسی ئەوەی هاوەڵەکەی سەوداکە رابگرێ‌و هەڵی بوەشێنێتەوە.

٢-خییاری مەرج: بەم جۆرە هەردووکیان یان یەکێکیان خییار بە مەرج بگرن بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، ئەگەر ماوەکە درێژیش بێ هەر دروستە.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ الْمُتَبَايِعَيْنِ بِالْخِيَارِ فِي بَيْعِهِمَا ، مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا ، أَوْ يَكُونُ الْبَيْعُ خِيَارًا».[1] فرۆشیارو کڕیار خییاریان بۆ هەیە لە سەوداکەیاندا بە مەرجێ لێك جیانەبوبنەوە، یان لە مامەڵەکەیان خییاریان بەمەرج گرتبێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو.

٣- خییاری عەیب بەم جۆرە کاڵاکە یان بەهاکە عەیبدار بێ.

لەوەپێش باسی ئەوە کرا: کەنابێ عەیب‌و خەوشی کاڵا بشاردرێتەوە، جا ئەگەر پیاوێك کاڵایەکی کڕی‌و دەرکەوت عەیبدارەو پێی نەزانیبوو تا لێك جیابوونەوە، دەتوانێ کاڵا عەیبدارەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنِ اشْتَرَى غَنَمًا مُصَرَّاةً فَاحْتَلَبَهَا ، فَإِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا ، وَإِنْ سَخِطَهَا فَفِي حَلْبَتِهَا صَاعٌ مِنْ تَمْرٍ».[2] کەسێك بزنێك یان مەڕێکی کڕی، ماوەیەك بوو فرۆشیار نەیدۆشیبوو بۆ ئەوەی گوانی گەورە

---

[1] متفق علیه: خ (٢١٠٧/٣٢٦/٤)، م (١٥٣١/١١٦٣/٣)، ن (٧/٢٤٨).

[2] متفق علیه: خ (٢١١٥/٣٦٨/٤)، وهذا لفظه، م (١٥٢٤/٣١٠/٩)، بزيادة في أول.

بـن‌و شـیره‌كه‌یان تێـدا كۆببێتـه‌وه‌و فرۆشـیار وابزانـێ ئـه‌م شـیر زۆرییـه‌ی سروشتی‌یه‌، دوایی كه‌ دۆشی بۆی ده‌ركه‌وت وانیـه‌، ئه‌گـه‌ر بـه‌و حاڵـه‌یش پێـی ڕازی بـوو، ئـه‌وه‌ گلـی ده‌داتـه‌وه‌، ئه‌گـه‌ر نه‌یویـست ده‌توانـێ بیگێڕێتـه‌وه‌ بـۆ خاوه‌نی‌و له‌جیاتی ئه‌و شیره‌ی لێی دۆشیوه‌ ربه‌ خورمایه‌كی ده‌داتێ.

له‌ ئه‌بو هوره‌یره‌وه‌ ڕیوایه‌تكراوه‌، ده‌ڵێ: كه‌ پێغه‌مبـه‌ر (دروودی خـودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رمووی: «لاَ تُصَرُّوا الإِبِـلَ وَالْغَـنَمَ ، فَمَـنِ ابْتَاعَهَـا بَعْـدُ فَإِنَّـهُ بِخَيْـرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْتَلِبَهَا إِنْ شَـاءَ أَمْـسَكَ ، وَإِنْ شَـاءَ رَدَّهَـا وَصَـا عَ تَمْـرٍ».[1] شیر له‌گوانی حوشـترو بـزن‌و مـه‌ڕدا حـه‌بس مه‌كـه‌ن وابزانـدرێ ئاژه‌ڵه‌كه‌ شـیری زۆره‌و گوان زله‌، جا كه‌سێك ئاژه‌ڵێكی لـه‌و جـۆره‌ی كـڕی ئـه‌وه‌ پـاش دۆشـینی خییاری بۆ هه‌یه‌، ده‌توانێ ئاژه‌ڵه‌كه‌ لای خۆی بهێڵێته‌وه‌ یان بیگه‌ڕێنێته‌وه‌ بۆ خاوه‌نی پێشووی‌و ربه‌ خورمایه‌كیشی له‌گه‌ڵدا بداتێ.

## ریباو سود

پێناسه‌ی ریباء (ربـا) وشـه‌یه‌كی موعته‌لـه‌ بـه‌ ئـه‌لفی (مقصورة) كۆتـایی هاتووه‌، له‌ (ربایربو) وه‌رگیراوه‌.

بنـه‌مای (ربـا) یـانی زیـاده‌و گه‌شـه‌كردن، وه‌كـوو قورئـان ده‌فـه‌رموێ: {اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ – الحج/٥} یان به‌ مانا كه‌م به‌زۆرو یه‌ك به‌دوو.

## حوكمی ریبا

ریبـا بـه‌ نه‌صـصی قورئـان‌و سـوننه‌ت‌و كـۆڕای ئوممـه‌تی موسـوڵمان حه‌رامه‌و نادروست‌و ناڕه‌وایه‌.

---

[1] صحيح: (ص. ج/٧٣٤٧)، خ (٤/٣٦١/٢١٤٨)، د (٩/٣١٠/٣٤٢٦).

قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ. فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ – البقرة/٢٧٨ - ٢٧٩}.: ئەی خاوەن باوەڕان! تەقوای خودا بکەن ئەو پارە زیادەی کەلای قەرزداران هەتانە بەهۆی سەودای ریبا ئامێزەوە وازی لێ بێنن‌و وەری مەگرنەوە ئەگەر راست دەکەن خاوەن باوەڕن، ئەگەر واز لە ریبا خۆری نەهێنن، ئەوە خۆتان ئامادە بکەن بۆ جەنگ لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەی، ئەگەر تۆبە بکەن‌و واز لەریباو سود بێنن ئەوە بەحەڵاڵی دەسمایەکەتان وەربگرنەوەو زیادەکە چەرت بکەن، نە ستەم بکەن نەبێڵن ستەمتان لێ بکرێ.

یان دەفەرموێ: {الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ – البقرة/٢٧٥}: ئەوانەی ریبا دەخۆن ڕۆژی قیامەت لەگۆڕەکانیان ڕاست نابنەوە مەگەر بەشێوەی کەسێك شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ‌و وەکوو شەپلە لێ دراوی لێ هاتبێ‌و هەر گۆدە گۆدی بێ.

هەروا دەفەرموێ: {يَمْحَقُ اللّهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ – البقرة/٢٧٦}. خودا ماڵی ریبائامێز پوچ دەکاتەوەو دەیفەوتێنێ یان بەرەکەتی تێدا ناهێڵێ‌و سودی لێ ببیندرێ.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ». خۆتان بپارێزن لە حەوت شتی بەهیلاکبەرو فەوتێنەر، هاوەڵان عەرزیان کرد ئەو حەوت رەفتارە بەدە چین؟ فەرمووی: «الشِّرْكُ بِاللَّهِ ، وَالسِّحْرُ ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ، وَأَكْلُ الرِّبَا ، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ

الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلاَتِ».[1] هاوەڵدانان بۆ خودا، سیحرو جادوکردن، کوشتنی مرۆڤ کە خودا یاساغی کردووە مەگەر لەشێوەی حەدو قیصاصدا، خواردنی ریباو سود، خواردنی ماڵی هەتیو، هەڵاتنو پشت هەڵکردن لەڕۆژی هەڵمەت بردنو غەزادا، بوختانکردن بە ئافرەتی داوێن پاكو موسوڵمان.

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەفرینی کردووە لە ریباخۆرو بریکارەکەی، لەو کەسەی حیسابەکە دەنوسیو لەو دوو شاهیدانەی دەبنە شایەت بەسەر مامەڵەو ریباکەوە، فەرمووی: (هُمْ سَوَاءٌ)[2] ئەوانە هەموویان هاوبەشی ئەو تاوانەن.

لە ئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الرِّبَا ثَلاَثَةٌ وَسَبْعُونَ بَابًا أيسرها مثل أن ينكح الرجل أمه».[3] ریبا حەفتاو سێ جۆرە لایەنە کەمەکەیان وەکوو ئەوە وایە پیاو دایکی خۆی مارە بکا.

لە عەبدوڵڵای کوڕی حەنظەلەوە لە پێغەمبەر ریوایەت دەکا، دەڵێ: فەرمووی: «دِرْهَمُ رِباً يَأْكُلُهُ الرَّجُلُ وَهُوَ يَعْلَمُ أَشَدُّ مِنْ سِتَّةٍ وَثَلاَثِينَ زَنْيَةً».[4] دیرهەمێك لەریبا پیاو دەیخواو دەشزانێ ئەوە ریبایە تاوانەکەی لە سیو شەش زینا گەورەترە.

لە ئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَا أَحَدٌ أَكْثَرَ مِنَ الرِّبَا إِلاَّ كَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهِ إِلَى قِلَّةٍ».[5]

---

[1] متفق عليه: خ (٥/٣٩٣/٢٧٦٦)، م (١/٩٢/٨٩)، د (٨/٧٧/٢٨٥٧)، ن (٢/٢٥٧).

[2] صحيح: (مختصر م/٩٥٥) (ص. ج/٥٠٩٠)، م (٣/١٢١٩/١٥٩٨).

[3] صحيح: (ص. ج/٣٥٣٩)، ك (٢/٣٧).

[4] صحيح: (ص. ج/٣٣٧٥)، حم (١٥م٦٩/٢٣٠).

[5] صحيح: (ص. ج/٥٥١٨)، جه (٢/٧٦٥/٢٢٧٩).

هەر كەسێك بیەوێ ماڵو سامانی خۆی لەڕێگەی ریباوە زۆر بكا حەتمەن سەرەنجامی بەرەو نشوستیو كەمبوونەوە دەچێ.

## جۆرەكانی ریبا

ریبا دوو جۆرە: ریبای نەسیئە (ریبای قەرزدواخستن) ریبای فەضل (ریبای زیاد دان).

ریبای نەسیئە ئەو زیدە بەمەرج گیراوەیە: كە خاوەن قەرز وەری دەگرێ لە قەرزدار لەجیاتی دواخستنی قەرزەكە، ئەم جۆرە ریبایە حەرامو یاساغە بە دەقی قورئانو سوننەتو كۆڕای ئوممەتی ئیسلام.

ریبای فەضل: ئەوەیە پارە بە پارە بفرۆشرێ، یان خۆراك بە خۆراك لایەكیان زیادەی هەبێ، ئەم جۆرەشیان بەگوێرەی سوننەتی پێغەمبەرو كۆڕای ئوممەتی ئیسلام حەرامە، چونكە زەریعەو ڕێخۆشكەرەیە بۆ ریبای نەسیئەو سەردەكێشێ بۆ ئەو.

## ئەو شتانەی ریبایان تێدایە

ریبا نایەتەدی ئیللا لە شەش جۆردا كە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیاری كردوونو لەم حەدیثەی دوایی‌دا ئاماژەیان بۆ كراوە.

لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ مِثْلاً بِمِثْلٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ يَدًا بِيَدٍ فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ». [1] كە مامەڵەتان

---

[1] صحيح: (مختصر/٩٤٩)، م (١٥٨٧ – ٣/١٢١١/٨١).

كرد ئاوا بيكەن زێڕ بەزێڕ، زيو بەزيو، گەنم بەگەنم، جۆ بەجۆ، خورما بەخورما، خوى بەخوێ، جۆر بەجۆرو چەشن بە چەشنو يەك بەيەكو دەست بەدەستو حازر بەحازر، جا ئەگەر كالآكان جۆرو ڕەگەزيان لە يەك جيا بوو، وەكوو زێڕو زيو گەنمو جۆ، ئەو دروستە چۆنێكى بفرۆشن بەو مەرجەى قەرزى تێدا نەبێ، ئەگەر كالآكان لەيەك ڕەگەز بوونو عيللەتى ڕيباكەشيان يەك بوو دەبێ چونيەكى هەبێ لەڕوى كێشانو پێوانەوە، بەبێ ئەوەى چاكىو خراپى خودى كالآكان ڕۆڵيان هەبێ.

لە ئەبو سەعيدى خودرييەوە ڕيوايەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: «لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ ، وَلاَ تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ ، وَلاَ تَبِيعُوا مِنْهَا غَائِبًا بِنَاجِزٍ».[1] زێڕ بەزێڕ حازر بەحازر نەبێ مەيفرۆشن پاساوى بڕێكى مەدەن بەسەر بڕێكىدا لايەكيان زێدە مەكەنو لايەكيان كەمتر، زيو بەزيو مەفرۆشن مەگەر حازر بەحازرو بێ زيادو كەم هيچ لايەكيان لەوى تر زياتر نەبێ. كالآى نەبوو بەكالآى حازر مەفرۆشن.

لە عومەرى كوڕى خەتتابەوە ڕيوايەتكراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: «الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ».[2] فرۆشتنى زێڕ بەزێڕ مامەڵەيەكى ڕيبائامێزە ئەگەر بە

---

[1] متفـــق عليـــه: خ (٤/٣٧٩/٢١٧٧)، م (٣/١٢٠٨/١٥٨٤)، ت (٢/٣٥٧/١٢٦١)، ن (٧/٢٧٣)، د (٩/١٩٧/٣٣٣٢).

[2] متفـق عليـه: خ (٤/٣٤٧/٢١٣٤)، وهـذا لفظـه م (٣/١٢٠٩/١٥٨٦)، ت (٢/٣٥٧/١٢٦١)، ن (٢/٢٥٧)، ن (٧/٢٧٣)، د (٩/١٩٧/٣٣٣٢).

ئەندازەی یەکترو حازر بەحازر نەبێ. فرۆشتنی گەنم بەگەنم ڕیبای تێدایە ئەگەر ئاواو ئاوا نەبێ. فرۆشتنی جۆ بەجۆ ڕیبایە ئەگەر ئاواو ئاوا نەبێ. فرۆشتنی خورما بەخورما سەودای ڕیبا ئامێزە ئەگەر ئاواو ئاوا نەبێ. واتە: بە ئەندازەی یەکترو دەست بەدەست بێو لە یەك مەجلیسدا بێ.

لە ئەبو سەعیدەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) خورمای تێکەڵەمان دەست دەکەوت، ئەگەر بمانویستایە خورمای باشمان دەست بکەوێ، دەهاتین دوو ڕبەمان لەو خورما تێکەڵەیە دەفرۆشت بە ڕبەیەك خورمای باش، ئەم سەوداو مامەڵەیەی ئێمە بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گەیشتەوە فەرمووی: «لاَ صَاعَيْ تَمْرٍ بِصَاعٍ وَلاَ صَاعَيْ حِنْطَةٍ بِصَاعٍ وَلاَ دِرْهَمَ بِدِرْهَمَيْنِ».[1] نا نا ئیشی وا مەکەن دوو ڕبە خورما بفرۆشن بە یەك ڕبە، هەروا دوو ڕبە گەنم مەدەن بە ڕبەیەك گەنم، دیرهەمێکیش مەفرۆشن بە دوو دیرهەم.

ئەگەر جۆرێك لەو شەش شتانەی باسکران بەغەیری جۆری خۆیان فرۆشران وەکوو زێڕ بەزیو یان گەنم بەجۆ دروستە زێدەیان تێ بکەوێ، بەمەرجێ حازر بەحازرو لە مەجلیسەکەدا هەردوو لایان (فرۆشیارو کڕیار) حەقی خۆیان وەربگرن، ئاماژە بە فەرموودەکەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کە لەوەپێش لە حەدیثی (عوبادە)دا ئاماژەی پێ کرا، کە دەفەرموێ: «فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ». هەرکاتێ ئەم کاڵایانە جۆرەکەیان جیابوو چۆن دەفرۆشن بیفرۆشن.

هەروەها ئاماژە بە فەرموودەیەکی تری پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کە ئەبو داودو هی تریش ڕیوایەتیان کردووە دەفەرموێ: «لاَ بَأْسَ

---

[1] متفق علیه: م (٣/١٢١٦/٥١٩٥)، خ (٤/٣١١/٢٠٨٠)، ن (٧/٢٧٢).

بَيْعِ الذَّهَبِ بِالْفِضَّةِ – وَالْفِضَّةُ أَكْثَرُهُمَا – يَدًا بِيَدٍ وَأَمَّا نَسِيئَةً فَلاَ وَلاَ بَأْسَ بِبَيْعِ الْبُرِّ بِالشَّعِيرِ وَالشَّعِيرُ أَكْثَرُهُمَا يَدًا بِيَدٍ وَأَمَّا نَسِيئَةً فَلاَ».[1] هیچ خراپەیەك لەوەدا نیە زێڕ بەزیو بفرۆشرێ‌و زیوەکە زیاتر بێ لە زێڕەکە. بەمەرجێ دەست بەدەست بێ. بەڵام بە قەرز نەبێ. هەروەها چ خراپەیەك لەوەدا نیە گەنم بەجۆ بفرۆشرێ‌و جۆیەکە زۆرتر بێ، بەمەرجێ حازر بەحازر بێ، بەڵام قەرزی تێدا نەبێ.

ئەگەر جۆرێك لەم شەش جۆرانە فرۆشران بەغەیری جۆری خۆیان عیللەتی ریباکەشیان جودا بوو، وەکوو فرۆشتنی زێڕ بەگەنم، یان زیو بەخوێ، زیادەو قەرزی تێکەوێ قەیناکا.

لە عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خواردەمەنی لە کابرایەکی جولەکە بە قەرز کڕی، زریەکەی خۆی کردە بارمتە.[2]

خاوەنی کتێبی (سبل السلام) شەرحی (بلوغ المرام) دەڵێ: کۆڕای زانایان لەسەر ئەوە چەسپاوە کە: دروستە فرۆشتنی کاڵای ریبائامێز بەکاڵایەکی تری ریبائامێز کە ڕەگەزیان یەك نەبێ بەزێدەترو بەقەرزیش واتە: دەتوانی گەنم بفرۆشی بەزێڕو جۆ بەزیو هەروا شتی تریش لەوشتانەی بەپێوانە مامەڵەیان تێدا دەکرێ.

دروست نیە فرۆشتنی خورمای تازە پێگەیشتوو تەڕ بە خورمای وشکەوە بوو، مەگەر بۆ ئەهلی (العرایا): کەبریتین لەو فەقیرو هەژارانەی خاوەنی درەختی خورما نین، بۆ ئەوان دروستە خورمای (رطب) لە خاوەن باخەکان

---

[1] صحیح: (الإرواء ٥/١٩٥)، د (٩/١٩٨/٣٣٣٣).

[2] صحیح: (الإرواء/١٣٩٣)، خ (٤/٣٩٩/٢٢٠٠).

بکرن بۆ خواردنی خۆیان بەمەرجێ لە پێنج ویسق کەمتر بێ، ئەوانە دەتوانن خورمای (روطاب) بکڕن بەخورمای وشك بەشێوەی خرصاندن.

لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لە سەودا کردن بەشێوەی (المزابنة) موزابەنە: بریتییە لەفرۆشتنی میوە بەخورما بەشێوەی پێوانە، فرۆشتنی ترێ بەمێوژ بەشێوەی پێوانە.[1]

لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) روخصەتی داوە بۆ پێڕی (عەرایا)، هەژارانی بێ باخە خورما: کە خورمای (رطب) بکڕن بەشێوەی خەرصاندن، بەخورمای وشکە.[2]

لە ئەبو سوفیانەوە ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەت دەکا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی داوە مامەڵەی (العرایا) ئەنجام بدرێ، بەمەرجێك پێنج ویسق یان کەمتر لە پێنج ویسق بێ.[3]

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر ئەوە نەهی کردووە لەفرۆشتنی خورمای تەڕ بەخورمای وشك، چونکە خورمای تەڕ کە وشك بکرێتەوە کەم دەکا.

لە سەعدی کوڕی ئەبو قاصەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر کرا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای (رطب) تەڕ، فەرمووی: ئایا خورمای (روطاب) کە وشك بووەوە کەم دەکا؟ وتیان بەڵێ: ئیتر نەهی لێ کرد.[4]

---

[1] متفق علیه: خ (٢١٨٥/٣٨٤/٤)، م (١٥٤٢/١١٧١/٣)، (٧/٢٦٦).

[2] متفق علیه: م (١٥٣٩ – ٦٠/١١٦٩/٣)، خ (٢١٩٢/٣٩٠/٤)، د (٩/٢١٦/٣٣٤٦).

[3] متفق علیه: خ (٢١٩٠/٣٨٧/٤)، م (١٥٤١/١١٧١/٣)، د (٩/٢١٨/٤٨٣٣)، ت (٢/٣٨٣/١٣١٩).

[4] صحیح: (الإرواء/١٣٥٢)، د (٩/٢١١/٣٣٤٣)، جه (٢/٧٦١/٢٢٦٤)، ن (٧/٢٦٩).

دروست نیه فرۆشتنی ئەو شتانەی ڕیبائامێز بەرەگەزی خۆیان لەتەك یەكێكیان یان لەتەك هەردووكیاندا كاڵایەكی تر هەبێ لەجینسی خۆیان نەبێ.

لە فەضالەی كوڕی عوبەیدەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا ملوانكەیەكم كڕی بەدوانزە دینار ملوانكەكە پێكهاتبوو لەزێڕو میرو، لێكم جیاكردنەوە بۆم دەركەوت زێڕەكە لەدوانزە دینار زیاترە، ئەمەم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسكرد، فەرمووی: (لاَ تباع حتى تفصَلَ)[1] كاڵای لەو جۆرە نافرۆشرێ تا لێك هەڵنەهاوێردرێ. دەبێ ئاڵتونو میروەكان لێك جیابكرێنەوە بەجیا بفرۆشرێن.

## موزارەعە: زەوی دان بەسەپان بۆ ڕەدام هێنانی

موزارەعە لەزمانی عەرەبیدا بریتییە لە مامەڵەكردن لەسەر زەوی بەبڕێك لەو بەروبومەی لێی وەبەردێ.

مەبەست بە موزارەعە لێرەدا ڕەخساندنی زەوییە بۆ كەسێك كشتوكاڵی تێدا بكا: كە بەروبومەكەی بە نیوەیی یان ئەندازەیەكی تر بێ.

## موزارەعە مامەڵەیەكی ڕەوایە

لە نافیعەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: كە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر هەواڵی پێداوە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موزارەعە لەگەڵ دانیشتوانی خەیبەردا كرد كە باخەكانی خەیبەر بەخێوبكەنو بەكاریان بێنن، نیوەی بەروبومەكەیان بدرێتێ.[2]

---

[1] صحيح: (الإرواء/١٣٥٦)، م (١٥٩١ – ٩٠/١٢١٣/٣)، ت (٢/٣٦٣/١٢٧٣)، (٩/٢٠٠٢/٣٣٣٦).

[2] متفق عليه: خ (٥/١٣/٣٣٢٩)، م (٩٣/١١٨٦/١٥٥١)، د (٩/٢٧٢/٣٣٩١)، جه (٢/٨٢٤/٢٤٦٧).

ئیمامی بوخاری دەڵێ: قەیسی کوڕی موسلیم لە ئەبو جەعفەرەوە ڕیوایەت دەکا کە دەڵێ: لەناو مەدینەدا ماڵە موهاجیرێك نەبووە کە سەپانی بۆ خاوەن زەویەکانی مەدینەیی‌یەکان نەکردبێ. جا هەیانبوو بەسێیەك، هەیانبوو بەچواریەك، هەریەك لەعەلی‌و سەعدی کوڕی مالیك‌و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو عومەری کوڕی عبدالعزیزو ئەلقاسم‌و عوروەو خێڵی ئەبو بەکرو خێڵی عومەرو خێڵی عەلی‌و ئیبنو سیرین سەپانیان کردووە.[١]

## کرێ‌و مەسرەفی ڕەدامهێنانی زەوی دەکەوێتە سەر کێ؟

دروستە بەگوێرەی ڕێککەوتنی سەپان‌و خاوەن زەوی کرێ‌و مەسرەفی وەبەرهێنانی زەوی لەسەر خاوەن زەوی بێ یان لەسەر سەپان بێ یان لەسەر هەردوو لایان بێ.

ئیمامی بوخاری دەڵێ: ئیمامی عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) وا لەگەڵ سەپانەکان ڕێککەوتن ئەگەر بنەتۆو لەسەر عومەر بێ نیوەی داهاتەکەی بۆ خاوەن موڵك بێ، ئەگەر بنەتۆو لە سەپانەکانەوە بێ ئەوە ڕێژەی ئەوەندە لە بەروبومەکە هەڵبگرن.

هەر بوخاری دەڵێ: ئەلحەسەن فەرموویەتی: چ خراپییەکی تێدا نیە کە زەوی هی خاوەن زەوی بی‌و سەپانی بۆ بگرێ‌و هەردوو لایان مەسرەفی تێدا بکەن‌و بەروبومەکە بکەن بەنیوەو وەك یەك دابەشی بکەن، ئیمامی (الزهر)یش هەمان رای هەیە.

---

[١] صحیح بوخاری ج٥/١٠.

## ئەوەی لە موزارەعەدا دروست نیە

دروست نیە لە مامەڵەی موزارەعەدا بگوترێ: ئەوەندەی ئەم زەوییە کە دەکرێ بەکشتوکاڵ بۆ خاوەن زەوی بێ، ئەوەندەی زەوییەکەش بۆ سەپانەکە بێ. هەروا دروست نیە خاوەن زەوی بڵێ من ئەوەندە ویسقەم بەروبوم دەوێ.

لە حەنظەلەی کوڕی قەیسەوە، ئەویش لەرافیعی کوڕی خەدیجەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: هەردوو مامەکانم بۆیان گێڕامەوە کە: ئەوان لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) زەویان بەکرێ دەگرت بۆ کشتوکاڵ بەروبومی ئەو کشتوکاڵەی لەدەم جۆگاو شوێنی ئاوا دەڕوا، یان بە بڕێك بەروبوم: کەخاوەن زەوی بۆخۆی چەرتی دەکرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی ئەوەی لێ کردن، حەنظەلە دەڵێ: بەرافیعم گوت: ئەی ئەگەر بەدینارو دیرهەم بێ؟ رافیع لە وەڵامدا وتی ئەگەر بەکرێ گرتنەکە بەدینارو دیرهەم بێ قەیناکا.

ئیمامی (اللیث) دەڵێ: هەرشتێك ئەگەر لێزانو شارەزا لەبواری حەڵاڵو حەرامدا بە باشی نەزانن دەچێتە بواری ئەو سەوداو مامەڵانەی نەهی لێ کراوە، چونکە موخاطەرەی تێدایە.[1]

دوبارە لە حەنظەلەوە دەڵێ: پرسیارم لەرافیعی کوڕی خەدیج کرد: دەربارەی بەکرێ گرتنی زەوی بۆ کشتوکاڵ بەزێڕو زیو؟ لە وەڵامدا وتی: چ خراپیەکی تێدانیە، خەڵك لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) زەوییان بەکرێ دەگرت لەسەر ئەو بەروبومانەی لەدەم جۆگاو شتی ئاوا دەڕوێن یان بەشێك لە کشتو کاڵ، جا واڕێدەکەوێ کشتو کاڵی دەم جۆگاو چۆمەکان دەفەوتێ، یان وادەبێ ئەوەی دەم جۆگاو چومەکان دەفەوتێو ئەوەی دوورە لێیان پێ دەگا. جا ئەگەر خاوەن زەوی بە سەپانەکە بڵێ

---

[1] صحیح: (الإرواء: ٥/٢٩٩)، خ (٥/٢٥/٢٣٤٧/٢٣٤٦)، ن (٧/٤٣).

بەروبوومی ئەو مەسافە زەوییە بۆ تۆبێ‌و ئەمەیان بۆ من بێ، لایەکیان زەرەرمەند دەبێ: بۆیە نەهێیان لێ کرا، وەڵێ ئەگەر لەسەر شتێکی دیاری کراوو مەضمون بوو، ئەوە چ خراپیەکی تێدانیە، جا شتەکە زێڕبێ زیوبێ خۆراك بێ پۆشاك بێ یان شتی تربێ. لە رەگەزی بەروبوومەکە بێ یان لە رەگەزی تر بێ. وەکوو ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا ئاماژەی پێ کردوە.[1]

## ئاودێری باخ‌و درەخت بەکرێ (المساقات)

موساقات: بریتییە لە تەسلیم کردنی چەند درەختێکی دیاریکراو بەکەسێك بۆئەوەی بەخێویان بکاو ئاویان بدا لەبەرامبەر ئەم ئەرکەیدا بەشێکی دیاریکراو لە بەروبوومی درەختەکانی بدرێتێ جا نیوەبێ سێیەك بێ چواریەك بێ.

ئەم جۆرە گرێبەستە رەوایە، ئاماژە بەو ریوایەتەی لە ئیمامی عومەرەوە ریوایەتکراوە: کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ دانیشتوانی خەیبەر رێك کەوت کە باخ‌و درەختەکانی خەیبەر بەخێوبکەن لەبارتەقای کارەکەیاندا بەشێك لە میوەو بەروبوومەکەیان بدرێتێ.[2]

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: یاریدەدەران (الأنصار) عەرزی پێغەمبەریان کرد کە: باخە خورماکانمان دابەش بکە لەنێوان خۆمان‌و برا کۆچکارەکانمان، فەرمووی: (نەخەیر)، ئەمجار وتیان: دەی با ئەوان ئەرکی

---

[1] صەحیحی موسلیم لە شەرحی نەوەوی ج١٠/١٩٨.

[2] متفق علیە: لەوەپێش رابورد.

بەخێوکردنی بگرنە ئەستۆ، ئێمە دەیانکەینە شەریکمان لە بەروبوومەکەدا کۆچکارەکان وتیان: زۆر باشەو ئامادەبن.[١]

## زیندوکردنەوەی زەوی بەیارو بێکەس (زەوی مردوو)

### پێناسەی زەوی مردوو (أرض الموات):

بریتییە لە زەوییەکی وێرانی ئاوەدان نەکراوە. ئاوەدان کردنەوەی زەوی شوبهێندراوە بە ژیانەوەی و نەکێڵانو ئاوەدان نەکردنەوەی بە مردوو.

(احياء الموات): زیندوکردنەوەی زەوی مردو: ئەوەیە: یەکێك زەوییەك ئاوەدان بکاتەوە کە نەزاندرێ لەوەپێش ملکی کەسێکی تر بووبێ، ئەم دەست بکا بە کێڵانو بەخێوکردنو درەخت تێدا ناشتنو کشتو کاڵ تێداکردن یان بینای تێدابکا، بیری تێدا هەڵبکەنێ. ئاودێری تێدابکا. بەمە ئەو زەوییە دەبێتە ملکی ئەو.[٢]

ئایینی ئیسلام بانگەوازی کردووە بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی وێرانو بێ خاوەن.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ أَعْمَرَ أَرْضًا لَيْسَتْ لأَحَدٍ فَهُوَ أَحَقُّ»[٣]: کەسێك زەوییەکی وێرانەی بێ خاوەنی ئاوەدان کردەوە ئەوە دەبێتە ملکی خۆی و ئەو لەهەموو کەس لەپێشترە بە خاوەندارێتی ئەو زەوییە.

عوروە دەفەرموێ: ئیمامی عومەر لەسەردەمی خەلافەتی خۆیدا ئەم یاساو حوکمەی پەیڕەوکرد.

---

[١] صحيح: (الإرواء/١٤٧١) ، خ(٢٣٢٥/٨/٥).

[٢] فتح البارى ١٨/٥.

[٣] صحيح: (ص.ج/٦٠٥٧) ، خ(٢٣٣٥/١٨/٥).

له جابیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيِّتَةً فَهِيَ لَهُ».[1] کەسێك زەوییەکی وێرانەی مردو ئاوەدان بکاتەوە ئەوە دەبێتە ملکی خۆی.

هەر لەجابیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ أَحَاطَ حَائِطًا عَلَى أَرْضٍ فَهِيَ لَهُ»[2]: کەسێك شورەی بۆ زەوییەکی بێ خاوەنی وێرانە کرد ئەوە دەبێتە ملکی ئەو.

## بەکرێ گرتن (الإجارة)

ئیجارە بریتییە لە تەسلیم کردنی سودی شتێك لە بارتەقای کرێیەکدا. بەکرێ گرتن و کرێکاری کردن ڕەواو مەشروعە قورئان دەفەرموێ: {فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ – الطلاق/٦} ئەگەر ئافرەت مندالی بۆ بەخێوکردن و شیریان پێدان ئێوە کرێیان بدەنێ.

یان لەسەر زوبانی یەکێك لەکچەکانی حەزرەتی شوعەیب دەفەرموێ: {قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ – القصص/٢٦}. یەکێك لەکچەکانی حەزرەتی شوعەیب - کە هاتنەوە بەدو حەزرەتی موسا (سەلامی خودای لێ بێ) بۆئەوەی ببیەن بۆلای باوکیان – بەباوکی گوت: ئەی باوکی خۆشەویستم ئەم پیاوە بەکرێ بگرە با شوانیمان بۆ بکاو کاری ترمان بۆ هەلسوڕێنێ. بێگومان باشترین کەسێك کەتۆ بەکرێی بگری کەسێکە کە بەهێزو توانا بێ لەهەمان کاتدا دەست پاك و ئەمین بێ.

یان دەربارەی گەشتەکەی حەزرەتی موساو حەزرەتی خضر دەفەرموێ: {فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا –

---

[1] صحيح: (ص.ج/٥٩٧٥) ، ت(١٣٩٥/٤١٩/٢).

[2] صحيح: (ص.ج/٥٩٥٢) ، د(٣٠٦١/٣٣٠/٨).

الكهف/٧٧}. لەكاتی گەڕانیاندا بەناو شارەکەدا بۆئەوەی یەکێك لەخۆیان بگرێو ببێتە خانە خوێیانو کەس میوانداری نەکردن، تووشی دیواری ماڵێك هاتن لاربوبووەوە خەریك بوو بڕوخێ، حەزرەتی خضر دیوارەکەی راست کردەوە، حەزرەتی موسا پێی گوت: ئەتۆ بۆ بەخۆڕایی ئەم دیوارەت راست کردەوە خۆ دەتوانی کرێیان لێ وەرگری.

لە خاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)و ئەبوبەکر پیاوێکی خێڵی (الدیل)یان بەکرێ گرت، پاشان پیاوێکی شارەزا بە رێگەو بانیان لە خێڵی (عەبدی کوڕی عەدی) بەکرێ گرت[1].

### هەرشتێك مومکین بێ سوودی لێ ببیندرێو مادەکەی بمێنێتەوە دروستە بدرێ بەکرێ بەمەرجێ بەربەستی شەرعی نەبێ

مەرجە دەبێ شتە بەکرێ دراوەکە ئاشکراو نومایان بێو کرێیەکەش دیاریکراو بێ.

### بەکرێگرتنو جۆری کارەکە

قورئان لەمیانەی چیرۆکی حەزرەتی موسا (علیە السلام)و باوکی ئەو دووکچەی کە موسا حەیوانەکانی بۆ ئاودان! کە راستتر وایە حەزرەتی شوعەیب بووبێ. لەسەر زمانی باوکی دوو کچەکە دەفەرموێ: {قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ – القصص/٢٧}. من دەمەوێ یەکێك لە ئەم دوو کچەم مارەبکەم لەتۆ

[1] صحيح: (الإرواء/١٤٨٩)، خ(٢٢٦٣/٤٤٢/٤).

له بارتەقای ئەوەدا هەشت ساڵ شوانیم بۆبکەی، خۆئەگەر بیکەی بە دەساڵ ئەوە پیاوەتی خۆتە.

له حەنظەلەی کوڕی قەیسەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیارم لە رافیعی کوڕی خەدیج کرد دەربارەی بەکرێ گرتنی زەوی بە زێڕو زیو، لە وەڵامدا وتی: چ خراپیەکی تێدانیەو رەوایە. خەڵك لەسەردەمی پیغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) زەوی‌و شتی وایان دەدا بەکرێ لەسەر بەروبوومی کە لەدەم جۆگاو ئەمبەرەو بەری روبارو چۆمەکان دەڕوان، وادەبوو کشت‌و کاڵی دەم جۆگاو روبارەکان پێ دەگەیشتن‌و ئەو کشت‌و کاڵەی لەدەم جۆگاو دەم چۆمەکان دووربوو پێ نەدەگەیی، یان وادەبوو بە پێچەوانەوە دەبوو، بۆیە خەڵکەکە لەم جۆرە مامەڵانە مەنع کرا. وەڵێ ئەگەر بەکرێ دانەکە لەسەر شتێکی ئاشکراو مەضمون بوو ئەوە چ خراپیەکی تیدا نیە[1].

## کرێی کرێکاران

لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « أَعْطُوا الأَجِيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ».[2] کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی ئارەقی ئیشکردنەکەی وشك ببێتەوە.

## تاوانی ئەوانەی کرێی کرێکار نادەن

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پەروەردگار دەفەرموێ: « قَالَ اللَّهُ ثَلاَثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ

---

[1] صحيح: (الإرواء/١٤٩٨) لەوەپێش تێپەڕی.

[2] صحيح: (ص.جة/١٩٨٠)، جة(٢٤٤٣/٨١٧/٢).

أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ ، وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ».[1] سێ کەس ئەمن رۆژی قیامەت دژیانم‌و بەرەورویان دەبمەوە.

یەکەمیان: پیاوێکە عەهدو پەیمانی لەگەڵ مندا بەستبێ‌و بەڵێنی بەمن دابێ کە بەرامبەر بەئایین دڵسۆز دەبێ‌و بەسوێند جەختی لەسەر ئەم عەهدو پەیمانە کردبێتەوە، کەچی خیانەت بکاو عەهدو پەیمانەکەی هەڵبوەشێنێتەوە.

دووەمیان: پیاوێك مرۆڤێکی ئازاد بکاتە کۆیلەو بیفرۆشێ‌و پارەکەی بخوا.

سێیەمیان: پیاوێك کرێکارێك بەکرێ بگرێ‌و ئیشەکەی پێ بکاو کرێکەی نەداتێ.

### ئەوشتانەی دروست نیە کرێیان لەسەر وەربگیرێ

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – النور/٣٣} کچەکانتان ناچارمەکەن بۆ داوێن پیسی بەهیچ شێوەیەك ئەو رێگەیان بۆ مەکەنەوەو فێری ئەوکارە فەسادەیان مەکەن بۆئەوەی لەبارتەقای ئەو داوێنپیسییەیاندا کرێیەك وەربگرن. زۆرەملێ لەچەتیوەکانتان مەکەن بۆ لەشفرۆشی، ئەوە حەرامەو کارێکی پیسە، بەرەوای مەزانن رێگای بۆخۆش بکەن‌و بتانەوێ کاڵایەکی دونیاییتان – لەئەنجامدان‌و رێپێدان بۆ ئەو تاوانە – دەست بکەوێ: بێگومان رستەی {إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا} مەرجی زۆر لێ کردنەو بەیانی ئەو واقیعەیە: کە ئایەتەکە بەهۆیەوە نازڵ بوو. مانای ئەوە ناگەیەنێ ئەگەر چەتیوو کەنیزەکەکان زۆریان لێ نەکرێ‌و بەئارەزوی خۆیان بێ قەیناکا! واتە: قەیدی ئیرادەی {تحصن}و مەبەستی ماڵ پەیداکردن بەوکارە

---

[1] حسن: (الإرواء/١٤٨٩)، خ(٤/٤١٧/٢٢٢٧).

مەفهومی موخالەفەیان نیەو قەیدی بەیانی واقیعن، جا کەسێك زۆرە ملیّ لەچەتیوەکان بکا، بەجەخت زینایان پێ بکا، ناچاریان بکا لەشفرۆشی بکەن، ئەوە پەروەردگار بۆ ئەوان – پاش ئەم زۆر لێ کردنە – لێبوردەیەو لێیان خۆش دەبیّ، لەسەر ئەو تاوانە سزایان نادا.

لە جابیرەوە ریوایەتکراوە: کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی ئەبو سەلول (جاریة)یەکی هەبوو ناوی (مُسَیْکَة) بوو، یەکێکی تریشی هەبوو ناوی (أمیمة) بوو، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی ناوبراو ناچاری دەکردن زینابکەن، ئەوانیش چوونە خزمەت پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) شکایەتیان کردو وەزعو حاڵی خۆیانیان بۆ رونکردەوە. ئیتر پەروەردگار ئایەتی {وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – النور/٣٣}.[١]

لە ئەبو مەسعوودی ئەلئەنصارییەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لە فرۆشتنو وەرگرتنی بەهای سەگو کرێی زیناو شیرینی فالگرەوەو کوڵەوەنانی.[٢]

لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لە وەرگرتنی پارەی پەڕاندنو تۆماوی ئەسپ.[٣]

## کرێی خوێندنی قورئان

لە عەبدورەحمانی کوڕی شیبلی ئەلئەنصارییەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: بەگوێی خۆم ژنەوتم پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو:

---

[١] صحیح: (مختصر م/٢١٥٥)، م(٣٠٢٩-٢٧/٢٣٢٠/٤).

[٢] لەوەپێش لەباسی (ئەو شتانەی فرۆشتنیان دروست نیە) تێپەڕی.

[٣] لەوەپێش لەباسی (ئەو شتانەی فرۆشتنیان دروست نیە) تێپەڕی.

«اقْرَءُوا الْقُرْآنَ وَلاَ تَأْكُلُوا بِهِ وَلاَ تَسْتَكْثِرُوا بِهِ وَلاَ تَجْفُوا عَنْهُ وَلاَ تَغْلُوا فِيهِ».[1] قورئان بخوێنن، نانی پێوه مەخۆن، خۆتانی پێ دەوڵەمەند مەکەن، وازی لێ مەهێننو پاشگوێی مەخەنو لێی دوور مەکەونەوە، زێدەڕەویشی تێدامەکەن.

لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هاتە ناومان لەوکاتەدا ئێمە سەرگەرمی قورئان خوێندن بووین تێماندابوو عەرەبی زمانو تێماندابوو ناعەرەب، فەرمووی: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَكُلٌّ حَسَنٌ وَسَيَجِيءُ أَقْوَامٌ يُقِيمُونَهُ كَمَا يُقَامُ الْقِدْحُ يَتَعَجَّلُونَهُ وَلاَ يَتَأَجَّلُونَهُ».[2] قورئان بخوێننو سەرگەرمی خوێندنی بن هەموو قورئان خوێندنەکەتان باش بوو، لەوە بەولاوە کەسانێك پەیدادەبن قورئان بەوپەڕی ڕێكو پێکی دەخوێننو زۆرجوان موراعاتی یاسای تەجویدو تەرتیلی تێدادەکەنو زۆر زێدەڕەوی دەکەن لەچاك خوێندنیدا، دەیکەنە وەسیلەو هۆکار بۆ دابینکردنی بژیوو پاداشی دونیا، هیچ مەبەستیان ئەوەنیە پاداشی قیامەتی پێ وەربگرن. کاڵای دونیای بێ بەقا بەسەر پاداشی قیامەتدا تەفضیل دەدەن.

لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەتکراوە: کە بەگوێی خۆی لە پیغەمبەری بیستووە فەرموویەتی: (تعلّموا القرآن، وسلوا الله به الجنة قبل ان يتعلّمه قوم يسألون به الدنيا، فان القرآن يتعلمه ثلاثة رجل يباهي به، ورجل يستأكل به ورجل يقرأه لله)[3]: فێری قورئان ببن، داوا لەخودا بکەن بەهۆی قورئانەوە بتانخاتە بەهەشتەوە، پێش ئەوە کەسانێك پەیدابن بەهۆی قورئانەوە دونیا خۆری بکەن، چونکە قورئان سێ جۆر خەڵك فێری دەبێ.

---

[1] صحيح: (ص.ج/١١٦٨)، حم(١٥/١٢٥/٣٩٨).

[2] صحيح: (الصحيحة/٢٥٩)، د(٣/٥٨/٨١٥).

[3] صحيح: (الصحيحة/٤٦٣)، رواه ابن نصر في قيام الليل ص٧٤.

پیاوێك بۆ شانازی پێكردنو خۆهەڵنانەوە فێری بێو بیخوێنێ، پیاوێك دونیا خۆری پێ بكاو بیكاتە هۆی نان پەیداكردن، پیاوێك ساغ لەبەر ڕەزای خودا فێری بێو بیخوێنێ.

## كاسبی كردنو پارە بەگەڕخستن بە هاوبەشی (ألشركة)

ئەم جۆرە گرێ بەستو عەقدە ئەوەیە دووكەس یان زیاتر بە ویستی خۆیان ڕێك بكەون ماڵو پارەی خۆیان تێكەڵاو بكەنو بەگەڕی بخەن بە مەبەستی بەدەستهێنانی قازانج ((جاری واهەیە قازانج دەستەبەر دەبێ بەبێ مەبەست، وەكوو میرات گرتن)) ئەم ماڵ تێكەڵاوكردنە مەشروعو ڕەوایە، قورئان دەفەرموێ: {وَإِنَّ كَثِيراً مِنْ الْخُلَطَاءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَا هُمْ – ص/٢٤}

یان دەفەرموێ: {وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ – النساء/١٢}.

لە (ألسائب)ەوە ڕیوایەتكراوە: كە بەپێغەمبەری گوت: ئەتۆ لەسەردەمی نەزانیدا هاوبەشم بووی، باشترین هاوبەش بووی، {كنت لا تدارینی ولا تمارینی}[١].

### شەراكەتی شەرعیو پەسەند

ئیمامی شەوكانی لە (ألسیل الجرار)دا ج٣/٢٤٦-٢٤٨ دەفەرموێ: شەراكەتی شەرعی بە دەستەبەربوونی ڕەزامەندی لەنێوان دوو كەسدا یان زیاتر، بەمەرجێ هەریەكێ لە هاوبەشەكان ئەندازەیێ لەماڵی خۆی تەرخان بكاو لەگەڵ ماڵی شەریكەكەیدا تێكەڵاوی بكا، پاشان لەم ڕێگەیەدا هەوڵی

---

[١] صحيح: (ص.جة/١٨٥٣)، جة(٢٢٨٧/٧٦٨/٢).

بەگەڕخستنیو قازانج لێ کردن بدەن، کە لەئاکامدا هەرکەسەیان بەگوێرەی (رأس المال)ەکەی قازانجو زەرەری بۆ دیاری بکرێ. هەر بەگوێرەی دەستمایەکەیان خەرجو باجی مەشروعەکەیان دەربکرێ. ئەگەر لەناو خۆیاندا شەریکەکان رێك کەوتن کە قازانجیان بە یەکسانی بێ هەرچەند سەرمایەکەیان جوداوازی تێدابێ ئەوە دروستە، تەنانەت ئەگەر دەستمایەی یەکێکیان زۆر لەوی تریان زیاتریش بێ. چونکە ئەوە بازرگانیکردنێکە بە رەزامەندی هەردووکیانو چاوپۆشی کردنو موسامەحەیە بەدڵ.

## بازرگانیکردن بەپارەی یەکێکی ترەوە (المضاربة)

دەگوترێ (ضرب في الأرض): واتە: بەمەبەستی بازرگانی بەناو زەویدا گەڕا. قورئان دەفەرموێ: {وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّـهِ – المزمل/٢٠} واتە: کۆمەڵێکی تر کە بەناو زەویدا دەگەڕێن بە مەبەستی بازرگانیکردن هەوڵو تەقەللایانە بۆ بەدەستهێنانی فەزلو بەخششی خودا. ئەم جۆرە کاسبیکردنە پێشی دەگوترێ: (قیراض) لەم ڕووەوە: کە خاوەن پارە بەشێك لە ماڵو سامانەکەی دادەبڕێ بۆئەوەی بیخاتە گەڕ بەدەستی یەکێکی تر بەمەبەستی دەستکەوتنی قازانجو سود.

مەبەست بە موضارەبە لێرەدا بریتییە لە گرێبەستێك لەنێوان دووکەسدا، یەکێکیان بڕێك پارە دەدا بە ئەویتر بۆئەوەی بازرگانی پێوەبکاو قازانجەکەش لەنێوانیاندا بەو ئەندازەیەی لەسەری پێك دێن.

مامەڵەکردن بەشێوەی موضارەبە ڕەوایەو شەرع پەسەندی دەکا... ئیبنولمونذیر لە کتێبەکەیدا کە ناوی (الإجماع)ە لاپەڕە/١٢٤ دەڵێ: کۆڕای زانایانی ئیسلام لەسەرئەوە بەستراوە: کە قیراضو موضارەبە بە دینارو درەم ڕەوایەو هیچ خراپیەکی تێدانیە.

هەروا كۆڕایان هەیە لەسەرئەوە: كە دروستە بۆ كابرای بازرگان بیكاتە مەرج بەسەر خاوەن پارەكەوە سێیەكی قازانجی بداتێ یان نیوەی قازانج یان هەر ئەندازەیەك كە لەسەری پێكدێن، بەمەرجێ ئەندازەكە دیاریكراو بێ‌و بەشێك بێ لەماڵە وەگەڕخراوەكە، بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم جۆرە مامەڵەیان ئەنجام داوە.

لە زەیدی كوڕی ئەسلەمەوە ئەویش لە باوكییەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: عەبدوڵلاو عوبەیدوللا هەردوو كوڕی عومەری خەطاب لەگەڵ سوپایەكدا دەردەچن بۆ وڵاتی عێراق، جا كەدەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ مەدینە دەچنە لای ئەبو موسای ئەشعەری: كە ئەوكاتە ئەمیری شاری بەصرە بووە. ئەویش زۆر بەڕو خۆشییەوە پێشوازییان لێ دەكا. دوای قسەو گفتوگۆ ئەبو مووسا پێیان دەڵێ: ئەگەر بمتوانیایە كارێكم بۆ بكردنایە لێیەوە سودمەند بوونایە بۆم دەكردن. پاشان كەمێ بیر دەكاتەوە دەڵێ ئێستا من بڕێكم پارەی بەیتولمال لایە دەمەوێ بینێرم بۆلای خەلیفەی موسوڵمانان، ئەگەر من لێرە بتاندەمێ كاڵای پێ بكڕن لەمەدینە بیفرۆشنەوە، ئەوجا دەستمایەكە رادەستی خەلیفە بكەن‌و قازانجەكە لەناو خۆتاندا دابەش بكەن!؟

وتیان: زۆرمان پێ خۆشە، ئەویش پارەكەی رادەست كردن‌و نامەیەكی بۆ خەلیفە عومەر نووسی، كە سەرمایەكەیان لێ وەربگرێ، جا كە گەیشتنەوە مەدینە ماڵەكەیان فرۆشت‌و قازانجی باشیان لێ كرد، ئەمجا: كە سەرمایەكەیان برد تەسلیمی خەلیفە عومەری بكەن، حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئایا ئەم پارە سلفەیە دراوە بەهەموو سوپاكە؟ ئەوانیش وەكوو ئێوە پارەی بەیتولمالیان دراوەتێ كاڵای پێ بكڕن‌و لێرە بیفرۆشنەوە قازانجی لێ بكەن؟ وتیان: نەخەیر بەس ئەو مامەڵە لەگەڵ ئێمە كراوە، حەزرەتی عومەر فەرمووی: كوڕانی ئەمیری موسوڵمانانن‌و سلفەتان دراوەتێ، ئێستا دەتانەوێ سەرمایەكە تەسلیم

بکەن‌و بۆی دەربچن!! نەخەیر شتی وا نابێ، دەبێ سەرمایەو قازانجەکەش تەسلیم بە بەیتولمال بکەنەوە. عەبدوڵڵا بێدەنگ بوو (عوبەیدللا) وتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان شتی وا نابێ ئەتۆ مافی ئەوەت نیە ئەم غەدرە لەئێمە بکەی! خۆ دیارە ئەگەر ماڵەکە بفەوتایە یان کەمی بکردایە ئێمە دەبوایە بەرعودەی بین، حەزرەتی عومەر فەرمووی: نەخەیر، ئیللا دەبێ دەستمایەو قازانج رادەستی بەیتولمال بکەن، عەبدوڵڵا بێدەنگ دەبێ، بەلاّم عوبەیدللا هەر سوور بوو لەسەر هەڵوێستی خۆیی‌و داوای لە خەلیفە کرد کە رایەکەی پەسەند بکا، هەتا یەکێك لە دانیشتوانی مەجلیسەکە وتی: ئەی ئەمیری موسوڵمانان! بۆچی بۆیان ناکەی بە (قیراض) نیوەی قازانج‌و هەموو سەرمایەکەیان لێ وەربگرە، عومەر فەرمووی: ئەوا کردم بە (قیراض) ئیتر خەلیفە عومەر سەرمایەو نیوەی قازانجەکەی لێ وەرگرتن‌و عەبدوڵلاو عوبەیدیللا دوو کوڕەکەی خەلیفە، نیوەی قازانجەکەیان لەناو خۆیان دابەش کرد[1].

### ئەوکەسەی بازرگانی دەکاو پارەی سەرمایەدارەکە وەگەڕ دەخا ئەمینە

موضارەبە بەرەهایی‌و بە سنورداریی رەوایە، پارە وەگەڕخەرەکە ئەمین‌و باوەڕپێکراوە، کەمتەرخەم‌و دەستدرێژکار نەبێ نابێتە زامن‌و زیانی پێ ناژمێردرێ.

ئیبنولمونذیر دەڵێ: کۆڕای زانایان لەسەرئەوە چەسپاوە: کە خاوەن پارە هەرکاتێك نەهی لە پارەگێڕەکە کرد شت بەقەرز نەفرۆشێ‌و بەقەرز فرۆشتی زامن دەبێ.[2]

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٩١/٥)، ط(١٣٨٥/٤٧٩)، هق(٦/١١٠).

[2] الإجماع ص١٢٥.

له حەزیمی كوڕی حیزامەوە: كە هاوەڵی پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بوو وا گێڕدراوەتەوە: كە هەركاتێك پارەی بدایە بە ئاڵو وێڵ كەرێك بۆ وەگەڕخستنو كاسبی پێوەكردن مەرجی ئەوەی لەسەر كابرای پارە وەگەڕخەر دادەنا، كە نابێ پارەكەم بدەی بە گیانلەبەر، نەچی ئاژەڵو پەلەوەری پێ بكڕی، نابێ ماڵەكەی بخاتە ناو دەریاو بە دەریادا بیگوێزێتەوە، نەیخاتە شوێنی وا لافاو بیگێڕێتەوە. لەدەم روبارو نزیك ئاو دای نەنێ. پێی دەگوت: ئەم مەرجانە جێبەجێ نەكەی ئەتو زامنی ماڵەكەیو هەرشتێكی لێ هات دەبێ قەرەبووم بكەیەوە.[1]

## (ألسّلم)

سەلەم كە (سەلەف)یشی پێ دەگوترێ. بریتییە لەفرۆشتنی كاڵایەكی دیاریكراوی وەصفداركراو لە زیممەی فرۆشیاردا بە پارەیەكی حازر.

ئەم جۆرە مامەڵەیە مەشروعو رەوایە ئاماژە بە ئایەتی {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ - البقرة/٢٨٢} ئەی خاوەن بڕوایان ئەگەر پارەیەكتان دا بەیەكێك بەقەرز بۆ ماوەیەكی دیاریكراو بینووسن.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: من شایەتی دەدەم كە سەلەمی مەضمون تا كاتێكی دیاریكراو خودا لە قورئاندا حەڵاڵی كردووەو ئیزنی پێ داوە. ئەمجار ئایەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم......}ی خوێندەوە[2].

هەر لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كە تەشریفی كۆچیكرد بۆ مەدینە لەو رۆژگارەدا دانیشتوانەكەی

---

[1] صحيح الإسناد (الإرواء/٢٩٣/٥)، قط(٢٤٢/٦٣/٢)، هق(٦/١١١).

[2] فقه السنة ج٣/١٧١.

مامەڵەی سەلەمی خورمایان دەکرد بۆ ماوەی دوو ساڵو سێ ساڵ، ئەویش دەربارەی ئەم جۆرە مامەڵەیە فەرمووی: «مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَفِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ» [1] کەسێك سەلەمی لە شتێکدا کرد با پێوانەکەی دیاریکراوبێو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بێ.

## سەلەم کردن لەگەڵ کەسێك کە خاوەنی کاڵا سەلەم پێکراوە کەنەبێ مەرج نیە لە سەلەمدا کابرای پارەوەرگر خاوەنداری کاڵاکە بێ

لە موحەممەدی کوڕی ئەبولموجالیدەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی شەدادو ئەبو بوردە منیان نارد بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا (رەزای خودا لەهەموویان بێ) پێیان گوتم بڕۆ پرسیاری لێ بکە ئاخۆ هاوەڵانی پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەردەمی پیغەمبەردا سەلەمیان لە گەنمدا دەکرد؟ دەڵێ: عەبدوڵڵا وتی: ئێمە ئەو رۆژگارە لەگەڵ نەبەطیيەکانی وڵاتی شام سەلەممان دەکرد لە گەنمو جۆدا لە زەیتدا بە پێوانەیەکی دیاریکراو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، وتم: ئێوە پارەکانتان دەدا بەکەسانێك کە مالیکی ئەو کاڵا سەلەم تێداکراوە بوو؟ وتی: ئێمە پرسیاری ئەوەمان لێ نەدەکردنو ئەوەندە لێمان نەدەکۆڵییەوە، ئەمجار ناردیانم بۆ لای (عبدالرحمن)ی کوڕی (أبزی) پرسیارم لێ کرد، فەرمووی: هاوەڵانی پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەردەمی ژیانی پیرۆزیدا سەلەمیان دەکرد بەشێوەیەکی بەرفراوان کەسیشمان پرسیاری لە کابرای پارەوەرگرو سەلەم لەگەڵ کراو نەدەکرد ئاخۆ ئەوانە زەویو زاری کشتو کاڵیان هەیە یان نا؟[2]

---

[1] صحيح (الإرواء/١٣٦٩)، ك (٢/٢٨٦)، هق (٦/١٨).

[2] صحيح: (الإرواء/١٣٧٠)، خ(٢٢٤٤/٤٣٠/٤) وهذا لفظه د(٣٤٤٧/٣٤٩/٩)، ن(٧/٢٩٠)، ج(٢٢٨٢/٧٦٦/٢).

## (ألقرض) قەرز

قەرز ماڵێکە خاوەن قەرز دەیدا بە قەرزکەر بۆئەوەی لەدواییدا: کە توانای دانەوەی قەرزەکەی بوو بەبێ زیادو کەمو لەهەمان ماڵو کاڵاو پارە قەرزەکەی بداتەوە.

لە زمانی عەرەبیدا (قرض) بەمانا دابڕینو جیاکردنەوەیە لەم رووەوە خاوەن قەرز بەشێك لەماڵی خۆی جیادەکاتەوەو دەیدا بەو کابرایەی داوای قەرزی لێ کردوە[1].

لە ئەبو هورەیرە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ».[2] هەر موسوڵمانێك دەروویەك لە موسوڵمانێك بکاتەوەو لە تەنگژەیەکی جیهان دەربازی بکا، پەروەردگار لەرۆژی قیامەتدا دەرووی رەحمەتی لێ دەکاتەوە، کەسێك یارمەتی دەستکورتێك بدا لەدونیاداو رێگای ژیانی بۆ ئاسان بکا، خودا لەدونیاو قیامەتدا رێگای بۆ ئاسان دەکا، پەروەردگار لە هاریکاری بەندەی خۆیدایە هەتا بەندەکە هاریکاری برای موسوڵمانی بکا.

لە ئیبنو مەسعوودەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُقْرِضُ مُسْلِمًا قَرْضًا مَرَّتَيْنِ إِلاَّ كَانَ كَصَدَقَتِهَا مَرَّةً».[3] واتە: هەر موسوڵمانێك دووجار قەرز بدا بە موسوڵمانێك وەکوو ئەوە وایە جارێك ئەو برە پارەیەی بەخێر بداتێ.

---

[1] فقه السنة ج٣/١٨٢.

[2] صحيح: (مختصر مسلم/١٨٨٨)، م(٢٦٩٩/٢٠٧٤/٤)، ت(٤٠١٥/٢٦٥/٤)، د(٤٩٢٥/٢٨٩/١٣).

[3] حسن: (الإرواء/١٣٨٩)، جة(٢٤١٢/٨٠٦/٢)، ت(١٦٢١/٦٨/٣).

## قەرزداریو زێدەڕۆیی تێیدا

لە ئەوبانەوە کە مەولای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بوو ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ فَارَقَ الرُّوحُ الْجَسَدَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلاَثٍ دَخَلَ الْجَنَّةَ مِنَ الْكِبْرِ وَالْغُلُولِ وَالدَّيْنِ».[1]: کەسێك گیانی لەجەستەی جیابێتەوەو لەسێ شت بەری بێ، دەچێتە بەهەشتەوە، لە کیبرو خۆ بەزلزانی، لە غەشو خیانەت، لە قەرزداری.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ»[2]: گیانی موسوڵمان پەیوەستە بە قەرزەکەیەوە هەتا قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە.

لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ دِينَارٌ أَوْ دِرْهَمٌ قُضِيَ مِنْ حَسَنَاتِهِ لَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ»[3]: کەسێك بمرێ دینارو دیرهەمی لەسەربێ لە چاکەکانی قەرزەکانی دەدرێتەوە لە رۆژێکدا، لەشوێنێکدا دینارو دیرهەم نیە.

لە ئەبو قەتادەوە گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایە سەرپێ وتارێکی بۆ داین تێیدا فەرمووی: جیهاد لەڕێگەی خوداداو ئیمان بەخودا گەورەترین کردەوەی باشی مرۆڤە. پیاوێك هەڵسایە سەرپێو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئەگەر من لەڕێگەی خودادا گیانم لەدەست دا ئایا تاوانەکانم دەشۆڕێنەوە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووی: بەڵێ ئەگەر تۆ لەڕێگەی خودادا بکوژرێیو

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٩٥٦)، جة(٢/٨٠٦/٢٤١٢)، ت(٣/٦٨/١٦٢١).

[2] صحيح: (ص.ج/٦٧٧٩)، (المشكاة/٢٩١٥)، ت(٢/٢٧٠/١٠٨٤).

[3] صحيح: (ص.جة/١٩٥٨)، جة(٢/٨٠٧/٢٤١٤).

خۆگربیو بەتەمای پاداشی باشی خودا بی، هەڵمەت بەریو پشت هەڵنەکەی بەرەو ڕووی دوژمن بڕۆیە پێشەوەو هەڵنەیەی، پاشان پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووو: ئەرێ تۆ پرسیارەکەت چۆن کردو وتت چی؟ وتی ئایا ئەگەر من لەڕێگەی خودادا کوژرام ئایا ئەو کوژرانەم دەبێتە کەفارەتی تاوانەکانم؟ پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «نَعَمْ إِنْ قُتِلْتَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ إِلاَّ الدَّيْنَ فَإِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ قَالَ لِي ذَلِكَ».[1] بەڵێ ئەگەر بەڕاستی لەڕێگەی خودادا گیان بەخت بکەیو خۆڕاگر بیو بەهیوای پاداشی دواڕۆژ بی، لەکاتی شەڕدا هێرش بەریو پشت هەڵکردو نەبی، هەموو گوناهێکت لەکۆڵ دەکەوێ جگە لەقەرز، جوبرائیل سەلامی خودای لێ بێ ئەو حوکمەی پێ ڕاگەیاندم.

## کەسێك ماڵی خەڵك وەربگرێ بیەوێ بیداتەوە یان بیفەوتێنێ

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پیغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ أَدَاءَهَا أَدَّى اللَّهُ عَنْهُ، وَمَنْ أَخَذَ يُرِيدُ إِتْلاَفَهَا أَتْلَفَهُ اللَّهُ».[2] کەسێك پارەی یەکێك وەربگرێ بە قەرزو نیازی دانەوەی بێ خودا یارمەتی دەداو دیداتەوە، کەسێکیش ماڵێك وەربگرێ بەقەرزو بەهیوای نەدانەوەی، خودا ماڵەکەی دەفەوتێنێو ناتوانێ بیداتەوە.

لە شوعەیبی کوڕی عەمرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: صوهەیبول خەیر لە پیغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) بۆی گێڕاینەوە، کە فەرموویەتی: «أَيُّمَا رَجُلٍ يَدَّيَّنُ دَيْنًا وَهُوَ مُجْمِعٌ أَنْ لاَ يُوَفِّيَهُ إِيَّاهُ لَقِيَ اللَّهَ سَارِقًا».[3] هەر

---

[1] صحيح: (الإرواء/١١٩٧)، م(١٨٨٥/١٥٠١/٣)، ت(١٧٦٥/١٢٧/٣)، ن(٣٤/٦).

[2] صحيح: (ص.ج/٥٩٨)، خ(٢٣٨٧/٥٣/٥).

[3] حسن صحيح: (ص.جة/١٩٥٤)، جة(٢٤١٠/٨٠٥/٢).

مرۆڤێك قەرزێك وەرگرێ‌و نیازی وابێ نەیداتەوە رۆژی قیامەت بەخزمەت پەروەردگاری دەگاتەوە بە دز حیساب دەكرێ.

## فەرمانكردن بەدانەوەی قەرز

قورئان دەفەرموێ: {إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا – النساء/٥٨}: پەروەردگار فەرمانتان پێ دەكا كەسپاردەو ئەمانەتەكان بدەنەوە بەخاوەنەكانیان، هەركاتێكیش كێشەو نیزاعی خەڵكتان یەكالاكردەوەو لەناو مەردوومدا بوون بەفەرمانڕەواو دادوەر بەدادپەروەری حوكمی نێوانیان بكەن‌و عەدالەت بخەنە گەڕ، بێگومان پەروەردگار پەندو ئامۆژگاری باشتان دەكاو رێگای ڕاستتان نیشان دەدا... بێگومان پەروەردگار شنەواو بینایە بەكردارو گوفتاری هەموو كەس.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێ: {فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ – البقرة/٢٨٣}. ئەگەر برێكتان هەبوو دڵنیابوو: كەماڵەكەی ناخورێ‌و لەكاتی خۆیدا بابای قەرزدار قەرزەكەی دەداتەوە، ئەوە بارمتەوەرگرتن پێویست نیە. بەلام پێویستە قەرزدار بتمانەی خۆی بپارێزێ، ئەو بتمانەیەی كەخاوەن قەرز پێی هەبوو بەبێ بارمتە قەرزی داوەتێ، نەهێڵێ ئەو بتمانەیە بفەوتێ، لەخودا بترسێ خیانەتی لێ نەكا.

## قەرزدانەوەی پەسەندو باش (حسن القضاء)

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: پیاوێك حوشترێكی بەقەرز لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بوو، داوای قەرزەكەی لێ كردەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: {أَعْطُوهُ} قەرزەكەی بدەنەوە، هەوڵدرا ئەوكاتە حوشترێكی لەو جۆرە پەیدا بكەن‌و بیدەنەوە،

حوشترێكیان دەست نەكەوت لەو جۆرە، ئەوەی دەستیان كەوت حوشترێك بوو ساڵێك تەمەنی سەروتر بوو فەرمووی: ئەوەی بدەنەوە كابرا وتی: باشتر لەهی خۆمت دامەوە، خودا باشترت بۆ پڕ بكاتەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ خِيَارَكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً»[1] باشترین كەسانی ئێوە ئەوانەن: كە بەباشی قەرزەكانیان دەدەنەوە.

لە جابیری كوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی لە مزگەوت بوو، (میسعەر) دەفەرموێ: پێم وابوو وتی: كاتەكە چێشتنگاو بوو، فەرمووی: دوو ڕكات نوێژ بكە، من قەرزێكم لای پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێ) قەرزەكەی دامەوەو زیادەشی دامێ[2].

لە ئیسماعیلی كوڕی ئیبراهیمی كوڕی عەبدوڵلای كوری ئەبو ڕەبیعە ئەلەخزومییەوە ئەویش لەباوكیەوە ئەویش لەباپیریەوە ڕیوایەتكراوە، كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەروبەندی غەزای حونەیندا سی هەزار یان چل هەزاری لێ قەرز كردووە، كە لەغەزاكە هاتەوە قەرزەكەی داوەتەوە، پاشان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: «بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْوَفَاءُ الْحَمْدُ»[3] خودا بەرەكەت بخاتە ماڵو منداڵتەوە، پاداشی قەرز، دانەوەیەتیو سووپاسگوزارییە.

---

[1] صحيح: (الإرواء/٥/٢٢٥)، خ(٢٣٩٣/٥٨/٤)، م(١٦٠١/١٢٢٥/٣)، ن(٢٩١/٧)، ت(١٣٣٠/٣٨٩/١).

[2] صحيح: خ(٢٣٩٤/٥٩/٥)، د(٣٣٣١/١٩٧/٩).

[3] حسن: (ص.جة/١٩٦٨)، جة(٢٤٢٤/٨٠٩/٢)، ن(٣١٤/٧).

## جوان داواکردنەوەی قەرز

لە ئیبنو عومەرو خاتو عائیشەوە ریوایەتکراوە، کە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ طَالبَ حَقًّا فَلْيَطْلُبْهُ فِي عَفَافٍ وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ».[1] کەسێك داوای قەرزێکی خۆی کردەوە کە لەسەر قەرزدارێك بوو با بەجوانی داوای بکاتەوەو لەگەڵ بابای قەرزدار نەرمو نیان بێ، جا بابای قەرزدار بیداتەوە یان نەیداتەوە.

## مۆڵەتدانی قەرزداری نەبوو

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ – البقرة/٢٨٠} ئەگەر قەرزدارەکە هەژارو نەدارا بوو، ئەوە با مۆڵەت بدرێ تا دەستی بەرخۆی دەکەوێتەوەو لەتەنگانەی نەبوویی ڕزگاری دەبێ، خۆ ئەگەر لە قەرزەکەش خۆش ببن ئەوە زۆر باشە بۆ ئێوە ئەگەر ئێوە بزانن.

لە حوزەیفەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: ژنەوتم لە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «مَاتَ رَجُلٌ ، فَقِيلَ لَهُ: ماكنت تقول؟ قَالَ كُنْتُ أُبَايِعُ النَّاسَ ، فَأَتَجَوَّزُ عَنِ الْمُوسِرِ ، وَأُخَفِّفُ عَنِ الْمُعْسِرِ ، فَغُفِرَ لَهُ»[2]: پیاوێك مرد پرسیاری لێ کرا لەو دونیادا هەڵسوکەوتت چۆن بوو لەگەڵ مەردووم،؟ وتی: بازرگان بووم شتم بەخەڵك دەفرۆشت، عادەتم وابوو مۆڵەتی قەرزداری دەوڵەمەندم دەداو بۆ قەرزداری نەبوو هەژاریش بارسوکیم بۆ دەکردنو لەبرێکی یان لە هەمووی خۆش دەبووم، بەهۆی ئەم هەڵوێستە مەردانەیەوە لێخۆشبوونی پەروەردگاری بەدەست هێنا.

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٩٦٥)، جه(٢٤٢١/٨٠٩/٢).

[2] صحيح: (ص.جة/١٩٦٣)، خ(٢٣٩١/٥٨/٥).

لــە ئەبوليوســرا: كــەهاوەڵی پيغەمبــەر بــوو، ريوايــەتكراوە، دەڵــێ: پيغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ أَحَـبَّ أَنْ يُظِلَّـهُ اللَّـهُ فِـی ظِلِّهِ – فَلْيُنْظِرْ مُعْسِرًا أَوْ لِيَضَعْ لَهُ».[1] كەسێك پێی خۆشبێ خودا رۆژی قيامـەت بيخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆيەوە، با لەدونيادا مۆڵەتی قـەرزداری هـەژارو نەبوو بدا يان هەر قەرزەكەی لەسەر بكوژێنێتەوە.

## دواخستنی قەرزدانەوە لەكاتی خۆی بۆ كەسێك دەوڵەمەند بێ ستەمە

لـە ئـەبو هـورەيرەوە ريوايـەتكراوە، دەڵـێ: پيغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْـمٌ».[2] پاشـگوێ خـستنی دانـەوەی قـەرز لەكاتی خۆی بۆ كەسێك دەوڵەمەند بێ زوڵمو ستەمە.

## دروستە دەوڵەمەندی قەرزدار بخرێتە بەندەوە ئەگەر بە ئەنقەست قەرزی نەدايەوە

لەعــەمری كــوڕی (الــشريد)ەوە لــە باوكييــەوە ريوايــەتكراوە، دەڵــێ: پيغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموويەتی: «لَيُّ الْوَاجِـدِ يُحِـلُّ عِرْضَـهُ وَعُقُوبَتَهُ».[3] دواخستنی دانەوەی قەرز لە لايەن دەوڵەمەندو هەبووەوە كارێك دەخولقێنـێ ڕەوايـە بـۆ خـاوەن قـەرز سـكاڵای لێ بكـاو داوا بكـا بەنـدی بكـەن، تەمبێ خواردوی بكەن.

---

[1] صحيح: (ص.جة/١٩٦٣)، جة(٢/٨٠٨/٢٤١٩).

[2] متفق عليه: خ(٥/٦١/٢٤٠٠)، م(٣/١١٩٧/١٥٦٤)، د(٩/١٩٥/٣٣٢٩)، ت(٢/٣٨٦/١٣٢٣)، ن(٧/٣١٧)، جة(٢/٨٠٣/٢٤٠٣).

[3] حسن: (ص.ن/٤٣٧٣)، ن(٧/٣١٧)، جة(٢/٨١١/٢٤٢٧)، د(١٠/٥٦/٣٦١١).

## هەر قەرزێك سودو قازانج بێنێ دەبێتە ڕیبا

لە ئەبو بوردەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: هاتمە مەدینە توشی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بووم، وتی با بڕۆینەوە بۆ ماڵ میوانم بەو، بە ئەو جامەی پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئاوی تێدا خواردۆتەوە ئاوت دەدەمێ، لەو شوێنەش پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لێ کردووە نوێژ بکە. منیش لەگەڵی ڕۆشتمەوە، شەربەتی شیرنی دامێ خواردمەوە، خورمای دەرخوارد دام، لەو شوێنەی پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی کردبوو نوێژم کرد، ئەمجار پێی گوتم: براله! ئەتۆ لەناوچەیەك دەژی سودو ڕیبای تێدا باوو بڵاوە، یەكێكیش لەجۆرەکانی ڕیبا ئەوەیە یەكێك لەئێوە ماڵێك لەیەكێك قەرز دەکا بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، کە کاتی قەرزدانەوەکەی هات قەرزەکەی بۆ دەباتەوە بەچنەیەکیش دیاری بۆ دەبا دەخیلتم خۆبپارێزە لە وەرگرتنی ئەو بەچنە دیارییەو ئەوەی تێیدایە[1].

## ڕەهن کردن (بارمتەدان)

ڕەهن لە زمانی عەرەبیدا بەمانا حەپسکردنە.

لە زاراوەی شەرعدا ڕەهن بریتیە لەوەی ماڵێك بکەی بە بارمتەی قەرز، بۆ ئەوەی ئەگەر قەرزدارەکە نەیتوانی قەرزەکە بداتەوە، خاوەن قەرز لەماڵە ڕەهنکراوەکە قەرزەکەی خۆی هەڵبگرێتەوە[2].

ڕەهن کارێکی ڕەوایە قورئان دەفەرموێ: {وَإِن كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ – البقرة/٢٨٣}.

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٣٥)، خ(٣٨١٤/٣٤٢)، هق(٥/٣٤٩).

[2] بڕوانە فتح الباری ج٥/١٤٠ ومنار السبيل ج١/٣٥١.

قەید دارکردن بە دەستەواژەی سەفەرەوە لە ئایەتەکەدا لەبەر شێوەی زۆرینەو غالیبە، ئەگینا مەفهومی نیە، چونکە فەرموودەی پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوە دەچەسپێنن: کە رەهنکردن لەغەیری سەفەریشدا هەر ڕەوایە، ئەگەر کابرا لەماڵەوەش بوو دەتوانێ رەهن بکا.

لە عائیشەوە (رەزای خودای لێ بێ) ریوایەتکراوە، دەڵێ: کە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خواردنێکی لەکابرایەکی جولەکە کڕی بەقەرز بۆ ماوەیەکی دیاری کراو زرێیەکەی لادانا بە بارمتە[1].

## سود وەرگرتن لەبارمتە لەلایەن خاوەن قەرزەوە

دروست نیە بۆ خاوەن قەرزی بارمتە لادانراو، سود لەبارمتە وەربگرێ، ئاماژە بەو دەق و نەصصانەی لەوەپێش رابوردن: کە پوختەکەیان ئەوەبوو: هەر قەرززێك سود راکێشێ بۆ خاوەن قەرز دەچێتە چوارچێوەی ریباوە، بەم جۆرە کابرایەك زەوییەك بکا بە بارمتە لای خاوەن قەرز ئەویش زەوییەکە بەکاربێنێ بۆ کشتوکاڵ، یان خانوێك بکا بەبارمتەو خاوەن قەرز تا قەرزەکەی وەردەگرێتەوە تێیدا نیشتەجێ بێ یان بیدا بەکرێ و کرێیەکە وەربگرێ، مەگەر بارمتەکە وڵاخی سواری بێ یان ئاژەڵی شیردەر بێ، ئەوە دروستە خاوەن قەرز سواری بێ، شیری بدۆشێ، باری پێ بکێشێ...... هتد. بەمەرجێك ئاڵف و خۆراکی بۆ دابین بکا.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الظَّهْرُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُوناً وَيُشْرَبُ لَبَنُ الدَّرِّ إِذَا كَانَ مَرْهُوناً وَعَلَى الَّذِي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ نَفَقَتُهُ».[2] وڵاخی سواری ئەگەر بارمتە

---

[1] متفق علیه: لەوەپێش تێپەڕی.

[2] صحيح: (ص.ج/٣٩٦٢)، خ(٥/١٤٣/٢٥١٢)، د(٩/٤٣٩/٣٥٠٩)، ت(٢/٣٦٢/١٣٧٢).

بوو لەجیاتی قەرز، خاوەن قەرز بۆی هەیە بەکاری بێنێ لەجیاتی بەخێوکردنەکەی، شیری ئاژەڵ دەخورێتەوە ئەگەر ئاژەڵەکە بارمتە بوو بەمەرجێ خاوەن قەرزی بارمتە لادانراو نەفەقەی ئاژەڵەکە بخاتە ئەستۆی خۆی.

## حەواڵە (الحوالة)

حەواڵە لەزمانی عەرەبیدا بە مانا لادانە، گواستنەویە، لەزاراوەی شەرعزانەکاندا بریتییە لەگواستنەوەی قەرزێك لە ئیمەی کەسێکەوە بۆ ئیمەی کەسێکی تر، ئەگەر کەسێك قەرزێکی لابوو، ئەم قەرزدارەش بۆخۆی قەرزی لەسەر کابرایەکی تر هەبوو، دەتوانێ خاوەن قەرز حەواڵەی قەرزدارەکەی خۆی بکا، ئەگەر وای کرد پێویستە خاوەن قەرزی حەواڵەکراو رازی بێو ئەو حەواڵە کردنە قبوڵ بکا، بەمەرجێك کابرای حەواڵە بۆسەر کراو دەوڵەمەند بێ، چونکە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (مطل الغنيّ ظلم، فاذا أُتبِع أحدكم على مليّ فليتبع).[1] پاشگوێ خستنی قەرزدانەوە لەلایەن دەوڵەمەندەوە ستەمە، ئەگەر خاوەن قەرزێك لەئێوە حەواڵەکرا بۆ سەر دەوڵەمەندێکی قەرزداری قەرزدار، باڕازی بێو داوای قەرزەکەی لەو بکا.

## سپاردەو ماڵی ئەمانەت (الوديعة)

وەدیعە ماڵێکە بە ئەمانەت لەلای یەکێك دادەنرێ.

**حوکمی وەدیعە:** ئەگەر پیاوێك کاڵایەکی لەلای یەکێك دانا سوننەتە کابرا ئەو ماڵە وەدیعەیە لای خۆی گل بداتەوە، ئەگەر لەخۆی رادەدی: کە پارێزگاری ماڵەکەی بۆ دەکرێ، چونکە ئەمە دەچێتە بواری هاریکاری کردن

---

[1] متفق عليه: خ(٢٢٨٧/٤٦٤/٤)، م(١٥٦٤/١١٩٧/٣)، د(٣٣٢٩/١٩٥/٩).

لەسەر چاكەو چاكسازىو بەهانا هاتنى يەكتريەوە. هەركاتێكيش كابراى خاوەن ماڵ داواى ماڵەكەى كردەوە پێويستە باباى ماڵ لەلا دانراو بەبێ چەندو چوون ماڵەكە رادەستى خاوەن ماڵ بكاتەوە. چونكە خودا دەفەرموێ: {إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا – النساء/٥٨} پەروەردگار فەرمانتان پێ دەكا كەسپاردەكان بدەنەوە بەخاوەنەكانيان. يان دەفەرموێ: {فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ – البقرة/٢٨٣}.

پيغەمبەريش (درودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: «أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ».[١] سپاردەكە بگێرەوە بۆلاى ئەو كەسەى بە ئەمينو دەستپاكى داناوى. ئەو كەسەى سپاردەى لا دادەنرێ، زامنو بەرعودەى نەفەوتانى ماڵەكە نابێ، مەگەر كەمتەرخەمى بنوێنێو زێدەرەوى بكا لە بێ موبالاتىدا.

لە عەمرى كورى شوعەيبەوە لە باوكييەوە لە باپيريەوە ريوايەتى كردووە دەڵێ: پيغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: «مَنْ أُودِعَ وَدِيعَةً فَلاَ ضَمَانَ عَلَيْهِ».[٢] كەسێك سپاردەيەكى لادانرا زامنو بەرعودەيى لەسەر نابێ.

هەر لەوەوە ريوايەتكراوە، دەڵێ: پيغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: «لاَ ضَمَانَ عَلَى مُؤْتَمَنٍ».[٣] بەرعۆدە بوونو زەمان لەسەر ئەو كەسە نيە كە بەئەمين زانراوەو سپاردەى لەلا دانراوە.

لە ئەنەسى كورى ماليكەوە ريوايەتكراوە، كە عومەرى كورى خەتتاب بڕيارى بەسەردا داوە بە بژاردنى سپاردەيەكى دزراو كە لەلاى دانرابوو.

---

[١] صحيح: (ص.ج/٢٤٠)، ت(١٢٨٢/٣٦٨/٢)، د(٣٥١٨/٤٥٠/٩).

[٢] حسن: (ص.جة/١٩٤٥)، (الإرواء/١٥٤٧)، جة(٢٤٠١/٨٠٢/٢).

[٣] حسن (ص.ج/٧٥١٨)، قط(١٦٧/٤١/٣)، هق(٦/٢٨٩).

بەیهەقی دەڵێ: لەوانەیە ئەنەس کەمتەرخەمی کردبێ لە پارێزگاری کردنیدا، بەهۆی کەمتەرخەمیەکەیەوە ماڵە وەدیعە دزراوەکەی پێ بژاردووە.

## ماڵی خوازراو (العارية)

شەرعزانەکان پێناسەی (عاریە)یان بەوە کردووە، کە بریتییە لەپێدانی ماڵێك، ئامێرێك لەلایەن خاوەنەکەیەوە بدرێ بە یەکێکی تر بۆ ئەوەی سودی لێ وەربگرێ بەبێ بەرامبەر.

ئەم جۆرە دەستگیرۆدەیییە سوننەتەو شەرع پەسەندی دەکا، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى – المائدة/٢}. هاریکاری یەکتری بکەن لەچاکەو تەقواو خوداپەرستیدا.

هەروا پیغەمبەر دەفەرموێ: «وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ».[1] پەروەردگار یارمەتی بەندەی خۆی دەدا هەتا ئەو بەندە هاریکاری برای موسوڵمانی بێ.

لەلایەکی ترەوە پەروەردگار سەرزەنشتی ئەوانەی کردووە، کە ئامێرو کەرەسەی خۆیان رادەستی ئەوانە ناکەن کە داخوازییان لێ دەکەن و بەدەم داخوازی ئاتاجانەوە ناچن. دەفەرموێ: {الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ. الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ. وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ – الماعون/٥ – ٦ – ٧}

لە عەبدوڵلاوە ریوایەتکراوە، فەرموویەتی: ئێمە لەسەردەمی پیغەمبەری خودادا دۆڵچەی ئاوهەڵکێشان و مەنجەڵ و دیزەی کێشت لێنانمان بەماعون دادەناو لە یەکترمان مەنع نەدەکرد.

پێویستە ئەو ئامێرو حاجەتە خوازراوە کە کارەکەی پێ جێبەجێ کرا بگەرێندرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، چونکە حوکمی ئەمانەت و سپاردەیی هەیەو

[1] صحيح: (ص.ج/٦٥٧٧)، خ(٤/٣٨/٢٠٧٤)، حم(٢/٤٠٧)، ت(٥/٢٨/٢٦٤٦)، جة(١/٨٢/٢٢٥).

ئەمانەتیش دەبێ بدرێتەوە بەخاوەنی خۆی... قورئـان دەفـەرموێ: {إِنَّ اللّـهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا – النساء/٥٨}. پەروەردگار فەرمانتان پـێ دەکا کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان.

بابـای حاجـەتخوازو ئـامێر پـێ دراو، زەمـانو بـەرعۆدە بـوونی لەئەسـتۆ نیە، مەگەر کەمتەرخەمو بـێ موبـالات بـێ، یـان خـاوەن ئـامێر بیکاتـە مـەرج بەسەریەوە کە دەبێ ئـەرکی پاراسـتنی ماعونەکـە هـەڵبگرێو ئـەویش قبـوڵی بکا.

لە صـەفوانی کـوڕی یـەعلاوە ئـەویش لەباوکییـەوە ریوایـەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبــەر (درودی خــودای لەســەر بــێ) پێــی فــەرمووم هــەرکاتێ نوێنــەرو نێردراوی من هاتەلات سی زرێو سی حوشتری بدەرێ. دەڵێ: منیش وتم: ئەی پیغەمبــەری خــودا! ئــەم شــتانەم لێ دەخــوازی بەشــێوەی عاریــەی زەمــانو بەرعۆدەبوونەو بەبێ کەموکوڕی بۆم دەگێڕیەوە یان خوازراوی بێ زەمانەتە؟ فەرمووی: نا ئەرکی زەمانەتی ئەو ئامێرانە ناخەمە ئەستۆی خۆم[1].

## ماڵی دۆزراوە (اللقطة)

لوقطــە: مــاڵی هــەڵگیراوەو دۆزراوە: بریتییــە لــەماڵێك نرخــدار بــێ موعەرەض بێ بۆ تێداچوونو فەوتانو خاوەنی نەزاندرێ، بـەزۆری بـە مـاڵو سامانێك دەگوترێ: کە گیانلەبەر نەبێ ئەگەر ماڵە دزراوەکە حەیوان بوو پێی دەگوترێ (ضالة) گومبوو.

پێویستە لەسەر ئەو کەسـەی کـە ماڵێـك دەدۆزێتـەوە بزانـێ جنـسی ئـەو ماڵە چیە، ژمارەی چەنـدە، ئەمجار پیاوێکی عادڵ بکا بەشایەت، ئـەمجار هـەڵی بگرێتەوەو پارێزگاری بکاو تا ساڵێك جاڕی بۆ بـدا کـەوا مـاڵێکی دۆزیوەتـەوە،

---

[1] صحيح: (ص.د/٣٠٤٥)، (الصحيحة/٦٣٠)، د(٣٥٤٩/٤٧٩/٩).

جا ئەگەر خاوەنی پەیدا بوو نیشانەکانی روونکردەوە دەبێ ڕادەستی بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر دوای ساڵێکیش بێ، خۆ ئەگەر خاوەنی پەیدا نەبوو دەتوانێ سودی لێ وەربگرێ.

لە سوومیدەی کوڕی غەفەلەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: توشی ئوبەی کوڕی کەعب بووم پێی گوتم کیسەیەکم دۆزییەوە سەد دیناری تێدا بوو، چوومە خزمەت پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: تا یەك ساڵ تەواو دەبێ جاڕی بۆ بدە، ساڵێکی ڕەبەق من جاڕم بۆدا، کەس نەی گوت هی منەو خۆی نەکرد بەخاوەنی، ئەمجار کیسە پارەکەم هێنایەوە بۆ خزمەت پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: تا ساڵێکی تر تێوە دەسوڕێتەوە جاڕی بۆ بدە، دیسانەوە جاڕم بۆ دایەوە کەسم دەست نەکەوت خۆی بکا بەخاوەنی، دیسانەوە هێنامەوە بۆ خزمەت پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئاخۆ چی لێ بکەم، فەرمووی: جۆرو شێوەی کیسەکەو ژمارەی ماڵەکەو ئەو بەنەی کەپێی بەستراوە، ئەمانە بپارێزە، ئەگەر خاوەنی پەیدا بوو، بیدەرەوە ئەگینا بۆخۆت سودی لێ ببینە، منیش جاڕم بۆ دا خاوەنی بۆ پەیدا نەبوو، ئیتر بەکارم هێنا، سوومید دەڵێ: پاشان لەمەککە توشی ئوبەی بووم لەم بارەوە لێم پرسییەوە، وتی: نازانم سێ ساڵ بوو یان یەك ساڵ بوو.[1]

لە عیاضی کوڕی حیمارەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ وَجَدَ لُقَطَةً فَلْيُشْهِدْ ذَا عَدْلٍ – أَوْ ذَوَىْ عَدْلٍ – وَلاَ يَكْتُمْ وَلاَ يُغَيِّبْ فَإِنْ وَجَدَ صَاحِبَهَا فَلْيَرُدَّهَا عَلَيْهِ وَإِلاَّ فَهُوَ مَالُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ

---

[1] متفق عليه: خ(٢٤٢٦/٧٨/٥)، م(١٧٢٣/١٣٥٠/٣)، ت(١٣٨٦/٤١٤/٢)، جه(٢٥٠٦/٨٣٣/٢)، د(١٦٨٥/١١٨/٥).

يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ».[1] کەسێك ماڵێکی کەوتووی دۆزیەوە با پیاوێکی عادڵ یان دوو کەسی عادڵ بکا بەشایەت هیچ دەستکاری نەکاو نەیشارێتەوە، جا ئەگەر خاوەنی پەیدا بوو ئەوە بیداتەوە، چونکە ئەوە ماڵی خۆیەتی‌و حەقی خۆیەتی وەری بگرێتەوە، ئەگەر خاوەنی پەیدا نەبوو ئەوە ڕزقێکە خودا بۆی ڕەخساندووە.

## دۆزینەوەی مەڕو بزن‌و حوشتری گومبوو

کەسێك مەڕو بزنی دۆزیەوە دەیانگێڕێتەوە لای خۆی‌و جاڕیان بۆ دەدا ئەگەر خاوەنی پەیدا بوو باشە، ئەگینا دەیکاتە موڵکی خۆی، تەصەروفی تێدا دەکا، ئەگەر حوشتری دۆزیەوە نابێ بیگێڕێتەوە چونکە حوشتر بۆخۆی خۆی دەژێنێ‌و ترسی تێداچوونی لێ ناکرێ.

لە زەیدی کوڕی خالیدی (الجهنی)یەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پرسیاری شتی دۆزراوەی لێ کرد، فەرمووی: «عَرِّفْهَا سَنَةً ، ثُمَّ احْفَظْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا ، فَإِنْ جَاءَ أَحَدٌ يُخْبِرُكَ بِهَا ، وَإِلاَّ فَاسْتَنْفِقْهَا». بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو جاڕی بۆ بدە، پاشان کیسەکەی‌و بەنی بەستنی کیسەکە بزانە چۆنەو چیە ئەگەر خاوەنی بۆ پەیدا بوو، وتی: من خاوەنی ئەو ماڵە دۆزراوەم ئەوە بیدەرەوە، ئەگینا بۆخۆت بەکاری بێنەو خەرجی بکە، وتی: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەی مەڕو بزنی دۆزراوە حوکمەکەیان چۆنە؟ پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَكَ أَوْ لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ». ئەوە یان ماڵی تۆیە یان هی براکەتە، یان خۆراکی گورگە. کابرا گوتی: ئەدی حوشتری گومبوو؟ ئیدی ڕوخساری پیغەمبەر گۆڕاو فەرمووی: تۆ حەقی حوشترت چیە؟ ئەو بۆخۆی بێ ئاتاجە

---

[1] صحيح: (ص.جة/٢٠٣٢)، جة(٢٥٠٥/٨٣٧/٢)، د(١٦٩٣/١٣١/٥).

لەبەخێوکردن، سەمو خوفی خۆیو ئاوی ئیحتیاتی خۆی پێیە، بۆخۆی دەلەوەڕێو دەچێتە سەرئاو ئاودەخواتەوە، ملی درێژە دەتوانێ گەڵای بەرزی درەختو شتی وا داپاچێ.[1]

### حوکمی خواردەمەنی دۆزراوە یان شتی کەمنرخی دۆزراوە

کەسێك لەڕێگەدا خواردنێکی دۆزییەوە دەتوانێ بیخوا، ئەگەر شتێکی کەمنرخی دۆزییەوە دەتوانێ هەڵی بگرێو بیکاتە موڵکی خۆی.

لە ئەنەسەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ڕۆیشتنی بەڕێگادا دەنکە خورمایەکی کەوتووی چاو پێکەوت فەرمووی: ئەگەر لەترسی ئەوە نەبوایە کە ئەم خورمایە لەماڵی زەکات بێ، دەمخوارد «لَوْلاَ أَنِّي أَخَافُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لأَكَلْتُهَا».[2]

### دۆزراوەی ناوبەستی مەککە (لقطه الحرم)

دروست نیە ماڵی کەوتوو لەداخلی ئەرزی حەرەمدا هەڵبگیرێتەوە، مەگەر بەمەبەستی جاڕدانو بانگ بۆ هەڵدان، دوای ساڵێکیش جاڕدان بۆی دروست نییە تەملیك بکرێ.

لە ئیبنو عەبباسەوە (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) ریوایەتکراوە، کە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ مَكَّةَ ، فَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي ، وَلاَ تَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدِي ، وَإِنَّمَا أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، لاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا ، وَلاَ يُعْضَدُ شَجَرُهَا ، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا ، وَلاَ تُلْتَقَطُ لُقَطَتُهَا إِلاَّ

---

[1] متفق علیه: خ(٥/٨٠/٢٤٢٧)، م(٣/١٣٤٨/٢/١٧٢٢)، ت(٢/٤١٥/١٣٧٨)، جـة(٢/٨٣٦/٢٥٠٤)، د(٥/١٢٣/١٦٨٨).

[2] متفق علیه: خ(٥/٨٦/٢٤٣١)، م(٢/٧٥٢/١٠٧١)، د(٥/٧٠/١٦٣٦).

لِمُعَـــرِّفٍ». [1] بێگومـــان پـــەروەردگار ڕێزێكـــی تایبـــەتی داوە بـــە مەككـــەو دەوروبـەری زەوییەكـەی كـردووە بـە بەسـتو حـەرەم، نـە لـەپێش منـداو نـە لەدوای من بۆ كەس حەڵاڵ نەبووەو حەڵاڵ نابێ شەڕو جەنگ لەمەككەدا بكا، تـەنیا سـەعاتێك لـە ڕۆژدا ڕێگـە بـەمن دراوە شـەڕی تێـدا بكـەم، كـە لـەڕۆژی ڕزگـارركردنی مەككـەدا بـوو، گیاوگـژی تـەڕی نادورێتـەوە درەختـی نـابڕدرێ، ئاژەڵی كێوی‌و باڵندەی تەرە ناكرێ‌و ناڕەتێنـدرێ مـاڵی گومبـووی كـە یـەكێك دۆزییـەوە هـەڵی ناگرێتـەوە مەگـەر بەمەبەسـتی جـاڕدان بـۆی، بـۆ ئـەوەی خاوەنی پەیدا ببێ‌و بیداتەوە.

## زارۆكی فڕێدراو (منداڵی هەڵگیراوە)

زارۆكـی فڕێـدراو: ئـەو منداڵـە نەباڵغەیـە كـە لـەكۆڵان‌و سـەرجادەدا دەدۆزرێتەوەو هەڵدەگیرێتەوە، یان منداڵێكە ڕێگەی لێ گومبووە خاوەنی خۆی نادۆزێتەوەو كەس خۆی ناكا بەخاوەنی، نازاندرێ باوك‌و دایكی كێن؟

هەڵگرتنەوەی ئەم جۆرە منداڵانە فـەرزی كیفایەیـە ئەگـەر یـەكێك پێـی هەڵسا ئەوە ئەركەكە لەسەر ئەوانی تر لەدانیشتوانی شارو دەڤەرەكە لادەچێ، چونكە پەروەردگار دەفەرموێ: {وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى – المائدة/٢}.

منداڵی دۆزراوەی لەو جۆرە ئەگـەر لـەوڵاتی ئیـسلامدا بـوو ئـەوە حـوكم دەكـرێ بەموسـوڵمانی‌و بـە ئـازادیی ئـەو زارۆكـە، چـونكە ئەصـڵ‌و بنـەما لـە ئادەمیزاددا ئازادییـە نـەك كۆیلـەیی. ئەگـەر لەتـەك ئـەو منداڵـە هـەڵگیراوەدا ماڵ‌و سامانێك هەبوو، ئەوە لـەو مـاڵ‌و سامانە نەفەقـەو بـژێوی ئـەو منداڵـە دابین دەكرێ، ئەگینا بژێوی لەسەر بەیتولماله.

---

[1] صحیح: (ص.ج/١٧٥١)، (الإرواء/١٠٥٧)، خ(١٨٣٣/٤٦/٤).

سونەینی ئەبو جەمیلە – پیاوێکە لەهۆزی بەنو سەلەیم – دەگێڕێتەوە دەڵێ: منداڵە فڕێدراوێکم دۆزییەوە، هێنامە لای خەلیفە عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) عورەیفێ وتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! بێگومان ئەوە پیاوێکی صاڵحە، حەززرەتی عومەر فەرمووی: ئایا وایە؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: دەبیبە بۆخۆت، ئەوە حورو ئازادە وەلائەکەی بۆ تۆیەو بژێویشی لەسەر ئێمەیە.

## میراتی مرۆڤی دۆزراوەو هەڵگیراوە

ئەگەر ئەو منداڵە فڕێدراوە هەڵگیراوە مردو کەلەپوری لەدوا بەجێماو میراتگری لەدوای خۆی بەجێ نەهێشت، کەلەپورەکەی بۆ بەیتولمالە، هەروا ئەگەر کوژراو بکوژەکەی خوێنی کەوتە سەر، بەیتولمال خوێنەکەی وەردەگرێ.

ئەگەر یەکێك – نێر یان مێینە - ئیدیعای ئەوەی کرد کە ئەو منداڵە فڕێدراوە هەڵگیراوە لە ڕەچەڵەکی ئەوەو ئەوە وەچەو نەوەی ئەوە قسەکەی وەردەگیرێ بەمەرجێك بوونی ئەو منداڵە لە ئەو گونجاو بێ، ئەگەر دووکەس یان زیاتر ئیدیعای خاوەنیەتی خۆیان بۆ ئەو منداڵە کرد، کێیان توانی بەڵگەو شایەت لەسەر داواکەی ڕاست بکاتەوە دەدرێ بە ئەو، ئەگەر هیچیان شایەتیان نەبوو، ئەوە منداڵەکە نیشانی (قائف) سەرناس دەدرێ، پەنا بۆ ئەوە دەبرێ کە منداڵەکە نیشانی ئەو قائیفانە بدرێ کە: بەتێفکرین و وردبوونەوە لەشێوەو شکڵی منداڵەکەو دەعواچیەکە، دیاری کردنی ڕەچەڵەکی دەکرێ حوکمی قائیفەکە جێبەجێ دەکرێ و دەکرێتە منداڵی ئەو.

لە خاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هاتە ژورەکەی من و روی گوشادو کەیف خۆش بوو روخساری گەشابووەوە، فەرمووی: «أَلَمْ تَرَىْ أَنَّ مُجَزِّزًا الْمُدْلِجِيَّ دَخَلَ

فَرَأَى أُسَامَةَ وَزَيْدًا وَعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ ، قَدْ غَطَّيَا رُءُوسَهُمَا وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا ، فَقَالَ إِنَّ هَذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ».[١] ئەوە نازانی کە موجەززەی ئەلمود لەجێ ماوەیەك بەر لەئێستا سەیری قاچی زەیدو ئوسامەی کرد، سەرو جەستەی خۆیان داپۆشیبوو تەنها قاچیان بەدەرەوە بوون، وتی: ئەم قاچانە هەندێکیان لەهەندێکیانن‌و نژادو ڕەچەڵەکیان یەکە.

ئەگەر قائیفەکە (سەرناسەکە) وای ڕاگەیاند کە ئەو منداڵە هی دوو کەسە منداڵەکە دەبێتە منداڵی هەردووکیان.

لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: ئافرەتێك لەکاتی (پاکی)دا دوو پیاو چوو بوونە لای، دوایی منداڵێکی بوو، نیشانی سەرناسیان دا، وتی: لەهەردوکیانە. هەردوو پیاوەکە تێیدا هاوبەشن. ئیتر خەلیفە عومەر کردی بەمنداڵی هەردووکیان.

## بەخشین‌و دیاری (الهبة)

بەخشین: کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ (هِبَة) بریتییە لەوە مرۆڤ لەژیانی‌دا ماڵی خۆی بدا بەیەکێکی تر بەبێ بەرامبەر.

هەڵبەتە بەخشین کاریکی باشەو ئایینی ئیسلام پەسەندی کردووەو موسوڵمانانی هەڵناوە بۆ ئەنجامدانی.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە: کە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ لاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا ، وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ».[٢] ئەی ئافرەتانی خاوەن باوەڕ، با هیچ دراوسێیەك دیاری‌و بەخشندەی

---

[١] متفق عليه: خ(٦٧٧١/٥٦/٢)، م(١٤٥٩/١٠٨١/٢)، د(٢٢٥٠/٣٥٧/٦)، ت(٢٢١٢/٢٩٨/٣).

[٢] متفق عليه: خ(٢٥٦٦/١٩٧/٥)، م(١٠٣٠/٧١٤/٢).

جیرانەکەی بە کەم‌و بێ نرخ سەیر نەکا تەنانەت ئەگەر شتە بەخشراوەکە پێچکەی مەڕێکیش بێ.

هەر لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «تَهَادَوْا تَحَابُّوا».[1] دیاری بۆ یەکتری بنێرن خۆشەویستی دەکەوێتە ناوتانەوە.

## دیاری ئەگەر کەمیش بێ واچاکە وەربگیرێ‌و قبوڵ بێ

ئەبو هورەیرە ریوایەت دەکا: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لَوْ دُعِيتُ إِلَى ذِرَاعٍ أَوْ كُرَاعٍ لأَجَبْتُ ، وَلَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ ذِرَاعٌ أَوْ كُرَاعٌ لَقَبِلْتُ».[2] ئەگەر بانگ بکرێم بۆسەر دەعوەتی پێچکەی ئاژەڵێک یان قاچە ئاژەڵێک وەڵامی بانگکردنەکە دەدەمەوەو دەچم بۆ دەعوەتەکە. خۆ ئەگەر دیارییەکەم بۆ بێنن پێچکە ئاژەڵێک یان قاچە ئاژەڵێک بێ: کەهیچ گۆشتی پێوە نیە قبووڵی دەکەم.

## ئەو دیاری‌و بەخشانەی نابێ وەرنەگیرێن

عەزرەی کوڕی ثابیتی ئەلئەنصاری دەگێڕێتەوە دەڵێ: ثومامەی کوڕی عەبدوڵلا بۆیگێڕامەوە دەڵێ: چوومە لای ئەنەس ئەویش شتێکی بۆنخۆشی پێدام، وتی: ئەنەس عادەتی وابوو: ئەگەر بۆنێکی خۆشیان بەدیاریی بۆ هێنابا رەتی نەدەکردەوە، وتیشی ئەنەس پێی وابوو: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هیچ کاتێک دیاری بۆنخۆشی رەت نەدەکردەوە.[3]

---

[1] حسن (ص. ج/٣٠٠٢)، الإرواء (١٦٠١)، هق (٦/١٦٩).

[2] صحيح: (صحيح: (ص) ج/٥٢٦٨)، خ (٥/١٩٩/٢٥٦٨).

[3] صحيح: (صحيح: (ص. ت/٢٢٤٠)، خ (٥/٢٠٩/٢٥٨٢)، ت (٤/١٩٥/٢٩٤١).

لـه ئیبنـو عومـەرەوە ریوایـەتکراوە، دەڵـێ: پیغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: «ثَـلاَثٌ لاَ تُـرَدُّ الْوَسَـائِدُ وَالـدُّهْنُ وَاللَّـبَنُ»[1]: سـێ‌جۆر دیاریی رەت ناکرێنەوە، سەرین‌و بالیف رۆنی خۆ بۆنخۆشکردن‌و شیرو ماست‌و دۆ. دیـاری قبـوڵ دەکـرێ‌و پاداشیـشی دەدرێتـەوە، لـە خـاتو عائیـشەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دیـاری قبـوڵ دەکردو لەبەرامبەردا پاداشیشی بۆ خاوەن دیاریی دەناردەوە[2].

کێ شیاوی دیاریی بۆ ناردنە؟

لە خاتو عائیشەوە گێردراوەتەوە دەفەرموێ: بە پیغەمبـەرم گـوت: ئـەمن دوو هاوسێم هەن یەك دیاریم هەیە بـۆ کامیـانی بنێـرم؟ فـەرمووی: کامـەیان دەرگای لەدەرگای تۆوە نزیکترە[3].

(کورەیب) کە مەولای ئیبنو عەبباسە ریوایەتی کردوە: کە مەیموونـەی کچی الحارث (خودای لێ رازی بێ) بۆیگێراوەتەوە: کە بـەبێ ئـەوەی پـرس‌و را بە پیغەمبەر بکا کۆیلەیەکی بچوکی هەبوو ئازادی کرد، جا کە نـۆرەی ئـەوەی هات پیغەمبـەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) شـەو لای بـێ، عـەرزی کـرد: ئـەی پیغەمبـەری خـودا! ئایـا زانیوتـە مـن کۆیلـە پـچکۆلەکەی خـۆمم ئـازادکرد؟ فەرمووی: بەڕاست شتی وات کرد؟ وتی: بەڵێ کردومە، فەرمووی: «لَوْ أَعْطَيْتِهَا أَخْوَالَـكِ كَـانَ أَعْظَـمَ لأَجْـرِكِ»[4] لەراسـتیدا ئـەتۆ ئەگـەر بتبەخـشیایە بـە خاڵەکانت ئەوە خێرو پاداشتت زیاتر دەست دەکەوت.

---

[1] حسن (ص. ن/٢٢٤١)، ت (٤/١٩٩/٢٩٤٢).

[2] صحيح: خ (٥/٢١٠/٢٥٨٥)، د (٩/٤٥١/٣٥١٩)، ت (٣/٢٢٧/٢٠١٩).

[3] صحيح: خ (٥/٢١٩/٢٥٩٥)، ت (١٤/٦٣/٥١٣٣).

[4] متفق عليه: خ(٥/٢١٧/٢٥٩٢)، م (٢/٦٩٤/٩٩٩)، د (٥/١٠٩/١٦٧٤).

## حەرامە باوك لە بەخشینێدا تەفضیلی هەندێ منداڵی بدا بەسەر ئەوانی تردا

لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: باوکم هەندێ لەماڵی خۆی پێ بەخشیم، دایکم کەناوی (عەمرەی کچی ڕەواحە بوو) وتی: ڕازی نابم تا پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەمە ئاگادار نەکەیەوە، ئیتر باوکم چوو بۆ خزمەت پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆئەوەی ئاگاداری ئەم بەخشینەی باوکم بێ، پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە باوکمی فەرموو ئایا ئەم هەڵوێستەت لەگەڵ هەموو منداڵەکانت کردوە؟ وتی: نەخەیر. فەرمووی: «اتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا فِي أَوْلَادِكُمْ». لەخودا بترسنو لەگەڵ منداڵەکانتاندا دادپەروەرانە هەڵسو کەوت بکەن... ئیتر باوکم هاتەوە ئەو ماڵەی پێی بەخشیبووم لێی وەرگرتمەوە.

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: کەوابێ من مەکە بە شایەت، من نابمە شایەت بەسەر شتێکدا کە ستەم بێ.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: کە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: «أَيَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا إِلَيْكَ فِي الْبِرِّ سَوَاءً». ئایا پێت خۆشە کوڕەکانت هەموویان وەکوو یەك بۆت باشبن! دەڵێ: بەڵێ. دەفەرموێ: «فَلاَ إِذًا». کەوابێ نابێ بەجیا هەندێ لە ماڵەکەت ببەخشی بە یەکێکیانو بەوانی ترنەبەخشی[1].

---

[1] متفـــــق علیـــــه: خ(١٤٩٠/٣/٣٥٣)، م (١٦٢٠/٣/١٢٣٩)، ن (٥/١٠٨)، ت (٢/٨٩/٦٦٣)، د (٤/٤٨٣/١٥٧٨).

**بۆ کەس ڕەوانیە کە لەبەخشینی خۆی ژێوان بێتەوە یان بیکڕێتەوە**

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ ، الَّذِي يَعُودُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَرْجِعُ فِي قَيْئِهِ»[1]: بۆ ئێمەی موسوڵمان ڕەوانیەو ناگونجێ کە ڕەوشتی ناشیرینی وامان هەبێ: کە لەخراپترینو بێ نرخترین گیانلەبەردایە لە پەسەندترین ڕەوشتو حاڵەتیدا: کە سەگە. ئەو کەسەی لەبەخشراوی خۆی ژێوان دەبێتەوە، شتێك دەبەخشێ دوایی لێی پەشیمان دەبێتەوە، وەکوو سەگ وایە: کەڕشوی خۆی دەخواتەوە...

لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە لە باوکییەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەڵێ: بەگوێی خۆم ژنەوتم عومەری کوڕی خەتتاب دەیفەرموو: ئەسپێکم بەخشی بە کابرایەك کە لەڕێگەی خودا غەزای پێ بکا، کابرا ئەسپەکەی بێ خزمەت کردبوو، لەشوێنێك دیم دەیفرۆشت ویستم بیکڕمەوە، پێم وابوو بەنرخی هەرزان دەیفرۆشێ، لەوبارەوە پرسیارم لە پێغەمبەر کرد (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَشْتَرِهِ ، وَإِنْ أَعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ وَاحِدٍ ، فَإِنَّ الْعَائِدَ فِي صَدَقَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ». ئەگەر بەدیرهەمێکیش بتداتەوە لێی مەکڕە، چونکە کەسێك بەخشراوی خۆی بێنێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی هەڵیبگرێتەوە وەکوو سەگێك وایە کە ڕشوی خۆی دەخواتەوە[2].

بەڵام باوك دەتوانێ ئەگەر شتێکی بەخشی بە منداڵی خۆی لێی بستێنێتەوە. لە ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: «لاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ

---

[1] متفق علیه: خ(٥/٢٣٤/٢٦٢٢)، م (٣/١٢٤٠/١٦٢٢)، د (٩/٤٥٤/٣٥٢١)، ت (٢/٣٨٣/١٣١٦)، ن (٦/٢٦٥).

[2] متفق علیه: خ(٣/٣٥٣/١٤٩٠)، م (٣/١٢٣٩/١٦٢٠)، ن (٥/١٠٨).

أَنْ يُعْطِيَ عَطِيَّةً أَوْ يَهَبَ هِبَةً فَيَرْجِعَ فِيهَا إِلاَّ الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ». [١] رەوانیە بۆ مرۆڤ کەشتێك ببەخشێ پاشان لێی پەشیمان ببێتەوە جگە لەباوك کەشتێك ببەخشێ بەمنداڵی خۆی دەتوانێ لێی پەشیمان بێتەوە.

ئەگەر کابرای دیاری پێ بەخشراو دیارییەکەی گێڕایەوە بۆ خاوەنی ئەوە هیچ خراپیەکی تێدانیە کە وەری بگرێتەوە.

لە خاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نوێژی بە پارچە قوماشێکەوە کرد کە گوڵگوڵاوی بوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دوایی کە سەیری گوڵی قوماشەکەی کرد فەرمووی: «اذْهَبُوا بِخَمِيصَتِي هَذِهِ إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَائْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةِ أَبِي جَهْمٍ ، فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عَنْ صَلاَتِي». ئەم قوماشە گوڵدارە بەرنەوە بۆ ئەبو جەهەمو ئینبیجانییەکەی ئەبو جەهەم (قوماشێکە سادەیەو گوڵی تێدانیە) ئەوەم بۆ بێنن، چونکە ئەم قوماشە گوڵگوڵاوییە لەنوێژەکەم غافڵی کردم.

(ألصّعب)ی کوڕی جەثامەی (ألّليثي) کە یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەر لە (الأبواء)یان لە (ودان) بوو لە ئیحرامدا بوو، کەرە کێوییەکم بەدیاری دا بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەویش ڕەتی کردەوەو لێی قبوڵ نەکردم، زۆرم پێ ناخۆش بوو، جا کە لەدەمو چاوی من پێناخۆشبوونی زۆری هەست پێکرد لەسەر ڕەتکردنەوەی دیاریەکەم فەرمووی: ئێمە دیاری ڕەتناکەینەوەبەڵام ئێمە لە ئیحرامداین[٢].

---

[١] صحيح: (ص. ج/٧٦٥٥)، د (٩/٤٥٥/٣٥٢٢)، ت (٢/٣٨٣/١٣١٦)، ن (٦/٢٦٥).

[٢] متفق عليه: خ(٤/٣١/١٨٢٥)، م (٢/٨٥٠/١١٩٣)، ت (٢/١٧٠/٨٥١)، جه (٢/١٠٣٢/٣٠٩٠).

**کەسێك شتێکی بەخشی بەخزمێکیو دوایی لەڕێگەی میراتەوە بووەوە بەهی خۆی**

لە عەبدوڵلای کوڕی بورەیدەوە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەت پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وتی: ئەی پیغەمبەری خودا! من کەنیزەکێکم بەخشی بەدایکم، ئێستا دایکم کۆچی کردووە، پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: خودا پاداشتت بداتەوەو ئێستاش بە کەلەپورو میرات بوەتەوە بە ملکی خۆت[1].

**دیاری وەرگرتن لەلایەن والیو فەرمانڕەواوە ستەمو نارەوایە**

لە ئەبو حومەیدی (الساعدی)یەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی هۆزی ئەزدی کرد بە لێپرسراوی زەکات کۆکردنەوە ناوی (ابن اللتبية) بوو. کە لەزەکات کۆکردنەوە گەڕایەوە، وتی: ئەوە بۆ ئێوەو ئەمەش دیارییە، داویانە بەخۆم بەدیاری، پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا چووە سەر دوانگەو حەمدو سەنای خودای کرد، پاشان فەرمووی: «مَا بَالُ الْعَامِلِ نَبْعَثُهُ ، فَيَقُولُ هَذَا لَكَ وَهَذَا لِي . فَهَلاَّ جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ فَيَنْظُرُ أَيُهْدَى لَهُ أَمْ لاَ ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يَأْتِي بِشَيْءٍ إِلاَّ جَاءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ عَلَى رَقَبَتِهِ ، إِنْ كَانَ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ ، أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ ، أَوْ شَاةً تَيْعَرُ». چیە حاڵو وەزعی هەندێ کەس دەینێرین بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکێکی ڕەسمیو دەسەڵاتێکی دەدرێتە دەست، دوایی کەدێتەوە دەڵێ: ئەمە بۆ بەیتولمالو ئەمەش دراوە بەخۆمو بەدیاری بۆیان هێناوم، ئەوە بۆ لەماڵی باوكو دایکی خۆی دانەنیشت بزانێ ئاخۆ هیچیان بۆ

---

[1] صحيح: (ص/٥٣٥)، م (٢/٨٠٥/١١٤٩)، ت (٢/٨٩/٦٦٢)، د (٨/٧٩/٢٨٦٠).

دەهێنا؟ سوێندم بەوکەسەی گیانی منی وا لەدەستدایە هەریەکێ لەئێوە شتێکی ئاوای دەست بکەوێ، ڕۆژی قیامەت دێ بۆ سارای مەحشەر ئەوشتەی کەئاوا بەناحەق هەڵی گرتووە بەسەر نەری شانیەوەیەتی، جا ئەگەر ئەوشتە حوشتربوو بەسەر شانیەوە دەبۆڕێنێ، ئەگەر ڕەشە ولاخ بوو دەهۆڕێنێ، ئەگەر مەڕو بزن بوو دەبارێنێ. پاشان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی هەڵبڕی، هەتا بەباشی قوڵکەی بنهەنگڵیمان بینی، فەرمووی: ئایا من پەیامی خۆم گەیاند؟ سێجار ئەم فەرموودەیەی دووبارە کردەوە[1].

### بەخشینی شت بەکەسێك تا لەژیاندا بێ (ألعمری والرقبی)

ئەمەش جۆرێکە لەبەخشین سنووردار دەکرێ بەکاتێکی دیاریکراو ئەم جۆرە بەخشینە لەسەردەمی نەزانیدا پەیڕەو دەکرا، ئەوەبوو یەکێك بە یەکێکی تری دەگوت ئەو خانوەم پێ بەخشی بۆخۆت بێ تا لەژیاندابێ دوای لەدونیا دەرچوونت بگەڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆم یان میراتگرەکانم. ئەگەر منیش پێش تۆ مردم ئەوە بۆخۆت بێ. بەم جۆرە بەخشینە گوتراوە: (عُمْری). هەروا پێشی گوتراوە (رقبی) چونکە هەریەك لە بەخششکارو پێ بەخشراو چاوەڕوانی ئەوەدەکەن ئاخۆ کەی هاوەڵەکەی دەمرێو مڵکەکە بگەڕێتەوە بۆ خاوەنی یەکەمی بەخشندە.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم تەوقیتکردنەی ئیلغا کردۆتەوە هەرکەسێك بەوجۆرە شتی پێ ببەخشرێ تا لەژیاندابێ هی خۆیەتی کەمردیش بۆ میراتگرەکانیەتیو ناگەڕێتەوە بۆ بەخشندەکە.

لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الْعُمْرَى جَائِزَةٌ لِمَنْ أُعْمِرَهَا وَالرُّقْبَى جَائِزَةٌ لِمَنْ

[1] متفق عليه: خ(١٣/١٦٤/٧١٧٤)، م (٣/١٤٦٣/١٨٣٢)، د (٨/١٦٢/٢٩٣٠).

أُرْقِبَهَا». بەخشین بەشێوەی عەمرا دروستە بۆ کەسێك پابەندی دیاریکردنی ماوەکە نەبێ بەڵکوو بە یەکجاری بۆ خۆی بێو دوای خۆشی بۆ میراتگرەکانی بێ.

هەر لەجابیرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: بیستم پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «مَنْ أَعْمَرَ رَجُلاً عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ فَقَدْ قَطَعَ قَوْلُهُ حَقَّهُ فِيهَا وَهِيَ لِمَنْ أُعْمِرَ وَلِعَقِبِهِ».[1] کەسێك بەشێوەی عەمرا شتێکی بەخشی بە پیاوێك ئەوشتە دەبێتە ملکی پیاوەکەو دوا مردنیشی بۆ وەچەو نەوەکانیەتی. هەر لەگەڵ وتی ئەوە بۆتۆ بێ تا لەژیاندا بێ ملکییەتی ئەو شتەی نامێنێو دەبێتە ملکی کابرای پێ بەخشراوو وەچەو نەوەکانی.

هەر لەجابیرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «أَمْسِكُوا عَلَيْكُمْ أَمْوَالَكُمْ وَلاَ تُفْسِدُوهَا فَإِنَّهُ مَنْ أَعْمَرَ عُمْرَى فَهِيَ لِلَّذِي أُعْمِرَهَا حَيًّا وَمَيِّتًا وَلِعَقِبِهِ».[2] ماڵو سامانی خۆتان پارێزگاری بکەنو بەزایەی مەدەن، بێگومان کەسێك بەشێوەی عومرا ماڵێك بدا بە یەکێکی تر ئەوە ئەو ماڵە دەبێتە ملکی ئەو بە مردوییو بە زیندویی پاش خۆشی بۆ وەچەکانیەتی.

## وەقف

وەقف: لەزمانی عەرەبیدا بەمانا بەندکردنو راگرتن دێ، لە زاراوەی شەرعدا حەبسکردنو هێشتنەوەی ئەصڵی ماڵەکەیەو دابەشکردنی بەروبوومەکەیەتی لە رێگەی خودادا.

پرۆژەی وەقف پرۆژەیەکی چاکەکاریو مرۆڤ دۆستییە، ئیسلام دایهێناوەو بانگەوازی بۆ کردووە، لەسەردەمی پێش ئیسلامدا نەزاندراوەو

---

[1] صحیح: (ص. ج/١٩٢٧)، م (١٦٢٥ – ٣/١٢٤٥/٢١)، جه (٢/٧٩٦/٢٣٨٠).

[2] صحیح: (ص. ج/١٣٨٨)، م (١٦٢٥ – ٣/١٢٤٦/٢٦).

کاری پێ نەکراوە، پیغەمبەری ئیسلام (درودی خودای لەسەر بێ) دایهێناو بانگەوازی بۆکرد بەمەبەستی بەرژەوەندی موسوڵمانان، چونکە ئەم بەرژەوەندییانەی لە وەقفدا هەن لەکاری خێرخوازی تردا نین، چونکە وێدەچێ مرۆڤ ماڵێکی زۆر لەرێگەی خێرو خێرخوازییدا سەرف بکا، پاشان بفەوتێو نەمێنێو هەژارەکان جارێکی تر پێویستییان بەو ماڵە هەبێ، یان چینێکی تر هەژار پەیدابنو ماڵەکە نەمابێو ئەوان لێی مەحروم بن، کەوابوو رێگا چارەی باشترو گرنتی بۆ هەژار بەگشتیو بۆ هەموو سەردەمەکان ئەوەیە موسوڵمانان بەشێك لەماڵی خۆیان وەقف بکەن بۆ هەژارو ئاتاجان بەروبوومی ئەو ملکە بەسەریاندا بەش بکرێو ئەصڵی ماڵەکەش بمێنێتەوەو نەفەوتێ بەدرێژایی رۆژگار موسوڵمانان سوودی لێ وەربگرن[1].

وەقف کردن کارێکی مەشروعو پەسەندە، پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) موسوڵمانانی هەڵناوە بۆ ئەو کارە خێرەو تەرغیبی کردون

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە: کە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاثَةٍ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ»[2]: کە مرۆڤ مرد کردەوەکانی لێ دادەبڕێن جگە لەسێ شت: صەدەقەیەکی بەردەوام، یان زانیارییەکی بڵاو کردبێتەوە سوودی لێ ببێندرێ، یان منداڵێکی صاڵحی لەدوا جێمابێ دوعای بۆ بکاو داوای لێخۆشبوونی بۆ لەخودا بکا.

ئاشکراشە کە پرۆژەی وەقف دەچێتە چوارچێوەی صەدەقەی جارییەوە.

---

[1] حجة الله البالغة (٢/١١٦).

[2] م (٣/١٢٥٥/١٦٣١)، د (٨/٨٦/٢٨٦٣)، ت (٢/٤١٨/١٣٩٠)، ن (٦/٢٥١).

له ئیبنو عومەرەوە (رەزای خودای لێ بێ) ریوایەتکراوە، دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب لە خەیبەر زەوییەکی کەوتە دەست، هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) داوای لێ کرد ڕێ‌و شوێنی نیشاندا چی لێ بکا، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! زەویەکم لە دەڤەری خەیبەر دەست کەوتووە تا ئێستا ملکی وا بەنرخم دەست نەکەوتووە، دەفەرمووی چی لێ بکەم باشە؟! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا ، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا». ئەگەر حەزدەکەی خودی ملکەکە وەقف بکەو با موسوڵمانان خێر لە بەروبوومەکەی ببینن. جا ئیبنو عومەر دەفەرموێ: ئیتر عومەر (رەزای خودای لێ بێ) ملکەکەی وەقف کرد، خودی ملکەکە نافرۆشرێ‌و نابەخشرێ‌و نابێتە میرات‌و کەلەپور، واتە: عومەر (رەزای خودای لێ بێ) ملکەکەی کردە خێرو صەدەقە بۆ هەژارو خزم‌و کەس‌وکارو ئازادکردنی کۆیلەو یارمەتیدانی رێبوارو میوان، واتە بەروبوومی ملکەکە بەسەر ئەو چین‌و توێژانەدا دابەش بکرێ، ئەوکەسەش کە سەرپەرشتی دەکا دەتوانێ بە ئەندازەی پێویستی خۆی لێی بخواو بەشی دۆست‌و برادەرانی بدا.

### ئەوشتانەی وەقف دەکرێن‌و ئەوانەی وەقفیان لەسەر دەکرێ

ئیبنو حەزم دەڵێ: وەقف دروستە لەو شتانەدا: کە بۆخۆی دەمێنێتەوە سودیشی لێ دەبیندرێ وەکوو خانوبەرەو زەوی‌و زار لەگەڵ ئەو درەخت‌و خانووبەرەی تێیاندایە، هەروا ئاش‌و قورئان‌و کتێب‌و دەفتەر.

هەروا وەقف دروستە لە کۆیلەو چەك‌و ئەسپ‌و ئامێری غەزاکردن‌و شتی وا. دروستە مرۆڤ ماڵ وەقف بکا لەسەر کەسێك خۆشی بوێ، یان وەقفی بکا لەسەر خۆی پاشان لەسەر کەسێك بە پەسەندی بزانێ.

هەرکاتێ واقیف ماڵێکی خۆی لەسەر لایەنێکی دیاریکراو بە درکاندنی وەقفکردنەکە یەکسەر ماڵەکە لەواقیفەوە دەگواسترێتەوە بۆ ئەستۆی وەقف لەسەر کراو، دەق وەقف وەکوو بەخشینو فرۆشتن وایە[1].

## داگیرکردنی مڵكو ماڵ (الغصب)

داگیرکردن: بریتییە لەدەست بەسەراگرتنی مافی غەیر بەناڕەوا. دیارە ئەمەش زوڵمو ستەمەو زوڵمو ستەمیش چەند تاریکیو ناخۆشییەکە لەرۆژی قیامەتدا. پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ. مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لاَ يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاء – إبراهيم/٤٢ – ٤٣} ئەی موحەمەد؛ ئەی بیسەر! وامەزانە خودا بێ ئاگایە لەو کردارانەی ستەمکاران ئەنجامی دەدەن، وامەزانە: کە خودا مۆڵەتی ئادەمیزادی ستەمکار دەداو عەزابیان لێ دوادەخا، لێیان بێ ئاگایە، دڵنیابە خودا یەکەیەکە تاوانەکانیان دەژمێرێو لەسەریان دەنووسێو لەڕۆژی خۆی تۆڵەیان لێ دەستێنێ، نەوەکوو سزادانەکەیان دوادەخەین مەگەر بۆ ڕۆژێك دوای دەخەین بەلاو ناخۆشییەکانی سامناکن هەر لەبەر دیمەنی بەسامی ئەو رۆژە چاوی ئادەمیزادان بەملۆق دەوەستێو چاوقوونچاندنیان بۆ ناکرێ، لەگۆڕەکانیان رادەبن بەپەلەو سەرشۆڕی دێن بۆ دەشتی مەحشەر، سەریان بەرز کردۆتەوە بەترسو لەرزەوە دەڕوانن {لاَ يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ} چاویان بەملۆق وەستاوەو پێڵوی چاویان وێك ناکەوێتەوە {وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاء} دڵو دەروونیان خاڵیو بۆشە، هیچ وەرناگرێو هیچیان لەبیر نەماوە، لەترسان پەشۆکاوو شڵەژاون، سەرسامو وڕو حەیرانن، هەرچی هومێدو هیوا هەیە لەدڵیاندا نیە.

---

[1] منار السبیل ج٢/٩.

هەروا دەفەرموێ: {وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْـوَالَكُم بَيْـنَكُم بِالْبَاطِـلِ – البقـرة/١٨٨}.
پیغەمبەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) لـەوتاری ماڵئـاواییـدا فـەرمووی: «فَـإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا».[1] بێگومان خوێنتان، ماڵو سامانتان نـاموسو حـەیاتان حەرامـە لەسەرتان پێویستە پاریزگاری لێ بکەنو ڕێزی لێ بگرن وەکوو ڕێزگرتننتان بـۆ ئەم ڕۆژەو لەم مانگە ڕێزدارەدا لەم شارو دەڤەرە پیرۆزەدا.

## سود وەرگرتن لەماڵی دەست بەسەراگیراو

حەرامـە لەسـەر داگیرکـار سـود لـەکاڵای داگیرکـراو وەربگـرێ، پێویـستە کەسێك ماڵێکی داگیرکراوی لەلابوو چی زووە بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنی.

لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی سـائیبی کـوڕی زەیـد لـە باوکییـەوە لەباپیریـەوە ریوایـەتکراوە، کـە بیـستویەتی لـە پیغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرموویەتی: «لاَ يَأْخُذَنَّ أَحَدُكُمْ مَتَاعَ أَخِيهِ لاَعِبًا وَلاَ جَادًّا وَمَنْ أَخَذَ عَـصَا أَخِيـهِ فَلْيَرُدَّهَا».[2] با هیچ کەس لەئێوە کاڵای برای موسـوڵمانی هەڵنـەگرێو داگـیری نەکا نە بەگاڵتـە نـە بەڕاستی. کەسێك گۆچانو شتی وای بـرای موسـوڵمانی هەڵگرت با زوو بیگەڕێنێتەوە.

لـە ئـەبو هـورەیرەوە ریوایـەتکراوە، دەڵـێ: پیغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لأَحَدٍ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ ، قَبْلَ أَنْ لاَ يَكُونَ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ ، إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ

---

[1] صحيح: (ص. ج/٢٠٦٨).

[2] حسن (ص. ج/٧٥٧٨)، د (١٣/٣٤٦/٤٩٨٢)، ت (٣/٣١٣/٢٢٤٩) واللفظ (لا يأخذ أحدكم عصا أخيه).

مَظْلَمَتِهِ ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ».[1] کەسێك مافی یەکێکی لا بێ، ستەمێکی لێ کردبێ، دەستدرێژییەکی کردبێتە سەری، با زوو خۆی لێ ڕزگار بکاو فەرمبووی بۆ بکاتەوەو نەیخاتە درەنگ، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێ دینارو دیرهەم ڕۆڵیان نەمێنێ، جا ئەوکاتە ئەگەر کردەوەی چاکی هەبوو ئەوە بە ئەندازەی ستەمەکەی لەکردەوە باشەکانی هەڵدەگیرێ بۆ کابرای ستەم لێکراو، خۆ ئەگەر کردەوەی باشی نەبوو لەخراپەو تاوانی کابرای ستەم لێکراو هەڵدەگیرێ دەخرێتە سەر تاوانی ستەمکارو ئەوەندەی تر کۆڵی گران دەبێ.

### کەسێك لەپێناو پارێزگاری کردن لەماڵو سامانی خۆی بکوژرێ شەهیدە

ڕەوایە بۆ مرۆڤ بەرگری لەنەفسی خۆیو ماڵو سامانی بکا، ئەگەر یەکێك ویستی بیکوژێ یان ماڵی لێ بستێنێ دەبێ بەرگری لەخۆی بکا ئەگەر لەم پێناوەدا کوژرا شەهیدە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وتی: ئەی پیغەمبەری خودا! هەڵوێستم چی بێ ئەگەر یەکێك ویستی ماڵم لێ داگیر بکا؟ فەرمووی: «فَلاَ تُعْطِهِ مَالَكَ». ماڵەکەی مەدەرێ، وتی: ئەی ئەگەر شەڕی لەگەڵ کردم چی بکەم؟ فەرمووی: «قَاتِلْهُ». تۆش شەڕی لەگەڵ بکە، وتی: ئەی ئەگەر ئەو کوشتمی؟ پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «فَأَنْتَ شَهِيدٌ». ئەتۆ شەهیدی، وتی: ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: «هُوَ فِي النَّارِ». ئەو دۆزەخییە.

---

[1] صحيح: (ص. ج/٦٥١١)، خ (٥/١٠١/٢٤٤٩)، ت (٤/٣٦/٢٥٣٤) بمعناه.

## داگیرکردنی زەوی‌و زار

لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ لە پێغەمبەرم ژنەوت (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «مَنْ ظَلَمَ مِنَ الأَرْضِ شَيْئًا طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ».[1] کەسێك ستەم بکاو کەمێك لەزەوی یەکێك داگیر بکا خودا بە ئەندازەی ئەو زەوییە داگیرکراوەی بۆ دەکاتە تۆق‌و لەملی دەکا.

لە سالمەوە لەباوکییەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: : «مَنْ أَخَذَ مِنَ الأَرْضِ شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّهِ خُسِفَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ».[2] کەسێك شتێکی لە زەوی داگیرکرد بەبێ ئەوەی هیچ مافێکی بەسەر ئەو زەوییەوە هەبێ دەستی بەسەردا گرت‌و بەناحەق کردی بەهی خۆی، ڕۆژی قیامەت بەقوڵایی حەوت تەبەقەی زەوی‌دا دەیبەنە خوارێ.

کەسێك زەوییەکی داگیرکرد دارودرەختی تێدا ڕواند یان بیناو باڵەخانەی تێدا دروست کردن، پێویستە زەوییەکە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنی‌و ئەو نەمام‌و درەختانەی تێیدا چەقاندووە دەریان بێنێ، بیناو باڵەخانەی تێیدا کردوون بیانڕوخێنێ. ئەمەش ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «لَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ»..[3] کەسێك بچێتە سەر زەوییەك ملکی خۆی نەبێ درەختی تێدا بڕوێنێ بۆئەوەی بیکاتە ملکی خۆی لەپێش ئەویشدا یەکێکی تر ئەو زەوییەی ئاوەدان کردبێتەوەو بووبێتە ملکی، ئەوە ئەم کابرایە ستەمکارەو بەو درەخت ڕواندنە بۆتە داگیرکار، دەبێ

---

[1] متفق عليه: خ(٢٤٥٢/١٠٣/٥)، م (١٦١٠/١٢٣٠/٣).

[2] صحيح: (ص. ج/٦٣٨٥)، خ (٢٤٥٤/١٠٣/٥).

[3] صحيح: (ص. ج/٦٢٧٢)، ت (١٣٧٨/٤١٠/٢)، جه (٢٤٦٦/٨٢٤/٢).

وازی لێ بێنێ و زەوییەکە بداتەوە خاوەنی، چونکە هیچ مافێك نیە بۆ کابرای درەخت ڕوێنی ستەمکارو زەوی داگیرکەر.

ئەگەر کشتوکاڵی تێدا کرد دەبێ بڕی تێچووی کشتوکاڵکردنەکە وەربگرێتەوەو وازی لێ بێنێ و کشت و کاڵەکە بۆ خاوەن زەوییەکە دەبێ.

لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ زَرَعَ فِي أَرْضِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ فَلَيْسَ لَهُ مِنَ الزَّرْعِ شَيْءٌ وَتُرَدُّ عَلَيْهِ قِيمَةُ نَفَقَتِهِ».[1] کەسێك لەزەوی کەسانی تردا کشتوکاڵی کرد بەبێ ڕەزامەندی و ئیزن وەرگرتن لێیان، ئەوە جگە لە نەفەقەو تێچوی کشت و کاڵەکە هیچی تری ناکەوێ.

## شوفعە

شوفعە بریتییە لە گواستنەوەی بەشی هاوبەشێك بۆلای هاوبەشەکەی: کە لەوەپێش ئەو بەشە گواسترابۆوە بۆ کابرایەکی بێگانەو ناشەریك. بەونرخەی دیاریکرابوو بۆ کڕیارە بێگانەکە.

## شوفعە لەچیدا ئەنجام دەدرێ؟

لەجابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بڕیاریدا بەڕەوایی شوفعەو بەرقەراربوونی لەهەر موڵك و ماڵێك دا بەئاسایی بەش نەکرێ. بەڵام ئەگەر ملك سنورو ڕێبازی جیاکرایەوە شوفعەی تێدانیە.

لەسەر ئەم بنەمایە کەسێك هاوبەشی هەبوو لە زەوی و زارێکدا یان لەدیوارو خانوبەرەدا نابێ بیفرۆشی بە بێگانە هەتا پرس بەهاو بەشەکەی

[1] صحيح: (ص. ج/٦٢٧٢)، ت (١٣٧٨/٤١٠/٢)، جه (٢٤٦٦/٨٢٤/٢).

دەكاو پێشنیاری ئەوەی بۆدەكا كە لێی بكڕێ، ئەگەر لەپێشدا پرسی بە هاوبەشەكەی نەكردو پێشنیاری ئەوەی نەكرد كە دەیفرۆشێو پێی خۆشە ئەو لێی بكڕێ، فرۆشتی بە یەكێكی بێگانەو نا هاوبەش، ئەوە هاوبەشەكەی دەتوانێ بە ڕێگای شوفعە ئەو ملكە هەڵبگرێتەوە. چونكە ئەو شیاوترین كەسە بە كڕینو هەڵگرتنەوەی ملكی هاوبەشەكەی.

لە جابیرەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ كَانَتْ لَهُ نَخْلٌ أَوْ أَرْضٌ فَلاَ يَبِيعُهَا حَتَّى يَعْرِضَهَا عَلَى شَرِيكِهِ».[1] كەسێك باخی خورما یان زەویو زاری هەبوو با نەیفرۆشێ هەتا پرس بە هاوبەشەكەی دەكاو بۆ ئەوی رادەنوێنێ كە لێی بكڕێ.

لەئەبو رافیعەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الشَّرِيكُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ مَا كَانَ».[2] شەریك شیاوترە بەو زەوییەی لە پەناویەتیو ئاوبارەو جۆگای دەیگرێتەوەو لێی نزیكە.

شوفعە بەهۆی هاوسێیەتییەوە ئەگەر لەنێوانیاندا حەقێكی هاوبەش هەبوو بەم جۆرە ڕێگایان یەكبوو یان بەیەك كارێز ئاو دەدران ئەوە شوفعە دەچەسپێ بۆ یەكێ لە هاوبەشەكان هەركامیان بەشی خۆی بفرۆشێ بە یەكێكی بێگانە بۆ هاوبەشەكەی تریان هەیە بەشێوەی شوفعە هەڵی بگرێتەوە، بەمەرجێ پێش فرۆشتنەكەی پرسی پێ نەكردبێو بۆی عەرز نەكردبێ.

لە جابیرەوە ریوایەتكراوە، دەفەرموێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الْجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَةِ جَارِهِ يُنْتَظَرُ بِهَا وَإِنْ كَانَ غَائِبًا إِذَا كَانَ

---

[1] صحيح: (ص. ج/٢٠٢١)، جه (٢/٨٣٣/٢٤٩٢)، ن (٧/٣١٩).

[2] صحيح: (ص. جه/٢٠٢٧)، جه (٢/٨٣٤/٢٤٩٨).

طَرِيقُهُمَا وَاحِدًا».[1] جیران خاوەن مافە بۆ کڕینەوەی مڵکی جیرانی، تەنانەت ئەگەر هاوسێیەکەی لەماڵ نەبوو دەبێ چاوەڕێی بکا تا دەگەڕێتەوەو پرسی پێ دەکا ئاخۆ ئەو دەیەوێ بیکڕێ یان نا، ئەمە کاتێك وایە کە ڕێگایان یەك بێ، واتە مڵکی هەردوو هاوسێکان یەك ڕێگایان هەبوو.

هەروا لە ئەبو رافیعەوە ریوایەتکراوە: کە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « الْجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ مَا كَانَ».هاوسێ شیاوترەو خاوەن مافە بۆ کڕینەوەی مڵکی نزیکی مڵکی خۆی.

## بریکاریی (الوكالة)

بریکاریی بریتییە لەوەی: یەکێك یەکێکی تر دەکاتە بریکاری خۆیو دەسەڵاتی دەداتێ بەشێوەی رەهایی یان سنوردار. وەکالەت رەوایە بە پێی قورئانو سوننەتو کۆڕای ئوممەت... پەروەردگار دەفەرموێ: {وَكَذَلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءلُوا بَيْنَهُمْ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا – الكهف/١٩}. ئاوا بەوشێوە کۆمەڵی ئەصحابولکەهف زیندومان کردنەوە بۆئەوەی بکەونە پرسیارو لێکۆڵینەوە لەناوخۆیاندا، یەکێکیان وتی: چەند زەمان لەم شوێنە ماونەوە؟ وتیان: رۆژێك یان بڕی رۆژێك ماوینەوە. هەندێکیان وتیان: خودا دەزانێ ماوەی مانەوەکەمان چەندە، ئێستا ئێمە برسیمانە با جارێ خەمی ئەوە بخۆینو ئەو کێشەیەمان حەل بکەین. یەکێك بنێرن بۆ بازاڕو ئەم پارەیەی لامان جنگ دەکەوێ هەندێکی بدەنێ با بچێ خواردنمان بۆ بکڕێ لە

---

[1] صـــحيح: (ص. جـــه/٢٠٢٤)، خ (٤/٤٣٧/٢٢٥٨)، د (٩/٤٣٨/٣٤٩٩)، ن (٧/٣٢٠)، جـــه (٢/٨٣٣/٢٤٩٥).

بازاڕو بۆمان بهێنێ. یا بەکارامایی‌و لێزانانە بچێ بۆناو شارو نەهێڵێ یاساوڵو ناحەزانمان پێمان بزانن، دەبێ زۆر بەنهێنی‌و وریاییەوە بچێ، وابکا کەس پێمان نەزانێ.

لە ئەبو رافیعەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مەیموونەی مارەکرد، دوایی گواستییەوە من لەو ماوەیەدا سازێنەری ئەو خوازبێنی‌و مارەکردن‌و ژنگواستنەوە بووم[١].

پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی بریکاری دیاریکردووە بۆ وەرگرتنەوەی قەرزو بۆ جێبەجێ کردنی حەدە شەرعییەکان‌و شتی تریش[٢].

موسوڵمانان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە دروستە بریکار بگیرێ، بەڵکوو سوننەت‌و کارێکی پەسەندو جەخت لەسەر کراوە. چونکە پرۆسەی بریکارگرتن جۆرێکە لە هاریکاریکردن لەسەر چاکەو تەقوا. چونکە هەموو کەسێك ناتوانێ بۆ خۆی ئیشەکانی جێبەجێ بکاو کارەکانی راپەڕێنێ، کەوابێ پێویستە مرۆڤ هەندێ کاری خۆی بە خەڵکانی تر بسپێرێ، بۆئەوە لەجیاتی ئەو کارەکانی بۆ راپەڕێنن. هەرشتێکیش دروست بێ مرۆڤ بۆ خۆی ئەنجامی بدا دروستە بریکاری بۆ دیاری بکا.

وەکیل ئەمین‌و بڕوا پێکراوە لەوەی وەری دەگرێ‌و خەرجی دەکا هەتا سنوور بەزێنیش نەکا نابێتە زامن‌و بەرعۆدەبوو. چونکە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ ضَمَانَ عَلَى مُؤْتَمَنٍ».[٣]

---

[١] صحيح إسناد (الإرواء/٦/٢٥٢)، أخرجه الدارمي (٣٨/٢)، وأحمد (٦/٣٩٢ - ٣٩٣).

[٢] نمونەی ئەوە فەرمایشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: {أغدُ يا أنيس الى إمرأة هذا فان أعترفت فارجمها}.

[٣] حسن (ص. ج/٧٥١٨).

## كتاب الإيمان والنذور
## نامەی سوێندو نادەکانو فۆتۆکان

سوێند کە بەزمانی عەرەبی بە (یمین) ناوزەد دەکرێو لە بنەماشدا (یمین) بەمانا دەستی راستە، بۆیە ئەو وشەی یەمینەیان بۆ سوێند بەکارهێناوە چونکە عەرەبەکان کە سوێندیان بۆ یەکتری دەخوارد دەستیان دەنایە ناو دەستی یەکتریو جەختی پەیمانەکەیان دەکردەوە.

لە شەرعیشدا سوێند بریتییە لە جەختکردنەوەی شت بەناوهێنانی ناوێکی خودا یان صیفەتێك لە صیفەتەکانی.

سوێند تەنها بەناوێك لە ناوەکانی خودا یان صیفەتێك لە صیفەتەکانی دادەمەزرێ

لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (رەزای خودای لێ بێ) ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئاگای لێ بوو عومەری کوڕی خەتتاب لەگەڵ کۆمەڵێکدا دەڕۆیشت لەناوەندی قسەو باسدا سوێندی بەباوکی دەخوارد، پیغەمبەر پێی فەرموو: «أَلاَ إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ ، مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ ، أَوْ لِيَصْمُتْ».[1] ئاگاداربببنەوە: کە خودا نەهێتان لێ دەکا لەوە کە سوێند بە باوكو باپیرانتان بخۆن، ئەگەر کەسێك ویستی سوێند بخوا با سوێند بەخودا بخوا یان با بێدەنگ بێو سوێند نەخوا.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَزَالُ جَهَنَّمُ تَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ حَتَّى يَضَعَ رَبُّ الْعِزَّةِ فِيهَا قَدَمَهُ فَتَقُولُ قَطْ قَطْ وَعِزَّتِكَ . وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ».[2] دۆزەخ پەیتا پەیتا دەڵێ کوا تاوانبار ماون بخرێنە ناومەوە بابێنو هێشتا پڕنەبووم!!

---

[1] متفق عليه: خ(٦٦٤٦/٥٣٠/١١)، م (١٦٤٦ – ٣/١٢٦٧/٣)، د (٣٢٣٣/٧٧/٩)، ت (١٥٧٣/٤٥/٣).

[2] متفق عليه: خ(٦٦٦١/٥٤٥/١١)، م (٢٨٤٨/٢١٧٨/٤)، ت (٣٣٢٦/٦٥/٥).

ئیتر هەر قۆڕەی خاڵی بوونی دێو هەڵپەی هەڵلوشینی زیاتریەتی هەتا پەروەردگار قاچی دەخاتە ناو، ئیتر دەڵێ بەسمە بەسمە قەسەم بە شکۆمەندیت پڕبوم. ئەمجار دۆزەخ وێکدێتەوە.

## سوێند بەغەیری خودا شیرك‌و کوفرە

لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: ژنەوتم لە پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ».[1] کەسێك سوێند بەغەیری خودا بخوا، ئەوە بێگومان کافردەبێ یان هاوبەشی بۆ خودا داناوە.

لە ئەبو هورەیرە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ حَلَفَ مِنْكُمْ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى . فَلْيَقُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ . وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ تَعَالَ أُقَامِرْكَ ، فَلْيَتَصَدَّقْ».[2] کەسێك سوێندی خوارد لەمیانەی سوێندەکەیدا وتی سوێندم بە (لات) بێ ئەوشتە وایە، یان وانیە، با دوابەدوای ئەوە بڵێ: (لا الـه الا الله). کەسێك بە هاوەڵەکەی گوت وەرە با قومار بکەم لەگەڵتا، با خێرو صەدەقە بکا.

**رەخنەیەك‌و وەڵامەكەی:**

هەندێ کەس پاساو دێننەوە بۆ سوێندخواردنیان بە غەیری خودا بەوە کەترسی ئەوەیان هەیە سوێندەکەیان درۆبێ‌و نایانەوێ ناوی خودا لەگەڵ درۆو دەلەسە تێکەڵ بکەن خوداش بۆ خۆی دەفەرموێ: {وَلاَ تَجْعَلُواْ اللّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ – البقرة/٢٢٤}. وەڵامی ئەو پاساوەی کە پشتی پێ دەبەستێ ئەو ریوایەتەیە: کە میسعەری کوڕی کیدام دەیگێڕێتەوە لە وەبرەی کوڕی

---

[1] صحيح: (ص. ج/٦٢٠٤)، ت (١٥٧٤/٤٥/٣).

[2] متفق عليه: م (١٦٤٧/١٢٦٧/٣)، ن (٧/٧)، د (٣٢٣١/٧٤/٩)، خ (٦٦٥٠/٥٣٦/١١).

عەبدورڕەحمان، دەڵێ: عەبدوڵلا فەرموویەتی: {لأن أحلف بالله كاذباً أحبّ الي من أن أحلف بغيره صادقاً}[١] ئەگەر من بەدرۆ سوێند بەخودا بخۆم لەلام باشترە لەوەی بەڕاست سوێند بەغەیری خودا بخۆم.

مانای ئایەتەکەش {وَلاَ تَجْعَلُواْ اللّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ} وەکوو ئیبنو کەثیر دەفەرموێ‌و لە ئیبنو عەبباسەوە نەقڵ دەکا بەم جۆرەیە: (خودا مەکەنە پەردەو دێو جامە بۆ سوێندەکانتان بڕیارمەدەن، بڵێن: سوێندم خواردوە ئەو کارە خێرە ناکەم، بەڵکوو کەفارەتی سوێندەکەت بدەو کارە خێرەکە ئەنجام بدە).

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: ئیمامی (مەسروق)و شەعبی‌و ئیبراهیمی نەخەعی‌و موجاهیدو طاوس‌و، سەعیدی کوڕی جوبەیرو عطاءو عیکریمەو مەکحول‌و زوهری‌و حەسەن‌و قەتادەو موقاتیلی کوڕی حیبان‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و ضەحاك‌و عەطای خوراسانی‌و (السدی) ئەو ئایەتەیان بەوشێوە تەفسیرەی منیان تەفسیر کرد.

## کەسێك سوێند بخوا بە ئاینێك غەیری ئایینی ئیسلام بەم جۆرە بڵێ جولەکەبم ئەوشتە وایە یان وانیە

لە ثابیتی کوڕی ضەحاکەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ سِوَى الإِسْلاَمِ كَاذِبًا مُتَعَمِّدًا فَهُوَ كَمَا قَالَ».[٢] کەسێك سوێندبخوا بە ئایینێکی جیا لە ئایینی ئیسلام بەم جۆرە بڵێ بچمە سەر دینی جولەکە یان گاور، ئەوشتە وایە یان وانیە

---

[١] صحيح: (الإرواء/٢٥٦٢)، الطبراني في الكبير/٨٩٠٢/٢٠٥/٩.

[٢] متفق عليه: م (١١٠ – ١/١٠٥/١٧٧)، خ (١/٥٣٧/٦٦٥٢)، د (٩/٨٣/٣٢٤٠).

سوێندەکەشی درۆبێ، ئەوە یەکسەر لە ئیسلام وەردەگەڕێو دەچێتە سەر ئەو ئایینە.

لە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدەوە ئەویش لە باوکییەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الإِسْلاَمِ فَإِنْ كَانَ كَاذِبًا فَهُوَ كَمَا قَالَ وَإِنْ كَانَ صَادِقًا لَمْ يَعُدْ إِلَى الإِسْلاَمِ سَالِمًا».[1] کەسێك بڵێ: من لەئایین بێ بەری بم، ئایینم نەمێنێ، ئەوشتە وایە یان وانیە، ئەوکەسە ئەگەر درۆبکا ئەوە چۆنی گوتووە ئاوایە، لە ئیسلام دەردەچێ، خۆ ئەگەر ڕاست بکا وا بەئاسانیو ساغو سەلامەتی ئایینی بۆ ناگەڕێتەوە.

## کەسێك سوێندی بەخودا بۆ خورا دەبێ بڕوای پێ بکاو ڕازی بێ

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوێی لێ بوو پیاوێك سوێندی بەباوکی دەخوارد. فەرمووی: «لاَ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ مَنْ حَلَفَ بِاللَّهِ فَلْيَصْدُقْ وَمَنْ حُلِفَ لَهُ بِاللَّهِ فَلْيَرْضَ وَمَنْ لَمْ يَرْضَ بِاللَّهِ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ».[2] بە باوكو باپیرانتان سوێند مەخۆن، کەسێکیش سوێندی بەخودا خوارد با ڕاست بکاو بەدرۆ سوێند بەخودا مەخۆن، کەسێکیش سوێندی بەخودا بۆ خورا با ڕازی بێو نەڵێ بڕوات پێ ناکەم، کەسێك سوێندی بەخودا بۆ بخورێو ڕازی نەبێ ئەوە لەپیاو چاکانی خودانیە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ رَجُلاً يَسْرِقُ فَقَالَ لَهُ أَسَرَقْتَ

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٥٧٦)، د (٩/٨٥/٣٢٤١)، ن (٧/٦)، جه (١/٦٧٩/٢١٠٠).

[2] صحيح: (ص. جه/١٧٠٨)، جه (١/٦٧٩/٢١٠١).

قَالَ لاَ وَاللّٰهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ. قَالَ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ آمَنْتُ بِاللّٰهِ وَكَذَّبْتُ بَصَرِي». [1] حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم پیاوێکی بینی دزی دەکرد، پێی فەرموو ئەوە دزیت کرد؟ وتی: نە بەوخودایەی هیچ خودای ترنین جگە لەو، دزیم نەکردوە. حەزرەتی عیسا فەرمووی: ئیمانم هەیە بەخوداو چاوم رەشکەو پێشکەی کردوەو درۆی کردوە.

## سوێند دەبێتە سێ جۆر

١- سوێندی لەغوو دانەبەستراو.

٢- سوێندی غەمموس‌و بەدرۆخوراو.

٣- سوێندی دابەستراوو جەخت لەسەر کراو.

سوێندی لەغوو دانەبەستراو: ئەو سوێنددەیە کە کابرا بەسەر دەمیدا دێ‌و مەبەستی نیە وەکوو ئەوە یەکێك بە یەکێك بڵێ بەخوا دەبێ نان بخۆی ئاو بخۆیەوە، مەبەستیشی بەم وشەو رشتەیە سوێندخواردن نیە، ئەم جۆرە سوێندە دانابەسترێ‌و بەسوێند حیساب ناکرێ.

قورئان دەفەرموێ: {لاَّ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِيَ أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ – البقرة/٢٢٥}. پەروەردگار ئێوە ناخاتە بەر لێپرسینەوەو تۆڵە لێ ستاندن بەهۆی سوێندی سەرزارەکی‌و دانەبەستراو. بەڵکوو ئێوە موحاسەبە دەکا لەسەر ئەو سوێندانەتان کە لەناخی دڵتانەوە دێتە دەرو بە جەخت دەیڵێن: یان دەفەرموێ: { لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ – المائده/٨٩}.

---

[1] متفق عليه: خ(٦/٤٧٨/٣٤٤٤)، م (٤/١٨٣٨/٢٣٦٨)، ن (٨/٢٤٩)، جه (١/٦٧٩/٢١٠٢).

لـه خـاتو عائيـشەوە (رەزای خـودای لیٚ بـیٚ) ریوایـەتکراوە، دەفـەرمویٚ: ئایەتی {لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ} دەربارەی قسەی کەسێك نازڵ بووە لەمیانی قسەکردنیدا دەڵیٚ بەڵیٚ (والله)، ناوەڵلا.[1]

## سوێندی بەفتارەدەرو ماڵوێرانکەر (یەمینی غەمموس)

ئـەو سـوێندە بەدرۆیەیـە کـە بەهۆیـەوە مـاف پێـشێل دەکـریٚ. یـان ئـەو سـوێندەیە مەبەسـت تێیـدا فیـسق و خیانەتـە، سـوێندی نـاڕەواو ناحەقـەو یەکێکـە لەتاوانـە گـەورەکان، بۆیـەش نـاونراوە (غـەمموس) ماڵوێرانکـەرو بەفتاردەر چونکە سوێندخۆرەکە بـە قـوڕدا دەباتـە خـوارو مـاڵوێرانی دەکاو دوایی دەیخاتە ناو دۆزەخەوە.

سوێندی غەمموس و بەناحەق لە هەرە تاوانە گەورەکانـەو کـەفارەتی بـۆ نادریٚ، چونکە پەروەردگار دەفەرمویٚ: {وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّـدتُّمُ الأَيْمَـانَ – المائـدة/٨٩}. ئاشکراشـە سـوێندی غـەمموس و ناحـەق و نـاڕەوا دانابەسـتریٚ چونکە سوێندی دابەستراو ئەوەیە بتوانریٚ هەڵبوەشێتەوە، دەی ئـەم حاڵەتـە بۆ سوێندی غەمموس دەستەبەر نابیٚ.

پەروەردگار دەفـەرمویٚ: {وَلاَ تَتَّخِذُواْ أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ فَتَـزِلَّ قَـدَمٌ بَعْـدَ ثُبُوتِهَـا وَتَـذُوقُواْ الْـسُّوءَ بِمَـا صَـدَدتُّمْ عَـن سَـبِيلِ اللّـهِ وَلَكُـمْ عَـذَابٌ عَظِـيمٌ – النحـل/٩٤}. ئـەی خـاوەن بـاوەڕان! سـوێندەکانتان مەکەنـە فـێڵ و تەڵەکـەو هۆکاری هەڵخەڵەتاندنی خەڵك، بۆ ئـەوەی هەڵنەخلیسکێن و لـەڕێگای ڕاسـت و ئیمانـداری لانـەدەن، دوای ئـەوەی دڵتـان لەسـەر ئـایین دامـەزراوە. بـۆ ئـەوەی توشی سزای سەختی خودایی نەبنەوە بەهۆی لەخشتەبردنی خەڵکی. چونکە ئیمانهێنان و ژێوانبوونەوە لێی، خەڵکی هەڵدەنیٚ بۆ دووركەوتنەوە لە ئیسلام

---

[1] صحيح: (ص. د/٢٧٨٩)، خ (١١/٥٤٧/٦٦٦٣).

{وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ} بۆ ئێوه سزای كوشندەو گەورە هەیە ئەگەر عەهدو پەیمانی خۆتان هەڵبوەشێننەوە.

خاوەنی تەفسیری طەبەری لە تەفسیرەكەیدا دەڵێ: مانای ئایەتەكە ئاوایە: نەكەن ئەو سوێندانەتان كە دەیانخۆن وایان لێ بكەن كە وەفا بەعەهدو پەیمانی خۆتان نەكەن بەرامبەر بەو كەسانەی پەیمانتان لەگەڵ بەستوونو بتانەوێ فێڵو غەدر بكەنو سوێندەكەتان بۆیە دەخۆن تا بەرامبەرتان دڵنیا بێ كە ئێوە بۆیان باشنو دڵتان صافە بەرامبەریان وەلحال ئێوە خەیاڵی ئەوەتان هەیە غەدریان لێ بكەن[1].

لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە لە پیغەمبەرەوە ڕیوایەتكراوە، كە فەرموویەتی: «الكبائر: الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ ، وَقَتْلُ النَّفْسِ ، وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ».[2] تاوانە گەورەكان هاوەڵ دانانە بۆ خودا، ئەزیەتدانی دایكو باوكە. كوشتنی ئادەمیزادە بەناحەق. سوێندی غەمموسو ناڕەوایە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «خَمْسٌ لَيْسَ لَهُنَّ كَفَّارَةٌ الشِّرْكُ بِاللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَقَتْلُ النَّفْسِ بِغَيْرِ حَقٍّ أَوْ نَهْبُ مُؤْمِنٍ أَوِ الْفِرَارُ يَوْمَ الزَّحْفِ أَوْ يَمِينٌ صَابِرَةٌ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالاً بِغَيْرِ حَقٍّ».[3] پێنج تاوان كەفارەتیان نییە، هاوەڵ دانان بۆ خودا، كوشتنی ئادەمیزاد بەناحەق، یان تالانكردنی ماڵی موسوڵمان، یان هەڵاتن لەصەفی غەزا لەكاتی هێرش بردندا، یان سوێندی غەمموسو بەدرۆ، كە بەناحەق ماڵی غەیر بۆ خۆیان دابڕن.

---

[1] تەفسیری طەبەری ج١٤/١٦٦.

[2] صحيح: (ص. ج/٤٦٠١)، خ (٦٦٧٥/٥٥٥/١١)، ن (٧/٨٩)، ت (٥٠١٠/٣٠٣/٤).

[3] حسن (ص. ج/٣٢٤٧)، حم (٢٢٠/٦٨/١٤).

## سوێندی دابەستراوو حوکمەکەی

سوێندی دابەستراو ئەو سوێندەیە سوێندخۆر بە مەبەستەوە دەیخوا سووره لەسەری‌و بە جەختەوە ئەدای دەکاو جەخت لەکردنی شتێك یان نەکردنی دەکاتەوە، جا ئەگەر سوێندەکەی بەدرۆ نەبوو وەبەگوێرەی سوێندەکەشی هەڵس‌وکەوتی کرد ئەوە هیچ کەفارەتی لەسەر نیە، خۆ ئەگەر سوێندەکەی لەخۆ خست، دەبێ کەفارەتی سوێندەکەی بدا، چونکە قورئان دەفەرموێ: {وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ – البقرة/٢٢٥} وەڵێ تاوانبارتان دەکاو سزاتان دەدا ئەگەر بەدڵ سوێندەکە بخۆن‌و مەبەستتان لە سوێندخواردنەکە هەبێ - یان دەفەرموێ: {وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ – المائدة/٨٩} بەڵکوو سزاتان دەدا لەسەر سوێندێك کە بە سووربوونەوە جەختی لەسەر بکەنەوەو بڵێن: سوێندم وابێ فلان شت دەکەم یان نایکەم. ئەمە ئەگەر سوێندەکەی لەخۆ خست لێپرسینەوەی لەسەرە.

## دامەزران‌و چۆنیەتی نوێژ بەگوێرەی نیازو نیەتە

لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: لە پیغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ».[1] کردەوەکان بەگوێرەی نیازە، کەسێك سوێند بخوا لەسەر شتێك‌و شتێکی تر لەنیازی‌دا بێ، ئەوە عیبرەت بەنیازەکەیەتی نەك بە لەفظەکەی.

لە سوومیدی کوڕی حەنظەلەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: ڕۆیشتینە دەر نیازمان بوو بچینە خزمەت پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وائیلی کوڕی حوجرمان لەگەڵدا بوو، لە ڕێگا دوژمنەکەی گرتی، خەڵکەکە توشی ئیحراج بوون، کە سوێند بخۆن: کە ئەمە فلان نیەو فلانە، من سوێندم

[1] لەباسی دەستنوێژدا تێپەڕی.

خـوارد، کـه ئەمـه برامـه، ئـیتر کـابرا وازی لێ هێنـا، دوایـی هاتینـه خزمـەت پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) عـەرزم کـرد: کـه خەڵکەکـه ئامـادە نەبوون سووێندەکه بخۆن، مـن سـوێندم خـوارد، کـه ئەمـه برامـه، پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: «صـدقتَ الْمُـسْلِمُ أَخُـو الْمُـسْلِمِ».[1] ڕاستت کردووە موسوڵمان برای موسوڵمانە.

کاتێك ئیعتیبار بـەنیازی سوێندخۆرەکەیه ئەگـەر سـوێند نـەدرێ، داوای سـوێندخواردنی لێ نـەکرێ، ئەگـەر سـوێند دراو داوای سـوێندی لێ کـرا، ئـەوە سوێندەکەی لەسەر نیازی ئەو کەسەیه کە سوێندی دەدا.

له ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «انما الْـيَمِينُ عَلَـى نِيَّـةِ الْمُـسْتَحْلِفِ».[2] سـوێند کـەوتن و نەکەوتنی بەگوێرەی نیازی ئەو کەسەیه داوای سوێندخواردن دەکا.

هەر له ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: «يَمِينُكَ عَلَى مَا يُـصَدِّقُكَ بِـهِ صَـاحِبُكَ».[3] سـوێندەکەت بەو شێوە دەبێ کە هاوەڵەکەت لەنیازیدایە.

کەسێك سوێندی خوارد کە فلانه شت نـەکا، لـەبیری چۆوە یـان بەهەڵـه ئەو کارەی کرد، ئەوە سوێندی لێ ناکەوێ، چونکە قورئان دەفەرموێ: {رَبَّنَـا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا – البقرة/٢٨٦}. ئەی خـودای ئێمـە! سزامان مـەدە لەسـەر شـتێك لـەبیرمان نـەبوو یـان بەهەڵـه لێمـانی ڕودا. لـه فـەرموودەی

[1] صحيح: (ص. جه/١٧٢٢)، جه (١/٦٨٥/٢١١٩)، د (٩/٨٢/٣٢٣٩).

[2] صحيح: (ص. جه/١٧٢٣)، جه (١/٦٨٥/٢١٢٠)، م (١٦٥٣- ٢١/ ٧٣/٢٩٧٤).

[3] صحيح: (ص. جه/١٧٢٤)، م (٣/١٢٧٤)، جه (١/٦٨٦/٢١٢١)، د (٩/٨٠/٣٢٣٨).

پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: کە بەندەکان ئەو پاڕانەوەیە ئەنجام دەدەن پەروەردگار دەفەرموێ: {نعم}[1] بەڵێ باشەو دوعاکەتان گیرایە.

کەسێك سوێندی خواردو وتی: ئینشائەڵڵا، ئەوە چەرت کردنەو سوێندەکەی ناکەوێ.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەت دەکا، کە دەفەرموێ: سولەیمانی کوڕی داود (علیهما السلام) وتی: «لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى سَبْعِينَ امْرَأَةً كُلُّهُنَّ تَأْتِي بِغُلاَمٍ يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ. فَقَالَ لَهُ صَاحِبُهُ أَوِ الْمَلَكُ قُلْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. فَلَمْ يَقُلْ وَنَسِيَ. فَلَمْ تَأْتِ وَاحِدَةٌ مِنْ نِسَائِهِ إِلاَّ وَاحِدَةٌ جَاءَتْ بِشِقِّ غُلاَمٍ». دەبێ من ئەمشەو بچمە لای حەفتا ئافرەت لەخێزانەکانم هەموویان سکیان بێو هەریەکەیان کوڕێکی بێو گەورە بنو ببنە غەزاکەر لە ڕێگای خودادا، هاوەڵەکەی یان فریشتە پێی گوت: بڵێ ئینشائەڵڵا، وای نەگوتو لەبیری چۆوە، هیچ کام لەژنەکانی منداڵیان لەسکی نەکەوتو کەسیان منداڵی نەبوو، جگە لە یەکێکیان منداڵێکی نیوە ناچڵی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَوْ قَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، لَمْ يَحْنَثْ وَكَانَ دَرَكًا فِي حَاجَتِهِ».[2] ئەگەر بیگوتایە ئینشائەڵڵا سوێندەکەی نەدەکەوت هەموو ژنەکانی کوڕیان دەبوونو ئەو کوڕانە بۆی دەبوونە یارمەتیدەرو هاوکار بۆ غەزا.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ حَلَفَ وَاسْتَثْنَى إِنْ شَاءَ رَجَعَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرُ

---

[1] صحيح: (ص. ن/٣٥٨٨)، م (١/١١٥/١٢٥).

[2] متفق عليه: م (٣/١٢٧٥/٢٣/١٦٥٤)، خ (١١/٥٣٤/٦٦٣٩)، ن (٢٥٧).

حَانِثٍ». [١] کەسێك سوێندی خواردو لە سوێندەکەیدا ئیستیثنائی بەکار هێنا، وتی: ئینشائەڵلا. (ئەگەر خودا حەزبکا) ئەوکاتە بەویستی خۆی حەزی لێ بوو ئیشەکە بکا یان نەیکا سوێندی لێ ناکەوێ.

کەسێك سوێندی لەسەر شتێك خواردو دوایی بینی پێچەوانەکەی باشترە، با کارە باشەکەیان بکاو کەفارەتی سوێندەکەشی بدا. [٢]

کەسێك سوێندی خوارد پێچەوانەکەی خێرتر بوو نابێ کابرای سوێندخۆر سور بێ لەسەر سوێندەکەی، پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلاَ تَجْعَلُواْ اللّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصْلِحُواْ بَيْنَ النَّاسِ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ – البقرة/٢٢٤}.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: واتە: خودا مەکەن بە لەمپەڕو سوێندەکەتان بکەن بەهۆکاری نەکردنی خەیر، بەڵکوو کەفارەتی سوێندەکەتان بدەنو کارەخێرەکە بکەن. [٣]

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «وَاللَّهِ لأَنْ يَلَجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ الَّتِي فَرَضَ اللَّهُ». [٤] ئەگەر یەکێك لەئێوە سوێندێکی خوارد پەیوەندی بەماڵو منداڵەکەیەوە هەبوو بەجۆرێك ئەگەر سوێندەکەی لەخۆی نەخاو ماڵو منداڵی زیانیان لێ بکەوێ، پێویستە سوێندەکە لەخۆی بخاو کەفارەتەکەی بدا، خۆ ئەگەر وتی سوێندەکە لەخۆم ناخەم تاوانی سوێند لەخۆ خستن ناخەمە ئەستۆی خۆم، ئەوە هەڵەیەو ئەم هەڵوێستەی پەسەند

---

[١] صحيح: (ص. جه/١٧١١)، جه (٢١٥٠/٦٨٠/١)، د (٣٢٤٥/٨٨/٩)، ن (٧/١٢).

[٢] صحيح: (الإرواء/٢٠٨٤)، م (١٦٥٠ – ١٣/١٢٧٣/٣)، ت (١٥٦٩/٤٣/٣).

[٣] لەوەپێش تێپەڕی.

[٤] متفق عليه: خ (٦٦٢٥/٥١٧/١١)، م (١٦٥٥/١٢٧٦/٣).

نیـه، چـونکه بـەردەوام بـوون لەسـەر پـەیڕەویکردنی سـوێندەکەی‌و زیـان گەیاندن بەماڵ‌و منداڵی تاوانی گەورەترە لەوەی سوێندەکەی بخاو کەفارەتی بـدا، بـەڵام بەمـەرجێ سـوێند لـەخۆ خـستنەکەی سەرنەکێـشێ بـۆ تـاوان‌و گوناحباری.

## کەفارەتی سوێند

کەسێك سوێندی خواردو سوێندەکەی کەوت، کەفارەتەکەی بە یەکێ لـەم سێ شێوە دەبێ.

١- (إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ). پێدانی ژەمێك خواردن بە دە هەژار لە خواردەمەنییەکی مام ناوەندی.

٢- (أَوْ كِسْوَتُهُمْ) یان پۆشاك پێدانیان.

٣- (أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ) یان ئازاد کردنی بەندەیەکی موسوڵمان.

ئەمجار ئەگەر کەسێك لەم سێ جۆرە کەفارەتـە هیـچیانی بـۆ دەستـەبەر نـەبوو ئـەوە کەفارەتـەکـەی بـەرۆژوبوونی سـێ رۆژە، بـەڵام ئەگـەر دەسـەڵاتی بەسەر یەکێ لەو سێ جۆرەی پێشوودا بشکێ نابێ پـەنا بـۆ رۆژوگـرتن بـەرێ. قورئان دەفەرموێ: {لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِـي أَيْمَـانِكُمْ وَلَكِـن يُؤَاخِـذُكُم بِمَـا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِـنْ أَوْسَـطِ مَـا تُطْعِمُـونَ أَهْلِـيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَـةِ أَيَّـامٍ ذَلِـكَ كَفَّـارَةُ أَيْمَـانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ – المائدة/٨٩}: پەروەردگار ناتانگرێ بـەو سـوێندانەی بـەبێ مەبەست، بەسـەر دەم‌و زوبانتانـدا دێ، بـەڵکوو حیـساب‌و لێکۆڵینـەوەتان لەگـەڵ دەکـا لەسـەر ئـەو سـوێندانەی بـە مەبەسـتەوە دەیـانخۆن‌و سـورن لەسـەریان، جـا کەفارەتی سوێند خواردەمەنی دانـە بـە دە هـەژارو بـۆ هـەر یەکـەیان ژەمێـك لەخواردنێکی مام ناوەندی لەوەی دەیدەن بـەخاوخێزانی خۆتـان، یـان پۆشـاك پێـدانیان یـان ئـازادکردنی بەندەیـەکی موسـوڵمان، ئەگـەر ئەمانـە هیـچیان

دەستەبەر نەبوون ئەوە دەبێ سێ ڕۆژ بەڕۆژو بێ، ئەوەیە کەفارەتی سوێندەکانتان.

وا باشە ئەگەر پەنای بۆ ڕۆژوگرتن برد سێ ڕۆژەکان بەسەریەکەوە بگرێ. چونکە بەریوایەتی ڕاستو دروست لە ئوبەیو ئیبنو مەسعودەوە ریوایەتکراوە، کە ئەوان ئەم ئایەتەیان بە {فصيام ثلاثة أيام متتابعات}[1] خوێندۆتەوە ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: ئەم قیرائەتە ئەگەر نەشچەسپێو بە موتەواتەر نەژمێردرێ، ئەوە بەبێ شك لەپلەی خەبەری واحید نایەتە خوارێ، یان کە هیچکە نەبێ تەفسیرو شیکردنەوەی صەحابییە،ئاشکرایە تەفسیرو ڕوونکردنەوەی صەحابی حوکمی حەدیثی مەرفوعیان هەیە.[2]

ئیمامی طەبەری دوای ئەوەی بەڵگەهێنانەوەی بەشێوە خوێندنەوەی ئوبەیو ئیبنو مەسعوود ڕەتکردەوە لەسەر واجیبوونی بەرۆژوبوون یەك لەدوایەك، دەڵێ: وەڵێ من وا بەباشی دەزانم کە بەرۆژوبوونی کابرای سوێند لێ کەوتوو بەشوێن یەکدا بنو نێوانیان نەخا، چونکە هیچ خیلافو ڕاجیایی لەوەدا نیە لەلای زانایانی شەریعەت ئەگەر یەکێك ئەو سێ ڕۆژە بەسەریەکەوە بەرۆژوبوو کەفارەتەکەی تەواوەو کارەکەی بەجێیە بەڵام ڕاجیایی هەیە لەوەدا ئەگەر بەسەر یەکەوە بەرۆژو نەبوو، ئاشکراشە کارێك کە ئیجماعی لەسەر بێ بەلامەوە خۆشەویستترە لەکارەکەی تر کە کۆڕای لەسەر نیە هەرچەندە دروستیش بێ.[3]

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٥٧٨)، جامع البيان/٧/٣٠.

[2] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٢/٩١.

[3] ئیبنو کەثیر ج٢/٩١.

## سوێند خواردن لەسەر شتی حەرام

ئەگەر یەکێك گوتی: لەسەرم حەرام بی خواردن بخۆم، یان لێم حەرام بێ کە بچمە ناو خانووەکەم، ئەوە ئەو شتانەی لێ حەرام نابێ وەلێ ئەگەر خواردنەکەی خوارد یان چووە ناو خانووەکەیەوە دەبێ کەفارەتی سوێند بدا. قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – التحريم/١} ئەی پێغەمبەر! بۆچی شتێك کەخودا بۆی حەلاڵ کردوی لەخۆتی یاساغ دەکەی؟ دەتەوێ ڕەزامەندی خێزانەکانت بەدەست بێنی. پەروەردگار لێخۆشبووە لەتاوانو خاوەنی ڕەحمو سۆزە بۆ بەندەکانی.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای خاتو زەینەبی خێزانی کە: کچی (جەحش) بوو هەنگوینی دەخواردەوەو لای دەمایەوە، ئێمەیش پێمان ناخۆش بوو، لەگەڵ خاتو حەفصەی هەوێسارمدا ڕێککەوتین کە لەوە دوا هاتەلای کاممان پێی بڵێین: ئەوە (مەغافیرت) خواردووە؟ ئەمن بۆنی مەغافیر لەتۆ دەکەم. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ وَلَكِنِّي كُنْتُ أَشْرَبُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ فَلَنْ أَعُودَ لَهُ وَقَدْ حَلَفْتُ لاَ تُخْبِرِي بِذَلِكِ أَحَدًا».[1] نەخەیر مەغافیرم نەخواردووە، وەلێ من هەنگوینم خواردۆتەوە لەلای زەینەبی کچی جەحش، ئیتر جارێکی تر نایخۆمەوە، ئەوە سوێندەو خواردوومە وەلێ ئەمە بەکەس مەڵێ.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: دەربارەی سوێندی حەرام، دەبێ سوێندخۆر سوێندەکەی لەخۆی بخاو کەفارەت بدا (لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة).

---

[1] صحيح: (ص. ن/٣٥٥٣)، خ (٨/٦٥٦/٤٩١٢).

## فۆتوو (نەذر)

نەذر: بريتييە لەوەی شتێك بەواجب بگيرێ لەبەر هۆيەك كە لەوەپێش واجب نەبووبێ.

نەذركردن شتێكی ڕەوايە، قورئان دەفەرموێ: {وَمَا أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ – البقرة/٢٧٠}: ئەوەی دەيبەخشن يان نەذرێك دەكەن لە نەذرەكان، ئەوە خودا ئاگای لێيەتی، يان دەفەرموێ: {ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ – الحج/٢٩}. با حاجيەكان دوای ڕاوەستان لەكێوی عەرەفەو ئەنجامدانی هەندێ كاری تری حەج، چڵك و دزوێنی خۆيان لابەرن، نەذرەكانيان جێبەجێ بكەن، تەوافی بەيتی پيرۆزو كۆن بكەن.

لە لايەكی ترەوە پەروەردگار مەدحی ئەوانەی كردووە كە وەفا بەنەذری خۆيان دەكەن دەفەرموێ: {يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا – الإنسان/٧}: ئەو موسوڵمانە ڕاستاڵانە ئەوانەن كە وەفا بە نەذرەكانيان دەكەن و ترسی ڕۆژێكيان هەيە كەشەڕو ناخۆشييەكانی پەرش بڵاوو سامناك و گورچكبڕن.

لەخاتو عائيشەوە ڕيوايەتكراوە، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموويەتی: «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلاَ يَعْصِهِ».[1] كەسێك لەسەر خۆی پێويست كرد، كە تاعەتی خودا بكا با پابەندی نەذرەكەی بێ و تاعەتی خودا بكا. كەسێك لەسەر خۆی پێويست كرد كە لەخودا ياخی بێ با نەذرەكەی جێبەجێ نەكاو لەخودا ياخی نەبێ.

---

[1] صحيح: (ص. ج/٦٥٦٥)، خ (١١/٥٨١/٦٦٩٦)، د (٩/١١٣/٣٢٦٥)، ت (٣/٤١/١٥٦٤).

له عەبدوڵڵای كوڕی عومـەرەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی نـەذر فـەرمووی: «إِنَّـهُ لاَ يَرُدُّ شَيْئًا ، وَلَكِنَّهُ يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ».[1] نەذر بریتی هیچ ناكەوێ، وەلێ ئەوەندە هەیە بەهۆیەوە لە ڕژدو چروك ماڵو سامان دەردەهێندرێ.

له سەعیدی كوڕی (الحارث)ەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: لـە ئیبنـو عومـەرم بیست دەیفەرموو: ئەوە نەهیتان لێ نەكراوە لە نـەذر كـردن؟ بـۆ واز نـاهێنن، بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ النَّـذْرَ لاَ يُقَـدِّمُ شَيْئًا ، وَلاَ يُؤَخِّرُ ، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِالنَّذْرِ مِنَ الْبَخِيلِ».[2] نەذر هیچی لە بارانیـە نەشتێك پێش دەخا نەدوای دەخا، ئەوەندە هەیە بەهۆی نەذركردنـەوە مـاڵو سامان لە دەستی ڕژدو چروك دەردەهێندرێ.

## نەذرو فۆتۆكەی رەوایەو كەی نادروستە؟

نەذر صەحیحو ڕەوایەو دادەبەسترێ بەمەرجێ خێر بـێ، مەبەسـت پێـی نزیكبوونەوە لە خودا بێ، هەر نـەذرێـك لـەو جۆرە بـێ دەبـێ پێوەی پابەنـد بێو هەوڵی جێبەجێ كردنی بدرێ، ئاماژە بەو فەرموودەیـەی خـاتو عائیـشە ڕیوایەتی كردووە دەفەرموێ: «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّـهَ فَلْيُطِعْـهُ» كەسێك لەسـەر خۆی نەذر كرد كە طاعەتی خودا بكا پێویستە وەفا بەنەذرەكەی بكا.

---

[1] متفق عليه: خ (٦٦٩٣/٥٧٦/١١)، م (١٦٣٩/٢١٠/٣)، د (٣٢٦٣/١٠٩/٩)، ن (٧/١٦).

[2] صـــحيح: (ص. ج/٦٥٦٥)، خ (٦٦٩٦/٥٨١/١١)، د (٣٢٦٥/١١٣/٩)، ت (١٥٦٤/٤١/٣)، ن (٧/١٧)، جه (٢١٢٦/٦٨٧/١).

بەڵام نەذرکردن لەتاوانو سەرپێچی کردنی فەرمانی خودادا ڕەوانیەو نەذرەکەی دانابەستێ، وەڵێ دەبێ کەفارەتی بدا کەفارەتەکەشی کەفارەتی سوێندە.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ نَـذْرَ فِـي مَعْـصِيَةٍ وَكَفَّارَتُـهُ كَفَّـارَةُ يَمِـينٍ».[1] فۆتۆکردن بۆ تاوان دروست نیە، کەسێك لەسەرخۆی نەذرکرد: کە کارێك بکا کارەکە پێچەوانەی یاسای ئیسلام بوو ئەوە نەذرەکەی دروست نیەو دەبێ کەفارەتیشی بداو کەفارەتەکەشی وەکوو کەفارەتی سوێند وایە.

نەذری موباح وەکوو ئەوە لەسەرخۆی نەذر بکا کە بەپێ حەج بکا سواری هیچ نەبێ، یان لەسەرخۆی نەذر کرد کە هەر لەبەر خۆر ڕاوەستێو نەچێتە بەر سێبەر، ئەوە نەذرەکەی دانابەستێو کەفارەتیشی لەسەر نیە.

ئەبو هورەیرە ڕیوایەت دەکاو دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا کابرایەکی پیری بینی دەڕۆی، دوو کوڕی چوبوونە ژێر باڵییەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم پیرە مێردە بۆ وا دەڕواو کاری چیە؟ کوڕەکانی عەرزیان کرد قوربان ئەوە لەسەر خۆی نەذر کردووە بەپیادە بچێ بۆ حەج، پێی فەرموو: «ارْكَبْ أَيُّهَا الشَّيْخُ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكَ وَعَـنْ نَـذْرِكَ».[2] ئەی پیرەمێرد سواری وڵاخ بە بەسواری بڕۆ بۆ حەج، بێگومان خودا هیچ پێویستی بەوە نیە تۆ ئاوا حەجیماڵی بکەیو داوای لێ نەکردووی بەو جۆرە حەج بکەی.

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٥٩٠)، د (٣٢٦٧/١١٥/٩)، ت (١٥٦٢/٤٠/٣)، ن (٧/٢٦).

[2] صحيح: (مختصر م/١٠٠٥)، م (١٦٤٣/١٢٦٤/٣).

له ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مەککەدا بەلای پیاوێکدا تێپەڕی لەبەر خۆر ڕاوەستا بوو، فەرمووی: {ما هذا؟} ئەوە چیە بۆ ڕاوەستاوی؟ عەرزیان کرد ئەم کابرایە لەسەر خۆی نەذر کردووە کە بەرۆژو بێ و لەبەر خۆر ڕابوەستێ و نەچێتە ژێر سێبەرو لەگەڵ کەسیش قسە نەکا، ئیتر ئاوا بەو شێوە لە بەیانییەوە تا ئێوارە لەبەر خۆر رادەوەستێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ».[1] با قسە بکاو بیشچێتە بەر سێبەرو دابنیشێ و ڕۆژووەکەشی تەواو بکا.

کەسێك طاعەت و فەرمانبەرداریيەکی لەسەر خۆی نەذرکردو دوایی نەیتوانی ئەو نەذرە جێبەجێ بکا، ئەوە دەبی کەفارەتی سوێندێك بدا.

له عوقبەی کوڕی عامیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ».[2] کەفارەتی نەذر وەکوو کەفارەتی سوێند وایە.

کەسێك نەذرێکی لەسەرخۆی فەرز کرد، دوایی پێش جێبەجێ کردنی نەذرەکەی مرد، ئەوە دەبێ وەلی و میراتگرەکانی بۆی جێبەجێ بکەن.

له ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد دەربارەی نەذرێك کە لەئەستۆی دایکیدا بووەو پێش ئەوەی نەذرەکەی جێبەجێ بکا لەدونیا

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٥٩١)، خ (٢٧٦/٤)، د (٣٣٠٠).

[2] صحيح: (ص. ج/٤٤٨٨)، م (٣/١٦٤٥/١٦٤٥)، ن (٧/٢٦).

دەرچووە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «فَاقْضِهِ عَنْهَا».[1] ئەتۆ لەجیاتی دایکت نەذرەکەی جێبەجێ بکە.

## باسی خۆراکەکان (كتاب الأطعمة)

خۆراك: ئەوەیە ئادەمیزاد دەیخواو دەبێتە بژێوی‌و ژیانی پێی بەردەوام دەبێ. لەبنەڕەتدا هەموو خواردنێك حەلاڵ‌و ڕەوایە مەگەر دەقێك هەبێ چەرتی بکا.

قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي الأَرْضِ حَلاَلاً طَيِّباً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ – البقرة/١٦٨} ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە؛ بخۆن‌و بخۆنەوە لەوەی لەزەویدا بۆ ئێوە فەراهەم هێنراوە، حەلاڵ‌و پاك‌و خاوێنە.

یان دەفەرموێ: {يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ. قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ – الأعراف/٣١-٣٢}. ئەی ئادەمیزادینە! بەرگ‌و پۆشاکی جوان‌و ڕازاوە بپۆشن بەتایبەتی کە دەچن بۆ مزگەوت هەر مزگەوتێك بێ، بخۆن‌و بخۆنەوە، وەڵێ زێدەڕەوی مەکەن. ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بەو خەڵکە بڵێ کێ ئەو شتە جوان‌و ڕازاوانەی یاساغ کردووە، کە پەروەردگار بەڕەحم‌و فەضلی خۆی بۆ بەندەکانی خۆی فەراهەمی هێناون، هەروا ئەو رزق‌و ڕۆژییە پاك‌و خاوێنەی خودا بۆ بەندەکانی هێناوەتە دی.

هیچ خواردەمەنی‌و خۆراکێك حەرام نیە جگە لەو خواردنانەی خودا لە قورئانی پیرۆزدا یان لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکەی رونی کردۆتەوە

---

[1] متفق عليه: م (١٦٣٨/١٢٦٠/٣)، وهذا الفظه خ (١٦٩٨/٥٨٣/١١)، د (٣٢٨٣/١٣٤/٩).

کەحەرامن، حەرامکردنی ئەو خواردنانەی خودا حەرامی نەکردوون درۆ هەڵبەستنە بەدەم خوداوە.

قورئان دەفەرموێ: {قُلْ أَرَأَيْتُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلاَلاً قُلْ آللّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللّهِ تَفْتَرُونَ. وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَشْكُرُونَ – یونس/٥٩-٦٠}. ئەی پێغەمبەر بەو بێ بڕوایانە بڵێ: ئێوە بیروڕاتان دەربارەی ئەو رزق و رۆژییەی خودا بۆی ناردونە خوارێ، کەچی بەئیزن و شەرعی خودا هەندێکتان حەرام کردووە هەندێکتان بە حەلاڵ داناوە. ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئایا خودا ئیزنی داون: کە هەندێك لەو رزق و رۆژییە بە حەلاڵ بزانن و هەندێکی حەرام بکەن؟ یان ئێوە درۆی بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن. ئەوانە: کەدرۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن دەبێ گومانیان چۆن بێ؟ دەبێ بەخەیاڵی خۆیان رۆژی قیامەت بەچ شێوەیەك هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکرێ؟ بێگومان خودا خاوەنی فەضل و بەخششی زۆر و زەبەندەیە بەسەر ئادەمیزاداندا، ولێ زوربەی زۆری ئەو خەڵکە سوپاسی ئەم هەموو نیعمەتانەی خودا ناکەن.

یان دەفەرموێ: {وَلاَ تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَـذَا حَلاَلٌ وَهَـذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ لاَ يُفْلِحُونَ. مَتَاعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ – النحل/١١٦-١١٧} هەروا بەهەوانتەو قسەی بێ بنەماو نەزانی شت حەلاڵ و حەرام مەکەن، نەچن شەریعەتی خودا پاشگوێ بخەن و لەخۆتانەوە بڵێن: ئەوە حەلاڵەو ئەوە حەرامەو لە ئاکاما ئەو حەرامکردن و حەلاڵکردنە پاڵ خودا بدەن و ئیفتیرا بەدەم خوداوە بکەن، بێگومان ئەوانەی درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن سەرکەوتوو نابن، ژیانێکی

كورت‌و بڕه كالآیه‌كی دونیاییان چنگ ده‌كه‌وێ، به‌لآم له‌قیامه‌تدا سزای به‌ئێشیان بۆ دانراوه‌.

## ئه‌و خواردنانه‌ی حه‌رامن

قورئان ده‌فه‌رموێ: {وَمَا لَكُمْ أَلاَّ تَأْكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلاَّ مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ – الأنعام/١١٩} چیه بۆ ئێوه له‌گۆشتی ئه‌و كوشتیانه ناخۆن كه‌ناوی خودای له‌سه‌ر هێنراوه‌، خودا ئه‌و شتانه‌ی له‌سه‌رتان حه‌رام كراوه بۆی شیكردونه‌وه‌و نابێ توخنیان بكه‌ون، مه‌گه‌ر ناچاربن‌و شتی حه‌لآلتان ده‌ست نه‌كه‌وێ، ئه‌وكاته به ئه‌ندازه‌ی پێویست ده‌توانن له‌و خواردنه حه‌رام كراوانه بخۆن.

بێگومان په‌روه‌ردگار ئه‌و خواردنانه‌ی لێمان یاساغه به‌ته‌واوی بۆ روون كردینه‌وه‌و هیچ ته‌م‌و مژی تێدا نه‌هێشتۆته‌وه‌. په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ – المائدة/٣}. حه‌رامه له‌سه‌ر ئێوه مرداره‌وه بوو خوێن‌و گۆشتی به‌رازو هه‌ر كوشتیه‌ك ناوی غه‌یری خودای له‌سه‌ر گوترابێ، ئاژه‌ڵی خنكاو به‌هه‌ر جۆرێك خنكا بێ، ئه‌و ئاژه‌ڵه‌ی به‌شتی كوشنده زه‌بری لێ درابێ‌و به‌و هۆیه گیانی ده‌رچوو بێ، هه‌ر ئاژه‌ڵێك هه‌ڵدێرابێ‌و گیانی ده‌رچوو بێ، هه‌ر ئاژه‌ڵێك به‌شه‌ڕه قۆچ گیانی ده‌رچوو بێ، هه‌روا ئاژه‌ڵێك درنده برینداری بكا یان هه‌ندێكی لێ بخواو به‌و هۆیه‌وه گیانی ده‌رچوو بێ مه‌گه‌ر ئه‌و جۆره ئاژه‌لآنه‌ی باسكران به‌زیندوویی فریایان بكه‌ون‌و سه‌ریان ببڕن، هه‌روا حه‌رامه گۆشتی ئه‌و كوشتیانه‌ی له‌سه‌ر (نصب) سه‌رده‌بڕێن. (نصب: ئه‌و به‌رده تایبه‌تیانه بوون به‌ده‌وری كه‌عبه‌وه بوون عه‌ره‌به‌كان له‌سه‌رده‌می نه‌زانیدا قوربانیان بۆ بته‌كانیان له‌سه‌ر سه‌رده‌بڕین)

هەروا حەرامە لێتان بەختگرتنەوەو ڕەمڵ هاویشتن بەهۆی تیرە دارینەوە. هەموو ئەو شتانەی باسکران پێویستە خۆیان لێ بپارێزن چونکە دەرچوونە لەسنوری خوداو سەرپێچیکردنی فەرمانەکانیەتی.

هەروەها دەفەرموێ: {وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ – الأنعام/١٢١}. ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! گۆشتی ئاژەڵێك مەخۆن: کە مردار بووبێتەوەو سەرنەبڕدرا بێ، یان سەربڕدرا بێو ناوی خودای لەسەر نەهێندرابێ یان بۆ غەیری خودا سەبڕدرا بێ.. بێگومان حەیوان سەربڕین بۆ غەیری خوداو خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو لەخودا یاخی بوونەو تاوانە.

هەروەها دەفەرموێ: {قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ – الأنعام/١٤٥}. ئەی موحەممەد! بەو مەردومگەلە بڵێ: من لەو سروشەی بۆم نێردراوە کە قورئانی پیرۆزە، شتێکی تێدا نابینم: کە بۆ بخۆر حەرام بێ مەگەر مردارەوەبوو بێ، یان خوێنێکی شلی ڕەوان، نەك خوێنی توندی تۆپەڵ بەستوو؛ وەکوو جەرگو سپڵ. یان گۆشتی بەراز، بێگومان ئەوە پیسە، یان سەربڕاوێك بێ ناوی غەیری خودای لەسەر برابێ.

هەروەها دەفەرموێ: {وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا – المائدة/٩٦}. یاساغە لەسەر ئێوە نێچیری کێوی هەتا لە ئیحرامدا بن، هەتا لەپۆشاکی ئیحرامدا بن نابێ نێچیر بگرێو گۆشتی بخوا.

هەر پارچە گۆشتێك لە ئاژەڵی زیندو ببڕدرێ خواردنو بەکارهێنانی وەکوو مرداراوەبوو حەرامەو حوکمی ئەوی هەیە، ئاماژە بە حەدیثی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئەبو واحید ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ

وَهِيَ حَيَّةٌ فَهِيَ مَيْتَةٌ».[1] ئەوەی ببڕدرێ لە ئاژەڵ و گیانلەبەری گۆشت خوراو لەو کاتەدا ئاژەڵەکە زیندو بێ ئەو پارچەیەی لێی براوە حەرامە.

ئەو گیانلەبەرانەی بەبێ سەربڕین حەلاڵن یان ئەو خوێنەی خواردنی حەلاڵە؟ ئەمانەن کە لەم حەدیثەی دوایی‌دا ئاماژەیان پێ دەکرێ.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ وَأَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ».[2] دوو مرداروە بووەکان ماسی و کولەیە دوو خوێنە حەلاڵەکانیش جەرگ و سپڵە.

## حەرامکردنی گۆشتی کەرەکێوی

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەری خودا یەکێك هاتە خزمەتی وتی هەموو کەرە کێوییەکان سەر بڕاون و خوران، پاشان یەکێکی تر هاتە خزمەتی وتی: کەرە کێوییەکان هەموو خوران، پاشان یەکێکی تر هاتە خزمەتی وتی کەرە کێوی قەلاچۆکران و هیچیان نەهێشتن هەموو سەربڕان و خوران. ئیتر پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بانگدەرێك بانگی هەڵدا بەناو خەڵکدا (إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ ، فَإِنَّهَا رِجْسٌ). بێگومان خوداو پێغەمبەرەکەی نەهیتان لێ دەکەن لە خواردنی گۆشتی کەرەکێوی، توخنی مەکەون چونکە پیسن، ئیتر ئەو دیزەو مەنجەلانەی گۆشتی کەرەکێوییان تێدا دەکوڵێندرا

---

[1] صحيح: (ص. جه/٢٦٠٦)، جه (٢/١٠٧٢/٣٢١٦).

[2] صحيح: (ص. ج/٢١٠)، (الصحيحة/١١١٨).

سەرونقون کرانەوە لەوکاتەدا مەنجەڵو دیزەکان لێوان لێوبوون لە گۆشتو لرفەیان دەهات.[1]

## خواردنی گۆشتی هەر دڕندەیەکی کەڵبەدارو هەر باڵندەیەکی چنگو نینۆك تیژ حەرامە

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرمویٚ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لەخواردنی گۆشتی هەر دڕندەیەك کەڵبەداربێ هەروا لەخواردنی گۆشتی هەر باڵندەیەکی چنگو نینۆك تیژ بێ.[2]

گۆشتی مانگاو مریشكو قەلو قازی پیسی خۆر حەرامە. ئەم پیسخۆرانە بە عەرەبی پێیان دەگوترێ (جلالە)، ئەمەش بەو گیانلەبەرەماڵیانە دەگوترێ کە زوربەی عەلەفیان شتی پیس بێ. ئەم جۆرە گیانلەبەرە پیسخۆرانە گۆشتیان حەرامە شیریان حەرامە، سواربونیان حەرامە.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرمویٚ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لە حوشتری پیسخۆر کە سواری ببن یان شیرەکەی بخورێتەوە.[3]

## کەی ئاژەڵی پیسخۆر گۆشتو شیری حەڵاڵ دەبێ[4]

هەرکاتێ ئاژەڵو گیانلەبەری پیس خۆر مەنع کرا لەخواردنی پیس بۆماوەی سێ ڕۆژ دروستە سەر ببڕێو گۆشتی بخورێ.

---

[1] متفق علیه: خ(٥٥٢٨/٦٥٣/٩)، م(١٩٤٠-٣٥-/١٥٤٠/٣).

[2] صحیح: (مختصر م/١٣٣٢)، م(١٩٣٤/١٥٣٤/٣)، د(٣٧٨٥/٣٧٧/١٠)، ن(٢٠٩/٧).

[3] صحیح: (ص.جة/٢٥٨٢)، جة(٣١٨٩/١٠٦٤/٢)، د(٣٧٦٧/٢٥٨/١٠).

[4] حسن صحیح: (ص.د/٣٢١٧)، د(٣٧٦٩/٢٦٠/١٠).

له ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە: کە سێ ڕۆژ مریشکی پیسخۆری بەنددەکرد.[1]

## هەر خواردنێك حەرام بێ لەكاتی ناچاریدا حەڵاڵ دەبێ

قورئان دەفەرموێ: {فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – البقرة/١٧٣}. واتە کەسێك نەبوونیو برسیایەتی تەنگی پێ هەڵچنیو خواردنی حەڵاڵی دەست نەكەوت، بۆی حەڵاڵە بەبێ زێدەڕۆیی پەنا بۆ خواردنی حەرام بەرێ بێگومان خودا لێبخۆشبوو بە بەزەییە.

ئیبنو کەثیر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: کەسێك ناچاربوو بۆ خواردنی شتێك لەم خواردنە حەرامە، پێویستیو ناچاری پاڵی پێوەنا کەشتێك لەم خواردنانە بەکاربێنێ ئەوە بۆی ڕەوایەو پێی تاوانبار نابێت، خودا لێخۆشبوو بە بەزەییە، پەروەردگار دەزانێ بەندەی ئاتاجی چی پێویستەو چەند ناچارە بۆ پەنا بردن بۆ ئەو خواردنانە بۆیە چاوپۆشی لێ دەکاو لێی خۆش دەبێ.

لە (المسند)و (صەحیحی ئیبنو حیبان)دا فەرموودەیەك بە مەرفووعی لە ئیمامی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ اللّٰـهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ».[2] دڵنیابن خودا پێی خۆشە کە روخصەتەکانی وەربگیرێنو پەیڕەوییان بکرێ وەکوو چۆن پێی ناخۆشە ئەو شتانەی یاساغی کردوون پرکێشییان بکرێ.

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٥٠٤) ابن ابي شيبة (٤٦٦٠/١٤٧/٨).

[2] صحيح: (ص. ج/١٨٨٦)، حم (١٠٨/٢)، الإرواء (٥٦٤/٩/٣).

بۆیە شەرعزانەکان فەرموویانە: وادەبێ خواردنو بەکارهێنانی گۆشتی مردارەوە بوو واجبەو دەبێ بیخوا، ئەمە ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو لەبرسا بمرێو هیچیشی دەست نەکەوت جگە لە مردارەوە بوو. وادەبێ خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو سوننەتە، وایش دەبێ موباحە واتە بەگوێرەی حاڵو وەزعی مرۆڤەکەو ئەندازەی پێویستیو ئاتاجی، حوکمەکە دەگۆڕێ، ئەمجار زاناکانی شەرع کەوتوونەتە راجیاییەوە، لەوەدا ئاخۆ مرۆڤە ناچارەکە ئەوەندە لەشتە حەرامەکە بخوا نەمرێو سەددی رەمەقی بکا، یان بۆی هەیە خۆی لێ تێرو مڕ بکاو لێیشی پەزمەندە بکا؟ هەریەکەیان رایەکی پەسەند کردووە، لەکۆتاییدا ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: مەرج نیە بۆ ئەوەی خواردنو بەکارهێنانی گۆشتی مردارەوە بوو حەڵاڵ بێ سێ رۆژ هیچی دەست نەکەوێ بیخوا، وەکوو هەندێ لەعەوامو ناشارەزا لەشەریعەت ئەوەیان بەمەرج داناوە، بەڵکوو راستی ئەوەیە هەرکاتێك برسیایەتیو ئاتاجی ناچاری کرد بۆی ڕەوایە پەنا بۆ خواردنی حەرام بەرێ.

## سەربڕینی شەرعی (الذكاة الشرعية)

(الذكاة) کە وشەیەکی عەرەبییە لەبنەمادا بەمانا پاك کردنەوەیە، سەربڕینی ئاژەڵ ناونراوە بە (ذكاة) چونکە شەرع کردویەتی بەمەرجو هۆکاری حەڵاڵبوونی گۆشتی سەربڕاوەکە. مەبەستیش بە وشەی (ذكاة) سەربڕینی ئاژەڵ یان لەملدانیەتی، چونکە ئەو ئاژەڵەی گۆشتی حەڵاڵە بەبێ سەربڕین دروست نیە هیچی لێ بخورێ جگە لەماسیو کوللە ئەمانە سەربڕینیان ناوێ.

## هەر ئاژەڵێك موسوڵمان یان ئەهلی کیتاب (جولەکەو مەسیحی) سەری ببڕن خواردنی حەڵاڵە

قورئان دەفەرموێ: {وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ – المائدة/٥} خواردنی ئەوانەی خاوەن نامەی ئاسمانین بۆ ئێوە حەڵاڵە.

بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا: کە دەفەرموێ: مەبەست بە (طعام) لە ئایەتەکەدا گوشتی یە کانیانە.[1]

لە کەعبی کوڕی مالیکەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: ئافرەتێك مەڕێکی بە بەردی تیژ سەربڕی بوو، پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاخۆ گۆشتی ئەو مەڕە حەڵاڵە خواردنی؟ فەرمانی کرد بەحەڵاڵی و فەرمووی ئا حەڵاڵەو بیخۆن.[2]

## دروستە سەربڕینی ئاژەڵ بەهەموو ئامێرێکی بڕینەوەو تیژ جگە لەنینۆك و ددان

لە عەبابەی کوڕی ریفاعەوە ئەویش لەباپیریەوە ریوایەتکراوە: کە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە کێردو چەقۆمان نیە ئاژەڵی پێ سەربڕین چی بکەین؟ فەرمووی: « مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ فَكُلْ ، لَيْسَ الظُّفُرَ وَالسِّنَّ ، أَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ ، وَأَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ».[3] هەرچی خوێن بڕژێنێ و ناوی خودای لەسەر بهێندرێ، بەسەربڕینی شەرعی دەژمێردرێ، بەمەرجێ ئەو خوێن ڕژێنەرە نینۆك و ددان نەبن، چونکە نینۆك کێردی حەبەشەییەکانەو دانیش ئێسقانە.

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٥٢٨)، خ (٩/٦٣٦).

[2] صحيح: (الإرواء/٢٥٢٧)، خ (٥٥٠٤/٦٣٢/٩).

[3] متفق عليه: خ (٥٥٠٣/٦٣١/٩)، م (١٩٨٦/١٥٥٨/٣)، د (٢٨٠٤/١٧/٨)، ت (١٥٢٢/٢٥/٣)، ن (٧/٢٢٦)، جه (٣١٧٨/١٠٦١/٢).

له شەدادی کوڕی ئەوسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: دووشتم لە پێغەمبەر بیستووەو لەبەرم کردووە: فەرمووی: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ».[1] پەروەردگار لەسەر هەموو شتێ چاکەکاری نوسیوەو پەسەندی کردووە، گەرەکیەتی هەموو شتێك بە باشی ئەنجام بدرێ، جا ئەگەر ئاژەڵتان کوشت بەشێوەیەکی جوان بیکوژن، ئەگەر سەریشتان بڕین بەجوانی سەربڕینەکە ئەنجام بدەن، با ئەوکەسەی حەیوانەکە سەردەبڕێ کێردەکەی تیژ بکاو کوشتی‌یەکەی بەتیغی کول ئازار نەدا.

## چۆنیەتی سەربڕین

**ئەو گیانلەبەرانەی گۆشتیان حەڵاڵە بخورێ دوو جۆرن:**

١- هەیانە ئادەمیزاد دەتوانێ سەری ببڕێ.

٢- هەیشە ئادەمی ناتوانێ سەری ببڕێ.

ئەوەی دەتواندرێ سەرببڕدرێ، ئەوە سەربڕینەکەی بریتیە لە بڕینی قۆرتەمەی ملی‌و دووڕەگی ئەملاو ئەولای قۆرتەمەی، ئەو حەیوانەی سەربڕینی ناتواندرێ ئەوە سەربڕینی بریتیە لەکوشتنی بەهەر شێوەیەك بێ.

له ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، کە فەرموویەتی: (الذَّكَاةُ فِي الْحَلْقِ وَاللَّبَّةِ). سەربڕین لە بڕینی قۆرتەمەو شاڕەگی ئەملاو ئەولای قۆرتەمەیدا خۆی دەبینێتەوە.

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٥٤٠)، م (١٩٥٥/١٥٤٨/٣)، ت (١٤٣٠/٤٣١/٢)، د (٢٧٩٧/١٠/٨)، ن (٧/٢٢٧)، جه (٣١٧٠/١٠٥٨/٢).

ئیبنو عەبباس‌و ئیبنو عومەرو ئەنەس فەرموویانە ئەگەر حەیوان سەری لەلاشەی جیاکرایەوە، ئیتر بە سەربڕاوی شەرعی دەژمێردرێ.

ئیمامی بوخاری سەرەباسێکی داناوە بەناوی باسێك: دەربارەی ئەو ئاژەڵانەی یاخی دەبن ئەوە وەکوو ئاژەڵی وەحشی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ. ئیبنو مەسعود بەو شێوە فتوای داوە، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (مَا أَعْجَزَكَ مِنَ الْبَهَائِمِ مِمَّا فِي يَدَيْكَ فَهُوَ كَالصَّيْدِ). ئەو ئاژەڵەماڵییەی یاخی ببێ لەژێر کۆنترۆڵی تۆ دەربچێ ئەوە وەکوو نێچیری کێوی وایە.

دەربارەی حوشترێك بکەوێتە بیرێکەوە فتوادراوە چۆنێك بۆت کرا سەری ببڕەو سەربڕینەکەی شەرعیە. ئیمامی عەلی‌و ئیبنو عومەرو خاتو عائیشە ئەم رایەیان درکاندووە.

لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئێمە سبەینێ بەرەنگاری دوژمن دەبینەوە، کێردو چەقۆمان لانیە، ئایا دەتوانین بە قەفەزاژو شتی وا ئاژەڵ سەرببڕین؟ فەرمووی: «أعجل ـأو أرِنْ مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ ، فَكُلُوهُ ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ ، وَسَأُحَدِّثُكَ عَنْ ذَلِكَ ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ». بەسەربڕین گیانی کۆتا پێ بهێنە یان هەناسەی ببڕە، بەهەرشتێك تیژ بێ‌و خوێن بڕژێنێ‌و ناوی خودای لەسەر هاتبێ حەڵاڵە بخورێ‌و بیخۆ، بەمەرجێ ئەو شتە تیژە خوێنڕژێنەرە نینۆك نەبێ، ددان نەبێ چونکە ئێسقانە، نینۆکیش کێردی حەبەشییەکانە.

جا رافیع – گەراوی حەدیثەکەیە – دەڵێ هەندێ حوشترو مەڕی تالانیمان دەست کەوت، حوشترێکیان لێمان یاخی بوو، پیاوێك تیرێکی پێوەناو خستی، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم جۆرە حوشترانە چەموشی‌و یاخی بوونیان هەیە وەکوو یاخی بوونی ئاژەڵی کێوی،

جا ئەگەر ئاژەڵێکی ماڵی ئاوا یاخی بوو دەسەڵاتی سەربڕینی ئاساییتان نەبوو ئاوای لێ بکەن بەتیر برینداری بکەن‌و لە پەل‌و پۆی بخەن بۆ ئەوەی بتوانن سەری ببڕن.[1]

## سەربڕینی بێچوی ئاژەڵ

ئەگەر بێچو لەسکی دایکی هاتەدەرو گیانی تێدا مابوو دەبێ سەرببڕدرێ ئەگەر بەمردویی هاتەدەر ئەوە سەربڕینی دایکەکەی بری سەربڕینی ئەو دەکەوێ.

بیسمیللا کردن لەسەر کوشتی مەرجە بۆ حەڵاڵ بوونی خواردنی، ئەگەر بکوژەکە بە ئەنقەست ناوی خودای لەسەر کوشتی‌یەکە نەهێنا گۆشتی کوشتی‌یەکە حەڵاڵ نابێ.

قورئان دەفەرموێ: {فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كُنتُمْ بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ – الأنعام/١١٨} لەگۆشتی ئەو کوشتیانە بخۆن کەناوی خودایان لەسەر هێندراوە لەکاتی سەربڕینیاندا، یان دەفەرموێ: {وَلا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرْ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ – الأنعام/١٢١} گۆشتی کوشتی‌یەك مەخۆن کە مردار بوبێتەوە، یان لەکاتی سەربڕینی‌دا ناوی خودای لەسەر نەهاتبێ. یان بۆ غەیری خودا سەربڕا بێ، وەکوو ئەو حەیوانانەی موشریکەکان بۆ بتەکانیان سەریان دەبڕین، ئاژەڵ سەربڕین بۆ غەیری خوداو خواردنی گۆشتی ئەو جۆرە کوشتیانە لەخودا یاخی بوون‌و تاوانە. بێگومان شەیاتینی ئادەمیزادو جندۆکە ختوکەی دڵی هاوەڵان‌و دۆستانی خۆیان لەموشریکەکان دەدەن بۆ ئەوەی دەمەدەمێ لەگەڵ پێغەمبەرو هاوەڵانی بکەن دەربارەی خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو کوشتی‌یەك ناوی خودای لەسەر نەهاتبێ یان بۆ غەیری

[1] متفق علیه: خ (٥٥٠٣/٢٤٨٨)، م (١٩٨٦).

خودا سەربڕابێ، ئەگەر ئێوە بەگوێی ئەو موشریکانە بکەن‌و بیروبۆچوونی ئەوانتان بەلاوە پەسەند بێ پێتان وابێ مردارەوە بوو حەڵاڵە، ئەوە ئێوەش وەکوو ئەوان موشریك‌و تاوانبارن.

لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووی: (مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ، فَكُلُوهُ)[1] هەرچی خوێن بڕێژێ‌و ناوی خودای لەسەر بهێندرێ لەگۆشتەکەی بخۆن.

## ڕاوکردنی ئاژەڵی کێوی (الصيد)

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا – المائدة/٢} هەرکاتێ ئیحرامتان شکاند بۆتان ڕەوایە ڕاوی ئاژەڵ بکەن.

یان دەفەرموێ: {يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ – المائدة/٤}. ئەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) موسوڵمانان پرسیارت لێ دەکەن چییان بۆ حەڵاڵە بیخۆن؟ پێیان بڵێ هەر خواردنێك پاك‌و خاوێن بێ حەڵاڵە بۆتان هەروەها حەڵاڵە بۆتان نێچیری سەگ‌و تاژی‌و بازو هەڵۆی تەربییە دادراو، واتە: هەر نێچیرێك ئەو جۆرە دڕندە فێرکراوانە بیگرن خواردنی حەڵاڵە بەمەرجێك ئەو سەگ‌و تاژیانە لەلایەن ئادەمیزادەوە فێری ڕاو کرابن‌و مەشق دادرابن، کەوابێ لەگۆشتی ئەو نێچیرانە بخۆن کە ئەو دڕندە فێرکراوانە بۆ ئێوەی دەگرن، تا کابرای خاوەنی دەگاتە سەری پاسی دەکاو هیچی لێ ناخوا لەکاتی تێبەردانی دڕندە فێرکراوەکەدا ناوی خودا بێنن‌و (بسم الله) بکەن. تەقوای خودا بکەن خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کە دەبنە هۆی سزای خودا، دڵنیابن

[1] لەوەپێش ڕابورد.

خودا رۆژی پەسڵان خێرا حیساب و لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکاو هیچی لێ گوم نابێ.

راوکردنی نێچیری دەریا هەموو کاتێك حەڵاڵە، هەروا نێچیری وشکانی مەگەر لەحاڵەتێکدا راوکەر یان راوبۆکراو لەئیحرامدا بێ. قورئان دەفەرموێ: {أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعاً لَكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُماً – المائدة/٩٦} هەرکەسێك کوشتی و سەربڕاوی حەڵاڵ بێ ئاژەڵی راوکراویشی حەڵاڵە.

ڕاوکردن بەچەند جۆرێك ئەنجام دەدرێ، وادەبێ بەشمشێرو کێردو چەقۆو گوللەو سەرەتیرو شتی وا ئەنجام دەدرێ، وادەبێ بەهۆی تاژی رامکراو بازو هەڵۆی راهێندراو شتی وا ئەنجام دەدرێ، قورئان دەفەرموێ: { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَيَبْلُوَنَّكُمْ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِنْ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ – المائدة/٩٤}: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو موسوڵمانن، دڵنیابن خودا ئێوە بەتاقی دەکاتەوە بەئاسانبوونی راوکردن بۆتان بەجۆرێك لەوکاتەدا کەئێوە لەئیحرامدا بوون، نێچیرەکان ئەوەندە بۆتان بەیدەست بوون و لێتان نزیکبوونەوە کە دەتانتوانی بەدەست بیانگرن یان بە ڕم لێیان بدەن.

یان دەفەرموێ: {وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنْ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمْ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ – المائدة/٤} ئەو گیانلەبەرانەی فێری ڕاویان دەکەن و لەسەر گرتنی نێچیر رایان دەهێنن، بەو شێوەی خودا ئێوەی فێر کردووە بۆ راوکردنی نێچیر ئێوەش رامیان دەکەن و بەوشێوەی دەتانەوێ ئاوا رادەستی ئێوەی دەکەن، جا کەوابوو بخۆن لەگۆشتی ئەو نێچیرانەی ئەو گیانلەبەرە راوکەرانە بۆ ئێوەی دەگرن و رادەستی ئێوەی دەکەن.

مەرجە دەبێ ئەو چەکەی راوی پێ دەکرێ نێچیری پێ دەکوژرێ دەکرێ دەبێ گوللەکەی یان تیژییەکەی بچێتە ناو جەستەی نێچیرەکەو کونی بکا.

هەروا مەرجە بۆ گیانلەبەری دڕندە: کەراوی پێ دەکرێ دەبێ رامکراوو ڕاهێندراو بێ، نابێ بەهیچ جۆرێ لەنێچیرەکەی بخوا، نابێ راوکەرەکە لەگەڵ نێچیرکراوەکەدا هۆکارێکی تر ببینێ کەبۆتە هۆی گرتنی نێچیرەکە؟

ناوهێنانی خودا مەرجە، دەبێ لەوکاتەدا کە چەکەکەی ئاڕاستەی نێچیرەکە دەکا یان گیانلەبەرە دڕندەکەی تێ بەردەدا، ناوی خودا بێنێ (بیسمیللا)ی لەسەر بکا.

له عەدی کوڕی حاتەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد دەربارەی ساتورە کولەیەك یان عەصایەك کە سەرێکی ئاسنی تێخرابێو نێچیری پێ راوبکرێ ئایا گۆشتەکەی حەڵاڵە یان نا؟ فەرمووی: «إِذَا أَصَبْتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ ، فَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَقَتَلَ فَإِنَّهُ وَقِيذٌ ، فَلاَ تَأْكُلْ». ئەگەر بەتیژای ساتورەکە یان بەلاتیژیەکەی عەصاکە نێچیرەکە گیانی لەدەستدا ئەوە گۆشتەکەی حەڵاڵەو بیخۆ، ئەگەر پانەوپان پێی کێشرا ئەوە گۆشتەکەی حەرامەو نێچیرەکە مردارەوە بووەو لێی مەخۆ.

عەدی دەڵێ: عەرزیم کرد ئەگەر سەگی راهێندراوی تێ بەردەم؟ فەرمووی: « إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وَسَمَّيْتَ ، فَكُلْ » ئەگەر سەگە راوکەرەکەت ئاڕاستەی نێچیرەکە کردو ناوی خودات هێناو ئەویش نێچیرەکەی گرت، ئەوە لێی بخۆ، دەڵێ: عەرزیم کرد ئەی ئەگەر سەگە راوکەرەکە لەنێچیرەکەی خوارد حوکمی نێچیرەکە چۆنە؟ فەرمووی: « فَلاَ تَأْكُلْ ، فَإِنَّهُ لَمْ يُمْسِكْ عَلَيْكَ ، إِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ » ئەگەر حاڵەکە بەوجۆرە بوو لەگۆشتەکەی مەخۆو بەمردارەوە بوو دادەنرێ، چونکە ئەوکاتە سەگە راوکەرەکە نێچیرەکەی بۆ تۆ نەگرتووە بەڵکوو بۆخۆی گرتووە، دەڵێ باشە وا ڕێدەکەوێ من سەگەکەی خۆم ئاراستەی نێچیرەکە دەکەم کە دەبینم سەگێکی تری لەگەڵدایە،

فەرمووی: «لاَ تَأْكُلْ ، فَإِنَّكَ إِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى آخَرَ»[1] لەگۆشتی نێچیری ئاوها مەخۆ، چونکە تۆ تەنها بیسمیللات لەسەر ناردنی سەگەراوکەرەکەی خۆت کردووە.

## راوکردن بەسەگی رانەهێندراو

ئەو نێچیرەی سەگو تاژی رانەهێندراوبیگرێ حەڵاڵ نیە مەگەر بەزیندویی فریای بکەویو سەری ببڕێ.

لە ئەبو ثەعلەبەی (الخشنی)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەناو گەڵو نەتەوەیەکی مەسیحیدا دەژین ئایا لەقاپو قاچاغی ئەواندا شت بخۆین؟ هەروەها ئێمە لەناوچەیەکدا دەژین دیاردەی راوو راوشکاری زۆر پێوە دیارە، من بەکەوانەکەم راو دەکەم، جاری وایش دەبێ بەسەگی رامنەکراو راودەکەم، جاری وایش هەیە بەسەگی راهێنراو راودەکەم، دەی پێم بفەرموو گۆشتی ئەم نێچیرانە کامەیان حەڵاڵە؟ فەرمووی: «أَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فَلاَ تَأْكُلُوا فِيهَا ، وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا وَكُلُوا فِيهَا ، وَمَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ فَكُلْ ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ فَكُلْ ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ غَيْرَ مُعَلَّمٍ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ».[2] دەربارەی ئەوەی باست کرد بەنیسبەت ئەهلی کیتاب، ئەگەر قاپو قاچاغی ترتان دەست کەوت ئەوە لەهی ئەواندا شت مەخۆن، ئەگەر جگە لەقاپو قاچاغی ئەهلی کیتاب هیچی ترتان دەست نەکەوت ئەوە بیانشۆنو شتیان تێدا بخۆن، ئەو نێچیرەی بەتیروکەوانت دەیکوژیو ناوی خودات لەسەر هێناوە، ئەوە گۆشتەکەی حەڵاڵەو بیخۆ، ئەو نێچیرەی بەسەگی

---

[1] متفق عليه: خ (٩/٦٠٣/٥٤٧٦)، م (١٩٢٩ – ٣/١٥٢٩/٣)، ن (٧/١٨٣).

[2] متفق عليه: خ (٩/٦٠٤/٥٤٧٨)، م (٣/١٥٣٢/١٩٣٠)، جه (٢/١٠٦٩/٣٢٠٧)، ن (٧/٨١).

راهێندراو راوی دەکەی‌و ناوی خودای لەسەر دەهێنی ئەوە حەلاڵەو لێی بخۆ، ئەوەی بەسەگی رانەهێندراو راوی دەکەی‌و فریای دەکەوی بەزیندوویی سەری دەبڕی بیخۆ.

**نێچیری پێکراو کە بکەوێتە ناو ئاوەوە**

ئەگەر نێچیرە راوکراوەکە کەوتە ناو ئاوەوە گیانی لەدەستدا، خواردنی حەلاڵ نیە، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە عەدی کوڕی حاتەمی فەرموو: «إِذَا رَمَيْتَ سَهْمَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ فَإِنْ وَجَدْتَهُ قَدْ قَتَلَ فَكُلْ إِلاَّ أَنْ تَجِدَهُ قَدْ وَقَعَ فِي مَاءٍ فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي الْمَاءُ قَتَلَهُ أَوْ سَهْمُكَ».[1] ئەگەر تیرت ئاڕاستەی نێچیر کرد ناوی خودا بێنە، جا ئەگەر نێچیرەکەت کوشت ئەوە حەلاڵەو لێی بخۆ، مەگەر نێچیرەکە دوای پێکرانی بکەوێتە ناو ئاوەوەو گیانی دەربچێ، چونکە تۆ نازانی ئاخۆ ئەو نێچیرە بەتیری تۆ کوژراوە یان بەکەوتنە ناو ئاوەکە خنکاوە.

**نێچیری پێکراو ئەگەر دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ نەدۆزرایەوە پاشان دۆزرایەوە**

ئەگەر کەسێك تیرێکی ئاڕاستەی نێچیرکردو پێکای‌و نێچیرەکە گومبوو دووڕۆژ یان سێ ڕۆژ دوایی دۆزرایەوە، ئەگەر گۆشتەکەی بۆنی نەکردبوو خواردنی حەلاڵە.

لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: «إِذَا رَمَيْتَ الصَّيْدَ فَوَجَدْتَهُ بَعْدَ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ ، لَيْسَ بِهِ إِلاَّ أَثَرُ سَهْمِكَ ، فَكُلْ».[2] ئەگەر تیرت بەنێچیرەوە ناو دوای ڕۆژێك یان

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٥٥٦)، م (١٩٢٩/٧/١٥٣١/٣).

[2] صحيح: (مختصر م/١٢٣٩) خ (٥٤٨٤/٦١٠/٩).

دوو رۆژ دۆزیتەوە بێجگە لەشوێن تیری تۆ هیچی تری پێوە نەبوو، ئەوە گۆشتەکەی حەڵاڵەو بیخۆ.

لە ئەبو ئەعلەبەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ فَغَابَ عَنْكَ فَأَدْرَكْتَهُ فَكُلْهُ مَا لَمْ يُنْتِنْ».[1] ئەگەر بەتیرەکەت نێچیرێکت پێکاو نێچیرەکە بە برینداری لێت گوم بوو دوایی دۆزیتەوە گۆشتەکەی حەڵاڵە دەتوانی بیخۆی بەمەرجێ بۆگەن نەبووبێ.

## قوربانی (الأضحية)

قوربانی ئەو ئاژەڵەیە لەڕۆژانی جەژنی قورباندا بەنیازی لەخودا نزیکبوونەوەو بەندایەتی کردن بۆ خودا سەر دەبڕدرێ.

قوربانی لەسەر خاوەن تواناو دارا واجبە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ كَانَ لَهُ سَعَةٌ وَلَمْ يُضَحِّ فَلاَ يَقْرَبَنَّ مُصَلاَّنَا».[2] کەسێك هەیەتی‌و بەتوانایەو دەتوانێ قوربانی بکاو نایکا با نزیك شوێن نوێژی ئێمە نەبێتەوەو نەیە بۆ نوێژی جەژن.

چۆنیەتی بەڵگەی ئەم فەرموودەیە لەسەر واجب بوونی قوربانی ئەوەیە کاتێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی دەکا لەوکەسانەی هەیانەو قوربانی ناکەن، لەنزیکبوونەوە لەشوێنی نوێژ، نیشانەی ئەوەیە ئەرك‌و واجبێکی بەجێ نەهێناوە، کەوابوو سودو فائیدە لەهاتنی بۆ نوێژی جەژن نیە، لەگەڵ نەکردنی ئەو واجبە نوێژی جەژن دروست نیە.

لە میخنەفی کوڕی سولەیمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا لە عەرەفە وەستابووین، فەرمووی: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ عَلَى كُلِّ أَهْلِ

---

[1] صحيح: (مختصر م/١٢٤٢)، م (١٩٣١ – ١٥٣٢/١٠/٣).

[2] حسن (ص. جه/٢٥٣٣)، جه (٢/١٠٤٤/٣١٢٣).

يْتٍ فِي كُلِّ عَامٍ أُضْحِيَةً وَعَتِيرَةً أَتَدْرُونَ مَا الْعَتِيرَةُ».[١] ئەی خەڵکینە! لەسەر هەموو خاوەن ماڵو خێزانێك پێویستە ساڵانە قوربانییەك‌و کوشتییەکی رەجەبانە بکا.

عەتیرە: ئەو کوشتییەیە کە لەناو خەڵکدا بە (رەجەبییە) بەناوبانگە، کوشتی (عەتیرە) دوایی حوکمەکەی سڕاوەتەوە، ئەمەش ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِيرَةَ».[٢]

(فَرَع) بریتیە لەوەی لەسەردەمی نەزانیدا لای عەرەبەکان واباو بوو کەبێچوی یەکەمجاری حوشتر سەربڕن بۆ بتەکانیان، هەندێکیش دەڵێن لەناو عەرەبدا واباو بوو کە هەرکاتێ کابرا حوشترەکانی ببونایە بە سەد حوشتر نوێنگینە حوشترێکی سەردەبڕی بۆ بتەکەی.

ئاشکراشە کە سڕینەوەی حوکمی (عەتیرە) حوکمی قوربانی ناسڕێتەوە.

لە جوندوبی کوڕی سوفیانی (البجلی) ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ڕۆژی جەژنی قوربان لەخزمەت پێغەمبەردا بووم، فەرمووی: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيُعِدْ مَكَانَهَا أُخْرَى ، وَمَنْ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ».[٣] کەسێك پێش ئەنجاندانی نوێژی جەژن قوربانی ئەنجام دابێ، بۆی بەقوربانی حلێب ناکرێ، با لەجیاتی ئەو سەربڕینە ئاژەڵێکی تر سەربڕێ، کەسێکیش قوربانی سەرنەبڕیوە با سەریبڕێ. ئەم فەرموودەیە بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە قوربانی واجبە،

---

[١] حسن (ص. جه/٢٥٣٣)، ت (٣/٣٧/١٥٥٥)، د (٧/٤٨١/٢٧٧١)، جه (٢/١٠٤٥/٣١٢٥).

[٢] متفق عليه: خ (٩/٥٩٦/٥٤٧٣)، م (٣/١٥٦٤/١٩٧٦)، د (٨/٣٢/٢٨١٤)، ت (٣/٣٤/١٥٤٨)، ن (٧/١٦٧).

[٣] متفق عليه: خ (١٠/٢٠/٥٥٦٢)، م (٣/١/١٥٥١/١٩٦٠)، جه (٢/١٠٥٣/٣١٥٢)، ن (٧/٢٢٤).

بەتایبەتی کەفەرمان دەکا بە ئیعادەکردنەوەی قوربانی بۆ کەسێك کەپێش نوێژ، قوربانی کردبێ.

## چی بەکەڵکی قوربانی کردن دێ؟

ئەو ئاژەڵەی بەکەڵکی ئەوە دێ بکرێ بەقوربانی رەشەوڵاخو مەڕو بزنو حوشترە، قورئان دەفەرموێ: { وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكاً لِيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الأَنْعَامِ – الحج/٣٤} بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك نوسوکی قوربانیو نزیکبوونەوە لەخودا بەهۆی سەربڕینی ئاژەڵەوەمان داناوە بۆ ئەوەی ناوی خودا بێننو سوپاسی بکەن لەسەر ئەوەی ئەو ئاژەڵانەی بۆ ژێربار کردوون دەتوانن سودیان لێ وەربگرن. ئەگەر ئاژەڵی قوربانییەکە مەڕ بوو دەبێ ساڵێکی تەمەنی تەواوکردبێ ئەمە بەلای جەماوەری زانایانەوە، وەلێ هەندی فەرموویانە بەرخی شەش مانگە بەکەڵکی قوربانی دێ، ئەگەر ئاژەڵەکە بزن بوو دەبێ تەمەنی لەساڵێك تێپەڕ بووبێو چوبێتە ساڵی دووەمی تەمەنیەوە، ئەگەر رەشەوڵاخ بوو دەبی تەمەنی لەدوو ساڵ تێپەڕ بووبێو چوبێتە ساڵی سێیەمی تەمەنییەوە، ئەگەر حوشتر بوو دەبێ پێنج ساڵ تەواو بکاو بچێتە ساڵی شەشەمەوە.

## حوشترو رەشەوڵاخ بەکەڵکی حەوت کەس دێن

لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چووین بۆ حەج، ئیحرامیمان بەحەج بەستبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردین: کە هەر حەوت کەس لەئێمە هاوبەش بین بۆ فیدیە لەحوشتردا یان لە ڕەشەوڵاخدا.[1]

---

[1] م (١٣١٨ – ٢/٩٥٥/٣٥١).

ئەگەر خەڵكەكە هەژارو كەم دەرامەت بوون، یان حوشتر گران بوون‌و بزن‌و مەڕ هەرزان، دەكرێ بە دە كەس حوشترێك (جزور)ێك بكەن بە فیدیە یان قوربانی.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەرێكدا جەژنی قوربانمان لێ هات، بە دە كەس حوشترێكمان كردە قوربانی بەحەوت كەسیشمان ڕەشەوڵاخێكمان كردە قوربانی.[1]

## مەڕو بزن بۆ قوربانی خۆی دەبیء‌و بۆ خاوو خێزانیشی

لە عەطای كوڕی یەسارەوە ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: پرسیارم لە ئەبو ئەیوبی ئەلئەنصاری كرد ئاخۆ لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) قوربانی كردن چۆن بووە؟ لە وەڵامدا وتی: پیاو لەسەردەمی پێغەمبەردا بۆ خۆی‌و خێزانی مەڕێكی دەكردە قوربانی بۆ خۆیان لێیان دەخوارد بەشی خەڵكی تریشیان دەدا، پاشان خەڵك خۆیان پێ هەڵدەنایەوەو لافو گەزافیان لێ دەدا تا حاڵ بەم حاڵە گەیشت.[2]

## ئەو ئاژەڵانەی بەكەڵكی قوربانی كردن نایەن

لە عوبەیدی كوڕی فەیرۆزەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێ: بە (البراء)ی كوڕی (عازب)م گوت دەربارەی قوربانی پێم بڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لە چ كردو چی بەلاوە پەسەند نەبوو، لە وەڵامدا وتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا دەستی گرتم، دەستم لەدەستی كورتتر بوو

---

[1] صحیح: (ص. جه/٢٥٣٦)، جه (٢/١٠٤٧/٣١٣١)، ت (٢/١٩٤/٩٠٧)، ن (٧/٢٢٢).

[2] صحیح: (ص. جه/٢٥٤٦)، جه (٢/١٠٥١/٣١٤٧)، ت (٣/٣١/١٥٤١).

فەرمووی: «أَرْبَعٌ لاَ تُجْزِئُ فِي الأَضَاحِيِّ الْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ظَلْعُهَا وَالْكَسِيرَةُ الَّتِي لاَ تُنْقِي»: چوار جۆر ئاژەڵ هەن بەکەڵکی قوربانی نایەن، ئاژەڵێك کوێر بێ بەتەواوی، نەخۆشێك نەخۆشییەکەی کاریگەری لەسەر ئاژەڵەکە پەیدا کردبێ، شەلێك بەئاشکرا شەلییەکەی پێوە دیار بێ، ئاژەڵێکی لاوازی وەها مۆخی نەبێ. وتی: من ئەو ئاژەڵەی بڕێ لەگوێی بڕدرابێ بەلامەوە پەسەند نیە بکرێتە قوربانی، فەرمووی: ئەوەی بەلاتەوە پەسەند نیە مەیکە بە قوربانی بەڵام لەخەڵکی حەرام مەکە.[1]

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: زانایانی شەرع کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە: کە ئەو چوار عەیبەی لە حەدیثی (البراء)دا باس کراون دەبنە هۆکاری ئەوە کە هەر ئاژەڵێك یەکێك یان زیاتر لەو عەیبانەی تێدا بێ بەکەڵکی قوربانی نایە، هەروەها هەر عەیبێك کە لەو عەیبە باسکراوانە خراپتر بێ.[2] ئەگەر عەیبێك لەخوار ئەو عەیبانەوە بێ ئەوە نابێتە مانیع، بەڵام ناپەسەندە.

بزنی دانشکاو بەکەڵکی قوربانی نایە، ئاماژە بەو حەدیثەی (البراء)ی کوڕی عازیب ریوایەتی کردووە دەڵێ: خاڵێکم کەپێی دەڵێن: ئەبو بوردە پێش نوێژی جەژن کوشتی سەربڕی، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: «شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ». مەڕەکەی سەرت بڕیوە بڕی قوربانی ناکەوێ، گۆشتێکە بۆ ماڵو منداڵت فەراهەم هێناوە. وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! مەڕێکی ترم هەیە دابەستەیە ئەوە دەکەم بەقوربانی، فەرمووی: «اذْبَحْهَا وَلاَ تَصْلُحُ لِغَيْرِكَ». بڕۆ سەری ببڕە هەر بەکەڵکی ئەوە دێ بیکەیە قوربانی بۆخۆتو بەس. پاشان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ

---

[1] صحيح: (ص. جه/٢٥٣٦)، جه (٢/١٠٤٧/٣١٣١)، ت (٢/١٩٤/٩٠٧)، ن (٧/٢٢٢).

[2] صحيح مسلم بشرح النووي ج١٣/١٢٠.

ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَإِنَّمَا يَذْبَحُ لِنَفْسِهِ ، وَمَنْ ذَبَحَ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَقَدْ تَمَّ نُسُكُهُ ، وَأَصَابَ سُنَّةَ الْمُسْلِمِينَ». [1] کەسێك پێش نوێژ حەیوانی سەربڕی ئەوە قوربانی نیەو گۆشتێکە بۆ ماڵو منداڵی خۆی فەراهەمی هێناوە، کەسێکیش دوای نوێژ کوشتی سەربڕی ئەوە قوربانی کردووە ڕێو ڕەسمی موسوڵمانانی گرتۆتەبەر. لە فەرموودەکەدا کاتی قوربانی دیاری کراوە کە بریتییە لەدوای بەجێهێنانی نوێژی جەژن، کەسێك پێش ئەوکاتە حەیوان سەربڕێ بە قوربانی حسێب ناکرێ.

لە جوبەیری کوڕی موطعیمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «كُلُّ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ ذَبْحٌ». [2] هەموو ڕۆژانی تەشریق: کەسێ ڕۆژی دوای جەژنە بەکەڵکی قوربانی تێدا کردن دێن.

کەسێك ویستی قوربانی بکا نابێ لەسەرەتای مانگی ذیلحیجەوە هیچ شتێ لەمووی خۆی لاببا، نابێ نینۆکی بکا تا دوای ئەنجامدانی قوربانییەکە.

لە ئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا رَأَيْتُمْ هِلاَلَ ذِي الْحِجَّةِ وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ فَلْيُمْسِكْ عَنْ شَعْرِهِ وَأَظْفَارِهِ». [3] هەرکاتێ مانگی ذیلحیجەتان بینیو یەکێك لەئێوە ویستی قوربانی بکا با واز لەسەرتاشینو موڵێکردنەوەی جەستەییو نینۆك کردن بێنێ.

---

[1] متفق عليه: خ (١٠/١٢/٥٥٥٦)، م (٣/١٥٥٢/١٩٦١)، ت (٣/٣٢/١٥٤٤)، د (٧/٥٠٤/٢٧٨٣)، ن (٧/٢٢٢).

[2] صحيح لغيره: حم (٢٧/٣١٦/١٥٦٥١).

[3] م (٣/١٥٦٥/٤١/١٩٧٧)، د (٧/٤٨٩،٤٩٠/٢٧٧٤)، ت (٣/٣٩/١٥٦١) ن (٧/٢١٢/٢١١)، جـه (٢/١٠٥٢/٣١٤٩).

وا باشە ئەو کەسەی قوربانی دەکا بۆخۆی قوربانییەکە سەربڕێ ئەگەر لەسەربڕیندا کارامەو لێزان بوو.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو بەرانی چاو بەکلی کردە قوربانی، بەچاوی خۆم بینیم تەشریفی قاچی خستبووە سەرلاملی بەرانەکانو بیسمیللای کردو ئەڵلاهوئەکبەری کردو سەری بڕین.[1]

ئەگەر قوربانیکەرەکە نەیدەزانی قوربانی باش سەربڕێ دەبێ یەکێك بەکرێ بگرێ لەماڵی حەلاڵی خۆی پارەی بداتێ نەچێ لەجیاتی سەربڕینەکە گۆشت یان پێستەکەی بداتێ.

لە حەزرەتی عەلییەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێکردم، کە سەرەوکاری حوشترە قوربانییەکانی بکەمو گۆشتەکە یان پێستو سەروپێکانیان دابەش بکەم، هیچ لەو گۆشتو پێستە نەدەم بە ئاژەڵ سەربڕەکە، پێشی فەرمووم: کرێی سەربڕینەکانیان لەماڵی تایبەتی خۆم دەدەم.

پەسەندە کە قوربانیکەر لەگۆشتی قوربانییەکەی بخوا، دیاری لێبدا بەخزمو جیرانو دۆستو ناسیاو، بەشی هەژارو نەدارای لێ بدا، ئاماژە بە فەرموودەی پەروەردگار کە دەفەرموێ: {فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ — الحج/٢٨} لەگۆشتی قوربانییەکانتان بخۆنو بەشی هەژارو کەم دەرامەتەکان بدەن. هەروا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «فَكُلُوا وَادَّخِرُوا وَتَصَدَّقُوا». لەگۆشتی قوربانییەکانتان بخۆنو بەشێکی لێ پەزمەندە بکەنو هەندێکیشی لێ بدەن بەهەژاران.

---

[1] متفق علیە: خ (١٠/١٨/٥٥٥٨)، م (٣/١٥٥٦/١٩٦٦).

مەبەستی قوربانیکردن دێتە جێ بەڵێ بەخشینی ئەندازەیەك لەگۆشتەکە، هەرچەندە ئەوەی دەیبەخشێ زۆر باشترە لەوەی کە بۆخۆی بیخوا.

**حەوتم (العقیقه)**

حەوتم ئەو ئاژەڵە ماڵییەیە کە سەردەبڕدرێ بۆ منداڵ، حەوتم پێویستە لەسەر باوك بۆ منداڵی بکا، بۆ کوڕ دوو مەڕی هاوتەمەن بۆ کچ مەڕێك.

لە سەلمانی کوڕی عامیری (الضبی)یەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لەدەمی موبارەکی پێغەمبەرم ژنەوت فەرمووی: «مَعَ الْغُلاَمِ عَقِيقَةٌ ، فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا وَأَمِيطُوا عَنْهُ الأَذَى». [1] بۆ کوڕ حەوتم بکەن بەنیازی سەلامەتی، خوێنی بۆ بکەن، مووی سەری بتاشن.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردین کە بۆ کوڕ دوو مەڕ بکەین بەحەوتم بۆ کچ یەك مەڕ بکەین بە حەوتم. [2]

**کاتی حەوتم کردن ڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی منداڵەکەیە**

لە (الحسن)ەوە لە سەمورەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: «كُلُّ غُلاَمٍ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ وَيُسَمَّى». [3] هەموو کوڕێکی تازە لەدایکبوو پەیوەستو مورتەهەنە بەو حەوتمەی بۆی سەردەبڕدرێ ڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی بۆی سەردەبڕدرێو سەری دەتاشرێ، واباشە مرۆڤ: کە لێی مەعلوم بوو کاتی

---

[1] صحيح: (ص. جه/٢٥٦٢١)، خ (٩/٥٩٠/٥٤٧٢)، د (٨/٤١/٢٨٢٢)، ت (٣/٣٥/١٥٥١).

[2] صحيح: (ص. جه/٢٥٦١)، جه (٢/١٠٥٦/٣١٦٣)، ت (٣/٣٥/١٥٤٩).

[3] صحيح: (ص. ج/٢٥٦٣)، جه (٢/١٠٥٦/٣١٦٥)، د (٨/٣٨/٢٨٢١)، ت (٣/٣٨/١٥٥٩).

خۆی باوکی حەوتمی بۆ نەکردووە، خۆی بۆخۆی حەوتم بکا، چونکە ئەوە چەسپاوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوای ئەوەی کرا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی حەوتمی بۆخۆی کردووە.[1]

ئەوەی پەسەندە بۆ منداڵ بکرێ دوای لەدایکبوونی ئەمانەن

١- مەلاشوی هەڵبدرێتەوە: لە ئەبو موساوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: خودا کوڕێکی پێدایین، بردم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی نا ئیبراهیمو بەخورما مەلاشوی هەڵدایەوەو دوعای بەختەوەریو بەرەکەتی بۆ کردو ئەمجار ڕادەستی خۆمی کردەوە، ئەم کوڕە گەورەترین کوڕی ئەبو موسا بوو.[2]

٢- تاشینی سەری منداڵەکە لەرۆژی حەوتەمی لەدایکبوونیدا ئەمجار کێشانی سەنگی زیوو بەخشینی زیوەکە بە هەژارەکان.

لە ئەلحەسەنی کوڕی سەمورەوە لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتکراوە، کە فەرموویەتی: «كُلُّ غُلَامٍ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ وَيُسَمَّى».[3]

لە ئەبو رافیعەوە ڕیوایەتکراوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەفاطیمەی فەرموو (کاتێك فاطیمە حەسەنی بوو) پێی فەرموو: «احْلِقِي رَأْسَهُ ثُمَّ تَصَدَّقِي بِوَزْنِ شَعْرِهِ مِنْ فِضَّةٍ عَلَى الْمَسَاكِينِ».[4] سەری بتاشە بەکێشی مووەکانی زیو بکە بەخێرو دابەشی بکە.

---

[1] حسن: (س.ص/٢٧٢٦).

[2] متفق عليه: خ (٩/٥٨٧/٥٤٦٧)، وهذا لفظه م (٣/١٦٩٠/٢١٤٥).

[3] لەوەپێش تێپەڕی.

[4] حسن: (الإرواء/١١٧٢)، حم (٦/٣٩٠)، هق (٩/٣٠٤).

٣- رۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی سوننەت بکری، ئامـاژە بەو فەرموودەیەی طەبەرانی لە (المعجم الصغیر)دا لەجابیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر بۆ حەسەن‌و بۆ حوسەینیش رۆژی حەوتەمی لەدایکبوونیان حەوتمی بۆ کردوون‌و سوننەتیشی کردوون.[1]

هەروا ئاماژە بەو فەرموودەیەی طەبەرانی لە (الأوسط)دا ریوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە: کە فەرموویەتی: حەوت شت دەربارەی منداڵی تازە لەدایکبوو سوننەتن لەرۆژی حەوتەمی لەدایکبوونیدا بۆی بکری، ناوی بنری، سوننەت بکری..................

## دابو نەریتی نان خواردن‌و ئاو خواردنەوە

ئادابی خواردن‌و خواردنەوە زۆرن، هەندێکیان ئادابی پێش نانخواردنن، هەندێکیان لەکاتی خواردندان، هەندێکیان دوای نانخواردنن.[2]

## ئادابو ری‌و شوێنی پێش نانخواردن ئەمانەن

١- خواردن‌و خواردنەوەکەی پاك‌و خاوێن بێ لەشتی حەڵاڵ‌و پاك بەدەستیان بێنێ، خۆی بپارێزێ لەخۆراکی حەرام‌و شوبهاوی، ئاماژە بە فەرموودەی پەروەردگار کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ – البقرة/١٧٢}: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو خاوەن بڕوای تۆکمەن، بخۆن‌و بخۆنەوە لەو رزق‌و رۆزییەی بۆمان فەراهەم هێناون... لە ئایەتەکەدا وشەی (طيبات) هاتووە، واتە خۆراکێکی حەڵاڵی وەها کەقێزی لێ نەکرێ‌و بەپیس دانەنرێ.

---

[1] طص (٨٩١/١٣٢/٢)، هق (٨/٣٢٤).

[2] احياء علوم الدين ج٢/٣ — ٨.

٢- دەبێ مەبەستو نیازی لە خورادنو خواردنەوەی بەهێزبوون بێ لەسەر بەتوانایی بۆ خوداپەرستی، بۆ ئەوەی لەسەر خواردنو خواردنەوەشی پاداش وەربگریو خودا لەخۆی ڕازی بکا، خواردنو خواردنەوەی موباح بەهۆی نیازو مەبەستەوە دەبێتە طاعەتو خوداپەرستیو پاداشی لەسەر وەردەگری. کەوابوو مرۆڤی موسوڵمان وا دەڕوانێتە خواردنو خواردنەوە کە وەسیلەو هۆکارن بۆ شتی ترو بۆخۆیان مەبەستو ئامانجو ئاکام نین، مرۆڤی موسوڵمان کە دەخواو دەخواتەوە مەبەستی ئەوەیە جەستەو لاشەی رابگریو بەهێز بێ بتوانێ عیبادەتی خودا بکا ئەو کە شت دەخواو دەخواتەوە مەبەستی خودی خواردنو خواردنەوەکە نیە، بۆیە مرۆڤی موسوڵمان تا برسی نەبێ ناخوا تا تینوی نەبێ ناخواتەوە.

٣- پێش نانخواردن ئەگەر دەستی پاك نەبوون یان دڵنیانەبوو لە خاوێنیان دەبێ بیانشواو پاکیان بکاتەوە.

٤- خواردنەکەی بخاتە سەر سفرەیەك لەسەر زەوی لەپێش دەمی خۆی دابنێ، نەك بیخاتە سەرمێزو تەپڵەك، چونکە ئەو شێوەی پێشوویان خاکی ترەو دورترە لەفیزو تەکەببور، هەم ئامازە بەو قسەیەی ئەنەس کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەت لەسەر مێزو قاپی بچکۆلەدا شتی نەخواردووە.[1]

ئیمامی غەزالی دەفەرموێ: بزانن کەئێمە دەڵێین خواردن لەسەر سفرەو سینی باشترە، ناڵێین خواردن لەسەر مێزو تەپڵەك نەهی لێ کراوە مەکروهە یان حەرامە، چونکە شتێك لەم بارەوە نەچەسپاوە.

٥- بەتەواضوعو هێدیو هێمنی دابنیشێ، وادابنیشێ کە بۆ تەحیات خوێندن دادەنیشێ، یان وادابنیشێ قاچی ڕاستی بەرز بکاتەوەو لەسەر قاچی

---

[1] خ (٩/٥٣٠/٥٣٨٦)، ت (٣/١٦٠/١٨٤٨)، جە (٢/١٠٩٥/٣٢٩٢).

چەپی دابنیشێ وەكوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیكرد، هەروا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە دەفەرموێ: «إنما أَنَا عَبْدٌ آكُلُ كَمَا يَأْكُلُ الْعَبْدُ، وأجلس كما يجلس العبد».[1] ئەمن تەنها بەندەیەكم لە بەندەكانی خودا، وەكوو بەندەیەكی ئاسایی خواردن دەخۆم هەروەكوو چۆن وەكوو بەندەیەكی ئاسایی بۆ كەش‌و فش دادەنیشم.

٦- دەبێ چی بۆ دانرا بیخواو بەوە ڕازی بێ: كەحازرو مەوجودە، نابێ ڕەخنە لەخواردن بگرێ، بەڵكوو ئەگەر لەدەمی خۆش بوو بیخوا، ئەگەر لەدەمی ناخۆش بوو وەلای بنێ، ئاماژە بە فەرموودەی ئەبو هورەیرە كە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەت ڕەخنەی لەخواردن نەگرتووە، ئەگەر حەزی لێ بوایە دەیخوارد، ئەگینا وازی لێ دێناو عەیبی لەخواردنەكە نەدەگرت.[2]

٧- وا باشە خێزان هەموویان لەسەر سفرەكە كۆببنەوەو هەموویان بەیەكەوە نان بخۆن، ئاماژە بەو فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە دەفەرموێ: «فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ».[3] لەدەوری سفرەی نان خواردن كۆببنەوەو ناوی خودای لەسەر بهێنن فەڕو بەرەكەت دەكەوێتە ناو خواردنەكەتانەوە.

---

[1] صحيح: (س. ص/٥٤٤)، ورواه البغوی فی شرح السنة (٢٨٣٩ – ١١/٢٨٧).

[2] متفق عليه: خ (٥٤٠٩/٥٤٧/٩)، م (٢٠٦٤/١٦٣٢/٣)، د (٣٧٤٥/٢٣٧/١٠)، ت (٢١٠٠/٢٥٤/٣)، جه (٣٢٥٩/١٠٨٥/٢).

[3] لەوەپێش ئاماژەی بۆ كراو تەخریج كراوە.

**دابو نەریتی كاتی نانخواردنیش ئەمانەن**

١- نابێ دەسپێشخەری بكا بۆ نان خواردن پەلەبكا لە دەستپێكردنی خواردن، لەكاتێكدا لە مەجلیسەكەداو لەسەر سفرەكەدا كەسانێك هەبن لەخۆی گەورەتر بن بەتەمەنتربن یان لەروی كۆمەلآیەتییەوە لەزۆر خۆیەوە بن، چونكە هەڵپەكردنو دەست پێشخەری كردن بۆ نانخواردن لەسومعەی كەم دەكاتەوە، دەبێتە رێ خۆشكەرە بۆ ئەوەی ئەو كەسە بەچڵێس وەصف بكرێو ئەمەیش جێی رەخنەیە.

شاعیرێك دەڵێ:

إذا مدت الأيدي إلى الزاد لم أكن    بأعجلهم إذ أجشع القوم أعجل

ئەگەر دەست كرا بەنانخواردنو دەست برا بۆ بژێو من نابمە سەردەستەو یەكەم كەسو خێرا دەست بۆ خواردنەكە نابەم، چونكە چڵێس ترین كەس ئەو كەسانەیە كە لەكاتی نانخواردندا هەڵپەبكاو خێرا دەست بەرێ بۆ خواردنەكە.

٢- دەبێ چی بۆ دانرا پێی رازی بێو داوای خواردنی تر نەكا.

٣- دەبێ سەرەتا ناوی خودای لەسەر بێنێو بیسمیللا بكا، چونكە ناوهێنانی خودا لەسەر خواردن فەروبەرەكەتی تێدەخاو شەیتانی لێ دوور دەخاتەوە.

لەخاتو عائیشەوە ریوایەتكراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ فَإِنْ نَسِيَ فِي أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ فِي أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ».[1] هەركاتێك یەكێ لەئێوە خواردنی خوارد با سەرەتا بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ - بەناوی خودا) ئەگەر لەبیری چوو با بڵێ بەناوی خودا لەسەرتاو لەكۆتاییدا.

---

[1] صحيح: (ص. د/٣٢٠٢)، د (١/٢٤١/٣٧٤٩)، ت (٣/١٩٠/١٩٢٠)، جه (١٠٨٢/٣٢٦٤ و ٢/١٠٨٧).

هەر لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، فەرمووی: پێغەمبەری خودا لەگەڵ شەش کەس لەهاوەڵانی خواردنێکیان دەخوارد، عارەبێکی دەشتەکی بەدوو پارو لرفی دا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر ئەو کابرا دەشتەکییە (بیسمیللای) بکردایە خواردنەکە بەشی دەکردن.[1]

لە حوزەیفەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: هەرکاتێ ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی خواردنێک دەبووین، کەسمان دەستی بۆ نەدەبرد هەتا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی بۆ نەبردایەو دەستی بەخواردنی نەکردایە، وارێکەوت جارێ ئێمە لەخزمەتیدا ئامادەی خواردنێک بووین بینیمان کچۆڵەیەک دەتگوت پاڵی پێوە دەنێن پەلاماری خواردنەکەی داو ویستی دەستی تێ بخا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرت نەیهێشت، پاشان عەرەبێکی دەشتەکی هات دەتگوت پاڵی پێوە دەنێن ویستی دەستی بۆ بەرێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرت، ئەمجار فەرمووی: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ أَنْ لاَ يُذْكَرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ جَاءَ بِهَذِهِ الْجَارِيَةِ لِيَسْتَحِلَّ بِهَا فَأَخَذْتُ بِيَدِهَا فَجَاءَ بِهَذَا الأَعْرَابِيِّ لِيَسْتَحِلَّ بِهِ فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ وَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ يَدَهُ فِي يَدِي مَعَ يَدِهَا».[2] لەڕاستیدا شەیتان تەعامی واپێ حەڵاڵو خۆشە کەناوی خودای لەسەر نەهێندرێ، ئەو نەگریسە ئەو کچۆڵەی پاڵ پێوەنا بۆسەر خواردنەکە بۆ ئەوەی بەبێ بیسمیللا لەسەرکردن دەست بەخواردنی بکرێو بۆی حەڵاڵ بێ، منیش دەستی کچۆڵەکەم گرتو نەم هێشت، ئەمجار ئەو کابرا عەرەبەی پاڵنا بۆ ئەوەی بەبێ ناوهێنانی خودا لەسەر نانخواردنەکە دەستی پێ بکرێ، منیش دەستم گرت نەم هێشت، سوێندم

---

[1] صحیح: (ص. ت/١٨٥٨)، ت (١٩٢٠/١٩٠/٣).

[2] م (٢٠١٧/١٥٩٧/٣)، د (٣٧٤٨/٢٢٣٩/٢٤٠/١٠).

بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە دەستی شەیتان لەگەڵ دەستمدا لەدەستی کچۆڵەکەدا بوو.

لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: «إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ فَذَكَرَ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ. وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ. وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ».[1] ئەگەر مرۆڤ چووە ناو ماڵی خۆی، لەکاتی چوونە ژورەوەو کاتی نانخواردن ناوی خودای هێنا، شەیتان هاواری لێ هەڵدەستیو دەڵێ شوێنی حەوانەوەو مانەوەو شێوتان لێرە نیە، بەڵام ئەگەر چووە ماڵەوەو ناوی خودای نەهێنا، شەیتان دەڵێ شوێنی مانەوەتان دۆزییەوە ئەمە جێگای خۆتانە، هەروا ئەگەر لەکاتی نانخواردندا ناوی خودای نەهێنا شەیتان بەتاقمەکەی دەڵێ: شوێنی مانەوەو شێوی شەوتان چنگ کەوتو شانی لێ دادەن، ئەمە جێگای خۆتانە.

٤- دەبێ بەسێ پەنجەی دەستی ڕاستی نان بخواو پاروی بچوك بکاو باش پاروەکانی بجوێ، لەلای خۆیەوەو لە تەنیشتی دەوریو لەگەنی خواردنەکە خواردن هەڵبگرێو دەست نەبا بۆ ناوەڕاستی دەوریو قاپەکە.

لە کەعبی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: من بۆخۆم بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە بەسێ پەنجە نانی دەخوارد، کە لێ دەبووەوە پەنجەکانی دەلێستنەوە.[2]

لە عومەری ئەبو سەلەمەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: من منداڵ بووم لەباوەشی پێغەمبەردا بووم، دەستم بەناو لەگەنی کێشتەکەدا دەهێناو دەبرد،

---

[1] م (٢٠١٨/١٥٩٨/٣)، د (٣٧٤٧/٢٣٩/١٠)، جە (٢٨٨٧/١٢٧٩/٢).

[2] م (٢٠٣٢ – ١٣٢/١٦٠٥/٣)، د (٣٨٣٠/٣٢٧/١٠).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: «يَا غُلاَمُ سَمِّ اللَّهَ ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ».[١] ئەی لاوی خۆشەویست ناوی خودا بێنەو بەدەستی راستت نان بخۆو لەبەردەمتەوە بخۆو دەست بەملاو بەولادا درێژ مەکە، عومەر دەڵێ: لەوەدوا ئیتر من بەوشێوە خواردنم خواردووەو لەو ئامۆژگارییە لام نەداوە.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَأْكُلَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ بِشِمَالِهِ وَلاَ يَشْرَبَنَّ بِهَا فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِهَا».[٢] کەس لەئێوە بەدەستی چەپی نان نەخواو شلەمەنی پی نەخواتەوە، چونکە شەیتان بەدەستی چەپی خواردن دەخواو بەویش دەخواتەوە.

لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پیاوێك لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی چەپی نانی دەخوارد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: «كُلْ بِيَمِينِكَ». بەدەستی ڕاستت خواردنەکە بخۆ، پیاوەکە وتی ناتوانم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ اسْتَطَعْتَ مَا مَنَعَهُ إِلاَّ الْكِبْرُ». یاخوا هەر نەتوانی، لوتبەرزیو تەکەببور وای لێ کردی ئاوا هەڵوێست بنوێنی، سەلەمە کەراوی فەرموودەکەیە، دەڵێ: کابرا لەوەدوا نەیتوانی دەستی ڕاستی بەرز بکاتەوە بۆ دەمی.

---

[١] متفــق عليــه: خ (٩/٥٢١/٥٣٧٦)، م (٣/١٥٩٩/٢٠٢٢)، د (١٠/٢٥١/٣٧٥٩)، ت (١٨٨/١٩١٨ و ٣/١٨٩).

[٢] م (٣/١٥٩٨/٢٠٢٠)، د (١٠/٢٥٠/٣٧٥٨)، ت (٣/١٦٦/١٨٦٠).

له ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ الْبَرَكَةَ تَنْزِلُ وَسَطَ الطَّعَامِ فَكُلُوا مِنْ حَافَتَيْهِ وَلاَ تَأْكُلُوا مِنْ وَسَطِهِ».[1] خێرو فەڕو بەرەکەت دادەبەزێتە ناوەڕاستی دەوری‌و بەلەم‌و لەگەنەکانەوە ئێوە لەقەراخی قاپەکانەوە خواردن هەڵبگرن‌و بیخۆن، دەست مەبەن بۆ ناوەڕاستی قاپەکەی خواردنەکەی تێدایە.

٥- نابێ فو لەخواردنی گەرم بکاو بیەوێ بەفوی دەمی ساردی بکاتەوە، با چاوەڕوان بکا تا خواردنەکە سارد دەبێتەوە.

٦- ئەگەر شتێك لەخواردنەکە کەوتە خوار با وازی لێ نەهێنێ، بەڵکوو هەڵیبگرێتەوەو پاکی بکاتەوەو بیخوا.

له جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَحْضُرُ أَحَدَكُمْ عِنْدَ كُلِّ شَيْءٍ مِنْ شَأْنِهِ حَتَّى يَحْضُرَهُ عِنْدَ طَعَامِهِ فَإِذَا سَقَطَتْ مِنْ أَحَدِكُمُ اللُّقْمَةُ فَلْيُمِطْ مَا كَانَ بِهَا مِنْ أَذًى ثُمَّ لْيَأْكُلْهَا وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ».[2] شەیتان لەهەموو شتێکی ئێوەدا خۆتێهەڵدەقورتێنێ، تەنانەت بۆ نانخواردنی هەریەکێ لەئێوە ئامادە دەبێ، جا کەیەکێك لەئێوە پاروەخواردنێکی لێ کەوتە خوار باتۆزو خۆڵەکەی لێ دوور بخاتەوەو بیخواو وازی لێ نەهێنێ شەیتان بیخوا.

٧- با هاوەڵ‌و هاوسینی‌یەکەی یا میوانەکەی واڵێ بکا بیخاتە حاڵەتی ئیحراجەوەو پێی بڵێ: بخۆو ئیلحاحی لێ بکا، بەڵکوو پێویستە لەسەری بە لەسەرەخۆیی‌و ئەدەبەوە بەشی خۆی بخوا بەبێ شەرمکردن یان شەرم بەسەر خۆدا هێنان، چونکە ئەمە دەبێتە هۆکاری ئیحراج بوون بۆ هاوەڵەکەی یان بۆ

---

[1] م (٢٠٢١/١٥٩٩/٣).

[2] صحیح: (ص. ت/٢٣٨٠)، ت (٢٤٨٦/١٨/٤)، جه (٣٣٤٩/١١١١/٢).

میوانەکەی. هەروەکوو چۆن جۆرە ڕیباو خۆدەرخستنێکی تێدایە ڕیبابازیش حەرامو ناپەسەندە.

٨- بەهێندی بێ لەگەڵ هاوەڵی سەرسینیداو هەوڵ نەدا زۆرینەی خواردنەکە بخوا یان لەهاوەڵەکەی زۆرتر بخوا، بەتایبەتی ئەگەر خواردنەکە کەم بێ. چونکە ئەگەر وا بکا مافی غەیر پێشێل دەکاو حەقی کەسانی دیکە دەخوا.

لە جەبەلەی کوڕی سوحەیمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: ساڵێکی گرانیو قاتو قڕی یەخەی گرتبووین لەگەڵ ئیبنو زوبەیردا هەندێ خورمامان دەست کەوتبوو لەکاتی خورما خواردنماندا ئیبنو عومەر بەلاماندا تێپەڕی، پێی فەرمووین: دوو دوو خورماکان مەخەنە دەمتانەوە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەوە کرد کە مرۆڤ لەکاتی خواردنی خورماو شتی وادا دوو دوو خواردن بخاتە ناودەمی، مەگەر هاوەڵەکەی ئیزنی بدا.[1]

٩- لەکاتی نانخواردندا با سەیری هاوەڵانی نەکاو موراقەبەشیان نەکا، نەوەکوو شەرم بکەن، بەڵکوو پێویستە چاو داخاو سەیری بەردەمی خۆی بکاو نەڕوانێتە ئەملاو ئەولا، سەرە تاسکەیان لێ نەکاو نەبێتە چاودێر بەسەریانەوە چونکە ئەوە دەبێتەوە هۆی ئەوەی ڕقیان لێی ببێتەوە.

١٠- نابێ لەسەر سفرەو سینی نانخواردن کارێکی وابکا هاوەڵانی جاڕز بکا، نەچێ دەستی خۆی بتەکێنێتە ناو قاپی چێشتەکەو زۆر سەری خۆی شۆڕ نەکاتەوە بۆسەر خواردنەکە نەبادا لەدەمیەوە خواردن بکەوێتە ناو خواردنەکەوە، هاوەڵان قێزی لێ بکەنەوە، هەروەها نابێ وشەو ڕستەی وا بڵێ: کەهاوەڵان پێیان ناخۆش بێو بەو هۆیەوە واز لەخواردنەکە بهێنن.

---

[1] خ (٩/٥٦٩/٥٤٤٦).

١١- پێویسته نانخواردنی لەگەڵ هەژاران لەسەر بنەمای خۆنەویستی ئەنجام بدا، لەگەڵ هاوشانی خۆی بەشێوەی کراوەییو شێوە موداعەبەو زەردەخەنە بێ، لەگەڵ خۆی گەورەترو خاوەن پلەو پایە بەئەدەبو حیشمەتەوە بێ.

١٢- واز لەخواردن بێنێ هێشتا حەزی لەخواردنەکە بێ، خۆبپارێزێ لەتێربوونو مڕبوون. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ فَإِنْ كَانَ لاَ مَحَالَةَ فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ».[1] مرۆڤ هیچ کیسەیەکی پڕ نەکردووە خراپتر بێ لەپڕکردنی گەدەی، بەسە بۆ ئادەمیزاد چەند پارویەك پشتی رابگرن، ئەگەر هەر هیچ نەبێ با گەدەی بکا بەسێ بەش بەشێکی بۆ خۆراكو بەشێکی بۆ شلەمەنیو شەرابەکەی بەشێکیشی بۆ هەناسەدانی.

## دابو نەریتی دوای خواردنیش ئەمانەن

١- قاپی خواردنەکە باش بماڵێو هیچی تێدا نەهێڵێ، پەنجەکانیشی بلێسێتەوە.

لە ئەنەسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەخواردنێکی دەخوارد سێ پەنجەکانی خۆی دەلێستنەوەو دەیفەرموو: «إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ فَلْيُمِطْ عَنْهَا الأَذَى وَلْيَأْكُلْهَا وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ». ئەگەر یەکێکتان پاروی لێ کەوتە خوارەوە با پاکی بکاتەوەو بیخواو وازی لێ نەهێنێ ببێتە خۆراکی شەیتان، ئەنەس دەڵێ: فەرمانیشی پێ کردین کە قاپو لەگەنی خواردنەکە باش بماڵین. فەرمووشی: «فَإِنَّكُمْ لاَ

---

[1] صحيح: (ص. ت/٣٢٨٠)، ت (٤/١٨/٢٤٨٦)، جه (٢/١١١١/٣٣٤٩)، ص (٣٢٨/١٣٤٨)، ك (٤/١٢١).

تَدْرُونَ فِي أَيِّ طَعَامِكُمُ الْبَرَكَةُ». [١] چونکە ئێوە نازانن بەرەکەت‌و فەڕ لەکوێی خواردنەکەتاندایە.

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بە لستنەوەی پەنجەکان‌و ڕامالینی خۆراکی ناو قاپ‌و دەوریەکان، فەرمووشی: «فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ فِي أَيِّ طَعَامِكُمُ الْبَرَكَةُ». [٢] ئێوە نازانن بەرەکەت‌و فەڕ لەکوێی خواردنەکەدایە.

٢- سوپاسی خودا بکا لەسەر خواردنەکە.

لە ئەبو ئومامەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەسفرەی خواردنەکەی هەڵدەگرتەوە دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ ، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلاَ مُوَدَّعٍ وَلاَ مُسْتَغْنًى عَنْهُ، رَبَّنَا». [٣] حەمدو سوپاس بۆ خودا، سوپاسی زۆرو هەڵقوڵاو لەناخەوە لەسەر ئەو هەموو نیعمەتە جۆراو جۆرو پاك‌وخاوێن‌و بەرەکەت ئامێزە، سوپاسی نیعمەتەکانی دەکەین‌و سپڵەو پێنەزان نین، خودا نیعمەتی خۆیمانی لێ نەبڕێ، ئێمە هەرگیز لەنیعمەتی خودا بێ ئاتاج نین.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ أَكَلَ طَعَامًا ثُمَّ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا الطَّعَامَ وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ». [٤] کەسێك خواردنێکی نۆش کرد، پاشان بڵێ: سوپاس بۆ ئەو خودایەی رزق‌و ڕۆژی

---

[١] م (٣/١٦٠٧/٢٠٣٤)، ت (٣/١٦٧/١٨٦٣)، د (١٠/٣٢٥/٣٨٢٧).

[٢] م (٣/١٦٠٦/٢٠٣٣).

[٣] خ (٩/٥٨٠/٥٤٥٨)، ت (٥/١٧٠/٣٥٢١)، د (١٠/٣٢٨/٣٨٣١)، جە (١٠٩٢/٣٢٨٤ و ٢/١٠٩٣).

[٤] حسن: (ص. ت/٣٤٥٨)، ت (٥/١٧١/٣٥٢٣)، د (٦٤/٤٠٠٤، ١١/٦٥).

پێدام بەبێ ئەوەی هێزو توانای خۆمی تێدا خەرج کرابێ، ئەوە ئەو کەسە تاوانی رابردوو داهاتووی بەرلێخۆشبوونی خودا دەکەوێ.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ أَطْعَمَهُ اللَّهُ طَعَاماً فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَأَطْعِمْنَا خَيْراً مِنْهُ وَمَنْ سَقَاهُ اللَّهُ لَبَناً فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ».[1] کەسێك خودا خواردنێکی بۆ فەراهەم هێنا بڵێ: خودایە فەڕو بەرەکەت بخەرە خواردنو بژێومانەوە، خواردنی چاکترو زۆرترمان بۆ دەستەبەر بکە. کەسێك خودا شیرو شلەمەنیەکی بۆ فەراهەم هێناو نۆشی کرد با بڵێ: خودایە بەرەکەتو فەڕ بخەرە ناو شیرەمەنیو خواردنەکانمانو بۆمان زیاد بکە.

٣- ئەگەر وارێکەوت لەسەرەتای خواردنو خواردنەوەیدا لەیادی نەبوو ناوی خودا بێنێو (بِسْمِ اللَّهِ) بکا با لەکۆتاییدا ناوی خودا بهێنێو بڵێ: بەناوی خودا لەسەرتاو کۆتاییدا.

لەخاتو عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ فَإِنْ نَسِيَ فِي أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ فِي أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ».[2] ئەگەر یەکێك لەئێوە ویستی دەست بکا بەخواردنی خواردنێك با بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ) ئەگەر لەسەرتاوە لەیادی چوو ناوی خودای نەهێنا با بڵێ (بِسْمِ اللَّهِ) لەسەرەتاو کۆتایی خواردنەکەدا.

---

[1] حسن: (ص. ت/٣٤٥٥)، ت (١٦٩/٣٥٢٠ و ٥/١٧٠)، د (١٩٦/٣٧١٢ و ١٠/١٩٧)، جه (١٠٨٦/٣٣٦٤ و ٢/١٠٨٧).

[2] صحيح: (ص. د/٣٢٠٢)، د (٢٤٠/٣٧٤٩ و ١٠/٢٤١)، ت (٣/١٩٠/١٩٢٠).

٤- ئەگەر كەسێك لەسەر سفرەو خوانی كەسانێكی تر نانی خوارد (خواردنێكی نۆش كرد) با دوعایان بۆ بكا خودا بەرەكەت بخاتە رزق‌و رۆزییانەوە.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلای سەعدی كوڕی عوبادە، ئەویش نان‌و زەیتی خستە بەردەمی‌و پێشكەشی كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی خوارد، پاشان فەرمووی: «أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلَائِكَةُ». ڕۆژووەوانەكان لەسەر خوانی ئێوە ڕۆژوویان شكاند، پیاوچاكان تەعامی ئێوەیان خوارد فریشتە داوای لێخۆشبوون لەتاوانیان بۆ ئێوە كرد.

٥- وا باشە دوای نان خواردن كابرا بەدەستەسڕێك دەستی بسڕێتەوە، یان بیانشوا، هەڵبەتە شُشتن باشترە لەسڕینەوە.

## نامەی شلەمەنییەكانی دەخورێنەوە (كتاب الأشربة)

ئەو شلەمەنییانەی ئادەمیزاد دەیانخواتەوە لە ئاوو شیرو هەنگوین‌و ئەو جۆرە شتانە، هەموویان لەنازو نیعمەتی خودان كە بەبەندەكانی خۆی بەخشیون، بۆیە خودا منەتیان بەسەردا دەكاو فەرمانیان پێدەكا: كە سوپاسگوزاری بن‌و هەمیشە نیعمەتەكانی پەروەردگاریان لەبەرچاو بێ.

خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنزَلْنَا مِنْ السَّمَاءِ مَاءً طَهُوراً. لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَاماً وَأَنَاسِيَّ كَثِيراً}.

ئێمە لەئاسمانەوە ئاوێكی پاك‌و پاكەوەكەرمان باراندوە بۆئەوەی زەوی وشك‌و سوتەمەڕۆی پێ زیندوبكەینەوە درەخت‌و ڕوەك‌و بەروبوومی كشت‌و كاڵی تێدا فەراهەم بێنین، دروستكراوانی خۆمان لە گیانلەبەران بەگشتی‌و ئادەمیزادەكان بەتایبەتی تێراو بكەین.

هەروا دەفەرموێ: {هُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً لَكُمْ مِنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ – النحل/١٠}.

پەروەردگار خودایەکی وەهایە لەبەرزاییەوە ئاوی بۆ باراندون لەهەندێکی دەخۆنەوەو بۆ پێداویستی ژیانی خۆتان بەکاری دێنن، هەر بە ئەو ئاوە روەك‌و درەختمان رواندوە بۆئەوەی ئێوە سودی لێ وەرگرن‌و بیکەنە لەوەرگای ئاژەڵەکانتان‌و ئاڵف‌و ئالیکی لێ دەستەبەر بکەن بۆیان‌و هەروا ئەو روەك‌و درەختانە زەوی ئارایش بدەن‌و دیمەنی جوان‌و رەنگاو رەنگتان بۆ پێك بێنن.

هەروەها دەفەرموێ: {فَأَنْزَلْنَا مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنْتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ – الحجر/٢٢}. ئێمە لە ئاسمانەوە ئاومان بۆ باراندون‌و ئێوەمان پێ تێراو کردوە خۆتان‌و ئاژەڵەکانتان‌و کشت‌و کاڵ‌و باغ‌و بێستان‌و دارستان بەو ئاوە تێراو دەبن، هەندێکیش لە ئاوی ئەو بارانە لەناخی زەویدا پەزمەندە دەکەین‌و بەگوێرەی پێویست دەیکەین بە کانیاوو روبار بۆئەوەی هەمیشە سودی لێ وەربگرن، ئەوە دەسەڵات‌و توانای ئێمەیە ئەو ئاوە لەناو زەویدا خەزن دەکەین، ئێوە توانای ئەوەتان نیەو ئەو کارەتان لەدەست نایە.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: {وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَناً خَالِصاً سَائِغاً لِلشَّارِبِينَ – النحل/٦٦}. بۆ ئێوە هەیە لە ئاژەڵەکانتاندا عیبرەت‌و ئامۆژگاری، ئەگەر وردببنەوە دەزانن ئێمە چ نیعمەتێکمان بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە ئەوەتا لەنێو ئەو شیاکەو خوێنەی ناوگەدەی ئاژەڵەکانتان ئێمە شیرێکی پاڵفتە کراوی گوارای تام‌و بۆنخۆشتان بۆ دەستەبەر دەکەین‌و دەیخۆنەوە بەجۆرەها شێوە سودی لێ وەردەگرن.

یان دەفەرموێ: {يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ – النحل/٦٩}. دێتەدەر لەگەدەی ئەو حەشەرە پچکۆلە کاسبکارە

سەرسوڕهێنەرە شەرابێکی رەنگ جیاجیا، کە دەرمانی چەند نەخۆشی تێدایە بۆ ئادەمیزاد، یان دەفەرمویٚ: {أَفَرَأَيْتُمْ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ. أَأَنْتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنْ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ. لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجاً فَلَوْلا تَشْكُرُونَ – الواقعة/٦٨-٧٠}.

ئەوە نابینن ئەو ئاوەی دەیخۆنەوەو نۆشی دەکەن ئایا ئێوە لە هەورەوە باراندوتانە یان ئێمەین دەیبارێنین، خۆ ئەگەر بمانەویٚ ئەو ئاوە شیرین‌و گوارایە دەکەینە ئاوێکی تفت‌و تاڵ‌و بە کەڵکی هیچ نەیە، ئەوە بۆ سوپاسی خودا ناکەن؟.

ئەصڵ‌و بنەما لە شلەمەنییە خوراوەکاندا ئەوەیە کە حەلاڵ‌و زولاڵن هیچ کامێکیان حەرام ناکرێن مەگەر بەڵگەیەك هەبیٚ لەسەر حەرامبوونی، لەوەپێش لەنامەی (الحدود)دا باسی شەراب‌و ئەو شلەمەنییانەی دەشوبهێن بە خەمرەوەو حوکمی ئەویان هەیە، باسکران‌و ئاماژەیان بۆ کرا ئەوەش بزانـدریٚ کە: مەکروهو نەشیاوە تێکەڵکردنی زیاد لەجۆرێك لەئەو شڵەمەنییانەی لە ئاکامی گوشینی میوەی وەکوو خورماو مێوژو شتی لەوجۆرەی کە خەڵك دەیگوشیٚ، مەبادا گورین‌و تەخەمموریان تێدا پەیدابیٚ‌و بیخواتەوەو نەزانیٚ کە گوراوەو بۆتە شەراب.

لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵیٚ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) نەهی کردوە لەوەی خورماو مێوژ تێکەڵ بکرێن یان خورمای نەگەییوو خورمای گەییو تێکەڵ بەیەك بکرێن‌و بگوشرێن‌و شلەمەنییان لیٚ دروست بکریٚ.[1]

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) بۆیە نەهی لەو تێکەڵکردنە کردوە ئەوەکوو زوو ئەو گوشراوە تێکەڵە بگوریٚ‌و ببێتە سەرخۆشکەر،

---

[1] متفق عليه: خ(٥٦٠١/٦٧/١٠)، م(١٩٨٦/١٥٧٤/٣)، د(٣٦٨٥/١٦٥ و ١٦٦/١٠).

خۆئەگەر نەگوراو نەبوە خەمرە، خواردنەوەی حەلاڵە. هەروەکوو چۆن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی لەسرکە دروستکردن کردوە لە قاپو قاچاغی دیاریکراودا لەبەر هەمان هۆ، وەلێ پاشان فەرمانی پێکردن بە خواردنەوەی نەبیذەکە بەمەرجێ نەبوبێتە سەرخۆشکەر.[1]

## ئادابو رێورەسمی شت خواردنەوە

١- هەرکاتێك مرۆڤ ویستی شتێك بخواتەوە ناوی خودا بێنێ بڵێ: (بسم الله)

لە عومەری کوڕی ئەبو سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: گەنجێك بووم تازە پێدەگەیشتم لەماڵی پێغەمبەردا بووم، لەکاتی نانخواردندا دەستم بەناو لەگەنەکەدا دەگێڕا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: «يَا غُلاَمُ سَمِّ اللَّهَ ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ»[2]: ڕۆڵە، ناوی خودا بێنەو بەدەستی ڕاستت بخۆو دەست بۆ ئەملاو ئەولای لەگەنی خواردنەکە مەبەو لەلای خۆتەوە بخۆو دەست بەرە بۆ ئەولایەی کە لێتەوە نزیکە.

ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: (بسم الله) کردن لەکاتی ئاو خواردنەوە یان شیرخواردنەوەدا هەروا بۆ باقی شلەمەنییەکانی تر وەکوو (بسم الله)کردن وایە لەسەر نانخواردن، هەرئەوەندە بڵێ: (بسم الله) کیفایەتە.[3]

٢- وا باشو پەسەندە بەدەستی ڕاستی شلەمەنییەکە بخواتەوە:

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَأْكُلَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ بِشِمَالِهِ وَلاَ يَشْرَبَنَّ بِهَا

---

[1] المغنى لأبن قدامة ج٨/٣١٩.

[2] متفق عليه: خ(٥٣٧٦/٥٢١/٩)، م(٢٠٢٢/١٥٩٩/٣)، د(٣٧٥٩/٢٥١/١٠).

[3] صەحیحی موسلیم بە شەرحی نەوەوی ج١٣/١٨٩.

فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِهَا».[١] باهيچ يەكێ لەئێوە بەدەستى چەپى خواردن نەخواو شلەمەنى نەخواتەوە، چونكە شەيتان بەدەستى چەپى دەخواو دەخواتەوە.

٣- واباشە بەدانيشتنەوە ئاوو شلەمەنى بخواتەوە:

لەئەبو سەعيدى خودرييەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) نەهى كردوە لەوەى بەڕاوەستانەوە ئاو بخورێتەوە.[٢]

لە ئەبو هورەيرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: «لاَ يَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِمًا فَمَنْ نَسِيَ فَلْيَسْتَقِئْ»[٣]: با هيچ كەس لەئێوە بەڕاوەستانەوە ئاوو شتى وا نەخواتەوە كەسێ لەبيرى چوو ئاوى بەڕاوەستانەوە خواردەوە با خۆ بڕشێنێتەوە.

٤- بە قاپێك ئاو بخواتەوە ئاوەكە ببيندرێو بزاندرێ چۆنەو چى تێدايە. بەقاپێكى وا نەخواتەوە ئاوەكەى تێدا نەبيندرێ وەكوو سواڵەتو شتى وا.

لە ئەبو هورەيرەوە ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) نەهى كرد لەوەى لەدەمى كوندەو شەربەو شتى وا ئاو بخورێتەوە واتە دەبێ ئاوەكە بكرێتە ناو قاپێكەوە ببيندرێ ئەمجار بخورێتەوە.[٤]

٥- لە ئەبو سەعيدى خودرييەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) نەهى كردوە لەوەى لەدرزو كونى قاپو شتى وا ئاو بخورێتەوە.[٥]

---

[١] م (٢٠٢٠/١٥٩٨/٣)، د(٣٧٥٨/٢٥٠/١٠)، ت(١٨٦٠/١٦٦/٣).

[٢] م(٢٠٢٤/١٦٠٠/٣).

[٣] م(٢٠٢٦/١٦٠١/٣).

[٤] خ(٥٦٢٧/٩٠/١٠).

[٥] صحيح: (ص.د/٣١٥٦)، د(٣٧٠٤/١٨٨ و ١٨٩/١٠).

الخطابي دەفەرموێ: بۆیە نەهی کراوە لەئاو خواردنەوە لەدرزو کونی ئەو دەفرو حاجەتانەی ئاویان تێدایە چونکە ئەگەر کابرا لەو درزو کونانەوە ئاو بخواتەوە ئاوەکە بەسەر دەمو چاویو جلەکانیدا دەپرژێ. چونکە کونو درزی دەمی تێناکەوێ، ئاو خۆرەوەکە ناتوانێ بەدەمو لێوی کونو درزەکان کۆنترۆڵ بکا.

گوتراوە ئەو کونو درزانە (مقعد الشیطان) کورسیو شوێنی شەیتانن، وێدەچێ مانای ئەم دەستەواژە ئەوەبێ کەشوێنی کونو درزی ئەو شتانەی ئاویان تێدا هەڵدەگیرێ بەشتنو شتی وا پاك ناکرێنەوەو دەستیان تێناکەوێ، کەوابێ ئاو خواردنەوە لەو شوێنانە بە پاكو خاوێنی دەستەبەر نابێ.

ئەمەش کردەوەی شەیتانەو تەسویلو رێخۆشکردنی ئەوە، هەروەها کە هەوڵیدا لە کونو درزی قاپی ئاو تێداهەڵگیراودا ئاو بخواتەوەو دەمی پێوە ناو ئاوەکە بەدەمو چاویدا پرژاو سینگو بەرۆکی تەربوون ئەوە بەکاری شەیتان دەژمێردرێ ئەزیەتدانەکە لە ئەوەوەیە.[1]

٦- نابێ ئاوو شلەمەنی تر لە پیاڵەو جامی زێرو زیودا بخواتەوە

لە عەبدوررەحمانی کوڕی ئەبو لەیلاوە ڕیوایەتکراوە، گوتوویەتی: ئێمە لای حوزەیفە بووین لە مەدائین، داوای ئاوی کرد کابرایەکی ئاگر پەرست لە پیاڵەیەکی زیودا ئاوی بۆ هێنا، پیاڵەکەی لەدەست وەرگرت پێیا ماڵی، وتی: من فەرمانم پێکردوە کە لەپیاڵەی زیودا ئاوم بۆ نەهێنێ، من بۆ خۆم بە گوێچکەی خۆم لە پێغەمبەرم ژنەوت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ وَلاَ الدِّيبَاجَ وَلاَ تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ ، وَلاَ تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا ، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ».[2] ئاوریشمو دێباج مەکەنە

---

[1] معالم السنن ج٥/٢٨٤.

[2] متفق عليه: خ(٥٤٢٦/٥٥٤/٩)، م(٢٠٦٧/١٦٣٧ و ٣/١٦٣٨).

پۆشاکی پیاوانتان، لە قاپو پیاڵەی زێڕو زیویشدا خواردن مەخۆنو مەخۆنەوە، قاپو پیاڵەی زێڕو زیو شت تێدا خواردنیان لەژیانی دونیادا بۆ ئەوانە (واتە بۆ کافرەکانە) لە قیامەتیش بۆ ئێوەی موسوڵمانە.

لە ئوممو سەلەمەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الَّذِي يَشْرَبُ فِي إِنَاءِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ».[1] ئەوەی لە پیاڵەی زیودا ئاوو شلەمەنی دەخواتەوە ئەوە بابزانێ ئاگری دۆزەخ دەخاتە ورگی خۆیەوە.

٧- نابێ لەکاتی ئاو خواردنەوەدا هەناسە بداتە ناو ئاوەکە.

لە ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ».[2] ئەگەر یەکێك لەئێوە ئاوو شلەمەنی خواردەوە با هەناسە نەداتە ناو پیاڵە ئاوەکە.

٨- واباشە بەسێ وەجبە پیاڵە ئاوەکە بخواتەوە.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ئاو خواردنەوەدا سێجار هەناسەی دەدا، واتە: بەسێجار ئاوەکەی نۆش دەکرد. موسلیمو تیرمیزی لە ڕیوایەتەکە ئەمەشیان زیادکردووە: کە فەرموویەتی (دروودی خودای لەسەر بێ): «إِنَّهُ أَرْوَى وَأَبْرَأُ وَأَمْرَأُ».[3] ئەم جۆرە ئاو خواردنەوە باشتر تینوایەتی دەشکێنێو دەرد دەرمان دەکاو گواراو خۆشتر قوت دەچێ.

٩- دەبێ دوای خواردنەوەی ئاوو شلەمەنییەکە سوپاسی خودا بکا:

---

[1] متفق عليه: خ(٥٤٢٦/٥٥٤/٩)، م(٢٠٦٧/١٦٣٤/٣)، جة(٣٤١٣/١١٣٠/٢).

[2] متفق عليه: خ(٥٦٣٠/٩٢/١٠)، م(٢٦٧-٥٦/٢٢٧/١)، ت(١٩٥١/٢٠٢/٣).

[3] متفق عليه: خ(٥٦٣١/٩٢/١٠)، م(٢٠٢٨/١٦٠٢ و ١٦٠٣/٣)، ت(١٩٤٥/٢٠١/٣).

له ئەبو ئەییوبی ئەنصارییەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە خواردنی دەخوارد یان ئاوو شلەمەنی دەخواردەوە دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَ وَسَقَى وَسَوَّغَهُ وَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجًا». حەمدو سوپاس بۆ خودایەك خواردنی داو ئاوی فەراهەم هێناو تێرو تێراوی کردین وای لێ کردن بە ئاسانی بە قوڕگدا بچێتە خوارو دوای سود لێ وەرگرتن لەو خواردن‌و خواردنەوەیە ڕێگای دەرچوونی بۆ فەراهەم هێناوەو بەشێوەی سروشتی دەری دەدەینەوە.

له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا». بێگومان پەروەردگار لە عەبدی خۆی ڕازی دەبێ کە خواردنێکی خوارد سوپاسی لەسەربکا، کە شلەمەنییەکی خواردەوە سوپاسی خودای لەسەربکا.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا سُقِيَ أَحَدُكُمْ لَبَنًا فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ. فَإِنَّهُ لَيْسَ شَيْءٌ يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ إِلاَّ اللَّبَنُ».[1] ئەگەر یەکێ لەئێوە پیاڵە شیرێکی دەرخواردرا، با بڵێ: خودایە! فەڕو بەرەکەتمان بۆ تێبخەو بۆمان زۆربکە، بێگومان هیچ شلەمەنییەك نیە وەکوو شیر بری خواردن‌و خواردنەوە بکەوێ.

سوننەتە بۆ کەسێك کە شیرەمەنی دەخواتەوە یان شتێکی چەور دەخوا پاش خواردنەوەو خواردنەکە ئاو لەدەم رادا.

---

[1] حسن (ص.ت/٣٤٥٥)، ت(٣٥٢٠-١٦٩/٥/١٧٠)، د(١٩٦/٣٧/٢ و ١٠/١٩٧).

لـه ئیبنـو عەبباسـەوە ڕیوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژێك شیری خواردەوە، دوایی داوای ئاوی کرد لەدەمی راداو فەرمووی: (ان له دسماً)[1] بێگومان شیر چەوری پێوەیە.

لـه ئەنەسـەوە ڕیوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) جارێـك پیاڵـە شـیرێکی خـواردەوە، ئـاوی لـەدەم ڕانـەداو دەستنوێژیشی نەگرتەوەو نوێژی کرد.[2]

١٠- ئەگـەر مـێش کەوتـە نـاو پیاڵە شلەمەنی یـەکێ ئێوە بـا بەتـەواوی مێشەکە لە شلەمەنییەکەدا نقوم بکاو ئـەمجار فڕێی بداتـە دەرەوە. بێگومـان لە باڵێکیانی دا دەرد هەیە لە باڵەکەی تریدا دەرمان هەیە.[3]

١١- ئەگــەر یــەکێك شـتێکی خـواردەوە ئـەمجار بابیـدا بـەوەی لـەلای ڕاستییەوەیەتی.

لـه ئەنەسـەوە ڕیوایـەتکراوە: کـه پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ماسـتاویان بۆهێنـا، لـەلای ڕاسـتییەوە عـەرەبێکی دەشـتەکی لێ بـوو، لـەلای چەپیشی حەزرەتی ئەبوبەکر دانیشتبوو، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەماسـتاوەکەی خـواردەوە، ئـەمجار دای بـەکابرای عـەرەبو فـەرمووی: «الأَيْمَنَ فَالأَيْمَنَ». لای ڕاست پـێش بخـەن، هـەموو کاتـێ گرنگی بـەلای ڕاست بدەن.

١٢- ئەگەر یەکێك ئاوی گێڕا بەسەر هاوەڵانیدا با بۆخۆی دوا هەموان ئاو بخواتەوە.

---

(١) متفق عليه: خ(٢١١/٣١٣/١)، م(٣٥٨/٢٧٤/١).

(٢) حسن (ص.د:١٨١)، د(١٩٤/٣٣١/١).

(٣) خ(٥٧٨٢/٢٥٠/١٠)، جة(٣٥٠٥/١٩٥٩/٢)، د(٣٨٢٦/٣٢٤/١٠).

له ئەبو قەتادەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «سَاقِيَ الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبًا». ئاوگێڕی قەوم بۆ خۆی دوا هەموان ئاو دەخواتەوە.

**فائیدەیەکی پزیشکی لە فەرمودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ):**

پێویستە موسوڵمانان قاپو قاچاغی خواردنو خواردنەوە تێدا هەڵگیراو بەسەر بڵاویو سەر نەگیراویو مەکشوفی نەهێڵنەوە، پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودابنو خۆ بپارێزن لە گوێڕایەڵی بۆ شەیتانو توشبووون بە نەخۆشیو میکروب.

لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «غَطُّوا الإِنَاءَ وَأَوْكُوا السِّقَاءَ».[1] قاپو مەنجەڵی خواردن داپۆشن، دەمی کوندەو مەشکەو شتی وا ببەستن. ئیمامی موسلیم ئەم دەستەواژەشی بۆ فەرمودەکەی پێشەوە زیادکردوە فەرموویەتی: «فَإِنَّ فِي السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فِيهَا وَبَاءٌ لاَ يَمُرُّ بِإِنَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غِطَاءٌ أَوْ سِقَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ وِكَاءٌ إِلاَّ نَزَلَ فِيهِ مِنْ ذَلِكَ الْوَبَاءِ». بێگومان لەماوەی ساڵدا شەوێکی تێدایە تاعونو نەخۆشی دەبارێ، بەلای هەر قاپێکی سەر بەتاڵدا یان کوندەو مەشکەی دەم نەبەستراودا تێپەڕێ ئیللا لەو نەخۆشییەی تێدەکەوێ.

هەر لەجابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «غَطُّوا الإِنَاءَ وَأَوْكُوا السِّقَاءَ وَأَغْلِقُوا الْبَابَ وَأَطْفِئُوا السِّرَاجَ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَحُلُّ سِقَاءً وَلاَ يَفْتَحُ بَابًا وَلاَ يَكْشِفُ إِنَاءً فَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلاَّ أَنْ

[1] متفق عليه: خ(٣٣١٦/٣٥٥/٦)، م(٢٠١٤/١٥٩٦/٣)

يَعْرُضَ عَلَى إِنَائِهِ عُودًا وَيَذْكُرَ اسْمَ اللَّهِ فَلْيَفْعَلْ فَإِنَّ الْفُوَيْسِقَةَ تُضْرِمُ عَلَى أَهْلِ الْبَيْتِ بَيْتَهُمْ». [(١)]

قاپو حاجەتی خواردەمەنی داپۆشن، دەمی کوندەو مەشکە ببەستن، دەرگای خانوبەرەی خۆتان دابخەن، چرا بکوژێننەوە بێگومان شەیتان دەمی کوندەو مەشکەی بەستراو ناکاتەوە، دەرگای داخراوو پێوەدراو ناکاتەوە، پەردە لەسەر قاپی خواردەمەنی تێدا هەڵگیراو لانابا، ئەگەر کەسێ هیچی لەمانە بۆ نەکرا با دارێك چیلکەیەك بەسەر قاپەکەدا رابنگێویێو ناوی خودا بێنێ، بۆیە چراو ئاگرو شتی وا بکوژێننەوە لەشەودا، چونکە جرو جانەوەرو پشیلەو شتی وا لەوانەیە بەهۆیەك لە هۆیەکان ببنە هۆکاری ئاگرکەوتنەوە.

## باسی وەسیەتکردن

وشەی (وصيّة) لەزمانی عەرەبیدا چاوگەو لە (وصيّت الشيئ أوصيه) وەرگیراوە کە بەمانا لێکدانو پێکەوە گرێدانی شت دێ، کەوابێ وەسیەتکەر ئەوەی لەژیانی هەیە بەدوا مردنییەوە گرێ دەدا.

وەسیەت لە شەرعدا بریتییە لەوە ئادەمیزاد ملکێك کتێبێك قەرزێك سودێك ببەخشێ بە یەکێکی تر، بەمجۆرە وەسیەت بۆکراو دوای مردنی وەسیەتکەر ببێتە خاوەنی شتە بەخشراوەکە.

## حوکمی وەسیەت

وەسیەت واجبە لەسەر کەسێك ماڵێکی هەبێ وەسیەتی تێدابکا.

قورئان دەفەرموێ: {كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمْ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ – البقرة/١٨٠}

---

(١) م(٢٠١٢/١٥٩٤/٣).

پەروەردگار لەسەر ئێوەی نووسیوەو پێویستی کردوە: کە هەرکاتێك مردن لەیەکێك لەئێوە نزیك بۆوە بەمجۆرە توشی نەخۆشییەکی ترسناك بوبوو، یان کەوتبوە سالەوەو مالّو سامانی بەجێ دەهێشت بۆ میراتگرەکانی، با وەسیەت بۆ باوكو دایكو هەندێ لە خزمانی بکا بە بەشێك لەو مالّو سامانە، بەشێوەیەکی عادلانەو میانەڕەوانە.

لە عەبدوللای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ ، يُوصِي فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ ، إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ».[1] ڕەوانییە بۆ مرۆڤی موسولّمان شتێکی هەبێ وەسیەتی تێدابکاو دوو شەوی بەسەردا تێپەڕێ وەسیەتەکەی نەنووسیبێو لای خۆی داینەنابێ.

### ئەندازەی ئەو مالّو سامانەی سوننەتە وەسیەتی تێدا بکرێ

لە سەعدی کوڕی وەقاصەوە ڕیوایەتکراوە، دەلّێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەردانی نەخۆشی کردم، ئەوکاتە من لە مەککە بووم ئەو پێی ناخۆش بوو لەو ولاتە بمرێ کە کۆچی لێوە کردوە پێی خۆش بوو لە غەریبی بمرێ. فەرمووی: «يَرْحَمُ اللَّهُ ابْنَ عَفْرَاءَ». خودا ڕەحم بەکوڕی (عەفراء) بکا. عەفرا ناوی دایکی سەعدە – وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! هەموو مالّەکەم بکەم بە وەصییەت؟ فەرمووی: نەخەیر. وتم: نیوەی بکەم؟ فەرمووی: نەخەیر نیوەیش زۆرە، وتم: قوربان سێیەکی بکەم؟ فەرمووی: سێیەك باشە هەرچەندە ئەویش زۆرە، ئەمجار فەرمووی: «إِنَّكَ أَنْ تَدَعَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ فِي أَيْدِيهِمْ ، وَإِنَّكَ مَهْمَا

---

[1] متفق عليه: خ(٥/٣٥٥/٢٧٣٨)، م(٣/١٢٤٩/١٦٢٧)، د(٨/٦٣/٢٨٤٥)، ت(٢/٢٢٤/٩٨١)، جة(٢/٩٠١/٢٦٩٩)، ن(٦/٢٣٨).

أَنْفَقْتَ مِنْ نَفَقَةٍ فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ ، حَتَّى اللُّقْمَةُ الَّتِي تَرْفَعُهَا إِلَى فِي امْرَأَتِكَ ، وَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَرْفَعَكَ فَيَنْتَفِعَ بِكَ نَاسٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ» ئەتۆ ئەگەر میراتگرەكانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بێڵی باشترە لەوەی بەهەژاری بەجێیان بێڵیو ببنە ئەرك بەسەر خەڵكەوەو دەست لەخەڵك پان بكەنەوەو چاویان لەدەستی خەڵك بێ، ئەتۆ چەندێك نەفەقەو بژیو بۆ خێزانت دابین بكەی دەبێتە مایەی صەدەقەو خێر، تەنانەت پاروە نانێك كە بەرزی دەكەیەوە بۆ سوحبەتو خۆشی بۆ دەمی هاوسەرەكەت. هەڵبەتە پرسیارەكەی سەعد ئاماژە بەوەبوو كە گوایە حەزی لەوەیە خێرەكەی زۆربێ، جا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی مەنع كرد، بۆ تەسەللادانەوەی سەعد پێی فەرموو: هەرچی بكەی لە ماڵو سامانتدا صەدەقەی واجب بێ یان سوننەت بێ ئەگەر مەبەستت رەزامەندی خودابێ پاداشی باشی لەسەر وەردەگریەوە.

ئەمجار پێی فەرموو: رەجاوایە خودا تەمەنت درێژبكا هاوكاری چەند غەزاو فتوحات بكەی موسوڵمانان لێت سودمەندبن بەهۆی غەنیمەتو دەستكەوتەكانی فتوحات كافرەكانیش لەسەر دەستی تۆ توشی هیلاكەتو زیان ببن، ئەم دوعاو رەجایەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ سەعد هاتەدیو دوای ئەو نەخۆشییە چل پەنجا ساڵ ژیا، وەكوو مەشهوورە سەعد لەدوای حەجی ماڵئاوایی چلو پێنج ساڵ ژیاوە.

ئەوكاتەی سەعد ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد تەنها یەك كچی میراتگری هەبوو.

## میراتگر وەصییەتی بۆ ناكرێ

لە ئەبو ئومامەی باهلییەوە ڕیوایەتكراوە دەڵێ: ژنەوتم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وتاری حەجی ماڵئاواییدا، دەیفەرموو: «إِنَّ

اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ». [١] بێگومان خودای مەزن بۆ هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی داوەتێ، وەصیەتكردن بۆ میراتگر نابێ.

## ئەوەی لەپێشەكی وەصیەتنامەدا دەنووسرێ

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: هاوەڵان لە پێشەكی وەصیەتنامەكانیاندا دەیاننوسی: بسم الله الرحمن الرحیم: ئەمە وەسیەتنامەی فلاَنی كوڕی فلاَنە شایەتی دەدا: كە جگە لەخودا هیچ خودای تر نین تاكو تەنهاو بێ شەریكە، موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە، قیامەت ڕادەبێو شكو گومانی تێدانیە، خودا هەموو مردوان لە گۆڕەكانیان ڕاست دەكاتەوە، كێشی سارای مەحشەریان دەكا بۆ حیسابو لێكۆڵینەوە. ئەمجار وەسیەتو ئامۆژگاری ماڵو منداڵی خۆی دەكا كە تەقوای خودا بكەنو چاكسازی ناوخۆیان بكەن فەرمانبەرداری فەرمانی خودابن، شوێن پەیامی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بكەون ئەگەر بەڕاستی موسوڵمانن. هەمان ئەو وەسییەتو ئامۆژگاریانەیان بۆدەكا كە حەزرەتی ئیبراهیم بۆ كوڕو نەوەكانی كرد، هەروەها حەزرەتی یەعقوبیش هەمان وەسییەتو ئامۆژگاری كوڕەكانی كرد. { يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمْ الدِّينَ فَلا تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ – البقرة/١٣٢} ئەی ڕۆڵەكانم! خودا ئایینی پاكو بێ خەوشی بۆ هەڵبژاردوون: كە ئایینی پاكی ئیسلامە، بەهیچ شێوەیێ لێی لامەدەن، بەموسوڵمانی نەبێ لەدونیا دەرمەچن هەمووتان لەسەر ئایینی ئیسلام بەردەوام بن.

---

[١] صحيح: (ص.جة/٢١٩٤) ، جة(٢٧١٣/٩٠٥/٢)، د(٢٨٥٣/٧٢/٨)، ن(٢٤٢/٦).

## کەی وەسییەت دەبێتە ماف و جێگیر دەبێ

وەسییەت نابێتە مافی وەسییەت بۆکراو مەگەر دوای مردنی وەسییەتکەرو دوای دانەوەی قەرزەکانی جا ئەگەر قەرزەکان هەموو ماڵو سامانی مردوەکەی گرتەوە، ئەوە کابرای وەسییەت بۆکراو هیچی نادرێتێ.

لە ئیمامی عەلییەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردوەو بڕیاری داوە قەرز بخرێتە پێش وەسییەتەوە. دەی خۆ ئێوە خۆتان لە قورئاندا دەخوێننەوە ( مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ ).[1]

**ئاگادارکردنەوەیەک:**

چونکە لەم ڕۆژگارەدا زوربەی خەڵك بیدعەتیان لە ئایینی خۆیاندا داهێناوە، بەتایبەتی لەمەوزوعێکدا کە پەیوەندی بەداب و نەرێتی کفن و دفنی جەنازەوە هەیە. بۆیە پێویستە موسوڵمان وەسییەت بکا، کە لەسەر شێوەی ئایینی ئیسلام و سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کفن و دفن بکرێ. ئاماژە بە ئایەتی: { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلائِكَةٌ غِلاظٌ شِدَادٌ لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ – التحريم/٦} ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! بڕواتان بەتاك و تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی موحەممەد هەیە، خۆتان ڕێك و پێك بکەن بەتاعەت و خوداپەرستی و بەندایەتی کردنی دڵسۆزانە خۆتان و خێزان و منداڵتان بپارێزن لەئاگرێك سوتەمەنیەکەی ئادەمیزادو بەردە؛ بتپەرستەکان و بتەکانیانن. بەسەر ئاگری دۆزەخەوە چەند فریشتەیەك هەن دڵڕەق و بێ بەزەیی، سەرپەرشتی دۆزەخ دەکەن، تاوانباران

---

[1] حسن (ص.جة/٢١٩٥)، (الإرواء/١٦٦٧)، جة(٢٧١٥/٢/٩٠٦)، ت(٢٢٠٥/٣/٢٩٤).

سزا دەدەن دیمەنیان سامناكو پێكهاتەیان سەرسوڕهێنەرە خودا خوڵقاندونی بۆ سزادانی تاوانباران.

بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمیشە لە وەسییەتنامەكانیاندا ئەوەیان دوپات دەكردەوە كە بەگوێرەی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كفنو دفن بكرێن. ئاسارو ریوایەت لەم بارەوە زۆرو زەبەندەن.

لە عامیری كوڕی سەعدی ئەبی وەقاصەوە ڕیوایەتكراوە: كە باوكی لە نەخۆشی مردنیدا وەسییەتی كرد؛ وتی: (گۆڕێكی لادرم بۆ هەڵبكەنن ئەمجار دەمی لادرەكە بەخشت هەڵ بچنن وەكوو چۆن پێغەمبەر بەوشێوە دفن كرا.[1]

**ئاگاداركردنەوەیەكی تر:**

ئەگەر مرۆڤ منداڵو نەوەی هەبوون، یەكێك لە منداڵەكانی لەژیانی خۆیدا مردو ئەویش منداڵی بەجێ هێشتن، پێویستە ئەو كابرایە وەسییەت بكا بۆ ئەوەی دواخۆی بەشە میراتی منداڵی مردوەكەی بدرێ بە منداڵەكانی، یان بەشێك دیاریی بكا لە سێیەكی ماڵەكەی بۆئەو نەوانەی.

خۆئەگەر كابرا مردوو وەسییەتی نەكرد بەوەی شتێك بدرێ بەنەوەكانی، ئەوە ئەندازیەكیان ماڵ دەدرێتێ بكاتە حەدی ئەوەی ئەگەر وەسییەتی بۆ بكردنایە، چونكە ئەمە قەرزە لەسەری ئەگەر مردوو وەسییەتی بۆ نەنووسین لەسەری لاناچێ. ئەمڕۆ زوربەی دادگاكانی وڵاتە ئیسلامییەكان بەم شێوە كاردەكەن.

---

[1] حسن (ص.جة/٢١٩٥)، (الإرواء/١٦٦٧)، جة(٢٧١٥/٢/٩٠٦)، ت(٢٢٠٥/٣/٢٩٤).

## باسی میرات (كتاب الفرائض)

پێناسەی میرات (فرائض): کۆی وشەی (فریضة) کە بەمانا ئەندازەو دیاریکردنە، قورئان دەفەرموێ: {فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ – البقرة/٢٣٧} واتە: نیوەی ئەوەی دیاریتان کردوە. وشەی (فرض) لە زاراوەی شەرعدا ئەو بەشەیە کە بۆ میراتگر دیاریی کراوە.

## پێویستە موسوڵمانان وریابن لە میرات بەشکردنداو سنوورەکانی نەبەزێنن

بێگومان عەرەبەکان پێش ئیسلام میراتیان دەدا بە پیاوەکانو ئافرەتیان بێبەش دەکرد، بەشی گەورەو باڵغەکانیان دەداو منداڵیان بێبەش دەکرد. کە ئایینی ئیسلام هات مافی دا بەهەموو خاوەن مافێك، ئەم مافدانەی بەهەموو خاوەن مافێك بەگوێرەی خۆی ناوی ناوە {وَصِيَّةً مِنْ اللَّهِ – النساء/١٢}. {فَرِيضَةً مِنْ اللَّهِ – النساء/١١} ئەمجار بەشوێن ئەوەدا موسوڵمانان دەترسێنێ لە زێدەڕەویو سنوورشکێنی لەبواری میرات بەشکردنداو دەفەرموێ: {تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ. وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَاراً خَالِداً فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُهِينٌ – النساء/١٣-١٤}.

## ئەوەی بەمیرات لەماڵی مردوو دەدرێ بەمیراتگران

کە ئینسان مرد یەکەم شت مەسرەفی کفنو دفنی مردوەکە لەماڵەکەی خەرج دەکرێ. پاشان ئەگەر قەرزدار بوو، قەرزەکەی لێ دەدرێتەوە، ئەمجار وەسییەتەکەی جێبەجێ دەکرێ، جا ئەگەر شتێك مایەوە لە ماڵو سامانی بەسەر میراتگرەکانیدا دابەش دەکرێ. ئاماژە بە ئایەتی قورئانی پیرۆز: {مِنْ

بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ – النساء/١٢}.[1] هەروەها ئاماژە بە فەرموودەی ئیمامی عەلی کە دەفەرموێ: (قَضَى رَسُولَ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– بِالدَّيْنِ قَبْلَ الْوَصِيَّةِ). پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەماڵی بەجێماوی مردودا قەرزدانەوەی پێش جێبەجێ کردنی وەصییەت خستووە. دوای قەرزدانەوەکە وەسییەتەکەی جێبەجێ کردوە.

## هۆکاری میراتگرتن سێ شتن

١- نەسەبو خزمایەتی ئاماژە بەئایەتی {وَأُوْلُو الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ – الأحزاب/٦}.

٢- وەلاء (واتە: بەندەی ئازادکراوو سەییدەکەی پەیوەندی وەلائیان لەنێودایە).

٣- ژنو مێردایەتی ئاماژە بەئایەتی {وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ – النساء/١٢}.

## ئەو شتانەی دەبنە هۆی میرات نەگرتن

١- کوشتن: بکوژ میرات لەکوژراو ناگرێ. ئەگەر یەکێك باوکی خۆی بکوژێ کوشتنەکەی دەبێتە مانیعو میراتی لێ ناگرێ.

لەئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الْقَاتِلُ لاَ يَرِثُ».[2] بکوژ میرات لەکوژراو ناگرێ.

٢- جوداوازی ئایین: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ

---

[1] لەوەپێش تێپەڕی.

[2] صحيح: (ص.ج/٤٤٣٦) ، (الإرواء/١٦٧٢)، ت(٢١٩٢/٢٨٨/٣)، ج(٣٦٤٥/٨٨٣/٣).

وَلاَ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ).[1] موسوڵمان میرات لەكافر ناگرێو كافریش میرات لە موسوڵمان ناگرێ.

٣- كۆیلایەتی: كەسێك كۆیلەبوو خزمو كەسوكاری میراتی لێ نابەن، بەڵكوو میراتەكەی بۆ سەییدەكەیەتی.

## ئەو پیاوانەی میرات دەگرن دە جۆرن

١-٢: كوڕو كوڕی كوڕ با زۆریش داكەوێ. ئاماژە بە ئایەتی {يُوصِيكُمُ اللَّـهُ فِي أَوْلادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ – النساء/١١} خودا ئامۆژگاریتان دەكاو پێتان رادەگەیەنێ كەمنداڵی نێرینەتان دوو هێندەی مێینەتان میرات دەگرێ.

٣-٤: باوكو باپیر بازۆریش بەرەوژوور بڕوا، ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار {وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ – النساء/١١} دایكو باوكی مردوو بۆ هەریەكەیان شەش یەك هەیە.

٥-٦: براو برازا بازۆریش دووركەوتبنەوە، ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار كە دەفەرموێ: {وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ – النساء/١٧٦}.

٧-٨: مامو كوڕی مام: با زۆریش لێك دووركەوتبنەوە. ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) كە دەفەرموێ: «أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا ، فَمَا بَقِيَ فَهْوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ».[2] بەشە میراتیەكان بدەنە خاوەنەكانیان، ئەوی لەوان زیادبوو ئەوە دابەش دەكرێ بەسەر ئەو خزمە پیاوانەی لە مردوەكە نزیكن كێیان لەپێشتر بێ ئەوان میراتەكە دەبەن.

٩- مێرد: ئاماژە بە ئایەتی {وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ – النساء/١٢}.

---

[1] متفق علیه: خ(٦٧٦٤/٥٠/١٢)، م(١٦١٤/١٢٣٣/٣)، ت(٢١٨٩/٣٨٦/٣).

[2] متفق علیه: خ(٦٧٣٧)، م(١٦١٥).

١٠- گەورەو ئاغای كۆیلە: ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): «اَلْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ».[1] وەلاو سەرپەرشتی بۆ ئەو كەسەیە كە كۆیلەكەی ئازاد كردوە.

## ئەو ئافرەتانەی بەشە میراتیان هەیە حەوت جۆرن

١-٢: كچو كچی كوڕ: بازۆر بڕوا بەرەوخوار، ئاماژە بە فەرمایشتی خودا كە دەفەرموێ: {يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلادِكُمْ – النساء/١١}.

٣-٤: دایكو نەنك: ئاماژە بە فەرمایشتی خودا: كە دەفەرموێ: {وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ – النساء/١١}.

٥- خوشك: ئاماژە بە ئایەتی {إِنْ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ – النساء/١٧٦}.

٦- خێزان (هاوسەر): ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار {وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ – النساء/١٢}.

٧- ئاغا ژنو خاوەن كۆیلە كە كۆیلەكەی ئازادكردبێ: ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): «اَلْوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ».[2]

## ئەوانەی مافی ئەوەیان هەیە میرات بگرن سێ جۆرن

هەیە خاوەن بەشی دیاریكراوە (ذوفرض). هەیە عەصەبەیە جاری واهەیە هیچی بەرناكەوێ، جاری وایش هەیە هەمووماڵەكە دەگرێ. هەیە ذەویلئەرحامە.

---

[1] خ(٢٥٦١)، م(١٥٠٤).

[2] متفق عليه: خ(٤٥٦/٥٥٠/١)، م(١٥٠٤/١١٤١/٢)، د(٢٩١٠/٤٣٨/١٠).

ئەو بەشە دیاریکراوانە لە قورئاندا ئاماژەیان پێ کراوە شەشن: نیوە، چواریەك، هەشتیەك، دووبەش لەسێبەش، سێیەك، شەشیەك.

نیوە: بەشەمیراتی پێنج جۆر میراتگرە:

١- مێرد: ئەگەر خێزانە مردووەکەی منداڵی نەبوو. ئاماژە بە ئایەتی {وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ – النساء/١٢}.

٢- کچ: ئاماژە بە ئایەتی {وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ – النساء/١١}.

٣- کچی کوڕ: چونکە کچی کوڕ بە کۆڕای زانایان حوکمی کچی هەیە.

ئیبنولمونذیر دەفەرموێ: زانایانی شەرع کۆڕایان هەیە لەسەرئەوە کە کوڕی کوڕو کچی کوڕ شوێنی کوڕو کچ دەگرن نێرینەیان شوێنی نێرینەو مێینە شوێنی مێینەیان دەگرن بەمەرجێ مردووەکە کوڕو کچی خۆی نەمابن.

٤-٥: خوشکی باوك‌و دایکی: خوشکی باوکی. ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێ: {إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ – النساء/١٧٦}.

## چواریەك بەشە میراتی دوو کەسە

١- بەشی مێردە ئەگەر ژنە مردووەکەی منداڵی هەبن. ئاماژە بە ئایەتی {فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ – النساء/١٢}.

٢- بەشە میراتی ژنە ئەگەر مێردە مردوەکەی منداڵی نەبن، ئاماژە بە ئایەتی {وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكُمْ وَلَدٌ – النساء/١٢}.

هەشتیەك: بەشە میراتی ژنە ئەگەر مێردە مردووەکەی منداڵی لەدوا بەجێمابن. ئاماژە بە ئایەتی {فَإِنْ كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُمْ – النساء/١٢}.

**ئلثان: دووبەش لەسێ بەش بەشە میراتی چوارکەسە**

**١-٢: دوو کچ یان دوو کچی کوڕ ئامـاژە بـە ئایـەتی {فَـإِنْ كُـنَّ نِـسَاءً فَـوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ – النساء/١١}.**

**٣-٤: دوو خوشکی باوكو دایکی: دوو خوشـکی بـاوکی، ئامـاژە بـە ئایـەتی {فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ – النساء/١٧٦}.**

**سێیەك بەشە میراتی دوو کەسە**

**١- دایك: ئەگەر حەجب نەدەبوو ئاماژە بە ئایـەتی {فَإِنْ لَمْ يَكُـنْ لَـهُ وَلَـدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ – النساء/١١}.**

**٢- بەشە میراتی دووکەس یان زیاتر، لە خوشـكو بـرای دایکـی ئامـاژە بـە ئایەتی {وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلالَةً أَوْ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَـا السُّدُسُ فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ – النساء/١٢}.**

**شەشیەك بەشە میراتی حەوت کەسە**

**١- دایك لەگەڵ منداڵدا یان لەگـەڵ خوشـكو بـرا، واتـە: ئەگـەر مردوەکـە منداڵ یان خوشكو برای لەپاش بەجێ مابوو لەگەڵ دایکیدا لەم حاڵەدا دایك بەشە میراتی شەشیەکە. ئاماژە بە ئایـەتی {وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَـا الـسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ فَـإِنْ كَـانَ لَـهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ – النساء/١١}.**

**٢- نـەنك: کاتێـك مردوەکـە دایکـی نـەمابێ. ئیبنولمونـذیر دەفـەرموێ: شـەرعزانان کۆڕایـان هەیـە لەسـەرئەوە: کـە نـەنك بەشـە میراتـی شەشـیەکە ئەگەر مردووەکە دایکی نەمابێ.[1]**

---

[1] الإجماع/٨٤.

٣- تاقە میراتگرێك لە منداڵی دایك نێربن یان مێینە بن: ئاماژە بە ئایەتی {وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلالَةً أَوْ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ – النساء/١٢}.

٤- كچی كوڕ ئەگەر مردوەكە كچی خۆی هەبێ: ئاماژە بە فەرموودەی ئەبو قەیس ڕیوایەت دەكا دەڵێ: لە هوزەیلی كوڕی شورەحبیلم ژنەوت، وتی: پرسیار لەئەبو موسا كرا دەربارەی مردووێك كە كچێكی خۆیو كچێكی كوڕیو خوشكێكی لەدوا بەجێ مابوو، لە وەڵامدا وتی: كچەكەی خۆی نیوە دەبا، خوشكەكەشی نیوە. ئەمجار وتی: بچۆرە خزمەت ئیبنو مەسعود ئەویش هەروا دەڵێ، كە پرسیار لە ئیبنو مەسعود كراو قسەكەی ئەبو موسایان بۆگێڕایەوە فەرمووی: نەخەیر من ئەگەر فتوای ئاوابدەم لە ڕێبازی حەق لام داوە. من ئێستا بڕیار دەدەم بەوشێوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری لێ داوە: كچەكە نیوەی میراتەكە دەبا كچی كوڕەكە شەشیەك بۆئەوەی بە كچەكەو كچی كوڕەكە بەشەكەیان ببێتە دووبەش لەسێ بەش، چی مایەوە دەدرێ بە خوشكەكە.

هاتین بۆلای ئەبو موسا فەرمایشتەكەی ئیبنو مەسعودمان بۆگێڕایەوە. ئەبو موسا فەرمووی: ئیتر مادامێكی ئەم زانا گەورەتان لەناودایە پرسیار لەمن مەكەن.[1]

٥- خوشكی باوكی لەگەڵ خوشكی باوكو دایكیدا بۆئەوەی بەهەردووكیان دوو بەش لەسێ بەش تەواوبكەن، وەكوو چۆن كچی كوڕ كە لەگەڵ كچی مردوەكە كوبونەوە كچی كوڕەكە شەشیەك دەبا بۆئەوەی بەهەردوكیان دووبەش لەسێ بەش بەرن.

---

[1] صحيح: (الإرواء/١٦٨٣) ، خ(١٢/١٧/٦٧٣٦)، د(٨/٩٧/٢٨٧٢)، ت(٣/٢٢٨٥/٢١٧٣).

٦- باوك لەگەڵ منداڵی مردوەکە. ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێ: {وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ – النساء/١١}.

٧- باپیر ئەگەر باوك نەبوو: ئیبنولمونذیر دەڵێ: شەرعزانان كۆڕایان هەیە لەسەرئەوە: كە باپیر حوكمی باوكی هەیە.

## العصبة (میراتگری بەش دیاری نەكراو)

عەصەبە: كوڕو خزمی پیاون: مەبەست بەو وشەیە لێرەدا ئەو كەسانەیە كە دوای وەرگرتنی میراتگرە بەش دیاریكراوەكان ئەگەر شتێك مایەوە وەری دەگرن ئەگەر نەشمایەوە هیچ، مەگەر ئەو عەصەبە كوڕی مردوەكە بێ، ئەوە ئەو بەهیچ حاڵێ بێ بەش نابێ.

عەصەبە ئەگەر خاوەن بەشی دیاریكراو (ذوی الفروض)یان لەگەڵ نەبوو هەمووماڵەكە دەبەن.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا ، فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ».[1] بەشە میراتە دیاریكراوەكان بدەن بە خاوەنەكانیان چی لەوان مایەوە بیدەن بەنزیكترین نێرینە لەمردوەكە.

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ – النساء/١٧٦} برا هەموو میراتەكە دەبا ئەگەر ئافرەتە مردوەكە منداڵی نەبوون، ئەوەتا برا عەصەبەیە كاتێ بەتەنها بێ هەموو میراتەكە دەبا، ئیتر باقی عەصەبەكان قیاس دەكرێن بۆسەر ئەو.

---

[1] فقه السنة ج٣/٤٣٧.

عەصەبە دوو جۆرن: عەصەبەی نەسەبی، عەصەبەی سەبەبی.

عەصەبەی سەبەبی ئەوەیە: هۆکارەکە ئازادکردن بێ. ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): «الْوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ». وەلاو سەرپەرشتیاری بۆ کەسێکە ئازادی کردبێ، هەروا فەرمودەی (الْوَلاَءُ لُحْمَةٌ كَلُحْمَةِ النَّسَبِ). ئازادکردنی کۆیلە ئازادکراوو ئازادکەر پێکەوە دەبەستێتەوە ئاغاو گەورەی کۆیلەی ئازادکراو میرات ناگرێ مەگەر لەکاتێکدا عەصەبەی نەسەب وجودیان نەبێ.

جوداوازی نیە لەوەدا ئاخۆ ئازادکەرەکە پیاوبێ یان ئافرەت بێ. لە عەبدوڵڵای کوڕی شەدادەوە لەکچی حەمزەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: ئاغاکەم بەڕەحمەت چوو تەنها کچێکی لەپاش بەجێ ما، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) میراتەکەی لەنێوان منو کچەکەیدا دابەشکرد نیوەی بۆ منو نیوەی بۆ کچەکەی.[1]

### عەصەبەی نەسەبی سێ جۆرن

١- هەیە بۆخۆی عەصەبەیە، ئەوانیش پیاوانی میراتگرن جگە لەمێردو منداڵی خوشك.

٢- هەیە بەهۆی غەیرەوە دەبێتە عەصەبە. ئەمانەش بریتین لە کچو کچی کوڕ، خوشکی باوكو دایکیو خوشکی باوکی. هەر یەکێك لەم کچو خوشکانە لەگەڵ براکەیاندا دەبنە عەصەبەو نیوەی براکەیان میرات دەگرن، ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێ: {وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالاً وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ – النساء/١٧٦}.

---

[1] حسن (ص.جة/٢٢١٠)، جة(٢٧٣٤/٩١٣/٢)، ك(٦٦/٤).

٣- عەصەبە لەگەڵ غەیری خۆیدا. ئەمانەش خوشك لەگەڵ كچ دان، ئاماژە حەدیثەكەی ئیبنو مەسعود: كە ریوایەتی كردوە، دەفەرموێ: (وَمَا بَقِيَ فَلِلأُخْتِ).[1] ئەگەر كابرایەك مرد كچی لەپاش بەجێ مان لەگەڵ خوشكدا كچەكان دوو بەش لەسێ بەش دەبەن چی مایەوە لە میراتەكە بۆ خوشكەكانە.

## حەجبو بێبەشكردن

حەجب: لەزمانەوانیدا مەنع كردنە، مەبەست لێی مەنع كردنی كەسێكی دیاریكراوە لە میراتگرتن لەهەمووی یان لە بڕێكی، لەبەر هەبوونی كەسێك لەمیراتگرەكان.

بێبەشكردن (حرمان) مەبەست لێی مەنعكردنی شەخصێكی دیاریكراوە لە میراتەكەی بەهۆی پەیدابوونی لەمپەرو مانیعێك لە مانیعەكانی میراتگرتن وەكوو قەتلو كوفرو كۆیلایەتی.

## جۆرەكانی حەجب

حەجب دوو جۆرە حەجبی حیرمان، حەجبی نوقصان:

حەجبی نوقصان: بریتییە لە كەمكردنەوە بەشە میراتی یەكێك لە میراتگرەكان لەبەر هەبوونی یەكێكی تر لە میراتگر، ئەمەش بۆ پێنج كەس دێتەكایەوە:

١- مێرد لەنیوە میرات حەجب دەبێ بۆ چواریەك ئەگەر ئافرەتە مردووەكە منداڵی هەبوو.

---

[1] لەوەپێش تێپەڕی.

٢- ژن لەچواریەکە میرات حەجب دەبێ بۆ هەشتیەکە میرات ئەگەر مێردە مردوەکە منداڵی هەبوو.

٣- دایك لە سێیەکە میرات حەجب دەبێ بۆ شەشیەکە میرات کاتێك مردوەکە منداڵو نەوەی میراتگری هەبێ.

٤- کچی کوڕ.

٥- خوشکی باوکی.

**حەجبی حیرمان:** بریتییە لە بێبەشکردنی شەخصێك لەهەموو بەشە میراتەکەی بەهۆی هەبوونی یەکێکی تر لە میراتگرەکان. بۆ نموونە وەکوو بێ بەشکردنی برا لەمیرات لەکاتی هەبوونی کوڕ. ئەم جۆرە حەجبە میراتی شەش لەمیراتگر ناگرێتەوە، هەرچەند حەجبی نوقصان دەیانگرێتەوە ئەم شەش میراتگرانەش ئەمانەن.

١-٢: باوكو دایك.

٣-٤: کوڕو کچ.

٥-٦: ژنو مێرد. ئیتر حەجبی حیرمان باقی میراتگرەکانی تر دەگرێتەوە.

**حەجبی حیرمان لەسەر دووبنەما دادەمەزرێ**

یەکەم: هەرکەسێك بگاتە مردو بەهۆی کەسێك ئەوە لەگەڵ وجوودی ئەو کەسەدا ئەو میرات ناگرێ. وەکوو کوڕی کوڕ هەتا کوڕی مردوەکە وجودی هەبێ کوڕی کوڕەکە میرات نابا، جگە لە منداڵی دایك، ئەوان بەهۆی دایکەکەیانەوە میرات دەگرن کەچی لەگەڵ هەبوونیشیدا میرات دەگرن.

دووەم: هەموو کاتێك نزیك پێش دوور دەکەوێو تا نزیك بە مردوەکە وجودی هەبێ خزمە دوورەکە میرات نابا.

کوڕ کوڕی کوڕ مەنع دەکا لە میراتگرتن واتە کوڕ برازای حەجب دەکا. ئەگەر میراتگرەکان لەپلەی خزمایەتیدا یەکسان بوون. ئەوە سەیری ڕێژەی هێزی خزمایەتیەکە دەکرێ. وەکوو برای باوكو دایکی لەگەڵ برای باوکیدا. هەڵبەتە برای باوكو دایکی پلەی خزمایەتی بەهێزترە لەپلەی برای باوکی بۆیە برای باوكو دایکی حەجبی برای باوکی دەکا.

## کیتابی حودود (نامەی سنوورەکان)

الحدود: کۆی وشەی (أَلحَدّ) ئەمیش لەبنەمادا بەمانا لەمپەڕو پەردەو سنووری نێوان دووشت. لەزمانەوانیدا بەمانا (مەنع) دێ.

لە زاراوەی شەرعدا ئەو سزاو تۆڵە لێ ستاندنانەن کە شەرع دیاری کردوون بۆ تاوانەکان بۆئەوەی ئادەمیزاد بگەڕێتەوە لە تاوانو توخنیان نەکەوێ.

جەرائیمی حودود: قورئانو سوننەت سزاو تۆڵەی داناون بۆ هەندێ جەریمە وەکوو زیناو بوختانو دزیو سەرخۆشیو شەڕکردن لەگەڵ موسوڵمانانو یاخی بوون لێیان پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام، هەڵگەڕانەوە لە فەرمانڕەوای موسوڵمانان.[١]

## سزاو تۆڵەی تاوانەکان دەبێ جێبەجێ بکرێن

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « حَدٌّ يُعْمَلُ بِهِ فِي الأَرْضِ خَيْرٌ لأَهْلِ الأَرْضِ مِنْ أَنْ يُمْطَرُوا أَرْبَعِينَ

---

[١] فقه السنة ج٢/٣٠٢.

صَبَاحًا».[1] سزاو تۆڵە لەسەر تاوانێك جێبەجێ بكرێ باشترە بۆ دانیشتوانی سەر زەوی لەوەی چل ساڵ بارانی پێویستیان بۆ ببارێ.

سزاو تۆڵەی تاوان پێویستە بەتێكڕا لەسەر هەموو كەس جێبەجێ بكرێ، ئەوە بەرچاو نەگیرێ ئاخۆ تاوانبار خزمە بێگانەیە بنەماڵەو وەجاخزادەیە یان لاكەوتەو هەتیومچەیە.

لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە ڕیوایەتكراوە، گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «أَقِيمُوا حُدُودَ اللَّهِ فِي الْقَرِيبِ وَالْبَعِيدِ وَلاَ تَأْخُذْكُمْ فِي اللَّهِ لَوْمَةُ لاَئِمٍ».[2] تۆڵەو سزاكان جێبەجێ بكەن لەسەر خزمو بێگانە، با لۆمەو سەرزەنشتی لۆمەكاران ئێوە پشت سارد نەكاتەوە لە جێبەجێ كردنی ئەو حەدو سزایانەی خودا دیاریكردون.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتكراوە: كە ئوسامە بۆ ڕاگرتنی تۆڵە لەسەر ئافرەتێك چووە خزمەت پێغەمبەرو قسەی لەگەڵ كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُقِيمُونَ الْحَدَّ عَلَى الْوَضِيعِ ، وَيَتْرُكُونَ الشَّرِيفَ ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أنّ فَاطِمَةُ فَعَلَتْ ذَلِكَ لَقَطَعْتُ يَدَهَا».[3] ئەوەی گەلو نەتەوەكانی پێش ئێوەی بەهیلاك بردوە ئەوەبووە كە تۆڵەی تاوانیان لەسەر هەژارو بێ دەسەلات جێبەجێ كردوە بەلاّم لەسەر خاوەن دەسەلاتو وەجاخزادەیان جێبەجێ نەكردوە، سوێندم بەوكەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فاتیمەی كچم دزی بكا دەستی دەبڕم.

---

(١) حسن (ص.جة/٢٠٥٧)، جة(٢/٨٤٨/٢٥٣٨)، ن(٨/٧٦).

(٢) حسن (ص.جة/٢٠٥٨)، جة(٢/٨٤٩/٢٥٤٠).

(٣) صحيح (الإرواء/٢٣١٩)، خ(١٢/٨٦/٦٧٨٧).

## تکاکردن بۆ تاوانبار ناپەسەندە کاتێك فەرمانڕەوای لێ ئاگادار کرا

لەخاتو عائیشەوە گێڕدراوەتەوە: کە قورەیش زۆر گرنگییان بەئەو ئافرەتە مەخزومییە دا: کە دزی کردبوو هەولی ئەومیان دا: کەتۆڵە لێ ستاندنی لەسەر لابەرن، لەناوخۆیاندا کەوتنە مقۆ مقۆ وتیان: کێ باشە دەربارەی، قسە لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بکا؟ کێ دەتوانێو جورئەتی ئەوەی هەیە لەوڕووەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بدوێنێ جگە لە ئوسامە: کە خۆشەویستی پێغەمبەرەو زۆری لەدڵدا شیرینە؟ رایان سپارد بچێتە خزمەت پێغەمبەرو شەفاعەتی بۆبکا، ئوسامە چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەرو لەوبارەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ» . ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ قَالَ: « يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا ضَلَّ مَنْ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ ، وَإِذَا سَرَقَ الضَّعِيفُ فِيهِمْ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ ، وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعَ مُحَمَّدٌ يَدَهَا».[1] ئەوە دەربارەی ئەنجامنەدانی تۆڵەو حەدێك لە حودودەکانی خودا شەفاعەت دەکەی؟ دەتەوێ سزاو تۆڵەیەك کە خودا دیناوە جێبەجێ نەکرێ؟ پاشان هەڵسایە سەرپێو خەڵکەکەی کۆکردەوە وتارێکی بۆ دانو فەرمووی: ئەی خەڵکینە! بزانن ئەوەی گەلو نەتەوەکانی پێش ئێوەی گومڕا کرد ئەوەبوو ئەگەر یەکێکی خاوەن دەسەڵاتو پیاو ماقوڵیان دزی بکردایە گوێی خۆیان لێ دەخەواندو وازیان لێ دەهێناو تۆڵەیان لێ نەدەستاند، ئەگەر بۆرە پیاوو لاوازو بێ دەسەڵاتیان دزی بکردایە دەستیان دەبڕیو تۆڵەی تاوانەکەی لێ دەسەندرا، سوێندم بەخودا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکا ئەم نەفسی موحەممەدە بەدەستی خۆی دەستی دەبڕێ.

---

[1] متفق علیه: خ(٦٧٨٨/٨٧/٢)، م(١٦٨٨/١٣١٥/٣)، د(٤٣٥١/٣١/١٢).

## واباشه ئەگەر موسوڵمانێك تاوانێكی كرد پەردەپۆش بكرێ‌و نەبرێتە لای فەرمانڕەوا

لـە صـەفوانی كـوڕی ئومەیـەوە ڕیوایـەتكراوە، وتـی: مـن لەمزگـەوت نوسـتبووم جـاجمێكم بـەخۆدا دابـوو، هـی خـۆم بـوو سـی دیرهـەمی دەهێنـا، پیاوێـك هـات لێـی دزیـم، دوایـی كـابرای دز دۆزرایـەوە هێنرایـە خزمـەت پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمانی كرد بەبڕینی دەستی. صەفوان دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەرو عەرزیم كرد: ئەوە لەسەر دزینی شتێك كە بەهاكەی سی دیرهەمـە دەستی ئەم كابرایە دەبڕی؟

ئەمن جاجمەكەی پێ دەفرۆشـم‌و پارەكەشـی لەسـەردەكەم بەقـەرز كـەی بووی بمداتێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: «فَهَـلاَّ كَـانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ».[1] دەی بـۆ ئەمـەت ئـەنجام نـەدا پـێش ئـەوەی دەعواكە بگاتـە لای مـن. بـۆ پـێش ئـەوەی ئـەم كـارە بڵاوبێتـەوە ئاشكرابێ بەوشێوە پەردەپۆشت نەكرد؟

لـە ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتكراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ فِـي الـدُّنْيَا وَالآخِـرَةِ».[2] هـەر موسوڵمانێك تاوانی موسوڵمانێك پەردەپۆش بكا، پەروەردگار لەپاداشی ئەوەدا لەدونیاو قیامەتدا تاوانەكانی دەپۆشێ.

واپەسەندو باشە، بەندە بۆ خۆشی ئەگەر تاوانێكی كرد بڵاوی نەكاتـەوە پەردەپۆشی بكا. چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى إِلاَّ الْمُجَاهِرِينَ ، وَإِنَّ مِنَ الْمَجَانَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْـلِ عَمَـلاً ،

---

[1] صحيح: (ص.د/٣٦٩٣) ، د(٤٣٧١/٦٢/١٢)، ن(٨/٦٨)، جة(٢٥٩٥/٨٦٥/٢).

[2] صحيح: (مختصر م/١٨٨٨)، م(٢٦٩٩/٢٠٧٤/٤)، ت(١٤٤٩/٥٣٩/٢).

ثُمَّ يُصْبِحَ وَقَدْ سَتَرَهُ اللَّهُ ، فَيَقُولَ يَا فُلَانُ عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا ، وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللَّهِ عَنْهُ».[1]

هەموو ئوممەتم تاوانیان پەردەپۆش دەکرێ جگە لەوانەی بۆخۆیان لە تاوانەکانیان لە هەڵاّدەدەن، تاوان دەکەن‌و بۆ خەڵکیشی باس دەکەن. بێگومان بەشێکە لەموجاهەرەو لە هەڵاّدان کە کابرا بەشەو تاوانێك دەکا، کە رۆژی لێ دەبێتەوە وێرای ئەوەی خودا تاوانەکەی پەردەپۆش کردوە، کەچی بۆ خۆی لەخۆی ئاشکرا دەکاو دەڵێ: فلاّنکەس! من ئەمشەو ئەوەم کردو ئەوەم کرد!! خودا تاوانەکەی سرپۆش کردوەو کەس پێی نەزانیوە کەچی بۆ خۆی پەردە لەسەر خۆی هەڵدەداتەوە.

## جێبەجێکردنی حدود لەسەر تاوانبار دەبێتە کەفارەتی تاوانەکەی

لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووین، فەرمووی: بەیعەتم لەگەڵدا بکەن‌و پەیمانم بدەنێ کە هاوبەش بۆ خودا دانەنێن‌و هیچ شتێك مەکەنە هاوەڵی خودا، دزی مەکەن زینامەکەن، ئایەتەکەی قورئانی لەوبارەوە هەموو خوێندەوە. ئەمجار فەرمووی: جا کەسێك پابەندی وادەو پەیمانی خۆی بێ، ئەوە پاداش‌و جەزای لەسەر خودایەو ئەو پاداشی دەداتەوە. کەسێکیش تاوانێکی لێ رودراو سزای شەرعی لەسەر جێبەجێ کرا ئەوە بۆی دەبێتە کەفارەت‌و ئەوەی (حق الله) بێ لەسەری لادەچێ. کەسێکیش تاوانێکی ئەنجام داو خودا بۆی سرپۆش کرد ئەوە عائید بەخودایە مەیلی لێ بوو لێی خۆش دەبێ مەیلی لێ بوو سزای دەدا[2]

---

[1] متفق عليه: خ(١٠/٤٨٦/٦٠٦٩)، م(٤/٢٢٩١/٢٩٩٠). 

[1] متفق عليه: خ(١٨/٦٤/١)، م(٣/١٣٣٣/١٧٠٩)، ن(٧/١٤٨).

[2] متفق عليه: خ(١٠/٤٨٦/٦٠٦٩)، م(٤/٢٢٩١/٢٩٩٠).

## کێ سزاو تۆڵەی تاوانەکان جێبەجێ دەکا

ئەنجامدانی تۆڵەو سزاکان لەسەر تاوانبار دەبێ یان ئیمام یان جێگرەکەی ئەنجامی بدا. چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تا لەژیان دابوو بۆ خۆی سەرپەرشتی جێبەجێکردنی دەکرد، دوا خۆیشی جێنشینەکانی بەوکارە هەڵدەسان. جاری وایش بووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بریکاری بۆ خۆی داناوە تا ئەو ئەرکە جێبەجێ بکا، ئەوەتا جارێك فەرمووی: «وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا ، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا».[1]

واتە: ئەی ئونەیس هەڵسە بڕۆ بۆلای ژنی ئەم کابرایە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکە، ئەگەر دانی بەتاوانی زیناکردندا نا بەردەبارانی بکە.

دروستە بۆ (سیّد)ی خاوەن کۆیلە، ئیقامەی حەد لەسەر کۆیلەی خۆی ئەنجام بدا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «إِذَا زَنَتِ الأَمَةُ فَتَبَيَّنَ زِنَاهَا فَلْيَجْلِدْهَا ، وَلاَ يُثَرِّبْ ، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَلْيَجْلِدْهَا ، وَلاَ يُثَرِّبْ ، ثُمَّ إِنْ زَنَتِ الثَّالِثَةَ فَلْيَبِعْهَا ، وَلَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعَرٍ».[2]

## حەدی زینا

زینا حەرامەو یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، قورئان دەفەرموێ: {وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً – الإسراء/٣٢}.

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد ئاخۆ کام گوناە لەهەموو گوناهێك گەورەترە؟ فەرمووی: «أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ». ئەوە هاوەڵ بۆ خودا دابنێی وەلحال ئەو تۆی بەدی هێناوە. وتم: پاشان کام تاوان؟ فەرمووی:

---

[1] لەوە بەولاوە تەخریجەکەی دەهێنین.

[2] متفق عليه: خ(٦٨٣٩/١٦٥/١٢)، م(١٧٠٣/١٣٢٨/٣).

«وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ» منداڵی خۆت بفەوتێنی بیکوژی لەترسی ئەوەی خواردنت لەگەڵ بخوا، واتە وابزانی ئەو رزقی تۆ دەخواو ئەگەر لەگەڵت دابێ هەژارت دەخا. وتم: پاش ئەوە چی تاوانێك زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: «أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ».[1] ئەومیە زینا لەگەڵ هاوسەری جیرانەکەتدا بکەی.

قورئان دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً. يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً. إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً – الفرقان/٦٨-٧٠} موسوڵمانی راستاڵ ئەوانەن کە بەندایەتی هەر بۆ خودا دەکەن‌و لەگەڵ خودا خودای تر ناپەرستن، بەناحەق نەفسێك کەخودا کوشتنی حەرام کردوە ناکوژن، زینا ناکەن، کەسێك کارێکی ئاوا ناپەسەند ئەنجام بدا تووشی سزای دۆزەخ دەبێ رۆژی قیامەت سزای دۆزەخی بۆ دوو چەندانە دەکرێتەوە بەریسوایی تێیدا دەمێنێتەوە بۆ هەتا هەتایێ. مەگەر کەسێك بێ تۆبە بکاو ئیمانی پتەوی هەبێ کردەوەی باش ئەنجام بدا، ئەو جۆرە کەسانە خودا خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێ بەچاکە.

لە حەدیثی سەمورەی کوڕی (جندب الطویل) دەربارەی خەوبینینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)دا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى مِثْلِ التَّنُّورِ – قَالَ فَأَحْسِبُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ – فَإِذَا فِيهِ لَغَطٌ وَأَصْوَاتٌ – قَالَ – فَاطَّلَعْنَا فِيهِ ، فَإِذَا فِيهِ رِجَالٌ وَنِسَاءٌ عُرَاةٌ ، وَإِذَا هُمْ يَأْتِيهِمْ لَهَبٌ مِنْ أَسْفَلَ مِنْهُمْ ، فَإِذَا أَتَاهُمْ ذَلِكَ اللَّهَبُ ضَوْضَوْا –

---

[1] متفق علیه: خ(٦٨١١/١١٤/١٢)، م(٨٦/٩٠/١)، د(٢٢٩٣/٤٢٢/٦).

قَالَ – قُلْتُ لَهُمَا مَا هَـؤُلاَءِ قَـالَ: قَـالاَ فَـإِنَّهُمُ الزُّنَـاةُ وَالزَّوَانِـي».[1] رۆیـشتین تـا گەیشتینـە سەر چاڵێکی قوڵ وەکوو تەندور – راوی دەڵێ: وابـزانم پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی – کە گوێمـان راگـرتو سـەیرمان کـرد هەراو هۆریایەکی لێ دەهات، کە لێـی وردبوینـەوەو روانیمـان پیـاوو ئـافرەتی روتو قوتی تێدابوون، لەژێر خۆیانەوە بڵێسەیان بۆ دەهات جا کە گـەرمایی‌و بڵێسەیان بۆدەهات دەستیان دەکرد بە هاوارو نوزانەوەو کرووزانەوە، فـەرمووی بـەدوو هاوەڵەکـەم گـوت: ئەوانـە کێن‌و چێیان کـردووە ئـاوا سـزایان دەدرێ؟ وتیان: ئەوانە پیاوی زیناکەرو ئافرەتی زیناکەرن.

لـە ئیبنـو عەبباسـەوە ریوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: « لاَ يَزْنِي الْعَبْدُ حِينَ يَزْنِي وَهْـوَ مُـؤْمِنٌ ، وَلاَ يَـسْرِقُ حِـينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ ، وَلاَ يَشْرَبُ حِينَ يَشْرَبُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ ، وَلاَ يَقْتُـلُ وَهْـوَ مُـؤْمِنٌ». مـرۆڤ کـە زینـا دەکا لەوکاتـەدا موسـوڵمان نامێنـێ، کـە دزی دەکـا لەوکاتـەدا ئیمـانی نامێنـێ، عـەرەقخۆر لـەکاتی عەرەقخواردنەوەکەیـدا ئیمـانی نامێنـێ، بکوژ کە موسوڵمانێك دەکوژێ لەوکاتە ئیمانی لێ دادەڕندرێ.

عیکریمـە دەڵـێ: بـە ئیبنـو عەبباسـم گـوت: ئیمـان‌و بـاوەڕ چـۆن لـەو تاوانبارە دادەڕندرێ؟ دەڵێ: ئیتر ئیبنو عەبباس پەنجەی دەستەکانی تێکنـان‌و پاشان پەنجەکانی لێك دەرهێنـان – جائەگـەر تۆبـەی کـرد بیروباوەڕەکـەی بـۆ دەگەڕێتەوە ئەمجار پەنجەکانی تێکنانەوە - .[2]

زیناکەر ئەگەر موحصەن بوو واتە: پیاو ژنی هێنابوو یـان ئـافرەت شـوی کردبوو بە نیکاحی صەحیح جوتبوونیان بۆ دەستەبەر بوبـوو دوای ئـەوە بـە

---

[1] صحيح: (ص.ج/٣٤٦٢)، خ(٧٠٤٧/١٢/٤٣٨).

[2] صحيح: (ص.ج/٧٧٠٨)، خ(٦٨٠٩/١٢/١١٤)، ن(٨٦٣).

ئیختیـاری خۆیـان ئـەو تاوانـەیان ئەنجامـدا ئـەوە حەدەکـەیان رەجـم کردنـە تادەمرن.

لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەلئەنصارییەوە ڕیوایـەتکراوە: کە پیاوێك لـەهۆزی ئەسـلەم هاتـە خزمـەت پێغەمبـەرو عـەرزی کـرد: کـە تـاوانی زینـای ئەنجامـداوە، چـوارجار شـایەتی لەخۆیـدا، ئـیتر پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمانی کـرد بـە بـەردەبارانکردنی، ئـەم پیـاوە لـەوەپێش ژنـی هێنابوو.[1]

لە ئیبنو عەبباسـەوە ڕیوایـەتکراوە: کـە عومـەری کـوڕی خـەتاب ڕۆژێك وتـاری بـۆ موسـوڵمانان دا؛ فـەرمووی: پـەروەردگار حـەزرەتی موحەممـەدی بەحەق‌و راستی رەوانەکرد، قورئانی بۆسەر نازڵ کردوە، لەو ئایەتانەی تێیدا نـازڵ کـراون ئایـەتی رەجـم بـوون، خوێندومانەتـەوەو لێیـان حـاڵی بـووین‌و لەماناکـەیان گەییـشتین، بـەگوێرەی ئایەتەکـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) زیناکەری موحصەنی بەردەباران کـرد، ئێمـە هـەروا دوای لـەدونیا دەرچـوونی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەوشـێوە زیناکـەری موحصەنمان بەردەبارانکردوە، دەترسم ڕۆژگارێکی زۆر تێپەڕێ‌و خەڵکی بڵـێ: ئێمە لە قورئاندا ئایەتی رەجمکردن نابینین، ئیتر بەم هۆیەوە خەڵکی واز لـە ئەنجامـدانی فـەریـضەیـەکی وا بێـنن کـەخودا لـە قورئانـدا نـازڵی کـردوەو گومڕابین، رەجمکردن لە قورئاندا حەق‌و چەسپاوەو پێویـستە ئـەنجام بـدرێ لەسەر کەسێك موحصەن بێ‌و زینابکا چ پیاو بێ چ ژن بێ، بەمەرجێ شایەت هەبێ یان ئافرەتەکە سکی هەبێ یان لەرێی دان پیانانەوە بچەسپێ.[2]

---

[1] صحیح: (ص.د/٣٧٢٥) ، ت(١٤٥٤/٤٤١/٢)، د(٤٤٠٧/١١٢/١٢).

[2] متفق علیه: خ(٦٨٣٠/١٤٤/١٢)، م(١٦٩١/١٣١٧/٣)، د(٤٣٩٥/٩٧/١٢).

## حەددو تۆڵەستاندن لەكۆیلە

ئەگەر غەیری مرۆڤی ئازاد – چ كەنیزەك بێ یان بەندە – زینای كرد رەجمی لەسەرنیە، وەڵێ پەنجا داری حەدی لێ دەدرێ، ئاماژە بە فەرمایشتی پەروەردگار {فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ – النساء/٢٥} ئەگەر كۆیلە بوو نە موحصەنو زینایان لێ رودرا ئەوە نیوەی سزای مرۆڤی ئازادیان لەسەرە.

لە عەبدوڵڵای كوڕی عەیاشی (المخزومی)یەوە ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: عومەری كوڕی خەتاب فەرمانی پێ كردم لەگەڵ كۆمەڵە گەنجێكی قوڕەیشی، ئەركی جەڵدە لێدانی كۆیلەو كەنیزەك بخەینە ئەستۆمان، ئیتر پەنجا جەڵدەمان لێ دەدا.

## كەسێك بەزۆر زینایان پێ كرد حەدی لەسەر نیە

لە ئەبو عەبدوڕەحمانی (السلمي)یەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: ئافرەتێكیان هێنایە لای عومەری كوڕی خەتاب كە ئەم ئافرەتە تینوایەتی تینی بۆ دێنێ بەلای شوانێكدا تێدەپەڕێو داوای ئاوی لێ دەكا، ئەویش پێی دەڵێ تاخۆتم تەسلیم نەكەی ئاوت نادەمێ، ئافرەتەكەش بەناچاری خۆی تەسلیم دەكاو زینای لەگەڵ دەكرێ. ئیتر حەزرەتی عومەر دەستی كرد بە ڕاوێژكردن لەگەڵ خەڵكدا دەربارەی ڕەجمكردنی ئافرەتەكە، حەزرەتی عەلی فەرمووی: ئەم ئافرەتە ناچاربووە، من وای بۆ دەچم ئەم ئافرەتە مەرەخەس بكرێو تۆڵەی زینای لێ نەسەندرێ.[1]

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٣١٣)، هق(٨/٢٣٦).

## تۆڵەی زیناکەر کە موحصەن نەبێ

قورئان دەفەرموێ: {الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ}. ئافرەتی زیناکەرو پیاوی زیناکەر ئەگەر زینایان کردو موحصەن نەبوون، ئەوە هەریەکەیان سەد جەڵدەیان لێ بدەن، هیچ بەزەییتان پیانەیەتەوە بەباشی یاسای خودا جێبەجێ بکەن، ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، با کۆمەڵێك لە موسوڵمانان ئامادەی تۆڵە لێ ستاندنو سزادانی ئەو دوو زیناکەرانەبن.

لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیست: کەفەرمانی کرد دەربارەی کەسێك کە زینای کردبێو موحصەن نەبێ سەد جەڵدەی لێ بدرێو ساڵێکیش لە وڵاتی خۆی دوور بخرێتەوەو ئازاری غەریبی بچێژێ.[1]

لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: « خُذُوا عَنِّي خُذُوا عَنِّي قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ وَالرَّجْمُ».[2] لەمنەوە فێربنو بڕیار وەربگرن، لەمنەوە فێربنو بڕیار وەربگرن، بێگومان پەروەردگار یاساو ڕێسای تۆڵە ستاندن لە ئافرەتانی زیناکەری رون کردۆتەوە. کچو کوڕ ئەگەر زینایان لێ رودرا هەریەکەیان سەد جەڵدەی لێ دەدرێ، پیاوو ژن ئەگەر بەشێوەی شەرعی لەوەپێش پرۆسەی هاوسەرگیریان ئەنجام دابێو ئەمجار زینایان لێ رودرا، ئەوە هەریەکەیان سەد داری حەدی لێ دەدرێو ئەمجار بەردەباران دەکرێن.

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٣٤٧) ، خ(٦٨٣١/١٥٦/١٢).

[2] صحيح: (مختصر م/١٠٣٦)، م(١٦٩٠/١٣١٦/٣)، د(٤٣٩٢/٩٣/١٢).

## به چ بەڵگەیەك سزاو حەدی زینا دەچەسپێ؟

حەد بە یەكێك لەدوو شت دەچەسپێ، دان پیانـان، شـایەت. هەركەسێك بـۆ خـۆی دان بـەوەدا بنـێ كـە زینـای كـردوە ئـەوە جێبـەجێ كردنـی حـەدی لەسەر دەچەسپێ، ئامـاژە بـەوە: كـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ماعیزو (ألغامدیة)ی بـەردەباران كـردن لـە ئاكامی دان پیانـانی خۆیـان لەسـەر خۆیان كەوا زینایان كردوە.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتكراوە، فەرموویـەتی: كاتێـك مـاعیزی كـوڕی مالیك هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانی بەوەدانا كە زینای كردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێـی فـەرموو: « لَعَلَّـكَ قَبَّلْتَ أَوْ غَمَزْتَ أَوْ نَظَرْتَ». لەوانەیە ماچت كردبێ، لەباوەشت گرتبێ، سەیرت كردبێ ؟! مـاعیز وتـی: نەخـەیر ئـەی پێغەمبـەری خـودا! هـیچ كامـێ لەوانـە نەبوون، فەرمووی: «أَنِكْتَهَا» سواری بـووی‌و لەگـەڵی‌دا جوتبـووی؟ وتـی بـەڵێ لەگـەڵی جوتبـوم. جـا ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: ئـیتر پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی‌دا بە بەردەبارانكردنی.[1]

لە سولەیمانی كوڕی بوڕەیدەوە ئەویش لەباوكی‌یـەوە دەگێڕێتـەوە دەڵێ: ئافرەتێكی خێڵـی غامیـد لـەهۆزی (الأزد) هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! پـاكم بكـەرەوە، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «وَيْحَكِ ارْجِعِي فَاسْـتَغْفِرِي اللَّـهَ وَتُـوبِي إِلَيْهِ». هـاوار بـۆ تـۆ، سـەربەڤوڕ، پاشـگەزبەرەوەو داوای لێخۆشـیبوون لـەخودا بكە، ئافرەتەكە وتی: ئایا دەتـەوێ لـەدان پیانانەكـەم ژیـوانم بكەیـەوە وەكـوو چۆن ویستت ماعیز ژیوان بكەیەوە، كار لەكار ترازاوە، فـەرمووی: «وَمَا ذَاكِ»؟

---

[1] صحیح: (ص. د/٣٧٢٤)، خ (١٢/١٣٥/٦٨٢٤)، د (١٢/١٠٩/٤٤٠٤).

چی ڕویداوە؟ وتی: من دووگیانم لە ئاکامی زیناوە، فەرمووی: «آنْتِ»؟ تۆ دووگیانی لەئاکامی زیناوە؟ وتی بەڵێ: ئەمجار پێی فەرموو: «حَتَّى تَضَعِي مَا فِي بَطْنِكِ». بڕۆرەوە چاوەڕوان بە تا منداڵەکەت دەبێ، ڕاوی دەڵێ: پیاوێکی ئەنصاری حەواندنەوەی ئافرەتەکەی لەئەستۆ گرت هەتا منداڵەکەی بوو، کابرای ئەنصاری هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد ئافرەتە غامیدییەکە منداڵەکەی لێ بۆوە، فەرمووی: «إِذًا لاَ نَرْجُمَهَا وَنَدَعَ وَلَدَهَا صَغِيرًا لَيْسَ لَهُ مَنْ يُرْضِعُهُ». کەوابێ ئێمە نایەین بەردەبارانی بکەین‌و منداڵەکەی بەزارۆکی بمێنێتەوە کەس نەبێ شیری بداتێ، کابرایەکی ئەنصاری دەستی هەڵبڕی‌و عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! من ئەرکی شیرپێدانی لە ئەستۆ دەگرم، ڕاوی حەدیثەکە دەڵێ: ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانیدا ئافرەتەکە بەردەباران کرا.[1]

ئەگەر هاتوو کابرا لەدانپێدانەکەی پاشگەزبوەوە وازی لێ دەهێندرێ، ئاماژە بەو حەدیثەی نوعەیمی کوڕی هەززال ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: ماعیزی کوڕی مالیك هەتیو بوو لەژێر چاودێری باوکم‌و لەژێر سایەی ئەودا پێگەیی. لەگەڵ کەنیزەکێك تووشی تاوانی زینابوو....... تاکۆتایی حەدیثەکە، کە دەفەرموێ: «فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُرْجَمَ – قَالَ – فَأُخْرِجَ بِهِ إِلَى الْحَرَّةِ فَلَمَّا رُجِمَ فَوَجَدَ مَسَّ الْحِجَارَةِ جَزَعَ». پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بە بەدەربارانکردنی، ئیتر ئەوەبوو بردرا بۆ (الحرة) کە کەوتۆتە قەراخی مەدینە، جا کەبەردەباران کرا ئازاری بەردەکانی پێ گەیی لە دانپێدانەکەی پاشگەز بۆوەو ویستی خۆی قوتار بکاو هەڵات عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس ڕوبەڕوی بویەوە، هاوەڵەکانی تری دەستەوەستاند بوون‌و بۆیان نەگیرایەوە،

---

[1] صحيح: (مختصر م/١٠٣٩)، م (٣/١٣٢١/١٦٩٥).

ئیتر عەبدوڵڵا لولاکە حوشترێکی پیا ماڵیو کوشتی، پاشان هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: «هَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ لَعَلَّهُ أَنْ يَتُوبَ فَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَيْهِ».[1] دەی بۆچی وازتان لێ نەهێنا، بەڵکوو تۆبەی بکردایەو خودا تۆبەی لێ قبوڵ بکردایە.

لە ڕیوایەتێکی تردا کە لەجابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: کە گەڕاینەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «فَهَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ وَجِئْتُمُونِي بِهِ»؟ دەی بۆ وازتان لێ نەهێناو بیهێنن بۆلای من؟ بۆ ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکا. نەك بۆ ئەوەی حەدەکەی لەسەرلابا واتە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو فەرموودەی فەرموو مەبەستی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە بوو بۆ ئەوەی ئەگەر شوبهەیەکی تێدا بەدی کرد بەهۆی ئەو شوبهەوە حەدەکەی لەسەر هەڵگرێ، خۆ ئەگەر شوبهەی تێدا نەبینی حەدەکەی لەسەر تەنفیز بکا، کەواتە مەبەست ئەوە نیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەهاوەڵان کردبێ وازی لێ بێنن، هەروا ئەوە ناگەیەنێ کە هەڵاتنی تاوانبار لەحەدو هەوڵدانی بۆ خۆ قوتار کردن دەچێتە خانەی ئەو شتانەی دەبنە لەمپەڕ لە ئەنجامدانی حەد بۆیە فەرمووی: «فَهَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ وَجِئْتُمُونِي بِهِ».

## حوکمی کەسێك دان بەوەدا بنێ کە زینای لەگەڵ فلاّن ئافرەت کردووە

ئەگەر پیاوێك دانی بەوەدانا کە خۆی زینای لەگەڵ فلاّن ئافرەت کردووە، ئەوە حەددی شەرعی لەسەر ئەنجام دەدرێ. ئەمجار ئافرەتەکە

---

[1] صحيح دون قوله (لعلة أن.......) (ص. د/٣٧١٦)، د (١٢/٩٩/٤٣٩٦).

ئەگەر ئەویش ئیعترافی لەسەر خۆی کرد حەددی شەرعی لەسەر جێبەجێ دەکرێ، ئەگەر نکوڵیشی لێکرد ئەوە حەددی لێ نادرێ.

لە ئەبو هورەیرەو زەیدی کوڕی خالیدەوە ڕیوایەتکراوە: کە دوو پیاو کێشەیان لەنێواندا پەیدا بوو، چوونە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکێکیان وتی: بەگوێرەی نامەی خودا دادگاییمان بکەو بڕیارمان لەنێواندا بدە. ئەویتریان تێگەیشتوتر بوو وتی بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! بەگوێرەی قورئان حوکم بکە لەنێوانماندا ئیزنیشم بدە با قسە بکەم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: {تَكَلَّمْ} دەی قسەی خۆت بکە. کابرا وتی کوڕەکەم لای ئەم کابرایە بەکرێ گیراو بوو ڕەنجبەری بوو، زینای لەگەڵ ژنی ئاغاکەی کردووە، پرسیارم کردووە پێیان ڕاگەیاندوم کە ئەوەی لەسەر کوڕەکەمە ئەوەیە: بەردەباران بکرێ، منیش سەد سەر مەڕم بۆ کردووە بەفیدیەو کەنیزەکێکیشم داوە. دوایی پرسیارم لە زانایان کردووە وتیان: ئەوەی لەسەر کوڕەکەت پێویستە ئەوەیە سەد داری حەددی لێ بدرێو ساڵێکیش لەزێدی خۆی دوور بخرێتەوە. بەردەبارانکردن بۆ ژنی کابرایە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ ، أَمَّا غَنَمُكَ وَجَارِيَتُكَ فَرَدٌّ عَلَيْكَ». سوێندم بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە ئەمن بەگوێرەی قورئان حوکم دەکەم لەنێوتاندا، مەڕەکان و کەنیزەکەکەت دەگەڕێندرێتەوە بۆت، ئەمجار فەرمانی کرد سەد داری حەددیان لەکوڕی کابرا دا، ساڵێکیش لەزێدی خۆی دوور خرایەوە، فەرمانیشی بە ئونەیسی (الأسلمی) کرد کەبچێ بۆلای ژنی کابرا

ئەگەر دانی نا بە تاوانەکەیدا بەردەبارانی بکا، ئافرەتەکە دانی نا بەوەی کەراستە زینای کردووە، ئیتر ئونەیس رەجمی کرد[١]

## چەسپاندنی زینا بەهۆی شایەت

پەروەردگار دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ – النور/٤}: ئەوانەی بوختان بۆ ئافرەتی داوێنپاك هەڵدەبەستن و پاشان بۆ چەسپاندنی داواکەیان ناتوانن چوار شایەت ئامادە بکەن، یەکی هەشتا داری حەددیان لێ بدەن لەتۆڵەی بوختان هەڵبەستنەکەیاندا، ئەوانە بەم بوختان هەڵبەستنەیان فاسق بوون شایەتیدانیان لێ قبوڵ ناکرێ.

جا ئەگەر چوار پیاوی موسوڵمانی عاقڵ شایەتییاندا بەوەی: کە بەچاوی خۆیان دیتویانە هێنی فلان کەس لەوانێکی فلاندا وەکوو کلچیوك لەناو کلداندا یان دۆڵچە لەناو بیردا دەهاتوو دەچوو، ئەوە پیاوەکەو ئافرەتەکەش هەردووکیان داری حەددیان لێ دەدرێ.

ئەگەر سێیان شایەتیداو چوارەمینیان شایەتی نەدا، ئەوە زیناکە ناچەسپێ و سێ شایەتەکە بە بوختانکەر لە قەڵەم دەدرێن و داری حەددی بوختانیان لێ دەدرێ. ئاماژە بە بەمانای ئایەتەکە... هەروا ئاماژە بەو ریوایەتەی لە قەسامەی کوڕی زوهەیرەوە هاتووە: کە دەڵێ: کاتێك ئەوەی ئەبو بەکرەو (المغیرة) روویدا، - ئەمجار حەدیثەکەی گێڕایەوە – دەڵێ: بانگی شایەتەکانیان کرد بۆ شایەتیدان، ئەوەبوو ئەبو بەکرەو شیبلی کوڕی میعبەدو ئەبو عەبدوڵڵا (نافیع) شایەتییاندا، ئیمامی عومەر (رەزای خودای

---

[١] متفـــــق علیـــــــه: خ (٢٧، ٦٨٢٨/١٣٦/١٢)، م (٩٧/١٦٩٨/١٣٢٤/٣)، د (٤٤٢١/١٢٨/١٢)، ت (١٤٥٨/٤٤٣/٢)، جه (٢٥٤٩/٨٥٢/٢)، ن (٢٤٠/٨).

لێ بێ) کاتێك ئەم سێیە شایەتیاندا وتی: بەڕاستی ئیشی ئەبو بەکرە قورس بوو، جا کە زیاد هات بۆ ئەوەی شایەتی بداو شایەتەکان ببنە چوار عومەر پێی فەرموو: خوا یاربێ بەحەقو ڕاستی شایەتی دەدەی، زیاد وتی: من ناتوانم شایەتی زینا بدەم بەو شێوە بڵێم بەچاوی خۆم دیومە هینی کابرا لەوانێکی فلاندا بوو، وەلێ من شتێکی نەشیاو خراپم بینی، ئیمامی عومەر وتی: (الله أکبر) زیناکە نەچەسپا. داری حەددی بووختانیان لەسێ شایەتەکە بدەن، ئەوەبوو داری حەددیان لێ دان، قەسامە: کەڕاوی حەدیثەکەیە دەڵێ: ئەبو بەکرە دوای جەڵدە لێدانەکەش وتی: شایەتی دەدەم ئەو کابرایە زینای کرد، ئیمامی عومەر ویستی دووبارە داری حەدی بوختانی لێ بداتەوە، ئیمامی عەلی نەهی لێ کرد فەرمووی: ئەگەر جەڵدەی بوختانی لێ بدەی، دەبێ (المغیرة)ی هاوڕێشت بەردەباران بکەی، ئیتر عومەر وازی لێ هێناو سەرلەنوێ داری حەدی بوختانی لێ نەدایەوە.[1]

## حوکمی کەسێك زینا لەگەڵ مەحرەمی خۆی بکا

کەسێك زینا لەگەڵ مەحرەمی خۆی بکا سزاکەی کوشتنە موحصەن بێ یان غەیرە موحصەن بێ. ئەگەر مەحرەمی خۆی مارە بکا، دەشکوژرێو ماڵەکەشی داگیر دەکرێ.

لە (البراء) گێڕدراوەتەوە دەڵێ: توشی مامم بووم، ئالایەکی پێ بوو پێم وت: بۆ کوێ دەچی؟ وتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردومی بچم بۆسەر پیاوێك باوەژنی خۆی مارە کردۆتەوە دوای مردنی باوکی، فەرمانی پێ کردووم لەملی بدەم ماڵو سامانیشی وەربگرم.[2]

---

[1] إسناد صحيح (الإرواء ٨/٢٩)، هق (٨/٣٣٤).

[2] صحيح: (الإرواء/٢٣٥١)، صحيح: (ص.) (ص. جه/٢١١١)، (١٢/١٤٧/٤٤٣٣).

## حوكمی كەسێك بچێتەلای ئاژەڵو شتی وا

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ وَقَعَ عَلَى بَهِيمَةٍ فَاقْتُلُوهُ وَاقْتُلُوا الْبَهِيمَةَ».[1] كەسێك كاری جوتبوونی لەگەڵ وڵاخو ئاژەڵو شتی وادا كرد بیكوژنو حەیوانەكەش بكوژن.

## سزای نێربازی

ئەگەر كەسێك نێربازی لەگەڵ ئادەمیزادی نێرینەدا كردو هێنەكەی خۆی ئاودیوی كۆمی كرد، سزای هەردووكیان كوشتنە موحصەن بێ یان غەیرە موحصەن.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ».[2] هەركاتێك كەسانێكتان بینی پەیڕەوی قەومی لوطیان دەكرد نێر سواری نێر دەبوو ئەوە بكەرو ئیش لەگەڵ كراو (فاعلو مفعول) بكوژن.

## سزای بوختان

لێرەدا بوختان: بریتییە لەوە تۆمەتی زینا پاڵ داوێنپاكێك بدرێ، بەم جۆرە بە یەكێك بڵێ: شڕواڵ پیس، زیناكەر، یان هەر دەستەواژەو كەلیمەیەك كە مانای زیناو شڕواڵ پیسی بگەیەنێ.

بوختان یەكێكە لەتاوانە گەورە بەهیلاكبەرەكان، قورئان دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ – النور/٢٣} بێگومان ئەوانەی بوختان بەئافرەتی داوێنپاكی بێ

---

[1] حسن صحيح (ص. ت/١١٧٦)، ت (١٤٧٩/٢/٨)، د (٤٤٤٠/١٥٧/١٢).

[2] صحيح: (ص. جه/٢٠٧٥)، ت (١٤٨١/٣/٨)، د (٤٤٣٨/١٥٣/١٢).

ئاگاو خەبەرو موسوڵمان دەکەن، نـەفرینیان لێ کـراوە لـەدونیاو لەقیامەتـداو سزای بەئێش‌و سامناکیان بۆ بڕیار دراوە.

لـە ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فـەرمووی: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ». خۆتـان بپـارێزن لـە حـەوت تاوانە بەهیلاکبەرەکە، هاوەڵان عـەرزیان کـرد ئـەو تاوانانـە چی‌و چین ئـەی پێغەمبەری خودا!؟ فەرمووی: «الشِّرْكُ بِاللَّهِ ، وَالسِّحْرُ ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ، وَأَكْلُ الرِّبَا ، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ ، وَالتَّـوَلِّي يَـوْمَ الزَّحْـفِ ، وَقَـذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلاَتِ»[1] هـاوەڵ دانـان بـۆ خـودا، سیحرو جادوبـازی، کوشـتنی نەفـسی موسـوڵمان کـە خـودا حـەرامی کـردووە مەگـەر بەحـەق، خواردنی ڕیباو سود، خواردنی ماڵی هەتیو، پشت هەڵکردن لەبـەرەی جەنگ‌و هـەڵاتن لەغـەزا، بوختـانکردن بـە ئـافرەتی داوێنپـاکی بـێ ئاگـاو خەبـەرو موسوڵمان.

کەسێك بوختان بە موسوڵمانێك بکا هەشتا داری حەدی لێ دەدرێ وەکوو پەروەردگار دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَـمْ يَـأْتُوا بِأَرْبَعَـةِ شُـهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْـدَةً وَلا تَقْبَلُـوا لَهُـمْ شَـهَادَةً أَبَـداً وَأُولَئِـكَ هُـمُ الْفَاسِـقُونَ — النور/٤} ئەوانەی بوختان بە ئافرەتی داوێنپاك دەکەن، پاشان چوار شـایەت ناهێنن بۆ ڕاستی داواکەیان هەشتا داری حەدیان لێ بدەن‌و هـەرگیز شـایەتیان لێ وەرمەگرنەوە، ئەوانە فاسق‌و تاوانبارن.

## نەفرین کردنی ژن‌و مێرد لەیەکتری (اللعان)

لـە ئیبنـو عەبباسـەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: کـە هـیلالی کـوڕی ئومەییـە بوختانی بۆ ژنەکەی هەڵبەست، لەخزمـەت پێغەمبـەردا ئـەوەی ڕاگەیانـد کـە

---

[1] متفق علیه: (ص. ج/١٤٤).

خێزانەکەی لەگەڵ (شەریکی کوڕی سەحماء)دا زینای کردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو بەلگەو شایەت بێنە ئەگینا داری حەدی بوختانکردن لەپشتت دەدەم، هیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن دەبێ کە یەکێك لەئێمە پیاوێکی بینی بەسەر ژنەکەیەوە بچێ بگەڕێ بەدوای شایەتدا؟ بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر دەیفەرموو: «الْبَيِّنَةَ وَإِلاَّ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ». شایەت بێنە ئەگینا داری حەد لە پشتت دەدرێ، هیلال وتی: سوێندم بەو کەسەی تۆی بەحەق ڕەوانە کردووە، من ڕاست دەکەمو بوختان ناکەم، دڵنیام پەروەردگار سروش نازڵ دەکاو پشتی من لەداری حەد دەپارێزێ، ئیتر حەزرەتی جوبرائیل هاتە خوارو ئایەتی {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنْ الصَّادِقِينَ – النور/٦} بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هێنا ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدووی ژنەکەی هیلالیدا نارد، هیلالیش هات شایەتی دا. پێغەمبەریش دەیفەرموو: «إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ»؟ خودا ئاگادارەو دەزانێ کە یەکێکتان درۆ دەکا. ئەمجار ئافرەتەکە هەڵسا شایەتی خۆی دا چوار جار شایەتیەکەی دا، کە گەیشتە جاری پێنجەم ڕایانگرت پێیان گوت ئەمەیان (موجبە)و چەسپێنەرە ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئافرەتەکە هەڵوێستەیەکی کردو تۆزێك بێ دەنگ بوو، بەجۆرێك گومانی ئەوەمان برد، کە لەشایەتیەکەی ژیوان دەبێتەوە، پاشان وتی: حەیای قەومەکەم نابەم ئەو ئابڕو بردنە ناخەمە سەرشانی خۆم، ئیتر پێوەرۆیی وتەکانی لیعانی تەواو کردن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَبْصِرُوهَا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ ، فَهْوَ لِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ» بزانن ئەگەر ئەم ئافرەتە منداڵێکی بە وەلەد هێنا چاوڕەشو چاوگەورە سمتو کەفەڵ زلو قولو قاچ ئەستور

ئـەوە مانـای وایـە منداڵەکـە لـە شـەریکی کـوڕی سـەحماء پەیـدا بـووە. کـە ئافرەتەکە منداڵی بوو دەق سەروشکڵی بەوشێوە بـوو کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەسـت نیـشانی کـرد، ئـیتر پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فـەرمووی: «لَوْلاَ مَا مَضَى مِنْ كِتَـابِ اللَّـهِ لَكَـانَ لِـي وَلَهَـا شَـأْنٌ»[1] ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە قورئان ئـەوەی بڕیوەتـەوە حوکمەکـەی وا ئاراسـتە کردووە، ئەگینا من دەربارەی ئەو ئافرەتە جۆرێکی تر هەڵس‌وکەوتم دەکرد.

## ئەو حوکمو ئاکامانەی بەهۆی لیعان دێنەدی

ئەگەر ژنو مێرد لیعانیان کـرد بـەم نـەفرین لێکردنـەیان ئـەم حوکمانـە دێنە دی.

١- لێـك جیابوونـەوەی ژنو مێـردو نـەمانی گرێبەسـتی نێوانیـان ئامـاژە بەحەدیثی ئیبنو عومەر کە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خودا ڕێو ڕەسمی لیعانی لەنێوان پیاو ژنێکی ئەنصاریدا ئەنجامداو لێکی جیاکردنەوە.[2]

٢- لێك حەرامبوونیان لەیەکتری بۆ هەتا هەتایە، ئاماژە بە قەولی سەهلی کوڕی سەعد کە دەڵـێ: (فَمَضَتِ السُّنَّةُ بَعْـدُ فِـي الْمُتَلاَعِنَـيْنِ يُفَـرَّقُ بَيْنَهُمَـا ثُـمَّ لاَ يَجْتَمِعَانِ أَبَدًا).[3] سوننەتی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) وا بـەڕێوە چـووەو چەسـپاوە کـە هـەر ژنو مێردێـك لیعـان لەگـەڵ یـەکتر بکـەن لێـك جیابکرێنەوەو بەهیچ جۆرێك دروست نەبێ ببنەوە بە ژنو مێردی یەکتری.

٣- مارەیی ئافرەتە لیعان لەگەڵ کراوەکە دەچەسپێو مافی خۆیەتی دەبێ وەری بگرێ. ئاماژە بـەو حـەدیثـەی ئـەییوب لـە سـەعیدی کوڕی جوبـەیرەوە

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٠٩٨)، خ (٨/٤٤٩/٤٧٤٧)، د (٦/٣٤١/٢٢٣٧)، ت (٥/١٢/٣٢٤٩).

[2] متفق عليه: خ (٩/٤٥٨/٥٣١٤)، م (١٤٩٤ — ٩/١١٣٣/٢).

[3] صحيح: (الإرواء/٢١٠٤)، د(٦/٣٣٧/٢٢٣٣)، هق(٧/٤١٠).

ریوایەتی کردوە دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم گوت: پیاوێك بوختانی بۆ ژنەکە هەڵبەست پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چ بڕیارێکی دا؟ وتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژن‌و مێردەکەی خێڵی (بەنی عەجلانی) لێك جیا کردنەوەو فەرموویی: «إِنَّ اللّٰهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ». خودا ئاگادارەو دەزانێ یەکێکتان درۆدەکا، ئایا کامتان لە هەڵوێستی خۆی پاشگەز دەبێتەوەو تۆبە دەکا؟

هیچ کامیان لە هەڵوێستی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە، دوبارە فەرمووی: «إِنَّ اللّٰهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ». هیچ کامیان پاشگەز نەبوونەوە. بۆجاری سێیەم فەرموویەوە: «إِنَّ اللّٰهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ». ئیتر هەردوکیان سووربوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری لێك جیابوونەوەیانی داو لێکی جیاکردنەوە.

ئەمجار ئەییوب دەڵێ: عەمری کوڕی دینار پێی وتم: لە فەرموودەکەدا شتێك هەیە نابینم بیگێڕیەوە، ئەویش ئەوەیە دوای لێك کردنەوەیان پیاوەکە وتی: ئەو ماڵ‌و سامانەی کردومە بە مارەیی بۆی چۆن‌و کەی لێی وەربگرمەوە؟ ئایا ئەو ماڵەم بەفیڕۆ دەڕوا؟ وتی: بەکابرا گوترا: «لاَ مَالَ لَكَ ، إِنْ كُنْتَ صَادِقًا فَقَدْ دَخَلْتَ بِهَا ، وَإِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَهُوَ أَبْعَدُ مِنْكَ».[1] حەقی ئەوەت نیە داوای مارەییەکە بکەی هیچ ماڵێکت لای ئافرەتەکە نیە، چونکە ئەگەر راست بکەی ئەوە (دخولت پێ کردوە) بەوە مارەییەکە بۆتە ماڵی خۆی‌و چەسپاوە. خۆ ئەگەر درۆبکەی لە لیعانەکەتدا ئەوە زۆر ناڕەواو دوورە لە حەق ئەتۆ داوای مارەییەکەی لێ بکەی، بۆئەوەی دوو ستەمی لێ نەکرێ

[1] متفق عليه: خ(٥٣١١/٤٥٦/٩)، م(١٤٩٣/١١٣٠/٢)، د(٢٢٤١،٤٠/٣٤٧/٦).

ستەمێکیان حەیاچـون‌و نـاو زڕانـدنی بـەو تۆمەتـەی پاڵـت داوە. دووەمیـان داواکردنەوەی ماڵێك کە بەشێوەی شـەرعی پێـت داوە بوومتـە مـاڵی حـەلاڵی خۆی.

٤- منداڵەکە دەخرێتە پاڵ ژنە لیعان لەگەڵ کراوەکە، ئاماژە بە حەدیثی ئیبنو عومەر کە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) ڕێ‌و ڕەسمی لیعانی لەنێوان پیاوێك‌و ژنەکەیدا ئەنجام دا، پیاوەکـە خـۆی بـێ بـەری کـرد لـەو منداڵـەی ژنەکـە بەوەلـەدی هێنـابوو، ئـیتر پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێکی جیاکردنەوەو منداڵەکەشی پـاڵ ئافرەتەکـە دا.[1]

٥- چەسپان‌و هەبوونی میرات لێك گرتن لەنێوان ئافرەتە لیعان کەرەکـەو منداڵەکەی. ئاماژە بـە قسەکەی ئیبنـو شیهاب: کـە لـە حـەدیثـەکـەی سـەهلی کـوڕی سـەعددا هـاتووە دەفـەرموێ: «فَكَانَـتِ الـسُّنَّةُ بَعْـدَهُمَا أَنْ يُفَـرَّقَ بَـيْنَ الْمُتَلَاعِنَيْنِ ، وَكَانَتْ حَامِلاً ، وَكَانَ ابْنُهَا يُدْعَى لأُمِّهِ ، قَـالَ ثُـمَّ جَـرَتِ الـسُّنَّةُ فِـي مِيرَاثِهَا أَنَّهَا تَرِثُهُ وَيَرِثُ مِنْهَا مَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ».[2]

## تۆڵەو حەددی دزیکردن

ئـایینی ئیـسلام پارێزگـاریکردنی مـاڵ‌و سـامانی بـەکارێکی پێویـست‌و زەروری داناوەو جەختی لەسەر کردۆتەوە. ئەصڵ‌و واقیع لەهـەموو شتێك دا ئیباحەیـە مەگـەر بەڵگـەی پێچەوانە بێتەکایـەوە. هـەروا نـەهی کـردوە لـە پەیـداکردنی مـاڵ‌و سامان لەڕێگـەی حەرامـەوە، هۆکـارو ڕێبـازە یاسـاغەکانی

---

[1] متفـــــق عليـــــه: خ(٥٣١٥/٤٦٠/٩)، م(١٤٩٤/١١٣٢/٢)، د(٢٢٤٢/٣٤٨/٦)، ت(١٢١٨/٣٣٨/٢)، ن(٦/١٧٨)، جة(٢٠٦٩/٦٦٩/١).

[2] متفق عليه: خ(٥٣٠٩/٤٥٢/٩)، م(١٤٩٢/١١٢٩/٢)، د(٢٢٣٥/٣٣٩/٦).

پەیداکردنی ماڵیشی رونکردۆتەوە {وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ – الأنعام/١١٩} بێگومان ئەوەی حەرامکراوە لەئێوە بۆتان رون کراوەتەوە.

هەڵبەتە جۆرێکیش لە کاسبی حەرام دزیکردنە، واتە هەلگرتنو دزینی ماڵی غەیر بەشێوەیەك پەنامەکیو شاردنەوەی تێدابێو کابرای دز هەوڵ بدا کارەکەی بشارێتەوەو پێی نەزاندرێ.

ئاشکراشە دزیکردن لەتاوانە گەورەکانەو حەدو سزای بۆ دیاریکراوە لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەردا شیکراوەتەوەو کۆڕای ئوممەتی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە.

قورئان دەفەرموێ: {وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِنْ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ – المائدة/٣٨} پیاوو ئافرەت ئەگەر دزییان کردو تاوانەکەیان لەسەر چەسپا دەستیان ببڕن لە تۆڵەی ئەوەی ئەنجامیان داوە... ئەم دەسبڕینە ئیهانەو سوکایەتی پێکردنێکە لەخوداوە بۆیان، خودا باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکداو هەموو بڕیارو حوکمێکی حیکمەتەو بێ هودەیی تێدانیە.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەستی دزێکی بڕی لەسەر دزینی مەتاڵێك نرخەکەی سێ درهەم بوو [1].

ئیبنولمونذیر دەڵێ: زانایان کۆڕایان هەیە لەسەرئەوە پێویستە دەستی دز ببڕدرێ بەمەرجێك دوشایەتی موسوڵمانی ئازادی عادڵ شایەتی لەسەر بدەن.[2]

---

[1] متفق علیه: خ(٦٧٩٥/٩٧/١٢)، م(١٦٨٦/١٣١٣/٣)، ت(١٤٧٠/٣/٣).

[2] الإجماع: ٦٢١/١٤٠.

ئەگەر بابایەكی عاقڵو باڵغ بە ئیختیاری خۆی دزی كرد بۆ خۆی دانی بەدزیەكەیدا نا یان دوو شایەت شایەتییان لەسەردا، ئەو ماڵەی دزی بووی گەیشتبووە حەدی نیصابو لەشوێنی پارێزراوی شیاودا دزی بووی، ئەوە پێویستە دەستی ببڕدرێ.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ إِلاَّ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا».[1] دەستی دز نابڕدرێ هەتا بڕی ئەوەی دزیویەتی نەگاتە روبعێكو زیاتر.

ئیبنولمونذیر دەڵێ: زانایانی موسوڵمان كۆڕایان هەیە لەسەرئەوە بڕینی دەستی دز پێویست نابێ هەتا كابرا ماڵەكە لەشوێنی شیاوی خۆی دەرنەهێنێ.[2]

شوێنی شیاو (حرزالمثل) ئەو شوێنەیە بەعادەت ئەو جۆرە ماڵەی تێدا هەڵدەگیرێ، وەكوو خانوو، وەكوو گەنجینە، وەكوو دوكانی داخراو.

خاوەنی (الروضة الندية) دەڵێ: (حرزالمثل) شوێنی شیاو بۆ ماڵ تێدا هەلگرتن، خەڵكی بەعادەت ئەو جۆرەماڵەی تێدا هەڵدەگرن، بۆنموونە كادێن شوێنی (كا) تێدا هەلگرتنە، تەویلەو ئاغەڵ شوێنی تێدا حەوانەوەی ئاژەڵە، گەوو پەچە شوێنی تێدا حەوانەوەی مەڕو بزنە، كەندوو عەمبارو سایلۆ شوێنی شیاوی دانەوێڵە تێدا هەلگرتنە.

لە عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاصەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیاری لێ كرا دەربارەی دزینی خورما بەسەر درەختەكەیەوە، فەرمووی: «مَنْ أَصَابَ بِفِيهِ مِنْ ذِي حَاجَةٍ غَيْرَ مُتَّخِذٍ خُبْنَةً فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ وَمَنْ خَرَجَ بِشَيْءٍ مِنْهُ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَالْعُقُوبَةُ وَمَنْ سَرَقَ مِنْهُ شَيْئًا بَعْدَ

---

[1] متفق عليه: خ(٦٧٨٩/٩٦/١٢)، م(١٦٨٤-٢-/١٣١٢/٣).

[2] الإجماع: ١٣٩/٦١٥.

أَنْ يُئْوِيَهُ الْجَرِينُ فَبَلَغَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ فَعَلَيْهِ الْقَطْعُ»[1]: کەسێك لەخورمای لێ نەکراوەو نەچندراو کە هێشتا هێشوەکەی بەدرەختەکەوەیە، کەمێکی لێ کردووە بۆ خواردنی خۆیو پێداویستی راگوزەرانەی خۆی، ئەوە بۆی رەوایە سزای لەسەرنیە بەمەرجێك ئەوەندە لێ نەکاتەوە بیخاتە بەرکۆشو بەر هەڵبێنەوە، کەسێك ئەوەندەی لێ رنی بیکاتە بەرکۆشو بەر هەڵبێنەوە، ئەوە دوو چەندانە غەرامە دەگرێو عقوبەتی تەعزیریشی لەسەرە، کەسێك خورمای دزی دوای ئەوەی خرایە گەنجینەو شوێنی هەڵگرتنەوە، ئەگەر بەهاکەی دەگەییشتە نرخی مەتاڵێك ئەوە دەستی دەبڕدرێ. بابای ماڵ لێ دزراو بۆی هەیە کابرای دز عەفوبکا بەمەرجێ داواکە نەگەیشتبێتە لای فەرمانڕەواو نەخرابێتە قاڵبی رەسمیاتەوە.

له صەفوانی کوڕی ئومەیەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: لەمزگەوت نوستبووم پارچە قوماشێکی (چندراو لە خوریو کەمێکی لە ئیبریسم)م بەخۆدا دابوو بەهای سی دیرهەمێك بوو، پیاوێك هات لیێ دزیم، کابرا دزییەکەی لێ ئاشکرابوو دەستگیرکراو هێندرایە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش فەرمانی کرد بەدەست بڕینی، صەفوان دەڵێ: کە بەوەم زانی هاتمە خزمەت پێغەمبەرو عەرزم کرد: ئەوە لەسەر سی درەم دەستی ئەو کابرایە دەبڕی. ئەمن پارچە قوماشەکەی پێ دەفرۆشمو نرخەکەشی بۆ دەکەم بە قەرزی درێژخایەن. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «فَهَلاَّ كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ».[2] دەی بۆچی پێش ئەوەی داوایەکە بگاتە لای من ئەم چارەسەرەت بۆ نەدۆزییەوە؟!

---

[1] حسن: (ص.د/٣٦٨٩)، د(١٢/٥٦/٤٣٦٨)، جة(٢/٢٥٩٦،٨٦٦)، ن(٨٥/٨).

[2] صحيح: (ص.د/٣٦٩٥) ، د(٦٢/٤٣٧١ و ١٢/٦٣)، جة(٢/٨٦٥/٢٥٩٥).

## زانيارييەكی بەسود

زانایـان كۆڕایـان هەیـە لەسـەرئەوە دز ئەگـەر بڕیـاری دەسـت بڕینـی بـۆ دەرچوو یەكەمجار دەستی ڕاستی دەبڕدرێ. ئەگـەر عـاری نـەناو دووبـارە دزی كردەوە، قاچی چەپی دەبڕدرێ، ئەگـەر سـێیەمجار دزی كـرد ڕاجیاییـان هەیـە لەوەدا ئاخۆ دەستی چەپی یان قاچی ڕاستی دەبڕدرێ. زوربـەی زۆری زانایـان فەرموویانـە دەسـتی چـەپی دەبـڕدرێ شـێخی پایەبـەرز خـاوەنی (ألتعليقـات الرضـية: ج٣/٢٩٨) دەفـەرموێ: بڕینـی دەسـتی چـەپی لـە سـێیەمجاری دزیكردنەكەی چەسپاوەو كاری پێكراوە لەلایەن خەلیفەی یەكەم ئەبوبەكری صدیق‌و عومەری كوڕی خەتاب وەكوو بەیهەقی ئامـاژەی پـێ كـردوە ج٣/٢٨٤. ئەمجار ئەگەر هەر عاری نەنا دزی كرد قاچی ڕاستیـشی دەبـڕدرێ پاشان كە هەر وازی نەهێناو سووربوو لەسەر دزیكردن تەعزیر دەكرێ‌و بەند دەكرێ.

## حەددی خۆ سەرخۆشكردن

قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـوا إِنَّمَـا الْخَمْـرُ وَالْمَيْـسِرُ وَالأَنْـصَابُ وَالأَزْلامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ، إِنَّمَا يُرِيدُ الـشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمْ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَـصُدَّكُمْ عَـنْ ذِكْـرِ اللَّـهِ وَعَـنْ الصَّلاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنتَهُونَ – المائدة/٩٠-٩١} ئەی كۆمەڵی بڕواداران بزانن: كە شەراب‌و قومارو سەربڕینی ئاژەڵ لەسـەر بـەردە تایبەتـەكان‌و بـۆ بتـەكانتان‌و تـیرو پـشك هـەموویان كـاری خـراپ‌و پـیس‌و كـردەوەی شـەیتانین‌و خۆیـان لێ بپارێزن، بەڵكوو سەرفرازی دونیاو قیامەت بن‌و لەسـزای خـودا ڕزگارتـان بـێ، شـەیتان كـە ئـەو كارانـەتان لـەپێش چـاو جـوان دەكـا دەیـەوێ بـەهۆی ئالودەبوونتـان بـە شـەراب‌و قومـارەوە بـوغزو كینـەو دوژمنایـەتی بخاتـە

نێوانتانەوە، بەیادی خودا بێ ئاگاتان بکاو نوێژتان لەبیر بەرێتەوە، دەی ئایا ئێوە بەم ئامۆژگاریو پەیامە دڵسۆزانەیە واز لەو کردەوە خراپانەتان دێنن؟

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ ، وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهْوَ مُؤْمِنٌ»[1]

زیناکەر لەوکاتەدا کە زینا دەکا ئیمانی نامێنیو کافرە، شەراب خۆر لەوکاتەدا کە شەراب دەخواتەوە ئیمانی نامێنیو کافرە.

لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الْخَمْرُ أُمُّ الْخَبَائِثِ وَمَنْ شَرِبَهَا لَمْ يَقْبَلِ اللَّهُ مِنْهُ صَلاَةً أَرْبَعِينَ يَوْمًا فَإِنْ مَاتَ وَهِيَ فِي بَطْنِهِ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً».[2] شەراب کانو سەرچاوەی هەموو تاوانەکانە، کەسێك خواردیەوە تا چل ڕۆژ نوێژی قبوڵ نیە، خۆ ئەگەر بمرێو شەرابەکە لە گەدەیدا مابێ ئەوە بەکافری دەمرێ.

لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «الْخَمْرُ أُمُّ الْفَوَاحِشِ وَأَكْبَرُ الْكَبَائِرِ مَنْ شَرِبَهَا وَقَعَ عَلَى أُمِّهِ وَعَمَّتِهِ وَخَالَتِهِ».[3] شەراب کانو سەرچاوەی تاوانەکانەو گەورەترین تاوانە دوای هاوەڵدانان بۆ خودا، کەسێك خواردیەوە عەقڵو هۆشی خۆی لەدەست دەدا لەوانەیە سواری دایکی خۆی ببێ، وێدەچێ سواری پوری (خوشکی باوکی) ببێ، سواری پوری (خوشکی دایکی) ببێ.

---

[1] صحيح: (ص.ج/٧٧٠٧).

[2] حسن (ص.ج/٣٣٤٤)، طس(٣٨١٠).

[3] حسن (ص.ج/٣٣٤٥)، طب(١١٣٧٢/١١٢٠/٢).

له ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مُـدْمِنُ الْخَمْـرِ كَعَابِـدِ وَثَـنٍ».[1] شەرابخۆری بەردەوام وەکوو بتپەرست وایەو حوکمی ئەوی هەیە.

له ئەبو (ألدرداء)ەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَـدْخُلُ الْجَنَّـةَ مُـدْمِنُ الْخَمْـرَ».[2] شەرابخۆری بەردەوام ناچێتە بەهەشتەوە.

له ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لُعِنَـتِ الْخَمْـرُ عَلَـى عَـشَرَةِ أَوْجُـهٍ بِعَيْنِهَـا وَعَاصِـرِهَا وَمُعْتَـصِرِهَا وَبَائِعِهَـا وَمُبْتَاعِهَـا وَحَامِلِهَـا وَالْمَحْمُولَـةِ إِلَيْـهِ وَآكِـلِ ثَمَنِهَـا وَشَـارِبِهَا وَسَاقِيهَا».[3] شەراب لەدەڕووەوە نەفرینی لێکراوە؛ خودی خۆی نەفرینی لێ کراوە چونکە کانی هەموو تاوانێکە، هەروا نەفرین لەو کەسەش کراوە بۆ خۆی دەیگوشێ، ئەو کەسەیش هەوڵ دەدا بیگوشێ بۆ خۆی یان بۆ کەسانی دیکە، فرۆشیارو کڕیارەکەی ئەو کەسەیش کە هەڵی دەگرێ بیبا بۆ کەسانی دی، یان داوا دەکا بۆی بەرن، ئەومیش کە نرخەکەی دەخوا، ئەو کەسەیش کە دەیخواتەوە ئەومیش کە مەیەکە دەگێڕێ.

### ج شتێك پێی دەگوترێ خەمر؟

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كُـلُّ مُـسْكِرٍ خَمْـرٌ وَ كُـلُّ خَمْـرٍ حَـرَامٌ).[4] هەرشتێك

---

[1] حسن (ص.جة/٢٧٢٠)، (الصحيحة: ٦٧٧)، جة(٣٣٧٥/١١٢٠/٢).

[2] صحيح: (ص.جة/٢٧٢١) ، (الصحيحة: ٦٧٨)، جة(٣٣٧٦/١١٢١/٢).

[3] صحيح: (ص.جة/٢٧٢٥) ، جة(٣٣٨٠/١١٢١/٢)، د(٣٦٥٧/١١٢/١٠).

[4] صحيح: (ص.جة/٢٧٣٤) ، م(٢٠٠٣-٧٥/١٥٨٨/٣)، جة(٣٣٩٠/١١٢٤/٢).

سەرخۆشت بكاو عەقڵ بەرێ، بەخەمر لە قەڵەم دەدرێو حوكمی ئەوی هەیە هەرشتێكیش بەخەمر حیساب بكرێ حەرامە.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: پرسیار لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرا دەربارەی (ألبِتْع): كە سركەی هەنگوینەو ئەهلی یەمەن دەیان خواردەوە، پێغەمبەر لە وەڵامدا فەرمووی: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ».[1] هەر شەرابێك سەرخۆش بكا خواردنەوەی حەرامەو لەهەموو ڕویەكەوە حوكمی خەمری هەیە.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتكراوە، فەرمووی: ئیمامی عومەر چووە سەر مینبەرو ڕاوەستاو دەستی كرد بە وتاردانو فەرمووی: بزانن خەمر حەرامەو قورئان نازڵ بووە بە حەرامبوونی، ئەو شەرابە لە پێنج شت دروست دەكرێ لە ترێ، لە خورما، لە هەنگوین، لە گەنم، لەجۆ. خەمر ئەوەیە سەرخۆش بكا هەر خواردنو خواردنەوەیەك مرۆڤی سەرخۆش كردو عەقڵی داپۆشیو لەكاری خست ئەوە خەمرەو حەرامە بیخۆیو بیخۆیەوە.[2]

لە (ألنعمان)ی كوڕی بەشیرەوە ڕیوایەتكراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ مِنَ الْحِنْطَةِ خَمْرًا وَمِنَ الشَّعِيرِ خَمْرًا وَمِنَ التَّمْرِ خَمْرًا وَمِنَ الزَّبِيبِ خَمْرًا وَمِنَ الْعَسَلِ خَمْرًا».[3] بزانن خەمر لەگەنم دروست دەكرێ، لەجۆ دروست دەكرێ لە مێوژ بەرهەم دێندرێ لەخورما دروست دەكرێ لە هەنگوین دروست دەكرێ.

---

[1] متفق عليه: خ(٥٥٨٦/٤١/١٠)، م(٢٠٠٣/٢٣٣٣/٤)، د(٣٦٦٥/١٢٢/١٠).

[2] متفق عليه: خ(٥٥٨١/٣٥/١٠)، م(٣٠٣٢/٢٣٢٢/٤)، د(٣٦٥٢/١٠٤/١٠).

[3] صحيح: (ص.جة/٢٧٢٤) ، جة(٣٣٧٩/١١٢١/٢)، د(٣٦٥٩/١١٤/١٠).

## جوداوازی نیه لەنێوان کەمیو زۆری خەمر

لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ریوایەتکراوە فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ وَمَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ».[١] هەرچی سەرخۆشکەربێ خواردنەوەو خواردنی حەرامە، هەرشتێك زۆرەکەی سەرخۆش بکا کەمەکەشی حەرامە.

لەخاتو عائیشەوە ڕیوایەتکراوە، فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ وَمَا أَسْكَرَ مِنْهُ الْفَرْقُ فَمِلْءُ الْكَفِّ مِنْهُ حَرَامٌ».[٢] هەموو شتێکی سەرخۆشکەر حەرامە. هەرچی زۆرەکەی سەرخۆش بکا خواردنەوەی پڕ بە لوێچێکیشی حەرامە.

## حەددو سزای شەرابخۆر

ئەگەر ئادەمیزادێکی موکەللەف بەویستی خۆی شەرابی خواردەوە دەشی زانی ئەوەی دەیخواتەوە شەرابەو حەرامە ئەوە چل داری حەددی لێ دەدرێ، ئەگەر فەرمانڕەوا وای بەباش زانی زیاد لەچل داری لێ بدا بۆی هەیە لێی زیاد بکا تا دەگاتە هەشتا دار، ئاماژە بەو ریوایەتەی (الحصينی کوڕی المنذر) گێڕاویەتیەوە کە دەڵێ: ئیمامی عەلی لەحەددی شەرابخواردنەوەدا چل داری لە (الوليد)ی کوڕی عوقبەدا، پاشان وتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چل داری لە شەرابخۆر داوە، ئەبوبەکر چل داری لێ داوە، عومەر هەشتا داری لێ دا، هەمووشیان لەچوارچێوەی سوننەتی پێغەمبەردان، من بۆخۆم پێم باشترە هەشتا داری لێ بدرێ.[٣]

---

[١] صحيح: (ص.جة/٢٧٣٦) ، جة(٣٣٩٢/١١٢٤/٢).

[٢] صحيح: (ص.جة/٤٥٥٢) ، ت(١٩٢٨/١٩٤/٣)، د(٣٦٧٠/١٥١/١٠).

[٣] صحيح: (مختصر م/١٠٤٧) ، م(١٧٠٧/١٣٣١/٣).

## حەدد بەدوو شت دەچەسپێ

١- دان پیانانو ئیقرار ٢- شایەتیدانی دوو عادڵ.

## دروست نیە دوعای شەڕ لە شەرابخۆر بکرێ

لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ڕیوایەتکراوە: کە پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەبوو ناوی عەبدوڵڵا بوو نازناوی (حیمار) بوو، قسە خۆش بوو زۆرجار پێغەمبەری دێنایە پێکەنین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر شەرابخواردنەوە داری حەددی لێ دابوو، رۆژێکی تر لەسەر هەمان تاوان هێنایانە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش فەرمانی کرد بەجێبەجێ کردنی حەدد لەسەریو داری حەددی لێ درا، پیاوێك لە ئامادەبوان وتی: خودایە نەفرینی لێ بکە، ئەمە چەندجار هێنایانو داری حەددیان لێ داو عارنانێ.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَلْعَنُوهُ ، فَوَاللَّـهِ مَا عَلِمْتُ أَنَّهُ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ».[1] (دەڵێن وشەی (ما) زێدەیە. هەمزەی (إنّه) بە مەفتوحیو بە مەکسوری دروستە).

نەفرینی لێ مەکەن سوێندم بەخودا ئەو پیاوە من دەزانم خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێن.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: سەرخۆشێکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش فەرمانی کرد بەلێدانی، ئیتر هەمان بوو بە شەپلاغەو مستەکۆڵە لێی دەدا، هەمانبوو بە نەعلەکەی لێی دەدا، هەشمان بوو بە پۆشاکەکەی لێی دەدا، کە کابرا ڕۆیی‌و تێهەڵدانی باشی خوارد، پیاوێك وتی: ئەوە چیەتی بۆ وادەکا؟ خودا ڕیسوای کا! پێغەمبەر

---

[1] صحيح: (المشكاة/٣٦٢١)، خ(٦٧٨٠/٧٥/١٢).

(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَكُونُوا عَوْنَ الشَّيْطَانِ عَلَى أَخِيكُمْ».[1] مەبنە یارمەتیدەر بۆ شەیتان لەسەر براکەتان، چونکە شەیتان کە تاوانکردنی بۆ جوان دەکاو هەڵی دەنێ بۆ کردەوەی خراپ مەبەستی ریسواکردنی براکەتانە جا کەئێوەش دوعای ریسوابوونی بۆبکەن ئەوە دەبنە یارمەتیدەری شەیتان.

## سزای یاخی بوونو چەتەییو رێگری (حد الحرابة وقطع الطريق)

الحرابة: بریتییە لە یاخی بوونی کرۆپێکی چەکدار لە وڵاتی ئیسلامدا بۆ بەرپاکردنی پشێویو ئاژاوەو خوێن رێژیو روتکردنی رێبوارو چەپاوکردنی ماڵو سامانی خەڵكو هەتکی ناموسو لەناوبردنی بەروبومو ماڵو سامانو منداڵو بەرەنگاربوونەوەی ئایینی ئیسلامو ئەخلاقو یاساو پەیرەوو پرۆگرام.

هەڵبەتە یاخی بوونو چەك هەڵگرتن دژی فەرمانرەوای موسوڵمانان لە تاوانە گەورەکانە، بۆیە سزاکەشی سەختو دژوارە.

قورئان دەفەرموێ: {إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْا مِنْ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ – المائدة/٣٣}. سزاو تۆڵە لەوانەی دژی خوداو پێغەمبەری خودا دەجەنگن هەوڵی بەرپاکردنی فیتنەو ئاشوب دەدەن لەسەر زەویو لە فەرمانرەوای موسوڵمانان یاخی دەبنو چەتەییو رێگری دەکەنو خەڵك دەکوژنو ماڵو سامانی موسوڵمانان چەپاو دەکەن، سزاکەیان ئەوەیە دەکوژرێن هەڵدەواسرێن، دەستو قاچیان راستو چەپ دەبڕدرێ. یان لە وڵات

---

[1] صحيح: (ص.ج/٧٤٤٢) ، خ(١٢/٧٥/٦٧٨١)، د(١٢/١٧٦/٤٤٥٣).

راودەنرێن‌و دەردەكرێن، ئەو سزایانە بۆ ئەوانە پڕاو پڕی تاوانەكانیانە، ئەوانە لەدونیادا ریسواییان بۆ بڕیار دراوەو لە قیامەتیش عەزابی بەئێش‌و سامناكیان بۆ ئامادەكراوە.

لە ئەنەسەوە (رەزای خودای لێ بێ) گێڕدراوەتەوە دەڵێ: كۆمەڵێك لەخێڵی عوكڵ هاتنە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موسوڵمانبوون، ئاوو هەوای مەدینەیان پێ نەكەوت‌و توشی نەخۆشی بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ كردن: كە بڕۆن بۆ دەری مەدینە بۆ شوێنێك كە گا ڕانە حوشتری زەكاتی لێ بەخێودەكرا لەوێ شیرو میزی حوشترەكان بخۆنەوە، ئەوانیش فەرمانەكەی پێغەمبەریان بەجێ هێناو ماوەیەك لەو شوێنە شیرو میزی حوشتریان خواردەوە، باری تەندروستیان باش بوو نەخۆشییان نەما، لە ئایین هەڵگەڕانەوەو شوانە حوشترەكانیان كوشتن‌و حوشترەكانیشیان بردن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە بەم روداوەی زانی هێزی نارد بەدوایانداو دەسگیریان كردن‌و هێنایانن بۆ خزمەتی، ئەویش فەرمانی كرد دەست‌و قاچیان بڕین‌و چاویان هەڵكۆڵین رەگەكانی خوێن لێ بەربوونیان داخ نەكردن، خوێنیان لەبەر رۆیی تا مردن.[1]

راڤەكەرانی قورئان راجیاییان تێكەوتووە دەربارەی ئەو سزایانەی ئایەتەكەی پێشەوە ئاماژەیان بۆ دەكا، ئایا ئەو سزایانە بە تەرتیب‌و ریزبەندی دەبێ یان بەشێوەی هەڵبژاردنەو فەرمانڕەوا سەرپشكە كام سزایە هەڵدەبژێرێ. لە ریوایەتێكدا كە لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە دەفەرموێ: كەسێك چەكی دژی كۆمەڵی ئیسلام‌و موسوڵمانان ئاراستەكردو رێگری‌و چەتەیی‌و ترس‌و خۆفیان بەرپا دەكردو لە فەرمانڕەوای موسوڵمانان یاخی بوون، دوایی دەسگیركران‌و كەوتنە ژێر دەسەڵاتی دادوەری موسوڵمانان،

---

[1] متفق علیه: خ(٢٣٣)، م(١٦٧١).

فەرمانڕەوای موسوڵمانان سەرپشکە لەوەدا بیانکوژێ یان هەڵیان واسێ، یان دەستو قاچیان ببڕێ، ئەمە رای کۆمەڵێك لە عولەمای سەلەفە.

جەماوەری زانایان دەفەرموون: ئەم ئایەتە حوکمەکانی بەگوێرەی حاڵو چۆنیەتی یاخی بووەکان ئاراستە دەکرێن. ئەوەتا ئیبنو عەبباس دەربارەی رێگرو چەتەو یاخی بوو فەرموویەتی: رێگرو چەتە ئەگەر خەڵکیان دەکوشتو ماڵو سامانیشیان دەستاند ئەوە دەشکوژرێنو بە کوژراوی هەڵدەواسرێن، ئەگەر هەر خەڵکیان دەکوشتو ماڵو سامانییان نەدەستاند ئەوە هەر دەکوژرێنو هەڵناواسرێن، ئەگەر هەر ماڵیان دەستاندو خەڵکیان نەدەکوشت ئەوە دەستو قاچیان راستو چەپ دەبڕدرێن، ئەگەر هەر خەڵکیان دەترساندو ماڵو سامانیان نەدەستاند ئەوە لە وڵاتو زێدو نیشتمانیان دەردەکرێن.[1]

## تۆبەکردنو پەشیمانبوونەوەی یاخی بووان پێش ئەوەی بکەونە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوای موسوڵمانانەوە

قورئان دەفەرموێ: {إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ – المائدة/٣٤} واتە: ئەو سزایانەی لە ئایەتی پێشودا بەسەر یاخی بوواندا دەسەپێندرێ جگە لەوانەی پێش ئەوەی دەسەڵاتتان بەسەریاندا بشکێ تۆبە دەکەنو واز لەیاخی بوونو کردەوە ناپەسەندەکانیان دێنن، باش بزانن خودا خاوەنی لێخۆشبوونو بەزەییە.

ئەمجار جەماوەری زانایانی ئیسلام پێیان وایە تۆبەکردنی ئەو یاخی بووانە (حق الله)یان لەسەر لادەبا، وەلێ مافی ئەو ئادەمیزادانەی بەدەستی ئەوان زیانیان پێ گەییوە لاناچێ، دەبێ بیدەنەوە. ئیمامی طەبەری دەڵێ:

---

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٢/٥١ – ٥٢.

تۆبـەكردنيان مـافی خـوداو ئادەميزادانيـشيان لەسـەر لادەبـا مەگـەر مـاڵو شـتێكيان سـتاندبێو بەدەسـتيانەوە مابـێ، ئـەوەدەبێ ئـەو ماڵـە رادەسـتی خاوەنەكەی بكەنەوە، لە هاوەڵانيشەوە وا ڕیوايەتكراوە پاڵپشتی بۆچونەكەی طەبەری دەكا.[1]

## حەددی پاشگەزبوونەوە لەئیسلام

قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ – آل عمـران/١٠٢} ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە تـەقوای خـودا بكـەن بـە ئەوپـەڕی لێ بـوردوی‌و دڵـسۆزی، سـووربن لەسـەر بەردەوامبوونتان لەسەر بیرو باوەڕتان‌و هەر بە موسوڵمانی لەدونیا دەرچن.

## هەڕەشە لەوەی لە ئیمان‌و باوەڕ پاشگەز ببنەوە

قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لائِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ – المائدة/٥٤} ئەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە بـەردەوام بـن لەسـەر بیروبـاوەڕی ئیسلامی‌و پاشگەزمەبنەوە، هەركەسێك لە ئايينی خۆی پاشـگەزبێتەوە، ئـەوە خودا بە تواناو دەسەڵاتە لە داهاتودا قەوم‌و گەل‌و هۆزێك دێنێتە ئاراوە خودا بۆخۆی خۆشی دەوێن‌و ئەوانیش خودايان خۆش دەوێ، لەئاستی موسوڵمانانـدا ملكەچ‌و دڵنەرم‌و بەبەزەیین، لەبەرامبەر كافرو بێ باوەڕاندا بە زەبرو زەنگ‌و باڵادەست دەبن، لەپێناو شكۆمەندیی ئايينی خودادا جیهاد دەكەن‌و لە لۆمـەی لۆمەكاران ناترسن، ئەو بیروباوەڕو هەڵوێستە جوانمێرانـە فـەضڵ‌و نیعمـەتی

---

[1] جامع البيان في تفسير القرآن ج٦/٢٢١ – ٢٢٥الجامع لإحكام القرآن ج٦/١٥٥.

خودایــه دەیــدا بەکەســانێك مــەیلی لێ بــێ، خــودا خەزینــەی رەحمــەتی بەرفراوانەو زاناو ئاگاداره بەهەموو شتێك.

هەروا پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلا يَزَالُونَ يُقَـاتِلُونَكُمْ حَتَّـى يَـرُدُّوكُمْ عَـنْ دِينِكُمْ إِنْ اسْتَطَاعُوا وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُـوَ كَـافِرٌ فَأُوْلَئِـكَ حَبِطَـتْ أَعْمَـالُهُمْ فِـي الـدُّنْيَا وَالآخِـرَةِ وَأُوْلَئِـكَ أَصْـحَابُ النَّـارِ هُـمْ فِيهَـا خَالِـدُونَ – البقرة/١١٧} بەردەوام کافرو بێ دینەکان شەڕتان لەگەڵ دەکەنو دژایەتیتان دەکەن بۆئەوەی ئەگەر بتوانن‌و بۆیان بکرێ لە ئایینی خۆی پاشگەز بێتـەوەو بەکافری‌و هەڵگەڕاوە لە ئایین بمرێ ئەوانە کردەوەکانیـان لـەدونیاو قیامەتـدا پوچ کراونەوەو پێڕی دۆزەخن‌و بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە.

## ردە: پاشگەزبوونەوە

ردە (پاشگەزبوونەوە): بریتییە لە کردن یا گوتنی شتێك کـە بەهۆیـەوە مــرۆڤ لەچوارچـێوەی ئیـسلام دەچـێتە دەرەوە، کـەوابوو پاشـگەزبۆوە ئـەو کەسـەیە دوا موسـوڵمانبوونی کـافر ببێتـەوە، جـا یـان بـەوتن یـان بـە بـاوەڕو ئیعتیقاد، یان بە شك‌و گومان یان بەکردەوە تەنانەت ئەگەر بەشێوەی گاڵتـەو گەشمەریش بێ.

هەڵبەتـە موسـوڵمان بـە دەرچـوو لـە ئیسلام‌و پاشـگەزبۆوە نـاژمێردرێ‌و بەکافر دانانـدرێ مەگەر کوفر لە دڵیدا جێگیر ببـێ‌و دڵـی پێـی دابمرکـێ‌و بـە فیعلی دڵی ببێتە کان‌و جێگای کوفر. وەکوو قورئـان دەفـەرموێ: {وَلَكِـنْ مَـنْ شَـرَحَ بِـالْكُفْرِ صَـدْراً – النحـل/١٠٦}: وەلێ کەسـێك دڵـی بـە کـوفر ئـاوەدان بووبێتەوەو کوفر تێیدا جێگیربووبێ. هەم ئامـاژە بـە فـەرموودەی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ ، وَإِنَّمَا لِكُـلِّ

امْرِئٍ مَا نَوَى».[1] هەرچی کردەوە هەیە بەگوێرەی نیازو مەبەستە هەموو ئادەمیزادێك پاداش‌و سزای بەگوێرەی نیازو مەبەستەکەیەتی.

جا چونکە ئەوەی لەدڵدایە نهێنی‌و غەیبەو خودا نەبێ کەس نایزانێ، پێویستە شتێکی لێ دەربکەوێ کە نیشانەی کوفرەکەی بێ، بەتەاوی کوفرەکەی بچەسپێنێ‌و تەئویل‌و بێنەوبەرە هەڵنەگرێ، تەنانەت دەگوترێ ئیمامی مالیك گوتویەتی: کەسێك شتێکی وای لێ دەرکەوت کە لەسەدا نەوەدو نۆ بەکوفر دەژمێردرا، لەیەك لایەنەوە ئیحتیمالی ئیمانی لێ دەکرا بەکافر دانانرێ‌و حیسابی موسوڵمانی بۆ دەکرێ.

## هەندێك نموونەی وا کە بەکوفر حسێب بکرێن

١- ئینکاریکردنی شتێکی وا کە لەئایین دا ئاشکرایەو رونکراوەتەوە وەکوو ئینکاریکردنی تاك‌و تەنهایی خودا، دان نەنان بەوەدا: کە خودا بەدیهێنەری بونەوەرە. هەروا ئینکاریکردنی هەبوونی فریشتە، رەتکردنەوەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) ئینکاریکردنی زیندوبوونەوەو پاداش‌و سزا، بڕوانەبوون بەوەی نوێژ پێویستە زەکات واجبە رۆژووی رەمەزان‌و حەجی ماڵی خودا فەرزن.

٢- بە حەڵاڵ زانین‌و ئیباحەی شتێك کە کۆڕای موسوڵمانان لەسەر حەرامبوونیەتی، وەکوو بە حەڵاڵ زانینی شەراب‌و زیناو سودو خواردنی گۆشتی بەراز، بەحەڵاڵ دانانی رشتنی خوێنی بەناحەق، خواردنی ماڵی ئەم‌و ئەو، کەسێك بڵێ: خەمر حەڵاڵە یەکسەر پێی کافردەبێ، با بۆخۆی نەشی خواتەوە. کەسێك بڵێ سودو ریبا حەڵاڵە پێی کافردەبێ بابۆخۆیشی نەیخوا.

---

[1] متفق علیه: خ(١/١٣٥/٥٤)، م(٣/١٥١٥/١٩٠٧)، د(٦/٢٤٨/٢١٨٦).

٣- بەحەرام دانانی شتێك كۆڕای موسوڵمانان لەسەر ئەوەبێ كە حەڵاڵە. وەكوو بەحەرامكردنی نازو نیعمەتی خودا كەبۆ مرڤی بەدیهێناوە شەرع بە پاكو خاوێنو (طيبات) ناوی بردون، جا كەسێك بڵێ: خواردنی ترێ، خورما، هەنگوین.......هتد حەرامە، پێی كافر دەبێ، چونكە كۆڕای موسوڵمانان لەسەر ئەوەیە ئەوانە حەڵاڵو زوڵاڵو پاكنو نازو نیعمەتی خودان فەراهەمی هێناون بۆ بەندەكانی قورئان دەفەرموێ: {وَلا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمْ الْكَذِبَ هَذَا حَلالٌ وَهَذَا حَرَامٌ لِتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لا يُفْلِحُونَ. مَتَاعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ – النحل/١١٦-١١٧}. هەر بەهەوانتەو بەڕاو بۆچوونی خۆتان شت حەرامو حەڵاڵ مەكەن، بەبێ گەڕانەوە بۆ شەرعی خوداو بێ بەڵگە مەڵێن: ئەوە حەرامەو ئەمە حەڵاڵە، هەر تەنها لەبەرئەوەی زمانتان بەدرۆو قسەی بێ بنەما راهاتووە لەدرۆ بوختان ناپرینگێنەوە، بەبێ بەڵگە شت حەرام دەكەن، تا لە ئاكاما وای لێ بێ بەدرۆو بەبوختان حەرامكردنو حەڵاڵكردنە كەپاڵ خودا بدەن بەبێ ئەوەی شتێك لەخوداوە دەربارەی نازڵ بووبێ. بێگومان ئەوانەی درۆو بوختان لەسەر خودا هەڵدەبەستن سەركەوتوو نابنو سەرفرازی دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەر نابێ. لەدونیادا ئەوەی دەستیان دەكەوێ كاڵایەكی كەمو كەمخایەنەو زوو بەسەر دەچێ، لە قیامەتیش دا سزای بەئێشو نەبڕاوەیان بۆ ئامادەكراوە.

٤- جنێودان بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یان سوكایەتی پێكردنی، هەروا جنێودانو سوكایەتی كردن بەهەركامێك لە پێغەمبەران.

٥- جنێودان بە ئایین: بەداخەوە جنێودان بە ئایین زۆر بە ئاسانیو بەربڵاوی بەسەر زمانی گەورەو پچوك دا دێ.

٦- تانەدان لە قورئانو سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەلا خستنو حوکم پێ نەکردنیانو پاساو دانەوەی یاسا دەسکردەکان بەسەریاندا.

٧- هەرکەسێك لافی ئەوە لێ بدا کە نیگای بۆدێ لەخوداوە.

٨- فڕێدانی موصحەف بۆ ناو پیسایی، هەروا کتێبی حەدیث بەمەبەستی سوکایەتی پێکردنیان، کەمبایەخی ناوەڕۆکیان. بەداخەوە ئەم بەڵایە زۆر پەخەی عالەمی ئیسلامی گرتووە، بەرێگادا دەڕۆی دەبینی ئایەتێکی قورئان رستەی (بسم الله الرحمن الرحيم) لەسەر جادە کەوتووە فڕێ دراوەتە ناو قوڕو پیسایییەوە، لە فەرمانگەو قوتابخانەکاندا ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەناو کتێبە مەدرسییەکاندا بەشێوەیەکی نەشیاو لەناو پیسو پۆخەڵیدا فڕێ دراون. یان لە راڕەوو حەوشەو کۆڵانەکاندا پەرتو بڵاوبوونەوەو ژێر پێیان کەوتوون.

٩- سوکایەتیکردن بەناوێك لەناوەکانی خودا، یان سوکایەتیکردن بە فەرمانو نەهیەکانی خودا.

١٠- پەرستنی بتو صەنەم، تەوافو سوڕانەوە بەدەوری گۆڕو نزرگەداو پاڕانەوە لێیانو بانگکردنیانو داوای یارمەتی لێیان، نەزرو قۆتۆکردن بۆ مردوی ناو گۆڕو سەربڕینی ئاژەڵ بۆیان یان بۆ مەخلوقاتی تر.[1]

١١- گاڵتەکردن بە قاعیدەو یاساو بڕیارێکی شەریعەت، وەکوو سوکایەتیکردن بە نوێژکەرو گاڵتەکردن بە ریشو سەرپۆشو پۆشاکی باڵا پۆشی، سوکایەتیکردن بە بانگ. وەکوو قورئان ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: {وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ اتَّخَذُوهَا هُزُواً وَلَعِباً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَعْقِلُونَ – المائدة/٥٨}. هەرکاتێ بانگ رادەدێرن بۆ ئامادەبونو ئەنجامدانی نوێژ، کافرو

---

[1] فقه السنة: ٢/٣٨٤ – ٣٨٥.

گومڕاکان پرۆسەی بانگەکە دەکەنە مایەی پێکەنینو گاڵتەپێکردن. ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە ئەوانە گەلو نەتەوەیەکی بێ عەقڵو کاڵفامن.

یان دەفەرموێ: {يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ. وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ. لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ – التوبة/٦٤-٦٦}. دووڕووەکان ترسی ئەوەیان هەیە کە سورەتێکی قورئان نازڵ بێتە سەریان، هەواڵیان بداتێ بەوەی لە دڵیاندایە. ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: گاڵتە بەئایینی ئیسلام بکەن! بێگومان ئەوەی کە لێی دەترسێن کە ئاشکرابوونی ناو دڵتانە خودا دەری دەخاو ئاشکرا دەبێ. خۆ ئەگەر لێیان بپرسی ئەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی ئاخاوتنو گاڵتەکردنیان، دەڵێن: ئێمە ئەو قسەو باسانەمان بە جیدیو راستی نیە، ئێمە ئەو قسانە دەکەین بۆ گاڵتەو گەپو کات بەسەربردنو خەم بەبادانە!!. پێیان بڵێ: کەی ئەوە شایانی ئەوەیە ئێوە بیکەنە کەرەسەی پێکەنینو گاڵتەو گەپ؟ بۆ هیچ شتێکی تر نیە جگە لە پەروەردگارو صیفەتەکانیو شەریعەتو یاسایو پێغەمبەرو پەیامەکەی ئێوە بیکەنە کەرەسەی پێکەنین؟ خۆ گاڵتەکردن بەخوداو بە قورئانو باقی حوکمەکانی ئایینو سوکایەتی کردن بە پێغەمبەرو پەیامەکەی کوفرێکی رونو ئاشکرایە قەت عوزری وا مەهێننەوە، بەتەما ئەوە مەبن بەو عوزرە بێ جێو نا مەعقولەتان لەو تاوانە گەورە رزگارتان ببێ. دڵنیابن ئێوە بەو کردارو گوفتارەتان دوای ئیمان هێنانتان کافر بوونەوە.

١٢- وەصفکردنی خودا بەشتێك کە شیاوی ئەو نەبێ، وەکوو وەصفکردنی بەوە کە هاوەڵی هەیە، یان منداڵی هەیە، یان خێزانی هەیە، هەروا وەصفکردنی بەرژدیو چروکی وەکوو جولەکەی نەفرین لێکراو دەیڵێنو

قورئان لێیانەوە حیکایەت دەکاو دەفەرموێ: {وَقَالَتْ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيراً مِنْهُمْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ طُغْيَاناً وَكُفْراً وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمْ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ كُلَّمَا أَوْقَدُوا نَاراً لِلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللَّهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً وَاللَّهُ لا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ – المائدة/٦٤}. جولەکە – نەفرینی خودایان لێ بێ – وتیان‌و دەڵێن: خودا رژدو چروکە، دەستی بەخشندەیی نیە، دەك رویان رەشبێ‌و دەستیان رژدو چروك بێ‌و دووربن لەرەحمەتی خوداو نەفرینیان لێ بێ، بەهۆی ئەو بوختانە گەورەی دەیکەن‌و وەصفکردنی خودا بەشتێك کەشیاوی نیە. بەڵکوو خودا بەخشندەو میهرەبانە، دەستی رەحمەت‌و رزق‌و رۆزی هەمیشە کراوەو بەخشندەیە. هەرچی نازو نیعمەتێك لەبونەوەردا هەیە لەخوداوەیەو ئەو دەیڕەخسێنێ‌و بۆ ئادەمیزادی فەراهەم دێنێ. چۆنی بوێ‌و چەندی بوێ بەویستی خۆی نازو نیعمەت رزق‌و رۆزی دەبەخشێ.

سوێندبێ ئەو ئایات‌و موعجیزانەی نازڵیان دەکەین بۆسەر تۆ ئەی پێغەمبەر، ئەو هەموو بەهرەو نیعمەتانەی لەلای خوداوە بۆ تۆ دێ کافرو جولەکەکان پتر گومڕا دەکاو زیاد لەحەق دووریان دەخاتەوەو ئیمان‌و باوەڕی موسوڵمانانی پێ زیاد دەبێ. ئەوانە حەسوودی‌و دڵ پیسییان هەڵینان بۆئەوەی پەیامی ئیسلام رەت بکەنەوەو ئیمان بە پێغەمبەری ئاخر زەمان (محمد) نەهێنن، لە تۆڵەی ئەو حەسوودی‌و سەر سەختییەیاندا خودا رق‌و کینەی خستۆتە نێوان جولەکەو گاورەکانەوە، هەر تاقم‌و کۆمەڵێکیان دژی ئەویتریانەو بەخوێنی سەری یەکتری تینون‌و مێژوو شایەتە لە کۆن‌و نوێدا چییان بەرامبەر یەکتر کردووەو تا رۆژی قیامەت ئەم دژایەتی‌و دوژمنایەتیەی نێوانیان کۆتایی نایەو هەمیشە لەبرەودادەبێ، هەرکاتێ جولەکە هەوڵی پیلان داڕشتن‌و جەنگ بەرپاکردن بدەن دژی پێغەمبەرو موسوڵمانانی

دڵسۆزو راستاڵ، ئاگری شەڕو فیتنەیی هەڵگیرسێنن لەنێوان گەلو نەتەوەکاندا، خودا ڕیسوایان دەکاو پیلانەکەیان پوچەڵ دەکاتەوە، ئەوانە سروشتیان وایە هەمیشە هەوڵی فەسادو گەندەڵیو ئاشوب نانەوە بدەن هەرگیز هەوڵی چاکسازیو ئاشتەوایی نادەن، کەسێکیش ئەوە رەوشتو کرداری بێ موفسیدەو خودا فەسادکارو فەساد رەوشتی خۆش ناوێن.

## حوکمی هەڵگەڕاوە لە ئایین

هەرکەسێك شتێکی لەم کردارو گوفتارە کوفر ئامێزانە ئەنجامدا دەیزانی کارو گوفتارەکەی پێچەوانەی ئایینو بە ئیختیاری خۆیو بە ئەنقەست کردنیو دوو شایەتی عادڵ شایەتییان لەسەردا، ئەوە حاکم بانگی دەکاو داوای لێ دەکا تۆبەو پەشیمانی خۆی لەو کوفرە رابگەیەنێ جائەگەر تۆبەی کرد ئەوەباشە ئەگینا دەکوژرێو بەکافری لەدونیا دەردەچێ ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ». [1] کەسێك لە ئایینی ئیسلام پاشگەزبۆوەو چووە سەر ئایینێکی تر بیکوژن.

لە عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ الثَّيِّبُ الزَّانِي وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ». [2] خوێنی هیچ موسوڵمانێك شایەتی بدا کە هیچ خودا نین جگە لە (أللە)و شایەتیش بدا کەمن پێغەمبەری خودام حەڵاڵ نیە، مەگەر لەسێ

---

[1] خ (١٢/٢٦٧/٦٩٢٢)، ت(٣/٩/١٤٨٣)، د(١٢/٣/٤٣٢٩)، ن(١٠٤ ، ٧/١٠٥).

[2] متفق عليه: خ(١٢/٢٠٦/٦٨٧٨)، م(٣/١٣٠٢/١٦٧٦)، د(١٢/٥/٤٣٣٠)، ت(٢/٤٢٩/١٤٢٣).

حاڵدا بێوەبێو زینابکا، یان بەناڕەوا ئادەمیزادێکی کوشتبێ یان لە ئایینی خۆی هەڵگەڕابێتەوەو لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیابوبێتەوە.

کەسێك لەسەر پاشگەزبوونەوە لەئایین بکوژرێ مامەڵەی کافری ئەصڵی لەگەڵ دەکرێ ناشۆردرێو کفنی بەبەردا ناکرێنوێژی لەسەر ناکرێو لە گۆڕستانی موسوڵمانانیشدا نانێژرێو خزمە موسوڵمانەکانی میراتی لێ نابەن.

## تۆبەکردنی پاشگەزبووە لە ئیسلام

کەسێك تۆبەی کردو لەدەستی حاکم هەڵات ژنی موسوڵمانی هەبوو گرێبەستی نێوانیان هەڵدەوەشێتەوە، جا ئەگەر لەوەدوا تۆبەی کردو گەڕایەوە بۆسەر ئایینی ئیسلام ئەوە ژنەکەی دەدرێتەوە، قورئان دەفەرموێ: {كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْماً كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ. أُولَئِكَ جَزَاؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللَّهِ وَالْمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ. خَالِدِينَ فِيهَا لا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلا هُمْ يُنْظَرُونَ. إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ - آل عمران/٨٦-٨٩}. خودا چۆن هیدایەتی گەلو نەتەوەیەکی وەکوو جولەکەو فەلەکان دەدا ئەوانەی دوا ئیمانهێنانیانو شایەتیدانیان لەسەر راستی پەیامی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کافربوونەوەو شوێن پەیامەکەی نەکەوتن، لەکاتێکدا نیشانەی ئاشکراو رون لە قورئانو نامە ئاسمانییەکانی پێشوودا زۆرو زەبەندەن لەسەر راستی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد. خودا هەرگیز قەومی ستەمکار هیدایەت نادا، چونکە ئەوان حەقیان ناسیو پێی ئاشنابوون، کەچی لێیان لادا، وازیان لە بەڵگە جۆراوجۆرەکانی راستی پێغەمبەرێتی موحەممەد هێناو هیدایەتی عەقڵیان فەرامۆش کرد.

ئەوانە جەزاو تۆڵەیان غەزەبی خودایە، دوورخستنەوەیانە لە رەحمەتی خودا، نارازیبوونی فریشتەو ئادەمیزادە لێیانو دوعاکردنە لێیان بەوە بەر

نەفرینی خودا بکەون لەدونیاو قیامەتدا ئەوانە بە ئەبەدیو بۆ هەتا هەتایە لە نەفرینو غەزەبی خودادان. یان لەناو ئاگری دۆزەخدا دەبنو لێی رزگارنابن. چونکە کەسێك شیاوی لەعنەتو نەفرین بێ، سزای ئاگری دۆزەخەو مۆڵەت نادرێنو عوزریش بێننەوە عوزریان نابیسترێ. مەگەر ئەوانەی تۆبە دەکەن لە کوفرو پاشگەزبوونەوەیان، واز لە کوفر دێننو دەگەڕێنەوە بۆلای خوداو مل لەکاری چاكو بەسود دەنێنو سەرگەرمی خوداپەرستی دەبن. ئەوانە خودا لێیان خۆش دەبێ، بێگومان خودا خاوەنی رەحمو سۆزی بەرفراوانە بۆ بەندەکانی.

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پیاوێکی ئەنصاری موسوڵمان بوو، پاشان پاشگەزبۆوە، هەواڵی نارد بۆ خزمەکانی داوای لێ کردن بۆی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بپرسن، ئاخۆ رێگای تۆبەی هەیە؟ خزمەکانی هاتنە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیان کرد: فلانکەس لە هەڵوێستی خۆی پەشیمان بۆتەوەو داوای لێ کردوین پرسیار لەجەنابت بکەین، ئاخۆ دەتوانێ تۆبە بکاو بگەرێتەوە بۆ سەر ئایینی ئیسلام؟ ئیتر ئایەتی {كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْماً كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ. أُوْلَئِكَ جَزَاؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللَّهِ وَالْمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ. خَالِدِينَ فِيهَا لا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلا هُمْ يُنظَرُونَ. إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ – آل عمران/٨٦-٨٩}. نازل بوو ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی بۆنارد بەوە کە رێگەی تۆبەی هەیە ئیتر موسوڵمان بووە.[1]

---

[1] صحيح الإسناد (ص.ن/٤٠٧٩)، ن(٧/١٠٧).

## ناڕاستەکردنی تۆمەتی کوفر بەسەر کەسێکی دیاریکراودا

لێرەدا شتێك هەیە پێویستە ئاگاداری بینو وریابین نەکەوینە هەڵەوە، شتەکەش ئەوەیە: هەموو ئەو نموونەو میثالانەی هێناومانەوە بۆ کارو گوفتارە کوفر ئامێزەکان، شتێکی چەسپاوو حەقنو دەقی حەدیثو ئایەت ئاماژەیان پێ دەکەنو کوفری ئاشکرانو دەگوترێ کەسێك ئاوا بڵێ یان ئاوابکا ئەوە پێی کافر دەبێ.

وەلێ بەنیسبەت شەخسێکی دیاریکراوەوە کە کردەوەو گوفتاری کوفر ئامێزبوون ئەگەر پێمان بگوترێ ئایا ئێوە شایەتی دەدەن کە ئەم شەخصە هەرشەکان دەیگرنەوەو کافرەو بۆ هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخەیر ئێمە ناتوانین شایەتی بدەین لەسەر کەسێکی دیاریکراو کە ئەوە کافرەو ئەهلی دۆزەخە بۆ هەتا هەتایە مەگەر بەڵگەیەکی وامان بەدەستەوەبێ لەسەر کافربوونەکەی هەڵمان بنێ بۆ شایەتیدان لەسەری. چونکە گەورەترین سەرپێچیو لەحەق لادانە کە شایەتی بدرێ لەسەر کەسێکی دیاریکراو بەوە کە کافرەو خودا لێی خۆش نابێو رەحمی خودا نایگرێتەوەو بۆ هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەبێ، ئەمە حوکمی کافرە دوا مردنی، حوکمی کەسێکە دڵنیابی کە بەکافری مردوە!! بۆیە ئەبو داود (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە سونەنەکەیدا لە کیتابی (الأدب)دا بابێکی هێناوە ناوی ناوە (باب النهي عن البغي) باسێك دەربارەی نەهی کردن لە بەغیو زێدەرەوی کردنو پەلەکردن لە حوکمدان بەکوفر بەسەر کەسی دیاریکراودا.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو دوو پیاو لەنەتەوەی ئیسرائیل برادەری یەکتری بوون، یەکێکیان هەر خەریکی تاوان کردن بوو، ئەویتریان بە پێچەوانەوە هەر خەریکی خودا پەرستی بوو، ئەم پیاوچاکە هەمیشە

ئامۆژگاری برادەرە تاوانکارەکەی دەکرد کەواز لەتاوان بێنێ‌و روبکاتە خودا پەرستی، رۆژێك بینی برادەرەکەی خەریکی تاوانێکە ئەویش وەکوو عادەتی خۆی نەهی لێ کردو پێی گوت: وازبێنەو بەسە چیتر لەخودا یاخی مەبە. ئەویش پێی گوت: وازم لێ بێنە خۆتۆ چاودێرو رەقیب نی بەسەر منەوە، پیاو چاکەکە پێی گوت: سوێندم بەخودا، خودا لێت خۆش نابێ یان ناتخاتە ناو بەهەشتەوە، دوایی هەردوکیان مردن‌و گەڕانەوە بۆلای پەروەردگار، خودا دادگایی کردن، بەپیاو چاکەکەی گوت: ئایا تۆ دەتزانی من کێم یان دەتزانی دەسەڵاتی من چۆنەو چەندە؟ ئیتر بە بابای تاوانباری فەرموو بڕۆ بۆ ناو بەهەشت‌و من بەرەحمی خۆم لێت خۆش بووم، بەوی تریشیان فەرمووی: بیبەن بیخەنە ناو دۆزەخەوە.

ئەبو هورەیرە کە راوی فەرموودەکەیە وتی: سوێندم بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەو کابرایە کە هەمیشە خەریکی خوداپەرستی بوو قسەیەکی کرد، بوو بەهۆکاری نەگبەتی بۆی لەدونیاو لە قیامەتدا، ماڵوێرانی دونیاو قیامەت بوو. ئەمە لە رویەکەوە لەرویەکی ترەوە ئەو شەخصە دیاریکراوە لەوانەیە ئیجتیهادی کردبێ‌و خودا کردارو گوفتارەکەی بەتاوان بۆ نەنووسیبێ. لەوانەیە ئەو ئایەت‌و حەدیثانەی پێ نەگەییشتبن‌و نەی زانیبێ ئەو کردارە یان ئەو گوفتارە کوفرە. وێدەچێ کابرا ئیمانێکی پتەوی وای لەدڵدابێ‌و چاکەی زۆری بێ، خودا رەحمی پێبکا. وەکوو چۆن لەوکابرایە خۆش بوو: کە وەصیەتی بۆ کوڕەکەی کرد وتی: کە مردم لاشەکەم بسوتێنە دوایی خۆڵەمێشی جەستەم بکە بە دووبەش نیوەی بە وشکانیدا بڵاوبکەرەوە نیوەکەی تری بەناو دەریادا. سوێندم بەخودا ئەگەر خودا دەسەڵاتی بەسەرمدا بشکێ سزایەکم دەدا کەس سزای وا نەدرابێ. کەکابرا مرد کوڕەکانی وەصییەتەکەی باوکیان بەجێ هێنا. ئەمجار پەروەردگار

فەرمانی بە وشکانی کرد خۆڵەمێشی جەستەی کابرای کۆکردەوە، فەرمانی بە دەریا کرد خۆڵەمێشی ناو خۆی گردکردەوە، هەموو جەستەی وەکوو خۆی لێ هاتەوە، ئەمجار خودا فەرمووی: بۆچی وەصییەتی وات کرد؟ وتی: خودایە لەترسی تۆ وام کردو تۆ بۆخۆشت لەمن باشتر دەزانی، ئیتر خودا لێی خۆش بوو.[1]

ئەم پیاوە پێی وابوو ئەگەر جەستەی ئاوا بسوتێندرێو ئاوا بە وشکانیو دەریادا بڵاو بکرێتەوە ئیتر خودا ناتوانێ گردی بکاتەوە، یان گومانی لەوەدا هەبوو، وەلێ بڕوای بەهەبوونی خودا هەبوو، لەخودا دەترسا ئیتر خودا لێی خۆش بوو.[2]

ئیمامی شەوکانی دەفەرموێ: با هەموو موسوڵمانێك ئەوە بزانێ: کە حوکمدان بەسەر موسوڵماندا بەچوونە دەرەوەی لە بازنەی ئیسلامو داخڵبوونی بۆ نێو بازنەی کوفر کارێکی نەشیاوەو نابێ هەروا بەئاسانی ملی لێ بندرێ، نابێ موسوڵمانێك بڕوای بەخوداو ڕۆژی دوایی هەبێ پڕکێشی کارێکی ئاوابکا مەگەر دەلیلو بورهانی زۆر ئاشکرای لەلابن بەڵگەی وای لابێ لەسەر کوفری کابرا لەخۆر ئاشکراتر بێ.

لەزۆر فەرموودەی ریوایەتکراو لەڕێگەی کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە ئەوە چەسپاوە: کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ لأَخِيهِ يَا كَافِرُ. فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا».[3] کەسێك بەبرایەکی موسوڵمانی بڵێ: کافر، یەکێکیان ئەو حوکمەی لەسەر دەسەپێ، واتە: ئەگەر ئەوکەسەی

---

[1] متفق عليه: خ(٧٥٠٦/٤٦٦/١٣)، م(٢٧٥٦/٢١٠٩، ٢١١٠/٤)، ن(٤/١١٣).

[2] شرح الطحاوية (٣٥٧ - ٣٥٨) هەروا بڕوانە بۆ مجموع الفتاوى ج١١/٤٠٨ - ٤١٣، (في الذى قال لبنية: اذا مت فاحرقونى).

[3] متفق عليه: خ(٦١٠٤/٥١٤/١٠)، م(٦٠/٧٩/١)، ت(٢٧٧٤/١٣٢/٤)، د(٤٦٦٢/٤٤٣/١٢).

حوكمی كوفری بەسەردا دەدا لەواقیعدا وانەبێ ئەوكابرا بۆ خۆی بەو حوكمە كافر دەبێ. لەم حەدیثانەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە لەو بارەوە ڕیوایەتكراون ئەو مەوریدو بارودۆخەی فەرمودەكەی تێدا گوتراوە ئاماژەی زۆر رونو هەڕەشەی گەورە هەن موسوڵمانان دەترسێنێ لەوەی پەلەبكەن لە بەكافرداناني ئەمو ئەوو حوكمدان بەسەر بابایەكی دیاریكراودا بەكوفرو دەرچوون لە ئایین. چونكە حوكمدان بە كوفری یەكێك لە موسوڵمانان كارێكی وا ئاسان نیە، دەبێ بزاندرێ: كە كابرا كوفرەكەی لەناخی دا چەسپاوەو هیچ پاساوێكی بۆ نادۆزرێتەوە. قورئان دەفەرموێ: {وَلَكِن مَّنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْراً – النحل/١٠٦}. واتە كابرا بگاتە حاڵەتێك كوفر لەدڵیدا جێگیر بووبێو ئیمانی تێدا نەمابێ.

كەوابوو ئیعتیبار بەو عەقیدە شەڕو نادروستانە نیە كەڕوو دەكاتە ناو دڵی موسوڵمانو كابرا وەری دەگرێو نازانێ كە دژایەتی لەگەل ئایینی ئیسلام دا هەیە. هەروا ئیعتیبار بە گوفتارو كردارێكی كوفر ئامێز نیە كە لەموسوڵمانێك دەردەكەوێو ئەنجامی دەدا مەبەستی دەرچوون لە ئایینو چونە ناو كوفر نیە.

هەروا ئیعتیبار بە وشەو رستەیەك نیە بەسەر زوبانی موسوڵمانێكدا دێو ئاگای لەماناكەی نیە.[1]

ئەگەر پرسیاربكرێ حوكمی موسوڵمانێك چیە كە زینا دەكا یان شەراب دەخواتەوە یان سودو ریبا دەخوا؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم تاوانانە تاوانی گەورەو بە هیلاكبەرن، بكەرەكەیان شیاوی ئەوەیە بە بڕواداری رەها حسێب نەكرێ، بەو تاوانانە فاسق بووە لەخودا یاخی بووە، دەتواندرێ بە بكەری یەكێك لەو تاوانە

---

[1] السبل الجرار ج٤/٥٧٨.

گەورانە بگوترێ (فاسق)، لەدونیادا حەددی دیاریکراوی بۆ داندراوە، لە قیامەتیش سزای دۆزەخ بەمەرجێ داری حەددی لێ نەدرێو تۆبە نەکا ئەگەر ئەمانە هاتنەدی فیسقەکەشی لادەچێ.

بەڵام بەهیچ شێوەیەك بکەری ئەو جۆرە تاوانانە بە کافر دانانـدرێ مادام کابرا دان بەوەدا بنێ تاوانی کردوەو ئیعتیراف بە هەڵەی خۆی بکا، کاتێك بەکافر حسێب دەکرێ کە ئەو جۆرە تاوانانە بە حەڵاڵ بزانێو هیچ پاساوێکی نەبێ. ئەمەی گوترا رای ئەهلی سوننەتو جەماعەتە. بە پێچەوانەی رای خەواریجو موعتەزیلەو ئەوانەی شوێن راوبۆچونی بێ بناغەی ئەوان کەوتوون، ئەوەتا خەواریجەکان پێیان وایە ئەوەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدا دەبێتە کافرو لە ئیسلام دەردەچێ، موعتەزیلە دەڵێن: ئەو جۆرە کەسانە لەدونیادا بەکافری تەواو یان بە موسوڵمانی کامل حسێب ناکرێن نە موسوڵمانن نەکافر! وەکوو دەڵێن: (في منزلة بين المنزلتين) بەڵام لەقیامەتدا موعتەزیلەکانیش وەکوو خەواریجەکان پێیان وایە کافرنو بۆ هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەمێننەوە. هەڵبەتە بەگوێرەی قورئانو سوننەتو کۆڕای سەلەف رای هەردوو لایان (موعتەزیلەو خەواریج) بەتاڵەو بێ بنەمایە.

## شەڕکردن لەگەڵ یاخیبوان

پێش هەموو شتێك پێویستە موسوڵمانان بۆ خۆیان فەرمانڕەوایەك دابنێن.

قورئان دەفەرموێ: {وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً – البقرة/٣٠} بیر لەوکاتە بکەرەوە: کە پەروەردگاری تۆ بەفریشتەکانی فەرموو من لەسەر زەوی خەلیفەیەك دادەنێم، ئادەمیزاد دروست دەکەم لەسەر زەوی

دەیانکەمە جێنشینو کاربەدەست بۆ ئەوەی پەرستشم بۆ بکەنو زەوی بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکار بێننو ئاوەدانی بکەنەوە.

ئیمامی قورطوبی دەفەرموێ: ئەم ئایەتە ئەصڵو بنەمایە بۆ دانانی خەلیفە (فەرمانڕەوا)یەك هەڵبژاردەی موسوڵمانان بێو گوێی لێ بگیرێو بەقسەی بکرێ، بۆ ئەوەی گوتاری موسوڵمانان یەك بێو داردەستو ئامێر بێ بۆ تەنفیز کردنی ئەحکامی شەرع. ئەمە کۆڕای موسوڵمانانەو هیچ خیلافو دژایەتییەك نیە لەنێوان زانایانی شەرعدا لەم بارەوە، جگە لە ئەبوبەکری (الأصم) کە یەکێکە لە گەورە پیاوانی موعتەزیلە ئەو پێی وایە دانانی خەلیفە پێویست نیەو بە ئەرکێکی شەرعی ناژمێردێ.

بەڵگەی ئێمە کە دەڵێین دانانی خەلیفە پێویستە ئایەتی { إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً – البقرة/٣٠} هەروا ئایەتی {يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ – ص/٢٦} ئایەتی {وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ – النور/٥٥}: خودا وادەی داوە بەموسوڵمانان، وادەی داوە بەوانەی لەئێوە بڕوادارنو کردەوەی باش دەکەن، کە دەیانکاتە جێنشینو کاربەدەست لەسەر زەوی ئەرکی ڕاپەڕاندنو جێبەجێ کردنی ئەحکامی شەرعی دەخاتە ئەستۆیانو فەرمانی پێ کردون بەڕێكوپێکی خوداپەرستی سەر زەوی بەڕێوە بەرن.

لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاوەڵان کۆڕایان دامەزراند لەسەر ئەوە حەزرەتی ئەبو بەکر بکرێتە جێنشین، ئەمەیش دوای کێشەو خیلافێك کە کەوتە نێوان موهاجیرینو ئەنصارەکانەوە لەژێر ساباتی بەنی ساعیدە دەربارەی ئەوە کێ ببێتە جێنشین، تەنانەت ئەنصارەکان وتیان: دەبێت ئەمیرێك لەئێمە بێو ئەمیرێك لەئێوەی موهاجیر بێت، ئیتر ئەبو بەکرو عومەرو موهاجیرین داکۆکیان لەوە کرد کە دەبێ فەرمانڕەوا هەر

لەهۆزی قورەیش بێ، عەرەب تێکرا بە فەرمانڕەوایی غەیری قورەیش رازی نابن‌و لەم بارەوە چەند بەڵگەو دەلیلێکیان خستەڕو، سەرەنجام یاریدەدەران لەهەڵویستی خۆیان پەشیمان بوونەوەو فەرمانبەرداریيان بۆ قورەیش دەربڕی، ئەگەر دانانی خەلیفە پێویست نەبوایە نە لەقورەیش‌و نە لەغەیری ئەوان ئەم دان‌و سان‌و بێنەو بەرەو کۆبونەوەو موناظەرە ئەنجام نەدەدرا، ئەم هەموو حیوارو گفتوگۆیە نەدەبوو بکرێ، دەبوایە یەکێك لەهاوەڵان پەنجەی ناڕازیبوونی هەڵبڕیایەو بیگوتایە دانانی خەلیفە پێویست نیەو ئەرکێکی شەرعی نیە نە لەقورەیش نە لەغەیری قورەیش، ئەم نیزاع‌و حیوارەی ئێوە بێهودەیەو سودێکی تێدا نیە!

لە لایەکی ترەوە ئەبو بەکری صەدیق کە مردنی لێ نزیك بۆوە، حەزرەتی عومەری کردە جێنشینی خۆی‌و دیاری کرد بۆ ئیمامەت، کەس لەهاوەڵان نەیگوت ئەمە کارێکی بێهودەیەو ناشەرعییە، نە لەسەر تۆ پێویستە ئەوە بکەی نە لەسەر ئێمە، کەوابوو دەرکەوت دانانی جێنشین‌و فەرمانبەرداری بۆی، ئەرکێکی شەرعی‌و پایەیەکە لەپایەکانی ئایین‌و بنەمایەکی سەرەکی کۆمەڵگای ئیسلامییەو هێزو توانای موسوڵمانانی پێوە بەندەو پێویستە لەسەریان پاشگوێی نەخەن.

## واجبە موسوڵمانان ملکەچی فەرمانڕەوای خۆیان بن‌و بەگوێرەی شەریعەتی خودا هەڵس‌وکەوتی لەگەڵدا بکەن

خودا دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنكُمْ – النساء/٥٩} ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوەو پابەندی ئایینی ئیسلامن! فەرمانبەرداری فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بن، گوێڕایەڵی فەرمانڕەوای خۆتان بن، هەتا ئەو بەگوێرەی شەریعەتی خودا هەڵس‌وکەوت بکا ئێوە گوێڕایەڵی بن‌و لە فەرمان‌و نەهی‌یەکانی دەرمەچن.

له ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، وتوویەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ ، وَمَنْ يُطِعِ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي ، وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي».[1] كەسێك گوێڕایەڵی من بێ ئەوە گوێڕایەڵی فەرمانی خودایە، كەسێك سەرپێچی فەرمانی من بكا، ئەوە لەخودا یاخی بووە، كەسێك ئیطاعەتی فەرمانڕەوای موسوڵمان بكا، ئەوە فەرمانبەرداری فەرمانی من بووە، كەسێك لەخەلیفەو فەرمانڕەوا یاخی بێ ئەوە لەمن یاخی بووەو سەرپێچی فەرمانی منی كردووە.

لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ڕیوایەتكراوە، دەڵێ: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ إِلاَّ أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ».[2] پێویستە مرۆڤی موسوڵمان گوێ بیسو گوێڕایەڵی فەرمانڕەوای موسوڵمان بێ لەهەموو شتێكدا، لەوشتانەدا پێی خۆشە یان پێی ناخۆشە، مەگەر فەرمانی پێ بكرێ بەیاخی بوون لەخوداو سەرپێچی فەرمانو نەهیەكانی، كە فەرمانی پێ كرا بەوەی سەرپێچی فەرمانی خودا بكا ئەوە با گوێ بیسی فەرمانڕەواكەی نەبێ فەرمانبەرداری فەرمانی نەبێ.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «عَلَيْكَ السَّمْعَ وَالطَّاعَةَ فِي عُسْرِكَ وَيُسْرِكَ وَمَنْشَطِكَ وَمَكْرَهِكَ وَأَثَرَةٍ عَلَيْكَ».[3] لەسەر تۆی موسوڵمان پێویستە گوێڕادێری

---

[1] متفق عليه: خ (١٣/١١١/٧١٣٧)، م (٣/١٤٦٦/١٨٣٥)، جه (٢/٩٥٤/٢٨٥٩).

[2] متفق عليه: خ (١٢١/١١١/٧١٤٤ و ١٣/١٢٢)، م (٣/١٤٦٩/١٨٣٩)، ت (٣/١٢٥/١٧٥٩)، د (٧/٢٩٠/٢٦٨)، ن (٧/١٤٠).

[3] م (٣/١٤٦٧/١٨٣٦)، ن (٧/١٤٠).

فەرمانڕەوا بی لەتەنگانەو فەرەحیدا، لەخۆشیو ناخۆشیدا، لەکاتێکیشدا کەوا دەزانن (أثرة)و بەرژەوەندیتان پاشگوێ خراوە.

لە وائیلی کوڕی جوحرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: سەلەمەی کوڕی یەزیدی (الجحفي) پرسیاری لە پێغەمبەر کرد (دروودی خودای لەسەر بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چی بکەینو هەڵوێستمان چی بێ ئەگەر فەرمانڕەوای وەهامان بۆ پەیدا بوون داوای ئەوەیان لێ دەکردین کە ئەوەمافەی هی ئەوانە لەسەر ئێمە بیاندەینێ بەڵام ئەوان مافی ئێمە کە لەسەر ئەوانە نەیاندەداینێ؟! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی نەدایەوەو روی لێ وەرگێڕا پاشان هەمان پرسیاری ئاڕاستە کردەوەو هەر روی لێ وەرگێڕاو وەڵامی نەدایەوە دووبارە پرسیاری لێ کردەوە لەجاری دووەمدا یان سێیەمدا ئەشعەثی کوڕی قەیس پەلی کێشایە دواوە، وەکوو بڵێ: چیدی لەوبارەوە پرسیار لە پێغەمبەر مەکە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا فَإِنَّمَا عَلَيْهِمْ مَا حُمِّلُوا وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ».[1] ئەگەر وایش بوون ئێوە هەر گوێڕادێرو فەرمانبەردار بن، ئەوان ئەرکی خۆیان لەسەرەو ئێوە ئەرکی خۆتان لەسەر. ئەگەر فەرمانڕەواکانتان ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێ نەهێنا ئێوە هی خۆتان بەجێ بێنن.

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّهَا سَتَكُونُ بَعْدِي أَثَرَةٌ وَأُمُورٌ تُنْكِرُونَهَا». لەوە بەولاوە خۆ ویستیو بەرژەوەند پەرستی پەیدا دەبێ، هەرکەسەو دەیەوێ بەرژەوەندی خۆی بێتە جێ، ئیثارو خۆنەویستی نامێنێ، زۆر هەڵوێستو کردار دەبینن لەکەسانی بەرامبەرتان پێتان ناخۆشەو

---

[1] م (١٨٤٦/١٤٧٤/٣)، ت (٣/٣٣١/٢٢٩٥).

بەناحەقی دەزانن‌و پێتان وایە مافتـان پێشێل کـراوە، هاوەڵان عـەرزیان کـرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمانت بەچیەو چی بکەین؟ ئەگـەر کەسێك لەئێوە ئەو دیاردانەی بینی‌و کەوتە ڕۆژگارێکی ئاوهاوە؟ فـەرمووی: «تُـؤَدُّونَ الْحَقَّ الَّـذِي عَلَـيْكُمْ وَتَـسْأَلُونَ اللَّـهَ الَّـذِي لَكُـمْ».[1] ئێـوە ئـەو ئەرکەی لەسـەر شانتانە جێبەجێی بکەن، داواش لەخودا بکەن ئەو مافەی هەتانە بتاندرێتێ، خـۆ ئەگـەر نەتاندرایـە ئـەوە بۆتـان دەبێتـە خێـرو فـەڕی ڕۆژی قیامـەت‌و چاکەتان پێـی زۆر دەبـێ، داوا بکـەن خـودا دڵیـان نـەرم بکـاو وایـان لێ بکـا ئـەوانیش ئـەرکی سەرشـانیان بەرامبـەر بـەئێوە جێبـەجێ بکـەن، یـان داوا لەخودا بکەن ئەو فەرمانڕەوایانەتان بۆ بگۆڕێ بە باشتر لەوان.

لـە عـەوفی کـوڕی مالیکـەوە ڕیوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: لـە پێغەمبـەرم بیست دەیفەرموو: «خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّـذِينَ تُحِبُّـونَهُمْ وَيُحِبُّـونَكُمْ وَيُـصَلُّونَ عَلَـيْكُمْ وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُـونَكُمْ ». قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ بِالسَّيْفِ فَقَالَ « لاَ مَا أَقَامُوا فِـيكُمُ الـصَّلاَةَ وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ وُلاَتِكُمْ شَيْئًا تَكْرَهُونَـهُ فَـاكْرَهُوا عَمَلَـهُ وَلاَ تَنْزِعُـوا يَـدًا مِـنْ طَاعَـةٍ».[2] باشترین فەرمانڕەوای ئێوە ئەوانەن ئێوە خۆشتان دەوێن‌و ئـەوانیش ئێوەیـان خـۆش دەوێ، داوای ڕەحمـەت‌و لێخۆشـبونیان بـۆ دەکـەن ئـەوانیش داوای ڕەحمەت بۆ ئێوە دەکەن، خـراپترین فـەرمانڕەوای ئێـوە ئەوانـەن ئێـوە ڕقتـان لێیانە‌و ئەوانیش ڕقیان لەئێوەیە، نەفرینیان لێ دەکەن‌و ئەوانیش نـەفرینتان لێ دەکەن.

راوی دەڵێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خـودا! ئایا بەربـەرەکانیان نەکـەین؟ بەگژیانـدا نەچین؟ فـەرمووی: نەخـەیر تـا ئـەوان نوێـژ بکـەن‌و ڕێ‌و ڕەسمـی

---

[1] متفق علیە: خ (١٣/٥/٧٠٥٢)، م (٣/١٤٧٢/١٨٤٣)، ت (٣/٣٣٧/٢٢٨٥).

[2] م (٣/١٤٨١/١٨٥٥).

نوێژ بەجێ بێنن‌و شەعائیری ئایین ئەنجام بدەن، ئاگادار ببنـەوە هەرکەسێك والی‌یەکی بۆ دانرا، بینی ئەو والی‌یە هەڵس‌وکەوتێك دەکا پێچەوانەی ئایینـە، با کارەکەی ببوغزێنێ، بەڵام با لێی یاخی نەبێ.

### کام فەرمانڕەواو ئیمامە پێویستە گوێڕایەڵی بکرێ؟

لە کتێبی (منـار السـبیل)دا هـاتووە دەڵـێ: هەرکەسـێك بـەگوێرەی یاسـای ئیسلامی بووە فەرمانڕەوا حەرامە سەرپێچی فەرمانەکانی بکرێ‌و لێـی یـاخی ببـێ‌و شـەڕی لەگـەڵ بکـرێ، جـا فـەرمانڕەوایی‌یـەکـە بـەکۆڕای موسـوڵمانان دابمەزرێ وەکوو حـەزرەتی ئـەبو بـەکر (رەزای خـودای لێ بـێ) یـان بەعەهـدو بتمانـەدان لـە خەلیفـەی پـێش خۆیـەوە بکرێتـە ئیمـام وەکـوو حـەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خودای لێ بێ) یـان لەڕێگـەی ئیجتیهـادی پیـاو مـاقوڵ‌و ئـەهلی حیلـل‌و عەقـدەوە ببێتـە خەلیفـە، وەکـوو ئیمـامی عوثمـان. چـونکە حـەزرەتی عومـەر (رەزای خـودای لێ بـێ) دیـاری کردنـی خەلیفـەی خستە پڕۆژەی ڕاوێژەوە لەنێوان شەش لەهاوەڵاندا، سەرەنجام ڕایان هاتە سەر ئەوە کە حـەزرەتی عوسمـان ببێتـە جێنـشین، یـان ئـەوە فـەرمانڕەوا بۆخـۆی خـۆی بـسەپێنێ وەکـوو عەبدولمـەلیکی کـوڕی مـەروان کـە لـەئیبنو زوبـەیر هەڵگەڕایـەوەو سـەرەنجام لـەناوی بـردو دەسـتی بەسـەر وڵات‌و موسـوڵماناندا گـرت. بـەجۆرێك موسـوڵمانان بەناچـاری‌و بـەئیختیار بەیعـەتیان پـێ کـردو کردیانە خەلیفەو فەرمانڕەوای خۆیان.

ئیمـام ئەحمـەد – وەکـوو لەڕیوایـەتی العطـاردا هـاتووە - دەڵـێ: کەسـێك بەزەبری شمشێر زاڵ بوو بەسەر موسوڵمانانداو بـوو بـە خەلیفـەو رابـەریان‌و نـاوی (ئـەمیرالمـؤمنین)ی لێ نـرا، پێویـستە موسـوڵمانان فەرمانبـەرداری بـن، تەنانەت حەڵاڵ نیە بۆ کەسێك ئیمـانی بـەخودا هـەبێ تاقـە شـەوێکیش لێـی

یاخی بێو بەئیمامی نەزانێ، جا ئەو ئیمامە پیاوی چاك بێ یان پیاوی خراپ بێ.

لــە کتێبــی (الغایــە)دا دەڵــێ: ئەگــەر لەعالــەمی ئیــسلامیدا هــەر دەســەڵاتدارێك بەســەر ناوچــەیەکدا خــۆی ســەپاندو زاڵ بــوو وەکــوو ئــەم ڕۆژگــارەی ئێمــە، ئــەوە حــوکمی هــەر یــەکێك لــەو فەرمانڕەوایانــە حــوکمی خەلیفەی ئیسلامی هەیە.[1]

## پابەندبوون بە بەیعەتی فەرمانڕەوایانی موسوڵمان واجبەو دەبێ وەفای پێ بکرێ، تا فەرمانڕەوای پێشوو هەبێ دروست نیە بەیعەت بکرێ بەیەکێکی تر

ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی کردووە: کە پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بێ) فەرموویــەتی: «كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ ، كُلَّمَا هَلَكَ نَبِـيٌّ خَلَفَـهُ نَبِيٌّ ، وَإِنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي ، وَسَيَكُونُ خُلَفَاءُ فَيَكْثُرُونَ . قَـالُوا فَمَـا تَأْمُرُنَـا؟ قَـالَ فُـوا بِبَيْعَةِ الأَوَّلِ فَـالأَوَّلِ ، أَعْطُـوهُمْ حَقَّهُـمْ ، فَإِنَّ اللَّـهَ سَـائِلُهُمْ عَمَّـا اسْـتَرْعَاهُمْ».[2] نەتەوەی بەنو ئیــسرائیل پێغەمبــەرەکانیان فــەرمانڕەواییان دەکــردن، هەرکــە پێغەمبەرێك لەدونیا دەردەچوو پێغەمبــەرێکی تــر شــوێنی ئــەوی دەگرتــەوە. دڵنیــابن لــەدوای مــن پێغەمبــەر نایــەن، کــاری موســوڵمانان دەکەوێتــە دەســت خەلیفەو فەرمانڕەوایان، زۆریش دەبن، هاوەڵان عەرزیان کرد چیمان فــەرمان پێ دەکەی هەڵسوکەوتمان بەرامبــەریان چۆن بــێ؟ فــەرمووی: وەفابکــەن بــە بەیعەتی خۆتان گوێڕایەڵی فەرمانڕەوای موسوڵمانان، تا فــەرمانڕەوای یەکــەم هــەبێ بەیعــەت بــە یــەکێکی تــر مەکــەن، مــافی خۆیــان بــدەنێ لەگوێڕایــەڵیو

[1] منار السبیل ج٢/٣٩٨.

[2] متفق علیه: خ (٣٤٥٥/٦/٤٩٥)، م (١٨٤٢/١٤٧١/٣).

فەرمانبەرداری. بێگومان خودا ڕۆژی قیامەت لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکا دەربارەی ئەوانەی فەرمانڕەواییان کردوون.

لە عەرفەجەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «إِنَّهُ سَتَكُونُ هَنَاتٌ وَهَنَاتٌ فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يُفَرِّقَ أَمْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ وَهْيَ جَمِيعٌ فَاضْرِبُوهُ بِالسَّيْفِ كَائِنًا مَنْ كَانَ». لەمە بەدواوە کێشەو نیزاع بەرپا دەبن کەسانێك پەیدا دەبن هەوڵی فەرمانڕەوایو دەسەڵات گرتنە دەست دەدەن، جا هەرکەسێك هەوڵی تەفرەقەو لێکترازانی کۆمەڵی ئیسلامیدا ویستی یەکیەتیو تەباییان لەناو بەرێ، لەهەر بنەماڵەو چینو توێژێك بێ بەشمشێر لێی بدەن، شەڕی لەگەڵ بکەنو ڕێگە مەدەن کۆمەڵی موسوڵمانان پارچە پارچەو گرۆ گرۆ ببن.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێ: «مَنْ أَتَاكُمْ وَأَمْرُكُمْ جَمِيعٌ عَلَى رَجُلٍ وَاحِدٍ يُرِيدُ أَنْ يَشُقَّ عَصَاكُمْ أَوْ يُفَرِّقَ جَمَاعَتَكُمْ فَاقْتُلُوهُ».[1] هەرکەسێك هاتو هەوڵی ئەوەیدا کۆمەڵی ئێوە لەژێر فەرمانڕەوای خەلیفەیەکدا بەڕێوە دەچوو ڕیزەکانتان تۆکمەیو پتەو بوونو هەوڵیدا کۆمەڵتان پەرتەوازە بکاو دووبەرەکیو کوتلەکاری پەیدا بکا لەنێوتاندا، بیکوژن مەهێڵن ویستەکەی بێتەجێ.

لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِذَا بُويِعَ لِخَلِيفَتَيْنِ فَاقْتُلُوا الآخَرَ مِنْهُمَا».[2] ئەگەر بەیعەت درا بەدوو فەرمانڕەوا بزانن کامەیان لەپێشدا بەیعەتی دراوەتێ ئەوەیان بەخەلیفە دابنێنو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن ئەوی

---

[1] م (١٤٧٩/١٨٥٢ و ٣/١٤٥٠).

[2] م (٣/١٤٨٠/١٨٥٣).

دووهـــەميان بكـــوژن، بـــا نەبێتـــە هـــۆی تەفرەقـــەو دووبـــەرەكی كۆمـــەڵی موسوڵمانان.

## حەرامە لەژێر ركێفی فەرمانڕەوا بچیەدەرو شەڕكردنو كوشتنـی خەواریجو یاخی بووان واجبە

بێگومان دەقەكانی قورئانو سوننەت كە لەوەپێش ئاماژەمان پێ كردنو هی تریش جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كە گوێڕایەڵی بۆ فەرمانڕەوای موسوڵمانان واجبەو نابێ سەرپێچی بكرێو بەربەرەكانی بكرێ. جا ئەگەر كۆمەڵێك یەكیان گرتو خاوەنی هێزو دەسەڵات بوون لە ئیمامو فەرمانڕەوای عادڵ هەڵگەڕانەوە پاساوێكیان بۆ ئەو هەڵگەڕانەوەی خۆیان هەبوو، لەناو خۆیاندا ئیمامێكیان بۆ خۆیان دانا، حوكمی شەرعیو كاری پێویست دەربارەیان ئەوەیە خەلیفەو فەرمانڕەوا بنێری بۆ لایانو داوایان لێ بكا بێنەوە ژێر ركێفیو لە هەڵوێستی خۆیان پەشیمان ببنەوە، ئەگەر ئەوان نارەزاییو ماف خوراوی خۆیان خستەڕو پێویستە فەرمانڕەوا گلەییو گازەندەكانیان ببڕێو زوڵمو ستەمێكی كە لێیان كراوە لایبەرێو مافی ڕەوای خۆیان بداتێ. خۆ ئەگەر هیچ بیانوویان نەبوونو سووربوون لەسەر یاخی بوونی خۆیان دەبێ ئیمام شەڕیان لەگەڵ بكاو تەنگیان پێ هەڵچنێ تاوایان لێ دەكا دێنەوە ژێر ركێفیو فەرمانبەرداری دەبن.

پێویستە موسوڵمانان هەموویان پشتگیری ئیمام بكەنو یارمەتی بدەن، بەهەموو جۆرێك دژی یاخی بووەكان بوەستنو تەنانەت ئەگەر بكاتە شەڕكردنیش لەگەڵیان، هەتا یاخیبووەكان دەگەڕێنەوە بۆ ژێر فەرمانی ئیمامو واز لە هەڵوێستی یاخی بوونیان دەهێننو دەكەونەوە گەڵ كۆمەڵی ئیسلامی. قورئان دەفەرموێ: {وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ —

الحجرات/٩} ئەگەر دوو تاقمو پێڕی موسوڵمان شەڕیان بوو شەڕیان پێ رابگرنو ئاشتیان بکەنەوە، صوڵحی نێوانیان بکەن، ئەگەر لایەنێکیان ملی نەدا بۆ ئاشتیو شەڕی رانەگرت، ئێوە بەهەمووتان شەڕ لەگەڵ پێڕی یاخی بوو بکەن تا ناچاریان دەکەن دەگەڕێنەوە بۆ ژێر فەرمانڕەوای ئیسلام.

قازی ئەبوبەکر (ابن العربی) دەڵێ: ئەم ئایەتە ئەصڵو بنەمایە لە شەڕکردنی موسوڵمانانو عومدەو کۆڵەکەیەکی پتەوە بۆ شەڕکردن دژی ئەوانەی بەهەندێ بیانوو پاساوی جیا جیا ڕێگە بەخۆیان دەدەن لە فەرمانڕەوا یاخی دەبن.

هاوەڵانیش لەسەردەمی خۆیان پشتیان بە ماناو مەفهومی ئەم ئایەتە بەستووە بۆشەڕکردن دژی ئەوانەی لەژێر رکێفی خەلیفەی ئیسلام چوونە دەرەوە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «تَقْتُلُ عَمَّارًا الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ». کۆمەڵێکی یاخی بوو عەممار شەهید دەکەن. مەبەستی بە پێڕی یاخی بوو ئەوانەن کە لەژێر فەرمانی خەلیفەی موسوڵمانان نەماونو ئاڵای یاخی بوونو دژایەتی فەرمانڕەوای موسوڵمانیان بەرزکردۆتەوە.

بێگومان لەلای زانایانی ئیسلام ئەوە چەسپاوەو بە بەڵگە سەلمێندراوە: کە حەزرەتی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) خەلیفەو ئیمامی شەرعی موسوڵمانان بووەو هەموو ئەوانەی لەژێر فەرمانی چوونەدەر بەیاخی بوو دەژمێردرێنو شەڕکردن لەگەڵیان واجب بووە بۆئەوە بگەڕێنەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی ئیمامی عەلیو ملکەچی صوڵحو ئاشتەوایی بن.[1]

هەرکاتێکیش شەڕ لەگەڵ یاخی بووان کرا نابێ دیلیان بکوژرێ، ئەگەر هەڵاتن شوێنیان ناکەون، بریندارایان دەبێ دەرمان بکرێو نەهێڵدرێ خوێنیان

[1] الجامع لأحکام القرآن: ج١٦/٣١٨.

لەبەربڕوا تا دەمرن. منداڵیان ناکرێ بە (سەبایا)و نارفێندرێ،ماڵیان ناکرێ بە تالآنیو غەنیمەت. ئەوەی فەوتاندویانە لە ماڵو سامان ئەو خوێنەی رشتوویانە ئەگەر تۆبەیان کرد لەسەر ئەوشتانە سزا نادرێنو عەفوون.[1]

کوژراویان مامەڵەی کوژراوی موسوڵمانیان لەگەڵ دەکرێ، دەشۆردرێنو کفنو دفن دەکرێنو نوێژی مردویان لەسەر دەکرێ لە گۆڕستانی موسوڵماناندا دەنێژرێن، چونکە پەروەردگار وێڕای یاخیبوونیان فەرموویەتی: {وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ – الحجرات/٩}. پاشان دەفەرموێ: {إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ – الحجرات/١٠}.

## كتاب الجنايات (باسی تاوانەکان)

جنایات: کۆی (جنایە)یە. چاوگەو لە (جنى الذنب يجنيه جناية) وەرگیراوە لەزاراوەی شەرعدا بریتییە لەدەست درێژی بۆسەر جەستە بەجۆرێك تۆڵەو قیصاصی لەسەربێ.

### موسوڵمان رێزی هەیەو نابێ دەستدرێژی بکرێتە سەر

قورئان دەفەرموێ: {وَلا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً. وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ عُدْوَاناً وَظُلْماً فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَاراً وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيراً – النساء/٢٩–٣٠}. ئەی ئیمانداران ئێوە دەست درێژی مەکەنە سەر یەکترو خۆتان مەکوژن، بێگومان خودا خاوەنی رەحمو بەزەییە بۆ ئێوەو ئەوەی نەهیتان لێ

---

[1] الجامع لأحكام القرآن: ج/٣٣٠.

دەكا لەبەرژەوەندی ئێوەدایە، كەسێك خۆی بكوژێ یان بەناحەق یەكێكی تر بكوژێ ئەوە تاوانی گەورەی ئەنجام داوەو لەوە بەولاوە توڕی دەدەینە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەمەش بۆ خودا كارێكی ئاسانەو هیچ ماندووبوونی تێدا نیە.

یان دەفەرموێ: {وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً – النساء/٩٣} كەسێك بەناحەقو بە ئەنقەست موسوڵمانێك بكوژێ ئەوە سزای ئەو تاوانبارە ئاگری دۆزەخە بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوە، رقو قاری خودای لەسەرەو نەفرینی لێ كردوە، سزای گەورەو سامناكی بۆ ئامادە كردوە.

هەروا دەفەرموێ: {مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَنْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً – المائدة/٣٢} لەبەرئەوە: لەسەر نەتەوەی ئیسرائیلمان پێویست كردو كردمانە یاسایەكی نەگۆڕ: كە هەركەسێك بەناحەقو ناڕەوا كەسێك بكوژێ كوشتنەكەی لە تۆڵەی كوشتندا نەبێ، یان بەمەبەستی قەلاچۆكردنی فەسادو ئاشوب لەسەر زەوی نەبێ، ئەوە تاوانەكەی ئەوەندە گەورەیە وەكوو ئەوە وایە هەموو ئادەمیزادی كوشتبێ، كەسێكیش كەسێك لەتێداچوونو فەوتان رزگاربكا ئەوەندە كارێكی باشە وەكوو ئەوە وایە هەموو ئادەمیزادی لە فەوتانو تێداچون رزگاركردبێ.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ». قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ « الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ وَأَكْلُ الرِّبَا

وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ».[1] خۆتـان بپارێزن له حەوت جۆر تاوانی بە هیلاکبەر، هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەو تاوانانـە چین ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: هاوەڵدانان بۆ خودا. کوشتنی نەفسێك کە خـودا حـەرامی کـردوە، مەگـەر بـە حـەق‌و قیـصاص. هـەروا خـواردنی مـاڵی هەتیو، خواردنی سودو ریبا، پـشت هـەڵکردن لـە ڕۆژی هێـرش بـردن بۆسـەر دوژمن، بوختان هەڵبەسـتن بـۆ ئـافرەتی داوێنپـاکی بێئاگا لـەو تاوانـەی پـاڵی دراوە.

لـە عەبـدوڵڵای کوڕی عومـەری خەتابـەوە ڕیوایـەتکراوە: کە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَـى اللَّـهِ مِـنْ قَتْـلِ رَجُلٍ مُـسْلِمٍ».[2] وێرانبـون‌و نـەمانی دونیـا لـەلای خـودا سـوکترە لـە کوشـتنی پیاوێکی موسوڵمان.

لـە ئـەبو سـەعیدی (الخـدری)و ئـەبو هـورەیرەوە ڕیوایـەتکراوە: کـە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَـوْ أَنَّ أَهْـلَ الـسَّمَاءِ وَأَهْـلَ الأَرْضِ اشْتَرَكُوا فِي دَمِ مُؤْمِنٍ لأَكَبَّهُمُ اللَّهُ فِي النَّـارِ».[3] ئەگـەر ئـەهلی ئاسمان‌و ئەهلی سەر زەوی هاوبەشی بکەن لە کوشتنی ئیماندارێك دا، خـودا هـەموویان بەرەو دەم دەخاتە ناو دۆزەخەوە.

لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعودەوە ڕیوایـەتکراوە، دەڵـێ: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ».[4]

---

[1] متفق عليه: خ(٥/٣٩٣/٢٧٦٦)، م(١/٩٢/٨٩)، د(٨/٧٧/٢٨٥٧)، ن(٦/٢٥٧).

[2] صحيح: (ص.ج/٥٠٧٧) ، ت(٢/٤٢٦/١٤١٤)، ن(٧/٨٢).

[3] صحيح: (ص.ج/٥٢٤٧) ، ت(٢/٤٢٧/١٤١٩).

[4] متفق عليه: خ(١٢/١٨٧/٨٦٦٤)، م(٣/١٣٠٤/١٧٨)، ت(٢/٤٢٧/١٤١٨)، ن(٧/٨٣).

یەکەم دادگاو یەکالا کردنەوەیەك کە لەنێوان ئادەمیزادەکاندا دەکرێ دەربارەی خوێنە.

هەر لە عەبدوڵلاوە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «يَجِيءُ الرَّجُلُ آخِذًا بِيَدِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ يَا رَبِّ هَذَا قَتَلَنِي. فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ لِمَ قَتَلْتَهُ فَيَقُولُ قَتَلْتُهُ لِتَكُونَ الْعِزَّةُ لَكَ. فَيَقُولُ فَإِنَّهَا لِي. وَيَجِيءُ الرَّجُلُ آخِذًا بِيَدِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ إِنَّ هَذَا قَتَلَنِي. فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ لِمَ قَتَلْتَهُ فَيَقُولُ لِتَكُونَ الْعِزَّةُ لِفُلاَنٍ فَيَقُولُ إِنَّهَا لَيْسَتْ لِفُلاَنٍ فَيَبُوءُ بِإِثْمِهِ».[1] ڕۆژی قیامەت وادەبێ پیاو دێ بۆ سارای مەحشەر دەستی پیاوێکی گرتووە: دەڵێ خودایە، ئەم پیاوە لەدونیادا کوشتمی، پەروەردگار بەکابرای بکوژ دەڵێ: بۆچی کوشتت؟ دەڵێ: بۆیە کوشتم تا ئایینی تۆ سەرکەوێو شکۆمەندی بۆ زاتی پاکت بچەسپێنم، خودا دەفەرموێ: ئەمەت لەبەر خاتری ئایینی من کردووەو شکۆمەندی هەر بۆمنە، پیاوی واهەیە دێتە سارای مەحشەر دەستی پیاوێکی گرتووە دەڵێ ئەم پیاوە منی کوشتوە، خودا پێی دەفەرموێ: بۆچی کوشتت؟ دەڵێ بۆیە کوشتم تا فلانکەس فەرمانڕەوای بچەسپێنێو ئاغایەتی بۆ دابمەزرێ، خودا دەفەرموێ: فلانکەس شکۆمەندیی نیە، ئیتر بە تاوانباریی دەگەڕێتەوە.

## حەرامە مرۆڤ خۆی بکوژێ

لە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ ، فَهْوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ ، يَتَرَدَّى فِيهِ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا ، وَمَنْ تَحَسَّى سَمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ ، فَسَمُّهُ فِي يَدِهِ ، يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ ، فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ ، يَجَأُ

---

[1] صحيح: (ص.ن/٣٧٣٢) ، ن(٧/٨٨٤).

بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا».[1]كەسێك خۆی لەشاخێك هەڵدێریو خۆی بکوژێ، ئەوە بۆ هەتا هەتایە لەناو ئاگری دۆزەخدا هەر خۆی هەڵدەدێرێ بەناو ئاگردا رۆدەچێ، کەسێك ژەهر بخواتەوەو خۆی ژەهر خواردو بکا، ئەوە لەناو ئاگری دۆزەخدا هەمیشە بۆ هەتا هەتایە ژەهرەکەی بەدەستەوەیەو دەیخواتەوە، کەسێك بە پارچە ئاسنێك خۆی بکوژێ ئەوە رۆژی قیامەت لەناو دۆزەخدا ئاسنەکەی بەدەستەوەیەو ورگی خۆی پێ قەمە هەنجن دەکا بۆ هەتاهەتایە.

لە جوندوبی کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ ، فَجَزِعَ فَأَخَذَ سِكِّينًا فَحَزَّ بِهَا يَدَهُ ، فَمَا رَقَأَ الدَّمُ حَتَّى مَاتَ ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى بَادَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِهِ ، حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ».[2] لە رۆژگارو سەردەمی پێش ئێوەدا پیاوێك برینێکی پێوە بوو، چاك نەدەبووەوە، صەبری نەگرتو هات بە چەقۆیەك دەستی خۆی بڕیەوە، ئیتر خوێنی بەربوو خوێنی نەوەستایەوە تامرد، پەروەردگار فەرمووی: بەندەکەم پەلەی کرد لەگیان دەرچوونی خۆیداو تەمەنی خۆی کۆتایی پێ هێنا، منیش بەهەشتم لێ حەرام کرد.

لە جابیرەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: طوفەیلی کوڕی عەمری (الدَوسی) هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی رەوانەکراوی خودا ئەگەر دەتەوێ کۆچ بکە بۆ وڵاتی ئێمە پارێزگاریت لێ دەکەین بۆت دەبین بە قەڵای قایمو پتەو، قەڵاکە هی هۆزی دەوس بوو هی سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام بوو.

---

[1] متفق عليه: خ(١٠/٢٤٧/٥٧٧٨)، م(١/١٠٣/١٠٩)، ت(٣/٢٦٠/٢١١٦)، د(١٠/٣٥٤/٣٨٥٥).

[2] متفق عليه: خ(٦/٤٩٦/٣٤٦٣)، م(١/١٠٧/١١٣).

وەڵێ پێغەمبـــەر (دروودی خـــودای لەســـەر بـــێ) قبـــووڵی نـــەکرد، ئـــەم ســـەروەرییەیان بـــە نـــصیب نـــەبوو چـــونکە پـــەروەردگار ئـــەو ســـەربەرزیو بەهرەیەی هەڵگرتبوو بۆ یاریدەدەران لە هۆزی ئەوس‌و خەزرەج‌و کردی بە خەڵاتی ئەوان. جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، طوفەیل‌و پیاوێك لە هۆزەکەی کۆچیان کرد بۆ مەدینە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەدەر وابوو ئاوو هەوای مەدینەیان پێ نەکەوت، پیاوەکە تووشی نەخۆشی بوو نەخۆشییەکەی هەراسانی لێ هەڵگرت، بەدەمـە تیرێکی پانکۆڵە جومژگەی پەنجەکانی خۆی بڕیەوە، هەردوو دەستی زاماربوون‌و خوێنیان نەگیرسایەوە تا پێی مرد. لە دواییدا طوفەیل بەخەو پیاوەکەی بەشێوەیەکی جوان بینی وەڵێ هەردوو دەستی داپۆشرابوون. پێی دەڵێ: خودا لوطفی چۆن بوو لەگەڵت؟ دەڵێ بەهۆی کۆچکردنم بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ مەدینە خودا لە تاوانەکانم خۆش بوو بەتایبەتی لەتاوانی خۆکوشتنم، بەڵام طوفەیل کە دەبینێ دوو دەستی داپۆشراون لێی دەپرسێ ئەدی هۆی چیە دەستەکانت داپۆشراون؟ دەڵێ: پێم گوترا: ئەوەی بۆ خۆت خراپت کردووە لە جەستەی خۆت ئێمە بۆت چاك ناکەینەوە! پاشان طوفەیل خەونەکەی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە فەرمووی: «اللّٰهُمَّ وَلِيَدَيْهِ فَاغْفِرْ» ئەی خودای گەورەمان لەدەستەکانیشی خۆشبە.[1]

---

[1] صحيح: (مختصر م/٩٧)، م(١/١٠٨/١١٦).

**ئەوەی ڕێگەی کوشتن دەداو وای لێ دەکا ڕەوابێ**

قورئـان دەفـەرموێ: {وَلاَ تَقْتُلُـوا الـنَّفْسَ الَّتِـي حَـرَّمَ اللَّـهُ إِلاَّ بِـالْحَقِّ – الإسراء/٣٣} نەچن ئەو نەفسەی خودا کوشتنی حەرام کـردوە ئێـوە بیکوژن، مەگەر لە تۆڵەو قیصاص دابێ‌و کوشتنەوەی حەق‌و ڕەوابێ.

لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) فەرموویەتی: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّـاسَ حَتَّـى يَـشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّى دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ ، وَحِسَابُهُمْ عَلَـى اللَّـهِ».[1] فـەرمانم پێکـراوە لەلایەن خوداوە بجەنگم‌و شەڕ لەگەڵ ئـەو خەڵکە بکەم کە هـاوەڵ بـۆ خـودا دادەنێن، تا شایەتومان دەهێنن‌و دەڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) هیچ خودا نین شـیاوی پەرستش بن جگە لە (الله)، هـەروا شـایەتی بـدا: کـە موحەممـەد پێغەمبـەری خودایە، ئیتر هەرکەسێ ئەمـە بڵـێ: سـەرو سـامانی خۆی‌و نـاموس‌و خـوێنی پارێزراوەو لەمن حەرام دەبێ. مەگەر لەسەر مافێکی ڕەوا کە لەسەری بێ.

ئـەو حەقـەی کـە لەئایەتەکـەدا ئامـاژەی پێکـراوەو ڕێگـای کوشـتنی ئـادەمیزاد دەدا، بـە فەرموودەیـەکی تـری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) تەفسیرکراوەتەوە، کە دەفەرموێ: «لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ الثَّيِّبُ الزَّانِـي وَالـنَّفْسُ بِـالنَّفْسِ وَالتَّـارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ».[2] خوێنی مرۆڤی موسوڵمان ڕەوانیـە بـڕژێ، کوشـتنی موسـوڵمان حـەڵاڵ نیـە مەگـەر بـە یـەکێ لـەم سـێ حاڵەتـە: کەسـێك کەسـێك بکـوژێ دەکوژرێتـەوە، بێوەبـێ‌و زینابکـا، موسـوڵمان لـە ئـایینی خـۆی پاشگەزبێتەوە.

---

[1] متفق عليه: خ(١/٧٥/٢٥)، م(١/٥٣/٢٢).

[2] متفق عليه: خ(١٢/٢٠١/٦٨٧٨)، م(٣/١٣٠٢/١٦٧٦)، د(١٢/٥/٤٣٣٠).

## جۆرەکانی کوشتن

**کوشتن سێ جۆرە: بە ئەنقەست، شێوە عەمد، هەڵە.**

١- کوشتنی بەئەنقەست ئەوەیە کابرایەکی موکەلەف قەصدی کوشتنی مرۆڤێکی بێ تاوان بکا، بە ئامێرو هۆکارێك کە عادەتەن ئەو چەك و ئامێرە مرۆڤی پێ دەکوژرێ.

٢- شێوە عەمد ئەوەیە کابرا بیەوێ بە ئامێرێك لە یەکێکی تربدا؛ کە عادەتەن ئەو جۆرە لێدانە بەو ئامێرە مرۆڤ ناکوژێ کەچی گیانی دەرچێنێ، بیکوژێ.

٣- کوشتنی هەڵە ئەوەیە، کابرای موکەلەف کارێکی رەوا ئەنجام بدا کەچی ببێتە هۆکاری کوشتنی مرۆڤێك، بۆ نموونە کابرا چەك ئاراستەی نێچیرێك بکا کەچی بەر مرۆڤێك بکەوێ و بیکوژێ، لەجۆری دووەم و سێیەم دا کەفارەت لەسەر بکوژەکەیەو خوێنیش لەسەر خزمەکانیەتی، ئاماژە بە ئایەتی قورئان کە دەفەرموێ: {وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلاَّ خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنْ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيماً حَكِيماً – النساء/٩٢}. رەوانیە بۆ موسوڵمان کە موسوڵمان بکوژێ، هەرکەسێ ئەو تاوانە بکا سزای سەختی دۆزەخی هەیە. مەگەر کەسێك بەهەڵە ئەو تاوانەی لەدەست بقەومێ. جا ئەگەر موسوڵمانێك بەهەڵە موسوڵمانێکی لەدەست کوژرا، ئەوە دەبێ لە فەرمبووکردنەوەی ئەو تاوانەدا کۆیلەیەك ئازادبکاو خوێنیش بدا بە کەس وکاری کوژراو مەگەر کەس وکاری کوژراو لێی خۆشبن و خوێنەکەی لێ نەستێنن. ئەگەر کوژراوەکە بۆ خۆی موسوڵمان بوو بەڵام کەسوکاری کافرو دوژمن بوون بەمئێوە، ئەوە

کەفارەتەکەی ئازادکردنی کۆیلەیەکی موسوڵمانەو خوێن نادرێ. ئەگەر کوژراو لەگەڵ و هۆزێك بوو لەگەڵ ئێوەدا عەهدو پەیمان هەبوو، ئەوە دەبێ خوێن، بدرێ بە کەس‌وکاری کوژراوو کۆیلەیەکی موسوڵمانیش ئازادبکا، جا ئەگەر کۆیلە دەستەبەر نەبوو دەبێ دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێ، ئەمە تەوبەو قەرەبوو کردنەوەیە لەو تاوانەو لەخوداوە دانراوە، پەروەردگار زاناو کاربەجێیە. وەلێ کوشتنی بەئەنقەست، خزم‌و کەسوکارو خوێنگرەکانی سەرپشکن لەوەدا بکوژ بکوژنەوە، یان نەیکوژنەوەو خوێن وەربگرن، ئاماژە بە ئایەتی قورئان: کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنْ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ – البقرة/١٧٨}.

ئەی خاوەن باوەڕان تۆڵە لەبکوژ بکەنەوە دەبێ مرۆڤی ئازاد لەجیاتی مرۆڤی ئازاد بکوژرێتەوە، کۆیلە لەشوێنی کۆیلەو مێینە لەشوێنی مێینە. جا ئەگەر بکوژ لەلایەن خزم‌و کەسوکاری کوژراوەوە عەفووکراو نەیانکوشتەوە پێویستە بەرێ‌و جێ‌و چاکەکاری‌و پیاوانە خوێنەکە وەربگرن، هەروا پێویستە خوێندەرەکان بە پیاوانەو رێك‌و پێك خوێنەکە بدەن، ئەوە کە دروستە لەجیاتی کوشتنەوە خوێن وەربگیرێ ئاسانکردن‌و بارسوکییە لەسەر بکوژ لەخوداوە بڕیاری لەسەر دراوەو رەحمەت‌و بەزەیی خودایە بۆتان، جا کەسێ تەجاوزکاری بکاو زێدەڕەوی بکا لەخوێن وەرگرتندا یان لەخوێن داندا ئەوە سزای سەختی دۆزەخی بۆ ئامادەکراوە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ إِمَّا أَنْ يُودَى أَوْ يُقَادَ».[1]

---

[1] متفق عليه: خ(٦٨٨٠/١٢/٢٠٥)، م(١٣٥٥/٢/٩٨٨).

کەسـێك موسـوڵمانێکی لەدەسـت کـوژرا یـان لـەجیاتی خـوێن دەدا یـان دەکوژرێتەوە.

ئەم ماڵو سامانەی لەجیاتی خوێن دەدرێ، بە کوشتنەکە واجب نـەبووە بەڵکوو بەدەلی قیصاصەکەیە، بۆیە بۆ خوێن وەرگرەکان ڕەوایـە صوڵح بکـەن لەسـەر غـەیری خوێنەکـە، تەنانـەت ئەگـەر زیـادیش وەربگـرنو داوای زیـادە بکـەن، ئامـاژە بـە فـەرموودەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـە دەفەرموێ: «مَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا دُفِعَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْمَقْتُولِ فَـإِنْ شَـاءُوا قَتَلُـوا وَإِنْ شَاءُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ وَهِيَ ثَلاثُونَ حِقَّةً وَثَلاثُونَ جَذَعَةً وَأَرْبَعُونَ خَلِفَـةً وَمَـا صَـالَحُوا عَلَيْهِ فَهُوَ لَهُمْ». وَذَلِكَ لِتَـشْدِيدِ الْعَقْـلِ.[1] کەسێك بـە ئەنقەست موسـوڵمانێکی کوشـت، بکـوژ دەدرێتـە دەسـت خـزمو کەسـی کـوژراو، ئەگـەر ئارەزۆیـان بـوو بیکوژنەوە، ئەگەر حەزیان لێ بوو خوێنی لێ وەردەگـرن، خـوێنی کوژراو سـەد حوشترە، سییان سـێ سـاڵیان تـەواوکردبێو چـوبنە سـاڵی چـوارەمەوە، سییان چوار ساڵیان تەواوکردبێو چوبنە ساڵی پێنجەم، چلیـشیان ئـاوس بـن، ئـەوەی خزمو کەسوکاری کوژراو پێی رازی دەبنو صوڵحی لەسـەردەکەن ئـەوە مـافی خۆیانە وەری بگرن، ئەمەش بەمەبەستی گرانکردنی خوێنەکە لەسەر بکوژ.

خـۆ ئەگـەر خزمـی کـوژراو بکـوژ عـەفو بکـەن ئـەوە باشـترە، ئامـاژە بـە ئایەتی {وَأَنْ تَعْفُوا أَقْـرَبُ لِلتَّقْـوَى – البقـرة/٢٣٧} ئەگـەر ئێـوەی کەسـوکاری کوژراو بکوژ عـەفوو بکـەن لـە کوشـتنەوەو لـەخوێن، وەرگـرتن ئـەوە باشـترەو نزیکترە لە تەقوا.

---

[1] حسن (ص.ت/١١٢١)، ت(٢/٤٢٣/١٤٠٦)، جة(٢/٨٧٧/٢٦٢٦).

هەروا ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلاَّ عِزًّا»[1]؛ ئادەمیزادی لێ بوردەو عەفوکار، خودا شکۆمەندی پێ دەدا.

## مەرجەکانی تۆڵەستاندنەوەو کوشتنەوەی بکوژ

**کوشتنەوەی بکوژ واجب نابێ هەتا ئەم مەرجانە نەیەنە دی:**

١- دەبێ بکوژ باڵغو عاقڵو بەئاگا بێ، واتە (موکەللەف) بێ. کەوابوو تۆڵەستاندنەوە (قیصاص) لەسەر منداڵو شێتو نوستوونیە، ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجنون حَتَّى يُفِيقَ وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ».[2]؛ قەڵەمی موحاسەبەو تۆڵە لەسەر سێکەس هەڵگیراوە: لەسەر مناڵ هەتا باڵغ دەبێ، لەسەر شێت هەتا ئیفاقەی دێو چاك دەبێتەوە، لەسەر نوستوو هەتا بەئاگا دێتەوە.

٢- نابێ کوژراوەکە لەوکەسانە بێ کە کوشتنیان رەوایە بەهۆیەك لەو هۆیانەی حەدیثی «لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ رَجُلٌ كَفَرَ بَعْدَ إِسْلاَمِهِ أَوْ زَنَى بَعْدَ إِحْصَانِهِ أَوْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ».[3] دیاری کردووە.

٣- نابێ کوژراوەکە کورو کچو نەوەی بکوژبێ ئاماژە بە حەدیثی (لا يُقْتَلُ الْوَالِدُ بِوَلَدِهِ).[4] باوك کە بکوژی منداڵی خۆی بێ ناکوژرێتەوە.

---

[1] صحيح: (ص.ت/١٨٩٤) ، م(٤/٢٠٠١/٢٥٨٨)، ت(٣/٢٥٤/٢٠٩٨).

[2] صحيح: (ص.ج/٣٥١٢) .

[3] صحيح: (ج/٧٦٤١) .

[4] صحيح (الإرواء/٢٢١٤)، ت(٢/٤٢٨/١٤٢٢)، جة(٢/٨٨٨/٢٦٦١).

٤- نابێ كوژراو كافربێ‌و بكوژ موسوڵمان بێ چونكه پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) ده‌فه‌رموێ: (لاَ يُقْتَـلُ مُـسْلِمٌ بِكَـافِرٍ).[1] موسوڵمان به‌هۆی ئه‌وه‌ی كه كوژراوه‌كه‌ی كافره ناكوژرێته‌وه.

٥- نابێ كوژراو كۆیله بێ‌و بكوژ ئازاد، ئه‌گه‌ر بكوژ مرۆڤی ئازادبوو كوژراوه‌كه‌ش كۆیله‌بوو ئه‌وه بكوژ ناكوژرێته‌وه.

## كۆمه‌ڵێك بكوژ له تۆڵه‌ی یه‌ك كوژراودا ده‌كوژرێنه‌وه

ئه‌گه‌ر كۆمه‌ڵێك یه‌كیان گرت‌و به‌هه‌موانیان یه‌كێكیان كوشت، ئه‌وه هه‌موویان ده‌كوژرێنه‌وه له تۆڵه‌ی كوشتنی ئه‌و كوژراوه‌دا. ئاماژه به‌و ریوایه‌ته‌ی ئیمام مالیك له سه‌عیدی كوڕی (المسيب)ه‌وه ریوایه‌تی كردوه: كه عومه‌ری كوڕی خه‌تتاب پێنج یان حه‌وت كه‌سی كوشتنه‌وه له قیصاصی یه‌ك كه‌سدا: كه هاوكاری یه‌كتریان كردبوو بۆ كوشتنی پیاوێك به فێڵ بردبوویانه شوێنێك كوشتبوویان.[2]

ئه‌مجار فه‌رمووی: (لَوْ تَمَالأَ عَلَيْـهِ أَهْـلُ صَـنْعَاءَ لَقَتَلْـتُهُمْ جَمِيعًـا).[3] ئه‌گه‌ر هه‌موو ئه‌هلی صه‌نعاء گه‌له‌كۆمه‌كێیان بكردایه له‌سه‌ر كوشتنی ئه‌م مرۆڤه هه‌موویانم ده‌كوشتنه‌وه.

## قیصاص‌و تۆڵه ستاندنه‌وه له‌بكوژ به‌یه‌كێك له‌دووشت ده‌چه‌سپێ

یه‌كه‌م: بكوژ دان به‌تاوانه‌كه‌یدا بنێ:

له ئه‌نه‌سه‌وه ڕیوایه‌تكراوه: كه جوله‌كه‌یه‌ك سه‌ری جارییه‌كی له‌نێوان دوو به‌ردا جه‌ڕمبابه دابوو شكاندبووی. پێیان گوت كێ وای لێ كردی؟ فلان؟

---

[1] حسن صحيح: (ص.ت/١١٤١) ، خ(٦٩١٥/٢٦٠/١٢)، ت(١٤٣٣/٤٣٣/٢).

[2] صحيح: (الإرواء/٢٢٠١) ، ط:(١٥٨٤/٦٢٨).

[3] (الإرواء/٢٢٠١)، ط:(١٥٨٤/٦٢٨)، فع(٦/٢٢)، هق(٨/٤١).

یان فلان؟ هەتا سەرە گەیشتە سەر کابرای جولەکەو ناوی هێندرا، کە ناوی هێنرا ئافرەتەکە بەسەر ئاماژەی بۆکرد، کابرای جولەکەیان هێناو ئیعتیرافی کرد، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دا سەری کابرای جولەکەیان بەبەرد شکاندەوە.[1]

دووەم: شایەتدانی دووشاهید لەسەری:

لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: شەوێك لە خەیبەر پیاوێك کوژرا، کە ڕۆژبۆوە خوێنگرەکانی چوونە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ڕوداوەکەیان عەرزکرد، فەرمووی: (أَلَكُمْ شَاهِدَانِ يَشْهَدَانِ عَلَى قَتْلِ صَاحِبِكُمْ؟). دوو شایەتتان هەیە شایەتی بدەن کێ خزمەکەتانی کوشتووە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەوشوێنەی خزمەکەمانی لێ کوژراوە کەسی موسوڵمانی لێ نەبووە تا بیکەین بە شایەتو ئەو دەڤەرو هۆبە هەموویان جولەکەن، جولەکە پێکیشی تاوانی لەوەش گەورەتر دەکەن. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پەنجا کەسیان لێ هەڵبژێرن سوێندیان بدەن، سوێندیان نەخوارد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلایەن خۆیەوە خوێنەکەی دا.

## مەرجی جێبەجێکردنی قیصاص و تۆڵە لەبکوژ

مەرجە بۆ ئەنجامدانی قیصاص و تۆڵە لە بکوژ هەبوونی سێ مەرج:

١- ئەوەی داوای تۆڵەستاندن دەکا دەبێ موکەللەف بێ. ئەگەر داواکاری تۆڵەستاندن منداڵ بوو یان شێت بوو، بکوژ بەنددەکرێ تا داواکار دەبێتە موکەللەف.

---

[1] متفق علیه: (٦٨٧٦/١٩٨/١٢)، م(١٦٧٢/١٢٩٩/٣)، د(٤٥١٢/٢٦٧/١٢).

٢- ئەگەر خوێنگرەکان چەند کەسێك بوون دەبێ هەموویان رایان یەك بێ لەسەر ئەنجامدانی تۆڵە لەسەر بکوژ، ئەگەر هەندێکیان عەفویان کرد، ئەوە کوشتنەوەی لەسەر لادەچێ.

لە زەیدی کوڕی وەهبەوە ڕیوایەتکراوە: کە ئیمامی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) پیاوێکی بکوژیان بردە لای کە پیاوێکی کوشتبوو. خزم و کەسی ویستیان بکوژ بکوژنەوە. خوشکی کوژراوەکە خێزانی بکوژ بوو وتی: من بکوژ لەبەشی خۆم عەفوو دەکەم، ئیتر عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کابرای بکوژ کوشتنەوەی لەسەرلاچوو.[1]

هەر لەوەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پیاوێك لەلای ژنەکەی پیاوێکی بینی، ئیتر مێردەکە ژنەکەی کوشت، روداوەکە بەرزکرایەوە بۆلای ئیمامی عومەر هەندێ لەبراکانی ژنە کوژراوەکە گلەییان لە ژنە کوژراوەکە هەبوو، لەبەشی خۆیان بکوژیان عەفوو کرد، ئیتر ئیمامی عومەر فەرمانی کرد کە باقی خوێنگرەکانی ژنە کوژراوەکە خوێن وەربگرن.[2]

٣- نابێ جێبەجێکردنی تۆڵە لە تاوانبار هەمان زیان بەغەیری تاوانبار بگەیەنێ بۆ نموونە ئەگەر کوشتنەوە لەسەر ئافرەتێکی سکپڕ چەسپا، ئافرەتەکە ناکوژرێتەوە تا منداڵەکەی دەبێ و شیری پێ دەداو لەشیر دەبڕێتەوە.

لە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدەوە لە باوکییەوە ڕیوایەتکراوە: کە ئافرەتێکی غامیدی پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد وتی: من تووشی زینابووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (إرجعي) جارێ بڕۆرەوە، ئافرەتەکە گەڕایەوە، بۆ سبەینێ هاتەوە

---

[1] صحيح: (الإرواء/٢٢٢٢)، عب(١٠/١٣/١٨١٨٨).

[2] صحيح (الإرواء/٢٢٢٥)، هق(٨/٥٩).

خزمـەتی وتـی: قوربـان وادیـارە دەتـەوێ وەکـوو مـاعیزی کـوڕی مالیـك بمگەڕێنیتـەوە، سوێندم بـەخودا مـن لـەناکامی زیناکردنـەوە سکم پڕبـووە، پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) پێـی فـەرموو: (دەی کـە هـەر سوری لەسەر دان پیانانەکەتو ناتەوێ نهێنی خۆت بپۆشی بـڕۆرەوە تـا منداڵەکەت دەبێ). جا کـە ژنەکـە منالەکەی بـوو، لەپارچـە پەڕۆیـەکا منالەکـەی هێنایـە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتی: ئەوە منالەکەمە بوومە، پێی فەرموو: دە ئێستە بـڕۆ شـیری بـدەرێ منالەکـەت بەخێوبکـە تـا لەشـیری دەبڕیەوە، جا کاتێ ژنەکە منداڵەکەی گەورەکردو لەشـیری بڕیـەوە منالەکـەی هێنایـەوە خزمـەت پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەتێك نـانی بەدەستەوەبوو دەیخوارد، عەرزی کرد: ئەوە منالەکەم گـەورەکردووەو لەشـیرم بڕیوەتەوە ئەوەتا خواردن دەخوا. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منداڵەکەی دایە دەست پیاوێك لە موسوڵمانان کـە بـەخێوی بکا سەرپەرشـتی بکـا، فەرمانیـشی کـرد چـاڵێکیان بـۆ ئافرەتەکـە هەڵکەنـد قوڵییەکـەی تـا سەرسنگی بوو، ئەمجار خستیانە ناوی فەرمانی بە خەڵکەکە کرد بەردەبارانی بکەن، خالیدی کوڕی وەلید یەکێك بوو لەوانەی بەردەبارانی دەکـرد بـەردێکی کێشا بەسـەریداو خـوێن فیـچقەی کـرد چـەند دڵۆپـە خوێنـێ چـوو بـە دەمو چاویدا، لەسەرئەوە خالید جوێنێکی پێدا، پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: «مَهْلاً يَا خَالِدُ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ تَابَهَا صَـاحِبُ مَكْسٍ لَغُفِرَ لَهُ». هێواش ئەی خالید! سابەو کەسەی گیـانی منـی بەدەسـتە ئـەم ژنە تەوبەیەکی کردووە ئەگـەر بـاجگرو گومرگ سـتێن تەوبـەی وا خـالیصو دڵـسۆزانە بکـەن خـودا لێیـان خـۆش دەبـێ، ئـەمجار فـەرمانی کـرد تـەرمی ژنەکەیان شۆردو کفنیان کرد، تەشریفی بـۆ خـۆی نوێـژی لەسـەرکرد، ئـەوجا لەگۆڕستانی موسوڵمانان ناشتیان.

## بکوژ چۆن‌و بەچی دەکوژرێتەوە؟

ئەصڵ‌و واقیع ئەوەیە بکوژ بەو ئامێرەی تاوانی کوشتنەکەی پێ ئەنجام داوە بکوژرێتەوەو بەو شێوەش بکوژرێتەوە کە ئەو تاوانەکەی پێ کردوە. چونکە ئەوە مانای عەدالەت‌و یەکسانی دەگەیەنێ، هەروا چونکە قورئان دەفەرموێ: {فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ – البقرة/١٩٤} کەسێك دەستدرێژی کردە سەر ئێوە، ئێوەش بەهەمان شێوە دەستدرێژی بکەنەوە سەر.

یان دەفەرموێ: {وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ – النحل/١٢٦}. ئەگەر تۆڵەتان ستاندەوەو ئازاری تاوانبارتاندا بەوشێوە ئازاری بدەنەوە کە ئێوە ئازاردراون. هەروا ئاماژە بەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەری کابرای جولەکەی واشکاندەوە بەبەرد کە ئەوسەری ئافرەتەکەی شکاندبوو.

## تۆڵەستاندنەوە مافی دادوەرو حاکمە

ئیمامی قورطوبی فەرموویەتی: هیچ راجیاییەك نیە لەوەدا: کە تۆڵەستاندنەوە لە بکوژ مافی خزم‌و کەس‌وکاری کوژراوەکەیە ئەوان دەبێ داوای تۆڵەبکەن‌و واجبە جێبەجێی بکەن، چونکە پەروەردگار فەرمانی بەهەموو موسوڵمانان کردوە بەتۆڵەستاندنەوەو قیصاص، ئاشکراشە ناگونجێ هەموو موسوڵمانان کۆببنەوەو تۆڵە لە بکوژێك وەربگرنەوە، کەوابوو فەرمانڕەواو سوڵتانیان کردوە بەوەکیل‌و بریکاری خۆیان بۆ جێبەجێ کردنی قیصاصی کوشتن‌و باقی تۆڵەو حەددە شەرعییەکان.[1]

---

[1] الجامع لأحكام القرآن: (٢٤٥ فقرمانرقوای ٢/٢٤٦).

عیللـەتو بایپـسی ئـەوەش ئەوەیـە: کـە خـاوەنی تەفـسیری الـصاوی کـە حاشیەیە بەسـەر تەفـسیری (جلالـین)ەوە، رونـی کردۆتـەوە دەڵـێ: (هـەرکاتێ چەسـپا کـە بکـوژ بـە ئەنقەسـتو دەسـتدرێژی موسـوڵمانێکی بـێ تـاوانی کوشتووە، پێویستە لەسەر فەرمانڕەواو حاکمی شەرعی موسـوڵمانان کۆمـەکی بـە خـزمو کـەس‌وکاری کـوژراو بکـەن بۆئـەوەی بتـوانن دەسـەڵاتی خۆیـانی بەسەردا فەرزبکەنو چییان بوێ لەگەڵی بکەن، ئەمجار دەبێ حاکمو دەسەڵات بەویستی خزمو کەس‌وکاری کوژراو بکوژ بکوژێتـەوە، یـان عـەفووی بکـا، یـان خوێن وەربگرێ، دروست نیـە بـۆ وەلیو خوێنگرەکـانی کـوژراو بـەبێ ئیزنـی حاکم دەسەڵاتی خۆیان بەسەر بکوژدا جێبەجێ بکەن، چونکە ئـەوە ئـاژاوەو فیتنەیی لێ دەکەویـەوە، خۆ ئەگەر وەلیو خزمـی کـوژراو بـەبێ ئیزنـی حـاکم بکوژی کوشتەوە بەتاوان دادەنرێو تەعزیر دەکرێ.[1]

## تۆڵەو قیصاص لەشتێك کە نەگاتە کوشتنو گیان دەرچوون

جا وەکوو چۆن تۆڵەو قیصاص لە بکوژ چەسپاوەو فەرمانی پێکـراوە کـە ئـەنجام بـدرێ. هـەروایش تۆڵـەو قیـصاص چەسـپاوە لـەو برینـدارکردنو شکاندنانەی کە سەر ناکێشێ بۆ گیان دەرچوون... قورئان دەفەرموێ: {وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِـالأُذُنِ وَالـسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ – المائدة/٤٥}. نووسیومانە فـەرزمان کـردووە لەسـەر نەتـەوەی ئیـسرائیل لـە تەوراتـدا، لـەجیاتی نـەفس نـەفس دەکوژرێتـەوە، لـە تۆڵەی چاوکوێرکردن چاو کوێردەکرێتـەوە لـەجیاتی لـوت لـوت دەبڕدرێتـەوە، لــەجیاتی گوێــچکە گوێــچکە ئــاوای لێ دەکرێتــەوە، لــەجیاتی ددان ددان دەشکێندرێ، برینیش هەروا تۆڵەی لەسەرە. ئەم حوکمانە هەرچەند شـەرعو

---

[1] فقه السنة: ج٣/٤٥٣.

یاسای نەتەوەی پێش ئیسلامن وەڵێ بوون بە شەرعو یاسای ئێمەیش، چونکە پێغەمبەر چەسپاندونی.

ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەکوو بوخاریو موسلیم لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە بۆمانی ریوایەت دەکەن: کە روبەیعی کچی (النضر) ددانی جارییەکی شکاند، بنەماڵەی روبەیع پێشنیاری ئەوەیان کرد قەرەبووی عەیبدارییەکەی بدەن، خزمو کەسی جارییەکە وتیان: دەبێ قیصاصی لێ بسەندرێ، ئەنەسی کوڕی (النضر) کە برای روبەییع بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەوە وابڕیارە ددانی روبەییع لەتۆڵەی ددانە شکاوەکەی جارییەکەدا بشکێتەوە؟ سوێندم بەو کەسەی تۆی بەحەق کردوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) من وادەزانم ئەوان خودا دڵیان نەرم دەکاو ددانەکەی ناشکێتەوە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «يَا أَنَسُ كِتَابُ اللَّهِ الْقِصَاصُ». ئەی ئەنەس قورئان قیصاصی دەست نیشان کردوەو مافی ئەوەی داوە بە ئەوان: کە داوای شکاندنەوەی ددانی روبەییع بکەن، ئەوەبوو لە دوواییدا رازی بوون قیصاصی لێ نەستێننەوە عەفوویان کرد، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ» هەندێ بەندەی خودا هەن ئەوەندە لای خودا بەرێزن ئەگەر داوا لەخودا بکاو جەختی لەسەربکا خودا داواکەی جێبەجێ دەکا.[1]

---

[1] صحيح: (ص.ج/٢٢٢٨) ، خ(٢٧٠٣/٣٠٦/٥)

**دەبێ بۆ تۆڵەستاندنەوەی جگە لەکوشتن ئەم مەرجانە بێنەدی**

١- دەبێ تاوانکار موکەللەف بێ. (باڵغو عاقڵو ئازاد بێ).

٢- دەبێ بە ئەنقەست تاوانەکە بکا ئەگەر بەهەڵەبوو تۆڵەی لەسەرنیە چونکە کوشتن ئەگەر بەهەڵەبوو قیصاصی لەسەرنیە کەوابوو لەشتێکدا کە لەخوار کوشتنەوەیە دەبێ بەهیچ جۆرێ قیصاصی لەسەر نەبێ.

٣- دەبێ خوێنی تاوانکارو تاوان لێ کراو یەکسان بن، کەوابوو ئەگەر موسوڵمانێك نیمیەکی برینداد کرد قیصاصی لێ ناسەندرێ.

**قیصاص لە ئەندامەکانی جەستەدا**

مەرجە بۆ تۆڵەستاندنەوە ئەنجامدانی قیصاص لە ئەندامەکانی دا سێ شت:

١- دەبێ بەبێ ستەمکردن بگونجێ تۆڵەستاندنەوەکە ئەنجام بدرێ. بەم جۆرە برینەوەکە لە جومژگەوە بێ، وەکوو جومژگەی دەستو ئانیشك. یان بتواندرێ لە ئەندازەیەك رابگیرێ وەکوو نەرمایی لوت تا دەگاتە ئێسقانەکەی. کەوابوو تۆڵەستاندنەوە ناکرێ لە ئەندامێکدا بۆش بێ، هەروا لەبڕینی بڕێ لە قۆڵ یان شکاندنی ئێسقانێك جگە لە ددان.

٢- لێکچوونی ئەندامەکان لەناوو لە شوێندا، کەوابوو لەجیاتی ئەندامی لای چەپ لای راست نابڕدرێ لەجیاتی ئەندامی لای راستیش لای چەپ نابڕدرێ هەروا لەجیاتی قامکە چکۆلە قامکە گەورە نابڕدرێو بە پێچەوانەشەوە، چونکە یەکسانییان لەنێواندا نیە ناویان جودایە، هەروا لەجیاتی ئەندامی زێدە ئەندامی ئەصڵی نابڕدرێ چونکە یەکسانییان لەناودانیە چ لەڕوی سودو قازانجەوە چ لەروی شوێنەوە.

٣- یەکسانی ئەندامی تاوانکارو تاوان لێکراو لەڕوی ساغیو ناساغییەوە، کەوابوو دەستی ساغ نابڕدرێ لەجیاتی دەستی شلەپەتە، دەستی تەواوو بێ

عـەیب نـابڕدرێ لـەجیاتی دەسـتێك پەنجـەكانی تـەواو نـەبن، بـەڵام بـە پێچەوانەوە دروستە.

## تۆڵەستاندنەوە لەجیاتی بریندارکردنی بە ئەنقەست

بریندارکردنی بە ئەنقەست قیصاصی تێدا دروست نیە مەگەر بتواندرێ وەکوو برینی بریندارکراو، تاوانبار بریندار بکرێتەوە بەبێ زیادوکەم. ئەگەر چونیەکیو موماثـەلـە نەدەهاتـەدی مەگـەر بـە تـەجاوزکردن لـە ئەنـدازەی دیاریکراو، یان بـە پـەنابردن بـە موخـاطـەرەو زیـان گەیانـدنی پـتر بـە بابـای تاوانبار، ئەوە ئەوکاتە قیصاص واجب نیە، بەڵکوو دەبێ خوێن بدا.

## خوێن

خـوێن: بریتییـە لـەو مـاڵو سـامانەی پێویـستە بـدرێ بـە کـابرای دەستدرێژی بۆسەر کراو یان بە سەرپەرشتیارو (وەلی)یەکەی.

خوێن دەدرێ بۆ ئەو تاوانەی قیصاصی تێدایە ئەوەی قیصاصی تێدانیە. بۆ هەردوو جۆریـان دەبـێ. لـەزمانی عەرەبیـدا وەکوو پێـی دەگـوترێ: (دیـة) پێـشی دەگـوترێ (عـەقڵ) کـە بـەمانا بەسـتنەوەی ئـاژەڵ دێ. بنـەمای ئـەم تەسمییـە ئەوەیـە بکوژ کـە مرۆڤێکـی لەدەسـت دەکـوژرێ، ئـەو حوشـترانەی دەیانـدا بـۆ خوێنەکـە بـە ڕێـشمەو گـوریس لەبـەردەم مـاڵی خزمـی کـوژراودا دەیانبەستێتەوەو ئامادەیان دەکا بـۆ تەسـلیمکردن بـەخوێنگرەکانی کوژراو... دەگوترێ (عقلت عن فلان) خوێنی فلان بکوژم خستە ئەستۆی خۆم بنـەماو بەڵگەی خـوێن دانو خـوێن وەرگـرتن ئـەم ئایەتـەی قورئانـە کـە دەفـەرموێ: {وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلاَّ خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ

رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنْ اللّٰهِ وَكَانَ اللّٰهُ عَلِيماً حَكِيماً – النساء/٩٢}.

دروست نیەو نابێ هیچ موسوڵمانێك بە ئەنقەست موسوڵمان بكوژێ. مەگەر بەهەڵە موسوڵمانێكی لەدەست بكوژرێ، جا ئەگەر كەسێك بەهەڵە موسوڵمانێكی كوشت، دەبێ لەكەفارەتی ئەو تاوانەدا كۆیلەیەك ئازاد بكاو خوێنیشی بدا بەكەسوكاری كوژراوەكە. مەگەر ئەوان لەخوێنەكە خۆش ببنو لێی وەرنەگرن، جا ئەگەر كوژراوەكە بۆخۆی موسوڵمان بوو بەڵام خزمو كەسوكاری دوژمنی ئێوە بوونو كافر بوون ئەوە بكوژەكە تەنها كۆیلەیەكی موسوڵمان ئازاد دەكا، ئەگەر كوژراو لەگەڵو هۆزێك بوو لەنێوان ئێوەو ئەواندا پەیمانو میثاق هەبوو ئەوە بكوژ دەبێ كۆیلەیەكی موسوڵمانیش ئازاد بكاو خوێنیش بدا بەكەسوكاری كوژراوەكە، كەسێك كۆیلەی دەست نەكەوت دەبێ دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژو بێ، پەروەردگار ئەم یاسایەی داناوە بۆ ئەوەی تاوانكار لەتاوان پاك بێتەوەو دەروونی ئارام بگرێ، پەروەردگار زاناو دانایە لەهەموو شتێكداو هەموو ئەحكامو یاسایەكی لەعیلمو حیكمەتەوە سەرچاوەی گرتووە.

لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە لەباوكیەوە لەباپیریەوە ڕیوایەتی كردووە كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری فەرموو: هەركەسێك بەهەڵە كوژرا خوێنەكەی سەد حوشترە، سییان ساڵێكی تەواو كردبێو چوبێتە ساڵی دووەمەوە، سییان (بنت لبون) بن دوو ساڵەیان تەواو كردبێو چوونە ساڵی سێیەمەوە، سییان سێ ساڵیان تەواو كردبێو چوبنە ساڵی چوارەمەوە، دە حوشتریشیان (ابن لبون) بن واتە حوشترە نێرە بن دوو ساڵەیان تەواو كردبێو چوبنە ساڵی سێیەمەوە.[1]

---

[1] حسن (ص. جه/٢١٢٨)، د (١٢/٢٨٣/٤٥١٨)، جه (٢/٨٧٨/٢٦٣٠)، ن (٨/٤٣).

هەر لەعەمری کوڕی شوعەیبەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: بەهای خوێن لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەشت سەد دیناری زێڕ بوو یان هەشت هەزار دیرهەمی زیو بوو، ئەم یاسایە بەوجۆرە بەردەوام بوو موسوڵمانان پابەندی بوون هەتا ئەو ڕۆژگارەی عومەری کوڕی خەتتاب بەجێنشین. ڕۆژێك وتارێکی بۆ موسوڵمانان داو فەرمووی: ئەی خەڵکینە بەهای حوشتر بەرزبۆتەوە، ئیتر ئەوەبوو حەزرەتی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆئەوانەی خاوەنی زێڕن و بیانەوێ زێڕبدەن لەبەهای خوێندا هەزار دیناری زێڕی دانا ئەوانەی بەزیو بیانادایە دوازدە هەزار دیرهەمی زیوی دانا ئەوانەی بیانەوێ ڕەشە وڵاخ بدەن دووسەد ڕەشەوڵاخ ئەوانەی مەڕیان هەیە دووهەزار مەڕ، ئەوانەی کوتاڵیان بدایە دووسەد پۆشاکی بوردی یەمەنی.

عەمری کوڕی شوعەیب کە ڕاوی حەدیثەکەیە دەڵێ: عومەر دەربارەی ئەهلی ذیمە بێدەنگ بوو بەهای خوێنی ئەوانی بەرزنەکردەوە.

## ئەوکوشتنەی خوێندانی تێدا واجبە

زانایانی ئیسلام کۆڕایان هەیە لەسەرئەوە: کە خوێن واجبە لەکوشتنی بەهەڵەو شێوە هەڵەدا، هەروا لەکوشتنێك دا بە ئەنقەست بێ بەڵام لەکەسێکەوە ڕوی دابێ مەرجێك لە مەرجەکانی تەکلیفی تێدانەبێ وەکوو ئەوە بکوژەکە منداڵ بێ یان شێت بێ. هەروا لەکوشتنی بە ئەنقەستدا: کە نرخ و ڕێزی بکوژ لەنرخی کوژراو زیاتربێ. وەکوو بکوژ ئازادبێ و کوژراو کۆیلە بێ. هەروا خوێن واجبە لەسەر بکوژێك کە لەخەودا وەرگەڕێ بەسەر یەکێکی ترداو بیکوژێ. یان کەسێك بەربێتەوە بەسەر یەکێکی ترداو بیکوژێ.

## جۆرەکانی خوێن

خوێن هەیە قورس‌و (مغلظ)ە هەیە سوك‌و كەم ئەركە. خوێنی سوك‌و هاسان واجب دەبێ لە كوشتنی بەهەڵەدا، خوێنی قورس‌و (مغلظ) لەكوشتنی شێوە ئەنقەستدا واجبە. خوێنی كوشتنی بە ئەنقەست ئەگەر خوێنگرەكان لە كوشتنەوەی بكوژ هاتنەخوار، ئەوە ئەندازەكەی بەوجۆرە دەبێ كە لەسەری ڕێك دەكەون، ئاماژە بە حەدیثەكەی عەمری كوڕی شوعەیب كە لەباوكیەوە، لە باپیریەوە بە مەرفوعی ڕیوایەتی كردوە: كە فەرمووی: «مَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا دُفِعَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْمَقْتُولِ فَإِنْ شَاءُوا قَتَلُوا وَإِنْ شَاءُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ وَهِيَ ثَلاثُونَ حِقَّةً وَثَلاثُونَ جَذَعَةً وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً وَمَا صَالَحُوا عَلَيْهِ فَهُوَ لَهُمْ». وَذَلِكَ لِتَشْدِيدِ الْعَقْلِ.[1] كەسێك بەئەنقەست موسوڵمانێك بكوژێ دەدرێتە دەست خزم‌و كەسی كوژراو، ئەگەر ویستیان دەیكوژنەوە، حەزیان لێ بوو، خوێنی لێ وەردەگرن، خوێنەكەش بریتییە لە سەد حوشتر سییان سێ ساڵیان تەواوكردبێ‌و چوبنە ساڵی چوارەمەوە، سییان (جذعة)بن، چلیان (خلفه) بن واتە بێچوویان بەدواوەبێ، چۆنیان سوڵح كردو ڕێككەوتن ئەوە مافی خۆیانە، ئەمەش بەمەبەستی قورس كردنی خوێنەكە.

خوێنی قورس (مغلظ) سەد حوشترە چلیان دەبێ ئاوس بن ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كە دەفەرموێ: «أَلاَ إِنَّ دِيَةَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلاَدُهَا».[2] بزانن خوێنی كوشتنی بەهەڵەو شێوە ئەنقەست كە بەقەمچی‌و گۆچان لێی بداو گیانی دەرچێ خوێنەكە سەد حوشترە چلیان دەبێ ئاوس بن.

---

[1] (الإرواء/٢٢٤٧)، د(٤٥١٩/٢٨٤/١٢).

[2] صحيح: (ص.جة/٢١٢٦)، د(٤٥٢٤/٢٩١/١٢)، جة(٢٦٢٧/٨٧٧/٢).

## خوێنی کوشتنی بە ئەنقەست لەماڵی بکوژ دەدرێ

خوێنی بەهەڵەو شێوە ئەنقەست لەسەر کەس‌وکاری بکوژە، واتە: خزمە نێرینەکانی کە باڵغ بووبن لە باوکییەوە خزمی بن‌و دەوڵەمەندو عاقل بن. کوێرو پیرو کەمئەندام ئەگەر دەوڵەمەندبن بەردەکەون. بەڵام ناکەوێتە سەر خزمی مێینەو هەژارو منداڵ‌و شێت‌و ئەوەیش کە ئایینی لە ئایینی بکوژ جوداواز بێ. چونکە مەبەستەکە یارمەتیدان‌و کۆمەکییە ئەوانەش ئەهلی ئەوە نین.

بنەماو بەڵگەی ئەوە کە ئەو جۆرە خوێنە دەکەوێتە سەر کەس‌و کاری نێرینەو دەوڵەمەندی بکوژ حەدیثەکەی ئەبو هورەیرەیە کە دەگێڕێتەوە دەڵێ: دوو ئافرەتی هۆزی هوزەیل شەڕیان بوو، یەکێکیان بەردێکی بەوی تریاندا دا ئافرەتەکەو بێچووی ناو منداڵدانیشی کوشت، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بڕیاریدا خوێنی زارۆکەکە کۆیلەیە بێ یان (وەلیدە)یەك بێ، بڕیاریشیدا خوێنی ئافرەتەکە لەسەر خزمی ئافرەتە بکوژەکەبێ.[1]

## خوێنی ئەندامەکانی جەستە

لەجەستەدا بڕێ ئەندام هەن تاکن وەکوو لووت‌و زوبان‌و وانێکی نێرینە، هەندێ ئەندامیش جوتن وەکوو چاوو گوێچکەو دەست، هەیشە زیاترە وەکوو پەنجەو ددان جا ئەگەر مرۆڤێك ئەندامێکی لەو ئەندامە تاکانە فەوتاند یان دوو لەوانەی کە جوتن ئەوە خوێنی تەواو دەکەوێتە سەر تاوانکار. ئەگەر ئەندامێکی لەجوتەکان فەوتاند ئەوە نیوەی خوێنی دەکەوێتە سەر.

کەوابوو خوێنی تەواو واجب دەبێ لەبارتەقای فەوتاندنی لوت‌و دووچاو، لە فەوتانی یەك چاودا نیوەی خوێن واجب دەبێ. لە فەوتاندنی پێلۆی

---

[1] متفق علیه: خ(٦٧٤٠/٢٤/١٢)، م(١٦٨١/١٣٠٩/٣)، ن(٤٧، ٤٨/٨).

چاوێکدا چواریەکی خوێن واجب دەبێ، لەبری فەوتاندنی پەنجەی دەستو قاچ خوێنی تەواو واجب دەبێ، لەجیاتی فەوتاندنی هەر پەنجەیەکدا دە حوشتر واجب دەبێ، لە فەوتاندنی هەموو دانەکاندا خوێنی تەواو واجب دەبێ، لەبری هەر ددانێك پێنج حوشتر واجب دەبن.

لە ئەبوبەکری کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەرەوە لە عومەر خۆیەوە کە لە پێغەمبەری گێڕاوەتەوە فەرموویەتی: «فِي الأَلْفِ الدِّيَةُ إِذَا اسْتُوعِيَ جَدْعُهُ مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ وَفِي الْيَدِ خَمْسُونَ وَفِي الرِّجْلِ خَمْسُونَ وَفِي الْعَيْنِ خَمْسُونَ وَفِي الآمَّةِ ثُلُثُ النَّفْسِ وَفِي الْجَائِفَةِ ثُلُثُ النَّفْسِ وَفِي الْمُنَقِّلَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ وَفِي الْمُوضِحَةِ خَمْسٌ وَفِي السِّنِّ خَمْسٌ وَفِي كُلِّ إِصْبَعٍ مِمَّا هُنَالِكَ عَشْرٌ».[1] لووت کە هەمووی بڕاو فەوتا سەد حوشتر خوێنەکەیەتی، خوێنی یەك دەست پەنجا حوشترە، خوێنی قاچ پەنجا حوشترە خوێنی یەك چاو پەنجا حوشترە. لەبری برینێك بگاتە سەر دەماخو پێستە تەنکەکەی سەر دەماخ کون نەکا سێیەکی خوێن هەیە، برینێك بگاتە بۆشایی ناو جەستە سێیەکی خوێن هەیە، برینێك پێویستی بەگواستنەوەی ئێسقان بێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر پانزە حوشتر خوێنەکەیەتی، برینێك گۆشت بېڕدرێو بگاتە سەر ئێسقان پێنج حوشتر خوێنیەتی. خوێنی ددان پێنج حوشترە برینی هەر پەنجەیەك لەجێگای خۆی دە حوشتر خوێنیەتی.[2]

لە ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم لە باوکییەوە لە باپیریەوە ریوایەتی کردوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) کە تەشریفی نامەیەکی بۆ ئەهلی یەمەن نارد فەرزو سوننەتەکانو ئەندازەی بەهای خوێنەکانی تێدابوو تێیدا فەرموبووی: «وَإِنَّ

---

[1] صحيح بشواهده (ص.ن/٤٥١٣)، بز(٢/٢٠٧/١٥٣١)، هق(٨/٨٦).

[2] صحيح بشواهده (ص.ن/٤٥١٣)، بز(٢/٢٠٧/١٥٣١)، هق(٨/٨٦).

فِي النَّفسِ الدِّيَةَ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ ، وَفِي الأَنْفِ إِذَا أُوعِبَ جَدْعُهُ الدِّيَةُ ، وَفِي اللِّسَانِ الدِّيَةُ ، وَفِي الشَّفَتَيْنِ الدِّيَةُ ، وَفِي الْبَيْضَتَيْنِ الدِّيَةُ ، وَفِي الذَّكَرِ الدِّيَةُ ، وَفِي الصُّلْبِ الدِّيَةُ ، وَفِي الْعَيْنَيْنِ الدِّيَةُ ، وَفِي الرِّجْلِ الْوَاحِدَةِ نِصْفُ الدِّيَةِ ، وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ ، وَفِي الْجَائِفَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ ، وَفِي الْمُنَقِّلَةِ خَمْسَ عَشَرَةَ مِنَ الإِبِلِ ، وَفِي كُلِّ أُصْبُعٍ مِنَ الأَصَابِعِ مِنَ الْيَدِ وَالرِّجْلِ عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ ، وَفِي السِّنِّ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ ، وَفِي الْمُوضِحَةِ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ».[(١)]

خوێنی نەفسێك سەد حوشترە، لوت كە بەتەواوی ببڕدرێ خوێنی تەواوی لەسەرە، زوبان خوێنی تەواوی دەوێ، بڕینی دوو لێو خوێنی تەواوی لەسەرە، دوو هێلكە گون خوێنی تەواویان دەوێ، بڕینی وانێكی نێرینە خوێنی تەواوی لەسەرە، شكاندنی پشت خوێنی تەواوی دەوێ، كوێركردنی هەردوو چاو خوێنی تەواویان دەكەوێ، بڕینی قاچێك نیوەی خوێنی تێدا واجب دەبێ، برینێك بگاتە سەر پێستە تەنكەكەی دەماغ سێیەكی خوێنی تێدایە، هەر برینێك بگاتە كلۆرایی جەستە سێیەكی خوێنی تێدایە، هەر برینێك پێویست بكا ئێسقی تێدا ئالۆگۆڕ بكرێ پانزە حوشتر خوێنیەتی، لەجیاتی هەر پەنجەیەك لە پەنجەی دەستو قاچ دەحوشترە، بۆ هەر ددانێك پێنج حوشترە بۆ هەر برینێك بگاتە سەر ئێسقان پێنج حوشترە.

### خوێنی لەدەستدانی چالاكیەكانی ئەندامانی جەستە

ئەگەر مرۆڤێك زەبرێكی لە مرۆڤێك داو بەهۆیەوە عەقڵی لەدەستدا یان هەستێك لە هەستەكانی فەوتا، وەكوو: بیستن، دیتن، بۆنكردن، چەشتن، قسەكردنی نەماو زمانی گیرا ئەمانە هەموو خوێنی تەواویان لەسەرە.

(١) صحيح بشواهده (الإرواء/٢٢٧٥)، (ص.ن/٤٥١٣) ط(٦١١/١٥٤٥)، ن(٥٧-٥٨-٥٩).

لـه عەوفـەوە ریوایـەتکراوە، دەڵـێ: پـێش ئـەوەی فیتنـەی (ابـن الأشـعث) بەرپا ببێ گوێم لێ بوو وەکوو ئـەو دەیگێڕمـەوە وتیـان: ئـەوە ئـەبو (المهلب)ە مامی ئەبو قولابەیە، وتی پیاوێك بەردێکی ئاڕاستەکراو بەرسەری کەوت پێـی کەڕبوو زمانی گیرا، شێت بـوو، لەپیاوەتیش کـەوت، حـەزرەتی عومـەر چوار خوێنی بۆ بڕیاردا.[1]

ئەگـەر کابرایـەکی یەکـچاو چـاوە سـاغەکەی دەرهێنـدرا خـوێنی تـەواوی دەکـەوێ، حـەزرەتی عومـەر بەوشـێوە بڕیـاری داو عەبـدوڵڵای کـوڕی‌و عـەلی کوڕی ئەبو طالبیش هەرهەمان بڕیاریان داوە.

لـه قـەتادەوە ریوایـەتکراوە، دەڵـێ: گـوێم لێ بـوو ئـەبو میجلـەز دەیگـوت: پرسیارم لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر کـرد دەربـارەی کوێری یـەك چـاو کـە چاوەکەی دەربهێندرێ ئـاخۆ حوکمەکـەی چۆنە؟ عەبـدوڵڵای کـوڕی صـەفوان هەڵیدایـە وتــی: ئیمـامی عومــەر (خــوای لێ رازی بــێ) خــوێنی تــەواوی بــۆ بڕیـارداوە، دەڵـێ منـیش وتم: بـرا مـن پرسـیار لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر دەکـەم، وتــی: ئــەی ئەوەنیــە ئــەویش لــە حــەزرەتی عومــەرەوە ریوایــەتت بۆدەکا.[2]

لە قەتادەوە لە (خلاص)ەوە لە ئیمـامی عەلییـەوە کـە دەیفـەرموو کوێر ئەگـەر چـاوی دەرهێنـدرا، سەرپـشك دەکـرێ لـەنێوان ئـەوەدا خـوێنی تـەواو وەربگرێ، یـان نیـوە خـوێن وەربگـرێ لـەجیاتی چاوێکی‌و لـەبری ئـەویتریانی چاوی کابرای جانی دەربهێنێ.[3]

---

[1] حسن: (الإرواء/٢٢٧٩)، ش(٦٩٤٣/١٦٣/٩)، هق(٨٦/٨).

[2] صحيح الإسناد: (الإواء/٢٢٧٠)، هق(٩٤/٨)، ش(٧٠٦٠/١٩٦/٩).

[3] ش(٧٠٦٢/١٩٧/٩)، هق(٩٤/٨).

## خوێنی برینی سەرشکانو روخسار بریندار بوون

ئەمیش دە جۆرن:

١- الخارصة: برینێك پێست بقەڵێشێو خوێنی لێ نەیە.

٢- الدامية: برینێك پێست بقەڵێشێو خوێنیشی لێ بێ.

٣- الباضعة: برینێك قەوارەی گەورە لەگۆشت بکا.

٤- المتلاحمة: برینێك قوڵ بێ لەگۆشتدا.

٥- السّمحاق: برینێك بگاتە سەر ئێسقانو پێستە تەنکەی سەر ئێسقان نەبڕێ. ئەمانە پێنج جۆرن قیصاصیان تێدا جێبەجێ ناکرێ، خوێنی دیاریکراویشیان تێدانیە بەڵکوو وا فەرز دەکرێ ئەو برینداركراوە ئەگەر كۆیلە بێو پێش بریندار بوونەکەی نرخی چەندبێو دوای بریندار بوونەکەی چەند نرخی پێ پشکێ ئەو مەبلەغە مەزندە دەکرێو وەردەگیرێ.

٦- الموضحة: برینێك گۆشت ببڕێو بگاتە سەر ئێسقانو پێستە تەنکەی نێوان گۆشتو ئێسقانیش لابەرێ، ئەوە خوێنەکەی پێنج حوشترە.

٧- الهاشمة: برینێك ئێسقانیشی تێدا شکابێ ئەوە خوێنەکەی دە حوشترە.

٨- المنقلة: برینێك کەوەندە زەختی هەبێ ئێسقان لەشوێنێکەوە بگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەوە خوێنەکەی پانزە حوشترە.

٩- المأمومة: یان (الآمّة) برینێکە لەسەر بکرێو بگاتە سەر دەماغو تەنها پێستە تەنکەی سەر دەماغ کون نەبووبێ ئەمە ئەندازەی خوێنەکەی سێیەکی خوێنە.

١٠- الدامغة: برینێکە بگاتە سەر دەماغ ئەمەش سێیەکی خوێنی هەیە.

## خوێنی (الجائضة)

(ألجائضة) برینێکه بگاته بۆشایی وەکوو ئەوە برینەکە بگاتە بۆشایی گەدە یان پشت یان سینگ یان قورگ یان میزەڵدان ئەم جۆرە برینە خوێنەکەی سێیەکە خوێنە، ئاماژە بەنامەی عەمری کوڕی حەزم کە تێیدا هاتووە (وفي الجائضة ثلث الدية) برینێك بگاتە بۆشایی جەستە سێیەکە خوێنە.

## خوێنی ئافرەت

ئەگەر ئافرەتێك بەهەڵە کوژرا نیوەی خوێنی پیاوە، هەروا خوێنی ئەندامەکانی ئافرەتو برینەکانی نیوەی خوێنی هی پیاوە.

لە شورەیحەوە ریوایەتکراوە، گوتی: عوروەی (البارقي) لەلایەن ئیمامی عومەرەوە هاتە لام وتی: خەلیفە عومەر بڕیاری داوە برینی پیاوو ئافرەت لەجۆری دان شکانو برینی (ألموضحة)دا چوون یەکن لەوە بەولاوە خوێنی ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە.[1]

## خوێنی جولەکەو فەلە (خاوەن نامەکان)

خوێنی خاوەن نامەکان ئەگەر بەهەڵە کوژران نیوەی خوێنی موسوڵمانە خوێنی نێرینەیان نیوەی خوێنی پیاوی موسوڵمانە. خوێنی ئافرەتیان نیوەی خوێنی ئافرەتی موسوڵمانە.

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیریەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (قَضَى أَنَّ عَقْلَ أَهْلِ

---

[1] اسناده صحيح: (الإرواء/٣٠٧)، ش(٧٥٤٦/٣٠٠/٩).

الْكِتَابَيْنِ نِصْفُ عَقْلِ الْمُسْلِمِينَ وَهُمُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى).[١] بڕیاری داوه کەخوێنی خاوەن نامەکان (جولەکەو نەصاری) نیوەی خوێنی موسوڵمانانە.

## خوێنی زارۆك لە منداڵدانی دایكدا

ئەگەر کۆرپەلە لەسکی دایکیدا بەهۆی زەبر لێدان لەدایکی، مرد دایکەکە نەمرد، جا زەبرەکە بە ئەنقەست بێ یان بەهەڵە بێ، کۆرپەلەکە بەمردوویی لەدایکی بوبێتەوە یان لەسکی دایکیدا مردبێ نێرینەبێ یان مێینە بێ، ئەوە خوێنەکەی عەبدێکە یان ئەمەتەیەکە سپی پێست بن واتە: خوێنەکەی (غرّة)یە. ئەگەر دایکەکەش مرد ئەوە ئەویش خوێنی خۆی هەیە.

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: دووژن لەخێڵی هوزەیل شەڕیان بوو، یەکێکیان بەردێکی ماڵی بە ئەوی تریاندا ئافرەتەکەو کۆرپەلەی ناوسکی هەردوکیان بە زەبرەکە مردن، کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بڕیاریدا خوێنی کۆرپەلەکە عەبدێك یان ئەمەتەیەك بێ، بڕیاریشی دا کە خوێنی ئافرەتەکەو سکەکەی بخرێتە سەر شانی خزمو کەس‌وکاری ئافرەتە بکوژەکە. میراتی ژنە کوژراوەکەشی دا بەمناڵەکانیو بەخزمەکانی تری.[٢]

وەڵێ ئەگەر کۆرپەلەکە بەزیندویی لەدایکی بووەو دوایی مرد ئەوە خوێنی تەواوی دەکەوێ. ئەگەر نێرینەبوو خوێنبەهاکەی سەد حوشترە، ئەگەر مێینەبوو خوێنبەهاکەی پەنجا حوشترە؛ چونکە مەعلومو ئاشکرایەو دڵنیاین کە کۆرپەلەکە بەهۆی زەبرەکە مردووە، کەوابێ دەشوبهێتە غەیری جەنینو حوکمی ئەوی نادرێتێ.

---

[١] حسن: (الإرواء/٢٢٥١)، جة(٢٦٤٤/٢/٨٨٣)، ت(١٤٣٤/٢/٤٣٣).

[٢] متفق علیه: مختصر صحیح مسلم ج٢/٥٤٢.

## باسی قەزاوەتو دادوەریی

دادوەری بەگوێرەی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەرو کۆڕای زانایانی ئیسلام مەشروعو پێویستە، قورئان دەفەرموێ: {وَأَنْ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ – المائدة/٤٩} بەپێی قورئان دادوەری لەنێوان موسوڵماناندا بکە. یان دەفەرموێ: {يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ – ص/٢٦} ئەی داوود ئێمە تۆمان کردووە بە جێنشینو فەرمانڕەوا لەسەر زەوی، کەوابێ بەحەقو عەداڵەت دادوەریی لەنێوان خەڵکدا بکە.

لە عەمری کوڕی عاصەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ».[1] ئەگەر دادوەر (قازی) بڕیاری دا، بڕیارەکەشی لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوەو هەوڵو تەقەللا بوو، راستیو حەقیقەتی پێکا، ئەوە دوو پاداشی بۆ دەنووسرێ، خۆئەگەر بڕیاری داو بڕیارەکەی لە ئاکامی ئیجتیهادو لێکۆڵینەوە بوو، بەڵام راستی نەپێکاو بەهەڵەچوو ئەوە پاداشێکی بۆ دەنووسرێ.

موسوڵمانان کۆڕایان هەیە لەسەرئەوەی دادوەریی مەشروعەو کارێکی پێویستەو فەرزی کیفایەیەو واجبە لەسەر ئیمامو فەرمانڕەوای وڵات بۆ هەموو دەڤەرو ویلایەتی وڵاتی ئیسلام بەگوێرەی پێویست قازیو دادوەر دابمەزرێنێ بۆئەوەی بەپێی شەریعەتی خودا دادوەریی موسوڵمانان بکەن، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆخۆی کێشەو ناکۆکی لەنێوان موسوڵماناندا یەکالا کردۆتەوەو دادپەروەریی چەسپاندوە. ئیمامی عەلیشی نارد بۆ وڵاتی یەمەن بۆئەوەی ببێتە دادوەر لەنێوانیاندا، خەلیفە

---

[1] متفق علیە: خ(٧٣٥٢/٣١٨/١٣)، م(١٧١٦/١٣٤٢/٣)، د(٣٥٥٧/٤٨٨/٩)، جە(٢٣١٤/٧٧٦/٢) منار السبیل (ج٣/٤٥٣).

راشـيدينەكانيش بـۆ خۆيـان ئـەركى دادوەرى نێـوان موسـوڵمانانيان بـەجێ هێناوە، كەسانى ديكەشيان كردۆتە دادوەرو قازى شارە ئيسلامييەكان.[١]

دادوەريى‌و قازييەتى هێنـدە كـارێكى پـيرۆزە تەنانـەت حەسوديـشى تێـدا رەوايە. لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوە ريوايەتكراوە، دەفەرموێ: پێغەمبـەر (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: «لاَ حَسَدَ إلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَسُلِّطَ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّـهُ الْحِكْمَـةَ ، فَهُـوَ يَقْـضِي بِهَـا وَيُعَلِّمُهَا».[٢] حەسوودى بردن رەوانيە مەگەر لەدوو شتدا: پياوێك خودا مـاڵ‌و سامانى بداتێ‌و بتوانێ لەڕێگەى حەق‌و شياودا خەرجى بكا، پيـاوێكيش خـودا زانيارى‌و حيكمەتى پێ ببەخشێ ئەويش كار بەو زانيارى‌و حيكمەتـەى خـۆى بكاو كێشەو نێزاعى نێوان موسوڵمانان يەكالا بكاتەوە.

لەڕاستيدا كـارى دادوەريـى كـارێكى زۆر هەسـتيارو خەتـەرە، دادوەر زۆر ئاگادار نەبێ تووشى هەڵخليسكان دەبێ. لە ئەبو هورەيرەوە ريوايەتكراوە: كە پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرموويەتى: «مَنْ جُعِلَ قَاضِيًا بَيْنَ النَّاسِ فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ».[٣] هەركەسێك ئەركى داددوەريـى خرايـە ئەستۆى ئـەوە بەبێ چـەقوو سـەربڕاوە، دەبـێ زۆر خـۆ بپـارێزێ لەسـتەم‌و لادان لـە رێـڕەوى عەدالەت، كارەكەى هەستيارە ئاگاى لەخۆى نەبێ تێداچووە.

لە ئەبو بورەيدەوە ريوايـەتكراوە: كـە پێغەمبـەر (درودى خـوداى لەسـەر بێ) فەرموويەتى: «الْقُضَاةُ ثَلاَثَةٌ اثْنَانِ فِي النَّارِ وَوَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ رَجُلٌ عَلِمَ الْحَقَّ فَقَضَى بِهِ فَهُوَ فِي الْجَنَّةِ وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ فَهُوَ فِي النَّارِ وَرَجُلٌ جَارَ فِي

---

[١] منار السبيل ج٢/٤٥٣.

[٢] متفق عليه: خ(١٣/٢٩٨/٧٣١٦)، م(١/٥٥٩/٨١٦)، جة(٢/١٤٠٧/٤٢٠٨).

[٣] صحيح: (ص.ج/٦١٩)، د(٩/٤٨٦/٣٥٥٥)، ت(٢/٣٩٣/١٣٤٠)، جة(٢/٧٧٤/٢٣٠٨).

الْحُكْمِ فَهُوَ فِي النَّارِ».[1] دادوەرو قازی سیٚ جۆرن، دوو جۆریان دەچنە دۆزەخ‌و جۆریٚکیان دەچنە بەهەشت: ئەو قازییەی حەق بناسیٚ‌و بەپیٚی حەق‌و عەدالّەت حوکم بکا ئەوە بەهەشتییە. قازییەك بەنەزانی حوکم بکا ئەوە دەچیٚتە ناو ئاگرەوە قازییەکیش لە حوکم‌و بڕیاریدا ستەم بکاو عەدالّەت رەچاو نەکا دۆزەخییە.

## نابیٚ کەس بۆ خۆی داوای ئەوە بکا بیکەنە دادوەرو فەرمانڕەوا

لە عەبدورڕەحمانی کوڕی سەمورەوە ریوایەتکراوە، دەفەرمویٚ: پیٚغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) پیٚی فەرمووم: «يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ ، فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا ، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا».[2] ئەی عەبدورڕەحمان بۆ خۆت داوامەکە بتکەنە فەرمانڕەواو قازی، چونکە ئەگەر تۆ ئەو پلەیەت پیٚ درا لەسەر خواست‌و داواکاریی خۆت کەس یارمەتیت ناداو بۆ خۆت بە تاك‌و تەنیایی دەکەویە سارا، ئەگەر بەبیٚ داواکاری خۆت ئەو ئەرکەیان خستە ئەستۆت یارمەتیت دەدریٚ.

## کەی پیٚویست دەبیٚ پیاو ئەرکی دادوەری بخاتە ئەستۆی خۆی؟

ئیبنو حەجەر لە فەتحولباریدا (ج١٣/١٤٦)دا دەفەرمویٚ: ئەبو عەلی (ألكرابيسی) کە هاوەلّی شافیعییە لە کتیٚبی (آداب القضاء)دا دەلّیٚ: نەمزانیوە لەنیٚوان زانایانی پیٚشین (سلف)دا راجیایی هەبیٚ لەوەدا کەشیاوترین کەس بۆئەوەی بکریٚتە دادوەریی موسولّمانان کەسیٚکە خاوەنی فەضل‌و زانست‌و راستگۆیی‌و وەرع‌و خۆپاریٚزی بیٚ، قورئان بخویٚنیٚ‌و تیٚیدا شارەزا بیٚ، زۆربەی

---

[1] صحيح: (ص.ج/٤٤٤٦)، د(٣٥٥٦/٤٨٧/٩)، جة(٢٣١٥/٧٧٦/٢).

[2] صحيح: (ص.ج/٤٤٤٦)، د(٣٥٥٦/٤٨٧/٩)، جة(٢٣١٥/٧٧٦/٢).

ئەحکامەکانی بزانێ، زانابێ بە فەرموودەکانی پێغەمبەرو زوربەیانی لەبەربن، هەروا ئاگاداری باشی هەبێ بەسەر قسەو راوبۆچوونی هاوەڵان، زانابێبەوشتانەی تێیدا هاوڕان‌و ئەو شتانەی راجیاییان تێیاندا هەیە. ئاگاداری راو بیرو بۆچوونی شەرعزانانی چینی دوا هاوەڵان بێ واتە (فوقەهای تابیعین). بزانی کام راوبۆچوون صەحیحەو کامیان نادروستە، هەوڵ بدا ئەحکامی روداوەکان لە قورئان دەربێنێ، ئەگەر لەوێدا حوکمەکە نەبوو لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا بدۆزێتەوە، ئەگەر لەوەشدا هیچی دەست نەکەوت پەنابەرێ بۆ کۆڕای هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جا ئەگەر هاوەڵانیش لەو مەسەلەیەدا راجیاییان هەبوو ئەوە رای کامەیان لەقورئان یان لە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نزیکە بەوە رەفتاربکا، ئەمجار بەفتوای گەورە هاوەڵان کاربکا، لەهەموو حوکم‌و برپاێکیدا پێویستە ئەم فلتەرانە رەچاوبکا. پێویستە زۆر موزاکەرەو راگۆڕینەوە لەگەڵ ئەهلی زانست‌و زانیاری بکا، راوێژیان پێ بکا، وێڕای فەضل‌و وەرعی زۆرو پابەندبوون بە رووەوشتە بەرزەکانەوە، زمان‌و گەدەو عەورەتی خۆی بپارێزێ لەشتی حەرام‌و ناپەسەند.

پێویستە باش لە قسەو گفتی کێشەکاران بگا، ئەمجار وێڕای هەموو ئەو رەوشتانەی باسکران عاقل‌و زێر بێ، شوێن هەواو ئارەزۆی خۆی نەکەوێ. ئەمجار ئیبنو حەجەر دەفەرموێ: هەرچەندە ئێمە ئەو راستییە دەزانین کە لەسەر روی زەویدا کەسێك نیە بەتەواوی هەموو ئەو رەوشتانەی تێدابن، وەلێ پێویستە هەوڵ بدرێ کە لەناو خەڵکانی هەموو چەرخ‌و رۆژگارێکدا کێیان خاوەنی فەضل‌و رەوشتی بەرزو پەسەندترە ئەو بکرێ بە دادوەرو قازی.

## نابێ ئافرەت بکرێ بەدادوەرو قازی

لە ئەبوبەکرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: من لەرۆژگاری شەڕی (جەمەل)دا خودا بەهۆی فەرموودەیەکی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە هاتەوە یادم لە بەشداری کردنی ئەو شەڕە پاراستمی. ئەوەبوو کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی ئەوەی پێگەیی: کە فارسەکان کچی کیسرایان کردوە بە فەرمانڕەوای خۆیان. فەرمووی: «لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً».[1] هەر گەل و نەتەوەیەك ئافرەت بکەنە فەرمانڕەوای خۆیان سەرکەوتوو نابن.

## ئاداب و ڕێوڕەسمی قازی

پێویستە قازی عەدالەتکار بێ لەنێوان کێشەکاندا بەیەکچاو سەیریان بکا لە تەماشاکردن و گفت و گۆو شێوەی دانیشتن و چوونە ژورەوەیان بۆلای بەیەکسانی بێ و فەرق و جیاوازی مامەڵەیان لەگەڵدا بکا.

لە (ئەبولەلیحی ئەلهوزەلی)یەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری و تێیدا دەفەرموێ: بزانە قەزاوەت ئەرکێکی دامەزراوو تۆکمەیەو سونەتێکی پەیڕەوکراوە، ئەگەر روداوێکیان خستە بەردەستت جوان لێی وردبەرەوەو باش تێی بگە ئەمجار قسەی لەسەربکە. چونکە گوتنی قسەی حەق ئەگەر جێبەجێ کردنی بەدواوە نەبێ بێ سودە. یەکسانی بخەرە نێوان خەڵکەوە لە تەماشاکردنیان و شوێنی دانیشتن و عەدالەتکاریتدا، بۆئەوەی زەعیف و بێ دەسەڵات لە

---

[1] صحيح: (ص.ج/٥٢٢٥)، خ(٧٠٩٩/٥٣/١٢)، ت(٢٣٦٥/٣٦٠/٣)، ن(٨/٢٢٧).

عەدالەتكاريت ناهومێد نەبن، خانەدانو دەسەلاتدار تەماعی ئەوەیان لێت نەبێ ستەمیان بۆ لە خەلك بكەی. [1]

## نابێ دادوەرو قازی بەرتیلو دیاریی وەربگرن

لە عەبدوللای كوڕی عەمرەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الرَّاشِي وَالْمُرْتَشِي». [2] نەفرینی خودا لەسەر بەرتیلدەرو بەرتیل وەرگربێ.

لە ئەبو حومەیدی (الساعدی)یەوە ریوایەتكراوە: كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «هَدَايَا الْعُمَّالِ غُلُولٌ». [3] دیاری بۆ بردنو دیاریی وەرگرتنی كاربەدەستان زوڵمو ستەمە.

## حەرامە قازی لەكاتی رق هەڵسانیدا بڕیار دەربكا

لە عەبدولمەلیكی كوڕی عومەیرەوە ریوایەتكراوە، دەڵێ: گوێم لێ بوو عەبدوررەحمانی كوڕی ئەبوبەكرە وتی: ئەبوبەكرە نامەیەكی بۆ كوڕەكەی نووسی: ئەوكاتە كوڕەكەی قازی سەجستان بوو، تێیدا نووسیبوی: هەرگیز لەكاتی رق هەڵسانتدا دادوەریی‌و بڕیاردان ئەنجام مەدە، چونكە من بۆخۆم لە پێغەمبەرم ژنەوت فەرمووی: «لاَ يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ». با دادوەرو قازی حوكم لەنێوان دوو كەسدا نەكا بە رق هەڵساوی.

---

[1] صحيح (الإرواء/٢٦١٩)، قط(١٥/٢٠٦/٤).

[2] صحيح: (ص.ج/١٨٧١). جه(٢٣١٣/٧٧٥/٢)، ت(١٣٥٢/٣٩٧/٢).

[3] صحيح (الإرواء/٢٦٢٢)، حم(٤٢٤/٥)، هق(١٣٨/١٠).

**بڕیاردانی دادوەرو قازی حەق نلگۆڕیو شت حەلآلو حەرام ناکا**

کەسێك بەناڕەوا مافێکی بۆ بڕیاردرا مافی خۆی نەبوو با رەتی بکاتەوە چونکە بڕیاری حاکم نە حەرام حەلاڵ دەکا نە حەلاڵ حەرام دەکا.

لە ئوممو سەلەمەوە کە خێزانی پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێ) ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوێی لە دەمە دەمێو کێشەو بێنەو بەرمیەك بوو لەبەردەم ژوورەکەی بەرپابوبوو، ئەویش تەشریفی چووە دەرەوە بۆ ناویان‌و پێی فەرموون: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الْخَصْمُ ، فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ ، فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَدَقَ ، فَأَقْضِيَ لَهُ بِذَلِكَ ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ ، فَلْيَأْخُذْهَا أَوْ فَلْيَتْرُكْهَا».[1] من ئادەمیزادێکم‌و بەس. رێ دەکەوێ کێشەو نیزاع دێنن بۆلام، لەوانەیە هەندێکتان لە هەندێکتان زمان رەوان‌و قسە زانتربن‌و باشتر بزانێ داکۆکی لە دەعواکەی خۆی بکا، منیش وادەزانم راست دەکاو بڕیار لە بەرژەوەندی ئەو دەردەکەم. جا هەرکەسێك من بەڕواڵەت‌و ظاهیر حوکمی بۆ دەربکەم‌و مافی موسوڵمانێکی بدەمێ با باش بزانێ ئەو پارچە ئاگرێکی دەخەمە دەستییەوە جا با هەڵی بگرێ یان وازی لێ بێنێ.

**داواو شایەت**

داوا: لەزماندا بەمانا داواکردنی شتێکە. قورئان دەفەرموێ: {وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ – الشوری/٣١} ئەوەی داوای بکەن بۆ ئێوە هەیەو لەجێیە.

لەزاراوەی شەرعدا داوا (دعوی) ئەوەیە مرۆڤ ئیدیعای شتێك بکا کە لەژێر دەستی یەکێکی تردایە یان لە ئەستۆی دایە لافی ئەوە لێ بدا کە ئەوشتە هی ئەوە.

[1] متفق علیه: خ(٢٤٥٨/١٠٧/٥) ، م(١٧١٣-٥-١٣٣٧)، د(٣٥٦٦/٥٠٠/٩).

((مودەعی)) داواکار: ئەو کەسەیە داوای مافێکی خۆی دەکا، هەرکاتێ لێی بێدەنگ بوو وازی لێ دەهێندرێ.

(مودەعا علیه) داوا لەسەرکراو: ئەوەیە داوای مافێکی لێ دەکرێ، ئەگەر بێدەنگیش بێ وازی لێ ناهێندرێ.[1]

(بینات) کۆی (بیّنة) واتە: نیشانەو بەلگە وەکوو شایەتو شتی تر . سەر بەلگەو بنەمای ئەم بابەتە ئەو فەرموودەیە: کە ئیبنو عەبباس دەیگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لَادَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ وَلَكِنَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ».[2] ئەگەر بەگوێرەی داواکاری ماف بدرایە بەخەڵك کەسانێك دەبوون داوای خوێنو ماڵی کەسانی دیکەیان دەکردو بەناحەق مافیان لێ زەوت دەکردن، وەلێ داوا لەسەر کراو دەتوانێ بەسوێند داواکەیان رەتبکاتەوە.

هەروا لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیریەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (الْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ).[3] بەلگەو شایەت لەسەر داواکارەو سوێند لەسەر داوا لەسەرکراوە.

## تاوانی ئەوەی داوای شتێك بكەی كەهی تۆ نیە

لە ئەبو زەڕەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «مَنِ ادَّعَى مَا لَيْسَ لَهُ فَلَيْسَ مِنَّا وَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ

---

[1] فقه السنة ج٣/٣٢٧.

[2] متفق علیه: م(١٧١١/١٣٣٦/٣٩٩/٢)، خ(٤٥٥١/٢١٣/٨)، جة(٢٣٢١/٧٧٨/٢).

[3] صحيح: (ص.ج/٢٨٩٦)، ت(١٣٥٦/٣٩٩/٢).

النَّارِ». [١] کەسێك داوای شتێك بکا کەهی ئەونەبێ ئەوە لە ئوممەتی ئێمە نیەو بە موسوڵمان حلێب ناکرێ، با جێگای خۆی لەناو ئاگردا ڕێك بخا.

## تاوانی ئەو کەسەی سوێندی بەناحەق دەخوا بۆئەوەی مافی یەکێکی تر بۆخۆی ببڕێ

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ وَهْوَ فِيهَا فَاجِرٌ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللَّهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ» [٢]: کەسێك سوێندبخواو سوێندەکەی بەدرۆ بێ بۆئەوەی ماڵی یەکێکی تر بۆخۆی ببڕێ، ڕۆژی قیامەت توشی خودا دەبێ، خودا لێی ناڕازییە.

لە ئەبو ئومامەی (ألحارثیَ)یەوە ڕیوایەتکراوە: کە لە پێغەمبەری بیستووە فەرموویەتی: «لاَ يَقْتَطِعُ رَجُلٌ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَأَوْجَبَ لَهُ النَّارَ». هەر مرۆڤێك مافی موسوڵمانێکی تر بە سوێندی درۆ بۆخۆی ببڕێ خودا بەهەشتی لێ یاساغ دەکاو دۆزەخی بۆ بڕیاردەدا. پیاوێك لە هاوەڵان عەرزی کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر ئەوشتەی بۆ خۆی دەیبڕێ شتێکی کەمیش بێ وایە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «وَإِنْ كَانَ سِوَاكًا مِنْ أَرَاكٍ». [٣] تەنانەت ئەگەر پارچە سیواکێکیش بی لە درەختی ئەراك.

---

[١] صحيح: (ص.جة/١٨٧٧)، م(١/٧٩/٦١)، جة(٢/٧٧٧/٢٣١٩).

[٢] متفق عليه: خ(٧٦، ٦٦٧٧ /١/٥٥٨) ، م(١/١٢٢/١٣٨)، د(٨/٦٧/٣٢٢٧).

[٣] صحيح: (ص.جة/١٨٨٢)، جة(٢/٧٧٩/٢٣٢٤)، م(١/١٢٢/١٣٧).

## ڕێبازەکانی چەسپاندنی داوا

ڕێبازەکانی چەسپاندنی داوا، دانپیانانە، شایەتە، سوێندە.

١- دانپیانان ئەوەیە: کابرا بە دەمو زوبانی خۆی ڕاستییەکە بدرکێنێ، هەرکاتێ ئەوە هاتەدی حوکم پێی واجب دەبێ، بەمەرجێ دانپیانەرەکە موکەلەفو موختار بێ، بەویستی خۆی ئیعتیراف بکا. بێگومان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەریەك لە (ماعز) و (ألغامدیة) و (ألجهینة)ی بە دانپیانانی خۆیان بەردەباران کرد.

هەروا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): «وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا ، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا».[1] ئەی ئونەیس بچۆ بۆلای خێزانی ئەم پیاوە ئەگەر دانی بەزیناکردنیدا نا بەردەبارانی بکە.

٢- شایەتیدان: شایەتیدان دەربارەی ئادەمیزادەکان فەرزی کیفایەیە ئاماژە بە ئایەتی {وَلا يَأْبَ الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا – البقرة/٢٨٢} بوون بە شایەتو هەلگرتنی ئەرکی شایەتیدان دەربارەی مافی ئادەمیزاد فەرزی کیفایەیەو بەجێهێنانی فەرزی (عین)ە چونکە خودا دەفەرموێ: {وَلا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ – البقرة/٢٨٣} شایەتی مەشێرنەوە، ئەگەر شایەتیەکتان لابوو بەجێی بێنن، کەسێك شایەتی لابێو بیشارێتەوە، ئەوە تاوانبارەو ئیمانی ساغ نیە.

پێویستە شایەت حەق بێژبێ، تەنانەت ئەگەر زیانی بەخودی خۆیشی دەگەیاند. چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوْ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِنْ يَكُنْ غَنِيّاً أَوْ فَقِيراً فَاللَّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلا تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا وَإِنْ تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا

---

[1] لەباسی حەددی زینادا تێپەڕی.

تَعْمَلُونَ خَبِيراً – النساء/١٣٥} ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە زیادەڕەویو موبالەغە بکەن لەچەسپاندنی عەدالەتدا، بەلێبڕاوی پابەندی بن، شایەتی حەقو ڕاستی بن بۆ خودا واتە: هەوڵی چەسپاندنی حەق بدەنو مەبەستی خودا لەخۆ ڕازیکردنتان هەبێ، شایەتی بەڕاستی بدەن، خۆتان لەشایەتیدانی بەدرۆ بپارێزن، با شایەتی دانەکەشتان لەدژی خۆتان بێ، یان زیانی بۆ دایكو باوکتان هەبێ یان زیانی بۆ خزمو کەسوکارو دۆستو ئاشنا هەبێ، حەق چۆنەو ڕوداوەکە چۆنتان ئاگا لێ بووە ئاوا بیگێڕنەوە، لەشایەتیداندا جگە لەلایەنی خوداو حەق، هیچ شتێکی تر لەبەرچاو مەگرن، لەشایەتیداندا لایەنگیری دەوڵەمەند لەبەر دەوڵەمەندییەکەی مەکەن، بەزەیتان بەهەژاردا لەبەر هەژاری نەیەتەوە، شوێن هەواو هەوەس مەکەون نەوەکوو لەحەق لابدەن بۆلای بەتاڵ، یان با هەواو هەوەسو دەمارگیریو خۆشەویستی بۆ هەندێ کەسو ڕقو کینەتان لەهەندێکی تر واتان لێ نەکا عەدالەت پاشگوێ بخەن {وَإِنْ تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا} ئەگەر بئەنقەست خوار بڕۆنو شایەتی بگۆڕنو درۆی تێدا بکەنو لەڕاستی لابدەن {فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيراً} دڵنیابن خودا ئاگای لە هەڵوێستو کردارو ڕەفتارتانەو سزاتان دەداتەوە.

شایەتیدان بەبێ ئەوەی ئاگاداری ڕوداوەکە بێ جەرامە چونکە قورئان دەفەرموێ: {إِلاَّ مَنْ شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ – الزخرف/١٨٦}.

شایەتیدانی بەدرۆ یەکێکە لەتاوانە گەورەکان؛ ئاماژە بەو فەرموودەیەی ئەبوبەکرە ڕیوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ». ثَلاَثًا. قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ . قَالَ « الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ. وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَقَالَ: أَلاَ وَقَوْلُ الزُّورِ. قَالَ

فَمَـا زَالَ يُكَرِّرُهَـا حَتَّـى قُلْنَـا لَيْتَـهُ سَـكَتَ».[1] ئـەرێ پێتـان نـەڵێم: کامەیـە گـەورەترین تـاوان؟ وتمـان: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـودا! پێمـان بێـژە، فەرمووی: گەورەترین تاوان هاوەڵدانانە بۆ خودا، ئەزیەتدانی باوك‌و دایکە، لەوکاتـەدا کـە ئەمـەی دەفـەرموو: شـانی دادابـوو، ئـیتر ئـەمجار دانیـشت‌و فەرمووی: ئاگاداربن‌و بزانن بوختان هەڵبەستن‌و شایەتیدانی بەدرۆیـە، ئـیتر هـەر ئـەم وتەیـەی دووبـارە دەکـردەوە هـەتا لـەدڵی خۆمانـدا وتمـان: خۆزگـە بێدەنگ بووایەو چیدی ئەم رستەیەی دوبارە نەکردایەوە.

## کێ شایەتی وەردەگیرێ؟

شایەتی وەرناگیرێ مەگەر لەکەسێك موسوڵمان‌و باڵغ‌و عاقل‌و عادڵ بێ.

کـەوابێ شـایەتیدانی کـافر وەرنـاگیرێ، تەنانـەت ئەگـەر شـایەتیدانەکەی لەسەر هاووێنەی خۆیشی بێ. چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: {وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنْكُمْ – الطلاق/٢} دووکەسی عادڵ لە موسـوڵمانی وەکـوو خۆتـان بکـەن بەشایەت. هەروا دەفەرموێ: {مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنْ الـشُّهَدَاءِ – آل عمـران/٢٨٢} لەو شایەتانەبن کەلێیان رازیـن. دەی خـۆ کـافر عـادڵ نیـەو لێشی رازی نـین‌و لەپێری ئێمەیش نیە.

هـەروا شـایەتیدانی منـداڵیش وەرنـاگیرێ چـونکە خـودا دەفـەرموێ: {وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ – آل عمران/٢٨٢} دوو لـەپیاوانتان بکـەن بەشایەت. منداڵ بەپیاو حسێب ناکرێ.

هـەروا شـایەتی لـە گێل‌و شێت‌و ئـەو جۆرە کەسـانە وەرنـاگیرێ چـونکە ئەوان قسەیان لەسـەر خۆیـان وەرنـاگیرێ‌و بتمانـەیان پـێ نـاکرێ بـۆ غـەیری خۆیان هەرنا.

---

[1] متفق علیه: خ(٢٦٥٤/٢٦١/٥)، م(٨٧/٩١/١).

شـايەتی فاسـق‌و گوناهبـاریش وەرنـاگیرێ چـونکە خـودا دەفـەرموێ: {وَأَشْـهِدُوا ذَوَی عَـدْلٍ مِـنْكُمْ – الطـلاق/٢} دووکەسـی عـادڵ‌و راسـتاڵ بکـەن بەشایەت.

هـەروا شـایەتی پیـاوو ئـافرەتی خیانـەتکارو داوێـن پـیس‌و دوژمنکاریش قبوڵ نیە.[1]

## نیصاب‌و ژمارە شایەت

مافەکان دوو جۆرن: مافی خودا، مافی ئادەمیزاد.

١- جۆرێکیـان شـایەتەکان دەبـێ دووپیـاو بـن ئەگـەر دوو پیـاو نـەبن وەرنـاگیرێن بەشـایەت. ئەمـە لەوشـتانەدا کـە کێـشەکە کێـشەی مـاڵ‌و سـامان نـەبێ‌و لـەو بوارانەشـدا بـێ کـە پیـاو بەسـەریدا رادەگـەن وەکـوو مـارەکردن‌و تەڵاقدان: چونکە قورئان دەفەرموێ: {فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَی عَدْلٍ مِنْكُمْ – الطـلاق/٢}. ئەگـەر گەیـیشتنە ماوەی خۆیان‌و عیدەیان تەواوبوو یان بەرێك‌و پێکی بیانخەنـە ژێـر نیکـاحی خۆتان‌و بەشـێوەی چاکەکاری ژیانیـان لەگەڵدا بەرنەسـەر، یـان بەشـێوەیەکی باش‌و بێ زیانگەیاندن پێیان، دەستیان لێ بەربدەن، دوو پیاوی عادڵ لەخۆتان بکەن بەشایەت لەسەر دەست لێك بەردانەکە.

پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: «لاَ نِكَـاحَ إِلاَّ بِـوَلِيّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ».[2] مـارەکردن دروسـت نیـە؛ گرێبەسـتەکە دانامـەزرێ مەگـەر وەلی ئافرەتەکـەو دوو شـایەتی عـادڵ ئامـادەی گرێبەسـتەکە بـن. دەی لـە

---

[1] حسن: (ص.جة/١٩١٦)، د(٣٥٨٤/١٠/١٠)، جة(٢٣٦٦/٧٩٢/٢).

[2] لەباسی نیکاحدا تێپەڕی.

ئایەتەکەو لە حەدیثەکەیشدا باسی شایەتی نێرینە کراوە کەوابێ لەو بوارانەدا شایەتی پیاو نەبێ وەرناگیرێ.

٢- جۆرێکیان دوو پیاو یان پیاوێك‌و دوو ئافرەت یان شایەتێك‌و سوێندی داواکار وەردەگیرێن. ئەمەش لەو بوارانەدا دەبێ کە پەیوەندی بە ماڵ‌و سامانەوە هەبێ. وەکوو مامەڵەی کڕین‌و فرۆشتن‌و بەکرێدان‌و ڕەهن‌و ئەو جۆرە شتانە. قورئان دەفەرموێ: {وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى – البقرة/٢٨٢} دوو شایەت لەپیاوانی موسوڵمانتان بکەن بەشایەت، ئەگەر دووپیاو ئامادە نەبوون پیاوێك‌و دوو ئافرەت بکەن بەشایەت لەو شایەتانەی لێیان ڕازین بۆیەش دەبێ لەجیاتی شایەتێکی پیاو دوو ئافرەت بن ئەگەر ئافرەتێکیان ڕوداوەکەی لەیاد چۆوەوە ئەویتریان بیری بێنێتەوە.

لە ئیبنو عەبباسیشەوە ڕیوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) حوکمی داوەو بڕیاری دەرکردووە لەسەر بنەمای سوێندی داواکارو یەك شایەت.

٣- جۆرێك ڕوداو هەیە دوو پیاو یان پیاوێك‌و دوو ئافرەت، یان چوار ئافرەت شایەتییان لێ وەردەگیرێ ئەمەش لەو بوارانەدا کەمزۆرجار پیاو بەسەریاندا ئاگادارنابن وەکوو ڕوداوی شیرخواردن‌و منداڵ بون‌و عەیبی ناوەکی ئافرەت.

وەلێ ئەو ڕوداوانەی کە هەر مافی خودایان تێدایە ئەوە شایەتیدانی ئافرەتی تێدا وەرناگیرێ. ئاماژە بە فەرموودەکەی ئیمامی زوهری کە دەفەرموێ: (لا يجلد في شيئ الاّ بشهادة رجلين) هیچ حەددێك ناچەسپێ‌و

جێبەجێ ناکرێ مەگەر دوو پیاو شایەتی تێدابدەن. ئەم جۆرەش کە مافی خودا (حق الله) ناسراوە سێ بەشە:

یەکەم: بەشێکیان کەمتر لەچوار شایەت وەرناگیرێو حوکمی پێ ناچەسپێ. ئەویش بریتییە لەزینا. خودا دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً – النور/٤}ئەوانەی رەوشتی داوێن پیسی پاڵ ئافرەتانی موحصەن دەدەنو پاشان ناتوانن لەسەر داواکەیان چوار شایەتی پیاو ئامادە بکەن هەشتا داری حەددیان لێ بدەن.

دووەم: بەشێکیان دوو پیاو شایەت بن شایەتیەکەیان وەردەگیرێ، ئەمەش لە بواری ئەو حەدانەدایە کە جگە لەزینا. وەکوو لەوەپێش ئاماژەمان پێکردو قسەکەی ئیمامی (زوهری)مان هێنا.

سێیەم: بەشێکیان بەشایەتییەك دەچەسپێ. وەکوو مەسەلەی بینینی هیلال لەسەرەتاو کۆتایی رەمەزاندا.

## چەسپاندنی روداو بەرێگەی سوێند

هەرکاتێ داواکار نەیتوانی بەڵگەو شایەت لەسەر داواکارییەکەی بخاتە روو، داوالەسەرکراویش داوای داواکاری رەتکردەوە ئەوە داواکار هیچ مافێکی نیە جگە لەوە داوابکا داوا لەسەرکراو سوێند بخوا، ئاماژە بەفەرمودەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی: «الْبَيِّنَةَ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينَ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ».[1] شایەت لەسەر داواکارەو سوێند لەسەر ئەو کەسەیە داواکە رەت دەکاتەوە.

لە (الأشعث)ی کوڕی قەیسی (ألكندی)یەو گێڕدراوەتەوە دەڵێ: لەنێوان منو پیاوێك کێشەیەك هەبوو لەسەر بیرێك. کێشەکەمان بردە لای پێغەمبەر

[1] لەوەپێش لەباسی دەعواو بەییناتدا تێپەڕی.

(درودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «شَاهِدُكَ أَوْ يَمِينُهُ». ئەی ئەشعەث! یان تۆ دوو شایەت بێنە یان کابرای بەرامبەرت سوێند بخوا. وتم: قوربان کەوابێ کابرای بەرامبەرم سوێند دەخواو هیچ گوێ ناداتێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ يَسْتَحِقُّ بِهَا مَالاً هُوَ فِيهَا فَاجِرٌ ، لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ». هەرکەسێك سوێندی بەناحەق بخواو بەهۆی سوێندەکەیەوە ماڵێك بۆخۆی بپچڕێو سوێندەکەی بەدرۆبێ، ئەوە رۆژی قیامەت روبەڕوی خودا دەبێتەوە خودا ناخۆشی دەوێ. ئەشعەث دەڵێ: ئیتر خودای مەزن بۆ چەسپاندنی فەرموودەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئایەتی {إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَناً قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لا خَلاقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ وَلا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ – آل عمران/٧٧}ی نازڵ کرد.

## کتاب الجهاد (باسی جیهاد)

جیهاد چاوگە بۆ فیعلی (جاهد) کە دەچێتەوە سەر (جُهْد): کە بەمانا بەکارهێنانو بەخشینی هێزو خۆماندوکردنە، دەگوترێ: (جاهد يجاهد جهادا) یان (مجاهدة) کاتێك کە هێزو توانای خۆی ببەخشێ ئەرکو ماندوبوون لە ئەنجامدانی شەڕکردن لەگەڵ دوژمن بخاتە ئەستۆی خۆیو بەرەنگاری دوژمن بێتەوە.

هەڵبەتە جیهاد بەجیهادی حەقیقی ناژمێردرێ هەتا مەبەستی بەو ئەرك لەئەستۆ گرتنە رەزامەندی خودا نەبێ. کاتێك جیهاد بەجیهادی راستی دەژمێردرێ: کە مەبەست پێی بەرزکردنەوەی وشە (لا الـه الا الله) بێو بەرزبوونەوەی دروشمی حەقو راستی بێو بەرەنگاربوونەوەی بەتاڵو

خۆبەختکردن لەپێناو ڕەزامەندی خودادا بێ. ئەگەر مەبەستی بە جیهادەکەی غەیری ئەوشتانە بوو لە کاڵاو مەبەستی دونیایی، ئەوە لەڕاستیدا پێی ناگوترێ جیهادو بەجیهاد نازمێردرێ.

کەسێك شەڕبکا بۆئەوەی پلەو پایەیەکی دونیایی بەدەست بێنێ یان کاڵایەکی دونیایی دەست بکەوێ، یان ئازایەتی خۆی رابنوێنێ، یان ناوو ناوبانگی ئازایەتی دەربکا، ئەوە هیچ ئەجرو پاداشێکی لەسەر جیهادەکەی دەستگیر نابێو لە ئەوابی قیامەت بێبەش دەبێ.

لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: وادەبێ پیاو شەڕدەکا بۆ غەنیمەتو کاڵا دەستکەوتن، وادەبێ پیاو شەڕدەکا بۆ ناوو شۆرەت، وادەبێ پیاو شەڕدەکا بۆ پلەو پایەو خەڵکی شوێن دەستی ببینن. ئەمانە کامەیان بەجیهاد لەپێناو ڕەزامەندی خودادا دەژمێردرێ. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللّٰهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ».[1] کەسێك بۆیە شڕبکا تا وشەی (لا اله الا الله محمد رسول الله) بەرزبێ ئەوە بەجیهاد دەژمێردرێ.

## تەرغیبو هەڵنان بۆ جیهاد

لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ آمَنَ بِاللّٰهِ وَبِرَسُولِهِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَصَامَ رَمَضَانَ ، كَانَ حَقًّا عَلَى اللّٰهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ جَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ ، أَوْ جَلَسَ فِي أَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ فِيهَا». کەسێك بڕوای بەتاكو تەنهایی خودا هەبێ، بڕوای بە پێغەمبەرێتی

---

[1] متفق عليه: خ(٢٨١٠/٢٧/٦)، م(١٩٠٤/١٥١٢/٣)، د(٢٥٠٠/١٩٣/٧)، ت(١٦٩٧/١٠٠/٣)، جة(٢٧٨٣/٩٣١/٢).

حەزرەتی موحەممەد هەبێ، نوێژبکا، رەمەزان بەڕۆژوو بێ، خودا لەسەرخۆی پێویست کردوە بیخاتە بەهەشتەوە، جا وێڕای ئەم بیرو باوەڕو کردەوانەی لە رێگای خودادا جیهاد بکا، یان لەوخاکەی تێیدا لەدایك بووە نیشتەجێ بێ‌و دەرنەچێ. هاوەڵان وتیان: ئەرێ ئەم موژدەیە بە خەڵکی رانەگەیەنین؟ فەرمووی: «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ، مَا بَيْنَ الدَّرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ ، أُرَاهُ فَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ»[1]؛ بێگومان لەبەهەشتدا پاداشەکان جیاوازییان تێدایەو بەرزو نزمییان هەیە لە پلەیەکەوە تا سەد پلە بەرزدەبێتەوە، خودا ئەم پلەو پایە جوداوازییانەی بۆ تێکۆشەران لەڕێگەی خودادا ئامادەکردوە، نێوان هەردوو پلەیەك وەکوو نێوان ئەرزو ئاسمان وایە لە فراوانیدا، جا ئەگەر داوای پلەو پایەی بەهەشتتان کرد لەخودا، داوای فیردەوس بکەن بێگومان فیردەوس ناوەڕاستی بەهەشتەو لای ژوروی بەهەشتە. لەژوور ئەوەوە عەرشی کردگارە، هەموو جۆگەو جۆبارەکانی بەهەشت لەوێوە هەڵدەقوڵێ.

هەر لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانِتِ بِآيَاتِ اللَّهِ لاَ يَفْتُرُ مِنْ صَلاَةٍ وَلاَ صِيَامٍ حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ».[2] نمونەی موجاهیدو تێکۆشەر لەپێناو ئایینی خودادا وەکوو موسوڵمانێك وایە رۆژ بەڕۆژوبێ‌و شەو سەرگەرمی شەونوێژو خوداپەرستی بێ، لە نیشانەکانی تاك‌و تەنهایی خودا وردبێتەوە لەنوێژو رۆژوی بەردەوامی خۆی دانەبڕێ تا

---

[1] صحيح: (ص.ج/٢١٢٦)، (الصحيحة/٩٢١)، خ(٦/١١/٢٧٩٠).

[2] صحيح: (ص.ج/٥٨٥١)، م(٣/١٤٩٨/١٨٧٨)، ت(٣/٨٨/١٦٦٩).

موجاهیدەکـە لـە غـەزاو تێکۆشـانیو دوورکەوتنـەوە لـەماڵو منـداڵی دەگەڕێتەوە.

هـەر لـە ئـەبو هـورەیرەوە ریوایـەتکراوە، وتوویـەتی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «انْتَدَبَ اللَّهُ لِمَنْ خَـرَجَ فِـى سَـبِيلِهِ لاَ يُخْرِجُـهُ إِلاَّ إِيمَانٌ بِى وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِى أَنْ أُرْجِعَهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ ، أَوْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ».[1] پەروەردگار بڕیاری داوە بەرعۆدە بووە بۆ کەسێك لە ڕێگەی خوادا دەربچێ بـۆ غـەزا، پاڵنـەرو هانـدەری بـۆ چـوونە دەرەوە بـۆ غـەزاو تێکۆشـان، بـڕوا بـەخوداو بەڕاسـت زانینـی پێغەمبـەرێتی پێغەمبـەران بـێ، بڕیـاری داوەو دەفـەرموێ: دەبـێ بـە کۆڵـێ پـاداشو دەسـتکەوتەوە بیگێڕمـەوە، یـان پلـەی شەهادەت بەدەست بێنێو بیخەمە بەهەشتەوە.

### گەورەیی شەهادەت

لـە ئیمـامی مەسـروقەوە ریوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: پرسـیارمان لـە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود کرد دەربارەی ئایەتی {وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُـوا فِـي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْـدَ رَبِّهِـمْ يُرْزَقُـونَ – آل عمـران/١٦٩} فـەرمووی: ئێمـەیش کـاتی خـۆی لـەم بـارەوە پرسـیارمان لـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) کرد فـەرمووی: «أَرْوَاحُهُمْ فِى جَوْفِ طَيْـرٍ خُـضْرٍ لَهَـا قَنَادِيـلُ مُعَلَّقَـةٌ بِالْعَرْشِ تَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ ثُمَّ تَأْوِى إِلَى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمُ اطِّلاَعَةً فَقَالَ هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئًا قَالُوا أَىَّ شَىْءٍ نَشْتَهِى وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا قَـالُوا يَـا

---

[1] متفق عليه: خ(١/٩٢/٢٦)، م(٣/١٤٩٥/١٨٧٦).

رَبِّ نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى. فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ تُرِكُوا».[1]

**ماناى ئايەتەكە واتە: وامەزانن كە ئەوانەى لەپێناو ئايينى خودادا كوژراون مردون، بە مردويان حيساب مەكەن، بەڵكوو ئەوانە نەمردون‌و زيندون وان لەخزمەت خوداى خۆياندا بە قەدرو ڕێزەوە كات بەسەردەبەن‌و لەلايەن خوداوە رزق‌و رۆزيى جۆراو جۆريان پێ دەدرێ لە ژيانێكى حەقيقى‌و گوزەرانێكى خۆش‌و لە جەستەيەكى بەرزەخى ناسك‌و لەتيفدان تا رۆژى قيامەت ئاوا دەژين، ئەوسا دەچنەوە ناو بەرگ‌و پۆشاكى دونياييان‌و حەشرو نەشر دەكرێن، شادمان‌و كەيفخۆشن بەو بەهرەيەى خودا بەهۆى شەهيدبوونيانەوە بۆى فەراهەم هێناون.**

**جا عەبدوڵلا فەرمووى: ئيمەيش كاتى خۆى سەبارەت بە ئەمە پرسيارمان لە پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) لە وڵامدا فەرمووى: (گيانى شەهيدان وان لەناو سكى چەند مەلێكى سەوزدا، ئەو مەلانە لە بەهەشتدا بە ويستى خۆيان گەشت‌و گوزار دەكەن حەزيان لەكوێ بێ دەچن‌و چييان بوێ دەيخۆن، هەموو جارێ دوا سوڕانەوەو گەشت‌و گوزاريان، بۆ حەسانەوەو پشودان دەگەڕێنەوە بۆ ناو چراخانێ كە هەڵاوسراون بەژێر تەخت‌و بارەگاى عەرشدا، جارێ پەروەردگار پێيان دەفەرموێ: ئارەزۆى چى تر دەكەن بتاندەمێ؟ شەهيدەكان دەڵێن: ئەى پەروەردگارمان! جا لەمەزياتر چيمان بوێ چيتر داوابكەين؟ ئەوەتا لەبەهەشتدا بۆ خۆمان بە حەزو ئارەزۆى خۆمان دەسوڕێينەوەو چيمان بوێ دەيخۆين‌و دەيخۆينەوە. تا سێ‌جار ئەم گفتوگۆيە لەنێوان شەهيدان‌و پەروەردگاردا تابيلا دەبێتەوە، جا كاتێ شەهيدەكان دەزانن كە خودا وازيان لێ ناهێنێ‌و هەر دەبێ داواى شتى تر**

---

[1] صحيح: (مختصر م/١٠٦٨)، م(١٨٨٧/١٥٠٢/٣)، ت(٤٠٩٨/٢٩٨/٤).

بکەن، عەرزی دەکەن ئەی پەروەردگارمان! دەمانەوێ گیانمان بەبەردا بکەیتەوەو بمانبەیتەوە بۆ ژیانی دونیامان بۆئەوەی جارێکی تر لەپێناو ئایینی پیرۆزی تۆدا شەهید بکرێینەوە!

کاتێ پەروەردگار دەبینێ شەهیدەکان هیچ پێویستی تریان نیە لەبەهەشتا ئیتر وازیان لێ دێنێ.

لە ئەنەسەوە ڕیوایەتکراوە: کە (أم الربیع)ی کچی (ألبراء): کە دایکی حاریثەی کوڕی سوراقەیە هاتە خزمەت پێغەمبەرو عەرزی کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! باسی حاریثەم بۆناکەی؟ - حاریثە ڕۆژی غەزای بەدر تیرێکی وێڵی بەرکەوتبوو شەهید بوو بوو – ئەگەر لەبەهەشتا بێ صەبر دەگرم، ئەگەر وانەبێ زۆری بۆ دەگریم، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «يَا أُمَّ حَارِثَةَ ، إِنَّهَا جِنَانٌ فِي الْجَنَّةِ ، وَإِنَّ ابْنَكِ أَصَابَ الْفِرْدَوْسَ الأَعْلَى».[1] ئەی دایکی حاریثە بەهەشت چەند باغو باخاتێکە، کوڕەکەی تۆ باخی فیردەوسی ژوروی بەرکەوتووە.

لە (المقدم)ی کوڕی مەعدیکەریبەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «وَلِلشَّهِيدِ عِنْدَ اللَّهِ سِتُّ خِصَالٍ يُغْفَرُ لَهُ فِي أَوَّلِ دَفْعَةٍ وَيَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَيُجَارُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَيَأْمَنُ مِنَ الْفَزَعِ الأَكْبَرِ وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ الْوَقَارِ الْيَاقُوتَةُ مِنْهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا وَيُزَوَّجُ اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ زَوْجَةً مِنَ الْحُورِ الْعِينِ وَيُشَفَّعُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَقَارِبِهِ».[2] شەهید لای خودا شەش بەهرەی هەن، لەگەڵ یەکەم دڵۆپە خوێنی لێی دەڕژێ خودا لێی خۆش دەبێ، شوێنی خۆی لەبەهەشتدا نیشان دەدرێ، تووشی سزای ناو گۆڕ

---

[1] صحيح: (ص.ج/٧٨٥٢)، خ(٢٨٠٩/٦/٢٥)، ت(٣٢٢٤/٩/٥).

[2] صحيح: (ص.جة/٢٢٥٧)، ت(١٧١٢/١٠٦/٣)، جة(٢٧٩٩/٩٣٥/٢).

نابێ، لەترس و فەزەعی گەورەی ڕۆژی قیامەت ئەمین و پارێزراو دەبێ. تاجی ویقارو ڕێزی دەخرێتە سەر سەری دەنکە یاقوتێکی ئەو تاجە لەهەموو کاڵاو خشڵی جیهان بەنرخترە. حەفتاو دوو حۆری بەهەشتی لێ مارە دەکرێ، تکاو شەفاعەتی بۆ حەفتا لە خزم و کەسوکاری لێ وەردەگیرێ

لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتکراوە، وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «الشَّهِيدُ لاَ يَجِدُ أَلَمَ الْقَتْلِ إِلاَّ كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمْ أَلَمَ الْقَرْصَةِ».[1] شەهید کە دەکوژرێ ئازاری کوشتنەکەی بە ئەندازەی ئەوەیە یەکێك لەئێوە ئێشی نقورچکی پێ بگا.

## هەڕەشە لەوانەی واز لەجیهاد دێنن

قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُمْ بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنْ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ. إِلاَّ تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً وَيَسْتَبْدِلْ قَوْماً غَيْرَكُمْ وَلا تَضُرُّوهُ شَيْئاً وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – التوبة/٣٨-٣٩}:

ئەی ئەوانەی بڕواتان بە تاك و تەنهایی خوداو ڕاستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەر هەیە، ئەوە چیتانە کە پێتان دەگوترێ: ڕابن و بڕۆن بۆ جیهادو غەزا لە ڕێگەی خودادا تەمبەڵی دەنوێنن و ڕانابن و لەشوێنی خۆتان ناجوڵێن و خۆتان بەزەوییەوە دەنووسێنن. ئەوە بەژیانی دونیاو کاڵاو لەزەتی دونیاتان ڕازی بوون ژیانی بەختەوەری دوا ڕۆژتان پاشگوێ خستووەو بەژیانی کورتخایەنی کەم بایەخی دونیا ڕازی بوون لەجیاتی ژیانی نەبڕاوەی پڕ خۆشی و شادی قیامەت. خۆ ژیان و لەزەت و کاڵای دونیا بە بەراورد لەگەڵ ژیانی قیامەت و خۆشییەکانی شتێکی زۆر کەم و کەمبایەخە. ئەگەر ئێوە

---

[1] حسن صحيح: (ص.جة/٢٢٦٠)، ت(١٧١٩/١٠٩/٣)، جة(٢٨٠٢/٩٣٧/٢)، ن(٦/٣٦).

بەپیر بانگەوازی جیهادەوە نەچن‌و بە گورج‌و گۆڵی رانەبن‌و نەچن بۆ غەزاو شەڕ لەگەڵ کافران، خودا سزای بەئێشتان دەداو ئێوە لەناو دەباو گەل‌و نەتەوەیەکی تر دێنێتە کایە. ئێوە بە هەڵوێستی تەمبەڵانەو نەچوونتان بەپیر بانگەوازی جیهادەوە زیان بەخودا ناگەیەنن خودا بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتی رەهای هەیە.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێ: {وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ – البقرة/١٩٥}. ماڵ‌و سامانی خۆتان لەرێگای خودادا ببەخشن واز لەجیهاد کردن مەهێنن، بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە ناو تەهلوکەو فەوتانەوە.

لە یەزیدی کوڕی ئەبو حەبیبەوە لە ئەسلەمەوە: کە باوکی عیمرانە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێکی موهاجیری لە قوسطنطەنیە هەڵمەتی بردە سەر ریزی دوژمن‌و دڕی دا، ئەوکاتە ئەبو ئەییوبی ئەنصاریمان لەگەڵ بوو – کەسانێك وتیان: ئەو کابرایە بەدەستی خۆی خۆی خستە ناو تەهلوکەوەو خۆی فەوتاند، ئەبو ئەییوب فەرمووی: ئێمە باشتر مانای ئەم ئایەتە {وَلا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ – البقرة/١٩٥} دەزانین. ئەم ئایەتە دەرحەق بەئێمە نازڵ بوو، ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، لەخزمەتیا ئامادەی شەڕو جیهاد بووین، بە ماڵ‌و بەگیان داکۆکیمان لە پێغەمبەرو ئایینەکەی کردو یارمەتیمان دا، جا کە ئایینی ئیسلام بڵاوبۆوەو کەوتینە قسەو باس‌و سرتە سرت، وتمان: خودا رێزی لێناین بەوەی کردینی بە هاوەڵی پێغەمبەرەکەی یارمەتی دا تا ئیسلام سەرکەوتوو رێرەوانی زۆربوون، ئێمە لەوکاتەوە چووینە ناو ئەم ئایینەوە هەموو شتێکی ترمان وەلاناو خزم‌و کەسوکارو ماڵ‌و منداڵمان خستە لاوەو خۆمان بۆ ئایین فیداکرد، ئێستا واشەڕ کۆتایی هات‌و قورسایی خۆی دانا، کەوابوو کاتی ئەوە هاتووە لەمە بەولاوە

بگەڕێینەوە بۆ ناو ماڵو خێزانمانو ئیستیراحەت بکەین، ئیتر دەربارەی ئێمە ئایەتی {وَلا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ – البقرة/١٩٥} نازڵ بوو، کەوابوو بەهیلاکچوونو فەوتان لەوەدایە کە پیاو لەناو ماڵو منداڵی خۆیدا بمێنێتەوەو پاڵی لێ بداتەوەو واز لەجیهاد بێنێ.[١]

## حوکمی جیهاد

قورئان دەفەرموێ: {كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ – البقرة/٢١٦}. شەڕکردنو جیهاد لەدژی کافران لەسەر ئێوە پێویست کراوەو ئەرکی سەرشانتانە ئەنجامی بدەن هەرچەندە پێشتان ناخۆشە ئەو ئەرکە خراوەتە سەر شانتان. وێدەچێ شتێك ئێوە بەلاتانەوە ناخۆش بێ بەڵام لەراستیدا شەڕو نەگبەتی بۆ ئێوە لێ بکەوێتەوە، خودا زاناو ئاگادارە دەزانێ چ باشەو چ خراپە ئێوە نازانن جیهادو تێکۆشان لەڕێی خودادا فەرزی کیفایەیە دەبێ موسوڵمانان ئەنجامی بدەن، ئەگەر ئەنجام نەدرێ هەموو موسوڵمانان تاوانبارن ئەگەر کۆمەڵێك ئەنجامیان دا لەسەر هەموو موسوڵمانان لادەچێ.

قورئان دەفەرموێ: {لا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلاًّ وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى – النساء/٩٥}. یەکسانو چونیەك نین ئەو موسوڵمانانەی لەماڵەوە پاڵیان لێ داوەتەوەو نەچوون بۆ غەزاو جیهادکردن دژی کافرانو هیچ عوزرو بیانووی نەچونیشیان نیە یەکسان نین لەگەڵ ئەوانەی لە ڕێگەی خودادا دەبەخشن، هەڵبەتە خودای باڵا

[١] صحيح: (ص.د/٢١٨٧)، د(٢٤٩٥/٧/١٨٨)، ت(٤٠٥٣/٢٨٠/٣).

دەست فەضڵو ڕێزو نرخی داناوە بۆ ئەوانەی بەماڵو گیانی خۆیان لە ڕێگەی خودادا جیهاد دەکەن، بە پلەو پایەیەکی گەورە ئەوانی بەسەر ئەوانەدا بەرزکردۆتەوە کە لەماڵەوە پاڵیان لێ داوەتەوە، خودا بۆ هەردوو لایان وادەی بەخششو چاکەی داوەو بەبەهەشتی رازاوەیان شاد دەکا.

لە ئایەتەکەدا پەروەردگار هەواڵی ئەوەی داوە کە فەضڵو ڕێزی خۆی دەبەخشێ بە موجاهیدو تێکۆشەران، بۆ ئەوانیشو بۆ ئەوانەی لە ماڵەوە پاڵیان لێ داوەتەوە پاداشی باش هەیە، جا ئەگەر پاڵدەرەوەکان ئەرکێکی پێویستی سەرشانیان بفەوتاندایە دەبێ شیاوی سزابن نەك پاداش، کەوابێ کە: کۆمەڵێك ئەرکی جیهادیان خستە ئەستۆی خۆیانو ئەنجامیان دا فەرزەکە لەسەر هەموو موسوڵمانان لادەچێ.

پێویستە ئەوە بزانی: کە زۆرچوون بۆ غەزاو تێکۆشان لە ڕێگای خودادا سوننەتەو لای خودا کارێکی پەسەندو خۆشەویستە. بەگوێرەی ئەو ئایاتو حەدیثانەی لەم بارەوە هاتوون غەزاکردنی زۆرو جیهادکردنی بەردەوام سوننەتە، کەمترین ئەندازەی غەزای واجب ئەوەیە لە ساڵێکدا یەکجار بچێ بۆ غەزا، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەوەی فەرمانی پێ کرا بە جیهاد هیچ ساڵێك نەبوە نەچوبێ بۆ غەزا، دەی شوێنکەوتنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) واجبەو پەیڕەوکردنی پێویستە، هەروەها چونکە غەزا فەرزو پێویستەو جار دواجار دووبارە دەبێتەوە. کەمترین دووبارەبوونەوەی ئەوەیە ساڵانە جارێك دوبارە بکرێتەوە وەکوو ڕۆژوو زەکات، خۆ ئەگەر پێویست بوو ساڵی زیاد لەجارێك ئەنجام بدرێ ئەوە پێویستە ئەنجام بدرێ، چونکە فەرزی کیفایەیەو بە گوێرەی پێویست مەزندە دەکرێ.

وەڵێ پێویستە ئێمەو خەڵکیش بزانن: کە شەڕکردن لە ئیسلامدا گۆزو گوممەت پەنای بۆ نابرێ، بەڵکوو دەبێ پێش وەخت ئاگادارکردنەوەو ئیعلانی بۆ بکرێ، دەبێ ئەوانەی جیهادیان لەدژ دەکرێ سەرپشك بکرێن لەنێوان موسوڵمانبوو سەرانەدانو شەڕ لەگەڵدا کردن، خۆ ئەگەر لەنێوان موسوڵمانانو کافراندا پەیمانو بەڵێن هەبوو، موسوڵمانان ترسی ئەوەیان هەبوو خیانەتیان لێ بکەن، دەبێ بەئاشکرا پێیان رابگەیەنن کە پەیمانەکەیان هەڵوەشاندۆتەوەو پابەندی نابن ئەمجار ئیعلانی شەڕیان لەگەڵ بکەن.

ئەحکامە کۆتاییەکان دەکەوێتە ئەستۆی ئەهلی نیمەوە، لەوەدا ئاخۆ ئاشتەوایی قبوڵ دەکەنو سەرانە دەدەن یان لایەنی شەڕ هەڵدەبژێرن یان موسوڵمان دەبن.

هەڵبەتە لەو حاڵەدا کە ئاشتەوایی هەڵدەبژێرنو سەرانە دەدەنو لەگەڵ موسوڵمانان عەهدو بەڵێن مۆردەکەن، نابێ موسوڵمانان گۆزو گوممەت پەلاماریان بدەنو غافڵ گیریان بکەن بەڵکوو دەبێ لەپێشدا پەیمانەکەیان بەسەردابدەنەوە عەهدەکە هەڵبوەشێننەوە ئەمجار شەڕکردن لە دژیان رابگەیەنن مەگەر موسوڵمانان لە حاڵەتی لاوازیدا بن ئەوە بەشێوەیەکی مەرحەلیو گونجاو تایبەت بەو حاڵەتە هەڵسو کەوت دەکەن.

## یاساو رێسای شەڕ لەدژی کافران

لە بورەیدەوە ریوایەتکراوە، وتوویەتی: دابو نەریتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وابوو کە هاوەڵێکی دەکردە سەر لەشکرو سەر پەلو سەر لق، بەتایبەتی ئامۆژگاری دەکرد بەوەی تەقوای خودابکاو لەگەڵ جەنگاوەرانی ژێر فەرماندەیدا رەفتار باش بێ. پاشان پێی دەفەرموون: «اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ اغْزُوا وَلاَ تَغُلُّوا وَلاَ تَغْدِرُوا وَلاَ تُمَثِّلُوا وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا وإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى إِحْدَى

ثَلاَثِ خِصَالٍ أَوْ خِلاَلٍ فَأَيَّتُهُمْ مَا أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ ثُمَّ ادْعُهُمْ مِنَ التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ وَأَخْبِرْهُمْ إِنْ هُمْ فَعَلُوا ذَلِكَ فَلَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ فَإِنْ هُمْ أَبَوْا أَنْ يَتَحَوَّلُوا مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللَّهِ الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْعَرَبِ وَلاَ يَكُونُ لَهُمْ مِنَ الْفَيْءِ وَلاَ مِنَ الْغَنِيمَةِ شَيْءٌ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ فَإِنْ أَبَوْا فَسَلْهُمْ إِعْطَاءَ الْجِزْيَةِ فَإِنْ فَعَلُوا فَكُفَّ عَنْهُمْ فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَقَاتِلْهُمْ». (١)

بەناوی خودا دەست بکەن بە غەزاو لەڕێگەی خودادا شەڕبکەن‌و دژی بێباوەڕان بجەنگن. غەزابکەن دزی‌و فرت‌و فێڵ لە غەنیمەت‌و دەستکەوتەکانی جەنگدا مەکەن، بێ وادەو بەڵێن مەبن، نامەردی‌و کاری نەشیاو مەکەن، جەستەی کوژراوانی دوژمن مەشێوێنن ئەتکیان مەکەن سوکایەتیان پێ مەکەن. منداڵ مەکوژن. ئەی فەرماندەو لێپرسراوی موسوڵمانان لەجەنگدا! کاتێك خۆت‌و هاوەڵانت روبەڕوی دوژمن بوونەوە لە کافرو هاوبەش پەیداکەران، داوایان لێ بکەو سەرپشکیان بکە لەنێوان یەکێ لەم سێ رەوشتە قبوڵ بکەن، هەرکامێك لەم سێ شتەیان قبوڵ کرد تۆیش قبوڵت بێ‌و شەڕیان لەگەڵ مەکە.

یەکەم شت داوایان لێ بکە ئیمان بێنن‌و ئایینی پیرۆزی ئیسلام قبوڵ بکەن، کە ئەمەیان قبوڵ کرد تۆیش لێیان قبوڵ بکەو وازبێنە لەشەڕکردن دژیان. کە موسوڵمان بوون ئەمجار داوایان لێ بکە کۆچ بکەن، لە وڵاتی خۆیانەوە بگوێزنەوە بۆ مەدینە: کە پایتەخت‌و شوێنی فەرمانڕەوایی موسوڵمانانەو بە (دار الهجرة) ناسراوە پێیان رابگەیەنە ئەگەر ئەمە جێبەجێ بکەن‌و کۆچ بکەن بۆ مەدینە ئەوە چ ماف‌و ئەرکێك بۆ کۆچکاران

(١) صحيح: (مختصر م/١١١١)، م(١٧٣١/١٣٥٦/٣)، ت(١٤٢٩/٤٣١/٢) مختصراً.

(مهاجرين) هەيە بۆ ئەوانیش دەستەبەر دەبێ‌و بێ کەم‌و زیاد حاڵیان حاڵی کۆچکاران دەبێ.

خۆئەگەر نەیانەویست کۆچ بکەن‌و بڕیاندا لەزێدی خۆیان بمێننەوە، ئەوە وەکوو موسوڵمانە سارانشینەکان حیساب دەکرێن‌و حاڵیان وەکوو حاڵی ئەوان دەبێ. هەر بڕیارو شەریعەتێکی خودا موسوڵمانان بگرێتەوە ئەوانیش دەگرێتەوەو دەبێ ملکەچی فەرمان‌و یاسای ئیسلام بن، وەلێ لە دەستکەوت‌و غەنیمەتی جەنگ‌و دەستکەوتی مفت (فەیئ) بەشیان نادرێتێ‌و پشکیان بۆ دانادرێ، مەگەر ئەوانیش لەتەك موسوڵماناندا بچن بۆ غەزاو هاوبەشی جەنگان دژی بێباوەڕان بکەن.

دووەم شت: کە رازی نەبوون موسوڵمان ببن داوای سەرانەیان لێ بکە، کە رازی بوون سەرانە بدەن ئەوە سەرانەیان لێ وەربگرەو شەڕیان لەگەڵ مەکە.

سێیەم شت: ئەگەر موسوڵمان نەبوون‌و سەرانەشیان نەدا هەردوو پێشنیارەکەیان رەتکردەوە، ئەوە پشت بەخودا ببەستەو داوای یارمەتی لێ بکەو شەڕیان لەگەڵ بکە.

لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: لە غەزایەکدا ئافرەتێك بیندرا کوژرابوو، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کرد لە کوشتنی ئافرەت‌و منداڵ.[1]

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆسەر ئەهلی یەمەن ببێتە مامۆستایان‌و فێری ئایینیان بکا، بەم شێوە ئامۆژگاری کردو پێی فەرموو: «إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ ، فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ

---

[1] متفـــــق عليـــــه: خ(٣٠١٥/١٤٨/٦)، م(١٧٤٤/١٣٦٤/٣)، د(٢٦٥١/٣٢٩/٧)، ت(١٦١٧/٦٦/٣)، جة(٢٨٤١/٩٤٧/٢).

قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ».[1] ئەی موعاز تۆ دەچییە سەر گەلو نەتەوەیەك خاوەن نامەی ئاسمانین، بانگیان بکە بۆئەوەی شایەتومان بێنن‌و بڵێن: (أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) شایەتی دەدەین جگە لەخودای تاك‌و تەنها هیچ خودای تر نین شیاوی پەرستن بن، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلاش پێغەمبەرو فروستادەی خودایە، جا ئەگەر بەقسەیان کردی‌و شایەتومانیان هێنا، پێیان رابگەیەنە کە خودا زەکاتی لەسەر پێویست کردون بڕێ ماڵ وەردەگیرێ لە دەوڵەمەندەکانیان‌و بەسەر هەژارەکانیاندا دابەش دەکرێتەوە. ئەگەر ئەمەشیان قبوڵ بوو رازی بوون، ئەمجار لەکاتی زەکات لێ وەرگرتنیاندا خۆت بپارێزە لەوەی کام ماڵ‌و سامانیان زۆر باش‌و خۆشەویستە لایان لێیان وەربگری، خۆت بپارێزە لە نزاو ناڵەی ستەم لێکراو، نەچی زوڵم‌و ستەم لەخەڵك بکەی، چونکە گومانت نەبێ لەنێوان نزاو پاڕانەوەی ستەم لێکراوو پەروەردگاردا پەردەنیە.

### غەزاکردن‌و جیهاد لەسەر کێ پێویستە؟

جیهاد واجب‌و پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی باڵغ‌و عاقڵ‌و ئازادو نێرینەو خاوەن توانا لەسەر شەڕو دارایی ئەوەی هەبێ تا لەغەزاکەی دەگەڕێتەوە بەشی خۆی‌و ماڵ‌و خێزانی بکا، واجببونی جیهاد لەسەر موسوڵمان‌و واجب نەبوونی لەسەر کافر ئاشکرایە، چونکە جیهاد بریتییە لە شەڕو جەنگان دژی کافر.

[1] متفق عليه: خ(١٤٥٨)، م(١٩).

واجببونیشی لەسەر باڵغو واجب نەبوونی لەسەر نابالغ ئاماژە بەو فەرموودەی ئیبنو عومەر دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: ڕۆژی غەزای ئوحود تەمەنم چواردەساڵ بوو نیشانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) درام بۆئەوەی ڕێگەم پێ بدا هاوبەشی غەزاکە بکەم ڕێگەی نەدام، پاشان ڕۆژی غەزای خەندەق تەمەنم پانزە ساڵ بوو نیشانی پێغەمبەر درام بۆئەوەی ڕێگام بدا هاوبەشی غەزاکە بکەم ڕێگای دام.[1]

ئەوەش کەجیهاد لەسەر پیاوی عاقڵ واجبەو لەسەر بێ عەقڵ واجب نیە ئەوە بەپێی ئەو فەرموودەی دەفەرموێ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ».[2] بەڵگەی ئەوەش: کە جیهاد لەسەر پیاوان واجبەو لەسەر ئافرەت پێویست نیە. ئەو فەرمودەیەیە: کە عائیشە ریوایەتی دەکا دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کردو وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئافرەتان جیهادیان لەسەرە؟ فەرمووی: بەڵێ (جیهاد لا قتال فیه: الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ). جیهادێکیان لەسەرە شەڕی تێدانیە: حەجو عومرە بکەن ئەوە جیهادی ئەوانە.

واجب نەبوونی جیهاد لەسەر نەخۆشو نەداراش بەپێی ئەو ئایەتەیە: کە دەفەرموێ: { لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلا عَلَى الْمَرْضَى وَلا عَلَى الَّذِينَ لا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ – التوبة/٩١} جیهاد پێویست نیە لەسەر لاوازو نەخۆشو نەدارا،...............

هۆی ئەوەش کە جیهاد لەسەر غەیری پیاوی ئازاد واجب نیە ئەوەیە: کۆیلە مڵکی ئاغاکەیەتیو بەبێ ئیزنو رەزامەندیی ئەو ناتوانێ جیهاد بکا.

---

[1] متفق علیه: خ(٢٦٦٤/٢٧٦/٥)، م(١٨٦٨/١٤٩٠/٣)، ت(١٧٦٣/١٢٧/٣).

[2] لەوەپێش چەند جارێك تێپەڕیوە.

**ج كاتێ جیهاد دەبێتە فەرزی عەینو لەسەر هەموو کەس پێویست دەبێ**

**جیهاد نابێتە فەرزی عەین مەگەر لەم حاڵەتانەدا بێ:**

١- ئەوکەسەی جیهادی لەسەرە بچێتە ڕیزی شەڕکەرانەوە، ئیتر ئەوکاتە بە نیسبەت ئەو، فەرزی کیفایەنیەو فەرزی عەینە. قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا – الأنفال/٤٥} ئەی خاوەن باوەڕان هەرکاتێ ڕوبەڕوی بێباوەڕان بوونەوە پشت هەڵمەکەنو لە بەرامبەریاندا خۆتان ڕابگرن.

یان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفاً فَلا تُوَلُّوهُمْ الأَدْبَارَ – التوبة/١٥} ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوەو خاوەن باوەڕن هەرکاتێ بەرەنگاری پێڕی بێباوەڕان بوونەوەو هێرشیان بۆ هێنان، پشت هەڵمەکەنو لەبەریان هەڵمەیەن.

٢- هەرکاتێك سوپای بێباوەڕان وڵاتێکی لە وڵاتی موسوڵمانان داگیرکرد، ئەوە پێویستە موسوڵمانان تێکڕا پەلاماری دوژمن بدەن.

٣- هەرکاتێك فەرمانڕەوا فەرمانی بەیەکێك کرد بچێ بۆ جیهاد بەنیسبەت ئەوکەسەوە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین. ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: (لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا)[1]

---

[1] متفق عليه: خ(٦/٣/٢٧٨٣)، م(٢/٩٨٦/١٣٥٣)، ت(٣/٧٤/١٦٣٨)، د(٧/١٥٧/٢٤٦٣).

## ديلى جەنگ

ئەوانەى لە كۆمەڵى كافران دەرفێندرێن دوو جۆرن:

جۆرێكيان بەخودى فڕاندنەكەيان دەبنە كۆيلە، ئەوانە ئافرەتو منداڵن.چونكە پێغەمبەر نەهى كرد لە كوشتنى ئافرەتو منداڵى بێباوەڕان، دابو نەرێتى وابوو وەكوو ماڵو سامان دابەشى دەكردن بەسەر موسوڵماناندا.

جۆرێكيان بەخودى فڕاندنو گرتنيان نابنە كۆيلە. ئەمەش پياوە باڵغەكانيانن، فەرمانڕەواى موسوڵمانان تێياندا سەرپشكە بيانكوژێ، يان بيانكاتە كۆيلە، يان بە پياوەتىو ماڵ يان لەبەرامبەر ئازادكردنى ديلى موسوڵمان بەرەڵايان بكا.

ئيمام سەرپشكە لەم سێ حاڵەتە كامەى بە مەصلەحەت زانى ئەوەيان لەگەل بكا،، قورئان دەفەرموێ: {مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ – التوبة/٦٧}.

بێگومان پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) پياوە ديلەكانى بەنو قوڕەيظەى كوشتن، پياوە ديلەكانى بەنو موصطەلەقى كردنە كۆيلە.

بە پياوەتىو منەت لەسەرنان ئەبولعاصى كوڕى رەبيعو ثومامەى كوڕى ئاثالى بەرەڵاكردنو ئازادى كردن، ديلەكانى غەزاى بەدريشى بەپارە بەرەڵا كردن، پياوێكى ديلى كافريشى بەدوو پياوى ديلى موسوڵمان گۆڕينەوە. ديلە كافرەكەى مەرەخەس كرد لەبەرامبەر مەرەخەسكردنى دوو ديلە موسوڵمانەكە. قورئان دەفەرموێ: {فَإِذَا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنّاً بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَكِنْ لِيَبْلُوَ بَعْضَكُمْ بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَنْ يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ – محمد/٤} ئەى كۆمەڵى موسوڵمانان: هەركاتێ بەرەو ڕووى كافرەكان بوونەوەو شەڕ لەنێوان ئێوەو ئەواندا بەرپا بوو دەستيان لێ

مەپارێزن، هێزو تواناى خۆتان بخەنە گەڕ بۆ تێکشکاندنیان، جا کەشەڕ تەواو بوو زۆرتان لێ کوشتن‌و خوێنیان ڕژا، لێشیان بەدیل گیرا ئەوکاتە دیلەکانیان بەتوندى کۆت‌و بەند بکەن، مەهێڵن ڕزگاریان بێ، ئەمجار ئێوە سەرپشکن لەنێوان ئەوەدا بەمنەت‌و پیاوەتى بەرەڵڵایان بکەن یان بەفیدیەو ماڵ لێ وەرگرتن یان بەگۆڕینەوەى دیل بەدیل مەرەخەسیان بکەن، ئەوە بڕیارى خودایە دەربارەى جیهاد دژى کافران، پەروەردگار بۆخۆى دەتوانێ کۆمەڵى کوفر لەناو بەرێ، تۆڵەى سەرپێچى‌و ستەمکارییان لێ بستێنێ، وەلێ خودا فەرمانى بەئێوەى موسوڵمان کردووە؛ کە بجەنگن دژیان بۆ ئەوەى دەربکەوێ کێ فەرمانبەردارى فەرمانى خودایە، ئەوانەى لەپێناو ئایینى خودادا شەهید دەکرێن، پەروەردگار ئەرک‌و ماندوبوون‌و خۆبەختکردنیان بەفیڕۆ نادا، کردەوەکانیان پوچ ناکاتەوە.

چەک‌و تفاقى شەڕکەرى بێ باوەڕ ئەگەر کوژرا دەبێتە ملکى بکوژە موسوڵمانەکەى. پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (وَمَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ).[1] کەسێك کافرێك بکوژێ چەك‌و تفاقى شەڕکردنى دەبێتە ملکى بکوژە موسوڵمانەکەى. مەبەست بە (سلب) پۆشاك‌و سیلاح‌و خشڵ‌و ئەو ئەسپەى بەسەر پشتیەوە کوژراوە.

## غەنیمەت‌و دەسکەوتەکانى جەنگ

دواى تەواوبوونى شەڕو سەرژمێرى دەستکەوت‌و غەنیمەت ئەمجار بەم شێوەیە دەستکەوتەکان دابەش دەکرێن، هەموو دەستکەوتەکە دەکرێتە پێنج بەش چوار بەشیان بەسەر جەنگاوەرانى ئامادەبووى غەزاکەدا دابەش دەکرێ.

---

[1] متفق علیه: خ(٣١٤٢/٢٤٧/٦)، م(١٧٥١/١٣٧٠/٣)، ت(١٦٠٨/٦١/٣).

بۆ پیادە بەشێك‌و بۆ سوار سێ بەش. بەشێکی پێنج بەشەکە دەدرێتە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە ئارەزۆی خۆی تەوزیعی دەکا.

قورئان دەفەرموێ: {وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ – الأنفال/٤١}. بزانن ئەوەی دەستتان دەکەوێ لە ماڵ‌و سامانی کافران پێنج یەکی بۆ خوداو پێغەمبەرە. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە ئارەزۆی خۆی دابەشی دەکا.

لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: بەچاوی خۆم بینیم غەنیمەت‌و دەسکەوتی جەنگ دەکرا بە پێنج بەش‌و ئەمجار دابەش دەکرا. ئەو بەشەی بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دادەنرا ئەوە ئەو تەشریفی تێیدا سەرپشك دەبوو بەئارەزوی خۆی تەوزیعی دەکرد.

هەر لەئەوەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) رۆژی خەیبەر بۆ جەنگاوەری ئەسپ سوار سێ بەشی دادەناو بۆ پیادە یەك بەش.[1]

لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جەنگاوەری ئەسپ سوار سێ بەشی دەدایە، پیادەش یەك بەشی دەدایە.[2] جەنگاوەری بەشداربووی غەزا بەشی بۆ دانانرێ هەتا پێنج مەرجی تێدا کۆنەبنەوە (موسوڵمانیەتی، باڵغی، عاقڵی، ئازادی، نێرینەیی) ئەگەر مەرجێکی لەمانە تێدانەبوو، دیارییەکی کەمی پێ دەدرێ‌و بەشی سەرەکی بۆ دانانرێ، چونکە ئەو بۆخۆی جیهادی لەسەر واجب نیە.

---

[1] صحيح: (ص.جة/٢٣٠٣)، جة(٢/٩٥٢/٢٨٥٤)، خ(٦/٦٧/٢٨٦٣)، م(٣/١٣٨٣/١٧٦٢)، د(٧/٤٠٤/٢٧١٦).

[2] صحيح: (الإرواء/١٢٢٧)، هق(٦/٢٩٣).

لـه عومـەیرەوە: کـە مـەولای (ئـەبو اللحـم)ە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: ڕۆژی غەزای خەیبەر لەگەڵ ئاغامدا ئامادەی غەزا بووم من ئەوکاتە کۆیلە بووم، لە دەستکەوتی غـەزا هیـچیان بـۆ دانـەنام لـە کـەلو پـەلی خـراپو کـەم نرخـی غەنیمەتەکە شمشێرە کولارتەیەکیان دامێ کە لەشانم دەکرد لەزەوی دەخشاو ڕام دەکێشا.[1]

لـە ئیبنـو عەبباسـەوە ڕیوایـەتکراوە، دەفـەرموێ: پێغەمبـەری خـودا ئافرەتی دەبردن بۆ غەزا، برینداریان دەرمان دەکردن، لە تالانیو دەستکەوتی جەنگ دیاریو بەخششیان پێ دەدرا، بـەڵام قـەت بەشی تـەواوی پـێ نـەداون وەکوو بە پیاوەکانی دەدا.[2]

## چۆنیەتی دابەشکردنی پێنج یەکی دەستکەوت

ئەو پێنج یەکەی دەدرا بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دابەشی بکا، دەکرا بە پێنج بەش، بەشێکی بۆ خودی پێغەمبـەر بـوو (درودی خـودای لەسەر بـێ) دوای لـەدونیا دەرچوونیـشی لەبەرژەوەنـدی موسـوڵمانانـدا خـەرج دەکرێ. بەشێکیشی دەدرێ بـە خـزمو کـەسوکاری پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە خێڵـی بـەنو هاشـمو بـەنو مـوطەلیـب. بەشـێکیش دەدرێ بـە هـەتیوان، بەشـێکیش بـۆ هـەژارو کـەم دەرامـەتان. بەشـێکیش بـۆ ڕێبـوارو لێ قەوماوان. قورئان دەفەرموێ: { وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ – الأنفال/٤١ }.

---

[1] حسن: (ص.جة/٢٣٠٤)، ت(١٦٠٠/٣/٥٨)، د(٢٧١٢/٧/٤٠٢)، جة(٢٨٥٥/٢/٩٥٢).

[2] صحيح: (مختصر م/١١٥١)، م(١٨١٢/٣/١٤٤٤)، د(٢٧١١/٧/٣٩٩)، ت(١٩٥٨/٣/٥٧).

## مفته مالْ (ألفيئ)

مفته مالْ بريتييه لەو مالْو سامانەی لەكافران دەگيرێ بەبێ شەڕ وەكوو ئەوە لەترسی موسوڵمانان هەڵێنو مالْو سامانيان لێ بەجێ بمێنیو بكەوێتە دەست موسوڵمانەكان، هەروا مالْو سامانێ كە لەسەرانەو خەراج پەزمەندە دەبێ، يان كابرايەكی زەميمی بمرێو ميراتگری نەبێو مالْو سامانی لەدوا بەجێ بمێنێ.

## گرێبەستو عەقدی ذيمة

(ذمة) وشەيەكی عەرەبييە بە مانا عەهدو ئەمانە.

عەقدی (ذمة) ئەوەيە فەرمانڕەوا يان جێگرەكەی رازی ببێ كە لەناو وڵاتی ئيسلامدا برێ خاوەن نامە يان بێ بڕواو كافر لەسەر ئايينی خۆيان بمێننەوە بەدوو مەرج:

١- سەرانە بدەن

٢- پابەندی ئەحكامی ئيسلام بن بەشێوەيەكی گشتی.

ئەصڵو بنەمای ئەم حوكمە ئايەتی قورئانە كە پەروەردگار دەفەرموێ: {قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ – التوبة/٢٩}: شەڕ بكەن دژی ئەوانەی ئيمانيان بەخوداو بەهاتنی رۆژی قيامەت نيە، ئەو شتەی خوداو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ياساغيان كردووە ئەوان بەحەرامی نازانن، هەروا دژی ئەوانەی پەيڕەوی ئايينی حەق ناكەن لەو گەلو نەتەوانەی خاوەن نامەنو ئايينەكەيان نەسخ بۆتەوە بجەنگن هەتا ناچار دەبن بە ملكەچی سەرانە دەدەن.

## ئەوەی لە ئاکامی عەقدی ذیممە دێتە کایەوە

هەرکاتێك عەقدی ذیممە مۆرکراو تەواو چەسپا، ئیتر شەڕکردن دژی ئەو ذیمیانە حەرامە، دەبێ ماڵو ناموسیان پارێزراو بێ، دەبێ ئازادییان بۆ بەرجەستە بکرێ، بەهیچ شێوەیەك توشی ئەزیەتو ناڕەحەتی نەکرێن[1] ئاماژە بە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: «اغْزُوا بِسْمِ اللَّهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ فَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى إِحْدَى ثَلاَثِ خِصَالٍ - أَوْ خِلاَلٍ - فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ إِلَيْهَا فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمُ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ فَإِنْ هم أبوا فسلهم الجزية فان هم اجابوك فاقبل وكفّ عنهم».[2]

## ئەو یاساو ڕێسایانەی بەسەر ئەهلی ذیممەدا جێبەجێ دەکرێ

ئەهلی ذیممە لەبواری مافی ئادەمیزادانەوە (حقوق الآدميين) ئەحکامەکانی ئیسلامیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، لەبواری گرێبەستو مامەڵەی کڕینو فرۆشتنو ڕەهنو بەکرێدانو ئەو شتانە، هەروا لەبواری بژاردنو خوێندانو نرخی شتی فەوتاوو ئەو جۆرە شتانە، وەکوو موسوڵمانان ئەحکامی ئیسلامیان لەسەر جێبەجێ دەکرێ، حەدو تۆڵەی شەرعییان لەسەر جێبەجێ دەکرێ.

لە ئەنەسەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: کە جولەکەیەك سەری جارییەکی لەنێوان دوو بەردا جەڕمبابە دابوو سەری شکاندبوو تا زۆر ئێشی پێ گەیشتبوو، پێی گوترا کێ وای لێ کردی؟ فلان بوو؟ فلان بوو؟ ناویان زۆر بۆ هەڵدان تا سەرە هاتە سەر کابرای جولەکەو ناوی ئەویان لەلای هێنا، ئیتر

---

[1] فقه السنة ج٣/٦٥.

[2] لەوەپێش تێپەڕی، بەهەندێ جیاوازی لە دەقەکەدا.

جارييەکە بەسەری ئامازەی کرد کە ئەو وای لێ کردووە، کابرای جولەکە گیراو دانی بەتاوانەکەیدا نا، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دا بەهەمان شێوە سەری کابرای جولەکەیان خستە نێوان دوو بەردەوەو جەرەبابەیان داو بەدوو بەردەکە سەریان کوتایەوە.[1]

لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دوو جولەکەیان هێنانە خزمەتی کە دوای ئەوە پیاوەکە ژنی هێنابوو ئافرەتەکە شووی کردبوو کەچی داوێن پیسییان کردبوو ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بە بەردەباران کردنیان.

## کەی گرێ بەستی ذیممی هەڵدەوەشێتەوە؟

هەرکاتێ بابای نیممی سەرانەی نەدا، یان ئامادە نەبوو پابەندی ئەحکامی ئیسلامی بێ دەربارەی مافی ئادەمیزادەکان، ئەوە گرێ بەستەکەی بە هەڵوەشاوە دادەنرێ، چونکە ئەو پابەندی مەرجەکانی گرێ بەستی نیممە نەبووە.

هەروا عەقدەکە هەڵدەوەشێتەوە بەوە کابرا دەست درێژی بکاتە سەر موسوڵمانان یان جنێو بەخوداو پێغەمبەر بدا.

لە ئیمامی عومەرەوە ریوایەتکراوە: کە کێشەی پیاوێکی هێنرایە لا کە ویستبووی بەزۆر زینا لەگەڵ ئافرەتێك بکا، حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئێمە لەگەڵ ئێوەدا لەسەر ئەمە صوڵحمان نەکردووە، ئیتر فەرمانی دا لە بەیتولەقدیس لەسێدارەیاندا.[2]

---

[1] متفق عليه: خ(٦٨٧١/١٩٨/١٢)، م (١٦٧٢/١٢٩٩/٣)، د (٤٥١٢/٣٦٧/١٢).

[2] حسن (الإرواء/١٣٧٨)، ابن أبي شيبة (١١/٨٥/٢)، هق (٢٠١/٩).

له ئیمامی عەلییەوە ریوایەتکراوە، کە ئافرەتێکی جولەکە جنێوی بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەداو تانەو تەشەری ئاراستە دەکرد، پیاوێك لەتۆڵەی ئەوەدا خنکاندی، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خوێنەکەی بەفیڕۆ دانا.[1]

هەرکاتێك عەهدو پەیمانی ذیممی هەڵوەشایەوە، حوکمەکەی حوکمی دیلە ئەگەر موسوڵمان بوو کوشتنی حەرامە، ئەگەر موسوڵمان نەبوو ئەوە ئیمامو فەرمانڕەوا سەرپشکە لەنێوان ئەوەدا بیکوژێ، یان بەمنەتو پیاوەتی بەرەڵڵای بکا، یان بەماڵو سامان یان بە دیل بیگۆڕێتەوە. وەکوو لەوەپێش لەباسی ئەحکامی دیلەکانی شەڕدا تێپەڕی.

## سەرانە لەکێ وەردەگیرێ؟

له ئیمامی نافیعەوە لە ئەسلەمەوە ریوایەتکراوە: کە ئیمامی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) نامەی نوسین بۆ فەرماندەکانی سوپای ئیسلام، فەرمانی پێ کردن کە سەرانە لەسەر ئافرەتو منداڵ دانەنێن. هەروا سەرانە نەخاتە سەر کەسانێك: کەتووشی کارەسات بوون کۆستیان کەوتووە.[2]

له موعازەوە ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێك رەوانەی یەمەنی کرد، فەرمانی پێ کرد: کە لەهەر نێرینەیەکی باڵغ دینارێك سەرانە وەربگرێ، یان بە بەهای دینارێك پۆشاکی مەعافیری وەربگرێت.[3]

دروستە رێژەی سەرانە زیاد بکرێ. ئاماژە بە حەدیثی ئەسلەم کە ریوایەتی کردووە، دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب لەسەر خاوەن زێڕەکان چوار

---

[1] صحيح الإسناد (الإرواء: ٥/٩١)، د (٢/١٧/٤٣٤٠)، هق (٩/٢٠٠).

[2] صحيح: (الإرواء/١٢٥٥)، هق (٩/١٩٥).

[3] (الإرواء/١٢٥٤)، د (٨/٢٨٧/٣٠٢٢).

دیناری دانا، لەسەر خاوەن زیو چل دیرهەمی دانا، وێڕای ئەوەش بژێوی موسوڵمانەکانو میوانداری کردنیشیان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ.[1]

پێویستە ئیمام دەوڵەمەندیو هەژاریی سەرانە لەسەر دانراوەکان بەرچاو بگرێو بەپێی ئاستی داراییان سەرانەیان لەسەر دابنێ، ئاماژە بەوتەی ئەبو نەجیح: کە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەئیمامی موجاهیدم گوت: ئەوە هۆی چییە دانیشتوانی شام یەکی چوار دیناریان سەرانە لەسەر دانراوە، کەچی دانیشتوانی یەمەن یەکی دینارێکیان لەسەر دانراوە؟ لە وەڵامدا وتی: ئەوە بەپێی دەوڵەمەندیو هەژاری سەرانە لەسەر دانراوەکانە.

**بەیارمەتی خودا ڕۆژی ( ٢٠١٠/٧/٢٢ ) لە وەرگێڕانو نووسینی ئەم کتێبە بوومەوە. خودا بیکاتە مایەی خێرو فەڕ پێویستە ئەوەش بڵێم: بە ئەنقەست کیتابی ( عتق )م وەرنەگێڕاوە. بە هومێدی ئەوەی جارێکی تر ئادەمیزاد کۆیلایەتی بەخۆیەوە نەبینێ...**

**ملا محمودی گەلاڵەیی**

---

[1] صحيح (الإرواء/١٢٦١)، هق (٩/١٩٥).

## پێڕستی سەرەباسەکان